# کوڵی دڵی
# مەلای گەورەی کۆیی

مەلاحسێن گورژی

نـــــاوی کتێـــــــب: کوڵی دڵی مەلای گەورەی کۆیی
نـــــاوی نوســـــەر: مەلاحسێن گورژی
چاپ و بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیربۆ بڵاو کردنەوەو / هەولێر
خـــــــــــــــەت: نەوزاد کۆیی
نەخـشەسازی نـاوەوە: شنۆ حمدامین
بـــــــــــــــەرگ : ئەمین مخلص
نـــۆرە و ســاڵی چــاپ: یەکەم ١٤٣٠ك – ٢٠٠٩ز
تـــــــــــــیراژ: ١٥٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان ژمارەی سپاردنی (٦٩) ی ساڵی ٢٠٠٨ دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٢٢ ٥١ ٤٦٠ ٠٧٥٠ - ٩١ ٧٢ ١٣٨ ٠٧٧٠
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com



مەلای گەورەی کۆیی

هەتادەمرم لەبۆ کوردان دەناڵم    عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بە ماڵم؟

دە بێ من کە یفی چیم بە دنیا بێ    قە ومی من وا ڕە زیل وڕیسوابێ ؟!



مەلا حوسێنی گورژی

ئەمن دەمرم دەمێنێ پاشەوارم    دەزانن ئەو حەلە کوردی هەژارم
ئەوەی دەینوسم و دەیڵێم و دەیکەم    لە دڵڕایە و لەباوەڕ رایە کارم
لەبۆیە پاشی خۆم گشتی لەنێو گەل    هیوام وایە ببێتە یادگارم
ئەگەر ئەورۆش کەسی ڕێزم نەزانێ    دەزانێ گورژی گەل دوا،چی بووە کارم

## تێبینی

ڕەنگە هێندێک کەس ڕەخنەم لێ بگرن وبڵێن کتێبەکەی خۆی لێوالێو کردووە لە هۆنراوە و گوتاری هۆنەران و نوسەرانی دیکە و کەمی قسەی خۆیەتی و بە مەسنگەلی خەڵک ڕازاندویەتەوە. منیش ئەو ڕەخنە لە سەرچاوم دادەنێم و بە دڵ قبوڵی دەکەم. چونکە تا ڕاددەیەکی زۆر ئەو قسە بەجێیە؛ بەڵام با هەمو کەس بزانێ، کە من ئەو کارەم بە چەند مەبەستی سەرەکی ئەنجام داوە کە بریتین لە:

١- مەبەست و واتای پەرتوکەکە لە هێندێک جێگا بۆ هێندێک کەس کەمێک توند و مەبەستەکانی کەمێک تیژ وداخن و؛ ڕەنگە لە کەسانێکی وەک منی وەرنەگرن، جا منیش بۆئەوەی پێیان بقولێنم و پێیان بڵێم: با بەتەنیا هەر من و ماملۆستای کۆیی نین، کە لەگەڵ ئەو جۆرە بیروباوەڕە پڕوپوچەی واندا نەیارین و بەرهەڵستی دەکەین؛ من هیچ کە بە پەیڕەوی لە باشقە مەلاکانی وەک مامۆستای کۆیی لەسەر نەیاری ئەو خورافاتە ساخ بومەتەوە؛ ئەوەتا زۆر لە پێش مەلای گەورەشدا ئەو هەمو کەڵەپیاو و زانا گەورانە و لەدوای ویش هەر ئەو هەمو مەلاو زاناو ڕوناکبیر و تیژهۆش و دوربینانە نەیان هێشتووە ڕێگەی وی کوێر بێتەوەو دڵسۆزی خۆیان بۆ گەل و نیشتمان و ئایینە پیرۆزەکەیان نیشان داوەو لەو ڕێیەشدا خەباتیان کردووەو ڕەنج و ئازاری زۆریان چەشتووە.

٢- ویستومە ئەو شوێنەوار و پاشەوارە بەنرخ و خاوەن بایەخەی وان، کە هەرکامێکیان بەڵگەیەکی زیندوو پەرتویەکی درەوشاوەیە لەسەر هۆشیاری و زانیار و بێداری و دڵسۆزی زانایانی گەلە چەوساوەکەمان تۆمار بکەم و لە پەنای یەکیاندا

خڕبکەمەوە؛ تا هەم لە نەمان و فەوتان و لە بەین بران بییان پارێزم و پەزمەندەیان کەم بۆ دوارۆژی گەلە هەژار و چاوبەستراوەکەمان و هەروەها بۆئایینی چاک و پاک و تاک و پیرۆزی ئیسلام. دیارە کە هەر نەمامەی لە جێیەکم ڕا هێناوەو لەپەنای یەکم چەقاندون و کردومەتە ئەو باخچە چکۆلە بۆ بەرەی داهاتوو تۆرەمەی دوارۆژی گەلەکەمان؛ تا نیشتمانە خۆشەویستەکەمانیان پێ لە فێڵی چاوبەستا بپارێزم، تا جارێکی دیکەش دژمنانی لاوەکی بەهۆی ستونی پێنجەمی خۆیان لەنێو ئێمەدا؛ نەتوانن کوردە موسڵمانەکان لەخشتە بەرنەوە.

٣٣- بێ گومان ئەگەر ئەو کارەشم نەکردبایە هەمو کەس دەستی وە هەموی ئەو بەڵگەو پەرتوکە مێژوییە بەنرخانە ڕانەدەگەییشت و ئەگەر بەدەگمەن یەکێک دەستی وەیەک دۆێک، یا چەن دانەیەکی وانە ڕاگەیبا لەوانەبو، کە هەتا مردن ئەوانی دیکەی هەر نەدیتبان و دەستی وییان ڕانەگەیبایە. بەڵام من ماوەیەکی زۆرم بۆ ئەو کارە تەرخان کردووەو لە ئێران و ئێراقان هەوڵم داوەو کەرەسەم بۆ خڕکردۆتەوە، تا وها شتێکم پێک وەناوە، کە بێ سوو هەمو کەس نەیدەتوانی ئەو کارە بکات، تەنانەت نیوەی ئەو هەمو بەڵگانەش پەیدا بکاو ئەو هەمو زەحمەتە بکێشێ، کە دەبێ قبولی بکەم، کە منیش هەر نەمتوانیوە یەک لەسەدی وانیش وەدەس بێنم.

ئەمجا گەلێک بە پێویستی دەزانم، کە لە ناخی دڵ و قوڵایی دەرونەوە سوپاسی زۆری هەمو ئەو کەسانە بکەم، کە تەنانەت بۆ گێڕانەوەی کورتە باسێکی مامۆستای کۆییان بە پێ گوتنی تاقە هۆنراوەیەکی ویش وەیا لە هەر بابەتێکەوە یارمەتییەکی چوکەلەشیان دابم. جا بەتایبەتی بەڕێزان مامو مەلا موحەممەدی بارزانی و جەنابی مامۆستا مەلا موحەممەدی کانی مازووەیی و

ڕێزدار مامۆستا مەلا عەبدووررەئوفی نەقشبەندی بیژوەیی، کە لەنێو ئەم شوێنەوارەدا شوێنی تایبەتی خۆیان دیارە و بەداخەوەش ئێستا هەرسێکیان کۆچی دووایییان کردووە و لەنێومان نەماون، هیوادارم کە خوای گەورە لەبەهەشتی بەریندا نشتەجێیان بکات و لەگەڵ مامۆستای کۆیی لە پەنای میهرو بەزەیی زۆر و بێ پایانی خۆی دا بییان حەوێنێتەوەو بییان حە سێنێتە وە.

**نوسەر**

# بەباڵا برین لە لایەن چاپەمەنی هیواوە

پاش‌نیوەڕۆی چوارشەممە١٩/ بەفرانباری ٨٠ لە دەفتەری کاری خۆم دانیشتبووم و دەمنووسی، کە جەنابی مەلا (حسین گورژی) لەپڕ لێم وەژوور کەوت. پاش سڵاو و جواب و من خۆش و تۆ خۆش باسی چاپکردنی کتێبی (پرتو آیات رحمانی)یان هێنا گۆڕێ. لە ناکاو دیتم کتێبێکی پێنج‌سەد لاپەڕەی دەپرێسکە پێچراوی دیکەی لە بنەنگڵی دەرێن و لە پێشی دانام، داوای لێ‌کردم کە لێی بڕوانم و ئەگەر بکرێ شتێکیشی لەسەر بنووسم و چاپی کەم. چاوێکم رێ‌خشاند و لێی خورد بوومەوە زانیم چییە و بۆچی دەبێ. بڕێکیشی بۆ خوێندمەوە. وەرمگرت و شەوێ دەگەڵ خۆم بردەوە ماڵێ، بڕێکم موتالا کرد. پڕ ناوەڕۆکم دی، هەر ئەو شەوەی بە پێی بۆچونی خۆم ئەو شێعرانەم بە زەینی داهات و لەسەرم نووسی.

کتێبێکیـــــان لەپـــــێش دانـــــام بە کــــوردی
کە کــــوترا بــــوو لە کوردێـــــک بە مەردی
بــــژی گـــــورژی کە نووســــیوتە کتێبێــــک
مەلای کـــــــــۆیە دەناســـــــــێنی بە وردی
کتێبــــــی وا بەنــــــرخ و پــــڕ لە ئەزمـــــوون
مەلای گەورە کە فەرمـــــــوویە بە کـــــوردی!
ئیــــــدی مەعلـــــوومە ئەورۆکە بە چـــــاکی
لە زانــــــستی کەســــــێک ناگــــــا بە گەردی
ئەتـــــۆ کـــــۆت کـــــردەوە بـــــۆ نەســـــڵی ئەورۆ

نە خیچـــــــای و نە ژاکـــــــاوی بە ڕژدی
نیـــشانەی بیـــری ژیـــر و تیـــژی تـــۆیە
کە لێزانـــــی و قەڵەمگێڕێکـــــی خـــوردی
لە بـــارەی مەردی کوردانـــدا دەنووســـی
ئیتـــر هەر بـــۆیە تـــۆش لێـــزان و مەردی
کەســـێکی بـــاش موتـــاڵای کـــا بە وردی
مـــوداوایە، بـــۆ ئـــۆف و ژان و دەردی
لە دیـــــوانی ئەدەب نەڕادی چـــــاکە
بە جـــووت دێ دووشەشـــی، هەر نـــۆرە نەردی
بە شـــانازی هیـــواش بـــۆ چـــاپ و نەشـــری
دەکۆشـــێ ســـوور بـــێ ڕووی، دوور بـــێ لە زەردی

**عەبدولقادر قادری "هیوا"**

# بە باڵا بڕین لە لایەن مامۆستا ئەسعەدییەوە

## بەنێوی خودای گەورە

زۆر لەمێژە لەگەڵ برای بەڕێز و خۆشەویست کاک مەلا حوسێنی گورژی پێوەندی دۆستایەتیمان هەیە و هەربۆیە و بەو بۆنەیەشەوە هاتوچۆمان هەبووە و هەیە. ئەو هاتووە و منیش چووم و من دەچم و ئەویش دێت. ئەوساڵ زۆر جاران کە یادم دەکرد و دەچوومە سەردانی هەموو جارێ دەمدیت وا لە دیوەکەی خۆیدا بە سەختی خەریکە یا پێنووسی بە دەستەوەیە و دەنووسێ یا بە تایپە کەجەکەی خۆی خەریکی تایپ کردنە یا لەگەڵ موتاڵا تێکەڵ بووە.

جا ئەوساڵ کە کتێبێکی مەزن و پڕبایەخی سەبارەت بە مەلای گەورەی کۆیە لەبەر دەستا بوو زۆر جاران کە دەچوومە لای یاخۆ بڕێکی بۆ دەخوێنمەوە یا من خۆم هێندێکم لێ دەخوێندەوە کە دەتوانم بڵێم بەو شێوە ئاگاداریم بەسەر زۆربەی کتێبەکەدا پەیدا کردبوو و لاموایە کە بە ڕاستی کتێبێکی زۆر زۆر باش و بایخدارە پەڕتوکێکی زۆر مەزنە لە بارەی ڕابەرێکی ئایینی زۆر مەزنی کوردەوە نووسراوە.

هەموو کەسێکی کورد پێویستە مەلای گەورەی کۆیە بناسێ چونکە ئەو گەورە بەڕێزە گەورەترین دڵسۆزی هەر کوردێک بووە هەرکەس ئەو کتێبەی مامۆستا گورژی بخوێنێتەوە دەتوانم بڵێم کە بەشێکی زۆری مێژووی کورد و کوردستان، کاکڵی ئایینی پیرۆزی ئیسلام، بەشێکی زۆر جوان و ڕەوانی ویژەی کوردی، خەیانەتکاری شێخەکان و فێڵ و فوت و ڕاووڕوت و چاوبەستنی وان و جۆری

بیرکردنەوە و پلە و پایەی زانیاری و ژیان و خەبات و بەسەرهاتی مەلای گەورە ئاگادار دەبیٚ و گەلێک شتی وای بۆ دەردەکەویٚ کە هەتا ئێستا هەر نەیزانیون.

بەڕاستی کاک مەلا حوسێن زەحمەتێکی یەکجار زۆری کێشاوە و خۆزگە لە کوردستاندا وێنە و نموونەی ئەو پیاوە گەورە و زەحمەتکێشەمان زۆر هەبان بیٚگومان مامۆستا گورژی گەلێکیان کۆشش کردووە تا کتێبێکی وەها گەورە و بەنرخیان لەبارەی وەها مەلایەکی گەورەی کورددا نووسیوە. هەروەک خۆی دەڵیٚ لە ئێران و عێراقان،دوای ئەو کەسانە کەوتووە کە هۆنراوەیا نووسراوەی وییان لابووە، یا هەر جۆرە ئاگادارییەکیان سەبارەت بە مەلای گەورە هەبوویٚ و لێی کۆڵیونەتەوە و پرسیاری لیٚکردوون و نامەی بۆ گەلێک کەس لەوبارەوە نووسیوە. زۆر بە دیقەتەوە بەوکارەوە هەڵساون و هەنگاوی گەورەیان هەڵێناوەتەوە. قۆڵی هیممەتیان لیٚ هەڵماڵیوە،بیٚترس و گومان بە دڵسۆزییەوە بە وەها کارێکی گەورە هەڵساون، بەڵام سەیرە نە خۆیان ماندوو بوون و نە قەڵەمیشیان کوڵ بووە!! بەڕاستی ئەمە لە وزەی هەموو کەسدا نییە، مامۆستا گورژی کە نووسەر و هونەرێکی هێژا و زانا و بەتوانا و شارەزا و بەهێزە بۆ گەشە پێدانی زمان و فەرهەنگ و وێژەی کوردی زۆریان هەوڵ داوە و لەو ڕێیەشدا تەمەن و ژیان و خۆشی خۆیان بەخت کردووە و هەر لەسەر ئەو بیر و باوەڕە بوو کە لە لایەن میرییە چەپەڵەکەی شای گۆڕبەگۆڕەوە هەمیشە زۆر بە سەختی لەژێر چاوەدێری و گوشاردا بووە و تەنانەت ماوەیەکی زۆریش لە گۆشەی زیندانە شەدارەکانی ئەو ڕژێمەدا بە هەژاری و نەداری بەسەری بردووە و گەلێکیش ئازار و ئەشکەنجە دراوە، بەڵام بەوحاڵەش سوپاس بۆ خوا هەرگیز کۆڵیان نەداوە و لەسەر بیر و باوەڕی خۆی هەر سوور بووە.

ئەگەرچی ماڵ و منداڵێکی زۆریشی لەم ڕۆژگارەدا بە ڕیشەوە بووەو دەسکورتی دەستی بەستووە و کتێبەکانی بۆ چاپ ناکرێن، بەڵام بێوچان خەریکی نووسین و توێژکاری و لێکۆڵینەوەیە و لەوەها هەلو مەرجێکی دژواردا ورەی بەرنەدا و لەگەڵ ئەو هەموو کەند و کۆسپەی ڕێگەی ژیانیدا بەربەرەکانی دەکات و چەرخی چەپگەڕ نەیتوانیوە چۆکی پێدابدا و زمانی ببەستێ و دەستی بلەرزێنێ، جا هەر بۆیە جێی خۆیەتی کە هەموومان ئافەرینی پێبڵێین و لە خودای گەورە داوای سەرکەوتنی بۆ بکەین.

ئەو ڕێگەی پیاوانی گەورەی گرتووە و چاو لە قارەمانانی خواپەرستی کورد دەکا و لاسایی یەکخوا پەرستانی ڕاستەقینە دەکاتەوە. هیوادارم کە خودای گەورە بە ئاوات و ئامانجی گەورەی خۆی بگەیەنێ و لە خوشک و برایانی کوردیش داوا دەکەم کە ئەم کتێبە بەنرخە بخوێننەوە کە بێگومان بە خوێندنەوە و چاوڕێخشانێک دەیان و سەدان ڕاستەقینەی وەهایان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە تا ئێستا هەر بیریشیان لێنەکردۆتەوە و بۆشیان دەردەکەوێ کە دژمنانی ئیسلام و کورد، چ جۆرە نەخشەگەلێکی شومیان بۆ ئێمە کێشاوە و چۆن دەیانەوێ لۆ هەتاهەتایە خوێنمان بمژن!!

جا منیش بەو چەند هۆنراوە بیروڕای خۆم سەبارەت بەو پەرتۆکە پڕ بایەخەی بەڕێز مامۆستا گورژی دەردەبڕم:

کتێبێکی بەنرخ و قیمەتە باسی مەلای کۆیە
وەکوو ئەستێرەیەکی گەش لە ئاسمانا ئەڵێن کۆیە
مەلای گەورە بەسام و هەیبەت و نەعرەی وەکوو شێر بوو
بە کوردی گوت لە خەو هەستە درەنگە ڕۆژ لە ئاسۆیە
هەتا کەی ژێر چەپۆکی عەیبە بۆ ئێمە ژیانی وا

بەسە خۆ خۆری یەک بگرن جەنابی شێخ خەتای تۆیە
فڕیوە قەل فڕی زۆر چاکی وەخوێنە و پەندی لێ بگرە
دەزانی چەندە بەرزە ئەم قسە هەستە لەبۆ تۆیە
ئاخر شێخ کەی فڕیوە خەرقی عادەت چۆن دەبێ گیانە
بەسە واز بێنە ئەی سۆفی کە شێخیش هەروەکوو تۆیە
بەوە هەستان لەخەو زۆرکەس کەچی هەر کوردە دواکەوتوو
نەماوە بۆت لە عالەمدا کەچی شێخ هەروەکوو خۆیە
مەلا شێخی دروست کردووە وەکو ئینگلیزی دین‌دوژمن
بە تەشوێتی تیژ لە چۆکی دا بەڵێ هەر بابە ڕۆڕۆیە
مەلا تۆ جێگری پێغەمبەری خۆت بۆچی ناناسی
زەلیلی دەستی شێخی شێخ وەکوو ئاغا لەسەر تۆیە
بە قەومی کورد بڵێ هەستن لە خەو شەو ڕاپەڕی ڕۆیی
فڕۆکە و مووشەکی دوژمن لە ئاسمانا لەسەر تۆیە
بە پێنووس و زمانت کونکە گورزی جەرگی داگیرکەر
بەوە نێو دەردەکەی بێ‌شک ئەتۆش هەروەک مەلای کۆیە
بە ڕێبازی ئەوا ڕۆیین هەزاران نووسەر و پسپۆڕ
سەر و ماڵیان لەسەر داناوە کاروان هەر وەکوو خۆیە
چرایەک هەڵکراوە ڕوونە شەوگاری تەم و تاریک
دەبیسم نێوی ئازادی لە هەولێریش وەکوو کۆیە
برای تێکۆشەر و زانا هەزاران ئافەرین بۆ تۆ
بە خوێنی جەرگە نووسیوتە بەسەرهاتی مەلای کۆیە
بژی هەر سەرکەوی گورزی زمانت کول نەبێ هەرگز
منیش گەر (ئەسعەدیم) باوەڕ دەکەی بڕوام وەکوو تۆیە

**ئەسعەدی**

# بە باڵا بڕین لە لایەن مامۆستا ئەحمەدیانەوە

بەنێوی خودا

سوپاس هەر بۆتۆیە خودایە سەنات بە کەس دوایی نایە، پێنووسی چارەنووسیت گەڵای ڕەنگینی لێنووسیت زەردی ڕۆژی ڕەشی شەوان سوری شەفەق سپی بەیان لەوحی کتێبی تەکوینت حەوای کەوی و زەوی شینت ئەوجار لەلای خۆت ڕابەرە دروود بۆسەر ئەو ڕابەرە بۆ تۆ دووایین پێغەمبەرە. شادیهێنەر و غەمبەرە. سڵاو بۆ ئەسحاب و یاران بەقەت دەنکی پەڵەی باران، یارەکانی پێغەمبەری لە یاوەران و کۆچەری.

دوای ئەوانە ئەوەش دەڵێم تەواو لەو کاتەدا کە دنیایەک کار بۆ نۆرە لە دەورم هاڵابوون و لە نێویاندا سەرەسووڕ و چاوە چاوم بوو، لەناکاو (جەنابی مەلا حوسێنی گورژی) بەسەری کردمەوە و لە ژوورەکەم وەژوور کەوت و دووای تۆخۆش و منن خۆش، کتێبێکی گەورەی (ژیاننامەی مەلای کۆیە) کە نووسراوەی خۆی بو لەپێشی دانام و لە منی ویست کە ئەو کتێبە بخوێنمەوە و پێم هەرجۆرێک بوو لەوبارەوە چەند دێڕێکی لەسەر بنووسم.

دیتم قەڵەمەکەم بە دندووک پێوە بووە نە ئەو کۆڵە قورسەی پێهەڵدەگیرێ و نە دەرەتانی هەڵاتنی هەیە، چونکە بە دابی کوردەواری میوان حاکمە و حوکمی حاکمیش ڕەت کردنەوەی نییە. لە لایەکی دیکەش خۆێندنەوەی ئەو کتێبە گەورەیە کە هەڵدانەوەی گەڵاکانی شەپۆلەکانی دەریای وەبەر چاوی دەخستم کاری منی ئەو

هەمــــووە ســــەرقاڵ و کەمکـــات و کـــار زۆر نەبـــوو. وە بەبـــێ خوێندنەوەشـی بڕیـاردان لەسـەر ئەو کتێبە کـارێکی خـراپ بـووە لەویش خراپتر وەپشتگوێ خستنی ویستی مەلایەکی ئـاوا زانـا و تێکۆشەر و خوێنگەرم بوو.

لەبەر ئەو هەمـوو هۆیـانە چـاکیم لەوەدا دی کە دوای پەسـند کردنی ئەو ژیاننامە و گوتنی چەند جار دەستخۆشی چەنـد دێڕێکـی کەم و کورت لەبارەی خاوەنی ئەو ژیاننامە و بە قسەی عەرەبەکان (صاحب الترجمە)وە لە بارەی ئەو ژیاننامە بنووسم:

١ـ خاوەنی ئەو ژیاننامەیە یانی مامۆستا مەلا محەمـمەدی کـۆیی پێـشەنگێکی زۆر گەورە و هەڵـکەوتەی ئـایینە کە نە تەنیـا خـۆی بەخەبەر بووە، بەڵکــو جەمــاوەرێکی یەکجــار زۆریــشی وەخەبەر هێنـاوە و هەتـا توانیـویەتی هەمـوو چەشـنە دەربەگـایەتی دینـی و دنیایی ڕاداوە. وە داموودەزگای ئیستیعمارچییەکانی وەدەر ناوە و نە هەر لە گـری‌وگـری فنچکـی کارەکـانی زەمـانی خـۆی بەڵەد بـووە بەڵکوو ئاوڕی داوەتەوە سەر ڕۆیـشتووش و تەنـانەت بەرەو پیری داهـاتووش چـووە و ئـاڵقەی کارەسـاتەکانی ڕۆیـشتوو و ئێـستا و داهـــاتووی پـــێکەوە شـــەتەک داوە. لە بـــاری ڕۆشـــنبیریش چـــرا بەدەستێکی ئەوەندە بە زات و زیرەک بووە کە بەبێ ترسـی و خـۆف لە وەزەندەی دێوەزمەکان تیشکی ئەو چرایەی بەهەموو قولینچک و قوژبنە تاریکەکاندا گێڕاوەو هەموو خورافاتێکی ئاییـنی وئابووری و ڕامیاری دەرپەڕاندووە. ئەو مامۆستا پسپۆڕ و هەڵکەوتەیە هەوەڵین کەسێک بووە کە قورعانی بە کوردی لێکداوەتەوە[(١)] و نەجیبەی کچی وەبەر خوێنـدن نـاوە و هەتـا توانیـویەتی تەقەی لە دێـوەزمەی نەخوێنـدەواری کـردووە و لە ڕێگـای خوێنـدەواری وڵاتەکەی بەرەو پێش بردووە.

بۆ پەڕاندنی لەمپەری پێشکەوتنی نەتەوەکەی و سەرکەوتنی نیشتمانەکەی و پشکواندنی گوڵی ئاواتی لاوانی وڵاتەکەی و بۆ بزاوتنی هەستی خواپەرستی و بێزاری لە خۆپەرستی و کاسی و مەستی بە شەو و ڕۆژ بە قەڵەم و زمان و لە قالبی هۆنراوە و پەخشاندا هەمیشە لە کۆشش و تەقەللادا بووە.

جا ئاگاداری لە ژیاننامەی پێشەنگێکی ئاوا هەڵکەوتە و دڵسۆزو خاوەن شوێنەوارە، جگە لە باری ئەمەگناسین بۆ ئەوەش بکرێتە سەرمەشق و وێنەی لێ‌هەڵگیرێ و بە هیوای خوا ڕێگای وی بۆ پێشکەوت و سەرکەوت دابگیرێ زۆر پێویستە و هیوادارم ئەو ژیاننامەیە دوای پێداچوونەوە و بژارکردنی خێرا لە چاپ بدرێ و بۆ خوێندنەوە وەبەر دەستی خوێندەوارانی بەرێز بخرێ.

٢ـ نووسەری ئەو ژیاننامەیە یانی (جەنابی مەلا حوسێنی گورژی) مەلایەکی زۆر زانا و بە یەکجار ئازایە و بالای بە قورسی بەلادا نایەو ئەوەتی من دیومەو دەیناسم هەر خەریکی دەرس‌دادان و کتێب‌دانان و هۆنینەوەی شیعر و تۆژینەوی مەبەستەکانی کۆمەلایەتی و ئایینی‌یە و ئارایەکی ئەوەندە زۆری لەگەڵ زانین و فامین و هەراوکردنەوەی جوغزی زانیاری هەیە کە ڕۆژگاریش لێی مۆن بێتەوە، جا وەبیری بێتەوە، ڕێکی گوشیێ زۆر کات و سات لەژێر مەنگەنەی کارەسات ڕۆژگار لوتیشی لەو خوار بێ ئەو پیادە بێ و خۆشی سواری بێ بە هەر لایەکدا بیگێڕێ ڕووی لە زانین وەرناگێڕێ هەر لە ڕووی عیلم و زانینە و ئەوی دیکەی پێ چ نینە. خودایە ئەو قەڵەمانە قەت کول نەبن کە زانستی ناساندنی ئیسلامەتی و ئاکارەی ئینسانەتی دەنووسن.

**مەهاباد ـ عەبدوڵڵا ئەحمەدیان**

**١٣٨٠/٨/٥**

# دیباچە

زۆر زۆم پێ خۆش بوو کە سوپاس و ستاییش و پەسنێکی وەهای یەزدانی مەزن بکەم کە هەتا ئەورۆ کەس نەیکردبێ و لە جوانی و لەباری و ڕێکوپێکی و نەخشینی و هێز و پێزە فەرهەنگی وێژەییدا لە هی هەموو کەس جوانتر و بالاتر بێ و کەسیش لە دواییدا ڕەخنەی لێ نەگرێ، بەڵام هەرچی دەکەم و دەکرێنم نە لە توانامدایە و نە هێزی پێنووس و وزەی زانیاریشم بەو پلە و پایە گەیوە.جا لەو ڕێیەوە زۆرم خۆ هێنا و برد و خۆم لێرە و لەوێ دا چم پێ نەکرا و بە ناهومێدی مامەوە و ئیتر تا ماوەیەکی زۆر لە گێژاوی خەیالاتا کەوتمە سەر مەلە و سەرەنجام هاتمە سەر ئەو خەیاڵە ئەو دوو پارچە هەڵبەستەی خۆم کە هی یەکەمم لە ساڵی ١٣٥٠ لە گوندی پاراستان و هی دووهەمیشم لە ١٣٤٨ لە گوندی واوانی ناوچەکانی گەورک و سوێسنی لە هەرێمی سەردەشت لە دەورانی فەقێیەتیە پڕ بڕک و ژان و خەم و پەژارەکەمدا دامناون، بنووسم و لە خوای گەورە بپاڕێمەوە کە لێم قەبووڵ بفەرمێ، کە ئەوەش دەقی هەر دووک پارچە هەڵبەستەکەیە:

### خواناسی

نێوی تۆ کە (اللە)یە بە کوردی کە خودایە
سەر لە سورمانە لە تۆ، ئیتر دڵ لە کوڵایە
بیر گێژەڵە، زیر هورە، زانایە نەزانە
بێسوو (شک) یەکە سەرسامە لە تۆ هەرچی جیهانە
هەر بووی و دەبی و نابێ و قەت نەبووە نەبوونت
لاچوو نیی و چونیت و نەچووی نییە چوونت

ناکێـــشرێ وێـــنەی تـــۆ بە پێنووســـێ کە بیـــرە
هـــیچ کەس قـــومی پـــێ نـــادرێ لەم ئـــاوە کە گیـــرە
ئەی خـــــوایە منـــــی لات ئەتـــــۆ دەناســـــم و بەس
بە خــــوا بە مــــرێنەر و ژیێـــــنەری هەمـــــوو کەس
هەر بیـــرێ لە هەر شـــتێکی دەکەم تـــۆ دەویـــدا هەی
هەر بلیمەتـــێ لـــیم ونـــی تـــۆ دەوی نـــاگەی
ئەی چـــاوگەکەی بـــوونم و هەم ژیـــن و ئەویـــنم
بـــڕوانمە هەر شـــتێک لە دنیـــا تـــۆ دەبیـــنم
هـــۆزانم و خـــۆ هەر شـــتێکی تەماشـــای کە دەکەم
ســـا هەر چـــشتێ هەیە و مـــن کە ســـەرنجێکی دەدەم
ســـۆمایی لە چـــاوان ئەتـــۆ ئەی هێـــزی دەس و پەل
ئەی گیـــان هەمـــوو شـــتێک و ئەرێ هەڵـخەری هەر هەل
هەرچـــــــی لە هەبوونـــــایە درشـــــت و وردی
جێگرتـوو، ڕووەک، سست و بچـووک، بە دەست و بـردی
گیانــدارێ کە ســـەختی و خەفەت و شـادی دەچێـــژێ
هەوری ڕەش و تاریـــــک کە بــــارانە دەڕێـــــژێ
دار و دەوەن، بەرد و گـــــڵ و گیــــا و هەوا گـــــش
هەرچـــی هەیە لە بـــزۆز و تەویـــن بـــوونی تەواگـــش
گـــۆی زەوی، ئـــاوی، بەژی، چـــڕی، دەشـــتی، چەمەنـــی
دونـــدەکەی بەرزی چیاکـــان کە بە خـــۆر پێـــدەکەنی
تەم و گێـــــــشوش و حەوا، ئاســـــــمان، بەرز و نەوی
شــــــاخ و دار و دەوەن و ســـــــــەوزە و زێ و زەوی
هەر بوونەوەرێـــک هەبـــووە، هەیە یـــا خـــۆ دەبـــێ ئەو
ژیـــن و ئەویـــن، ڕاز و نیـــاز، بێـــداری و هەم خەو
ســـەرپاکی لە تـــۆڕایە، بە هـــۆی تـــۆوە هەیە خـــۆ
هەرچـــی هەیە ئەی خـــوایە کـــری تـــۆیە کـــری تـــۆ

هەر دەنگــێ لە هەر شــتێکەوە دێ پەســن و سوپاســە
بـــۆ تـــووە ئەی دوور لە هەڵە و چەوت لە تاســـە
ئـــاور کە دەســـووتێ بە گـــڕ و کڵـــپە و تینـــی
زانـــا کە ســـرنجێکی بـــداتێ تـــۆ دەبینـــی
زانـــای و توانـــای و تـــۆ بینـــای و بەهێـــزی
خـــاوەن بەزەیـــی و بەخـــشەری، زۆر پـــۆگ و بەڕێـــزی
بـــوونێکی ئەتـــۆ ســـادە و هەر گیـــانێکی رووتـــی
تـــێکەڵ نـــی بە کـــۆمەڵ، ئەتـــۆ تـــاقێکی، نە جـــووتی
گیـــانێکی تەواوی ئەتـــۆ ئەی گیـــانی گیانـــان
هەر هێـــز و وزەی تـــۆیە وەکـــا چـــاوی بەیانـــان
زانیـــارییەکەت گـــش گـــری هەر شـــتێکی هەبـــوویە
هەرچـــی لە هەبوونـــایە خـــودا بـــوونی بە تـــوویە
تـــۆ خـــواییێکی وەهـــا گەورە و زانـــا و بەڕێـــزی
لە هەمـــوو خـــاوەنی هێزێـــک پتـــر خـــوایە بەهێـــزی
بە هەزاران وەکـــوو گـــورژی ســـەری شـــێواوە لە تـــۆ
جدەشـــزانێ کە تـــۆ هەی کەچـــی تێمـــاوە لە تـــۆ

**گوندی پاراستان، ساڵی ١٣٥٠ هەتاوی**

# چۆن تۆ نیی ؟!

ئەی خوداوەنـدی مەزن، ئەی بـێهەڤـاڵ و مـاڵ و حـاڵ
ئەی وەسـتا بـۆ گـش بوونێـک و ڕۆژی روون و کـاتی تـاڵ
ئەی هەمـوو گیانـدار و بـێگیـان هێـنەدی و پـۆگ و نەمـر
ئەی بهێنـی پـۆلی هەور و کـات و رۆژ و مانـگ و سـاڵ
ئەی هەمـوو بوونێـک بە بـێتـۆ هەر نیـیە و نـابێ ببـێ
بـێ گومـان دانـی بە بوونـت دادەنـێ زمانـدار و لاڵ
بـا کە سـروەی دێـت و رائەبـرێ بە بـن گوێمـا ئەڵـێ
هـیچ خـودایەک نیـیە مەگەر یەزدانـی پـاک و بـێهاڤـاڵ
دار کە بـا لێـی دات و هـاژەی لێـوە پەیـدا بـوو ئەڵـێ
هەر تەنیـا تـۆی نـامری یەزدانـی بـێبـاک و خەیـاڵ
خـانوویکی پەسـت و تاریـک و بـێشـۆق و کـاولە
هەر دڵێکـی گەر لە بیـر و تـرس و سـامت بـێ بەتـاڵ
دێرەکـانی رووپەڕەی پەڕتـووکی گـش خواناسـەکان
قەت لە باسـی پـڕ لە خێـری تـۆ خـودا نـابن بەتـاڵ
تـۆ نەبـی شـت چـۆن وەدی دێ و دێـتە مەیـدانی هەبـوون
هەر ئەتـۆی تێـکبەردەدەی ڕێـو و چەقەڵ، شـێر و شەپاڵ
تـۆ کە بـێوێـنە و نمـوونە و بـێلەش و دەسـت و پەلـی
نـابێ بگـرێ هەر نەبـووی وێـنەت بە کـامێرەی خەیـاڵ
ناسـک و باریـک و وردێـک و درشـتێکی وەهـای
نـوێنەرێکی گەورەیـی تـۆنە هەمـوو ئیـسرانی سـاڵ
زینـدووی و زانـای و بینـا و ببیـست و پـۆگی تـۆ
بێ خـواردن و چـاو و دڵ، بـێگـوێ و دەسـت و بێهەڤـاڵ
شـەو زریـوە زریـویکم گـوێ لـێ دەبـێ کـاتی خەوێ
پەسـنی تـۆیە بـوونەوەر دەیـکەن هەمـوو بە زمـانی حـاڵ

بــێ‌گومــانم کــێ کە نەتناســێت و ئیتکێربیــت نەکــا
تــۆ بە یاســای دادگەری خــۆت و رەدا دەیخەیــتە چــاڵ
نم‌نمەی باران و کرپەی بەفر و ترووسکەی سوورە گوڵ
گــش سوپاســی تــۆیە، بــێ‌کەس، بــێ‌بــرا و بــاب و کــاڵ
بەڵــگە و پەرتــووکی بــێ‌ئینتکێــرییە بــۆ بــوونی تــۆ
پەلکی گوڵ، ئاونگ لەسەر سەوزە، بە چەشنی زیوی قاڵ
پەنـــجەکەی پرهێـــزی لاوان بەڵـــگەی تـــوانینتە
کــوڵمی شــەرمینی هەزاران کیــژی شــۆخ و چــاو کەژاڵ
بــون لەتــۆرا، مــان لە تــۆرا، ژیــن لە تــۆرایە و نەمــان
هەرلە تــۆرا شــین و هەســت و بیــر و ژیــری بــێ‌خەیــاڵ
گــریە و نوســک و گــرووی منــداڵی ســاوای بــێ‌مەمــیش
گــشتی هەر هــاوار لە تــۆیە ئەی خــودای خــاوەن کەمــاڵ
چــشتێ بــێ‌وەســتا نییــە جــا چــۆن بڵــێم تــۆ نیــی خــودا
ســا ئەتــۆی وەســتای هەمــوو شــتێکی لەبەر چــاو و خەیــاڵ
ئەو جیهــانەی نــا لەســەرخۆ، هەر دەمەی جــۆرێکە خــۆ
هەرچـــی بـــشگۆڕێ وەدیهـــاتۆیە بـــێ‌بـــاب و منـــاڵ
خـــۆ وەدیهـــاتووش دەبـــێ هەیبـــێ وەدیهێـــنەر کەچـــی
ســـەیرە ناتناســـن گەلـــێ خەڵکـــی نەزان و کـــوێر و لاڵ
ڕابگیـــری رایەڵ و پـــۆی تەونـــی گەل تەنیـــا ئەتـــۆی
بـــۆیە قـــڕ نەکـــرا گەلـــی کـــوردت بە ســـەدها بانیپـــاڵ
تـــۆ خـــوداێکی وەهـــا مەزنـــی لە کـــوێ جـــا تێـــدەگا؟
ســـەد هەزارانـــی وەکـــوو مـــن بـــێ‌دڵ و کڵـــۆڵ و شـــەلاڵ
گـــورزی هەر هێنـــدە دەزانـــێ کـــۆیلەی خـــوایەکیە قەت
نامرێـــــت و نـــــاخوات و نـــــانوێ و نـــــابێ بەتـــــاڵ

**گوندی واوان، زستانی ١٣٤٨**

# مەلای کۆیی

هەتا دەمرم لە بۆ کوردان دەناڵم
عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بە ماڵم
دەبێ من کەیفی چیم بە دنیا بێ
قەومی من وا رەزیل و ریسوا بێ
بێکەس و بێدەر و فەقیر و هەژار
بێ سەر و سەرفراز و بێ سەردار
ئەوی رێگەی لە کوردەکان گۆڕی
لەعنەتی خودا لە ئەلحەد و گۆڕی

# کوڵی دڵی مەلای کۆیی

خۆم زۆر بە بەختەوەر و سەرکەوتوو دەزانم کە خودای گەورە یارمەتی دام تا هێندێک لە کوڵە دڵکانی بەڕێز ماموٚستای گەورە و ڕامیار و شارەزا، ماموٚستای هۆشیار و هێژا، مەلای گەورەی کۆیی کە لە ڕاستیدا کوڵی دڵی هەر کوردێکی ستەم لێکراوی زانا و دانا و تێگەیشتوون لەو کتێبەدا بۆ تۆی خوێنەری خۆشەویست ڕوون بکەمەوە.

خوێنەری خۆشەویست! من ناومهەوێ لەو کتێبەدا مەلای گەورە بە تۆ و بە خەڵکی کورد و موسڵمانان بناسێنم، چونکە ئەو بەڕێزە بۆ هەموو کوردێکی هەستیار و هۆشیار و بۆ هەموو موسڵمانێکی دادگەرو ڕووناکبیر ناسراو و ئاشنایە و بۆ زۆرترینیشیان دۆست و خۆشەویستە و هەرکەس داوایەکی ئاوا بکات لام وایە وەک ئەوەیە کە باوکێک بە منداڵەکانی یا برایەکی گەورە بە برا چکۆڵەکانی خۆی یا گەورە و ڕابەرێکی خۆشەویستی هۆزێک بەو هۆزە بناسێنێ، کە دیارە ئەوە کارێکی بێجێ و بێئاکامە.

چونکە بەڕاستی مەلای گەورە لە کاتی خۆیدا بۆ گەلی هەژاری کورد هەرگیز لە ڕابەرێکی گەورە و لێزان و دڵسۆز کەمتر نەبووە و بۆ خەڵکی کوردستانی گەورە کەمتر لە باب و کاک خۆشەویست و بەسۆز نەبووە.

مەلای گەورە کە دڵە گەورەکەی بەقەد کوردستانی گەورە وەک دەریایەکی گەورەی بێسەر و بنی لە کوڵی پڕجۆش و خڕۆش بووەو لە تاوی دەردی گرانی گەلە زۆرلێکراو و چاو بەستراوەکەی خۆی هەمیشە زڵقزڵق کوڵیوە و هەموو کات و ساتان کوڵی گریانێی لە

تـاو هـاوڕەگەزە هەژار و ڕێ لـێ‌وون‌کراوەکـانی دەئەوکـی‌دا بـووە و جاروباریش ئەو گریانەی بە هۆی پـارچە هەڵبەسـتێک دەربڕیـوە و قورقـوڕ گریـاوە و شـیوەن و زایەڵە و شـەپۆڕی جیهـانی کـوردی هەژاندووە و گوێی هەموو کـوردێکی زریکانـدۆتەوە و خەولێکەوتـوو بێ‌ئاگایەکانی هۆشیار کردۆتەوە.

جا هەر بەو کوڵ و گریە و زارییەی خۆی کارێکی وەهای کـردووە کە هەموو کوردێک نەک هەر تەنیـا بیناسـێ و خۆشـی بـوێ و بەس بەڵـکە بە گەورەتـرین دڵـسۆز و خەمخـۆر و ڕێ‌نـوێن و مامۆسـتا و ڕابەری خۆشـی دانـاوە و ئەوپەڕی ڕێـز و حـورمەتی بـۆ دانـاوە و وەکوو باوکێکی دڵسۆز چاوی لێ‌کردووە.

لە کوردستان‌دا قسە و ڕاوبۆچوونەکـانی مامۆسـتا هەمیـشە لەو مـاوە کەمەش‌دا بە شـێوەی پەنـد و مەتەڵ دەرهـاتوون. هـۆنراوە و هەڵبەسـتەکانی بـوونەتە سـرودی سەربەسـتی و ئـازادیخوازی و ڕزگاری گەل و گۆرانی و وردە ئاهەنگی بن لێوی هەر لاوێکی جزیـاد دیتـووی کـوردەواری و لەبەر خـۆیەوە خوێنـدونیەتەوە و تەنـانەت بـۆنەتە بەشـێک لە فۆلکلـۆری کـوردی و هێنـدێک لە فەرهەنگـی ڕەسەنی کـوردەواری و ئیتـر لـە (دایـرە)ی وێـژەی بژوێنـی کـوردی‌دا بەڕێزێکی زۆر چاک جێگەی خۆیان کردۆتەوە.

خوێنەری خۆشەویست! گلەییم لێ‌نەکەی کە بۆچی هۆنراوەکـانی مامۆسـتام ووشـە بە ووشـە ڕاڤەنەداون و ئەو کتێـبەم نەکـردۆتە ڕاڤەنامە (تفسیر)ێک بۆ هۆنراوەکانی مامۆستا؟!

بەڵـگەی ئەو کارەشـم تەنیـا ئەوە بـوو کە لاموانەبـوو کە هۆنراوەکـانی مامۆسـتا هێنـدە سەخت و دژوارن وەکـوو هـۆنراوەی گەلێک لە هـۆنەرانی دیـکە زۆرتـر وەک مەتەڵـۆکە و گـرێ‌پـوچکە و ئیـشکە گـرێ دەچـن نەک هـۆنراوەی وێـژەی و فەرهەنگـی. چـونکە

هۆنراوەکـــانی مامۆســـتای گەورە جیاوازیـــان لەو لایەنەوە و لە گەلێک لایەنی دیکەشەوە لەگەڵ هۆنراوەی هۆنەرانی دیکەدا هەیە. جـا هەر بـۆیە مـن هەرگیـز لام وانەبـووە و نیـیە کە هۆنراوەکـانی مامۆستا پێویستیان بە شی کردنەوە و ڕاڤەدانی وشە بەوشە هەیە و ئیتـر دەبـێ زۆر وەســتایانە شــی بکـرێتەوە و شـیتەڵ بکـرێن تـا مەبەستیان لێدەربخرێ،جا ڕاستی هەر بۆیەش بۆ ئەو مەبەستە لام نەداوە و بۆلاشی هەر ئەچووم.

بەڵام هەرجێـیەک کە مامۆسـتای گەورە خـوا بە گەورەیـی خـۆی بیبەخشێ ئاماژەیەکی بە ڕووداوێکی مێژوویی کردبێ و یـا باسێکی لە شـانازییەکـانی گەلـی کـورد کێـشابێتە پـێش هەروا سـادە لێـی نەگوزەراوم وبە سەریدا بازم نەداوە،بەڵکە بە پێی توانایی وهێز و وزەی زانیـاری خـۆم ڕوونـم کـردۆتەوە و بە باشـی باسـم کـردووە. چەنـدین بەسـتە هەڵبەسـتی کـورت و درێـژی چەنـدین هـۆنەری کوردیشم بۆ نمونە تێخستووە.

باسـی گەلێـک لە بنەماڵەکـانی گەورەی فەرمـانڕەوای کـورد لە کوردسـتان و جیهـانی ئیـسلام و هەروەهـا ژومـارەیەکی زۆریـش لە کەســایەتییە ئیــسلامی و کــوردییەکــانی گەورە و بەرچاویــشم تێـداکردووە. هـۆنراوەی گەلێـک لە هـۆنەرانی دیکەشـم کە وەک مامۆسـتا بیریـان کـردۆتەوە و لەسـەر ڕێبـازی مامۆسـتا و هێڵـی پیرۆزی ئەو پیاوە پیرۆزە بوون هێنـاوە و شـانازی لەسـەر ڕێبـازی مامۆستابوونم بۆیام چەسپاندووە. ژیاننـامەو مێـژووی ژیـانی زۆر کەسی کورد و ناکورد و زنجیرەی چەند زەنجیرە پادشای کوردیـشم تێخستووە.

لەبیر و بۆچوون و ڕاو و نووسراوە و هۆنراوە و پەرتـوکەکـان و شێوەی ڕەفتـار و کـردار و گوتیارەکـانی مامۆسـتا وا دەردەکەوێ کە

تێکۆشان و شۆڕشێکی مەزن و خەباتێکی خوایی دەس پێ کردووە.

هەروەها بۆ ئەوەش بزانـی کە دایکـی نیـشتمانی کـورد چ جۆرە ڕۆڵەیەکی لە ئامێزی گەرمی خـۆیدا پەروەردە کـردووە!! هـەروا بـۆ ئەوەی بزانـــــی لە کـــــوردی بـــــێبەش و هەژار و دەردەدار چ هەڵکەوتووە!!

هەیە و چەسپاو و سەلمێندراوە، ئێمە بە چاوی خۆمان دەیبینین: زەمینێـک کەوا بـێهێـز و پێـزە شیناوەردەکەی چـاک و بەرێـزە خوای گەورە و پەروەردگاریش دەفەرموێ (والبلد الطيب يخرج نباته باذن ربه والذي خبث لا يخرج الا نكداً) بەڵێ زەمینی خـاوەن هێـز و پاک شیناورد و گیا و گـوڵەگەی بەو ودمـی خـوا زۆر چـاک و بـاش دەڕوێـــت و ســـەر دەردێنـــێ، بەڵام ئەوەی کە کرێنـــک و خەراپ و شۆرەکاتە گیا و شیناوردی لێنابێتێ مەگەر زۆر بە کەمی و ئەویش هەمووی هەر لاواز و چیلاز و بێهێز و سیسە.

جا کوردستانیش تاکاتێکی، کە بێشکەی شارستانییەت وزانست و هونەر و پیـشەسازی و مەکۆی زانایـانی گەورە و بـنکە و پایەگـای گەورەتـرین زل هێـز و باشـقە میـری جیهـان بـوو هەتـا دەگـا بە سەربەخۆیەتی خۆی فەرمانڕەوای بەشێکی زۆر لە گەلانی جیهانیش بوو، گەلێک زانا و کەڵە پیاوی وەهای لێهەڵکەوتوون کە لەڕاستیدا لە جیهانی چاخی خۆیاندا بێوێنە و نموونە بوون.

تەنانەت ئێـستاش لەگەڵ ئەو هەمـوو بەدبەختـی و ڕۆژ ڕەشـی وماڵوێرانی ولێقەوماویەی خۆشیدا، ئەوەندەی زاناو دانا و بلیمەت و پسپۆڕی گەورە لـێهەڵکەوتـووە کە بە ڕێـژەی خـۆی لەوبـارەوە لە هەموو گەلانی دیکەی جیهانی ئیسلام زۆر لەپێشترە و دەتوانم بڵێم نـزیکەی نیـوەی تەواوی پەڕتـوکە ئیـسلامییەکـانیش هەر زانایـانی کورد نووسیویانن کە مەلای گەورەی کۆیی یەکـێکە لەو زانـا و دانـا نووســـەرو بـــاهونەرانەی ئیـــسلامی کـــورد، کە قـــوڵی خیـــرەت و

مەردانەییان هەڵماڵیوە و هەمیشە لە مەیدانی خەباتی خودایی‌دا وەک کێوچە قوین و لەدژی خەرافات وپڕوپووچ پەرستی ڕاپەڕیون و خواپەرستی و تەکپەرستی ڕاستەقینەیان هێناوەتە کایەوە و خەڵکیان بۆلای ئایینی بێخەوشی ئیسلام ڕاکێشاوە و گش خواگەلی پوشالییان پێفڕێداون و هەروەها تێیان گەیاندوون کە چۆن بەندەگی خوای گەورە بکەن. وەک هۆنەری کوردی دەڵێ:

گش خواگەلی پۆشالی بێ نێوەرۆک و خالی
بە نووکی شەق تێم هەڵدان هەرکە لێیان بووم حالی

جا بەڕاستی من ڕام وایە مامۆستا کۆیی لە چاخی خۆی‌دا لە خەڵکی دی ڕوکبێژتر بووە و لە هیچ کەسی نەپێچاوەتەوە و ئەوەی هەق و ڕەقوورەدا و ڕاستەقینە بووە گوتوویەتی و نووسیویەتی جا یا بە هۆنراوە یا بە وێژامە کاتێک کە پیاو هۆنراوە ئاگرینەکانی ئەو بەڕێزە دەخوێنێتەوە و لە ڕوانگەی هەقوێژییەوە سەرنجێکی ژیرانەی دەداتێ وای دێتە بەرچاوی خەیاڵ، کە هەر دەڵێی ئەو بەڕێزە فەرماندەیەکی زۆر لێزانی سوپایی و شەڕکەرێکی کارامەیە و لێی سواری فڕۆکەی زانیاری و ئاییندراری بووە و چۆتە حەوا و ئیتر زۆر بە سرنج و تێبینییەکی تەواوەوە بەڵام خەست و شێلگیرانە هەموو بنکە و پایەگاکانی دوژمنی دین بۆمباران دەکا و قەت نایهەوێ تاقمێکیش لە سوپای دوژمن دەربچێ.!!

بەڵام بۆمبارانەکەی ئەوەندە لێزانانە و بەسرنج و وردبینانەیە کە هەرگیز و هەرگیز تاقە موسڵمانێکی ڕاستەقینەش وەبەرنایە و بەحاڵ و دوبەلاش نای‌گرێتەوە!! تەواوی هۆنراوە و نوسراوەکانی بگەڕێی و هەموو قوژبنەکانیان بپشکنی بە ئەندازەی سەری دەرزییەشت شتێکی نەیار لەگەڵ ئایینی پیرۆزی ئیسلام و ژیریی و

زاڵیاری دەسناکەوێ و لە هیچ جێگایەک بۆنی بێدینییەیان لێنایەت و هەمووی هەر بۆن و بەرامەی تەکپەرستی و خەڵک ویستی و خوا مەبەستی و پارێزگاری بە هەر چوارلای خۆیدا بڵاو دەکاتەوە.

مەبەستە پڕ هەستەکانی مامۆستا و هەڵبەستە هەستیارانەکانی موسڵمانی خاوەن هەست و مەست دەکەن و خوا نەبێ هەموو شتێکی لەبیر دەبەنەوە، هەر کەس هۆنراوە و نووسراوەکانی مامۆستا بە سرنجێکی پاکەوە بخوێنێتەوە بێگومان دەبێتە خوا ناسێکی گەورەو تەکپەرستێکی ڕاستەقینە و مرۆڤێکی خاوەن خیرەت و پیاوەتی و ژیر و هەرگیز لە دوژمن سڵ ناکا و سەر بۆ خوا نەبێ بۆ هیچ کەس نەوی ناکات.

هۆنراوە بەسۆزەکانی ئەو بەڕێزە مرۆڤ هان دەدەن بۆ خیرەت و شەڕافەت و مەردانەگی و هەستی پاکی ئایینی و نەتەوایەتی دەیبەنە سەر ڕێبازی ئازادی و ڕزگاریخوازی و بێگومان ڕایدەپەڕێنن بۆ خەباتی خوایی و خزمەت و ڕاژەی گەل و نیشتمان.

جا هەربۆیە من لاموایە پێویستە لەسەر هەموو کوردێکی باوەڕدار و تەنانەت بگرە بێباوەڕیش لە ساڵیدا چەنجار هۆنراوە جوانەکانی مامۆستا بخوێنێتەوە ئەگەر لەبەریشی نەبن.

مامۆستای گەورە هەرگیز وەک ئەو کەمە مەلا خۆفرۆشانە نەبووە کە هەم لە پیکێش دەدەن و هەم لە ماپیکێش لەگەڵ گورگی کەلاکی دەخۆن و لەگەڵ مەڕیش شینێ دەکەن!! بۆ پیری دەسەڵاتداری ستەمکار دەس بە سینگییەوە دەنێن و بە ڕواڵەت بۆ هەژار و ستەملێکراوەکانیش دەگرین!! خەڵکی بۆ شێخ کەر دەکەن و دەیاننێرنە تەکییەو خانە گایان و دەشزانن کە تاوانە!! ئایەتی (والارض وضعها للأنام) واتا خوا زەمینی بۆو خەڵکە داناوە)

دەخوێننەوە و قەباڵەی تاپۆی شەشدانگی زەمین و ئاسمان و دار و بەرد و ژێر زەوی و سەر زەویش بۆ ئاغاواتە زگزل و ستەمکارەکان دەنووسن و مۆری دەکەن!! مامۆستای گەورەمان ئازادیخوازێکی ئیسلامی بووە کە دەیهەویست گەلی کوردیش وەکوو گەلانی دیکەی جیهان بژیت و چیدیکە زۆر و ستەمی لێنەکرێ و هەرگیزاو هەرگیزیش نەیدەویست کە کورد لە ڕێبازی پاکی ئیسلام لابدا. یان لابدرێ. چونکە لە قوڵایی دڵەوە پێیوابوو کە ڕێبازێک کە بتوانێ گەلانی جیهان ڕزگار بکا تەنیا ئیسلامە. ئەو ڕێزدارەی دەیوست کورد کە پێشێ لە پێشەوەی هەموو گەلانی دیکەی جیهان بووە ئێستاکەش دووبارە وەخۆ کەوێتەوە لانی کەم بێتەوە ڕیزی گەلان. ئەگەر نەشتوانێ لێیان پێشکەوێ.

مامۆستای گەورەمان ڕەحمەتی خوای گەورەی لێ بێ نووسراوەی یەکجار زۆرە بەڵام بە داخەوە نە هەموویان چاپ کراون و نە تەنانەت هەمووشیان خڕ کراونەتەوە، جا من لام وا نییە کە ئەوە هۆیەکەی بێ کەسی مامۆستایە بەڵکەم پێم وایە هۆی بێ کەسی گەلی کوردە، چونکە کورد ئەگەر کەسێکی هەبێ ئەو کەسە کەسی مامۆستایە و ئیتر هەر وەک مامۆستا گوتەنی: لەبەر بێ خاوەنی پاکی خەسار بوو ئەگەر میراودەلی بوو گەر هەماوەند زۆرێک لە کتێبەکانی مامۆستا هەر بگرە لە نێولیزگەی کتێبەکانیشیدا ناویان نەنووسیون و من لەوانە سێ دانەیانم ساخ کردۆتەوە کە بریتین لە ١- راقە (شرح)ێکی دوور و درێژ و باش و جوان لە سەر پەڕتووکی تصریفی مەلا عەلی بە زمانی عەرەبی کە بەڕێز چاپەمەنی جەوانبەختی بانێ بە تازەگی چاپی کردووە. خودا پاداشی بداتەوە ٢- طلاق الاکراد کتێبێکی چکۆلەو ژیکەڵەیە و لەمەڕ تەڵاق خواردن و جۆری تەڵاق کەوتن یا نەکەوتنی تەڵاقی کوردانەوە کە ئەوەش هەر بە زمانی عەرەبییە ٣- قەل فڕی و قەلەڕەشە لە جێ، کە ئەوەشی

لەبارەی ئەوەیەوە نووسیویوە کە شێخێک دەمرێ و بەڵام واش خەڵکی هەر رزگار نابن، چونکە کوڕەکەی یان خزمێکی نزیکی ویان لە جێ داناوە و ئیتر راستە کە قەل فڕیوە بەڵام قەلە رەشەیان لە جێ داناوە و کارەکە هەر وەکوو خۆیەتی!!جا دیارە هۆنراوەکانیشی هەر وەک نووسراوەکانی دیکەی هەرگیز بە تەواوی خڕ نەکراونەتەوەو ڕەنگە لەومیانەشدا گەلێکیان شرت و گوم ببن و هیچ دوور نییە هێندێکیان هەر بە ئەنقەست لە ناو برابن!!جا منیش بۆ پەیدا کردنی هۆنراوەکانی ئەو بلیمەتە گەلێکم هەوڵ داوە و بە تەنیا دەستم لە دوو سەرچاوەی چووکە گیر بووە. یەکیان دیاری مەلای کۆیی کە بەڕێز گیوی موکوریانی لە چاپخانەی خۆی (چاپخانەی کوردستان) چاپی کردووە و خستوویەتە بەر دەستی خوێنەران، و یەکیشیان دەسنووسە کۆنەکان و سینە فراوانەکان و مێشکە روونەکانی پیرە پیاو و کۆنە مەلایانی کورد بوو کەڵکێکی زۆر زۆرم لە هەر دووکیان وەرگرتووە و ڕاستی هەردووکیانم گەلێک لە لا گرینگ بوو گەلێک جێگای وەها هەبوون کە لە یەکیان دادەبوو لەوی دیکە دانا و بە پێچەوانەش. منیش ئەوانم بە یەکتر تەواو دەکرد کە بە پێویستی دەزانم سوپاسی هەستی بێ خەوشی خۆم پێشکەش بە هەر دوو لا بکەم و لە خوای گەورە بپاڕێمەوە کە پاداشی باشیان بداتەوە و لە بەزە و مێهری زۆری خۆی بێ بەشیان نەکات.

ئەو کتێبەم ناو ناوە بە کوڵی دڵی مەلای کۆیی و لە ماکیشا کوڵی دڵی هەر کوردێکی خاوەن باوەڕ و هەستیار و بەشەڕەفە کە لە ناو مەنجەڵی دڵی مەلای گەورەدا زڵق زڵق کوڵیوە. کوڵی دڵی مەلای کۆیی لە ڕاستیدا هەستی هەستیاران و هۆشی هۆشیاران و بیری بیرداران و ژیری و ئاوەزی ژیرۆمەندانی خواپەرستی کوردەوارییە. ڕاز و ڕیئۆنی ژیناوەری کوردی ستەمکێش و هەژارە،

دەردە دژوارو سەختەکانی گەلی زۆر لێکراوی کورد کە مامۆستای گەورە لە کوڵە دڵەکانی خۆیدا دەری خستوون و بە کوردەکانی راگەیاندوون دەردەخا و کوڵی دڵی نووسەریش هەر ئاوێتەی کوڵی دڵی مامۆستا دەکا، ئاوێکی کوڵهاتەی لە سەر گەرمای بالاتر لە سەد پلە وە پاڵ ئاوێکی کوڵهاتەی تر دەگێڕێ و هەر بە هەڵمەتووکەکەی چاوی دوژمنانی کورد کوێر دەکات، کوردی هەژارو بێچارە لە دەردی خۆی بە چاکی حاڵی دەکا و پێشی دەڵێ کە دەرمانەکەی چییە و لە کوێ دەس دەکەوێ.

جا لە کتێبی کوڵی دڵی مەلای کۆییدا هێناومە ژیاننامە و بەسەرهاتی چەندین ناوداری کورد و ناکوردیشم نووسیوە، هەر وەها مێژووی ژیان و سەربردەی چەندین پادشا و پیاوی گەورەی کورد و ناکوردیشم تا رادەیەک بە درێژی باس کردووە و کتێبەکەم پێ رازاندۆتەوە.

بە کوردی کوڵی دڵی مەلا دەریایەکە کە هەروا شەپۆلان دەداو هەر شەپۆڵەی لە شێوێک راو هەر بڵقەی لە زڵقێک و هەر زڵقەی لە قوڵتێک و هەر قوڵتەی لە قۆپەنێک را دێت. کەشکۆڵێکە لە گوێن سندوقی چەرچی کە هەموو جۆرە وردەواڵەیەکی تێدایە و هەر سەری هەڵبگری و لێکی بکەیەوە و بۆن و بەرامەکەی پیاو مەست دەکا. بەڵام بێ گومان هەموو کەس ڕەنگە بە چێژگە(مذاق)ی نەخواو خۆی لە بەرابەر بۆن و بەرامە خۆش و جۆراوجۆرەکەی رانەگرێ، کە ئەمەش هەرگیز بە مانای خەراپی کتێبەکە و مەبەستەکانی ئەو نییە.

جا لە خوێنەری خۆشەویست ئەخوازم کە بە سەرنجەوە بیخوێنێتەوە و بێ توێژکاری و لێکۆڵینەوە و وردەکارییەکی زۆر چاک و بێ لایەنانە و دادگەرانە بڕیاری نادادگەرانەی لەسەر نەدا و لە خۆڕایی نەمشکێنێ چونکە منیش هەر ئەوم و ئەویش منە و

کەوایە هەر خـۆی دەشـکێنێ. بەڵام زۆرم پـێ خۆشـە کە رەخـنەی سـازێنەر و بەجـێم لـێ بگـرێ و لە هەڵان بمهێنێـتەوە سـەر رێـیە. پێغەمـبەری خۆشەویـستمان) دەفەرمـوێ: "المـؤمن مـرآة المـؤمن" باوەڕدار هاوێنەی باوەڕدارە و دەبێ نەنگەکانی پێ بڵێ.

ئـــاوێنە کە چـــووی بە نـــاو دڵـــی گوشـــادی
هەر نەنگـــێ لە تـــۆ کە ئەو ببێـــتە دە یـــادی
دەیلێـــت بە تـــۆ کە دڵـــسۆزە دەســـا تـــۆش
گـــــورزی ئـــــاوا بە ئەگەر خـــــاوەنی دادی

خوشک وبرای خوشەویستم! نزیکەی پتر لە پێنج ساڵی ڕەبەق ئەو کتێبەم لەبەر دەستا بووە و دوو سێ جاری پێدا چـوومەتەوە. لە سـاڵی ١٣٧٢ی هەتـاوی ڕێکەوتـی ٢٦٩٣ی کـوردی لە گونـدی سەرچنار (کەلبی رەزاخان)ی ناوچەی چۆمی مەجیدخان دەستم پـێ کرد و لە مانگی گەلاوێژی ساڵی ١٣٧٨ی هەتاوی ڕێکەوتی ٢٧٠١ی مادی کوردی لە شاری مەهاباد شاری پێشەوا و بوداغ سوڵتان بە یاری خوای مەزن و بێ هاوتا تەواوم کرد.
بەڵام با ئەوەشت هەر پێ بڵێم ئەی خوێنەری خۆشەویست! کـارم لەو مـاوەدا تەنیـا هەر ئەوەنـدە نەبـووە و پێـت وا نەبـێ، کە ئـاوا تەمبەڵ و بێکارە بووم.

وێڕای پێدا چوونەوەو نووسینی ئەو کتێبە مەزنە پێدا چوونەوەو تۆژینەوەی سێ چوار کتێبی دیکەشم هەر دەس پـێ کردبـوو و کـارم تەنیا کوڵی دڵی مەلا نەبـوو. ئەگەرچـی خۆشـم ئەوەنـدەم کـوڵە دڵ هەبوون کە سەرم لێ شێوا بـوو، لەگەڵ کۆڵێـک کـوڵی دڵ و خەم و دەرد و پەژارە و تەنگدەستی ڕووبەڕوو بووم، کەرتێکم ژن و منـداڵی ناحـاڵی و بـێ گـوێ و نالەبـار هەبـوون و ژمـارەیەکی زۆر وردو هاژیش کە هەموو چاویان لە چاولێکەری بوو.

جا بەو حاڵەش و هەر لەو ماوەدا نووسین و پێدا چوونەوە و تایپی پەڕتووکی "ڕەخنە لەسەر کۆنگرەی سنە" و هەروەها پێدا چوونەوە و چاپ و بڵاو کردنەوەی کتێبەکانی"پەند و پێکەنین، گوڵسروودی گورژی" گوڵپەیامی گورژی"شم هەر بە کارێک لە کارەکانی خۆم دانابوون و زۆر سوپاس بۆ خوای گەورە سەرکەوتووی کردم.

دیارە خۆشت دەزانی کە ئەو ماوە قەیرانی ئابووری پشتی پیاوی دەشکاند، جا بە راستی، چونکە بە دڵێکی بێ کوڵ و خەیاڵێکی خاڵییەوە نەمنووسیوە، سەد لە سەد بێ نەنگ و کەم و کووڕی نییە و نابێ بشبێ. ئیتر لەوانەیە کە هەڵە و چەوت و ناتەواوی زۆر یا کەمی تێدا بن. بەڵام ئەمن ڕاشکاوانە دەیدرکێنم و بێ باکانە ڕایدەگەیەنم:

ئەگەر چاکە و ئەگەر چرووکە، گەر بە هەستە یا زۆر پەستە، ئەگەر خۆشە یا ناخۆشە، زۆر شیرینە یا زۆر تاڵە، کوتییە یا خۆ جندییە، زۆر بەرزە یا زۆر نەوییە، لەوەم چاتر لە لا نییە،چی دیم لە جانتادا نییە، هەر ئەوەندەم زانیاری هەس لەوەم پتر نایە لە دەس، تۆ سلێمان و من مێروولە تۆ شەمی و ئەمن پەپوولە، خۆم لە بلێسە و لە گرداوی لاقێکی کلۆم بۆ هێناوی، بە کورد یش پێت دەدەم بەڵێن پیر و پێشینەی کورد دە ڵێن، کا تێ کە دیاری قەسپ بێ، دەبێ شوند باری ئەسپ[1] بێ، چاوەڕوانی منیش لە تۆ،

---

١ . (دیاری و شوند یاری: هدیه و عطای مهدی الیه. لە کوردی شکاکیدا مەتەڵەیەک باوە کە دەڵێن: (ئەگەر دبا قەسپە شوندیاری حەسپە) واتا ئەگەر دیاری قەسپێک واتا خورمایەک بێ دەبێ پاداشی ئەو دیارییە ئەسپێک بێ. لە کوردی سۆرانیش نموونەی ئەوە هەیە کە دەڵێن (کەمی هێناوە بۆ زۆری، یا کەمی دێنێ بۆ زۆری) بەڵام وشەی (شوندیاری)⇐

موسڵمان و کورد بوونه خۆ، هه تا کو ده مری هه ر کورد به، دلێرو بویر ومەرد به، فێری خەبات و نەبەرد به، روسور به نەقەت ڕو زەرد به، پێش بونه خاکت خاکی به،هەمیشه لەگەڵ چاکی به، لەگەڵ خاوێنی و پاکی به،گورژیش له خوا داوا ئەکا، شەرمەندەی دواڕۆژمان نەکا، دا نمان نەبیتە پوش و کا، ڕێی ڕاستیمان لێ وون نەکا،به ولا و بەولامان دا نەدا، بمان باته سەر ڕێی ڕەدا، قەت نەپەرستین چەن خودا، له تەکپه ڕستین لا نەد ا، گه لی خۆما ن له بیر نەکا.

---

که به ما نای پاداشی د یارییه وشەیەکم له زاراوەی سۆردانی دا، که پڕ به پێستی وی بێ ،هەرچەند زۆر یشی بو گه ڕاوم وهه ولَیشم له دوا داوه نه د یتەوە.)

# سەرەتا

سوپاس و پەسن و ستایشی زۆر بۆ خودای گەورە و تاک و تەنیاو بینا و بیسەر و ئاگا و لێزان و هۆزان و راز زان و بۆگ و بەهێز و وەدیهێنەری بوونەوەر و مرێنەری ژینەوەر و ژینەوەری مردەوەر. خودای گەورەی وێژەوان و دێژەوانان و دۆستی دڵسۆزی باوەڕدار و موسڵمانان.

درورد و سڵاوی شایان و شیاوی خوای مەزن و پۆگ و زانا وێڕای درورد و سڵاوی گەرم و بەتینی ئێمەی لە ننک (سیفر) کەمتر لە سەر گیانی پاکی پێغەمبەری ئیسلام و یار و یاوەرانی و لە سەر گیانی بەسۆ و ژانی زاناکانی ئایینە پیرۆزەکەی بێت.

لە پاشان بە دڵێکی پڕ لە کوڵ و دەرد و پەژارە و دەروونێکی خەمبارەوە کۆیی ئاسایی دەڵێم:

ئەوەی زانـــــایە نـــــاو جەرگـــــی پەڵاســـــە
ئەوەی نـــــادانە نـــــازانێ چ باســـــە

لە گێڕانەویەکدا ئاوا هاتووە کە لە کاتی کۆچی دوایی پێغەمبەردا هەموو دار و درەخت و شیناوەردێک جگە لە داری سنجوو لە تاوان گەڵای پێوە نەما. گوتیان ئەی سنجوو تۆ چۆنە گەڵایەکت لێ نەوەریوە؟ گوتی: چاو لە دەرونم کەن کە هەمووی سووتاوە و ڕەش هەڵگەڕاوە...

خـوای گەورە لـە قورئـانی پیـرۆزدا دەفەرمـوێ : ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَٰكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَىٰ وَجَعَلْنَٰكُمْ شُعُوبًا وَقَبَآئِلَ لِتَعَارَفُوٓاْ ۚ إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ ٱللَّهِ أَتْقَىٰكُمْ﴾ ئەی خەڵکینە بێ گومان ئێوەمان دروست کـردووە لـە نێـر و مێیەک واتـا ئـادەم و حەووا و گێڕاومـانن بە چەنـدین گەل و هـۆزو تیرە و دەستە تا یەکتر بناسن و بناسنەوە و ڕێز لە یەکتـر بگـرن و مافی یەکتـر بناسـن و هیچکامێکتـان مـافی هـیچ کـامێکی دی پـێشێل نەکا و بشزانن کە ڕێـز و گەورەیـی ئێـوە تەنیـا بە خـوا پەرسـتی و پارێزگارییە. نەک بە دەسـەڵاتی زۆر و هێـز و مـاڵ و سـامان و ئەو جۆرە شتانە کە وایە بە پێی یاسـا و دەسـتووری خـوا هـیچ گەلێـک مافی چەوسـاندنەوەی گەلێکی دیکەی نییە و نـابێ خۆشـی پـێ لە گەلانی دیکە گەورەتر بێ بەڵکە خۆی دەفەرمـوێ: ﴿إِنَّمَا ٱلْمُؤْمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُواْ بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ﴾ واتـا موسـوڵمانان و بـاوەڕداران هەمـوویـان پێکەوە بران و دیـارە برایـانیش دڵـسۆزی یەکتـرن و هەرگیـز مـافی یەکتر پێشێل ناکەن. جا کەوایە ئەی خەڵکینە خۆتان ئیسلاح کەن و بەرژەوەندی بکەن لـە نێوان برایـانی خۆتـان و هەرچـی بە قـازانجی وانە بـیکەن و ئەنجـامی بـدەن و دژایەتـی و دووبەرەکـایەتی و نەیارییەتی لـە نێو خۆتـان ڕەگبڕ کەن.

بەڵام بە داخـی گـرانەوە هەر بـرا موسـڵمانەکانی گەلـی کـورد بە پێچەوانەی هەموو یاسـایەکی یەزدانـی و مرۆڤـایەتی هەر حاشـا لە بوونیشی دەکەن هەتا دەگا بە ناسین و پێ لێنانی مافی ڕەوای! یان ڕێز بۆ دانانی!!

جا بۆیە هۆنەری کورد هێمن دەڵێ:

شـــیوەنی مـــن شـــینی کـــوردی بێبەشـــە
ئەو گەلەی حاشـــا دەکەن لێـــی و هەشـــە

شــــــیوەنی مــــــن شــــــیوەنی ئینـــــسانییە
بــــانگی ئـــــازادی و گــــــڕووی یەکـــــسانییە

ئەوەیە یەکە زانایانی ئیسلام ناس و یەکخواپەرستی وەکوو مامۆستای کوردی کۆیی کاتێک ئەو هەموو جیاوازی و لادان لە ڕەداو ڕاستەقینەیان چاو پێ کەوتووە و ئەو هەموو بێ خوایی و خواری و خەراپکارییەیان دیتووە بە جارێ دڵیان وە کوڵ هاتووە و هاواریان لێ بەرز بۆتەوە و بەسەر نەیارانی خۆیاندا قیژاندوویانەو تێیان راخوڕیون کە لە ئیسلام لایان داوە و یاسای مرۆڤایەتیشیان پێشێل کردووە. ئیسلام هەموو موسڵمانان بە برای یەک دادەنێ و دەڵێ نابێ یەکتر وەچەوسێنن. ئەوەتا مامۆستای کۆیی لە داخان و لە تاوان و لە رزەتان نازانێ چ بکا و ناچار روو دە کوردەکان دەکا و پێیان دەڵێ:

مــــــن یەخەی خـــــۆم لە بــــــۆیە دائەدڕم
ئێـــــوە نــــابن بە هــــیچ و مــــن دەمـــــرم
دەبــــێ مــــن کەیفــــی چــیم بە دنیـــا بـــێ
قەومــــــی مــــن وا رەزیــــــل و ریــــسوا بــــێ
بــــــێکەس و بێــــــدەر و فەقیـــــــر و هەژار
بــــێ ســــەر و ســـــەرفراز و بــــێ ســـــەردار
ئەوەی رێـــــــگەی لە کوردەکـــــان گـــــۆڕی
لەعنەتــــــی خـــــوا لە ئەلـــــحەد و گـــــۆڕی
رەببــــــی هەرکەس کە دوژمنــــــی کــــورد بــــێ
چــــاوی بــــا دەرپەڕێ و ملــــــی ورد بـــــێ
میللەتــــــی کــــورد فەقیـــــر و بەســــــتەزمانی
بە قــــسەی ئەو کەســــانە چــــۆن خەڵەتـــــان

هەروەهـا لـە دڵێکـی پـڕ دەرد و پەژارە و داخ و کەسـەرەوە و بە هەناسە ساردییەوە دەڵێ:

هەتـــا دەمـــرم لە بـــۆ کـــوردان دەنـــاڵم
عیلاجیـــان چـــۆن بـــکەم هـــاوار بە مـــاڵم؟
فەقیـــــر و جاهیـــــل و نەخوێنـــــدەوارن
لە لای نەوعـــی بەشـــەر بـــێ قەدرو خـــوارن

یـان کاتێـک کە دەبینـێ گەلێـک شـتی پڕوپووچیـان لە ئـایینی پێغەمـبەر زیـاد کـردووە و دامودەزگـایەکی پـان و بەریـن و بەرفراوانیان بە نێوی شێخ و شێخایەتی و تەریقەت ساز کردووە کە لە بنـی ڕا دژی ئیـسلام و یاسـاکانی پێـشکەوتن خـوازی ئیسلامیشە،ڕوو لە هەمو پەیڕەوانی پێغەمبەر دەکاو بانگ رادێڵێ و دەڵێ:

وەرن ئەی ئـــوممەتی خیـــر البـــریە
لە پـــاش تەقـــدیمی ئـــیخلاس و تەحیـــیە
بە عـــیلم و عەقـــڵ و هـــۆش و فیکـــر و عیرفـــان
بە قەولـــی مـــستەفا و ئایـــاتی قورئـــان
بـــزانن ئەو قـــسانە پـــاکی پـــووچن
ئەگەر خوامـــان هەبـــێ ئەقتـــاب لە بـــۆ چـــن؟!
بە قەولـــی جـــاهیلان خۆتـــان مەگـــۆڕن
بە چـــاوی دڵ لە دنیـــایە بنـــۆڕن

مامۆستای بەڕێزمان دڵی گەورە وبەرینـی ئەوەنـدە لە کـوڵ و لە جۆش بـووە کە وەک مەنجەڵـی سـەرگرەپێچەی تەنـدووری نێڵدراو هەر زڵقـی داوە و قژقـژ کوڵیـوە و راسـتە کە زۆرینـەی هـاواری بـۆ

گەلی هەژار و زۆر لێکراوی کورد بووە بەڵام هەرگیز زۆر لێکراوانی دیکەشی فەرامۆش نەکردووە و هاواری ئیسلامیشی بە گوێی هەمووان‌دا داوە.

ئەو لە دژی هەموو جۆرە پڕوپووچ پەرستی و خەرافات و درۆ و دوو روویيەک راپەڕیوە. بێ گومان ئەگەر بلیمەت و هۆزانە دڵسۆزەکانی وەک ئەو بەڕێزە و دەیان و سەدانی وەک بەڕێز موفتی زەهاوی و شێخ مەعرووفی نۆدێیی و.. نەبان و بەو جۆرە لە دژی ئەو پڕوپووچ پەرستییەی کەوا بە نێوی تەریقەت و شێخایەتی لە وڵاتی کوردستان‌دا بڵاویان کردۆتەوە رانەپەڕیبان، رەنگ بو ئێستا ئێمە کوردستانمان ئاوا بە تەکپەرست (موحد) نەدیتبایە و یا هەر بە یەکجاری لە ڕێبازی ئیسلام لا دەدرا، یان شێتکیان بە نێوی ئیسلام بە گەرووی کورددا دەکرد، کە هیچ مافێکی بە ئیسلامەوە نەبایە.

خودا پاداشی ئەو کەڵە پیاوو با شقە مەلایانە بداتەوە، کە وەک شێر لە بەرابەر هەموو جۆرە خورافات و ناڕە وایی وپڕوپووچ پەرستییەک دا ڕاوەستان و وە کیو چەقین ملیان دەبەر ملی نا و چۆکیان پێ دادان و نەیانهێشت بە تەواوی ڕیشە لەو وڵاتە پیرۆزە دابکوتێ.

ئەگەر چی نەیاران و دوژمنانی ئەم ئاینە پیرۆ زەو تە پرەشانی ئەو گەل و هۆزە بەهەمو هێز وتوانایی خۆیان وەخۆ کەوتوون و ئەو پەڕی خەبا ت وتێکوشانی خۆیان لەو ڕێگە نا پیروزەدا بەئەو پەڕی خۆی گەیاندووە و هەمو زلهێزەچە وسێنەر و خویمژو گەل خورەکانێش پشتیوانی هەمەلایەنەیان لێ کردون، بەڵام بەفەر مودەی ڕیزادر سەعدی شیرازی:

چە غم دیوار امت را کە باشد چون تو پشتیبان
چە باک از مو ج بحران را کە باشد نوح کشتیبان

ڕاستی تا کەڵـە پیـاوان و باشـقە مەلایـانی وەک مەلای کویەمـان هەبن هەرگیز مەترسی ئەو چەقڵ و گورگانەمان لەدڵدا نابی، بەڵام بە هەزاران داخی گرانەوە ئەورۆ گەلێک کوڵکە مەلا ی وامان

خوابە زیادیـان نەکا کـە لەبەر نەزانـی خۆیـان پێیـان وایـە جە نابی شێخ کلیلی بەهەشتیی لە گیرفانی دایەوبۆ هەر کەس کە خـۆی خوشی بوی وپتر پوڵ ومالْ و شتی بۆ هێنابی(واتا چاکتری بـۆ کەر ببێ) دەرکە کە هەڵدە گری و هەبەپیلی دەژ وریی داوی.

مامۆستا گوتەنی:

مـەلایـەکیـــان هەیـــە سـنـــدانی لـێـــدا
نـەخـوێنـــد وو ئەحەمەق و گـــەوج و نـەزانـــە
نـــە وەکـــو کـــەر گـــەر ئـــەخوا دا یم لەدی دا
بەریـشی پـان دەلێـی مامـــی جـــوا نـــە
ئەو یـش بـو بـو شـێخ وەکـو کەلبـی موعەللـە م
بـــەدەم کەروێـــشکی بـــو دەگـــری لـــە لا نـــە
ئەلـــێ تـــوبە بـکەن لای شـێخ بـە گـو رجـــی
قییـــامەت ڕادەبـــێ هـــەر بەو زووانـــــە

# پێشەکی

شتێکی سروشتییە و زانایان و بە تایبەتی مێژووزانان قەبووڵیانە و دەیسەلمێنن کە هەر گەلێکی ئاگای لە ڕابردووی خۆی نەبێ بە داهاتووی خۆشی هیوادار نابێ.

ڕابردوو ئاوێنەیەکی باڵانوێنە بۆ ئێستا و داهاتوو، نەنگ و ناتەواوییەکان نیشان دەدا و دەیانخاتە ڕوو و خاڵە لاواز و بەهێزەکان دەس نیشان دەکا. هەر وەک کە ئاوێنە نەنگ و ناتەواوی و نالەباری و ناڕێکوپێکییەکان بۆ کابرا دەردەخات.

جا ئێمەی گەلی کوردی هەژاریش ئەگەر ئاوڕێک لە ڕابردووی خۆمان بدەینەوە و لاپەڕە زێڕین و ڕەنگاوییەکانی مێژووی گەلە بەش خوراو و خەباتکارەکەمان بخوێنینەوە و چاوێک بخشێنین بە دێڕەکانی دیرۆکی نەتەوە چەوسێنراوەکەماندا، بۆمان دەردەکەوێ کە گەلی هەژاری کوردمان لەگەڵ ئەو هەموو ستەمە چەند قاتییەش کە لە سەری بووە و، تا ئێستا لانی کەم بە پێنج دەوڵەتی ستەمکارو دڕندە کوتاویانە و سەرکوتیان کردووە و چەوساندوویانەتەوە و ویستوویانە بە تەواوی نیخەپەستی بکەن و ئیتر بە هیچ جۆرێک نەیانهێشتووە سەر هەڵبێنێ، بەڵام بە هەق توانیویەتی نەک هەر تەنیا سەری خۆی رابگرێ و بەس، بەڵکە توانیویەتی شان بە شانی گەلانی ئازاد و زیندوو و پێشکەوتووی جیهان کاروانی خەبات بئاژوێنێ و بیگەیەنێتە گۆڕەپانی شارستانییەت و پێشکەوتن و زانست و زانیاری و لە بەستێنەکانی وێژەیی، مێژوویی، هۆنەری، ئایینی، ڕامیاری، هونەری و هونەر پەروەری هتددا ڕقە و قینە و ململانەی لەگەڵ گەلە ئازاد و رزگار و

خودا پێداوەکانی جیهان کردووە و لەو بەزێنە(مسابقە)شدا گەلێکیانی بەزاندووە و لە هەورازی ڕێباز و ڕەوەز و ڕازی ژیان بە جێی هێشتوون و زۆریشیان هەر نەیانتوانیوە تۆزیشی بشکێنن و گەلێکیشیان بە لەقە لەق و هانکە هانک لە قەدی پا لا پاڵیان داوەتەوە و زۆریشیان بە شەکەژۆیی خۆیان گەیاندۆتێ یا نەگەیاندۆتێ.

جا لە ڕاستیدا ئەو هەموو شانازییە گەورە کە بۆ گەلەکەمان تاپۆ کراوە تا ئێستا و بگرە ئێستاشی لەگەڵ بێ هەمووی هەر لە قوژبنی ئەو کۆنە حوجرانە، ئەو فێرگە ئایینیانە، ئەو زانکۆ خۆماڵییانە، ئەو زانستگا خەڵکییانە هەڵقوڵیوە کە بە وردکە نانی ئیشک و بێ پێخۆری هەژار و دەستەنگەکانی گەلی موسڵمانی کورد ڕاگیراون، کە گەلانی دیکەی جیهان لەو زانکۆ خەڵکییانە بێبەش و بەهرەن و ئیتر ئەوانە تایبەتی نەتەوەی موسڵمانی کوردن. هەرچەند لە سەدەی بیستەمدا شێوە و چۆنیەتی ئەو حوجرانە زۆر پێویستە بگۆڕدرێ و بخرێتە سەر بارێکی پێشکەوتووانەی تر و باشتر و لەبارتر، چونکە ئەو شێوە و چۆنیەتییە لەگەڵ ئەو چاخە بووز ناخوا، بەڵام ئێمە دەبێ مەمنوونی ئەو کەسانە بین کە ئەو ڕێیەیان لە پێشدا بۆ گەلەکەمان کێشاوە و ئیتر یاخوا هەزاران درووود و بەزەیی و ڕەحمەتی خوایی لەسەر گیانی پاکیان بێ و خوای گەورە و خاوەن بەزەیی بیانخاتە بەر بارانی بەزە و مێهر و دروودی خۆی، پێغەمبەری مەزنیش دەفەرموێ: (من سنّ سنةً حسنةً فله أجرها و أجر من عمل بها الى يوم القيامة)، هەرکەس شوێنێکی باش بۆ خەڵکی بکێشێ بە قەد خێری خۆی و هەموو ئەو کەسانەی کاری لەسەر دەکەن خێری هەیە هەتا ڕۆژی پەسڵانێ...

بێ گومان ئەو فێرگە ئایینیانە کە پەروەرشگای لاوان و گەنجانی فەقێن لەسەر تاسەری کوردستانی گەورەدا بوونەتە هۆی سەرەکی و بنەڕەتی راگیر بوون و راوەستانی رایەڵ و پۆی تەونی گەل و پەرە پێدانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لەو وڵاتەدا.

بۆ پایەدار بوون و ڕاوەستانی هەر گەلێک هۆشیاری و ژیریی و بێداری و لێزانی و ڕامیاری ئەندامانی ئەو گەلە پێویستە و لاوانی کرچ و کاڵی گەلیش بۆ گەیشتن بەو پلە و پایە لە هەر بابەت و بەستێنێک و لە هەر لایەنێکی کۆمەڵایەتییەوە پێویستیان بە ڕێنوێنی و ڕابەرایەتی و شارەزایەتی هەیە، کە ئەو ڕابەرو ڕێنوێن و شارەزایانەش لە نێو کورداندا تەنیا و تەنیا لەو کۆنە حجرانەدا پێگەیشتوون.

دەتوانین بۆ نموونە هێما(اشارە) بە دەیان و سەدانی وەک مامۆستا ابن الحاجب، ابن قوتەیبە دینەوەری، سوهرەوەردی، ابن خلکان، ابن الحاج، مەلا عبداللە بێتوشی، یوسفی ئەسەم، شنۆیی، شکاکی کوردی و هەروەها دەیان وەک شێخ سەعیدی پیران، شێخ مەحموودی نەمر، شێخ عەبدولسەلام بارزانی، کاک ئەحمەدی شێخ ، مەلا عەبدولقادری گەیلانی و قازی محەمەدی پێشەوا و مەلا مستەفای بارزانی و مەلا ئاوارە و هتد بکەین.

سەردەمێک بووە، کە لە تەواوی ئەو کوردستانە پان و بەرین و بەربڵاوەدا نە فێرگە و خوێندنگەیەک هەبووە و نە زانکۆ و زانستگاو نە میرییە چەپەڵکانی دەسەڵاتداریش ویستوویانە لاوانی کوردەواری فێری زانست و زانیاری و خوێندن و خوێندەواری ببن و نە هێشتووشیانە!!

خۆ ئاغاوات و دەرەبەگ و شێخ و خەلیفە و کوێخا و گزیریش هەر یەکەی لەبەر خۆیەوە لەمپەرێکی گەورە و ڕێگرێکی بەدەسەڵات بووە لە سەر ئەو ڕێگا پیرۆزە. ئەوە لە لایەک و لە لای تریش

ئەگەر سەرنجێک بدەینە حاڵ و ژیواری کوردی هەژار کە بە درێژایی مێژوو و بە پێنج دەوڵەتی گەورە و بێ بەزە بە سەریاندا داوە و چەوساندوویانەتەوە و تەنانەت رێگەی خوێندنیان بە زمانەکەی خۆشی هەر پێ جا نەداوە بۆمان دەردەکەوێ کە هەم گەلی کورد گەلێکی نەبەز و تێکۆشەر و خۆڕاگرە و هەم مەلاکانیش دەوری سەرەکی خۆیان لە مەیدانی خەبات و خۆڕاگریدا دیتووە و رۆڵی خۆیان بازی کردووە کە تا ئێستا نەیانهێشتووە ئەو گەلە بێ سەواد و نەخوێندەوارە نەک هەر رامیاری نەیاران شوێن و چەخەری بخاتە سەر و خۆی لە ئامێزی دوژمن باوێ بەڵکە زۆر بە سەرسەختی بەرهەڵست و بەربەرەکانیشی کردووە.

بە ڕاستیش گەلێک کەڵە پیاوی وەک خانی و جەزیری و مەلا سەلیمی دەرسیمی و مەلای کۆیی و حاجی قادری کۆیی و نالی و شێخ مارفی نۆدێی و مەلا خەلیلی گۆڕۆمەری و هتد بێ هەر ئەو چاوەڕوانییەی لێ دەکرێ و بەس.

هەر بۆیە بە ڕاشکاوی و دڵنیاییەکی تەواوە دەڵێم ئەو کۆنە حوجرانە رەگ و ریشەیان لە ناو جەرگ و هەناوی گەلی موسڵمانی کورددایەو گوڵی دڵی خاوەن هەست و بەهێزو پاراوی گەلی کوردن و ئەرکێکی یەکجار زۆریان لە سەر شانی گەلی کورد هەیە و ئیتر هەرگیز هەوڵ و تەقەلای بێ ئایین و خوا نەناسان و نەتەویە بێ نەتەوە و نەتەوە نەناسەکان بۆ بڕاندنەوە و لە ناو بردنی ئەو حوجرانە بە ئاکام ناگا و لە راستیدا سەگ بە ئەستێران وەڕینە.

خۆماڵییانە بوونی ئەو فێرگە خەڵکییانە و هەروەها رەسەنی بوونیان بۆتە هۆی ئەوە کە هیچ رامیارییەکی لاوەکی و هیچ بیر و باوەڕێکی بێگانە پەرستانە و هیچ سۆزێکی کۆنە پەرستانە نەتوانێ لێیان وەژوور بکەوێ و شوێنەواریان لە سەر دابنێ و بەرەو هەستێکی نائیسلامییانە و ناخۆماڵییانە بیان ئاژوێنێ.

جا هەر بۆیە هەموو موسڵمانێکی کوردی تێگەیشتوو بە هەموو هێز و توانایی ئەنیوژەنی و بژۆنی(مادی و معنوی) خۆی بەرگری و پارێزگارییان لێ دەکا و بە گیان وماڵی خۆی رایاندەگرێ و دەیانپارێزێ، چونکە هیوای ئەوەی پێیانەکە هەزاران شێخ سەعیدو شێخ مەحموود و مەلا سەلیمی دەرسیمی و قازی پێشەوا و مەلا مستەفا بارزانی و ئاوارەی شەڵماشی دیکەشیان لێ سەر هەڵدەنەوەو بێنەوە مەیدانی خەبات و تێکۆشان و ئەوگەلە موسڵمانە بەپلە وپایەیەکی جیهانی و پەسلانی بگەیەنن و پێشیان کەون و لە هەورازی ژیان وەسەریان خەن.

ئەگەر ئەورۆ گەلی کورد لەکوردستانی دابەشکراودا بەو حاڵە شپرزەیەشیەوە لەگەڵ گەورەترین و زیندووترین و هۆشیارترین و پێشکەوتووترین گەلانی جیهان بەزێنە ململانە دەکاو هەمووشیان دەبەزێنێ و دەوەستێنێ و بە ڕێژە(نسبة)ی خۆی هیچیان تۆزیشی ناشکێنن!!

ئەگەر ئەورۆ ئەو کوردە هەژارە بەو هەموو هەژارییەشیەوە ئاڵای خەبات و وێژەی لە سەر لوتکەی هەرە بەرزی شارستانییەت و مرۆڤایەتی هەڵداوە و بە شنەی شەماڵی شانازی رۆژ و شەو دەشەکێتەوە و بە کوردی و بە کورتی ئەگەر ئەمرۆ کورد ماوە و خاوەنی بوونە، هەمووی هەر لە سایەی ئەو حوجرە قوڕینە و ئەو زانکۆ گڵینانە و ئەو فێرگە شڕانەوەیە کە دەتوانین بڵێین کانگای هەژاری و نەداری و چاوگەی دابینی (قناعة) و پاکی و پارێزگاری و خوا پەرستین.

ئەو حوجرە شڕانە ئەگەرچی بە رواڵەت زۆر چکۆڵە و خاپوور بوون و زۆرتر وەک کەلاوە دەچن نەک فێرگە و زانکۆ، بەڵام لە راستیدا کەڵە پیاو و زانای وەها گەورە و مەزنیان لێ هاتوونەتە دەرێ کە زۆر بەرزتر و باڵاتر و مەزنترن لە پسپۆڕانی پێگەیشتووی

زانکــۆ و زانــستگاکانی پێــشکەوتووترین وڵاتــانی ســەرکەوتووی جیهانی شارستانییەت و زانیاری.

ئەگەر بە چــاوێکی ڕەدا بینــانە تەماشــای مێــژووی رامیــاری، ئابووری، فەرهەنگی، ویژەیی، سوپایی، وەرزێڕی و تەنانەت بگرە پیشەسازی و ئەنـدازیاری و مەرەنگۆری و هتدی کوردی بکەی بـۆ چەند و چۆن دەیسەلمێنی و قەبوولی دەکەی کە سەرەتای هەموو ئەو هەودایــانە هەر لە حــوجرەی فەقێیــان ڕا هــاتووە و ئیتــر هەر کانگــای گەرم و پــڕ ئەوینــی حــوجرە قوڕینەکــانە کە تایبەتـدارە (مخــتص)ەکــانی هەمــوو ئەو رشــتە زانیارییــانەی لە باوەشــی پــڕ میهـری زانیارییــانەی خۆیـدا پێگەیانـدووە و بە چــاکی پەروەردەی کردووە.

لە کوردستاندا گەلێـک جـێگەی وەک کـۆیە و قەڵاچـواڵان بـنکە و پێگەی زانست و زانیاری بوون و بە هۆی هەبوونی حوجرە و مەلا و فەقێی زۆرەوە لە جیهاندا وەکوو کـۆتەراز و حەوتەوانەی ئاسمانێ درەوشــانەوە و وەک ئەســتێرە گەشــەکانی کاکێــشانەکان پڕشــنگیان هاویــشتووە و شــۆقیان وە هەمــوو لایەک داوە و هەر چــوار لای خۆیان بە تیرێژ و رووناکیی خۆیان رۆشن کردۆتەوە.

فەڕ و فیک و پیت و بەرەکەتی ئەو حـوجرانە ئەوەنـدە زۆر بـووە کە ئەگەرچی شاگرد و قوتابییەکان کەمیان خوێندووە بەڵام زۆریــان زانیــوە. ڕەدا بڵێــین و لە هەق دەر نەچــین کــورد و کوردســتان و تۆرەمەی کورد بـۆ هەتـا هەتـایە وامـداری ئەو کـۆنە حـوجرانەیە و لەوەتــا ئیــسلامی پیــرۆز هــاتۆتە کوردســتان و کــورد داواخــوازانە ئــامێزی بـۆ گرتـۆتەوە ئەو فێـرگە خۆماڵییــانە کە بە وردکە نــان و یارمەتی هەژارانەی کورد راگیراون گەورەترین پایەگا و بنکەی بـڵاو کردنەوەی ئەو ئایینە پیرۆزە بوون. ڕاستی هەروەکـوو ئامـاژەی بـۆ

کرا ئەو کۆنە حوجرانە کە هەتا سەدەی بسیتەمیش هەر رابەرایەتی گەلی کوردیان بە ئەستۆوە بووە و توانیویانە زۆر بە جوانی ڕێی پڕ لە کەند و کۆسپی خەباتی پێ ببڕن و جگە لە رامیاری و بیر و باوەڕی ئیسلامی و خۆماڵییانە هیچ جۆرە رامیاری و بیر و باوەڕێکی دیکەیان وە خۆ نەگرتووە و بێ گومان تازەش وەخۆی ناگرن، چونکە راست و درۆ و رەوا و ناڕەوا وا پێکەوە کۆ نابنەوە و ئیتر بێجگە لە دڵسۆزی و خاوێنی و پاکی و چاکی چی دیکە قبووڵ ناکەن. چونکە ئەوان کانگا و چاوگە و سەرچاوەی راستی و پاکی و بێگەردی و دڵسۆزی و ئایین و ئەوینن. جا هەر بۆیەش هەر لاوێکی کە لەم حوجرانەدا پێ بگاو پەروەردە بکرێ و مێشکی بە زانیارییە بەنرخەکانی ئایینی ئاو بدرێ و فێر کردن و راهێنان و بار هێنانەکانی لە دڵدا جێ گرتوو بێ لە هەموو کەس خۆماڵیتر، خاکیتر، خۆجێیی (محلی)تر و بێ خەیانەتتر، بێ مەترسی و بێ زیانترە و هەرگیز ناتوانێ بۆ ماڵی دنیا و پلە و پایە و ڕێزی رواڵەتی خیانەت بە خەڵک و ئایین و مرۆڤایەتی بکات و بە هەق دەتوانین بڵێین کە دڵسۆزی خەڵک و کۆیلەی پاکی خودایە.

ئەوەتا دەبینین، کە هەزاران زانای دڵسۆز و پایەبەرزی وەک مەلا عبدالرحمن پێنجوێنی، مەلا عەلی قزڵجی، مەلا ابن الصلاح شارەزووری، ابن الحاجبی سنجوەیی، مەلا یوسفی ئەصەمی سۆرانی بریسوەیی، مەلا عەبدولکەریمی بەرزنجی، مەلا ئەحمەدی گۆرانی، مەلا ئەحمەدی خانی، مەلای جزیری، مەلا عبدالرحمی مولوی تاوەگۆزی، مەلا شێخ عومەری قەرەداغی، ابن الحاجبی جێشانەیی، مەلا یەحیای مەزووری، مەلا عبدالله دم شکاو (پاراستی وەستا خاڵەیی)، مەلا حسێن پاراستی وەستا خاڵەیی، مەلا سلێمانی پاراستی وەستا خاڵەیی، مە محەمەدی پاراستی

وەستا خاڵەیی، مەلا خلیلی گۆڕۆمەری، مەلا رەسووڵی کەرمنداری، مەلا محەمەدی گرژاڵی، مەلا گچکەی هەولێری، حاجی مەلا قادری کۆیی، مەلا محەمەد کۆیی جەلیزادە، مەلا سەرداری سەرگەڵەیی، مەلا محەمەدئەمینی قەرەداغی، مەلا محەمەدئەمینی بێژوەیی (شێخەمین)، مەلا محەمەدئەمینی ماجیدی کوردی، مەلا شێخ مەحموودی زەنگنەیی، مەلا مەحموودی کۆیی، مەلا مەحموودی بێخود، مەلا خدری نالی، مەلا محەمەد قەسیمی سنەیی، شێخ خالیدی کوردی مەدینەیی، مەلا جەلالی گوڵ عەنبەری، مەلا شێخ مارفی نۆدێی، کاکە ئەحمەدی شێخ، شێخ مەحموودی نەمر، مەلا محەمەد سەلیمی ئەردەڵانی، مەلا محەمەد شەریفی شاهۆیی، مەلا محەمەدی کوڕی محەمەدی شارەزووی، مەلا محەمەد ابوالوفا تاج العارفین، مەلا سەعیدی تەختی مەریوانی، فرج الله زکی الکردی، مەلا حسێن مەجدی گەورکی، مەلا کەریم شاریکەندی، مەلا قاسمی کوردی، مەلا محەمەد قەسیمی عەلـلامە، مەلا عومەری سەردەشتی واشەمزینی، مەلا ئەحمەدی جەریحی واشەمزینی، مەلا عەلی ئامێدی، مەلا علی کرماشانی، مەلا عەلی سیف الدین ئامێدی، مەلا عەلی جەزەری، مەلا عەبدوڵڵا چزمانی، مەلا محەمەدی مەردۆخی کوردستانی، مەلا احمد ابن الرسول و هەزاران مەلای دیکەش کە بە هەق هەموویان جێگەی شانازی تەواوی گەلانی موسڵمانی جیهانن و گەلی کوردیش پێیانەوە دەنازێ لەو کۆنە حوجرانە سەریان هەڵداوە و هەموویان کۆرپەی نازی باوەشی گەرمی دایکی حوجرە قوڕینەکانن و لەوێدا پێگەیون و تێگەیون و خەڵکیشیان تێگەیاندوەو پێگەیاندووە و ئیتر هەر یەکەی بۆتە ئەستێرەیەکی پڕشنگدار و لە ئاسمانی فەرهەنگ و وێژەی کورد و ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا وەک گەلاوێژی بەیانان پڕشنگ داوێت و دەدرەوشێتەوە.

هەر کام لەو زانا بەرزانەی کە لەو کۆنە حوجرانەدا پێگەیون وەک چرایەکی بەهێزی تیشکەهاوێژە و لە تاریکستانی نەزانیدا کە خەڵک بە شۆق و رووناکی وی ڕێگای ژیان و خەبات و تێکۆشانی خۆیان بۆ جیهان و پەسڵان دۆزیوەتەوە.

جا دیارە یەکێک لەو هەزاران ئەستێرە پڕشنگدارانە و چرا تیشکە هاوێژانە و لەو زانا و دانا بەناوبانگانەی خاکی پاک و پیرۆزی کوردستانی خۆشەویست، بەڕێز مامۆستای هێژا و زانا و دانا و هۆزان و پیتۆڵ و پسپۆڕی کورد جەنابی مامۆستا مەلا محەمەدی ئەفەندیی کۆیی جەلیزادەیە.

یا خودا خودای مەزن لە میهر و بەزەیی خۆی وەک ڕێژنە بارانی بەهاری بە سەریدا بڕژێنێ و لە پەنای میهر و بەزەیی بێ پایانی خۆی لە بەهەشتی بەریندا نیشتەجێی بفەرموون. ئامین

زۆرم پێ خۆش بوو، کە لە بارەی ژیان و خەبات و تێکۆشانی هەر یەک لەو بلیمەتە بەرز و بەڕێز و پسپۆڕ و پیتۆڵە تێکۆشەرە و ئیسلام ناسە کوردانەدا پەرتووکێکی گەورە و تەواو بنووسم و توێژکارییەکی چاک سەبارەت بە ژیان و خەبات و تێکۆشا نە کەیانەوە بکەم. بەڵام بە داخەوە نە ئەو هێز و توانینەم هەیە و نە بە هیچ جۆرێکیش بۆم دەلوێ جا هەر بۆیە داوام لە برایانی کوردی موسڵمانی پێنووس بە دەس ئەوەیە کە هەر کەس لە بارەی یەک یا چەند کەس لەوان بە پێی توانا توێژکاری و لێکۆڵینەوەیەکی زانایانە بکا تا سەرەنجام ببینە خاوەنی کەلەپوورێکی زۆر و پڕبایەخ و بەکەڵکی مێژوویی.

ڕاستی ئەوە ئەرکێکی گەورەی سە رشانی هەموانەکە نەهێڵێن بەهیچ کلۆجێک شوێنەواری پڕ بایەخی زانایان و پسپورانی دلسو زمان بەهەدەر بڕوا و جۆگە تەکەیان کوێر بێتەوە.

# ژیواری کوردەواری

گەلی موسڵمانی کورد تا دوای شەڕەکانی یەکەم و دووهەمی جیهانی و تا ئەو چاخی شوومی نەگبەتی و دەورانی بەدبەختییەی دوایی لەهیچ چاخێکدا وەک ئێستا لێقەوماوو دەستەوستان و لاوازو بێ هێز و زەبوون و خانە خەراب و چیلاز نەبووە و کەم و زۆر خاوەنی سەربەخۆیی خۆی هەر بووە و لە گۆشە وکەنار و ناوەندی کوردستانی گەورەدا دەوڵەت و میری سەربەخۆ و ئازاد و ئازای زۆری بە پێی برگە گەلی چاخی پێک هێناون وەک مەلای گەورە دەفەرموێ:

لەمەو پێش میللەتێ بوون چوست و چالاک
لەمەو پێش دەوڵەتێکی سەربەخۆ بوون

ئەوەتا دەبینین کە لە پێش ئیسلامدا گەورەترین میریی و هێزی جیهانی وەک دەوڵەتی ماد و زنجیرەی پادشایانی ماد و دەوڵەتی ساسانی و زنجیرەی پادشایانی ساسانی لەو گەلە و لە نەتەوەی ئەم گەلە بوون. لە دوای ئیسلام و موسڵمان بوونیشی دیارە کە دەیان دەوڵەت و زنجیرە پادشای وەک میرانی سۆران و میران و پادشایانی بابان و دەوڵەتی میری کۆرەی ڕەواندز و کۆماری کوردستان و دەوڵەتی سەربەخۆی شێخ مەحموودی نەمری پێک هێناوە و خزمەت و ڕاژەی گەل و نەتەوەو ویژەو مێژووی خۆی کردووە و پیاوانە لە مەیدانی خەباتا ڕاوەستاوە و رایەڵ و پۆی تەونی گەلی ڕاگرتووە و بێ گومان ئەگەر نەشیتوانیبێ لە گەلانی دیکە چاکتر بێتەوە و پێشیان لێ وەبڕێ شان بە شانی وان لە

مەیدانی بەزێنەدا ڕۆیشتووە و وەک وان هەر هاتۆتەوە.

بەڵام بێ گومان دەبێ ئەو راستییە قەبووڵ بکەین، کە ئەو دوو شەڕە گەورانەی جیهانی هەر چەند بۆ گەلێک لە گەلانی ژێر چەپۆکە و بن دەستەی جیهان، بوون بە مایەی خێرو بەرەکەت و کەڵک و فەڕ و لە سایەی ئەو دوو شەڕە جیهانییەدا توانیان بە ئاوات و ئامانجی خۆیان بگەن و ئازادی و سەربەخۆیی خۆیان وەدەس بێنن، بەڵام بە داخەوە هەردووک ئەو شەڕە جیهانییە بۆ کوردی هەژار، بوون بە مایەی بەدبەختی و ماڵ وێرانی و ئەوەی هەشمانبوو لە دەسمان چوو و بە هۆگەلێکی تایبەتی کە لێرەدا نامانهەوێ قامکیان بۆ رادێرین نەمانتوانی هیچ جۆرە کەڵکێک لەو دوو ئاژاوە گەورە وەربگرین بەڵکە بێگانەکان توانیان کەڵکی باش بۆ خۆیان لە ئێمە وەربگرن!! بە گژ ئەم لا و ئەو لایاندا کردین و بە بەڵێنی گەلی درۆ و پووچ و بێ نێوەرۆک بە خوێناوی ئێمە شەواویان لە بێستانی ئاواتی گڵاوی خۆیان نا و لاشەی بریندار و لەشی خوێناوی و تیمار نەکراوی ئێمەیان لە مەیدانی شەڕدا بەجێهێشت. ئەوان بە هەموو شتێک گەیشتن و ئێمەش هەموو شتێکمان لە دەس دا!! خەڵک بوو بە شا و ئێمەش لە شایەتی را بووینە گەدا! وڵاتیان کردینە شەڕگە و لە سەر سینگی خوێناوی ئێمە شەڕی نارەوای خۆیان دەس پێکرد و بەڵام بەوەش هەر رانەوەستان دوای دامرکانی بڵێسەی ئاوری شەڕی شووم و شەرماوەر تاوانێکی دیکەی گەورەتریان لەگەڵ ئێمەی هەژار و رێ لێ ونبوو کرد.ئێمە کە لەو کاتەدا بەڕاستی سەر لێ شێواو و مات و سەرگەردان بووین لە هەموو ئەندام و جەستە و وەجەکانمان خوێن بە خوڕ دەهات و هەڵدەچۆڕا و هێشتا گوللە و سەرەرمب و پەیکانی دوژمنانی لاوەکیمان لەجەرگ و هەناوی خۆمان دەرنەهێنابۆوە و

لە راستیدا دۆست و دوژمنی خۆمان لەبەر پەرێشانی نەدەناسی و نەماندەزانی ئاورِ وە کێهە لایەی بدەین و بە گژ کێهە دوژمنەدا بێینەوە، لە ماڵی خۆشمان وەدەریان ناین و وڵاتەکەیان لێ داگیر کردین و کوردستانیان وەکو گۆشتی سەر چەپەرێ بەش بەش کرد و کێ دەستی وێ راگەیی بەشە کوردی خۆی برد و رۆیی!! کوردستان کرا بە پێنج پارچە و لە نێوان پێنج میری چەپەڵی دراوسێدا دابەش کرا و بە هەر پێنجیان دەستیان دە خنخنۆکەی کورد نا و خنکاندیان!! و ئیتر نیخە پەستیان کرد. جا ئا بەو شێوە ئەرکی دراوسێیەتی خۆیان بە جێ هێنا و ئیتر بەو جۆرە دەستی یارمەتییان بۆئەو دراوسێیەی خۆیان درێژ کرد!! ئاوا دەبێ دراوسێیەتی!!

هیچ گومان لەوەدا نییە کە هەر ئەو پێنجە نیزیک بوون و دەستیان وێرا دەگەیشت دەنا لانی کەم بەشە کوردیان بە چوار پێنجێکی دیکەش هەر دەدا. بەوەش هەر رانەوەستان و هەر وەک باسمان کرد لە مەو بەر دەزگاگەل و ئامرازگەلی سەرکوتکەر و چەوسێنەری وەکوو ئاغاوەت و کوێخا و گزیر و تەریقەتی مێشک تالانکەر و بیری ئازادی کوژ و ئاوری ئەوین کوژێنەوە و ئۆرگانگەلی سەر شێوێنەر و لە رێ لادەری وەکوو شێخ و مێخ و تەکیە و خانەقا یان لە نێو ئەو گەلە هەژار و دابەش کراوەدا دروست کرد و ئا بەو شێوە لە رێبازی راستی ئیسلامەتیش هەر لایان دا و بە تەواوی رێگەی راستییان لێ ون کرد!!

جا ئیتر ئەمجا بە کەیفی خۆیان توانییان سواری ملمان بن و بمانچەوسێننەوە و خوێنمان بمژن، کە ئەوەش خوو و خدەی هەمیشەگی چەوسێنەرە و هەرگیز نایهەوێ و بەڵکە ناشهێڵێ چەوساوەکەی هۆشیار و ژیر بێ و داوی جۆراوجۆری بۆ دادەنێ و

**دانی ڕەنگاوڕەنگی بۆ بە سەرەوە دەکا. مەلی بێچارە ئاگای لە نەخشە فێلاوییەکانی راوچی نییە دەنا قەت بە داوییەوە نابێ. من لێرەدا بە پێویستی دەزانم کە سوپاسی زۆر و شایانی خۆم ئاراستەی ئەو نووسەر و هۆنەرە کوردانە بکەم کە دان و داوی دوژمن بۆ گەلەکەیان لێک جیا دەکەنەوە و بۆ ڕێبازی راستەقینە رێنوێنییان دەکەن و قەت کەمتەرخەم و بێ لایەن و بێ هەڵوێست نین و بە باشی ئەرک و سپاردەی خۆیان بە جێ دێنن. ئەوەتا دەبینین کە مامۆستای کۆیی بۆئەو کورد و کوردستانە چ دیلانێک دەگێڕێ و چۆن مستی پڕ لە رق لە دەمی نەیاران و فێڵبازان و چەوسێنەرانی گەلەکەی رادەکێشێ! یان دەبینین کە ئەحمەد موختار بەگی جاف چۆن لە تاوی کوردستانی دابەش کراو شین دەگێڕێ و ناڵەی دڵی کوردستانی گەورە پڕ ئەکا!! بەڵێ ئەو بەڕێزە دەڵێ:**

دێتە گـوێم دەنگێـک بە ئـاە و شـیوەن و گریـانەوە
نـاڵەیی دڵـمە لە حەسـرەت خـاکی کوردسـتانەوە
لانەواز و بـێکەس و مەزڵـوومن ئێـستا قەومـی کـورد
گـاە بە دەسـتی تورکەکـان و گـاە بە دەسـت ئێـرانەوە
راسـتە گەر نـاوی عەداڵەت بـۆچی منـداڵانی کـورد
وێـڵ و سـەرگەردان بـسووڕێنەو بە سـەر کێـوانەوە؟
ئەو قەرار و مەجلیسەی وا خەڵک ئەڵێن بۆ کورد ئەبێ
هەر قـسەی رووتە وقـسەش نـاچێتە نـاو گیرفـانەوە
ئەورۆ بـا وا بـێ بەڵام رۆژێ ئەبـێ ئەولادی کـورد
بێـنەوە مەیـدان بە عـیلم و سـەنعەت و عیرفـانەوە
نەوجەوانـانی وەتەن تەوحیـدی ئەکەن ئەو مـیللەتە
هەر لە کرماشـان هەتـا ورمـێ و سـنە و بۆکـانەوە
رێـک ئەخەن وەزعییەتـی وان و جزیـرە سـەر بەسـەر

عەقـــرەوو زاخـــۆ ئەبەســـتن ریـّــک بە قەد بۆتـــانەوە
خـــانەقین و مەنـدەلی و خـاکی لورِستان یەک بە یەک
وەک وەســـا ئەیـــدوورن بە لای مەنتـــیقەی بابـــانەوە
پاش قرانی دوژمنان دەس پیّ ئەکەن تەعمیری موڵک
ریّـــگەی ئاســـن ئەچیّـــتە شـــاخی هەورامـــانەوە
کیّـــو و کەژ ئەبیّـــتە بـــاخ و جـــادە و قەســـرە ریّ
بـــۆ تەماشـــای دەســـتە دەســـتە دیّـــن لە ئینگلیـــستانەوە

بەڵێ لەو پارچە هەڵبەستەدا کاک ئەحمەد موختار جاف گوێی لە ناڵە ناڵی دڵی خۆیەتی کە بۆ گەلی کورد و خاکی پاکی کوردستان دەناڵێنێ و هەر وا لە دڵی خۆشیدا رایناگرێ و کەس نەزانێ چی لە دڵـــدایە و چ رووی داوە و چ قەومـــاوە. بەڵـــکە یەک بە خـــۆی هاواردەکاو دەڵێ بێ ناز و ستەم لێکراوو و هەژار و چەوساوەیە، ئێستاکە گەلی کورد بە دەستی ئێران و تورکانی تـۆرانی، بـۆیەش هەر ئەو دوانە هەڵـدەدا، چـونکە ئەو کـاتی هەر ئەو دوو دەوڵەتە بوون کە کوردیان دەچەوساندەوە و کوردی بێچارە لە نێوانی ئەو دووانەدا دابەش کرابوو و سوورییە و عێراق لە ژێر دەسەڵاتی تورک تۆرانیەکان و کوردەکانی قەفقازیش لە ژێر دەسەڵاتی ئێراندا بوون.

ئەمجـا دەڵـێ ئەگەر راسـتە و دادوەریـیەک لە گۆرِێـدایە بـۆچی منداڵی کورد لە هەموو شتێک بێبەشن و وێڵ و سـەرگەردان لە سـەر کێو و چۆڵ و بیابان دەسوورِێنەوە و بێ کارو ئیش و بێ خوێندن و خوێندنگەن؟!

دیـارە بـاوەرِیش بە وادە وبەڵێنیەکـانی ئەم لا و ئەو لا نـاکـا و دەزانێ کە ئەوانە هەر بۆ قازانجی خۆیان و بـۆ فریـو دانـی کـوردان ئەو جـۆرە وادە و بەڵێنیـانە دەدەن کە ئەوەش هەر قـسەی رووتە و

قسەش ناچێتە ناو گیرفانەوە. جا دیارە کە نموونەش بۆ ئەو داوایە یەکجار زۆرە.

هەر لە شەڕی دووهەمی جیهانیدا وادەی سەربەخۆییان بە کوردان دا و بە درۆ و دەلەسانە پتر لە ٤٠٠٠٠٠ لاوی خاوی دڵ گەرمی کوردیان بە کوشت دا و کردیانە دەستەچیلەی شەڕ و تەنانەت لاشەی بێ گیانیشیان لە شەڕگەکان هەڵنەگیرایەوە و بستە گۆڕێکیشیان پێ رەوا نەدیتن!!

ئەمجا پاش ئەو هەموو دەردە دڵ و پەژارە هەڵڕشتنە، هۆی بنەڕەتی و سەرەکی ئەو ژیوارە نالەبارە کە پێی وایە هەر نەخوێندەواری و نەزانین و دوور بوون لە پیشەسازییە، دەس نیشان دەکا و بە هەژاری و بێ دەسەلاتییەوە، بەڵام بە دڵێکی پڕ لە هیواوە دەڵێ: ئەورۆ با وابێ چونکە لاوانی کورد هەموو نەخوێندەوار و نەزانن بەڵام بێ گومان رۆژێک دەبێ کە نەتەوەی کوردو گەنج و لاوە دڵگەرمەکانی ئەوکەلە فێری زانست و زانیاری و رامیاری و پیشەسازی و دەوڵەتداری ببن و ئەمجا کە خۆیان بە چەکی زانست و زانیاری و پیشەسازی تەیار کرد بێنەوە مەیدان و ریزەکانی گەل یەک بخەن و پتەو بکەن و تەنانەت نەخشەی جوگرافی و سنوورە دەستکردەکانیش هەڵوەشێننەوە و دوای ئەوە دوژمنانی گەل و نیشتمانیان لە وڵاتدا نەهێشت دەس دەکەن بە ئاوەدانکاری و رێکوپێکی وڵات. بە جۆرێکی وا تەنانەت رێگەی ئاسن دەبەنە سەر کێو و شاخە حەستەمەکانیش و ئیتر:

کێو و کەژ ئەبێتە باخ و جادە و قەسرە رێ
بۆ تەماشای دەستە دەستە دێن لە ئینگلیستانەوە

**جا ئەمجا دەیهەوێ خەڵکی کورد لەو خەوە گران و سەنگینە زیان هێنەرە بێدار بکاتەوە و رووی تێدەکا و دەڵێ:**

لە خەو هەڵسن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە
هەمــوو تاریخی عــالەم شاهیدی فەزڵ و هونەرتانە
دەسا تێکۆشن ئەی قەومی نەجیب و بێکەس و مەزڵووم
بە گورجی قەتعی کەن ئەم رێگە دوورەی وا لە بەرتانە
بخوێنن چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تیغی دوژمنتان
هەمــوو ئان و زەمانێ عەینی قەڵغان و سوپەرتانە
بە خــۆڕایی لە دەستی بەرمەدەن ئەم خاکە شیرینە
کە تۆزی وەک جەواهیر، سورمە و کوحلی بەسەرتانە
بە سەر خاکا ئەگەر نازیش بکەن حەقتانە کوردینە
تەماشا سێبەری ئەم شاخ و کێوانە لە سەرتانە
بە بێ قەدری بە سەریا رامەبوورن حورمەتی بگرن
گوڵاڵە سوورەی ئەم سەحرایە خوێناوی جگەرتانە
دەمێکە ئەم وڵاتە وا ئەسیری پەنجەیی جەهلە
لە سایەی عیلمەوە ئەمڕۆ ئیتر نۆبەی زەفەرتانە
زمانی حاڵی ئەحمەد هەر ئەڵێ وریان بن ئەی خەڵکە
بزانن بەردی ئەم شاخانە ئەڵماس و گوهەرتانە

# کۆیە لە کوردستاندا

شاری کۆیە شارێکی قنجیلانە و جوان و کۆن و لەمێژینەی کوردستانی باشوورە کە لە نێوان شارەکانی ڕانیە، سولەیمانی، دوکان یا دەربەندیخان، شەقڵاوە و زاخۆدا هەڵکەوتووە.

شاری کۆیە لە دەشتی پڕ پیت و بەرەکەتی پان و بەرینی کۆیەدا لە داوێنی کێوی بەناوبانگی هەیبەت سوڵتاندا لە چەندین سەد ساڵی لەمەو بەر ساز کراوە و شاری کۆیە ٦٢٥ مەتر و کێوی هەیبەت سوڵتان ١٠٩٢ مەتر لە رووبەری دەریا بەرزترە.

چۆمی کەڵوێ کە لە زنجیرە کێوی قەندیل و کانییە خوای و سێڵوێ ڕا سەرچاوە دەگرێ و دەشتی لاجان بە زۆری و کەڵوێ بە کەمی، پاراو دەکا و لە باشووری شاری قەڵادزێ و رۆژهەڵاتی رانیە تێدەپەڕێ و دەربەندیخان دەگرێتەوە کە لەوێ بەربەندێکی چاکی لەبەر ساز کراوە و بەنداوی گەیوەتە قەڵادزێ. ئەمجا لەوێش تێدەپەڕێ تا دگاتە تەقتەق و باشوور و باشووری رۆژهەڵاتی شاری کۆیە دەگرێتەوە. بەڵام بۆ دەشتی پان و بەرین و وشکارۆی کۆیە هیچ قازانجێکی نییە چونکە لەو مەڵبەندە نە بەربەند و کاناڵ کێشی کراوە و نە هیچ جۆرە گۆڕانکارییەکیشی تێد ئەنجام دراوە.

ئەو چۆمە گەورە لە کوردستانی رۆژهەڵات بە رۆژئاوای شارۆچکەی رەبەت و رۆژهەڵاتی سەردەشتێدا تێدەپەڕێ بەڵام بۆ ئەو مەڵبەندش قازانجێکی ئەوتۆی نییە و لە دەشتی کەڵوێ خەڵک وا لە تینوان دەخنکێ و ئەویش بە هاشەهاش و کوڵاوکوڵ دێت و تێدەپەڕێ!!

لە باکووری شاری کۆیە کێوی "ئاواگرد" هەڵکەوتووەکە لە پشتی ئەو کێوە گوندی "شیواشانە" دێی مەلا عەبدوڵڵای دووهەمە.

**لە داوێنی کێوی هەیبەت سوڵتان هاوینە هەواری چنارۆکە کە جێگایەکی زۆر خۆش لە چاو دەشتی کۆیە، شاری کۆیە جێگایەکی فێنکتر و کوێستانترە کە مامۆستای کۆیی خوا لێخۆشبوو گۆیا لە هاویناندا خۆی و فەقێکانی چوونەتە وێ و تا پاییزێ هەر لەوێ خەریکی وانە وێژی و نووسەری و بە هونەری خۆیەوە خەریک بووە، خۆشی لەو هۆنراوەدا هێمایەک بەوە دەکا و دەڵێ:**

لە تەک شاخی سەفین و کێوی کۆسرەت
هەزار جێگەی هەیە مانەندی جەنەت
سەری حاجی قەڵا و سۆلی چنارۆک
بە بێ وێنەن لەگەڵ شوێنی حەمامۆک

**شاری کۆیە یەکێکە لە شارە هەرە کۆنەکانی کوردستانی گەورە و دەکرێ بە لانکەی زانست و زانیاری و شارستانییەت لە پێنووس بدرێ و لە دەورانی دوای ئیسلامدا هەمیشە مەکۆی زانایان و مەلا و گەور پیاو و مزگەوتو حوجرە و فێرگەی ئایینی بووە و گەلێکی زانا و دانای کەم وێنەی لێ هەڵکەوتووە و وەک پۆلە ئەستێرەی کۆ کە لە نێو ئەستێرەکانی ئاسمانێدا دەدرەوشێتەوە لە نێو شارەکانی دیکەی کوردستاندا دیار بووە.**

کۆ لە کوردستان و کۆ لە ئاسمان
سەر رگۆلی ئەستێرەکان و شارەکان
هەر بزی ئەی شاری کۆیە بۆو گەلە
چەند مەلای گەورە و بەڕێزت پێگەیان
با بکا شانازی کوردستان هەموو
بەو کورانەی پێتگەیاندوون ئەتوو

بـــۆ گەلـــی بەدبەخـــت و لێقەومـــاوی کـــورد
بـــوونە رێنـــوێنی رێبـــازت مـــوو بە مـــوو
شـــارەکەی حـــاجی و مەلای گەورە و دلێـــر
شـــاری کـــوردانی نەبەرد و نەڕڕە شـــێر
تـــۆ جـــێگەی شـــانازی هـــۆزی ئاریـــای
ئەی وڵاتـــی پـــڕ لە پیـــت و خێـــر و بێـــر
گـــورژی کوردســـتان هەمـــوو وەک گەوهەرە
پـــڕ لە چـــاوە و کـــانە، پـــڕ داری بە رە
رۆڵە یە ک لە م خـــاک و ئـــاوە پـــێ بـگـــا

# راز زان و زار دار و رابەرە

**مامۆستاش لەبارەی شاری کۆیەدا دەفەرمۆێ:**

لەشـــەکراو ی بـــە بەفـــر ی خوشـــترە لام
قـــسە وگـــو فتـــار ی لا وی بەفـــری قـــە نـــد ی
ئەوەنـــدەم شـــاری کـــو یـــە لا عـــە ز یـــزە
بەدور و لەعلـــی نـــا دەم ورد کـــە بەردی
لـــە د نیـــادا چ شـــار نـــاگەن بەکۆیـــە
بەرو بـــار و بە دەشـــت وکێـــو و گـــرد ی
کـــە پـــشکو ت بـــاغ و راغ و دار و بـــا ری
کـــە تـــێکەڵ بـــو کلـــو کـــی ســـو رو زەردی
هەوا کەی خۆشـــە ؛ ئـــا وی ســـا ف و خۆشـــی
بـــەعـــەیـــنـــی (جنـــة الخلـــد)ە لەعـــەردی

**ڕێزدا شێخ ڕەزای تاڵە بانیش دەفەرمۆێ:**

شـاری کـو یـە کە لەبا لـەب لە بتی نو ش لە بـە
گەر فەلەک لی بگەری مەنبەعی عەیـش و تەرە بـە

**شـاری کۆیە هەروەک بێشکەی زانایـانی ئـایینی و مەلا چـاک و نووسەرو هۆنەران بووە، هەروەهاش لانکەی پیـاوی گەورە گەورە و خۆش سروشت و پیاو ماقووڵ و راژەکارانی گەل و نیشتمان بووە و زۆری پیـاوی بـاش و بەخـزمەت لـێ هەڵکەوتـوون کە دەتـوانین بە چەند دانەیەک لەوانە ئاماژە بکەین بۆ نموونە حەماغای کۆیە.**

حەماغا پیاوێکی زۆر دەوڵەمەند و خۆش رەوش و نان خۆش و میوان دۆست بووە. ئەو پیاوە زۆر موسڵمان و ئایینداو و خوا پەرست بووە لە تەواوی ناوچەکەدا بە نانخۆش و دەس ئاوەڵا بەناوبانگ بووە و ئاوازەی میوانداری و سەخیایەتی وی لە هەرێمەکەدا زۆر لە سەر زاران بووە.

ئەو کاتی وڵاتی کوردەواری بەتایبەتی باشووری کوردستان لە ژێر چەکمەی رەقی تۆرانیەکان بووە و، چونکە بیروڕاشیان سەبارەت بە کورد قەت باش نەبووە، وڵاتەکە تا رادەیەکی زۆر هەرەج و مەرەج بووە هەر کەس دەستی رۆیبایە ستەمی لەوانی دیکە دەکرد و دەوڵەتیش لێی نەدەپرسییەوە و کاری پێی نەبوو. تیرەی شێخ بوزەینی، کە لەوبەری زێیە نیشتەجێ بوون تەمایان دە دێهاتی کۆیە دەکرد و لە چۆمی دەپەڕینەوە و پەلاماریان دەهێناو خەڵکیان تاڵان دەکرد و تەنانەت لە ناو شاری کۆیەش دەسدرێژییان بۆ خەڵک دەکرد.

حەماغا ناچار لێیان راپەڕی و شەڕێکی زۆری لەگەڵ کردن و دوای کوشتە و زامارێکی زۆر لە سەر جێی خۆیان دانیشاندنەوە و بە یەکجاری تەمبێی کردن.

هەر جووتیارێک جووبا لای و داوای گاجووت و ئامرازی وەرزێری لێ کردبایە دەیدایە و ئەگەر نەشیبووبایە بۆی دەکڕی. ماڵەکەی میوانخانەی مشەخت و رێبواران بوو و هەر کەس هەرچەندی لەوێ مابایەوە کەس لێی نەدەپرسی و هەموو رۆژێ جیرەی خۆی وەردەگرت.

دەڵێن کابرایەک لەوێ میوان دەبێ و لەو ماوەدا ئەسپەکەی دەتۆپێ و ئەویش هەموو رۆژێ هەروەک جاران دەچێ ئالیک و تفاق وەردەگرێ و دەیبا لە بازاڕی دەیفرۆشێ تا بەو پوولە ئەسپێک

دەکرێتەوە و ئەمجا سوار دەبێ و دەڕوا.

حەماغا چەند ساڵێکیش لە لایەن دەوڵەتەوە لە بەغدایە زیندانی کراوە. لەو ماوەدا لە زیندانیش هەروەک لە کۆیە دیوەخانی هەبووەو گەلێکی خزمەت بە زیندانییە هەژار و رووت و نەدارەکان کردووە و زۆر بە پۆلیس و کاربەدەستانی زیندان هەر بە ماڵی وی بەڕێ دەچوون. کاتێک لە زیندان ئازاد بووە تەواوی کەلوپەل و ئامرازی چێشتخانەکە و هەرچی لەویدا پێی بووە هەمووی داوە بە زیندان و زیندانییەکان.

کوردێکی زۆر کورد و موسڵمان و بەخشەر و بەخیرەت بووە. ستەم و تۆبزی لە کەس قەبووڵ نەکردووە و لە بەخشەریشدا نموونەی نەبووە لە دەورانی خۆیدا.



حەماغای کۆیە

یەکێک لە پیاو ماقولان وگەورەپیاوو دەوڵەمەندە دەست و دل ئاواڵاکانی شاری کۆیە یە، کە بە نا نخۆشی ومیوانکر و پیاوەتی زۆر بەناوبانگ بووە و ئێستا ش هەر لەبیر نەچۆتەوە بۆ هەمو خەڵکی هەریمەکە بۆتەویردی زمان و مەتەڵ لە کوردەواری دا.

# مزگەوتەکانی شاری کۆیە

کۆیە هەر لە کۆنەوە کۆکەرەوەی زانست و زانیاری و مەکۆی مەردانی مەرد و کورد و جێگەی بنکە ئاینییەکان بووە و هەمیشە پڕ بووە لەفێرگە و حوجرەو مزگەوت و رازاوەوە بە کۆڕی وانە وێژی و وانە خوێن و وانە وێژان بووە. لە شارێکی ئاوا چووکەدا چەندین مزگەوت و حوجرەی تێدا بووە. ئەو مەلا و زانایانەی کە لە کۆیەدا هەڵکەوتوون و پێگەیون هەر یەکەی ئەستێرەیەکی درەوشاوە و پڕشنگدار بووە لە ئاسمانی وێژەی ئیسلامدا.

ئەگەرچی ئەورۆ دنیاش گۆڕانێکی زۆری بەسەردا هاتووە بەڵام ئێستاش کۆیە هەر مەکۆی مەلا و فەقێ و بنکە ئاینییەکانە و چەندین مزگەوتی جوان ورازاوەی تێدایە کە بریتین لە:

١ـ مزگەوتی گەورەی کۆیە: ئەو مزگەوتە پیرۆزە مزگەوتێکی گەلێک جوان و رێکوپێکە و لە سەر شێوە و بیچمی "کابە"ی پیرۆز دروست کراوە و لە ناوەڕاستی شار و لە گەڕەکی بەفری قەندیدا هەڵکەوتووە.

گەڕەکی بەفری قەندی هەر ئەو گەڕەکەیە کە مامۆستای کۆیی خۆی لەبارەی قسە خۆشی و زمان شیرینی لاوەکانیدا دەفەرموێ:

لە شەکراوی بە بەفری خۆشترە لام
قسە و گوفتاری لاوی بەفری قەندی

وەک دەڵێن لە هیچ یەک لە وڵاتانی ئیسلامیدا جگە لە کابەی پیرۆز هیچ مزگەوتێک بەو شێوە و بیچمە نییە، مزگەوتی گەورەی کۆیە نەبێ.

لەساڵی١٢٦٠ی کۆچی مانگی واتا١٦٧ ساڵ لە مەو بەر دروست کراوە. لە ژووری مزگەوتەکەدا گومبەدێکی گەورە هەیە کە لە هەر دوو لای ویش دوازدە گومبەدی چووکە هەن. خودی ژوورەکەی شەش سەد گەزی چوار گۆشەیە.

بێجگە لە خودی مزگەوتەکە ١٠ هۆدەی لێ دروست کراوە کە یەکیان هی وانەوێژ و یەکیان هی پێشنوێژ و هەشتیان هی فەقێیانن.

بەڕێز مەلا مەحموودی هۆمەر گومبەدی ناسراو بە مفتی کە هاوچەرخی بەڕێز مفتی زەهاوی بووە یەکەم پێشنوێژ و وتاربێژ و وانەوێژی ئەو مزگەوتە پیرۆزە بووە. دوای کۆچی دوایی مەلا مەحموودی بەڕێز حاجی مەلا ئەسعەدی جەلیزادە لە جێگەی ئەو ئەرک و سپاردەی رامیاری و ئاییني بەجێ هێناوە. دوای کۆچی دوایی ویش، حاجی مەلا عەبدوڵڵای کوڕی لە جێگەی وی دانیشتووە. ئەمجا دوای حاجی مەلا عەبدوڵڵا، مەلا محەمەد ئەفەندی کوڕی کە بە مەلای گەورە ناوبانگی دەرکردووە و ئەو پەڕتووکەی ئێمەش لەبارەی وی دایە، هاتۆتە سەر ئەو مزگەوتە و لە تەمەنێکی زۆر کەمدا بۆتە پێشنوێژ و وتاربێژ و وانەوێژی ئەو مزگەوتە و ئەمجا هەر لەوێڕا ناوبانگی بە تەواوی جیهانی ئیسلامدا بڵاو بۆتەوە. ئەو مزگەوتە بەڕێز، حاجی مەلا بەکراغای حەوێزی دروستی کردووە. وەستای لە موسڵ و حەڵەبێڕا بۆ هێناوە و لە هەر لایەکەوە کەرەسەی بۆ خڕ کردۆتەوە و لە کاتی دروست کردنیدا ساڵێکی تەواو هەر بەردە مەرمەڕەکانییان بۆ تەشوێ تاش کردووەو بڕیوە و ئەمجا ساڵی دواتر، دەستیان بە دروست کردنی کردووە. لە سەر بەردێکی گەورە بەستە هەڵبەستێکی فارسی سەبارەت بەو مزگەوتە نووسراوە کە هەوەڵەکەی ئەو تاکەیە کە دەڵێ:

تا گنبد این جامع اعلا شده بر پا
صد ناز کند کوی برین قبه خضرا

دوایەکەشی ئەم تاکەیە کە دەڵێ:

از همـــت ملابکـــر ایـــن مـــسجد ممتـــاز
در ســال هـــزار و دوصـــد وشـــصت شـــد انـــشا[1]

٢ـ مزگەوتی گەرمووک: ئەو مزگەوتەش هەر لە گەڕەکی بەفری قەندی لە بەرکۆنیانی کەس نازانێ کێ دروستی کردووە. بێجگە لە خودی مزگەوتەکە دوو هەیوان و دوو حوجرەی فەقێیانی هەیە و گۆیا بۆیەش بە مزگەوتی گەرمووک ناو براوە لە کاتی خۆیدا لە حەوشەی مزگەوتدا کەرێزەیەک هەبووە کە لە بن عەردیدا ڕۆیشتووە و زستانان هەتا هەوای ساردتر ببێ ئەو گەرمتر بووە. تا ئێستا چەندین جار نوێ کراوەتەوە لە لایەن خێرخوازانی شاری کۆیەوە. ئەو کەرێزەش لە ساڵی ١٩٧٩ لە لایەن یانەی ئەوقافەوە پڕ کراوەتەوە.

---

١ ـ تەواوی هەڵبەستەکە ئەوەیە:

تـــا گنبـــد ایـــن جـــامع اعـــلا شـــده بـــر پـــا
عـــالم زوجـــودش بنـــشاط کە گـــویی
از منبـــر و محـــراب و درش نیـــز یقـــین اســـت آینـــد
هـــرکس کە درو جمـــعە گـــذارد بە شـــرایط
دانـــد بە هـــرکە بـــود اهـــل ســـعادت
فرمـــود بمـــن از ســـر تعلـــیم سروشـــتی
طـــالع بـــشمر مهمـــل ایـــن بیـــت و یکـــی فـــرد
از همـــت ملابکـــر ایـــن مـــسجد ممتـــاز
صـــد نـــاز کنـــد بـــراین قـــبە خـــضرا
هـــستند بـــە زیـــر شـــجر ســـدرە و طـــوبا

٣ـ مزگەوتی خادم السجادە: ئەوەش هەر لە گەڕەکی بەفری قەندی مامۆستای کۆییە و ئەو مزگەوتە، پیرۆزە یادگاریکی بەنرخی عبدالرحمن پاشای بابانە کە لە ساڵی ١٢٢٥ی کۆچی مانگی دروستی کردووە و مەلا ئەسعەد ئەفەندی خادم السجادەی کە مەلایەکی باشی ئەو سەردەمە بووە کردۆتە مەلای ئەو مزگەوتە گۆیا مەلا سەعدی ئەفەندی بۆیە پێیان گوتووە خادم السجادە چونکە بەرماڵی پێغەمبەری مەزنیﷺ لە لا بووە. دە یەکی داهاتی دەشتی کۆیە و گوندی "مەلا زیاد"یان بۆ ئەو مزگەوتە هێناوەتەوە.

دوای مەلا سەعد مەلا محەمەد ئەفەندی کوڕی و دوای ویش مەلا ئەمین ئەفەندی نەوەی لە جێگەی دانیشتوون. لە دەروانی مەلا ئەمین ئەفەندیدا سوڵتان عبدالحمیدی تورک بەرماڵەکەی لێ ئەستاندوون و بە تکا و رجایەکی یەکجار زۆر داونیەتەوە و ئەویش بەو مەرجەی، کە لە کەرکووکێ مزگەوتێکی بۆدروست بکەن و بیبەنە وێ.

٤ـ مزگەوتی پەلک: ئەو مزگەوتەش کە هەر لە گەڕەکی بەفری قەندی هەڵکەوتووە، لە بەر کۆنی بڕواری ساز کرانی بۆ کەس ڕوون نییە، بەڵام فەقێ جەردیس ناوێک لە ساڵی ١٢٧٤ کۆچی مانگی تازەی کردۆتەوە. جگە لە خودی مزگەوتەکە هەیوان و حەوشەیەکی زۆر خۆش و سێ حوجرەی فەقێیان و یەک حوجرەی مەلای وانەبێژی هەیە. ئەو چوار شیعرە فارسیە لە سەر دەروازەی مزگەوتەکە نووسراون:

دوش کردم سوال از هاتف
جای ذکر و بنای بی‌همتا
تاج افلاک در ربود سرود

بـــــر فلـــــک ســــود قبـــــه مــــسجد
کیـــــست آیـــــا نهـــــاده ایـــــن تأســـــیس؟
منـــــشأ زهـــــد و مبـــــدأ تـــــدریس
بیـــــت تـــــاریخ او بـــــه تقـــــدیس
بـــــه اعـــــلای دیـــــن فقـــــه جـــــرجیس

٥- مزگەوتی حاجی مەلا عومەر ئەفەندی: ئەو مزگەوتەش هەر لە گەڕەکی بەفری قەندییە. حاجی مەلا عومەری کوڕی جەردیسی داروغە لە ساڵی ١٢٨٠ی کۆچی مانگی لە پەنا ماڵی خۆیان دروستی کردووە.

ماوەیەک حاجی مەلا ئەسعەد ئەفەندی کوڕی حاجی مەلا عومەر لە سەر ئەو مزگەوتە بووە و هەر بۆیەش ناوی کەوتۆتە سەر و بە مزگەوتی حاجی مەلا عومەری ئەفەندی نێو براوە. دوای ئەوە کە ئەم مەلایە لە گەڕەکی بەفری قەندی ڕۆیشتووە گەڕەکی قەڵاتێ، حاجی مەلا ڕەسووڵی بێتووشی کە لە ساڵی ١٩١٩ زاینیی کۆچی دوایی کردوە بۆتە پێشنوێژ و وانەوێژی ئەو مزگەوتە.

٦- مزگەوتی حەتک: مزگەوتی حەتکیش هەر لە گەڕەکی بەفری قەندیدا هەڵکەوتووە کە مزگەوتێکی بڕێک چووکەڵە و زۆر جوان و خشپیلانەیە ئەو مزگەوتە زۆر کۆنە و بەروارەکەی نازانرێ و بۆ کەس روون نییە و کەس نازانێ کەنگێ و کێ دروستی کردووە.

دوو حوجرەی فەقێیانی هەیە کە مامۆستای وانەوێژیش هەر لە یەکێک لەواندا وانە ئەڵێتەوە. لە ساڵی ١٣١٧ی کۆچی مانگی لە لایەن حاجی عەبدوڵڵای حاجی مستەفا ڕەبەن تازە کراوەتەوە و نوێ کاری تێدا کراوە.

تا ئێستا گەلێک مەلای وەک مەلا لەتیف ئیسماعیل، مەلا سەلیم سەعید ئاکرەیی، مەلا خرناڵ، مەلا سولەیمان بێتواتەیی، مەلا سولەیمان مەلا ئیبراهیم و هتد بوون بە پێشنوێژ و وانەوێژی ئەو مزگەوتە پیرۆزە.[١]

٧- مزگەوتی بیرۆکە: بە داخەوە ئێستا ئەو مزگەوتە نەماوە، کە رووبەڕووی مزگەوتی حاجی مەلا عومەر لە گەڕەکی بەفری قەندی بووە.

گۆیا کاتێک لەمزگەوتی حاجی مەلا عومەر جێی نوێژکەران نەبۆتەوە، روویان لە مزگەوتی بیرۆکە کردووە چونکە زۆر لێک نزیک بوون. ئەو مزگەوتە زۆرتەواو و ڕێکوپێک بووە و حوجرەی فەقێیانیشی بە تەواوی هەبووە و تەنانەت جێگەی سوختە و موستەعیدانی لێک جیا بووە و بە جێگەی سوختەکانیان گوتووە سوختەخانە. تەنانەت پێش ساڵی ١٢٣٧ کۆچی مانگی لەو مزگەوتەش هەر نوێژی هەینی کراوە.

٨- مزگەوتی مەلا هۆمەر مەولوودی چاوڕەشی خەسرەوی: ئەو

---

[١] ـ ئەم چوار هۆنراوە فارسییە بە خەتێکی زۆر خۆش لە سەر بەردێکی مەڕمەڕ نووسراون و لە سەر دەروازەی مزگەوتەکە دراوە:

کرد تعمیر حاج عبدالله
نقد بسیار از ممر حلال
شرف چو بیت عتیق
یکی را گفتم جوهر این تاریخ
مسجد کهنه ازر یاعاری
کرد و ندید دشواری
جای تدریس و علم و بیداری
(باد مقبول حضرت باری)

مـــزگەوتەش هەر لە گەڕەکـــی بەفـــری قەنـــدی بـــووە ئێـــستا شوێنەواریـشی نەمـاوە. مەلا مەولـوود خـۆی دروسـتی کردبـوو هەر خۆشی وانەی ئاینی لەوێدا بە فەقێیان کوتووە و دیـارە حـوجرەی فەقێیانیشی هەبووە.

ئەو مزگەوتە تا ئێستا لێیان دواوین هەموویان هەر ئـی گەڕەکـی بەفری قەندی بوون.

٩ـ مزگەوتـــی ئـازادی: ئەو مـزگەوتە لە گەڕەکـی ئـازادییە و بە یـارمەتی و یاریـدەی پـارەی خەڵکـی ئەو گەڕەکە دروسـت کـراوە. مزگەوتێکی زۆر خۆش و لەبار و ڕێکوپێکە و خودی مزگەوتەکە زۆر گەورە و تەواوە و هەیوانێکی لە پێشەوە هەیە.

١٠ـ مزگەوتی حاجی بەکر دلێر: ئەو مزگەوتە بەڕێز حـاجی بەکـر دلێـر، لە گەڕەکـی بایزئـاغـا دروسـتی کـردووە و حەوشـەیەکی زۆر گەورە و خۆشی هەیە جێگای کۆڕی پرسە و سەرەخۆشـی لێرەدا لە مزگەوتـێ جیـایە. لە سـاڵی ١٩٧٩ی زاییـنـی تەواو بـووە و دەرکەی کراوەتەوە.

١١ـ مزگەوتی ئەوقـاف: ئەو مـزگەوتەش لە سـاڵی ١٩٨٢ی زاییـنـی یانەی ئەوقاف لە ڕێگـای حەمـامۆک لە لایەن میـرییەوە دەستی بە دروسـت کردنـی ئەو مـزگەوتە کـردووە، کە ئێـستا تەواو بـووە و یەکێکە لە مزگەوتە تازەکانی شاری کۆیە.

١٢ـ مزگەوتی حاجی سدیق: بەڕێز حاجی سـدیق حەمەد عەبـدوڵڵا زەمینەکەی لە گەڕەکـی قەڵاتـێ کڕیـوە و هەر بە پـارەی خۆشـی لە ساڵی ١٩٨٠ زاییینیدا دروسـتی کـردووە و ئەو مـزگەوتە کۆڵەکەی لە بەردانین و لە بنیڕا بێ کۆڵەکەیە و هەیوانێـک و یەک دوو هـۆدەی هەیە.

١٣ـ مزگەوتی رەشە: ئەو مزگەوتەش یەکجار کۆن و لەمێژینەیە و لە بەر کۆنیانی بەرواری دروست کردنی بۆ کەس نازانرێ و لە گەڕەکی قەلاتێ هەلکەوتووە. بەلام لە سالی ١٢٠٧ کۆچی مانگی حاجی ئەحمەدی وەتمانی تازەی کردۆتەوە. حەوشێکی گەورە و دوو حوجرەی فەقێیان و یەک حوجرەی مەلای وانەوێژی هەیە کە لە حەوشەکەدا مێرگێکی خۆشی تێدایە.

١٤ـ مزگەوتی سەرباغ: لە کۆیە گردێک هەیە پێی دەلێن گردی جوولەکان ولە پێشدا مالی لێ نەبوون، بەلام لە سالی ١٩٥٧ زایینی ئەو گردەش هەر کرا بە شار و پتر لە ٣٠٠ مالی لێ ساز کرا.

ئەمجا بەڕێز حاجی محەمەد حاجی عەبدوللا دوو پارچە زەمینی لەوێ کڕی و لە سالی ١٩٥٨ بە پوولی خۆی مزگەوتێکی خۆش و باشی لێ دروست کرد و حوجرەی فەقێ و مەلا و حەوزی ئاو و حەوشە و حەسارێکی باشی بۆ دروست کردن و، بەڕێز مەلا محێدین یەکەم پێشنوێژ و وانەوێژی ئەو مزگەوتە بووە.

١٥ـ مزگەوتی قامیش: ئەو مزگەوتەش هەر زۆر کۆن و لەمێژینەیەو بەرواری دروست کرانەکەی وە بیری هیچ کەس نایەت بەلام لە سالی ١٢٢٦ی کۆچی مانگی بەڕێز حاجی مەلا شێخ ئەحمەدی کوڕی مەلا شێخ ئەبووبەکری نەقشبەندی تازەی کردۆتەوە. ئەمجا لە سالی ١٣٠٤ی کۆچی مانگیش دووبارە لە لایەن بەڕێز حاجی مەحموود حاجی محەمەدئەمین حالخۆشییەوە تازە کراوەتەوە. ئەو مزگەوتە پیرۆزە بریتییە لە خودی مزگەوتەکە و یەک حوجرەی فەقێیان و یەک حوجرەی وانەوێژی و یەکی پێشنوێژی و حەوشە و حەوزو ئاودەسخانە.

١٦ـ مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد: ئەو مزگەوتەش هەر مزگەوتێکی زۆر کۆن و لەمێژینەیە و بەرواری دروست کرانی

نازانرێ. بەڵام لە ساڵی ١٢١١ی کۆچی مانگی بەڕێز عبدالرحمن پاشای بابان بۆ بەڕێز مەلا عبدالرحمن کاکی جەلی تازەی کردۆتەوە و پووڵێکی زۆری لێ خەرج کردووە.

ئەو مزگەوتە پێنج حوجرەی فەقێیانی هەیە. دوای ئەوە کە عبدالرحمن پاشای بابان تازەی کردەوە و مەلا عبدالرحمنی لە سەر دانا دوای ویش مەلا عبدالله کوڕی و ئەمجا حاجی مەلا ئەسعەدی کوڕی وی یەک لە دوای یەک مەلایەتییان تێدا کردووە.

١٧ـ مزگەوتی کۆنە جومعە: ئەو مزگەوتەش یەکێکە لە مزگەوتە هەرە کۆن و لەمێژینەکانی شاری کۆیە کە لە گەڕەکی "هەواو" هەڵکەوتووە. دەڵێن هەنتەشی عبدلله کوڕی هەنتەشی عومەر دروستی کردوە و هەر بۆیەش هەر بەو بۆنەوە بە مزگەوتی "ابن العمر"یش نێوی دەبرێ و هەروەها مزگەوتی عەولا و عومەرانیشی پێ دەڵێن تا کاتێکی کە مزگەوتی گەورە دروست کراوە نوێژی هەینی هەر لەوێ کراوە.

جا لە ساڵی ١٢٦٠ی کۆچی، کە مزگەوتی مانگی گەورە ساز کراوەو نوێژی هەینییان بردۆتە ئەوێ و ئەوێش نێوی کۆنە جومعەی بە سەردا براوە.

چەندین مەلای گەورە و هەڵکەوتووی وەک مەلا پیرۆتی وەتمانی، مەلا خدری هەورامی، مەلا عوسمانی حەمەبتە، مەلا ئەحمەدی باڵەکی (مەلا شەلە)، مەلا عبدالرحیمی ژێ، مەلا تەها مەلا عبدالرحیم لەو مزگەوتە مەلایەتییان کردووە.

١٨ـ مزگەوتی مەلا جامی: ئەو مزگەوتە پیرۆزە کە ساڵی ١١٧٢ی کۆچی مانگی دروست کراوە لە گەڕەکی بایزاغا هەڵکەوتووە و لە ساڵی ١٣٣٠ کۆچی مانگی لە لایەن بەڕێز حاجی ئیسماعیل حاجی

باپیرەوە تازە کراوەتەوە تا ئێستا چەندین مەلای بەڕێزی کوردەواری لەسەر ئەو مزگەوتە مەلایەتییان کردووە. بۆ نموونە بەڕێزان فەقێ حوسەینی کوڕی مەلا مستەفا، مەلا مەحموودی کوڕی فەقێ حوسەین، مەلا ئەحمەد و مەلا سادقی کوڕی و مەلا... مەلا زاهیر. بەڕێز مەلا زاهیر مەلا حامید کە خاوەنێ کتێب و نامیلکەی زۆری چاپ کراو و چاپ نەکراو و هۆنراوەی کوردی و فارسی و عەرەبییە و من خۆم لە زستانی ١٣٤٦ی هەتاوی لەگەڵ مەلا محەمەدئەمین پوورشێخە زەرگەتەنی کە ئێستا مەلای گوندی ئەمبێ لە ناوچەی مەرگەوەڕی ورمێیە لە خزمەت ئەو مامۆستا بەڕێزە دەمانخوێند و هەر یەکەی نامیلکەیەکی چووکەی عەرەبیشی بە نێوی قانون اسلام کە تازەی چاپ کردبوو داینێ و هێشتا هەر ماومەو دوای ئەوە کە لەوێ رۆیشتین چووینە گوندی کانی وەتمانی ناوچەی خەلەکان و ماوەیەک ماینەوە و پاشان چووینە سولەیمانییە و لەوێشەوە هاتینە گوندی دەشتێوی پژدەرێ و مەلا محەمەدئەمین زۆر بە سەختی نەخۆش کەوت و زۆر بە ناڕەحەتی هێنامانەوە سەردەشتێ.

مزگەوتەکە زۆر جوانکیلانە و خۆشە و حوجرەیەکی خۆشی فەقێیان و حوجرەیەکی وانەوێژیشی هەیە. حەوز و ئاودەست و حەوشە و حەسارەکەی زۆر جوان و رێکوپێک بوون. دارە خورمایەکی قەد ئەستووری دە حەوشەکەیدا بوو بەڵام خورمای نەدەگرتن. لە سەر دەروازەکەی نووسراوە: (فادخلوها بسلام آمنين).

١٩ـ مزگەوتی مفتی: ئەو مزگەوتەش هەر لە گەڕەکی بایزاغا هەڵکەوتوە کە لە ساڵی ١١٧٦ی کۆچی مانگی لە لایەن بەڕێز مەلا یۆسف زاهیدەوە دروست کراوە و ماوەی چل ساڵ هەر خۆی مەلایەتییەکەی کردووە، ئەمجا مەلا محەمەد کوڕی کە بە ابن الزاهد

بەناوبانگ بووە ماوەی شێست ساڵی تەواو واتا بە هەر دووکیان سەد ساڵی مەلای ئەو مزگەوتە بوون.

لەدوای ویش مەلا محەمەد ساڵحی کوڕی کە مفتی شاری کۆیە بووە لە سەری دانیشتووە و بە نێوی وی نێو براوە. لە ساڵی ۱۲۸۲ مانگی بەڕێز ئۆمەری بەکری کە ئێستا گۆڕەکەی لە بەر هەیوانی مزگەوتێیە و بە پارەی خۆی تازەی کردۆتەوە. ئەو مزگەوتە سێ حوجرەی فەقێیانیشی هەیە.

۲۰ـ مزگەوتی بایزاغا: ئەو مزگەوتە لە گەڕەکی بایزاغایە واتا باپیرە گەورەی عبدالرزاق ئاغا و بە پارەی خۆی دروستی کردووە. لە ساڵی ۱۰۱۵ مانگیدا دو سێ خانووشی لە وەختی خۆیدا بۆ کڕیوە کە یەکیان بۆ مەلای وانەبێژ و یەکیان بۆ مەلای پێشنوێژ و ئەوی دیشی بۆ بە کرێ داوە.

ئەو مزگەوتەش هەر وەک ئەوانی تر حوجرەی وانەوێژ و فەقێیانی هەیە. مامۆستا نالی لەو مزگەوتە وانەی ئایینی خوێندووە. دەڵێن پێش ئەوەی مامۆستاکەی وانەی پێ بڵێ لە لای هێندێک کەس دەیدرکێنێ کە ناوێرێ وانەی پێ بڵێ، چونکە دەڵێ بۆ هۆنەری هاوتای نییە و ئەگەر بۆ زانیاریش هەر وا بێ کاری من نییە وانەی پێ بڵێم.

ئەو پێنج هۆنراوە فارسییانە لە سەر بەردێکی مەڕمەڕ هەڵقەندراون و لە سەر دەروازەی مزگەوتەکە دراوە کە دەڵێ:

طرازنده جامع بی‌مثال
ز ایجاد آن پیش آن نامدار
شد باني ثاني حاج حسین
دنانیر و درهم بسي صرف کرد

خـــرد گفـــت تـــأريخش آن بـــی‌نظيـــر
بـــه قـــدر علـــم بـــود هـــر فرخنـــده فـــال
بـــه رضـــوان جنـــت نمـــود ارتحـــال
چـــو همـــت بلنـــد اســـت و نيكـــو خـــصال
بـــه تعميـــر تـــره حـــشر كـــرد اشـــتغال
مكـــان معـــلا چه جنـــت مثـــال

٢١ــ مزگەوتـی منـارە: ئەو مـزگەوتە لە گەڕەکـی قەڵاتـێ بەر لە سـاڵی ١٠٥٤ی کـۆچی مـانگی دروسـت کـراوە و ئەو کـاتی کە ئەو مـزگەوتە لە بنـاری گەڕەکـی قەڵاتـێ دروسـت کـراوە شـارەکە هەر هەتاوێ بووە و هەر بۆیەش مزگەوتی بناریش نێو براوە.

لە ساڵی ١١٨٣ی کۆچی مانگی کەسێک بە نێوی ذبیح الله تـازەی کردۆتەوە لە تەواوی مزگەوتەکانی کۆیە هەر ئەو مـزگەوتە منـارەی هەبـووە هەر بـۆیەش بە مزگەوتـی منـارە بەنێوبـانگە. بـێجگە لە خودی مزگەوتەکە حەوشە و باخچەیەکی خـۆش و هەیـوان و چەنـد حوجرەی فەقێیان و هەروەها حوجرەی مەلاشی هەیە.

بەڕێـزان مەلا ئەبـووبەکر و مەلا حـسێن و مەلا سـاڵح کە هەر سـێکیان نەوەی بـاپیر فەقـێ ئەحـمەدی دایە خەجـێن یەک لە دوای یەک مەلایەتییان لەو مزگەوتەدا کردووە و فەقێیان ڕاگرتوون. دوای وان مەلا عەلـی بـاداوەیی کە فەقێـی جەنـابی مەلای گەورە بـووە و هەروەهـا دەیـان مەلای دیـکەش لەو مـزگەوتە پێـشنوێژی و وانەوێژییان کردووە.

٢٢ــ مزگەوتـی مەحمووداغـا: ئەو مـزگەوتەش هەر لە گەڕەکـی قەڵاتێ هەڵکەوتـووە و لە پێـشدا نێوی مزگەوتـی خـالیداغا بـووە، بەڵام لە سـاڵی ١٢٧٢ بەڕێـز مەحمووداغـای غەفـووری تـازەی

کردۆتەوە. لە پێشدا مەلا حسێن ناوێک لە سەری بووە و دوایی مەلا سالحی جەلی بۆ ماوەی پەنجا ساڵ مەلایەتی و وانەویژی ئەو مزگەوتەی کردووە. ئەو مزگەوتە حەوشەیەکی زۆر گەورە و حوجرەی فەقێیان و یەک حوجرەی مەلای هەیە.

## ئەو مزگەوتانەش هەر نەماون:

١ـ مزگەوتی بیرۆکە ٢ـ مزگەوتی قۆشخانە ٣ـ مزگەوتی مەلا ئۆمەری مەولوود چاوڕەشی خەسرەوی ٤ـ مزگەوتی سوور.

شاری کۆیە ئێستا پتر لە بیست هەزار ماڵ دەبێ و سەر بە پارێزگاری هەولێرە. هێندێک لە شەقامەکانی بریتین لە:

١ـ شەقامی حاجی قادر ٢ـ شەقامی حەمامۆک ٣ـ شەقامی سەرباخ ٤ـ شەقامی ئیسکان ٤ـ شەقامی جەمعییە ٦ـ شەقامی ئازادی ٧ـ شەقامی جەوهەراوا ٨ـ شەقامی هەرمووتە.

گەڕەکەکانی کۆیە بریتین لە: ١ـ گەڕەکی بایزاغا ٢ـ گەڕەکی قەلا ٣ـ گەڕەکی بەفری قەندی کە لە پشتی گەڕەکی قەلایەیە ٤ـ گەڕەکی گردی کە رووبەڕووی بەنزینخانەکەیە ٥ـ گەڕەکی ئازادی ٦ـ گەڕەکی ئیسکان ٧ـ گەڕەکی جواهیراوا.

گوندەکانی نزیکی شاری کۆیە بریتین لە: گوندی فەقێیان و گوندی کافرۆشی لە رۆژهەلاتی باکوور و گوندی کفرەدۆڵ و بامورتکان و ئاودەلۆک و شەوگێر لە رۆژهەلاتی باشووری گوندەکانی شێواشۆک و شێلە و بایزاغا و باوەقۆپ و شێخەڕوان و پیرەڵ لە رۆژئاوا.

لە باکووری شاری کۆیە ناوچەی باواجانییە کە بریتییە لە گوندەکانی کرۆژ، سماقوڕی سێنان و سماقوڕی سەرچاوەو سماقوڕی

گەلی و ئیران و نازەنین و گوندی جەلی و کونە فلوسەو سکتان.

هەرێمی کۆیە سێ ناوچەیە: ١ـ بەرکۆیە ٢ـ پشکۆیە ٣ـ سماقوڕی.

جا ئەو شارە بچکۆلانە جوانکیلانەی کوردستان وەک زۆربەی شارەکانی دیکەی ئەو هەرێمە بێشکە و پەروەرشگای دەیان پیاوی زانا و هەڵکەوتوو و دەیان بلیمەت و پسپۆڕی وەک مەلای کۆیی، مەلا عەبدوڵلا جەلیزادە و باب و باپیرانی مەلای گەورەی کۆیی و دەیان هۆزانی هەڵکەوتووی گەورە و بلیمەت و پیتۆڵ و پسپۆڕ و هۆزان و لێزانی بەرزی وەک مەلا ئەحمەدی کوڕی مەلا جامی، مەلا عەبدوڵلای ئەوەڵ کوڕی مەلا محەمەدی مەلازادە، مەلا عەبدوڵلای دووهەم جەلی کوڕی مەلا عبدالرحمن جەلی، مەلا عەبدوڵلای سێیەم کوڕی حاجی مەلا ئەسعەدی جەلی، مەلا عبدالرحمن جەلی، شێخ سەعدی کوڕی مەلا خدری پیرمکائیلی، مەلا ئەحمەد عومەری گونبەدی، مەلا محەمەد قازی و هەروەها لانکەی چەندین هۆنەری باهونەری وەک حاجی مەلا قادری کۆیی و هۆنەری هەست ناسکی بیر تیژی وەک شێرکۆ کۆیی کە دەڵێ:

یاری من کەیفی لە لایە دەفعی دەرد و خەم دەکا
چاو لە وێنەی ئاسکە کێوی عاشقان ماتەم دەکا

وشەی "کۆ" لە فەرهەنگی کوردیدا واتا خڕ، خڕ بوونەوە، کۆ بوونەوە، خڕ بووە، کۆ بووە، پۆل و پێڕ. لە زاراوەی ئەستێرەوانی کوردیشدا پۆلە ئەستێرەیەکی کە لە لای رۆژهەڵاتەوە دەردەکەوێ و بە شوێن ویشدا پۆلێکی دیکە کە پێک هاتووە لە شەش ئەستێرە و سێیان پێکەوە و سێشیان پێکەوەن بە نێوی تەرازوو هەڵدێن. پێڕە ئەستێرەی کۆ و پۆلە ئەستێرەی تەرازوو لە ئاسمانا دیارن و ئەدرەوشێنەوە و خەڵک لە چاخەکانی رابردوودا وەخت و کاتی خۆیان پێ دیاری کردوون.

راستی هەرچەندە رەنگە لە کاتی نێو نانی شاری کۆیەدا ئەوەیان مەبەست نەبووبێ، بەڵام بە هەڵکەوت وا هاتووە کە شاری وەک کۆیە پۆلە ئەستێرەی کۆیە بە هۆی هەڵکەوتنی زانایانی زۆر و پسپۆڕ و هۆزانی هەڵکەوتووی بێ وێنە لەم شارە و دەوروبەری ئەم شارەدا لە ئاسمانی فەرهەنگ و وێژە و مێژووی کورد و کوردەواریدا وەکو کۆ دەدرەوشێتەوە.

شاری کۆیە هەر وەک زانایانی گەورە گەورە و کەم وێنەی تێدا هەڵکەوتوون گەلێکیش پیاوی گەورە و دەس ئاواڵە و نان خۆش و بە خزمەت و تێکۆشەر لە رێی ئیسلامەوە تێدا هەڵکەوتوون کە بە راستی جێگەی سوپاس و ڕێزن.

خەڵکی شاری کۆیە و هەرێمی کۆیە تێکڕا جگە لە ژمارەیەک خەڵکی گوندی هەرمووتە و هێندێک لە دانیشتووانی گەڕەکی قەڵای شاری کۆیە کورد و موسڵمانن و لە سەر رێچکە مەزەبی شافیعین.

شاری کۆیە ئێستا خاوەنی دوو زانکۆی بازرگانی و کشتوکاڵ و یەک خەستەخانەی گەورەی میری بە نێوی خەستەخانەی کۆیەیە. ئەو کاتەی من لەوێ بووم زانکۆیەکی چووکەی ئایینیشی لێ هەبوو بەڵام وەک دەڵێن ئێستا نەماوە. مامۆستای کۆیی خۆی دەفەرموێ کە وا دیارە لە ماتەمی کەسێکدا گوتوویەتی:

تەماشـــا بـــاخ و راخـــی شـــارەکەی کـــۆ
لە ماتەمـــدا قـــوڕی داوە وە ســـەر خـــۆ

لە کۆیەدا بێ گومان دەیان مەلا و زانای گەورە و بەڕێزی وەک بەڕێز مامۆستا بەرکۆیی هەڵکەوتووە کە بە داخەوە یا هەر نێو و

نێوبانگیان نەماوە یا ئەگەر مابێش بە عەرەب لە پێنووس دراون و تەنانەت لە نێوکەشیاندا هەر گۆڕانکاری کراوە! نموونەش نووسەری کتێبی"الاظهار"ە لە زانیاری نحودا، کە نێوبانگی بەرکۆیی واتا خەڵکی ناوچەی بەرکۆیە، بووە و گۆڕیویانە و کردوویانەتە "بُركَوِي" کە دەخوێندرێتەوە "بورکەوی" و تەنانەت لە سەر کتێبەکەشی هەر نووسراوە "الاظهار للبركوی"!!

## گوندەکانی خۆرئاوای کۆیە بریتین لە:

١ـ قەسرو خراپە: خەڵکی ئەو گوندە کە نیزیکەی ٤٠ـ٥٠ ماڵێکە و پیشەیان وەرزێڕی و ئاژەڵدارییە و ٢٠ کیلۆمەتر لە شاری کۆیە دوورە.

٢ـ سێوسەن: کە بە ناو ژنێک بە سۆسن نێونراوە و ١٠ کیلۆمەتر لە کۆیەوە دوورە

٣ـ ئاودەلوک: نیزیکەی ١٢ کیلۆمەتر لە شاری کۆیە دوورە.

٤ـ سوێڕەوە: ئەو گوندە، ٨ کیلۆمەتر لە شاری کۆیە دوورە و حەشیمەتەکەی ڕەوندن.

٥ـ قەیسەری سەرێ و قەیسەری خوارێ کە دوو گوندن و ٥ کیلۆمەتر لە شاری کۆیە دوورن.

٦ـ ئەسکی کۆیە: ئەو گوندە تەنیا یەک کیلۆمەتر لەکۆیە دوورە و بیست و پێنج ماڵێکە و بە ئاژەڵداری و وەرزێڕییەوە خەریکن.

٧ـ حەمە بایزان: ئەو گوندەش هەر تەنیا یەک کیلۆمەتر لە شاری کۆیە دوورە و هەژنۆدە ماڵێکە و بە دەغڵ و دان و ئاژەڵدارییەوە خەریکن.

٨ـ هەواوان: ئەو گوندە نیزیکەی ١٥ماڵە و خەریکی ئاژەڵداری و وەرزێـــڕین و تەنیـــا یەک کیلــۆمەتر لە شـــاری کـــۆیە دوورە و گەڕەکێکیش لە شاری کۆیەیە.

٩ـ کافرۆشان: گوندێکی نێزیکەی ٢٠ ماڵی بووە و ئێستا نەماوە و کاتی خۆی کایان فرۆشتووە و لە دێڕا هێناویانەتە شار.

١٠ــ خەرابە: ئەو گونـــدە ٣ کیلــۆمەتر لە شـــاری کـــۆیە دوورە نێزیکەی ١٢٠ مـاڵێکە و مـوچە و مەزراکـانی هەمـوو بەراون و رەز و باخ و میوەجاتی زۆری هەیە.

## گوندەکانی خۆرئاوای کۆیە بریتین لە:

١ـ گۆپتەپە: ئەم گوندە نێزیکەی ٦٠ ماڵ دەبێ و لە قەراخـی ئەو بیرێکی نەوتی لێیە، بەڵام تا ئێستا کەڵکی لێ وەرنەگیراوە

٢ـ گوزرەیی: ئەو گونـدە ئاقـاری لە ئاقـاری گـۆپتەپەیە و پێـشی چـۆڵ بـووە و ئێـستا ئـاوەدان کـراوەتەوە. ئەو دێـیە شـوێنەوارێکی کۆنی بە نێو (غەریبشا) لێیە.

٣ــ تەکەوڵ: ئەو گونـــدەش هەر چـــۆڵ بـــووە ولە ١٩٥٧ زایینـــی ئاوەدان کراوەتەوە و نیزیکەی ١٣ ماڵ دەبێ.

٤ـ شیواشۆک: شیواشـۆک دووانە، یەکیـان نەوتـی لێـیە و ئەوی تریشیان بە نێوی شیواشۆکی کوردان بەناوبانگە.

٥ــ شـاخە پیـسکە: ئەوەش هەر گونـدێکە لە نێزیـک کـۆیە لە خۆرئاوای شار هەڵکەوتووە

٦ـ کێڵە سپی: ئەو گوندە کاکە زیادی کـۆیە بە سـەری ڕاگەیـوە و نیزیکە ١٥ ماڵێک بووە.

٧ـ کانی دەربەند: ئەو گوندەش لە پێشدا چۆڵ کرابوو ئێستا ئاوەدان کراوەتە و ٢٠ماڵێک دەبێ

٨ـ بانە قەڵات: کە ئەویش دوو گوندن بانە قەڵاتی کوردان و بانە قەڵاتی سەیدان

٩ـ شێخەڕوان یان شێخەسوان: ئەو گوندەش ١٥ ماڵێک بووە و ئێستا نەماوە و لە خۆرئاوای شاری کۆیە هەڵکەوتووە.

# بنەچەکەی مامۆستا کۆیی

مامۆستای بەڕێزی کۆیی ناوی محەمەدە و کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵڵا کوڕی حاجی مەلا ئەسعەد کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵڵای دووهەم کوڕی حاجی مەلا عەبدورەحمان کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵڵای یەکەم ناسراو بە مەلا عەبدوڵڵا مەلازادەیە.

بە داخەوە زۆر گەڕام بەڵام ژیاننامەی هەموو ئەو مەلا گەورە و بەڕێزانەی بنەماڵەی مامۆستای کۆییم دەس نەکەوت. جا هەر بۆیە بە ناچاری ئەوانەی دەستم کەوتوون نووسیومن و ئەوانەش کە دەستم نەکەوتوون جێگای بەتاڵم بۆ داناون کە بەو شێوەی خوارەوەن:

١ـ مەلا عەبدوڵڵای ئەووەڵ: ئەو مەلا عەبدوڵڵایە کە بە مەلا عەبدوڵڵای ئەووەڵ بەناوبانگە کوڕی مەلا محەمەدی مەلازادە کوڕی مەلا برایم کوڕی مەلا حسێن کوڕی مەلا برایم کوڕی مەلا حەسەن کوڕی مەلا ئەبووبەکری جەلییە کە ئەو مەلا ئەبووبەکرە باپیرە گەورە و سەر زنجیرەی زانایانی جەلییەکانە.

مامۆستا مەلا کەریم لە پەڕتووکی "علماءنا فی خدمة العلم و الدین"دا دەنووسێ کە گۆیا بەڕێز مەسعوود محەمەد پیاوێکی مێژووزانەو لە بنەماڵەی زانایانی جەلییە دەڵێ ئێمە هیچ لەحاڵ و ژیواری مەلا عەبدوڵڵای ئەووەڵ نازانین جگە لەوەندەی کە ئەو نەوەی مەلا محەمەدی مەلازادە بووە.

دیارە کە مەلا محەمەدی مەلازادەش هەوەڵ کەسێکە لەو بنەماڵە بەڕێزە لە گوندی گەلاسی ناوچەی پژدەرێ را کۆچی کردووە بۆ ناوچەی رانیە و لە گوندی شیواشان پشتی کێوی ئاواگردی

باکووری شاری کۆیە نیشتەجێ بووە و دەستی کردووە بە وانە وێژی و پێشنوێژی و ڕاگەیاندنی یاساکانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام.

گوندی شیواشان گوندێکی زۆر خۆش و دڵگر و خۆش ئاو و هەوایە و کەوتۆتە نێوانی شارەکانی ڕانیە و کۆیە لە پشتی کێوی ئاواگرد بە دیوی ڕانیەدا. مامۆستا مەلا کەریم نووسیویەتی کە ئێمە نازانین کەنگێ و لە کوێ کوڕەکەی مەلا محەمەدی مەلازادە واتا مەلا عەبدوڵڵای ئەووەڵ لە دایک بووە؟ ئایا لە گوندی گەڵاس و پێش کۆچ کردنی یا لە گوندی شیواشان و دوای کۆچ کردنەکەی؟

بەڵام مەلا عەبدوڵلا زانایەکی گەورە و هەڵکەوتوو لە ڕیزی زانایانی بەرزی کوردەواری بووە و لە سەر پێ و شوێنی باب و باپیرانی خۆی ڕۆیشتووە و وانەی فەقێیانی گوتووە و حوجرە و مزگەوتی ڕازاندۆتەوە. ئەو زانا بەرزە لە دەوروبەری ساڵی ۱۱۵۰ کۆچی مانگی کۆچی دوایی کردووە و بە گوێرەی هێندێک لێکدانەوە ئەو لە ساڵی ۱۱۸۰ کۆچی دوایی کردووە.

۲- حاجی مەلا عبدالرحمن: کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵڵای هەوەڵ کوڕی مەلا محەمەدی مەلازادەیەو. ئەو پیاوە بەڕێزە یەکێک لە زانایانی هەرە بەرز و وانەوێژان (مدرسین)ی لە زەبر و خواناسانی ڕاستەقینەی کوردستان بووە.

مەلا عەبدولرەحمان کە یەکێکە لە سەر زنجیرەی خانەدانی ئایینی و بنەماڵەی زانیاریی جەلی لە شاری کۆیسنجاق، لەگەڵ خوا لێ خۆشبوو عبدالرحمن پاشای بابان دۆستایەتی نزیکی هەبووە و فێرگەکەشی هەر لە ژێر چاوەدێری وی و بە ئەرکی دەوڵەتی لە لایەن ئەو پادشا موسڵمانە کوردەوە بەڕێوە براوە. ئەو پیاوە خودایییە لە ساڵی ۱۲۲۸ کۆچی مانگیدا کۆچی دوایی کردووە.

بەڕێز مەلا محەمەدی مەلازادە باپیری حاجی مەلا عبدالرحمن جلی دانیشتووی گوندی شیواشان واتا شیوی ئاشان یا دۆڵی ئاشان کە لە پشتی کێوی "ئاواگرد"ی پشتی کۆیەیە، کوڕی مەلا برایم کوڕی مەلا حەسەن کوڕی مەلا برایم کوڕی مەلا حەسەن کوڕی مەلا ئەبووبەکرە کە ئەو بەڕێزانە هەموویان خەڵکی گوندی گەلاسی ناوچەی پژدەرن.

گەلاس گوندێکی خۆش ئاو و هەوا و خاوەن باغات و مووچە و مەزرای جوان و شاخاوییە لە بناری پژدەرێ و ئێستا وەک هەموو گوندەکانی دەوروبەری خۆی بە هۆی بەعسییەکان وێران کراوە و کەسی لێ نەماوە، بەڵام ئێستا زۆرتر بە "بی گەلاس" بەناوبانگە.

وا دیارە کە بە هۆی ئەوەی کە باپیرانی مامۆستای کۆیی مەلا بوون و مەلاش لە کوردستاندا قەت نیشتەجێی یەکجاری نەبووە و هەمیشە باری لە سەر پشتی وڵاخی بووە و لەم دێیە بۆ ئەو دێیە رۆیشتووە ئەوانیش هەر وەک مەلای دیکە لەم هاتوچۆیە بێبەش و بەهرە نەبوون و هەر بۆیە دەبینین کە پێشێ جێی نیشتەجێ بوونیان گەلاس بووە دوایە بۆتە شیواشان.

جا بەڕێز جەنابی حاجی مەلا عبدالرحمن جەلی لە گوندی شیواشانە لە دەوروبەری ساڵەکانی ١١٤٠ کۆچی مانگی لە دایک بووە و هەر لە ماڵی خۆیان کە بە راستی ماڵی ئایین و زانیاری بووە دەستی بە خوێندن کردووە و قورئانی پیرۆز و پەرتووکە ردەڵەکانی باو لە نێو مەلا و فەقێکانی کوردستاندا تەواو کردووە و ئەمجار رۆیشتۆتە نێو فەقێیان و پاش ماوەیەک کە بۆتە فەقێیەکی تەواو و ژیکەڵە چۆتە خزمەت مەلا سەیید خدری حەیدەری کە زانایەکی کەم وێنە بووە و لە خزمەتی دامەزراوە و تا تەواو کردنی دەورەی فەقێیەتی هەر لە خزمەتی ماوەتەوە و ئیجازەشی هەر لە خزمەت ویدا وەرگرتووە.

دوای تەواو بوونی دەورانی فەقێیەتی و ئیجازەی مەلایەتی وەرگرتنی چۆتە گوندی جەلی لە داوێنی کێوی ئاواگرد لە باکووری شاری کۆیە و دەستی کردووە بە مەلایەتی و ڕێنوێنی خەڵک و وانەوێژی و بڵاو کردنەوەی یاساکانی پیرۆزی ئیسلام و وەک هەموو مەلایەکی دیکەی کوردەواری بە هەژاری و نەداری و تەنگدەستی رایبواردووە و بە یارمەتی خەڵکی هەژار و دێ نشین فەقێی ڕاگرتوون و بە خێوی کردوون.

کاتێک کە عبدالرحمن پاشای بابان شاری کۆیەی گرت و خستییە ژێر دەستی خۆی ئاڵوگۆڕ و گۆڕانکارییەکی بەرچاوی لە شاردا وەدی هێناو زۆر کاری گەورەی ئەنجام دان کە یەکێکیان ئەوە بوو کە دەستووری ساز کردنی مزگەوت و فێرگەی دا و فێرگەیەکی باشی لەو شارەدا دروست کرد و فەرمانی دا مەلا عبدالرحمن جەلی لە گوندی جەلی ڕا بهێننە کۆیە و بەو شێوە مامۆستاش فەرمانی شای ئەنجام دا و هاتە کۆیەو بوو بە پێشنوێژو وانەوێژی ئەومزگەوتە و ئەو فێرگەی کە عبدالرحمن پاشا دروستی کردبوون.

ئەمجا لەوە بەو لا خۆی و فەقێکانی بە مووچەی میری بەڕێ دەچوون. شا ڕێز و حورمەتێکی یەکجار زۆری بۆ مەلا عبدالرحمن جەلی دادەنا و چاکەی زۆری لەگەڵ دەکرد و پشتیوانی بێ دریغی خۆی لێ دەردەبڕی و بەو جۆرە خوای گەورە هێندەی دیشی گەورە کرد و پلە وپایەی لە نێو خەڵکدا بەرز و بەرزتر بۆوە، تا سەرەنجام ئەو مامۆستا بەڕێزە بوو بە مامۆستای گشتی و فتوادەر بۆ هەموو شار و دەوروبەری و خەڵک لە هەموو لایەک ڕا دەهاتن بۆ لای و گرێ پووچکەکانی ژیانی کۆمەڵایەتی و پێسیرەکانی ئایینی خۆیان لای ئەو شیتەڵ دەکرد.

ئەو زانــا بەرێــزە لەگەڵ ئەوەش کە نووســەرێکی دەس ڕەنگــین بــووە بەڵام بە شــێوەی کتێــب جــگە لە: ١ــ نــامیلکەیەک لەبــارەی چەسپاندنی بوونی خودادا (اثبات وجود الواجب) ٢ـ ڕاڤە (شــرح)ێــک لە سەر نامیلکەی ژمێرامە (رسالە حساب بها الدین عاملی) کە وەک مامۆستا مەلا کەریمی مدرس نووسیویەتی بە ڕاستی زۆر شتی دیــکە وی ون بووە و یان هیچی دیکەی نییە یان هەیبووە و نەماوە، بەڵام زۆرتر هەر خەریکی پەراوێز و کۆبە لێنانی کتێبەکانی دیکە بــووە و بە ڕاستی لەو بــارەدا دەستێکی بــاڵای هەبــووە و بــۆ خــۆش کردنــی پەرتووکەکانی پێشینیان کەم وێنە بــووە و بــۆ نمــوونە کۆبەی لەو کتێبانە ناوە:

١ـ شرح ملا جامی ٢ـ شرح کمال الدین ٣ـ شرح ملا عبـدالله یـزدی ٤ـ جلال المنطق ٥ـ شرح العقائـد النفسیة ٦ــ مختـصر المعـانی ٧ــ المطول ٨ـ شرح جمع الجوامع ٩ـ المنهج المکیة فـی شرح القـصیدة الهمزیة ١٠ـ شرح فتح المبین ١١ـ أشکال التأسیس فـی الهندسـە ١٢ــ تفسیر البیضاوی ١٣ـ تحفة المحتاج.

دیارە ئەو پەراوێزانە هەموویان بە شێوەی (مدون) لە سەرێڕا تا خوارێ هەر کامە وەک یەک کتێب نووسراون و بەڵام بە داخەوە تــا ئێستا هیچیان چاپ نەکراون و دەستی خەڵکیان پێ ڕانەگەیوە.

جــا ئەو بەرێــزە دوای نێــزیکەی حەفتــا و حەوت ســاڵ ژیــان و خەبات و خزمەت و تێکۆشان لە ساڵی ١٢١٧ی کۆچی مانگیدا کــۆچی دوایــی کــردووە. ئەو حــاجی مەلا عبـدالرحمن بە مەلای کــاکیش هەر بەناوبانگ بووە. دوای خــۆی فێــرگە و مــزگەوت و کــار و پیــشەکەی خــۆی بــۆ کــوڕەکەی خــۆی حــاجی مەلا عبـدالله بەجــێ هێــشتووە و ئەویــش بە جــوانی و بە چــاکی ئەرک و ســپاردەی خــۆی بە جــێ هێناوەو دەستی کردووە بە مەلایەتی و وانەوێژی.

لە نمـــوونەی هەڵکەتـــوو و بلیمەتـــی بەڕێـــز حـــاجی مەلا عەبدورەحمان دەگێڕنەوە کە کاتێک لە خزمەتی باوکی خۆی حـاجی مەلا عەبدوڵلای هەوەڵ دا دەچێتە حەجێ بە هۆی ئەوەی بابی بڕێک پیرو هان دەبێ بەرگی مەلایەتی دادەنێ و بە جلوبەرگی کوردییەوە لە خزمەت باوکیدا دەبێ بۆ ئەوەی، چونکە بـابی جاری وا دەبـێ پێویستی بە لە کۆڵ کردن و خزمەتی زیادە دەبێ وا بە باش دەزانـێ کە بە بەرگی کوردییەوە خزمەتی بابی خۆی بکات و لە کۆڵی کا تا نیشانیش بدا کە کوڕی کورد چۆن خزمەتگوزار و ڕاژەکـاری بـاوکی خۆیەتی.

لە شاری ریازێ وەک گەلێک لە زانایانی جیهانی ئیسلام دەچێتەماڵی مفتی و لەوێ بە هۆی ئەوە کە هیچیـان نمـوودێکی ئەوتۆیـان نابێ لە خـوارەوەی هەموویـان دادەنیـشن و ئەو شـەوە کە چەنـدین زانـای گەورەی جیهـانی ئیـسلام لەوێ دەبـن و کێـشەیان لە سـەر جێگایەکی کتێبی توحفە دەبێ و هیچیان نایزانن مفتی دەڵـێ وام پـێ باشـە ئەو مەسـەلەیە بنووسـین و بینێـرین بـۆ شـاری کـۆیە بـۆ بنەمـاڵەی جەلیزادەکـان رەنـگە ئەوان بتـوانن لەو گـرێ پـووچکە رەهامان کەن و ئەو مەسەلەمان بۆ شی بکەنەوە.

حاجی مەلا عەبدوڵلا کە ئەو مەسەلەی گوێ لـێ دەبـێ بە مفتـی دەڵێ لەو کوڕەی من بپرسنەوە بۆتـان حەل دەکا. مفتی کە زۆری پێ سەیر دەبێ و زۆریشی پێ خۆش دەبێ مەسەلەکەی لەو بنەوپـاڵەوە بـۆ حەل بکـرێ. دەڵـێ: ئەتـۆ کێـی؟ عەرزی دەکـا مـن یەکـێکم لە هەمـوو جەلیزادەکـان کەمتـرم. بەڵـێ پەڕاوی تـوحفە وە پـێش مەلا عەبـدورەحمانی رانـک و چـۆخە دە بەر دەنـێن و ئەویـش هەر لە نووڕا دەڵێ قوربان ئەوە بۆیە لێتـان تێک چووە چـونکە خەبەری موبتەدایەکتان لێ ون بـووە و نەتانـدۆزیوەتەوە کە دوو سێ لاپەڕە

دووره و لە فڵان دێڕی فڵان رووپەڕەیە و توحفەش شتی وای زۆر تێدایە.

جا تەماشا دەکەن قسەکەی مەلا عەبدوڕەحمان دروستە و زۆری رێز بۆ دادەنێن و لە گەڵ باوکی دەیانبەنە لای سەرەوە و ناهێڵن تا کاتی گەڕانەوەیان لەوێ بڕۆن. بەڵێ حاجی مەلا عەبدوڕەحمان لەوێ بە تەواوی گەلانی موسڵمانی نیشان دا کە کورد زانیاری ئیسلامییان لە هەموو کەس پترە و لە هەموو کەسیش پتر دە خزمەت باوکی خۆیان دان.

٣- حاجی مەلا عەبدوڵلای دووهەم:

ئەو حاجی مەلا عەبدوڵلایە کوڕی حاجی مەلا عەبدوڕەحمانی کاکی جەلییە و یەکێکە لە هەرە پیاوە ماقووڵ و زانا بەناوبانگەکانی شاری کۆیە، وانەوێژێکی خواناس و هۆزانێکی هەڵکەوتوو و پیاوێکی بەسام و شەرم لێ کراو و نەبەز و خۆڕاگر و قاییم و قۆڵ بووە.

ئەو پیاوە بەڕێزە تەواوی خوێندنەکەی هەر لە خزمەت باوکی بەڕێزی خۆی "حاجی مەلا عەبدوڕەحمانی کاکی جەلی" بووە و هەمووی لە لای وی خوێندووە. دوای ئەوەی کە لەساڵی ١٢١٧ی کۆچی مانگی باوکی بەڕێزی کۆچی دوایی کرد و حاجی مەلا عەبدوڵلا لە جێی بابی دانیشت و دەستی کرد بە وانەوێژی و پێشنوێژی و خەڵک رێنوێنی کردن بۆ رێبازی پاکی ئیسلام، گەلێک فەقێ لە سەر دەستی پێگەیون و خزمەتێکی باشی بە خەڵک و ئاپینی پیرۆزی ئیسلام کردووە.

بەرواری لە دایک بوونی ئەو پیاوە گەورەمان بە داخەوە بۆ روون نەبۆوە. بەڵام وا دەردەکەوێ کە لە بەینی ساڵەکانی ١١٩٣ و

١٢٠٠ لە شاری کۆیە لە دایک بووبێ چونکە لە١١١٧ کە لە جێگای بابی دانیشتووە و دەستی کردووە بە وانەوێژی و مەلایەتی، دیارە خوێندنەکەشی تەواو کردووە و لانی کەم دەبێ لە نێوانی ١٧ تا ٢٠ ساڵەیدا بووبێ.

ئەو بەرێزە تا ساڵەکانی ١٢٤٦ و ١٢٤٧ ئەو هەمووە ئەرکە گرانەی بە ئەستۆوە بووە و بە چاکیش بەڕێوەی بردووە و ئیتر لە یەکێک لەو دوو ساڵەدا کە بە جوانی روون نییە کۆچی دوایی کردووە. خوا لێی خۆش بێ و جێگەی بەهەشتی بەرین بێ.
یادگارێکی کە لە دوای خۆی بۆ خەڵکی موسڵمانی بە جێ هێشتووە بریتییە لە:

١ـ وسیلة الوصول الی ساحة عنایة الرسول، کە لە بارەی ژیاننامە(سیرە)ی پێغەمبەری خوادا) بە هەڵبەست نووسیویەتی.

٢ـ کۆبە و پەراوێزی رێکوپێک لەسەر قسطلانی شرح بخاری.

٣ـ پەراوێز لەسەر پەرتووکی انسان العیون.

٤ـ پەراوێز لەسەر کتێبی جامع الاصول ابن اثیر.

٥ـ نامیلکەیەک لەبارەی دروست نەبوونی خێر کردنی کەسێک کە ئەو وامانەی لەسەر نێی بە قەدەر سامانەکەی بن.

٦ـ کتێبێک لەسەر شێوەی الاتقان فی علوم القرآن للشیخ جلال الدین السیوطی و لە بارەی زانیارییەکانی قورئان دایە.

٤ـ حاجی مەلا عەبدوڵڵای سێهەم:

حاجی مەلا عەبدوڵڵای سێهەم جەلیزادە کۆیی سەرۆکی زانایانی کوردستان کوڕی حاجی مەلا ئەسعەد کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵڵای دووهەم کوڕی حاجی مەلا عەبدوڕەحمان جەلی کوڕی حاجی مەلا

عەبدوڵلای هەوەڵە (یا خوا خوا لێیان خۆش بێ).

ئەو زانا مەزنە لە بەینی ساڵەکانی ١٢٥٠ تا ١٢٦٠ لە شاری کۆیە هاتۆتە سەر دنیایە و هەر لە ماڵی خۆیان کە بە راستی جێگەی زانست و زانیاری و فێر کردن و بارهێنان بووە پەروەردە کراوە و دەورانی سەرەتایی خوێندن و قورئانی پیرۆز و کتێبە وردەڵەکانی لە خزمەت باوکی بەڕێزی خۆی تەواو کردوون.

ئەوجا نێرراوەتە حوجرەکەی خۆیان ئەو فێرگە گەورەی کە لە لایەن پادشایانی کوردی موسڵمانی بابانییەوە پیتاکی تەواوی پێ دەدرا و مەلا و زاناکانی جەلیزادەی کۆیی بە هاوکاری گەلێک لە زاناکانی دیکە بەڕێوەیان دەبرد و پەروەردگایەکی گەورەی مەلا و فەقێکانی کوردستان بووە.

مەلا عەبدوڵلا لە تافی لاوەتیدا فەقێیەکی زۆر زیرەک و بیر تیژو خاوەن سەلیقە بوو و زۆر زوو بوو بە گەنجێکی لێهاتوو و هەڵکەتوو و تەواوی زانیارییەکانی ژیرامەیی و گێڕاوەیی (عقلی و نقلی) خوێندوون و تێیاندا بۆتە مامۆستا. ئەو لە وێژە و فەرهەنگی عەرەبیدا دەستێکی باڵای هەبووەو بیرو هەوای نیشتمان پەروەری و کۆمەڵایەتی و رامیاری لە کەللەیدا زۆر بووە. بە فەقێیەتی بۆ خوێندن لەگەڵ حاجی قادری کۆیی چۆتە ناوچەی باڵەکایەتی و لە خزمەت چەندین زانای بەرز و بەڕێزی وەک مەلا محەمەدی خەتتی، مەلا شێخ تەهای سوورە شوری، مەلا محەمەدی کوڕی کاک عەبدوڵلا کە هەرسێکیان لە بنەماڵەی بەڕێزی زانایانی وەتمانی باڵەکایەتین خوێندوویەتی و کەڵکی وەرگرتووە.

ئەو پیاوە بەڕێزە هەروەک هێمای پێکرا لە گەڵ حاجی قادری کۆیی هاوچەرخ بووە و حاجی قادر لە نامەیەکدا کە بە هەڵبەست

بۆی نووسیوە و دوای چەندین ساڵ ئەو سەفەرەی بیر دێنێتەوە کە وێکڕا چوونە باڵەکایەتی و ئەو دەم، حاجی قادر پێخواس بووە و لە بەر دەردی هەژاری وەک هەموو فەقێیەکی کوردەواری تام و چێژەی ژیواری زۆر دژواری فەقێیەتی چێژتووە و بە هەڤاڵەکەی خۆی دەڵێ:

حاجی قادر ئەو کاتی کە ئەو نامە بۆ حاجی مەلا عەبدوڵڵا دەنێرێ خۆی لە ئەستەمبوڵ دەبێ و حاجی مەلا عەبدوڵڵاش لە کۆیە.

ئەو زانا بەرزە کوردە هەر وەک زانایەکی کەم وێنە و بلیمەت بووە هۆنەر و هەڵبەستەرێکی خاوەن هەست و بیر ناسکیش بووەو هۆنراوەی زۆری بە زمانەکانی کوردی، فارسی و عەرەبی نووسیوە.

بەڕێز بابا مەردووخی رووحانی (شیوا) ـ خوا پاداشی بداتەوە ـ نموونەی لە هۆنراوەی کوردی وفارسییەکانی وی هێناوە و ئێمەش بۆ نموونە کەڵکیان لێ وەردەگرین.

نموونەی هۆنراوەی کوردی حاجی مەلا عەبدوڵڵا جەلیزادە کۆیی:

ئەوەش نموونەی هۆنراوەی فارسییە تی:

رزاق رزق بخشد پس تن چرا نهی
در زیر منت دونان برای نان
گر عارفی چرا عمل جاهلان کنی
ور جاهلی نشسته چرا جای عارفان
چون مال ظل زائل و اقبال لابقا است
دل را به حق گذار و گذر از این و آن
دامان عزم و کمر همت استوار

دیـــوانەوار خـــود را بە دیـــار عمـــر رســـان
ســـر را فـــرو نیـــاور، بهـــر نـــان بە کـــس
از حـــق طلـــب اعـــانە هـــو الحـــی مـــستعان

حاجی مەلا عەبدوڵڵای سێهەم پیاوێکی گەلێک ئازا و بەکار و نەیار بەزێن و دوژمن تۆقێن بووە. زۆر کەس ویستوویانە لە شاری کۆیە وەدەری نێن و ئەمجا بە کەیفی خۆیان خەڵکی شار و دەوروبەری بچەوسێننەوە و بە ئارەزووی خۆیان و بۆ کەڵک و قازانجی خۆیان هەڵیانسووڕێنن بەڵام حاجی مەلا عەبدوڵڵا بە توندی لە بەرابەریاندا راوەستاوە و هەموو نەخشەکانی وانی کردۆتە بلْقی سەر ئاوێ.

لەو دوو هەڵبەستەی شێخ رەزای تاڵەبانی کە لە گەڵ وی هاوچەرخ و دۆست بووە و لە بارەی ویدا نووسیویەتی ئەو مەبەستە بە جوانی خۆی دەنوێنێ و دەردەکەوێ کە دەڵێ:

حـــاجی عەبـــدوڵڵا لە ئـــادەم فیلتـــرە
بـــا وجـــوودی روتـــبەی پێغەمـــبەری
ئەو بە ســـەد شـــەیتان لە کـــۆیە دەرنەچـــوو
ئەم بە یەک شـــەیتان لە جەنـــنەت دەرپەڕی

ئەو هۆنەرە هەستیارە بە جوانی رایدەگەیەنێ کە ئەوانەی نەیاری حاجی مەلا عەبدوڵڵان نەک هەر تەنیا لە سەر هەق و ڕەدا نین و بەس بەڵکە هەر شەیتان و شۆڤاریشن و کارەکەیان کارێکی شەیتانی و دژی گەلی و دژی خواییە.



وێنەی شێخ ڕەزا

شـێخ ڕەزای تاڵەبـانی کەرکـووکی، کە وەک گـوترا دۆسـتێکی نێزیکی حاجی مەلا عەبدوڵڵا بووە لە پارچە هەڵبەستێکی چووکەی فارسیدا هۆنراوەی خۆی و زانیاری ئەو پێک هەڵدەسەنگێنێ و دەڵێ هۆنراوەی من و زانیـاری تۆ بە هەمـوو وڵاتـدا بڵاو بـوونەتەوە و هەمـوو کەس لێـی روونە کە چ ئەنـدازەن و هـیچ کەس نـاتوانێ نەیارییان بکات.

بەڵێ شێخ ڕەزا پێی هەڵـدەڵێ و رادەگەیەنـێ، کە ئەو لە هەموو نەنگێـک بە دوورە و ئەگەر نەنگێکـی هەبـێ ئەوەیە، کە گۆشـتی زانایان ژاراوییەو هەموو کەس ناتوانێ گۆشتیان بخوا چونکە ئەوان

وەک نەزانان نین هەر کەس گۆشتیان بخوا ژارخواردوو دەبێ و پێی دەمرێ، جا بەو جۆرە لە بارەی ویدا دەڵێ:

عیـب در ذات تـو ای کـان کـرم معـدوم اسـت
مگـر ایـن عیـب که لحـم علمـا مـسموم اسـت
شـعر مـن از هـمه سـو در هـمه کـشور جـاری
علـم تـو در هـمه جـا بـر هـمه کـس معلـوم اسـت
مـی‌رود شـعر مـن و علـم جهـانگیر شـما
هـر دو بـی فایـده تـا جـای اقامـت روم اسـت
نـامه بنـویس به هـر نـوع دلـت مـی‌خواهـد
همـه سـحر اسـت اگـر نثر اگر منظوم است

بەڵێ شێخ رەزای رەحمەتی خوا لێی خۆش بێ لێرەدا ئاماژە بەو مەتەڵە کوردییە دەکا کە دەڵێ (بەرد لە جێی خۆ بەسەنگە) بێگومان کاتێک هەڵقەنرا بەولاو لایاندا فڕێ دەدرێ و خلـلۆر دەبێتەوە جا دەڵێ: من و تۆش چۆن لە وڵات و زێدی خۆمان هەڵقەنراوین و، تا ئەو کاتە جێگای مانەوەمان ڕۆم بێ و لە ژێر سێبەری شوومی تورکاندا بین، هۆنراوە زانیارییەکەمان هەر بەفیڕۆ دەڕوا، چونکە نەیار هەرگیز سەرکەوتن و پێشڕەفتی ئێمەی ناوێ حاجی مەلا عەبدوڵڵای سێهەم دوای تەواو کردنی دەورانی فەقێیەتی و ودەمی مەلایەتی وەرگرتنی لە باوکی بەڕێزی وەکوو جێ نشینێک بۆ بابی دەستی کرد بە وانەوێژی و تەواوی کاروبارەکانی باوکی ئەنجام دەدان و باوکیشی چاوەدێری دەکرد ولە ژێر چاوەدێری ئەودا خەریکی ئەنجام دانی ئەرک و سپاردەی خۆی بووە. جا ئا بەو جۆرە توانی دەسەڵات و توانایەکی گەورە و تەواو لەم کارەدا وەدەس بێنێ و بە جوانی لە کۆڵ دەربێ.

لە ساڵی ١٢٨٠ کۆچی مانگیدا لە خزمەت باوکیدا چۆتە حەجێ و دوای ئەنجام دانی رێورەسمی حەج لە مەککە حاجی مەلا ئەسعەدی باوکی کۆچیی دوایی دەکا و لە گۆڕستانی "المصلی" بە خاک دەسپێردرێ و حاجی مەلا عەبدوڵلا دوای مردنی باوکی بە تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان و ماوەی یەک ساڵی تەواو دەخایەنێ تا دەگاتەوە نیشتمانی خۆی کۆیسنجاق.

کاتێک کە گەیشتۆتەوە کۆیە خەڵک و مەلاکان پێشوازییەکی گەرمیان لێ کردووە و ئەمجا بە شێوەی رەسمی و یەکجاری لە جێی باوکی دانیشتووە و هەموو ئەرکەکانی خۆی و باوکی وە ئەستۆی خۆی گرتووە و ئەنجامی داوە.

لە ساڵی ١٢٩٢ مانگی سەفەرێکی چەند رۆژەی بۆ بەغدایە کردوەو چۆتە خزمەت زانای ناودار و بلیمەت و بێوێنەی کورد مفتی زەهاوی و خۆی پێ ناساندووە. مفتی کاتێک کە لە زیرەکی و هۆشیاری و پلە و پایەی زانیاری حاجی مەلا عەبدوڵلا ئاگادار دەبێ رێزێکی زۆری لێ دەگرێ و بە دیداری زۆر خۆشحاڵ دەبێ و بە دۆستایەتی و هاوکاری لەگەڵ کردنی دڵ خۆش دەبێ.

ئەو سەفەرەی حاجی مەلا عەبدوڵلا بە رێکەوت لەگەڵ سەفەری بەڕێز جەنابی کاکەحمەدی شێخ کوڕی هۆزانی کورد شێخ مارفی نۆدێی هاوکات دەبێ. ئەو دووانە لە بەغدایە چەندین جار پێکەوە دیدار و را گۆڕینەوە دەکەن و پەیمان و بەڵێنی دۆستایەتی لەگەڵ یەکتری نوێ دەکەنەوە. هەروەها مەلا عەبدوڵلا لەگەڵ گەلێک لە پیاوە گەورەکانی شاری بەغدا ئاشنایەتی و دۆستایەتی پەیدا دەکاو هەموویان رێزێکی یەکجار زۆری لێ دەگرن. بەتایبەتی لەگەڵ بەڕێز محەمەد ئەفەندی جەمیلزادە دیدار دەکا و دەبنە دۆستی یەکترو

جەمیلزادە نرخ و ڕێزێکی زۆری بۆ دادەنێ و زۆر خۆشی لێی دێ و لە لای پیاو ماقووڵانی شاری بەغدایە زۆری بە چاکی باس دەکا و دەیناسێنێ و بەو شێوە حاجی مەلا عەبدوڵڵا لە شاری بەغدایەشدا نێوبانگی زۆر پەیدا دەکا و دەناسرێ و هەروەها ئەویش خەڵک دەناسێ.

دوای گەڕانەوەی لە بەغدایە زۆری پێ نەچوو کە شەڕ لە نێوان دەوڵەتی عوسمانیو رووسیای قەیسەریدا ڕاگەیێنرا و هەر لە هەمان ساڵی ١٢٩٢دا شەڕ دەستی پێکرا و گەلێک لە هۆز و خێڵە کوردەکانیش هەستی ئایینی هانی دان بۆ ئەوەی کە پشتیوانی لە دەوڵەتی عوسمانی بکەن و بەو جۆرە ئەوانیش چوونە ناو شەڕەکەو کوشتارێکی زۆریشیان لێکرا.

حاجی مەلا عەبدوڵڵاش وەک فەرماندەیکی لێزان و سەربازێکی فیداکاری ئیسلام هاتە مەیدان و جۆرێک چووە ناو جەرگەی شەڕەکەوە کە هەتا شەڕ تەواو نەبوو نەگەڕایەوە و ئەوپەڕی دلێری خۆی نیشان دا. جا ئەو کاتە دەورانی فەرماندەیی سمایل پاشای عوسمانی بوو مەلا عەبدوڵڵا لەو سەفەرەدا چەندین جار دیدار و کۆبوونەوەی لەگەڵ کرد و دۆستایەتی لە نێوانیاندا پتەوتر بوو. بنەماڵەی جەلییەکان چەندین پارچە زەمین و زەوی و زار و گوندیان لە دەوروبەری کۆیە هەبووە کە دەوڵەتی عوسمانی پێش ئەو شەڕە لێی داگیر کردبوون بەڵام دوای ئەو شەڕە بە هۆی ئەو سەرکەوتن و دلێرییانە کە حاجی مەلا عەبدوڵڵا خۆی نیشانی دان، دەوڵەت مانگانەیەکی باشی کە بریتی بوو لە یەک هەزار قرۆشی عوسمانی بۆ خۆی و بنەماڵەکەی بڕییەوە. بەڵام زەمینەکان و گوندەکانی هەر نەدانەوە. کە بە ڕای من چاک بوو نەیدانەوە دەنا بێ گومان زەبرێکی شوێن دانەر لە سەر کەسایەتی و

فیداکارییەکانی ئەو پیاوە گەورە دەبوو. لەوانەشە کە خودی حاجی مەلا عەبدوڵڵا هەر داواشی نەکردبێ و لە بنیڕا وە گوێی شای هەڵنەهێنابێ. چونکە لەوانەبوو خەڵک بڵێن هەر بۆ ئەوە ئەو هەموو دلێریەی لە خۆی نیشان داوە تا مڵکە داگیر کراوەکانی بدەنەوە.

دوای دامرکانی شەڕی نێوان عوسمانی و رووس ناکۆکی لە نێوان عوسمانی و ئێراندا پەیدا بوو. بۆ لە ناو بردنی ئەو ناکۆکییە، دەوڵەت حاجی مەلا عەبدوڵڵای بە نوێنەری لە گەڵ عەبدوڵڵا پاشای رەواندزی نارده ئێران بۆ وتوویژ لەگەڵ کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێران. ئەوان چوون و زۆر بە سەرکەوتویی گەڕانەوە و حاجی مەلا عەبدوڵڵا هەر کە گەیشتەوە کۆیە میدالیەی دەرەجە سێی مەجیدی پێشکەش کرا. ئەو وتوویژەی کە لە گەڵ نوێنەرانی دەوڵەتی ئێران کردی لە شاری مەهاباد بوو.

ئەوزانا بەرزە بەهۆی زانیاری زۆری خۆی و لێزانی وکارامەیی و هەروەها بە هۆی لێهاتوویی و لێوەشاوەیی و ئازایەتی و نەبەزی و تێکۆشەری و خەباتگێڕی خۆیەوە تا ما رۆژ لەگەڵ رۆژ بەرەو سەرکەوتن دەچوو و رێز و حورمەتێکی لە نێو خەڵکدا پتر دەبوو و پلە و پایەی پتر پێ هەڵا دەچوو و دەستی لە وانەوێژی و راگەیاندنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام شل نەکرد تا دەورانێک کە دیتی وا یەکێکی زۆر لە خۆی ئازاتر، زاناتر، وریاتر، لێزانتر، دڵسۆزتر، هۆشیارتر، نەبەزتر، کۆڵنەدەرتر وا پێ گەیوە و هاتۆتە مەیدانی خەبات و تێکۆشان و دەتوانێ جێگەی ئەو پڕ کاتەوە. جا تۆ خودا دەبێ کێ لە هەموو ئاکارێکدا لەو پاڵەوانە قارەمانە هۆزانە بلیمەت و پسپۆڕە بالاتر بێ؟

بێ گۆمان ناکرێ و نابێ و نالوێ و ناشێ کە ئەو کەسە جگە لە مەلا محەمەدی کوڕی، کەسێکی تر بێ. جا کاتێک کە وەهای دیت و زانی کە مەلا محەمەدی کوڕی کەسێکە کە دەتوانێ لە جێی وی دانیشێ و لەویش باشتر ئەرکەکان بە جێ بێنێ تەواوی کاروباری مەلایەتی و وانەوێژی حەواڵە بەوی کرد و لە جێگای خۆی داینا و ئەمجا خۆی خەریکی موتالا کردن و خوا پەرستی و چاوەدێری کاروباری کوڕە هەڵکەوتووەکەی بوو.

حاجی مەلا عەبدوڵڵا بە هۆی ئەوەی، کە لە دەورانی فەقێیەتیدا لە گەڵ کاکەحمەدی شێخ و شێخ عەلی ئەفەندی لە فێرگەی حاجی مەلا ئەسعەدی باوکی وێکڕا خوێندبوویان زۆری هۆگری بەو دوو پیاوە گەورەوە هەبوو دۆستایەتی و نێزیکی زۆریان پێکەوە هەبووە. ئەوانە لە دەورانی ژیانیاندا هەمیشە پێکەوە پێوەندییان هەبووە و نامەیان بۆ یەکتر نووسیوە، کە مامۆستا مەلا کەریم مودەڕڕیس - خوا پاداشی باشی بداتەوە - هێندێک لەو نامانەی لە کتێبی یادی مەردانلدا تۆمار کردوون.

وەک هێمای بۆ کرا حاجی مەلا عەبدوڵڵا پیشەی وانەوێژی و پێشنوێژی حەواڵە بە مەلا محەمەدی کوڕی کرد کە دیارە ئەو کارەی لە ساڵی ١٣١٨ی کۆچی مانگیدا کردووە و دوای ئەوەش تەنیا هەشت ساڵان ژیاوە و لە ساڵی ١٣٢٦دا دوای نیزیکەی ٧٦ ساڵ ژیانی پڕ لە شانازی و پڕ لە خەبات و تێکۆشانی مەردانە کۆچی دوایی کردووە. یا خوا بەر بارانی بەزەیی و میهر و دروودی خوا بکەوێ.

جارێک حاجی مەلا عەبدوڵڵا لە ڕێگوزەرێکدا ڕێی دەکەوێتە پژدەرو لەلای شێخ قادری سندۆڵان میوان دەبێ. شێخ هەر کە هەواڵی هاتنی حاجی مەلا عەبدوڵڵای پێ دەگا بە خۆی و تەواوی

دەروێشەکانییەوە بە پیرییەوە دەچێ و لە گەڕانەوەدا بۆ نێو گوندی سندۆڵان دەروێشەکان بە فەرمانی شێخ دەس دەکەن بە دەفە لێدان و جەزم بوون و های و هۆی. حاجی مەلا عەبدوڵڵا کە سواری گوێدرێژێک دەبێ و گوێدرێژەکە بەو دەفە و بەزم و هەرایەی دەروێشان چۆلاغ دەبێ و دەسڵەمێتەوە و بەو لا و لایاندا دەردەپەڕێ شێخ دەیهەوێ تەنانەت کەڵک لەوەش وەربگرێ و دەڵێ جەنابی مەلای دەفە لێدان و گوتن و زیکری دەروێشەکان ئەوەندە بەسۆزە تەماشا کە چ شوێنەوارێکی لە سەر کەرەکەی تۆ داناوە؟! تەماشا چۆن ئەویش هەر جەزم بووە؟! حاجی مەلا عەبدوڵڵاش کە دیارە لەو جۆرە کەسانە نەبووە هەروا بە ئاسانی و زووبەزوو هەڵخەڵەتێ دەڵێ: نەخێر یا شێخ کەرەکەی من خۆی نەقشبەندییەو کەیفی بە قادریان نایەت؟ بۆیە وا دەکا.

جا با ئەوەش بزانین دوو رچە (طریقت)ی قادری و نەقشبەندی هەر ئەو دوو رچەن کە مەلای گەورە لە بارەی واندا دەڵێ:

تەریقەی قادری و نەقشبەندی
بە پای دا رەونەق و ئاهەنگی کوردی

بەڵێ جەنابی مەلا عەبدوڵڵا کە هەم لە فەقێیەتیدا و هەم لە مەلایەتیدا ناوبانگی زیرەکی و پیتۆڵی و پسپۆڕی وەک هەوای ئازادی لە کوردستان گەڕابووە سەرەتای خوێندنەکەی لە خزمەتی باوکی بەڕێز و خۆشەویستی دەس پێ کرد و هەر لە خزمەت ویشی تەواو کرد و سەرەنجام دوای ماوەیەک گەڕان بۆ کۆ کردنەوەی زانیاری گەڕاوەتەوە لای باوکی و لە حوجرە پیرۆزەکەی خۆیان ئارامی گرتووە و هەر لەوێ و لە هەڵسووڕێنەر و وانەوێژی ئەو فێرگە بەناوبانگە ودەمی مەلایەتی وەرگرتووە.

بەڕێز حاجی مەلا عەبدوڵڵا دوای ئەوەی کە لە حوجرە پیرۆز و مبارەکەکەی خۆیان لە کۆیەدا ماوەیەکی باش ماوەتەوە و وانەی زانیارییە ئیسلامییەکانی خوێندووە و تا رادەیەکی زۆر لە زانیاریدا خۆی تەییار و ئامادە کردوە و ئەمجا وەک هەموو فەقێیەکی هەژاری کوردستان لە ماڵی خۆیان وەدەر کەوتووە و بەو لا و لایاندا رۆیشتووە و بۆ خڕ کردنەوەی زانیاری ئێرە و ئەوێی کردووە. لە هەر خەرمانێک خەرمانلۆغەیەکی وەرگرتووە و لە هەر باغێک گوڵێک و لە هەر بێستانەی چڵێکی چنیوە. لە خزمەتی گەلێک لە مەلا بەرز و بەڕێزەکانی کوردستان وانەی زانیاری ژیرامەیی و گێڕراوەیی (عقلی و نقلی) خوێندووە و لە هەر بلیمەت و پسپۆڕێک کەڵکێکی وەرگرتووە. لەو هەموو گەڕان و هەڵخولانەدا جارێک لە گەڵ حاجی مەلا قادری کۆیی دەچێتە ناوچەی باڵەکایەتی و لەو هەرێمی جوان و دڵڕفێن و لەو کوێستانە خۆش ئاو و هەوایەی نیشتمانی پیرۆزی کورد لە لای چەند کەس لە مەلا گەورەکان کەڵکی زۆری زانیاری وەرگرتووە.

بۆ نموونە لە خزمەت زانای بەڕێز مەلا محەمەدی کوڕی کاک عەبدوڵڵای شێخ وەتمانی و مەلا شێخ تەهای سوورەشوری و مەلا محەمەدی خەتێ مەلای دەرباری محەمەد پاشای رەواندزی وانەی خوێندووە و بە ئامادەگی و تەیاری و پۆشتەیی تەواوەوە گەڕاوەتەوە بۆ کۆیە. باوکی ئەو بەڕێزە جەنابی حاجی مەلا ئەسعەدی جەلی کە بۆ دووهەم جار دەچێتە حەج چونکە زۆر پیر و زورهان دەبێ لە گەڵ خۆی دەیبا و ئەویش لەوێ زۆر خزمەتی باوکی بەڕێزی دەکا و لە هەر جێیەک پێویست بووبێ لە کۆڵی دەکاو بە کۆڵی دەیگێڕێ. هەروەک لەمەو بەر باسمان کرد.

دوای تەواو بوونی حەج و ڕێوڕەسمی حەج و دیدار و وتوویژ لەگەڵ زانایانی عەرەبستان لە مەککەی پیرۆز نەخۆش دەکەوێ و

هەر لەویش کۆچی دوایی دەکا حاجی مەلا عەبدوڵلا هەر لەوێ دەینێژێ و خۆی بە تەنیا دەگەڕێتەوە بۆ کوردستان و بۆ کۆیە، لە لایەن مەلا و فەقێ و زانا بەرزەکان و هەموو تاقم و توێژەکانی خەڵکی کۆیەوە پێشوازییەکی چاکی لێ دەکرێ.

ئەو بەڕێزە سەبارەت بەو کۆچە دڵتەزێنەی باوکی لە یەکێک لە بیرەوەرییەکانی خۆیدا ئاوای نووسیوە:

"توفي والدي يوم الجمعة آخر شهر ربيع الثاني من سنة الف و مأتين و تسع و ثمانين فی مكة المكرمة عصر يوم الجمعة، و صلى عليه ضحوة يوم السبت بالملتزم الشريف و دفن فی جنة المصلى فی شعبه النور قرب قبر الشيخ ابن حجر رحمهما الله تعالی"

راستی حاجی مەلا عەبدوڵلا یەکێک بووە لە کەڵە پیاوە هەڵکەوتوو و قارەمانەکانی کەم وێنە و بێ لینگەی کوردستان و جا ئیتر بێ گومان جێی خۆیەتی کە کوڕی وەک مەلای گەورەی کۆیی کە بە کوڵی دڵی خۆی کوردستانی گەورەی وە جۆش هێناوە، لە پاش بێ و ئیتر کوردانی کۆن و پیر و پێشینیانمان جوانیان فەرمووە کە " گیا لە سەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە".

# ناسنامەی مەلای کۆیی

پسپۆڕی دڵسۆزی گەلی کورد، بلیمەتی هۆزانی موسڵمانی کوردستان، پێشەنگی هۆشیارانی گەلی بەڵا لێدراوی کورد و سەردەستەی دڵ بێدارانی کوردەواری و موسڵمانی دڵ پڕ باوەری قورئانی تەک پەرەستی خوداویستی خۆشەویستی یەزدانی مامۆستا مەلا محەمەدی کۆیی جەلیزادە و دڵسۆزترین کەسی کوردە کە بۆ کورد و کوردستان دڵی وە کوڵ هاتووە.

بەڕێز مامۆستا کۆیی ناوی پیرۆزی محەمەد و نازناوی جەلیزادەو ناوبانگی کۆیی و مەلای گەورە و پیشەی مەلایەتی و لە بنەماڵەی بەڕێزی ئایینی و زانیاری جەلییەکانە.

ئەو هۆزانە لێزانە و ئەو زانا بێ وێنەیە کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵلای سێهەم کوڕی حاجی مەلا ئەسعەد کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵلای دووهەم کوڕی حاجی مەلا عەبدوڕەحمان کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵلای هەوەڵ کوڕی مەلا محەمەدی مەلازادە کوڕی مەلا براییم کوڕی مەلا حەسەن کوڕی مەلا براییم کوڕی مەلا حسێن کوڕی مەلا ئەبووبەکری جەلییە. کە وەک باس کرا لە بنیڕا خەڵکی گوندی گەلاسی پژدەرن. ئەو زانا بەرزە پیاوێکی گەلێک زاناو دانا و تێگەیشتوو و لێزان و سەردەرچوو لە کاروباری جیهان و رامیاری و هەموو زانیارییەکانی باو لە دەورانی خۆیدا بووە.

بێ گومان بە راشکاوی دەتوانین بڵێین، کە لە نێو هاوچەرخانی خۆیدا بێ لینگە بووە و لانی کەم لە مەردایەتی و کوردایەتی و راستی و پاکی و چاکی و دڵسۆزیدا نموونە و هاوتای دەس نەکەوتووە. بەڵام من ئەوەش زۆر زۆر بە گرینگ و سەیر و سەمەرە نازانم چونکە کەسێک لەو بنەماڵە گەورە کە سەرچاوەی فێر و

زانیاری لە کوردستاندا بووە بێتە دەرێ و پێ بگا هەر دەبێ وا بێ و ئیتر ئەو ڕێگەی خۆی بڕیویە و ئەرکی خۆی بەجێ هێناوە و لە سەر پنجی خۆی ڕواوەتەوە و ئیتر کورد گوتەنی گیا لە سەر پنجی خۆی دەڕوێتەوە، خوای گەورەش دەفەرموێ: (و البلد الطیب یخرج نباته باذن ربه و الذي خبث لا یخرج إلأ نکداً) زەوی چاک و بەهێز و خاوێن بە ودم و فەرمانی خوا، بە جۆرێک، کە (یعجب الزّراع نباته) شیناوەردەکەی جووتێر سەرسام دەکا، دەڕوێنێ و ئەوەش کە خەراپە و زەوییەکی بێ هێز و پیسە و بەرهەمێکی خەراپ و کەم نەبێ نییەتی. بەڵام من ئەوە بە سەیر دەزانم جۆرە کەسانێک هەن کە لەو جۆرە بنەماڵانەش هەڵکەوتوون بەڵام نەک هەر نەبوونەتە جۆرە پیاوێکی ئاوا بەڵکە دروست بە پێچەوانەی چاوەڕوانی لێکران لە کڵ دەرهاتوون و دڕکن لە جێی گوڵ ڕواون.

مامۆستای کۆیی پیاوێکی زۆر پیتۆڵ و خۆناس و خواناس و گەلناس و وریا و ژیر و دڵسۆزێکی ڕاستەقینەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و خەمخۆرێکی گەلی کورد و ڕۆڵەیەکی هەڵکەوتووی کوردستانی دابەش کراو و بەدبەخت و فێڵ لێکراو بووە. ئەو هۆنەر بووە، هونەرمەند بووە، زانا بووە، مەلا بووە، رامیار بووە، وانەوێژ بووە، پێشنوێژ بووە، وتاربێژ بووە، نووسەر بووە، وێژەوان بووە، دێژەوان (فقیه) بووە، ڕاڤەدەر (مفسر) بووە، ڕاست وێژ و دڵسۆز و خەمخۆر بووە، کوڕێکی مەرد و مەردێکی کورد و نەترس بووە، بزوێنەری هەستی دڵان و ڕاپەڕێنەری خەولێکەوتووان بووە.

بۆ ئەوەی خۆم پێی هەڵنەڵێم تا نەڵێن هەستی نەتەوایەتی و هاوبیری و باوەڕی هانی داوە بۆو ڕانان و پێهەڵگوتنە، دەقی وێژامەی عەرەبی مامۆستا مەلا کەریمی مودەڕیس لە بارەی ئەو کەڵە پیاوەدا دێنم و دوایەش وەریدەگێڕمەوە سەر کوردی. ئەو

بەڕێزە لە بارەی مامۆستا کۆییدا ئاوای نووسیوە کە دەڵێ:

کان لصاحب الترجمة دور عجيب فی الحركة العلمية و توجيه الطلاب بل توجيه المسلمين كافة الی اليقظة و الاعتماد علی النفس، و التوجه الی معالی الامور و الوحدة و الاعتصام، و الابتعاد عن الاختلاف و الخرافيات،و فی الواقع كان احد الاجدين فی العلم و الفضل و الغيرة و الشهامة و الجسارة الادبية و قوة القلم، و فلاحة البيان، و صراحة اللسان، و لو لا بعض الموانع لاستفاد الناس منه ما لايستفاد بكثير من الزمان، فكان يختار لعلماء الدين الترأس و الاستقلال بتوجيه المسلمين، و اخذ الزمام الامور المهمة، و الحركة نحو الامام فی كافة الشئون الدينية و الاجتماعية و السبق علی سائر الناس.

فتخرج من تربيته فوج من العلماء الغياری الذين لايخافون فی الله لومة لائم و كذلک كان له آراء قيمة فی شئون التعليم و التدريس و رعاية الايام و الزمان، و لكن ليس التدبير كل شیء فان التقدير قد يضحک علی التدبير.

كتاب (علماءنا فی خدمة العلم و الدين) ص ٥٣٥.

واتا:

ناوبراو خاوەنی ئەو باسە دەورێکی سەرسام هێنەری هەبوو لە بزووتنەوەی زانیاری و هۆشیار کردنەوەی فەقێکان و بەڵکە گشتی موسڵمانن و ڕاپەڕاندنیان لە خەوی بێ ئاگایی و باوەڕ کردن بە خۆو وڕوپێ لە کارگەلی گەورە و گرینگ کردنیان و یەکیەتی و یەکگرتن و لێکتر نەپچڕان و دووری کردن و بێزار بوونیان لە ناکۆکی و دوو بەرەکایەتی و شتی پڕوپووچ و خەرافات و باوەڕ هەبوون بە بێجگە لە ڕاستەقینە و ڕاستییەکان.

لە راستیدا ئەو لەزانیاری و ڕێزو گەورەیی و هونەر و پیاوەتی و خیـرەت و نەترسـی و ئـازایەتی و ئاگـاداری و وێژەیـی و هێـزی قەڵەمدا و هەروەها لە رەوانیی بەیان و راست بێژی و رەوانبێـژی و راسـتەوخۆیی زمـان و بـێ پـێچ و پەناییـدا بە یەکەمـی یەکەمـان (هەڵبـژاردەی هەڵبژێـراوان)و بـێ وێـنە و نمـوونە و هاوتـا بـووە و ئەگەر لەبەر هێنـدێک لەمـپەڕ و بەرگـر نەبـایە خەڵـک کەڵکێکـی وەهایـان لـێ وەردەگـرت کە ئەو کەڵـک و قـازانجە بە مـاوەیەکی یەکجار زۆریش وەرنەگیرێ.

ئەو بەڕێزە هەمیشە بۆ زانایانی ئـایینی ئەوەی پەسند ئەکرد و پێی چاک بوو کە سەرۆک و سەربەخۆ بن و لە بێدار کردنەوەی موسڵمانانـدا گۆی لە مستی کەس نەبن و هەروەها لە کـارە گەورە و گرینگەکـان و بـزووتنەوەی بەرەو پـێش چـوون و تەواوی کاروبـارە ئاینی و کۆمەڵایەتی و رامیارییەکاندا دەبێ ئەوان (مەلاکان) جڵەوی کار و رۆڵی فەرمان وە دەست خۆیان بگرن و نەهـێڵن بکەوێـتە دەس نەزان و بێ ئاگاو لەخوا نەترس و خەیانەتکاران و، دەبـێ لە گش کارو بارێکدا لەهەموو خەڵک پێش کەون و هەرگیزنـابێ چاولێکەر و لاساکەرەوەی ئەم و ئەو بن. بەڵـکە بە پـێچەوانە مەلاکـان دەبـێ لە سەر هێڵ و رێبازی ڕاست و دروست و رامیاری راسـتەقینەی ئیـسلام بتوانن خەڵک بە دوای خۆیاندا بکێشن.

جا ئا لە سەر ئەو بیـر و بـاوەڕە ژومـارەیەکی زۆر لە زانایـانی خاوەن بیر و باوەڕ بە خۆ و لێهاتووی وا کە لە سەر خوا و لە رێی خوادا لە لۆمەی لۆمەکەران ناترسن، لە فێر کردن و بارهێنانەکانی وی کەڵکیـان وەرگـرت و لە فێـرگەی ئەودا پێگەیـشتن و هەر یەکەی بوو بە موجاهید و خەباتگێڕێک لە رێی خوادا.

هەروەهـا ئەو بلـیمەتە کەم وێـنەیە بە بیروبـاوەڕێکی تـایبەتی و پتەو و دروستی لە بارەی کاروباری فێر کردن وبارهێنان وسەبارەت

بەوانەویژی و بە فیرۆ نەدانی کات وچاخ و رۆژگاری بەنرخ و تەمەنی پڕبایەخ هەبوو. بەڵام هەموو شتێک بریتی نییە لە راوێژ و تەگبیر و زۆر جاران چارەنووس بە تەگبیر پێدەکەنێ.

پەڕتووکی زانایانی ئێمە لە خزمەت زانیاری و ئاییندا (بە کەمێک روون کردنەوەوە)

مەلای دڵسووتاو و دەروون هەڵقرچاوی کورد کە بڵێسەی ئاوری دەروونی بە قەرای بڵێسەی ئاوری نەوتی باباگوڕگوڕ بووە کە بیری لەوە کردۆتەوە وا نەوتی کەرکووک دەڕوا بۆ ئەورووپا و فەڕەنسەو ئینگلیس پێی حاوانەتەوە بەڵام کوردی بێچارەش ئەوەندەی نادەنێ کە تەنانەت دە فتیلەشی کات و شەو لە بەری دانیشێ ئاهی دەروونی هەڵکێشا و هەناسەی بۆسۆداری دووکەڵی لێ بەرز بۆتەوەو دەستەکانی خۆی گوشیون و پەژارەی دەروونی خۆی دەربڕیوە و گوتوویەتی:

نەوتی باباگوڕگوڕی چۆن دەچێ بۆ پاریسێ
ئاوری حەسرەتۆمەندی لە دەروونم داییسێ

دوای ویش عەبدوڵلا پەشێو دەڵێ:

مناڵەکان، مناڵەکان!
ئەی برسییە ژین تاڵەکان
لە سەر لوتکەی باباگوڕگوڕ
نزیک تاقگەی سەرەوژووری زێڕینی گڕ
گڵکۆیەکی بچکۆلەم دی لێی نووسرابوو
ئا لێرەدا مناڵێکی چاو بزی کورد
لە برسان مرد!!

**هە روە پەشیو لە پارچەیەکی چوکەلەی دیکەی خوی دا دەلی :**

منالەکان ! منالەکا ن! ئەی برسییە ژین تالەکان!
دەزگیرانم کوترێکی دیا ر بەکرە ؛ بۆ گواستنەوەی ڕۆژ ئەمیرم پهرپە ڕدری
قەدی چیام قەف قەف بڕ ی ؛ کعە لە دەرگای سنورم دا؛ تفی دەمی پوستال ڕەشیک ها ت
سواغی دا ناو چاوانم !!

**جا کاتێک کە دیتوویەتی گەلەکەی وی لە چاو هەموو گەلانی جیهان کراوەتە سێ چوار پارچە و هەر پارچەش دراوە بە دەوڵەتێکی وا کە هیچ بەزەیەکی پێیدا نایەت و ئاواش پاش کەوتوو لە هەموو مافێکی خوا پێدراوی خۆی بێبەش کراوە و بە تەواوی ڕێگەی ژیانی لێ گیراوە و سەرەڕای ئەوەش کراوەتە دەیان و سەدان قۆڵ و دەستە و هەر قۆڵەش وەک مێگەلێکی بێ سەر و زمان و بێ شوان و خودان وەبەر کۆلکە شێخێک یان کۆلکە خەلیفەیەکی خوا نەناس و لە خوا نەترس کراوە و ئەوانیش هەر بە کەیفی خۆیان بە نێوی ئایین و تەریقەت دەیانچەوسێننەوە و دەیانڕووتێننەوە و کەڵکی خۆیانیان لێ وەردەگرن، هەروەها کە دیتوویەتی کە ئەو خەڵکە نەزان و نەخۆێندەوارەش لە بەر نەزانی و نەخوێندەواری و بێ ئاگایی خۆیان لە ئایین و ژیان و بوون و هەروەها ئەحواڵی گەلان و جیهان پێیان وایە بەرنامەی ئایین و ژیان و دەستووری خودا دەبێ ئاوا بێ و ئیتر ئەوەیە دانان (تقدیر)ی خوایە کە ئەوان دەبێ هەر نۆکەری ئەم و ئەو بن و هەر ڕۆژە لە بەر دەرکی کەسێک هەڵتووتەکێن و بە پرچی درێژی ژنانەوە بچن بۆ بەر دەرکی تەکیەو خانەقا و لە باتی هەموو پێشکەوتن سەرکەوتنێک بە هولەهول سەر هەڵوەشێنن و گابۆڕی بکەن.**

ئەوە لە لایەک ولایەکیش هێندێک لە مەلاکانی ئەو سەردەمی و بگرە ئێستاش لەگەڵ بێ ئەگەرچی بە خەیاڵ دەبێ بەرنامە و یاساو رێسای خوای گەورە کە بۆ گەلانی جیهانی داناوە و بە هۆی پێغەمبەران و باڵوێزەکانی خۆی لە سەر زەوی پێی راگەیاندوون زۆر باش بزانن و ئاگاداری تەوایان لە قورئانی پیرۆز هەبێ و خۆ هەر کەسیش ئاگای لە قورئان هەبێ هەرگیز شتی پڕوپووچ (خرافات) قبووڵ ناکا بەڵام یا لە ترسان یا لە برسان یا لە بەر بەرژەوەندییەکی تایبەتی و کاتی و خۆیەتی کڕ و مات و بێدەنگن و نایێڵن و نایدرکێنن و یا بۆ قازانجێکی تایبەتی نەزان ئاسا رەگەڵ وان دەکەون و بەو شێوە خەیانەت بە گەل و نیشتمان و ئایینی پێشکەوتنخوازی ئیسلام و قورئانی پیرۆز و رێبازی محەمەد دەکەن.

لەپارچە هۆنراوەیەکی کورت و جوان و پڕ واتادا ئاهو ناڵە دەردەبڕێ و هەناسەیەکی قووڵ هەڵدەکێشێ و دەڵێ:

هەتا دەمرم لە بۆ کوردان دەناڵم
عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بە ماڵم
فەقیر و جاهیل و نەخوێندەوارن
لە لای نەوعی بەشەر بێ قەدر و خوارن
کەسێ قەدری لە لای خزمان نەمێنێ
لە لای بێگانە قەدری چی دەمێنێ
لەگەڵ یەک بەد رەوشت و بەد نیهادن
لە بۆیە وا کەساس و نامرادن
لە عیلم و مەعریفەت دوورن بە کوللی
خەیاڵی خاون لایان فیکری میللی
حەسوودن بۆیە بازاڕیان کەسادە
نەزانن بۆیە تاعەتیان فەسادە

له ســـەر عەردی ئەوی کـــوردی زمـــان بـــێ
له لای وایه ئەبـــێ ســـووک و نەزان بـــێ
ئەبـــێ حەمبـــاڵ و گـــاوان و شـــوان بـــێ
ئەبـــێ زەببـــاڵ و کەننـــاس و ســـەپان بـــێ
ئەبـــێ هەر ریـــش درێـــژ و پـــان و لـــوول بـــێ
ئەبـــێ هەر عـــاجز و گـــرژ و مەلـــوول بـــێ
ئەبـــێ هەر بەنـــدەی عـــورب و عەجەم بـــێ
ئەبـــێ بـــێ عـــیلم و ئـــیملا و قەڵەم بـــێ
ئەوەنـــدە بێهـــۆش و بـــێ دیـــن و نەزانە
که لای وایه خـــودای وی ریـــش پـــانە!!
مەلاکـــانیش له حەقیـــان زۆر خەیـــانن
ئەوانـــیش هەر دەڵێـــی گەوج و نەزانـــن!!

راستی مامۆستا حەقیەتی ئاوا بە مەلاکان دەڵێ، چونکە کەی مەلا دەبـێ لە ڕێگەی پێغەمـبەرلا بـدا و چـۆن ئەوەش ڕێگەی پێغەمبەرە! کە ئەوان دەیکەن، وەک مامۆستا دەفەرموێ:

له بـــاتی باســـی دیـــن و روکنـــی ئیمـــان
مەلا بۆیـــان دەخـــوێنێ مەدحـــی شـــێخان؟
ئەڵـــێ شـــێخی هەیه خـــاوەن کەرامەت
تکاتـــان بـــۆ ئەکـــا رۆژی قیـــامەت؟
شـــەو و رۆژێ بە زیکـــری خـــوا خەریـــکه
دیـــاره زۆر له خـــزمەت خـــوا نـــزیکه
گەلـــێ جـــاران دەچێـــته فەوقـــی عەرشـــی
ئەگەر حەز کـــا له لای خـــوا دائەنیـــشی
خولاســـه چەنـــد خورافـــاتێکی دیـــکه

مەلا نەقڵـــــی دەکـــــا بەو فـــــاک و فـــــیکە
عەوامـــــی قـــــورِ بەســـــەر وەک وا ئەزانـــــن
جەنـــــابی شـــــێخ بە خزمـــــی خـــــوا ئەزانـــــن
خـــــسووسەن گەر ئەڵـــــێن یـــــا غەوســـــی ئەعـــــزەم[١]
ئەوانەی شـــــــــــێخیان لا خـــــــــــودایە
حیـــــــسابی وان لە ســـــــەر تەوقـــــــی مەلایە
مەلا تـــــۆ بـــــا ســـــی خوایـــــا ن بـــــۆ بـــــفە ر مـــــوو
وەهـــــا بـــــا شـــــە لە بـــــۆ وان و لە بـــــۆ تـــــوو

**جا ئا لێرەدا سەبارەت بە مەلا و ئەرکەکانی وی و پلە وپایە و خۆدۆڕاندنی ویدا پێم خۆش بوو باسێکی کورتەڵە بکەم بەڵام وام بە باش زانی تەنیا ئەو پارچە هۆنراوەی خۆم کە لەو بارەوە چەند ساڵ لەمەو بەر دامناوە و بڵاوم کردۆتەوە بیهێنم کە ئەوە دەقەکەیەتی:**

## پەیام بۆ مەلا

مەلا تـــــــۆ رابەری خەڵکـــــــی جیهـــــــانی
کە تـــــــۆ میراتگـــــــری پێغەمبەرانـــــــی[٢]

---

[١] ـ غەوسی ئەعزەم هەمان شێخ عەبدولقادری گەیلانییە کە گڵکۆیەکەی لە شاری بەغدایە و لەمەولا باسەکەی دێت. بەڵام با لێرەدا ئەوەندە بزانین ئەو شێخانە چۆن نێو و نێوبانگی زلەزلەی وەک غەوسی ئەعزەم، شیخ المشایخ، مرشد عام، پیر طریقت و هتد بۆ خۆیان دادەنێن کە هەموویان فریودەر و راکێشەری خەڵکی سادە و ساویلکە و هەژارن.

[٢] ـ بەڕێز ناوداری کورد، موفتی زەهاوی دەفەرموێ:

ترکیب ملا چو در ازل از الم است — بیچارە نصیب او همە درد و غم است.
شادی بە دلش چگونە صورت بندد — چـون قلب کنی حاصل قلبش الم است

هەروەها هۆنەرێکی دیکەش لەبارەی مەلادا دەڵێ:

ئەتۆ رازداری یەزدانی لە دنیا
گوڵی ئایین و ویژدانی لە دنیا
ئەتۆ دڵسۆزی گش خەڵکی هەژاری
لە جێی پێغەمبەری گەورە و بەکاری
ئەتۆ مەردی خودا و ئاواتی خەڵکی
لە بۆ گش خەڵکی هەر قازانج و کەڵکی
ئەتۆ ئەرکت لە دنیادا گەلێکە
هەبوونی تۆ وەکوو بوونی گەلێکە
نەمانی تۆش نەمانی خەڵکە گشتی
دەبا بمریێ گەلێ تۆ بدا لە مشتی
مەلا بێ تۆ جیهان تاریک و پەستە
لە لای هەر کەس کە خاوەن بیر و هەستە
سپاردەی تۆ وەکی پێغەمبەرانە
وەکی پیاوانی گەورە و رابەرانە
ئەتۆ بەرپرسی خۆش کردنی جیهانی
ئەتۆی گەر راز و رێنوێنی دەزانی
ئەتۆی فەرماندە و سەرداری مەردان
ئەتۆی رازداری هۆزانی موسڵمان
ئەتۆ پایەت رەدایە و راستەقینە
رێگەت ئایینە رێبازت ئەوینە
برای دڵسۆز و سەرداری بەهێزی

---

دردی بیافرید خدا نام او ملا — بد تر گمان نبرم از او در جهان بلا
ماهیتش ملالت‌است و ترکیبش از الم — این نکته هویدا و واضح است و برملا
گر ملا و جمله بلا در مجلس — روند داخل، شوند محترم الا ملا

لە نێـــو خەڵکـــی موســـڵمانا بەڕێـــزی
ئـــۆ مامۆســـتای گیـــانی و زۆر بە کـــاری
لە ئەســـتۆی تـــۆیە گـــشت ئامۆژگـــاری
ئەتـــۆ راهێـــنەری پیـــر و منـــاڵی
ئەتـــۆی لە خـــوا و لە بـــوون و ژیـــن حـــاڵی
لە بـــۆ پێغەمـــبەری تـــۆ جـــێ نـــشینی
دەبـــێ تـــۆ دوور و نێزیکـــت ببینـــی
ســـپاردەی تـــۆ وەکـــی پێغەمـــبەرانە
وەکـــی پیـــاوانی گەورە و رابەرانە
بەڵام ئەی داخەکەم نەختێـــک بە خاســـی
وەکـــوو پێویـــستە هەرگیـــز خـــۆت نەناســـی
ئەتـــۆ بەو رێـــزە گەورە و پـــایە بەرزە
بە داخـــی گـــرانەوە مانەنـــدی هەرزە
لە مەیـــدانی خەباتـــا تێـــشکاوی
لە کـــار و پیـــشەکەتدا کـــاکە خـــاوی!!
ئەتـــۆ نەتزانـــی خـــۆت کێـــی و چ کـــارەی
لە بـــۆیەش تووشـــی ســـەد دەرد و پەژارەی
بە دەســـتی خـــۆت کەســـێکت خـــستە پـــێش خـــۆ
کە بە دزی بـــڕیەوە ئەو لاقەکەی تـــۆ
ئەتـــۆ ئاغـــا بـــووی و خـــۆت کـــردە نـــۆکەر
لە زووری ژووریڕا فـــڕێ درایە بەر دەر
لە ســـەرداری وەســـا تـــۆ بـــوویە ســـیپاڵ
دەجـــا هەڵـــکە لە گەڵ ئەو ژینـــی وا تـــاڵ
ســـپاردەی تـــۆ وەکـــی پێغەمـــبەرانە
وەکـــی پیـــاوانی گەورە و رابەرانە

به فەرمانی پێغەمبەر جێ نشینی
دەبوو چۆن جا تۆ پایەی خۆت نەبینی؟!
مەلا مەردی خودا بە خۆت بناسە
کە تۆ چا بێ هەموو ئەو خەڵکە خاسە
ئەگەر تۆ خۆت هەبی دنیا بە تۆیە
ئەتۆ نیی بۆیە دنیا رەنجەڕۆیە
کە تۆ ئایینی راستی بڵێی بە خەڵکی
وەکوو داری بەری و هەر پیت و کەڵکی
کە رێی راستی وە پێش خەڵکی کەوی تۆ
ئەوەی خوا دەیهەوێ بێ سۆ هەوی تۆ
ئەگەر مەردی خوا بی و بۆ خودا بی
دەبێ بێ سۆ لە ناڕاستی جودا بی
ئەتۆ نابێ مەرایی بکەی لە بۆ کەس
دەبێ گش بۆ تۆ ببنە چاو و گوێ و دەس
سپاردەی تۆ وەکی پێغەمبەرانە
وەکی پیاوانی گەورە و رابەرانە
مەلا مەردی خودا بە بۆ خودا بە
لە نامەردی و لە نامەردان جودا بە
مەدۆڕێ زیانی دۆڕانت نەمانە
وە دووی قورئان کەوە و دوور بە لە مانە
خەباتی تۆ لە بۆ خەڵکی بەکەڵکە
تلاسانت لە رێ مل شکانی خەڵکە
کە رات چاک و دڵت پڕ هەست و پاکە
مەلایەتییە مەکە بۆ ژینی کاکە
مەلایەتییە بکە بۆ راگەیاندن

بۆ ئیسلام بە بنی دنیا گەیاندن
ئەگەر مەردی خودای و بڕێک بە هۆشی
نەکەی زانیاری و ئایین فرۆشی
کە ئایینت فرۆشت مانەندی کالا
کراسی ترسەنۆکیت بڕا بە بالا
سپاردەی تۆ وەکی پێغەمبەرانە
وەکی پیاوانی گەورە و رابەرانە
کە چوویە دەرکی شێخ وێنەی موریدان
لە ناو دڵتا نەما ئایین و ویژدان
کە چوویە ماڵی زۆردار بۆ مەرایی
مەلا نی و پەستی، نابی بۆ مەلایی
کە جیاوازیت لە نێوان خەڵکی ئیسلام
ئەتۆ دانا ئیتر بزانە سەرەنجام
لە دەستت داوە تۆ ئایینی یەزدان
نە ژیریت هەس نە ئایین و نە ویژدان
مەلا بی تۆ دەبێ قورئان بزانی
بە بێ قورئان مەلا نی، پیاوی نانی
خەباتت بۆ خودا و بەرنامە قورئان
لە تۆ کۆوە دەبن خەڵکی موسڵمان
ئەگەر تۆ جێگری پێغەمبەران بی
گەلێک شەرمە کە چەشنی نۆکەران بی
سپاردەی تۆ وەکی پێغەمبەرانە
وەکی پیاوانی گەورە و رابەرانە
مەلا هەستە وەکوو مەردانی ئازا
بە جوببە و شاقەل و شۆرەت مەنازە

مەنــــازە قەت بە ریـــــشوە و شـــاڵ و ریـــشت
بنــــازە تـــۆ بە پیــــشە و کـــار و ئیـــشت
مەلایــــــی و زانیـــــاری نــــازی تــــۆیە
پێغەمـــــبەر هـــــاودەم و هــــاوڕازی تــــۆیە
لە خـــوار پێغەمـــــبەرا هەر تـــۆی لە دنیـــا
بـــــۆ کــــارێکی زلە هــــاتوویە دنیـــا
مەلا کۆڵـــــت گـــرانە و تـــرتە رێـــگەت
دڵــــی تەنگـــــی موســـــڵمانانە جــــێگەت
مەلا تـــۆ نەچـــیە دەرکـــی شـــێخ و پیـــران
لە بــــاتی وان بچـــــۆرە مــــاڵی بیـــران
ئەڕۆی رێـــــیەک کە پێغەمـــــبەر نەچـــــووبێ
نەتبـــێ خـــــوویەک کەوا بــــۆ وی نەبـــــووبێ
ســـــپاردەی تــــۆ وەکـــــی پێغەمـــــبەرانە
وەکـــــــــی پیــــــــاوانی گەورە و رابەرانە
مەلا تـــۆ بـــۆ مەلات خۆشــــناوی بـــۆچی؟
بە خـــۆت نـــاڵێی کە ئەو هـــیچ نیـــیە ئەتـــۆ چـــی؟
بەڕاســـــتی بێـــــت و گەر هەر دووک مەلا بـــن
وەکـــوو پێغەمــــبەران هەر بـــۆ خـــودا بـــن
بـــۆ یەکتـــر هێـــز و پـــشت و دەســـت و چـــاون
بەڵام ئەی داخەکەم هێـــــــشتاکە خــــــاون
نەیــــاری خــــوا و خۆتـــان بـــۆتە یـــاروو
لە دەســـــــــتوو داوە ســـــــا دار و نەداروو
رێـــگەو ون کـــرد لە خەڵـــک و هەم لە خۆتـــان
چـــرا هەڵبێــــنە ســـا چـــی مـــاوە بۆتـــان؟
مەلا مەردی خـــــــودا بە بەســــــیەتی بەس

له بـــارەی نـــاکۆکی گـــوێ مەگـــره بـــۆ کەس
خـــــوا فەرمـــــوویه ئـــــایەی (واعتـــــصموا)
دەبـــــا یەک بـــــین مـــــن و تـــــوو
دەمـــــێکه گـــــورزی هـــــاواری له تـــــۆیه
مەلا بـــــزانه خـــــودا کـــــاری به تـــــۆیه
ســـــپاردەی تـــــۆ وەکـــــی پێغەمـــــبەرانه
وەکـــــــــــی پیـــــــــــاوانی گەوره و رابەرانه

ئەگەر دیوانی هۆنراوەکانی مامۆستای کۆیی (دیاری مەلای کۆیی) بەوردی بخوێنینەوه و چاوێک به دێره زێڕینەکانیدا بێگرین بۆمان دەردەکەوێ که ئەو بەڕێزه چ ئەندازه له ژیان و بوون و جیهان حاڵی بووه و ویستوویەتی خەڵکیش وەکوو خۆی حاڵی بکا و چۆن دەردی ئایین و گەلەکەی به هەموو ئەندام و جەستەی خەستەی خۆی چەشتووه و هەستی به ناتەواوی و ناڕێکوپێکی کردووه و هەروەها چۆن چۆته بنج و بناوانی کارەوه و وەک مەرەنگۆزێکی لێزان و پزیشکێکی زۆر حاڵی و به شێوەی نوێ کەوتۆته بەربەرەکانێ لەگەڵ ماک و هۆی دەرد و نەخۆشی، نەک لەگەڵ دەردەکە، و بەربەرەکانێ لەگەڵ هۆکار(علـة) کردووه نەک له گەڵ خودی کار (معلول).

ئیتر به تەواوی ئاگادار بووه له ژیواری کوردەواری و زانیویەتی که هەموو نەکبەتی و بەدبەختی و ماڵ وێرانی و دواکەوتووییەکی گەلی کورد لەنەزانی و ناکۆکی ونەخوێندەواری و دووبەرەکایەتی و چەنده دەستەگی و قۆڵ قۆڵ بوون و لێک داپچڕانەدایه و هۆی ئەوانەش هەموویان هەر هەبوونی شێخ و ئاغا و دەرەبەگ و چڵپاوخۆرانی بێگانه و بێگانه پەرەستەکانن و بەتایبەتی شێخەکانی

بە لەمپەرێکی زۆر گەورە زانیوە لە سەر ڕێگەی ژیان و پێشکەوتن لە کوردستاندا.

چونکە ئەو خوا لێ خۆشبووە زانایەکی وا بووە کە سەرەڕای ئەوەی کە زانیویەتی ئەوانە کەوا خۆیان بە نێوی ئایین بە سەر خەڵکدا سەپاندووە نەک هەر ئایینی نین و بەرنامەکەیان ئایینی نییە، بەڵکە هێندێکیان بە تەواوی دژی ئایینیشن و لە ماکا دڕکی ئایین و چەقڵی چاوی ئیسلامن. چونکە تا دووسەد ساڵ دوای پێغەمبەر هەر نەبوون.

بەڵام بۆ زانینی ئەو مەبەستە لێکۆڵینەوە و موتالایەکی زۆر وردو سەرنجدەرانەی دەوێ. ئاسنێکی ڕووکێش کراو بە زێڕ، تا ڕووکێشەکەی لە سەر لا نەبەی نازانی کە زێڕ نییە. جا مەگەر زێڕینگەرێکی وەکوو مامۆستا کۆیی هەڵکەوێ و خۆی ئاسا بە چاوی دڵ لە دنیایە بنۆڕێ و بزانێ کە لە بن ئەم ڕووکێشە چ هەیە. خۆم جارێکی لە گەڵ مەلایەکی مریددا کەوتمە قسە لە بارەی شێخایەتیدا، دوای کێشە و هەڵلایەکی زۆر پێم گوت ئەرێ کاکە ئاخر وەکوو خۆمان دەزانین ئێمە چوار بەڵگەی دێژەیی (دلیل شرعی)مان هەیە و بە هۆی ئەو چوار بەڵگانە دەتوانین بزانین داخوا هەر شتێکی کە مەبەستمانە ئایینییە یان نا، کە بریتین لە (کتاب، سنە، قیاس، اجماع) واتا کتێب (قورئان)، ڕەوشی پێغەمبەر( و قیاس یانی هەڵسەنگاندنی شتێک کە ئێستا هەیە و پێشوو نەبووە بە شتێک کە پێشێ هەبووە دە شتێکدا کە تێیدا هاوبەشن بۆ نموونە وەک ئەوە کە ئێستا ویسکی هەیە و پێشێ نەبووە، بمانهەوێ بزانین داخوا فەرمانی دێژە (حکم شرع) لەبارەی ویدا چییە، تەماشا دەکەین کە ویسکی مەستکەرە، لە چاخی پێغەمبەریشدا( ئارەق هەبووە و مەستەکەرە و حەرامە، کەواتە

ویسکی چونکە مەستکەرە حەرامە. ئەوی تریش کۆبوونەوەی زانایان واتا هەر شتێک زانایانی ئایینی لە سەر ڕێککەوتن فەرمانی خوا و دێژەی پیرۆزی ئیسلامە.

جا ئەتۆ شێخایەتیم بۆ بە کێهەیان دەچەسپێنی؟ ماوەیەکی دە بیر کردنەوە ڕاچوو، سەری بەردایەوە و پاش ماوەیەک سەری هەڵبڕی و گوتی: بە (اجماع). گوتم: کامە اجماعە؟ ئەوەی کە ئێستا ئێمە دوو کەسین و یەکمان نەیار و یەکمان هاوکاریەتی؟ پاش ماوەیەک گوتی: جا ئێمە هیچ نین و حیسابمان لە سەر ناکرێ. گوتم: ئەگەر واش بێ ئێمە ئەوەمان بە میرات لە پێشینیانی خۆمان وەرگرتووە و لە کۆنەوە هەروا یەک نەیار و یەک هاوکاری بووە. وەرە با بگەڕێینەوە سەر قورئان و ڕەوشتی پێغەمبەر، ئیتر گورژی گوتەنی:

دەبا من پێت بڵێم کاکە بە کوردی
شتی وا پەست ئەرێ کێ فێری کردی
لە قورئانا نە شێخم دی نە دەروێش
هەموو چەند جاری لێکداوە بە وردی
نە سۆفیم دی نە تەکیە و خانەقام دی
نە باروبنە و دیاری و بارەگام دی
نە کەزیە و پرچ و زەرگ و دمبەک و دەف
نە شاڵ و منتەشا و جووبە و عەبام دی
ئەگەر پێویستە شێخ بۆ ئایینی خوا
بڵێ پێم شێخی گش پێغەمبەران کوا؟
محەمەدخۆی و یاروەرانی
بە گشتیان شێخێکیان بیوایە دەبوا
ئەگەر ئێمە موسڵمانین بە قورئان

به قورئـــــان وا نیـــــیه دەســـــتووری یەزدان
وە لا نێـــین مـــــزگەوت بـــۆ خانەگایـــان
دژی فەرمـــانی خـــوا و دەســـتووری قورئـــان

بەڵێ خـوای گەورە بە دڵـی ئەو پیـاوە گەورەی سرووش (الـهام) کـردووە کە تـا ئەم حـاڵە راوەسـتاو نە بـێ و ئەو گەلە هەروەهـا ناپێگەیشتوو و ناتەواو نەبێ و لاشی موسەوگەرە کە بۆ چارەی هەر دەردێک بەبەرەکـانی دەبـێ لەگەڵ هـۆی بنەڕەتـی دەردەکە بکـرێ و دڵـۆپە لە سـەربانیڕا و جـۆگە لە بنـاوانیڕا ئیـشک نەکـرێ لە خواریڕا خۆ ماندوو کردن بێ کەڵکە.

جـا هەر بـۆیە دێنـێ لە پـارچە هـۆنراوەیەکی دوور و درێـژدا دەردەکانی کۆمەڵی کوردەواری دیاری دەکات و دەیانخاتە بەرچـاوی خـاوەن چاوەکـان و بۆیـان دەسـت نیـشان دەکـا کە ئەو دەردانە لە چـیڕا پەیـدا بـوون و مـاکی بنەڕەتـی وان چییە. تـا خەڵـک خـۆی هۆشیار بێتەوە و خۆی بۆ چارەی دەردی خۆی تەکان لە خۆی بداو راپەڕێ، چونکە راستە کە:

به غمخـــــوارگی جـــــز ســـــر انگـــــشت مـــــن
نخـــارد کـــس انـــدر جهـــان، پـــشت مـــن ---- یـــا
خم شود از بار منت پشت من    تابخا رد پشت من انگشت من

ئەو زۆر بە چاکی ئاگادار بـووە و زانیـویەتی کە هەمـوو شـێخ و مێخ و تەریقەت و مەریقەت و تەکیە و مەکیە و ئەو فێڵ و فوتەی کە لە کوردسـتاندا سـەریان هەڵـداوە و لە ژومـارە نـایەن، بە پێـی نەخشەیەکی دژی ئیسلامیانە و دەرەکی (خارجی)بۆ لێک هەڵبڕین و لێکتـر نـامۆ کردنـی موسـڵمانان و بەتـایبەتی بـۆ لە نـاو بردنـی

یەکیەتی و برایەتی موسڵمانانی کورد دروست کراون و هەرگیز لە یاسای ئیسلامدا جێگایەکیان نییە و بە هیچ جۆرێک لە گەڵ ئیسلام بۆز ناخۆن و بنەمایەکی ئیسلامییان نییە. بەڵام بە جۆرێکیشیان لەگەڵ ئیسلام جۆش داون کە بەڕاستی جودا کردنەوەیان کارێکی سادە و ئاسان نییە.

لە دەورانی خودی پێغەمبەری مەزن و یارانی وەفاداریشیدا و تەنانەت بگرە چاخی چوار پێشەوای (مذهب)ی سوننیشدا ئایینی پیرۆزی ئیسلام هیچ پێویستییەکی بەوانە نییە و رەنگە شتێکی تایبەتی کوردستانیش بن یان لە وڵاتانی دیکەی دواکەوتووی وەک کوردستانیشدا هەبن بەڵام لە گەلانی ژیر و هۆشیاردا نەیانتوانیوە رەخنە بکەن.

جا مامۆستای خوا لێخۆشبوو کاتێک ئاوا هۆشیارانە لە شتەکە حاڵی دەبێ و دەردەکان دەدۆزێتەوە و دەرمانەکانیش دەناسێ و، بەڵام هەرچی دەشکات و دەشکرێنێ هیچی لە دەس نایە، دوای هەڵکێشانی یەک دوو هەناسەی ساردی بۆسۆدار ئاوا دەفەرموێ:

هەتـــا شـــێخێک لە کوردســـتان بمێنـــێ
ئومێـــدی زینـــدەکانیت پـــێ نەمێنـــێ
تەریـــقەی قـــادری و نەقـــشبەندی
بە بـــای دا رەونەق و ئـــاهەنگی کـــوردی
هەموویـــان بـــوونە ســـۆفی و پیـــر و دەروێـــش
بە بەرمـــاڵ و ســـەبیحە و رشـــتە و ریـــش
هەمـــوو بـــێ ئـــیش و بێکـــار و تەوەزەل
ورگ پـــان و مـــل ئەســـتوور و ســـەلک زل
لە وان و ئەرزەرۆم تـــا حەددی جافـــان
تەوەلـــلا بـــوون لە عەقـــڵ و علـــیم و عیرفـــان

بەوێ شـــــۆڵ و بەوێ عەقـــــڵ و تەمیـــــزێ
مـــوحەققەق قەومـــی کـــورد نـــاییتە ریـــزێ

ماموستای وردبین و زانا و دانا بە چاوی خۆی دەبینێ کە گەلی کورد لە پێشکەوتن و سەرکەوتندا تۆزی هیچ کامێک لە گەلانی جیهان ناشکێنێ وپیاوە گەورەکانی ئەو گەلەش لە باتی هەموو پێشکەوتن و سەرکەوتنێکی رامیاری هەر قۆڵەی وە دوای شێخێک و هەر دەستەی وە دوای خەلیفەیەک کەوتوون و پێشیان وا بووە کە ئایین بریتییە لە ریش و پرچ و سەر و کەزی و مل بادان و هوولەهوول و های و هووی و دەف و دەمبەگ و بەو جۆرەش رۆژ لە گەڵ رۆژ پتر لە ئایینی خوا دوور دەکەونەوە و لێی دەبن بە بێگانە، جا هەر بۆیە بە هەناسە ساردی و بێ هیواییەوە دەفەرموێ:

بە ریـــشی پـــان و پرچـــی پـــڕ لە ئەســـپێ
بنـــاخەی کـــاری کـــوردان چـــۆن دەچەســـپێ؟
بە کەشـــــکۆڵ و ســـــواڵ و فەقـــــر و زیلـــــلەت
مەحـــــاڵە کـــــاکی خـــــۆم تەشـــــکیلی دەوڵەت
هەمـــوو بـــێ هـــۆش و بـــێ گـــۆش و نەزانـــن
ئیـــدارەی ملـــک و مـــیللەت چـــۆن ئەزانـــن؟
ئومێـــــدو قەت نەبـــــێ کـــــورد بێـــــتە دەوڵەت
لە بەدبەختـــــی ئەوێـــــستا بـــــوونە ســـــێ لەت

جا ئەمجار برێک لە حاڵ و ژیواری کوردەواری ورد دەبێتەوە و کە دەبینێ هێندێک ئەو لە داخان خەریکە دیق ئەکەن و هێندێکیش هەر ئاگایان لە هیچ نییە و بە خەیاڵیشیاندا نایەت و بە قسەی شێخ و مێخان وەها لە رێگە لادراون کە هەر پێیان وایە پێنج و دوو

ڕۆژێکی دیکە ناخایەنێ کە شیرازەی جیهان لێک دەترازێ و هیچ شتێک لە حاڵی خۆی نامێنێ و بە یەکجاری پەسڵان ڕادەبێ و ئیتر ئەوە ویستی خوایە و هەوڵ بۆ ئاڵوگۆڕ کردنی بێ کەڵکە و بێ ئاکامە و دەبێ بەوە قاییل و دابین بن و خۆشیان هەڵاوەسن هەر ئەوەیە.

لە مەرجێکا کە خوای گەورە ئەفەرمێ: (ان الله لایغیر ما بقوم حتی یغیروا ما بأنفسهم) واتا: خوا حاڵ و ژیواری هیچ گەلو هۆزێک ناگۆڕێ و ئاڵوگۆڕی تێدا وەدی‌ناهێنێ هەتا ئەوان خۆیان ڕانەپەڕن و بۆ ئاڵوگۆڕ کردنی حاڵ و ژیواری خۆیان تەکان لە خۆیان نەدەن. جا هەر بۆیە مامۆستا چاوەکانی بە مۆلەق دەوەستێ و سەرێک با دەدا و دوایە بە خەم و پەژارەی زۆرەوە دەفەرموێ:

ئەوەی زانایە ناو جەرگی پەلاسە
ئەوی نادانە نازانێ چ باسە
جەنابی شێخ ئەڵێ ئاخر زەمانە
قیامەت ڕادەبێ هەر بەو زووانە
ئیرادەی خوایە ئێوە هەروەها بن
وەکوو هاڕووت و ماڕووت بن سەرەو بن
لە بەر قەولی پڕ و پووچی ئەمانە
لە دەس کوردا نەما غەیری هەمانە
لە بەر تەزویری وان شێخانی بەدبەخت
گەلی کورد نابنە ساحەب ڕابەت و تەخت

وەک دەبینین مامۆستای بلیمەت و زانامان خوا لێی خۆش بێ جێی خۆیەتی کە تەواوی بەدبەختی و بێبەشی گەلی کورد لە شێخەکان دەزانێ و پێی وایە لەت لەت کرانی کوردستانیش هەر لە

سایەی سەری وان رایە کە یاخوا سایەیان لە سەر کورد و کوردستان کەم بێتەوە و ببڕێتەوە و هەر نەمێنێ.

بەڕاستی ئەو چاوبەستانە وەهایان چاوی خەڵکی هەژار و نەخوێندەواری کورد بەستووە کە بە هیچ کلۆجێک رێگەی خۆی نادۆزێتەوە و سەر دەر ناکا. جا مامۆستا کاتێک دەبینێ گەلانی ژێر چەپۆکەی جیهان وا یەک لە دوای یەک ئازاد دەبن و لە ژێر باری چەوسانەوە دێنە دەرێ و سەربەخۆیی خۆیان وەدەس دێنن، بەڵام کوردەکان وەها بە قسەی پڕوپووچی شێخەکان بە فریو چوون و خەڵەتاون کە بە هیچ جۆرێک بیر لە داهاتووی خۆیان ناکەنەوە دەپرسێ و دەڵێ:

لە بەر چی کاری خەڵکی وا درووستە
ئەگەر هیندوزە گەر ئاگر پەرستە
ئەگەر لازە، ئەگەر رۆمە، ئەگەر جوو
لە ژێر نیری ئەم و ئەو پاکی دەرچوو
بڵێ یا شێخ قیامەت لێوە رابوو
بە جەهل و تەمبەڵی ماڵمان خەرا بوو
ئەگەر راستە ئەڵێی دنیا خەراوە
لە بۆ چتە ئەم هەموو جووت و بەراوە؟
ئەگەر دنیا خەرا بێ بەو نێزیکە
جەنابت بۆچ بە دنیا وا خەریکە؟

ئەمجا دوای گونجاندنی ئەو مەبەستە پڕ بایەخەی پێشێ هەر لەو پارچە هەڵبەستە درێژەدا دێتە سەر ئەو مەبەستە کە پیاوی موسڵمان نابێ پەست و ترسەنۆک و حیز و خوێڕی بێ، بەڵکە دەبێ خاوەن خیرەت و پیاوەتی و مەردایەتی بێ و وریا و تێکۆشەر و

ئازاو نەبەز بێ و جیهان و پەسلان وەک یەک بگرێ و بزانێ کە بە فەقیرۆگەیی و مردەلۆخەیی و هەژاری و بێهێزی هیچ کارێک ناڕواتە پێش و پیاو دەبێ هەوڵ بدا و تێکۆشێ بۆ بەرەو پێش بردنی رەوڕەوەی ژیان چونکە هیچ کاتێک هیچ شتێک بۆ کەس نابارێ و بێڕەنج و زەحمەت هیچ کەس هیچی دەس ناکەوێ و بە مەتەڵەی کوردی هەر دەستی ماندوو لە سەر زگی تێرە.

هەر وەک خوای گەورەش دەفەرموێ: (لیس للانسان الا ما سعی) نییە هیچ شتێک بۆ مرۆڤ ئەوە نەبێ کە هەوڵی بۆ بدا و "سعدی"یش لەو بارەوە دەڵێ:

نابرده رنج گنج میسر نمی‌شود
مزد آن گرفت جان برادر که کار کرد

جا مامۆستا دەس پێ دەکا و خیرەت وەبەر کوردان دەنێ و تانووتیان لێ دەدا و بە تەشەران دایاندەگرێ و دەڵێ: بۆچی کاری خەڵکی ئاوا دروست و ڕێکوپێکە، تەنانەت جوولەکە و هیندی و ئاگرپەرست یش هەموویان لە ژێر نیری خەڵک ڕزگاریان بووە و کەس نەماوە لەو حاڵەدا، کورد نەبێ؟! بەڵێ ئەوڕۆکە گەورەترین گەلی ژێر چەپۆکەی جیهان کوردە و نێزیکەی پەنجا میلیۆن کەسە و لە هەموو مافێکی سەرەتاییش هەر بێبەشە.

مامۆستا لە ڕێی ئایینییەوە ئامۆژگارییەکی دڵسۆزانەیان دەکا و دەفەرموێ:

وەکوو شێر وەرنە مەیدانی جەرارەت
بە خیرەت بن بە خیرەت بن بە خیرەت
پیاوی ترسەنۆک وەک پووشکە سووکە
ژنی بێوە بە کورکە و نووکە

سەحابەی رەش کەوا قەبری دیارە
مەسافەی سێ سەعات دووری لە شارە
سەحابەی مستەفا گەر ترسەنۆک بان
چ ئیشیان بوو لە تورکستان و ئێران؟
نەکەن خۆفێ نەکەن ترسێ هیچ کەس
بە غەیری پادشای دەرواری ئەقدەس
دەبێ بێ‌شک و شوبهە وا نەزانی
بە تەحقیری حەیاتە زیندەگانی
ئەوەی دنیای نەبێ دینی زەعیفە
مەلا بێ یانە شێخ یا خۆ خەلیفە
مەداری دین و دنیا هەر غینایە
بلێ الفقر فخری ئیفتیرایە

مەبەستی مامۆستا لێرەدا ئەوەیە کە جۆرە باوەڕێکی پیرێژنانە لە ناو خەڵکدا بڵاو بۆتەوە کە دەڵێن موسڵمان دەبێ بە هەموو شتێک قایل و دابین بێ و دەبێ لە خۆشگوزەرانی دووری بکا و موسڵمانان دەبێ بە هەژاری دابین بن، چونکە پێغەمبەر( شانازی بە هەژارییەوە کردووە و فەرمووشیەتی (هەژاری شانازی منە). جا مامۆستاش- خوا لێی خۆش بێ- ئەوەی بە درۆ دەزانێ و دەفەرموێ ئەی موسڵمان بڵێ "الفقر فخری" ئیفتیرایە و بە زمانی پێغەمبەرەوە هەڵبەستراوە و ئەو، هەرگیز وای نەفەرمووە. بەڵێ دابینی شتێکی چاکە و رەوشی پێغەمبەرانە، بەڵام هەرگیز بریتی نییە لە هەوڵ نەدان بۆ ژیان.

هەروەها دوای چەند هۆنراوەی جوان لەبارەی یەکیەتی و بەرنامەی دەوڵەتی کە خوا یار بێ لە جێی خۆیدا دەیانهێنین و باسیان لێ دەکەین. ئەو بەڕێزە روو دەکاتە موسڵمانانی کورد و بە

شێوەیەکی لێزانانە ئامۆژگارییان دەکا و دە گوێیان دەسریوێنێ و پێیان دەڵێ کە بۆ ئەوەی نازەکانی خوا بە فیرۆ نەڕۆن و کەڵکیان لێ وەربگیرێ، دەبێ فێری پیشەسازی ببن و تەمەنی پڕبایەخی خۆیان بە فیڕۆ نەدەن و نەچنە تەکیە و خانەگاکان و فێری درۆ و دەلەسە و فێڵ و فوت و خواری و دووڕوویی نەبن، چونکە ئەو خانەگایانە گورژی گوتەنی:

ئەوانە گـــــازینۆی ڕێبـــــواری خـــــاون
تەڵەن بـــۆ کـــوردی بەدبەخـــت دانـــراون

وەک دەفەرموێ:

هەتـــاکوو نەبـــــنە خاوەنـــــدی ســـــەنایع
هەمـــوو ئەنعـــامی خـــوا ئەڕوا بە زایـــع
بە خـــۆڕایی ئەچـــێ عـــومری عەزیزتـــان
بە هـــاوین و بەهـــار و پـــاییز و زســـتان
مەچـــوونە خانەقـــا و چـــایی‌خانـــان
هومێـــدم وایە ببـــنە خـــانی خانـــان
ئەگەر خـــواهیش ئەکەن خـــوا لێـــو بـــێ ڕازی
مەچـــوونە تەکیەکـــان بـــۆ حـــوققە بـــازی
قومـــاری قەت مەکەن ئێـــوە و خوداتـــان
دەنـــا بەر بـــا دەبـــێ مـــاڵ و موناتـــان
بەجـــێ بێـــنن ئەوەی واجـــب کـــرایە
بەوێ نەوعـــێ کە مەتلـــووبی خـــوایە
ئەگەر بـــاب جـــاهیلە بـــا کـــوڕ مەلا بـــێ
لە ئەحـــواڵی ئـــومەم بـــا شـــارەزا بـــێ

# بەرنامەی مامۆستا کۆیی بۆ کوردان

مامۆستا کۆیی لەوچەند تاکە هۆنراوەی خۆیدابەرنامەی گشتی و رامیاری و ئابووری و فەرهەنگی و سوپایی بۆ کوردان دیاری دەکاو ڕێبازێکی گشتی بۆ گەلە زۆر لێکراوەکەی دەس نیشان دەکاو دەفەرموێ:

ئەگەر عیــــزت دەوێ هەســـتە بە هــــیممەت
بە فکـــر و ســـەبر و تەدبیـــر و کیاســـەت
ئەبـێ مـــیللەت هەمـــوو یەک بـن لە گەڵ یەک
لە ئەربـــابی قەڵەم تـــا خـــاوەنی چەک
ئەگەر کوردێـــک ئیهـــانەت کەن لە بەســـرە
هەمـــوو بێـنە خـــرۆش و جـــۆش و نەعـــرە
هەتـــا حەقـــی نەســـێنن ڕانەوەســـتن
لە بەر بـــێ ئیتتیفـــاقی خـــوار و پەســـتن
خەزێنێکـــو هەبـــێ مـــاڵی عمـــوومی
وەکـــوو جـــوو و ئەرمەنـــی و داشـناک و ڕوومـــی
لە ڕوپـــیە و ئـــانە و چارێـــک و غـــازی
بە کەڵکـــو دێ لە ڕۆژی پەنـــجە بـــازی
فـــڕێ دەن مەنتەشـــا و بەرمـــاڵ و کەشـــکۆڵ
تەرک کەن تەپـڵ و ڕەقـــس و خـــزمەت و شـــۆڵ
تفەنـــگ و تـــۆپ و تەیـــارە پەیـــا کەن
بە عەزمـــی دیـــن و دنیـــا ڕوو لە خـــوا کەن
وەکـــوو شـــێر وەرنە مەیـــدانی جەرارەت
بە خیـــرەت بـــن بە خیـــرەت بـــن بە خیـــرەت
پیـــاوی ترســـەنۆک وەک پووشـــکە ســـووکە
ژنـــی بێـــوە بە کـــورکە و نـــووکە نـــووکە

راستی ئەوەی کە ئەو لەم چەند تاکە هۆنراوەدا رایگەیاندووە و وەک پێشڕەوێکی دڵسۆز و میهرەبان و هەمیشەیی وەپێش کوردان کەوتووە ئەوەندە جوان و ڕێکوپێک و تەواوە کە دەڵێی لە راوێژگەو جڤاتی رامیاران و ژیر و بەبیرانی کۆنەکار و کارکوشتەی گەلانی جیهاندا نەخشەی بۆ کێشراوە و دارێژراوەو بەرنامەیان بۆ دادەنێ و ڕێگایان پێشان دەدا. پەیڕە و پڕۆگرامیان بۆ دەنووسێ و نەخشەی رامیاری و کۆمەڵایەتییان بۆ دەکێشێ.

بەڵێ مامۆستای گەورەمان راست دەفەرموێ کەسێک، کە گەورەیی و سەروەری بۆ خۆی بوێ دەبێ خاوەنی ورەی بەرز و بیرو هەستی ئازادی و سەربەستی و ئۆقرە و خۆڕاگری و راوێژو نەخشەی جوان ولێهاتوویی و لێوەشاوەیی بێ.

ئەمجا هەر گەلێک بیهەوێ رزگار و سەربەخۆ بێ، دەبێ هەموویان تەبا و یەکگرتوو بن و بۆ دین و دنیای خۆیان روو لە خوای گەورە بکەن. ئەو گەلە دەبێ یەکسان و بێ چین و توێژ و تاقم بێ. هەر گەلێک هیوای بە مانەوە و سەربەستی خۆی هەبێ دەبێ رێگەی تاقم و توێژ و گرووپ و دەستەجات نەدا و ماوەی چینایەتی لە بەین هەڵبگرێ و کۆمەڵ، کۆمەڵێکی یەکسانی بێ، ئەو گەلانەی کە ماوەی چینایەتییان داوە و تاقم و توێژی زۆریان لە ناو خۆیاندا دروست کردوون مێژوو نیشانی داوە کە هەر بەرەو بڕانەوە و لە ناو چوون رۆیشتوون، سەرەڕای ئەوەش دەرمانی هەموو دەردێکی رامیاری هەر یەکیەتی و یەکگرتنە. بەڵێ مامۆستا جوانی فەرمووە کە دەڵێ:

ئەبێ میللەت هەموو یەک بن لە گەڵ یەک
لە ئەربابی قەڵەم تا خاوەنی چەک
ئەگەر کوردێک ئیهانەت کەن لە بەسەرە

هەمــــوو بێـــنە خـــرۆش و جـــۆش و نەعـــرە
هەتـــــا حەقـــــی نەســــێنن رانەوەســــتن
لە بەر بــــێ ئیتتیفـــــاقی خــــوار و پەســــتن

بەڕاستیش هەر وایە، دەبێ گەل هەمووی یەک بێ و یەکگرتـوو و یەکتر خۆشەویست بێ و ئەگەر تەماشا کەین بۆمان روون و ئاشکرا دەبێ کە گەل هەر وەکوو مەل خـاوەنی دوو بـاڵە، بـاڵی رامیـاری و باڵی سوپایی؛ و هەر دەوڵەتێکیش هەر بەو دوو باڵەوە راوەستاوەو هێــزی ســوپایی و رامیـــارین کە دەوڵەت و میریـــی هەر وڵات و نیـشتمانێکیان لـێ پێـک دێ و دەبـێ هەر کـاتێ ئەو دووانە پـێکەوە یەک نەبــن دەوڵەت و هێــزی گەل لە بەر یەک هەڵدەوەشـــێ. هەردووکیان بۆسەروەری و سەربەخۆیی گەل و نیشتمان پێویستن و هەرگیز مەل بە باڵێک نافڕێ.

جـا مامۆسـتای زانـا و رامیـاری راستەقینەمان دەفەرمـوێ دەبـێ خەڵک وەها پێکەوە یەک بن و وەها لە سەر یەک وە جواب بـێن کە ئەگەر کوردێک تەنانەت لە دەرەوەی کوردسـتان و لە جێیەکـی وەک بەسرە سووکایەتی پێ بکرێ و زۆری و سـتەمێکی لـێ بکـرێ دەبـێ تەواوی کـوردی دنیـا بێـنە جـۆش و خـرۆش و بە سـەر دوژمنـدا بگوڕێنن و بە جارێ بیتۆقێنن و هەتا مافی ئەو کـوردە زۆر لێکـراوە نەسـتێنن و تـۆڵەی نەکەنەوە دەبـێ رانەوەسـتن و هـۆنەری کـورد گوتەنی:

هەر کەس نەیبـــێ بیـــری تــــۆڵە
لە بــــابی خــــۆی نیــــیە، زۆڵە

خـۆ ئێـوە ئەی کـوردینە هەر تەنیـا لە بەر بـێیەکیەتـی و یەک نەبوونتان ئاوا رەزیل و زەبـوون و ژێـر چەپـۆکەی هەمـوو کەسن، دەنـا گەلـی ئـاوا رەشید و وریـا و ئـازا و نەبەز و ئـاوا قارەمـان و

پاڵەوان لە کوێ هەیە، لە کوردستان نەبێ؟! ئێوە خۆ کۆنترین و ئازاترین گەلانی جیهانن و بە بڕوای هێندێک لە راڤەدەرانی قورئانی پیرۆز ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: (ستدعون الی قوم اولی بأس شدید) واتا لەوە بە دوا بانگ دەکرێن بۆ شەڕ کردن لەگەڵ گەلێکی خاوەنەن زەبروزەنگی زۆر، لە بارەی ئێوەی کورددا هاتۆتە خوارەوە.

ئێوە دەبێ بزانن کە بە یەکیەتی هەموو شتێکتان بۆ دەکرێ، بەڵام بە بێ یەکیەتی هیچتان بۆ ناکرێ. خوای گەورە دەفەرموێ: (و اعتصموا بحبل الله جمیعا و لا تفرقوا) دەس بگرن بە رشتەی پەیمانی خوا و لێک هەڵمەبڕێن. پێغەمبەری مەزنیش دەفەرموێ: (انما یأکل الذئب من الغنم القاسیه) واتا گورگ تەنیا هەر ئەو مەڕەی دەخوا کە هەڵبڕابێ و لە مێگەلەکەی جیا دەبێتەوە و هەڵدەبڕێ. جا ئەی کوردینە ئێوە بۆچی وا دەکەن و هەتا کەنگێ یەک ناگرن و یەک نابن و خۆ ئەوا وەختە لە داخان مامۆستای گەورەمان هاواری بگەیەنێتە پەرپەڕۆچکەی دە رۆژێ.

هەروەها حاجی قادریش بێزاری خۆی لەو یەک نەبوونەتان دەردەبڕێ و دەڵێ:

ئیتتیفاقە دڵبەرێکی بێ کەدەر
حاجی ئەنواعی لیباسی کردە بەر
بێ جیاز و مارەیی دەیدا بە شوو
لەو هەموو کوردانە داخوازێک نەبوو!!

بەڕاستی شتێکی سەیرە کە دڵبەرێکی ئاوا جوان و نازەنین و پەسند و باش و لەبار و پڕمایە ئاوا بە ئاسانی بێ جیاز و بەرگ و زێڕ و مارەیی بیدەن و کەس داواکاری نەبێ!! نانا، داوتەڵەب و خوازبێنیکەری زۆرە و هەموو کەس ملی خۆی بۆ دەشکێنێ بەڵام

هەروەک بەڕێز حاجی قادر دەفەرموێ هەر لە کوردان کەس نایهەوێ چونکە نایناسن و نازانن کە چەندە باش و بایەخدارە.

یەکێک لە هۆیەکانی تێکچوونی دوامین دەوڵەتی بەهێزی کوردی ساسانی کە بە دەستی بە توانای بەڵام بێچەکی سەربازانی ئیسلام لە بەر یەک هەڵوەشا، هەبوونی ماوەی زۆری چینایەتی بوو. کۆمەڵی ئەو کاتی ئێران بریتی بوو لە چینەکانی:

١ـ نەجیبزادە و پیاو ماقووڵان و سەرانی وڵات و ئاغاوەت
٢ـ چینی نووسەران و فەرهەنگیان
٣ـ چینی سوپاییەکان
٤ـ کارگەران و کرێکاران و پیشەوەران و وردکە چینەکانی دیکە.

رژێمی چینایەتی ئەوەندە توند و سەخت بوو، کە هیچ کەس نەیدەتوانی لە چینێکرا بچێتە چینێکی دیکە وە، جا بە تایبەتی چینی پایین هەرگیزاو هەرگیز سەرکەوتنی نەبوو. دیارە لە وەها رژێمێکدا هەمیشە چینی خوارەوە بۆ بەرەو سەر چوون هەوڵ دەدا و دەیهەوێ لە چەوسانەوە رزگاری بێ و ئیتر هەر کاتێک بۆی هەڵکەوێ و دەرفەت وەدەس بێنێ رادەپەڕێ و ئاوری رق و قینی خۆی بە سەر چینی چەوسێنەردا هەڵدەڕێژێ و بە کڵوکەوە ئاگری دەداو دایدەپلۆغێنێ و ئیتر بێگومان بەرخ هەر لەبن سەوەدا نابێ و رۆژێ شاخی پەیدا دەبێ و خۆشی زل دەبێ و قۆچ لێ بدا.

دیارە لە وەها کۆمەڵێکدا هەرگیز ئاسایش و ئارامی و لە یەکتر ئەمین بوون و متمانە بە یەکتر لە ئارادا نییە. جا هەر بۆیە جەنابی مامۆستا بە گەلی کورد فەرمان دەدا وەک رابەرێکی راستەقینە و دڵسۆزێکی ئەو گەلە کە دەبێ هەموویان یەک بن و یەک تاقم و یەک توێژ بن و رژێمی چینایەتییان لە نێودا نەبێ و دەبێ یەکیەتییەکەشیان ئەوەندە توند و پتەو و قایم و قۆڵ بێ کە

ئەگەر لە بەسرەش کە وڵاتی کوردستانیش نییە، سووکایەتی بەکوردێک بکرێ، کوردان دەبێ هەموو خوێنیان بێتە جۆش و خرۆش و هەتا مافی ئەو کوردە نەستێنن و تۆڵەی نەکەنەوە رانەوەستن، چونکە

هەر کەس نەیبێ بیری تۆڵە
لە بابی خۆی نییە، زۆڵە

سەرەڕای ئەوەش، کە دەبێ ئاوا یەکگرتوو بن وەکوو هەموو گەلانی دیکەی دنیایە کە خاوەنی دەوڵەت و میریی خۆیانن و سەربەخۆن دەبێ خەزێنێکی ماڵی گشتییان هەبێ، چونکە دەوڵەت پێویستی بە خەرج و پیتاک هەیە و لە خۆڕا هەڵناسووڕێ و بەڕێوە ناچێ بەڵکە ئەو خەرج و پیتاکە هەمووی لەو خەزێنە گشتییەی ئەدرێ. کە ئەوەش هەمان (بیت المال)ی ئیسلامی واتا خەزێنەی گشتییە کە ئەو خەزێنە هەموو تاک(واحد)ێکی دراوی وڵاتەکەی تێدایە کە بە کەڵکو دێ و لە رۆژی تێگیران و پەنجەبازی و شەڕ و شۆڕدا. لەو تاکە هۆنراوەی مامۆستا کە دەفەرموێ:

ئەبێ میللەت هەموو یەک بن لە گەڵ یەک
لە ئەربابی قەڵەم تا خاوەنی چەک

ئاماژەیەکی زۆر گرینگ هەیە بۆ ئەوە کە هیچ دامودەزگایە میریی، بە بێهێزی یاسا دانەری و هێزی بەڕێوەبەری یاسا کە هێزی دادگەری و دادپەروەری ناکرێ هەر بشبێ.

جا دیارە ئەربابی قەڵەم بریتییە لە کۆڕی یاسا نووس یان کۆڕی راوێژگەری گەلی و خاوەن چەکیش هێزی بەڕێوەبەری یاسای دانراو و لە راوێژگەی گەلی دایە و لەو نیوە شیعرەشدا کە دەڵێ

هەتا هەقی نەسێنن ڕانەوەستن ئاماژە بە هێزی دادگەری (قوە قضائیە) دەکا کە هەموو دەوڵەتێک لەو سێ هێزە پێک دێت.

ئەو جار دێتە سەر ئەو مەبەستە گرینگە کە شێخەکان لە باتی هەموو زانیاری و ڕامیاری و پیشەسازی و پێشکەوتنێک کوردەکانیان فێری تەپڵ و دەف و دمبەگ و زەرگ وەشاندن و بەرماڵ بە شاندا دان و کەشکۆڵ هەڵگرتن کردووە. کە دیارە ئەوانەش لە ڕۆژی مەیدانداریدا هیچ و لە هیچیش کەمترن و بەرنامەی جیهان و سروشت و فێر و ڕامیاری هەر شتەی بۆ شتێکی داناوە. و ئیتر لە کاتی شەڕە تۆپ و شەڕە تفەنگ و شەڕە تەیارەدا دەروێشی بێمێشک بە تەپڵ و دەف وزەرگ و مەنتەشا و کەشکۆڵەوە چی لە دەس دێ؟! کە بێ گونان هیچ. جا بۆیە دەفەرموێ:

فڕێ دەن مەنتەشا و بەرماڵ و کەشکۆڵ
تەرک کەن تەپڵ و ڕەقس و خزمەت و شۆڵ
تفەنگ و تۆپ و تەیارە پەیا کەن
بە عەزمی دین و دنیا ڕوو لە خوا کەن
وەکوو شێر وەرنە مەیدانی جەرارەت
بە خیرەت بن بە خیرەت بن بە خیرەت
پیاوی ترسەنۆک وەک پووشکە سووکە
ژنی بێوە بە کورکە و نووکە نووکە

هەر لەو بەستە هەڵبەستەیدا ئاماژە دەکا بۆ یارانی پێغەمبەر و بە کوردان دەڵێ: ئەرێ ئێوە ئەی کوردانی موسڵمان! ئەگەر موسڵمانن بۆچی چاو لە یارانی پێغەمبەر ناکەن؟ خۆ ئەوان سەرمەشق و ئۆلگووی خەڵکن، موسڵمانن دەبێ هەمیشە ڕەفتاری ئەو پیاوە گەورانە ڕەچاو بکەن، ئەوان هەرگیز ترسەنۆک و

بێخیرەت نەبوون، ژیانی بە سووکی و بە رەزیلییان قەت قەبووڵ نەکردووە. ئەوان بە شانازی و سەربەرزی ژیاون، جا هەر ئەو ئازادی وشانازی و سەربەرزی و خیرەت و پیاوەتی و بیر و باوەڕە پتەوە بوو کە بۆ ماوەیەکی زۆر کەم ئەوانی گەیاند بە پلەی هەرە بەرزی ماقووڵی و سەروەری و سەرداری هەموو جیهانی ئیسلام و تەواوی دژمنەکانیش لە ترسی وان نەترەیان چوو و ئیتر خۆشیان بوونە گەورەترین هێزی جیهان.

خۆ ئێوەخۆتان زۆر پێ موسڵمانەو موسڵمانیش دەبێ بەخیرەت و نەبەز بێ و هەرگیز نابێ خوێڕی و ترسەنۆک بێ، چونکە:

پیاوی ترسەنۆک وەک پووشکە سووکە
ژنی بێوە بە کورکە و نووکە،

مامۆستا خوا لێی خۆش بێ، خۆشی پیاوێکی زۆر بەخیرەت و نەترس و نەبەز و خاوەن باوەڕ بووە.

ئەگێڕنەوە: جارێک مامۆستا نوێنەری کۆڕی گەلی دانەرانی عێراق (مجلس ملی مؤسسان عراق) دەبێ و دیارە دەوڵەتی کاتیی ئەو کاتی عێراقیش خەڵک زۆر لێی نەقاییل دەبێ و سەرەنجام لە خۆ پیشاندانێکی گەورەدا پەلامار دەبەنە سەر ساختومانی کۆڕەکە و نوێنەرەکان جگە لە مامۆستا هەر یەکەی بە لایەکدا رادەکەن و خۆیان دەشێرنەوە. بەڵام بە هۆی ئەوە کە مامۆستا نوێنەری خەڵکی و خۆشەویستی خەڵک دەبێ هیچ کەس کاری پێی نابێ و کەس خۆی تێناگەیەنێ. پاش بڵاوە کردنی خەڵکەکە نوێنەرەکان وەک مشک هەر یەکەی سەر لە کونێک دەردێنن و دێنەوە لای مامۆستا و پێی دەڵێن: ئەرێ قوربان ئەتۆ بۆچی نەترسای؟

**بەڕاستی ئێمە زۆر ترساین، کوڕە خۆ هەر زراومان چوو. ئەویش دەفەرموێ: ئەمن بە سێ بەڵگەی گەورە دەبوو نەترسم و هەڵنەیەم: یەکەم من موسڵمانم و موسڵمان قەت نابێ ترسەنۆک بێ. دووهەم کوردم و کوردیش لە هەموو گەلێکی دنیا بەخیرەت‌تر و ئازاترە. سێهەم من زانام و هەر کەسیش زانا بێ دەبێ نموونەی خیرەت و ئازایەتی بێ.**

**بەڵێ جا ئەوەیە کە دەفەرموێ:**

سەحابەی ڕەش کەوا قەبری دیارە
مەسافەی سێ سەعات دووری لە شارە
سەحابەی مستەفا گەر ترسەنۆک بانر
چ ئیشیان بوو لە کوردستان و ئێران؟

**ئەمجا دژی بیرو باوەڕی حیزانەی ئەو کەسانە،کە پێیان وایە ئەوەی موسڵمانەیان ئەوەی کوردی موسڵمانە هەر دەبێ بە زەبوونی و ڕەزیلی و بە سووک و چرووکی و ملکزی و ژێر دەستەیی و ژێر چەپۆکەیی بژی.!! ڕوو دە هەر موسڵمانێکی دەکا و دەفەرموێ:**

دەبێ بێ‌شک و شوبهە وا نەزانی
بە تەحقیری حەیاتە زیندەگانی
ئەوەی دنیای نەبێ دینی زەعیفە
مەلا بێ یانە شێخ یا خۆ خەلیفە

**هەروەها هەڵدەکوتێتە سەر بیر و باوەڕی نەزانانەی ئەو کەسانە کە بە نێوی دین دنیایان وەلاناوە، یان لە چۆڵگە و ئەشکەوتاندا**

دەژین، بە بێ هەموو پێداویستییەکی ژین یان وەک نەزانان بەوە قاییل و دابینن کە بەشەکەی وانیش هەر خەڵک بیخوات لە مەرجێکا کە خوای گەورە خۆی لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: (و لا تنس نصیبک من الدنیا) واتا بەشی خۆت لە جیهاندا فەرامۆش مەکە، چونکە خوا بەشی بۆ داناوی و تۆ خۆت ناتهەوێ و یا نازانی بتهەوێ.

جا ئەوانەی بە نێوی دین وا فریو دراون کە پێیان وایە دین ئەوەیە کە تۆ لە دنیا بێبەش بی و هەموو کەس هەر فێڵت لێ بکا و بەشت بخوا و ئیتر هیچ بیر لەوەی ناکەنەوە کە بێبەش وەک بێ بەشە، روو رەشیشە. چونکە هەر کەس نەتوانێ داکۆکی لە ماف و بەشی خۆی بکا لە پەسلاندا بەرپرس و بەرگروانە و خوای گەورەش دەفەرموێ: (قل من حرم زینە اللە التی اخرج لعبادە و الطیبات من الرزق) بلێ ئەرێ کێ حەرام و قەدەغەی کردوە ئەو جوانی و ناز و خۆشییانە کە خوا بۆ بەندەکانی خۆی دروستی کردوون و هەروەها رۆزییە پاکەکانیش. گەلێکن ئایەتی تری لەو چەشنە و هەروەها لەو بارەوە فەرموودەی جوانی پێغەمبەری مەزنیش زۆرن بۆ نموونە پێغەمبەرلە فەرموودەیەکدا دەفەرموێ: (لیس الرجل رجل الدنیا و لا الرجل رجل الآخرە بل الرجل رجلهما) واتا پیاو ئەوە نیە کە هەر پیاوی دنیایە بێ و پیاو ئەوەش نییە هەر پیاوی پەسلان بێ، بەڵکە پیاو ئەوەیە کە پیاوی دنیا و پەسلان بێ و وەک یەک بۆ هەر دوو لا تێبکۆشێ.

جا مامۆستای بەڕێزمان خوا لێی خۆش بێ، کاتێک دەبینێ راستەقینەی کار ئەوەیە کە خوا و پێغەبمەری خوا نیشانی دەدەن و شێخە دنیا خۆرەکانیش لای دنیایەیان لە مریدە کەرەکانیان بڕیوەتەوە و کۆلکە مەلا نەزانەکانیش بە دمبەگی ون هەڵدەپەڕن و

هێندێک بێ باوەڕێش بە چاکی بۆ خۆیان کەڵکی لێ وەردەگرن روو بە هەموویان دەفەرموێ:

ئەوەی دنیای نەبێ دینی زەعیفە
مەلا بێ یانە شێخ یا خۆ خەلیفە
مەداری دین و دنیا هەر غینایە
بڵێ "الفقر فخری" ئیفتیرایە

بەڵێ گەلێک قسەی ئاوای وەک ئەوە کە دەڵێ نەداری مایەی شانازی منە بە زمانی پێغەمبەری خۆشەویستەوە هەڵبەستراوە کە بەڕاستی بە هیچ جۆرێک لەگەڵ ژیری و لۆجیکی ئیسلامیدا ناگونجێن و نەیارییەکی تەواویان هەیە و پێکەوە دژ و ناکۆکن. چونکە لە تەواوی دێژە و وێژەی پیرۆزی ئیسلامدا ئاماژەیەکی چووکەڵەش بۆ ئەو مەبەستە کە نەداری جێگەی شانازی بێ نابینرێ بەڵێ ئەوە هەیە کە پیاو دەبێ بە نەداری دابین بێ و کاتێک کە هەژار و نەدار و دەستەنگ بوو نابێ هەڵبچێ و لە رێ لادا و لە کوورە دەر بچێ، بەڵام ئەو وتە ساختەگییە دەڵێ پێغەمبەر شانازی بەوەوە دەکا کە دەستەنگ و هەژار و نەدار بێ!! ئاخر نەدار چی لە دەس دێ؟ تا جێی شانازی بێ؟

جا موسڵمانی سادە و ساویلکە و ساکار کاتێک بزانێ کە پێغەمبەر شانازی بەوەوە دەکا هەرگیز بۆ دەوڵەمەند بوون و دەس رۆیشتن تێناکۆشێ و سەرەنجام وای لێ دێ کە دەبێتە سەرباری کۆمەڵ و ملۆزمی گەل و ئیتر دەبێ بە خێری خەڵکی بژیو ئیتر کاتێک کە ئەوەش مایەی شانازی پێغەمبەری خوا و رابەری گەورەی گەل بێ دەبێ خەڵک پتر شانازی پێوە بکەن و سەرەنجام وای لێ دێ کە گەل و کۆمەڵ بەو شانازییە بێ جێیەوە بە یەکجاری

دەبەتڵـــێ. جــا ئیتــر وای بە حـــاڵی ئەو گەلە کە بە هەژاری و نەدارییەوە بنازێ کە بێ گومان دەبێ بۆ نۆکەریش ئامادە بێ.

بە کوردی دەوڵەمەندی هەموو شتێکە و نەداری هیچ شتێک نییە، جا بۆیە مامۆستا دەفەرموێ:

مەداری دیـــــن و دنیــــــا هەر غینــــــایە
بڵـــــێ "الفقـــــر فخـــــری" ئیفتیـــــرایە

واتا ئەوەی ئایین و جیهانی لەسەر دەسوڕێ هەر ماڵ و سامان و دەوڵەمەنـــدییە و ئەوەش کە دەڵـــێن پێغەمبەرفەرمـــوویەتی نەداری هـۆی شـانازی مـنە بوختـانە کە بەو پێغەمـبەرە بەرێـزەی دەکەن. حاشـا قەت پێغەمـبەر شـتی وای نەفەرمـووە و ناشـیفەرموێ. بەڵـێ هەژار و نەدار نابێ لە نێو کۆمەڵێکدا گول بکرێ و وەدەر بنـرێ و دەبێ ئەوپەڕی ڕێزیشی لـێ بگیـرێ، بەڵام هەرگیـز مـایەی شـانازی نییە و نابێ بە هیچ کلۆجێک هەوڵی بـۆ بـدرێ. خـوای گەورە بـۆیە زەکـاتی دانــاوە کە هەژارەکـانیش بگەیەنێـتە ریـزی دەوڵەمەنـد و دەسڕۆیشتووەکان.

دووبــارە ڕوو لەکــوردانی چەوســاوە و لێقەومــاو و مــاڵوێران دەکاو، پێیــان دەڵـێ: ئێـوە ئەی برایـانی کـوردم! ئەگەر دەتـانهەوێ گەورە بـبن و ببـنە خـاوەنی مـافی خـوا پێـداو و بەڵام زەوت کـراوی خۆتـان ولە نێـو گەلانـا ئێـوەش دەرکەون و شـوێنەواریکتان ببــێ، دەبێ لەگەڵ چەند دوژمنـی گەورە بەشـەڕ بێن و چەنـدین کۆسـپ و لەمپەری گرینگ و گەورە و سەخت و حەستەم لە سەر ڕێـی خۆتـان لابەرن کە دیـارە ئەوەش بە دەسـتی بەتـاڵ نـاکرێ و دەبـێ خۆتـان تەیار کەن و ئامرازی شەڕ و کەرەسەی جەنگی پەیـدا بـکەن و ئەگەر ئەو کـارەی نەکەن دەبـێ هەوای گەورەیـی و بە مـافی خـۆ گەیـین و

وەدەس هێنـانی چارەنووسـی خۆتـان لە سـەر دەرکەن. چـونکە لە دنیـادا هـیچ کارێـک بە بـێ ئـامراز و کەرەسـە نـاکرێ و بەرنـامەی گشتی سروشتی و رەوشی خوا (سنة الله ش هەر لە سـەر بنچینـەی پێویستی ئامراز بۆ کار و ئاکام وەرگرتن لە کار دامەزراوە. جا هەر بۆیە پێمان دەفەرموێ:

هەوای گەورەیـــــی دەرکەن لە نێـــــو ســـــەر
بە بـــێ تـــۆپ و تفەنـــگ و مـــاڵ و عەســـکەر
مـــوحەققەق تـــا قیـــامەت نـــابنە بەگلـــگ
هـــاوان و تـــۆپ نەبـــن یـــان ئـــون ئێکـــی لـــگ
بە غەوواس و بە پـــــــــاپۆڕ و زریبلـــــــــی
بە بـــــالۆن و بە دوونـــــــخەی زربلـــــــی
لە دونیـــا هەر چـــی بـــێ کـــوردی مـــوحەققەر
بە بـــێ پـــارە لە بـــۆت نـــابێ مویەســـــەر

مامۆسـتای پـایەبەرز و بەرێزمـان کە خـۆی ئاگـاداری تەواوی بە سەر زانیارییەکانی سروشتی (علوم طبیعی)دا هەبووە و زۆر چاکیش زانیـویەتی کە لە دەروونـی عەردیـدا چ ئەنـدازە کلـن و سـەرچاوە و کانگای سفنگەل(مواد)ی جۆراوجۆری تێدایە بەتـایبەتی زەمینـی پڕ پیت و پیرۆزی کوردستان و خۆ دەرهێنانی ئەو کانگایـانەش بە بـێ زانینـی زانیـارییە سروشـتییەکان بە تـایبەتی زانیـاری (فیزیـک و شیمی) ناگونجێ و ناکرێ کەڵکیان لێ وەربگیرێ.

جـا بەو حـاڵەش هێنـدێک مەلای نەزان و نەخوێنـدەوار لە بەر نەزانی و گەوجی خۆیـان خوێنـدنی ئەو زانیارییـانە لە موسڵمانان قەدەغە و حەرام دەکەن و پێیـان وایە ئەوەیە دێـژە و شـەریعەتی ئیسلام. بەڵێ ئەوان کوردیـان ئـاوا فێر کـرد و بـار هێنـا و بە رێـی

چەوت و هەڵەدا ئاژاندوویان تا سەرەنجام وای لێ هات کە خەڵک خەریکی فێر بوونی زانیارییەکانی سروشتی و پیشەسازی و پێش خستنی وڵات و گەل و نیشتمانی خۆی بووە و ئێمەی کوردی نەزانیش هەر خەریکی تەپڵ و دەف و زەرگ و دمبەگ و شتی تری لەو چەشنە بووین و بە قسەی شێخ و مێخان بەو لا و لایاندا هەڵپەڕین و داپەڕین و بە جارێ هەموو شتێکمان لە دەس چوو و ئیتر لە دەس کوردا نەما غەیری هەمانە!!

بەڵام بێگانە هاتن و لە وڵاتی پڕ پیت و کانی ئێمەدا پارووویان دە رۆنی کەوت و گاسنیان گەیشتە خەزێنە، بەڵام ئێمە لە بەر ئەوەی کە ئەو زانیارییەمان نەدەزانین و خۆمان خەریک نەبووین، ئەو کانگا و سەرچاوە بەنرخانەی خۆمان دەرێنین، دەم لە پووش و دەس بەتاڵ و چاو لە دەس ماینەوە و ئێستاش کە ئێستایە چاومان لەوەیە کە ئەوان لە سامانی بێپایانی خۆمان خێرێکمان پێ بکەن و بە پیاوەتی خۆیان و خێری دایک و بابیان شتێکمان بدەنێ!!

جا هەر لەو پێوەندانەدا من لە ساڵانی رابردوودا پارچە هۆنراوەیەکم بە نێوی "تەشەر" نووسیوە کە پێم وایە بێ جێ نییە لێرەدا بیکەمە نێوئاخنی مەبەستەکە:

## تەشەر

لاوی کورد ئەی بۆت نەمێنم پاڵەوانی تەمبەڵی
خەڵک ئەوا سەرکەوتە سەرگۆی مانگ و تۆش هەر ماتەڵی
دەرکی فێرگەت داخراوە و واڵە دەرکی مەیکەدە
پێت خەنی بووم ئافەریم، ئاوایە کاری ئەم سەدە؟!
زانینت هەر بۆتە خەون و خوێندنت گاڵتە و گەمە

دەتـــهەوێ گەل ســـەربخەی کـــاکە بە هەویـــای ئەمە
ڕۆژی ڕزگـــاری هەڵات و تیـــشکی هاویـــشتە جیهـــان
بێبەشـــی تـــۆ ئەی بـــراکەم چـــونکە بـــێ بیـــری و نەزان
کێـــیە لەم دنیـــایەدا بـــێجگە لە تـــۆ وا پەســـت بـــێ
کێـــیە ئـــاوا پێنەگەیـــشتوو دوورە بیـــر و هەســـت بـــێ؟
لاوی کـورد هێنـدەت لـێ قەڵسم وا لە داخـت دیـق ئەکەم
هێنـد دەروون گوشـراو و دڵـتەنگم خەریـکە جیـق ئەکەم
لاوی خەڵکـــی دەشـــتە تاقیگـــا و دەســـی ڕادێ بە کـــار
دەســـــتی لاوی کـــــورد بەڵام ئەی داخەکەم ڕادێ بە دار
هەر کەســـێ بەردات ڕێـــگەی ڕاســـت و لاڕێ ڕێ کەوێ
قەت نیـــیە بگـــاتە ســـەری شـــار و قەتـــیش ســـەرناکەوێ
لاوی کـــورد ئیـــسلامە ڕێگـــا بـــۆ گەلانـــی هۆشـــیار
هەر گەلێکـــی بگـــرێ ڕێـــی ئیـــسلام دەبێـــتن بەختیـــار
خـــۆی دەکـــا ئامـــادەتر دژمـــن دژی تـــۆ و تـــۆش کەچـــی
کـــاری گەورەت بـــۆتە قومـــار و بەرەو پەســـتی دەچـــی
قیـتە قیتـی گوێچکەبـان و قولینچـک و بـن دەرک و سـەراو
کـاری گەورە و گرینگـی تـۆیە دیـارە کـارت کـرد تەواو
پەنـــجەکەت خـــاراوی دەســـکەللا و جـــگ و مێـــشێنەیە
ئـــافەریم بـــۆو کـــارە باشـــەت کـــارەکەت بـــێ وێـــنەیە
لاوی خەڵکـــی هەر خەریکـــی کۆشـــشە و هەوڵ و خەبـــات
تـــۆش خەریکـــی تەمبەڵـــی خـــۆتی هەژار و پەســـت ولات
تـــــۆ لە بـــــاتی پیـــــشە و پژگـــــاڵ و هەوڵ و تێکۆشـــــان
هەڵدەوێـستی سـا لە سـەر کـووچە و شـەقام و گوێچکەبـان
پیـــشەسازی خەڵکـــی جیهـــانی وەهـــا پـــێش خـــستووە
هەر گەلێکـــی پیـــشە نـــازانێ گەلـــێکە نوســـتووە

لاوی کـورد ئیـسلامە ڕێـگەی تـۆ ئەگەرکـوو تێـبگەی
گەر لە ئیـسلام لا بـدەی جـا پـێم بڵـێ بە کـوێ دەگەی؟
چـۆن نەنـاڵم، چـۆن نەگـریەم، چـۆن نەبـم مـات و پەژار
چـۆن لە تـاوی تـۆی نەزان فرمێـسکم هەڵنەڕێژنەخـوار
لاوی خەڵـک خـزمەت بە خەڵکی خـۆی دەکا ڕۆژ و شـەوێ
لاوی کـوردی نـازانێ داخـم، بـۆچ ئەژیـت و چـی ئەوێ؟
لاوی خەڵکـی مێـشکی ڕوونـی بیـر لە کاکێـشان ئەکـا
پـرچن و چڵکـن سـەری کـوردان هەمیـشە ژان ئەکـا
ئەم گەلەی تـۆ بـۆیە لێـی قەومـوە کـاکە کـوردەکەم
چونکە تۆی هەر نیت و بەو شێوەش هەبی چت لێ بکەم
هەر گەلێـک لاوی نەبـن وریـا و بەکـار و خوێنـدەوار
ئەو گەلە هەر پەسـت و پەککەوتە و هەژارە و نابەکـار
ئەو خـودایە بـۆیە داینـاوە جیهـان تـا تێـی بـگەی
گەر لە جیهـان و لە خـۆت حـاڵی نەبـی بە کـوێ دەگەی
کـاری لاوی خەڵـکە فـڕۆکە، بریـسکە، بێـتەل، ڕادوێـن
کـاری لاوی کـوردەواریش پـشکیلانە و گـۆرەوێن
لاوی خەڵک ئەفڕێ بە کەشتی و دەشتە سەر کورەی زوحەل
تـۆش خەریکـی هەمزەلـی، حەڵـوا و حبـۆکە و حینـگە شـەل
خەڵک بە هـۆی زانین لە گڵ دەردێنـێ سـەدها زێـڕ و زیـو
تۆش دەژی وەک دیل، زەبوون، برسی، هەژار، بێ کار و نیو
لاوی خەڵکـی دەچـتە زانـستگا و خەریکـی خوێنـدنە
لاوی کـوردیش هەر خەریکـی پـشکیلە و کەلـلاو بـنە
لاوی خەڵـک یـاری بە ئـامرازی پیـشە و کـارە و ئەتـۆش
گوڵینـگ و دەسـحێب و زریـزەت هەڵدەسـووڕێنی لە جـۆش
لاوی کـورد بەسـیە لە حـاڵی خـۆت وەرە بیـرێ وەکە

تــۆ گــریێپــووچکەی ژیانــت گــش بە قورئــانێ وە کە
هەســـتە وەک مەردی دە مەیـــدانێ لە پەســـتی لابـــدە
نــووکەکەی پێنووســـی بیـــری تیـــژ بە ژیـــری دابـــدە
گـــورزی هەر بـــۆیە لە داخـــی لاوی کـــورد وا دیـــق ئەکـــا
هەرچـــی پێـــی بڵێـــی وا مەکە و وا نـــابێ ئەو هەر وا دەکـــا

**جـا مامۆسـتای گەورە و گرانمـان کاتێـک کە بیـری لەو حـاڵە کـردۆتەوە و زۆر چـاکیش زانیـویەتی کە خـاکی پـاکی کوردسـتان چییەو چەندە بە فەڕ و کەڵکە و چۆن پڕە لە کانگـاگەلی سفنگەلی جۆراوجۆری وەکوو نەوت و قیر و گاز و زێڕ و زێوو ئاسن و مس و قەڵایی و قورقوشم و فافۆن تـانووت لە کوردان دەدات و دەفەرموێ:**

وڵاتێکتـــــان هەیە پـــــڕ کـــــان و مەعـــــدەن
بە بێـــــڵ و پـــــێمەڕە دوو قـــــۆرتی لـــــێ دەن
دەزانـــــن نـــــاوی عەردی چـــــی تێـــــدایە
وەلـــــێ مەرقـــــوومی ئەمـــــری کیمیـــــایە
هەتـــــا ئەو عـــــیلمە زۆر چـــــاکی نەخـــــوێنن
دەبـــــێ هەر پـــــاقلە و ســـــڵقان بچێـــــنن
مەلای نـــــادان بە عینـــــوانی شـــــەریعەت
حەرامـــــی کـــــرد لە تـــــۆ عیلمـــــی تەبـــــیعەت
لەبـــــۆیە هەرچـــــی لەو خـــــاکە بەدەر کەوت
لە زێـــــڕ و زێـــــو و تـــــوج و پـــــاقر و نەوت
هەمـــــووی کەوتـــــۆتە ژێـــــر دەســـــتی فەرەنگـــــان
چیـــــا و چـــــۆڵان دەنـــــۆڕن وەک پڵنگـــــان
بیـــــانۆڕن چیایـــــان چـــــۆن دەکـــــۆڵن
هەتـــــا کەی ئێـــــوە هەر بەرمـــــاڵ بەکـــــۆڵن

ئەمجا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە خوای گەورە کوردستانی بە جۆرێک دروست کردووە کە سەرەڕای کان و کانگا و سەرچاوە جۆراوجۆرەکانی ژێر زەوی لەسەر زەویش گەلێک شتی وای تێدا دروست کردووە کە زۆر جێگای دیکەی جیهان لێی بێبەشن. وەک ئەوە خوا گەلێک جێگای کوردستانی کردۆتە جەنگەڵ و لێڕەوارو پڕ دار و درەخت و نزاری پڕ بەر و خاوەن سێبەر و هەموو بەرەکانیشی بەکەڵکن. یان کوێستانەکانی کردۆتە نواڵ و بانوو و لاپاڵ و گوێبنیبەڵێن و کەتیرەی جەوت و شفرەی لێ پەیدا دەبێ.

بەڵام لەبەرئەوە کە ئەو شتانە خۆشیان کەمن و بەهرەشیان هەر کەمە و دەبێ بە رەنجی شان خڕ کرێنەوە و هەر کاری ژن و منداڵ و پاڵە و کارگەری رەنجبەری کوردەوارین.

رۆژئاواییەکانی نەوت هەڵمژ خۆیان لەو جۆرە شتانە خەسار نەکردووە و دوای ئەوانە نەکەوتوون و هەر بۆ کوردان ماونەتەوە و ئیتر ئێمەی کورد هەر ئەوانەمان لە دەسدا ماوە و بەس، و خۆ ئەگەر ئەوانەش هەروەکوو گەنجینەکانی دیکە لە دەس بدەین ئیتر بە یەکجاری دەس بەتاڵ و لە سەر ماڵی خۆمان بێ ماڵ و لە ساڵدا بێ حاڵ دەبین.

جا هەر بۆیە مامۆستای بەهەشتیمان ئامۆژگاریمان دەکا و دەفەرموێ:

خوری و مازوو و کەتیرە و جەوت و گەڵوان
وەکوو سێچکە و گڵیخە و رۆن و قەزوان
دەخیلوو بم نەکەن بیدەن لە دەستوو
وە ئیللا وا بزانن رۆحوو دەرچوو
هەتاکوو نەبنە خاوەندی سەنایع

هەمـــــوو ئەنعـــــامی خـــــوا دەڕوا بە زایـــــع
بە خـــــۆڕایی دەچـــــێ عـــــومری عەزیزتـــــان
بە هـــــاوین و بەهـــــار و پـــــاییز و زســـــتان

هەروەک رابرا من لە پارچە هەڵبەستی تەشەردا گوتوومە:

پیــشەسازی خەڵکــی جیهــانی وەهــا پــێش خــستووە
هەر گەلێکـــی پیـــشە نـــازانێ گەلـــێکە نوســـتووە

زۆر جوانە فەرموودەی مامۆستا کە دەفەرموێ هەتـاکوو ئێـوەش نەبنە خاوەنی پیشە و پیشەسازی هەمـوو ئەو نـاز و نازیارییـانەی کە خوداوەندی گەورە لە خاکی ئێوەدا بۆی دانـاون بە زایە دەچـن و بە هۆی ئەوە کە ناوانن و نازانن کەڵکیان لێ وەرگرن هەروەهـا لە جێی خۆیاندا دەمێننەوە، یان خەسار دەبن!!

ســەرەڕای ئەوەش ئێــوە هەر هەمیــشە بێکــارن و بە هــاوین و بەهـارو پـاییز وزسـتاێ تەمەنـی پڕ بایەختـان بە خـۆڕایی دەڕوا چــونکە هەر وا ناچــارن بە بێکــاری بیگــوزەرێنن و جــێگەی داخ و خەفەتە کە کووچە و کۆڵان و شەقام و بن دیوارەکان پڕپڕن لە لاو و گەنـــج و مێرمنـــداڵ لە کوردســـتاندا بەڵام مـــزگەوت و فێـــرگە و کارگایەکان چۆڵ و هـۆڵن و حوجرەکـان پەپوویـان لـێ دەخـوێنێ!! خەڵـک لە خــاکی تـۆ دەردێنـێ هەزاران زێـڕ و زیـو و تـۆش ئەوە حاڵتە!! ئەرێ جا کاکی خۆم دەتهەوێ تا کەی ئاوا بمێنی و تـا کەی دەستی خۆت لە بن باری خەڵک دەرناهێنی؟!

# تەکیە و خانەقا لە روانگەی مامۆستاوە

مامۆستای بەڕێز و بەرزمان، رووناکبیرێکی وەها بووە کە لە شەوی رەش و پڕ تەم و تەڵەمی رۆژگاری پڕ لە ئاشووبدا داوی رەشی دوژمن و نەیارانی گەلەکەی خۆی دیتووە و تەڵە و پەڵەی لێک جیا کردۆتەوە. دەڵێی وەکوو مەلێکی دووربین و تیژ باڵێکی وەها بووە کە دانە و داوی لێک جیا کردۆتەوە و هەرگیز لێی تێکەڵ نەبوون و قەت و قەت بۆ دانە بە داوی دوژمنەوە نەبووە.

ئەو خوا لێی خۆش بێ، زۆر چاک زانیویەتی کە ئەو تەکیەو خانەقایانەی کە وا لە وڵاتی کوردستانی بەڵا لێدراودا بە نێوی ئایین و بە قسە بۆ ئایین و بە رواڵەت بۆ راژەی گەل و ئایین ساز کراون، هەموویان دژی ئایینی ئیسلام و کەڵەن لە مزگەوتی ئیسلامی هاتوون و ئیتر تەنیا بۆ ئەوە ساز کراون کە شێخ و سیخوڕ و بێگانە پەرستەکان لەوێدا کۆ ببنەوە و موسڵمانانیش هێندێک لە مزگەوتێ بگێڕنەوە و جۆرێکیان بار بێنن کە ببنە دژ و نەیاری مەلا و مزگەوت. بەڵام دژایەتییەکی نهێنی و فێڵبازانە و حیزانە نەک دژایەتی ئاشکرا و پیاوانە، لە سەرتاسەری ئەو کوردستانە پان و بەرینەدا بە درێژایی مێژوو لە هەر جێیەکی خەڵکی حاڵی و مەلای زانا و هۆشیار ببێ ئەو جاسووسانە خەڵکەکەیان بە لەونێک لە دژی مەلا راست کردۆتەوە و بە گژیاندا کردووە...

جا نابێ ئەوەش فەرامۆش بکرێ کە بەڕاستی تەکیە و خانەقا نموونەی مزگەوتی زیان (مسجد الضرار)ن و لاسا کردنەوەی ئەبوو عامیری دووڕوویە کە لە مەدینە رایکرد و لە دواییدا دەستووری بە

پەیڕەوەکانی خۆی دا کە بۆ کۆبوونەوە و نەخشە کێشان و بۆسە نانەوە بۆ پێغەمبەر جێگایەک ساز بکەن و بچنە لای محەمەد و بڵێن ئێمە مزگەوتێکمان ساز کردووە و بۆ پیرۆزی و دەرگا هەڵگرتنی وەرە نوێژێکی تێدا بکە. دیارە مەبەستیشیان ئەوە بوو، کە ئەگەر تەشریفی هێنا لەوێدا لە داوی بخەن و بیکوژن.

بەڵێ لەو کاتەدا کەوا پێغەمبەر ئامادە بوو کە بڕوا بۆ غەزای تەبووک چوونە خزمەتی و داوایان لێ کرد و ئەویش فەرمووی ئێستا ئێمە لە سەر سەفەرین، ئەگەر خوا بیکا با بگەڕێینەوە. بەڵام لە گەڕانەوەدا خوا نیگای بۆ نارد و فەرمووی:

﴿وَالَّذِينَ اتَّخَذُوا مَسْجِدًا ضِرَارًا وَكُفْرًا وَتَفْرِيقًا بَيْنَ الْمُؤْمِنِينَ وَإِرْصَادًا لِّمَنْ حَارَبَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ مِن قَبْلُ ۚ وَلَيَحْلِفُنَّ إِنْ أَرَدْنَا إِلَّا الْحُسْنَىٰ ۖ وَاللَّهُ يَشْهَدُ إِنَّهُمْ لَكَاذِبُونَ ﴿١٠٧﴾ لَا تَقُمْ فِيهِ أَبَدًا ۚ لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَىٰ مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ أَحَقُّ أَن تَقُومَ فِيهِ ۚ فِيهِ رِجَالٌ يُحِبُّونَ أَن يَتَطَهَّرُوا ۚ وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُطَّهِّرِينَ ﴿١٠٨﴾ أَفَمَنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَىٰ تَقْوَىٰ مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانٍ خَيْرٌ أَم مَّنْ أَسَّسَ بُنْيَانَهُ عَلَىٰ شَفَا جُرُفٍ هَارٍ فَانْهَارَ بِهِ فِي نَارِ جَهَنَّمَ ۗ وَاللَّهُ لَا يَهْدِي الْقَوْمَ الظَّالِمِينَ ﴿١٠٩﴾ لَا يَزَالُ بُنْيَانُهُمُ الَّذِي بَنَوْا رِيبَةً فِي قُلُوبِهِمْ إِلَّا أَن تَقَطَّعَ قُلُوبُهُمْ ۗ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ ﴿١١٠﴾﴾

واتا ئەوانەی ئەوتۆکە مزگەوتێکیان ساز کرد بۆ زیان گەیاندن بە موسڵمانان و بۆ کوفر و گاورییەتی و بۆ پەرتەوازە و بڵاو کردنی باوەڕداران و بۆ بۆسە و کەمین دانان بۆ پێغەمبەری خوا کەسانێک بوون کە لەمەو بەر لە گەڵ خوا و پێغەمبەری خوادا بە شەڕ هاتن و سوێند دەخۆن کە ئێمە لەو کارەدا جگە لە چاکە مەبەستێکی دیکەمان نییە!! خوا گەواهی ئەدا کە ئەوان درۆ دەکەن

(تۆ ئەی محەمەد) هەرگیز نوێژ دەو مزگەوتەدا مەکە و مەچۆ تێی و تێیدا رامەوەستە. بێگومان مزگەوتێکیان کە لە هەوەڵی‌ڕا لە سەر پاکی و پارێزگاری (مزگەوتی قوبا کە لەوێش نێزیکە) دامەزراوە شایانترە، کە بچیە ناوی و نوێژی تێدا بکەی، چونکە مزگەوتی خوایە و بۆ خوا دروست کراوە و پیاوانێکی پاک و پیرۆزی تێدان کە پاکی و چاکی خۆیان پێ خۆشە و هەوڵی بۆ دەدەن و خوداش پاکانی خۆش دەوێن. ئایا ساختومانی ئەوانە، کە بناغەی کاری خۆیان لە سەر پاکی و خاوێنی و ترس لە خوا و پارێزگاری و باوەڕو بە هیوای رەزامەندی خودا داناوە چاکترە، یان ساختومانی ئەوانە، کە درۆزن و دووڕوو و بێباوەڕ و خوانەناسن و هەلپەرستن و هەمیشە هەر بە دوای فێڵ و تەڵەکە و داو و تەڵەدا دەگەڕێن، بەڵام لە بەر بەدبەختی و نەزانی خۆیان نازانن کەوا ئەوان بناغەی خانووە کاول و تێکشکاو و نێزیک بە رووخانەکەی خۆیان لە سەر لێوی کەنداڵی چۆمی خاڵی کە نێزیکە بڕووخێتە ناو کڵی دۆزەخەوە، داناوە. دیارە ئەوانە ستەمکارن و خواش ستەمکارانی خۆش ناوێن و هاوکارییان ناکا. ئەو ساختومانە هەر مایەی دوودڵی و گومانە لە دڵی واندا و دوودڵی و گومان لە دڵی وان دەرناکا مەگەر دڵیان پارچە پارچە ببێ و خواش زانا و لێزانەو هەر خۆی دەزانێ چ دەکا.

جا لەو سێ ئایەتە پیرۆزە بۆمان دەردەکەوێ، کە مزگەوت بۆ خودایە و دەبێ هەر بیرو باوەڕی خوایی تێدا رابگەیەنرێ و نابێ بە هیچ جۆرێک بۆ کاروباری دژی خوایی کەڵکی لێ وەربگیرێ. و هەروەها مزگەوت جێگەی کۆ بوونەوە و لێک نزیک بوونەوەی موسڵمانانە و موسڵمانان هەموویان هەتا مزگەوتەکە دەیبا دەبێ لەوێدا کۆ ببنەوە و هەتا ئەو کاتەی کە خەڵک لە مزگەوتی

هەبوودا جێیان دەبێتەوە دروست و ڕەوا نییە مزگەوتێکی دیکە ساز بکەن بەڵام کاتێک لەو مزگەوتەدا کە ئێستا هەیانە جێیان نەدەبۆوە بۆ نوێژ کردن یان بۆ کۆڕ و کۆبوونەوەی رامیاری و کۆمەڵایەتی دەتوانن مزگەوتی دیکە ساز بکەن یان هەر ئەو مزگەوتە گەورە بکەنەوە.

بە پێی بەرنامەی ئایینی ئیسلام بۆ نوێژی هەینی کە کۆبوونەوەیەکی گەورەتر لە نوێژەکانی دیکەیە خەڵکی شار یان دێ هەموویان دەبێ لە یەک مزگەوت کۆ ببنەوە جا مەگەر جێیان نەبێتەوە کە ئەودەم بە شێوەی کاتی و بۆ ماوەیەکی کەم هەتا مزگەوتی هەینی گەورە دەکەنەوە دروستە کە لە پتر لە یەک جێی بکرێ و ئەگەر ئەو گونجانە (امکان) نەبوو کە مزگەوتی هەینی وەها گەورە بکرێتەوە کە جێگەی تەواوی نوێژکەرانی شار یان دێ ببێ ئەوە دەتوانن لە چەندین جێگەدا بە پێی پێویست نوێژی هەینی بکەن. ئەگەرچی هێندێک کەسی بەرچاوتەنگ بەرگری لەو کارە دەکەن کە بەڕاستی زۆر ناڕەوایە و دژی بەرنامەی خودا و دێژەی ئیسلام و بەرژەوەندی موسڵمانانە.

بەڵام بە داخەوە ئێستا لە گەلێک شاری کوردستان مزگەوت ئەوەندە زۆرن کە ئی وایان تێدایە درۆ نابێ بڵێین لە پێنج فەرزی نوێژی رۆژێدا پێنج کەسی ناچێتێ و سەرەڕای ئەوەش لە حەوشەی هێندێک مزگەوتاندا خانەگایەکیشیان ساز کردووە و مریدە بێمێشکەکان لە مزگەوتی دەگێڕنەوە و دەیانبەنە ژووری خانەگایەکە و بە کەیفی خۆیان قسەیان بۆ دەکەن و پەروەردەیان دەکەن!! کە هەر بە هیچ جۆرێک لەگەڵ دێژە و شەرعی ئیسلامدا ناگونجێ و ئیتر بەڕاستی ئەو خانەگایانە هەمان مزگەوتی زیان و کەمینگا و هۆی لێکپچڕان و هەڵبڕانی موسڵمانان و بنکەی بڵاو

کردنەوەی بیر و رای ناخواییانەن و لەڕاستیدا ئەرکی موسڵمانان لە بەرابەر ئەو مزگەوتە زیانانەدا هەر ئەرکە پێغەمبەرە کە لەگەڵ مزگەوتی زیانی دووڕووەکانی مەدینە ئەنجامی دا کە ئەوە بوو رووخاندی و دار و پەردووەکەشی سووتاند و کردی بە دەستەچیلەی ئاور و کردیە مستێک خۆڵەمێش و بە بایدا کرد و خەڵووزەکانیشی خستە زبڵدانی مێژووەوە.

جا کە وایە مامۆستای خوا لێخۆشبوومان بۆیە هێرشیان دەکاتە سەر و دەیهەوێ موسڵمانان لەو جۆرە جێگانە، کە دووکانی دەس‌بڕی و جێگای مێشک تالان کردن و چەوساندنەوەی بیر و باوەڕ و تالان کردنی هەستی ئیسلامی و ئازادی خوازی و سەنگەری نهێنی دنیاخۆران و خەڵک فریودەرانن، بگێڕێتەوە و بیانباتە مزگەوتی خودایی و لە دوای مەلای دڵسۆزی گەل روویان پێ دە خودای گەورا بکا و ئیتر بێباکانە دەفەرموێ:

## خانەقا و تەکیە

مەچـــــونە خانەقـــــا و چـــــایی‌خانـــــان
هیـــــوام وایە کە بیـــــنە خـــــانی خانـــــانر
ئەگەر خـــــواهیش ئەکەن خـــــوا لێـــــو بـــــێ رازی
مەچـــــوونە تەکیەکـــــان بـــــۆ حـــــوقەب
{کە جـــــێگەی حوقەبـــــازی و فێـــــڵ و فـــــووتن
مەکـــــۆی بـــــێ‌ئایینـــــانی لات و لـــــووتن
دژن بـــــۆ ئـــــایینی خـــــوا و شـــــەریعەت
سیاســـــەت خـــــانەن بـــــۆ هەر دوو تەریـــــقەت
قومـــــارگەی سیاســـــەتی مەکارەکـــــانن

به نێـــوی دیـــن تەڵەن بـــۆ کوردەکـــانن}
قومـــــاریَ قەت مەکەن ئێـــــوە و خوداتـــان
دەنـــا بەربـــاد ئەبـــیَ مـــاڵ و موناتـــان
بەجـــــیَ بێـــــنن ئەوەی واجـــــب کـــرایە
بەویَ نەوعـــــــیَ کە مەتڵـــــــووبی خـــــوایە
ئەگەر بـــاب جـــاهیلە بـــا کـــوڕ مەلا بـــیَ
لە ئەحـــوالّی ئـــومەم بـــا شـــارەزا بـــیَ
ســـیاحەت کەن بچـــن بـــۆ چـــین و ژاپـــوون
ئەمێـــستا چـــین لە پێـــشانیش چلـــۆن بـــوون
چ ناوێکیـــــان نەبـــــوو بەیـــــنەلخەلایـــق
ئەمێـــستا بـــۆچی بـــوونە شەمـــسی شـــاریق
لەگەڵ رووســـــــیَکی وا زۆر و بە قـــــــووەت
شـــەڕی کـــرد و چلـــۆنیش وا بە ســـەر کەوت
چ زەهراوێکـــــیَ دایە دوبیـــــیَ ئەکـــــبەر
شـــکاندی ســـەتوەتی ســـوڵتان و قەیـــسەر
لە دونیـــادا دەبـــیَ هەر کـــوردی بـــیَفەڕ
نەبێـــته خـــاوەنی دەیهـــیم و ئەفـــسەر
لە ژێـــر کەوتـــوو و ڕەزیلـــی کـــوللی مـــیللەت
بەلّای لـــــیَ دا ژیـــــانی وا بە زیلـــــلەت
نەمانخوێنـــــد و نەمانـــــدیت و نەمانبیـــــست
عەلەمـــــداریَ لە نێـــــو کـــــوردان هەڵـــــستێت
ئەتـــۆ ئەی مـــامە کـــوردە پێـــست بڵـــێم چیـــت؟
کەڵاش خـــوار و کـــراس دڕیـــا و کەوا چیـــت
هەتـــا دەمـــری بە خـــواری رادەبـــوێری
بە بـــیَبەختـــی و بە بـــیَدەســـتی و فەقیـــری

به گیـــان و دڵ له ڕەببـــی خـــۆت دەخـــوازی
زگـــت پـــڕ بـــێ له ئەســـتوک و پیـــازی
به کـــوردی پێـــت بڵـــێم کـــارت شـــلۆقه
دوای چـــی کەوتـــوویی بەم گـــورگه لـــۆقه
گرینـــی مـــن له بـــۆ تـــۆیه وەئـــیللا
تەمـــاعم پێـــت نیـــیه حاشـــا و کەلـــلا
ئەتـــۆ چۆنێـــک دەژی مـــن هەر مەلامه
ئیتـــر بەســـیه بـــرا، خەتمـــی کەلامه

هەر وەها هۆنراوە جوانەکەی بەڕێز حاجی قادری کۆییشمان وەبیر دیته وەکه دەفەرموی:

شکـــلی تەکیەوخـــا نـــه قـــای شـــێخەکا ن
وا قـــیعەن ره نگینـــه ئـــەمما بـــو ریـــا ن
لەو هەمـــو شـــێخ ومریـــدانەی ریـــا
فەردێکـــی ناچێتـــه مزگەوتـــی خـــو دا

ئەوەی ڕاسته ئەوەیه، که مامۆستای گەورەمان بەدبەختی گەلی کورد و دواکەوتوویی کوردستان و دوورکەوتنەوەی خەڵک له ئیسلامی ڕاستەقینه هەمووی هەر له شێخ و شێخایەتی و تەکیه و خانەقا دەزانێ و که بەڕاستیش هەروایه. جا به تایبەتی له چاخی ئێستادا که خەڵک ئەوا به هۆی زانست و زانیاری و پیشەسازی له کورەی مانگیش تێپەڕیون و دەچنه سەر کورەی زوحەل گەیوونەته تلۆفکی داری ژیان و به لووتکەی هەره بەرزی پێشکەوتن گەیون، بەڵام کوردی بێچاره و ماڵ وێران ئێستاش هەر پێی وایه ئایین بریتییه لەمرید بازاڕی بازاڕی شێخ و شێخایەتی به ئایین دەزانێ و

لای وایە خوای گەورە لەبەر دەستی شێخ و مێخان دایە و هەرچی شێخ بە باشی نەزانی خوا هەر ناتوانێ بە لاشیدا بچێ هەر وەها ئێستاش لە باتی خوا، شێخ دەپەرستێ و لە باتی مزگەوت دەچێتە خانەگا و لە باتی مەلا هەر کۆلکە خەلیفەیەک بە دڵسۆزی خۆی دەزانێ!!

مامۆستا بیر لەوە دەکاتەوە کە وڵاتی ژاپۆن و چین هیچیان نە بە ژمارەی حەشیمەت و نە بە پێوانەی زەوی ناگەنە کوردستان بەڵام لە سایەی خیرەتی خەڵک و زانیاری و پیشەسازی و یەکیەتی خۆیانەوە ئێستاکە دەڵێی رۆژی رووناکن و دەبینن کە ژاپۆن چلۆن دەوڵەتی رووسیای شکاندو لەمەیدانی شەڕدا بەزاندی و وە لەرزەی خست.

ئەدی ئێوە ئەی کوردینە بۆچی ئاوا لە پاش و دواکەوتووی کشتی خەڵکن؟ بۆچی لە هەموو کەس رەزیلتر و زەبوون و لاوازترن؟ بۆچی ئاوا خوێڕی و بێکارەن؟ وڵاتی ئێوە لە زۆربەی وڵاتانی جیهان دەوڵەمەندتر و پڕچاوە و کانترە، ئاوی زۆرە، زەمینی کێڵان و کشتوکاڵی زۆرە، نەوتی زۆرە، گازی زۆرە، زێڕ و جیوە و مس و فافۆنی زۆرە کەچی تۆ ئەی کوردی ماڵوێران زگت تێر نییە لە ئەستووک و نان و پیازیش و خەڵک و لە سەر خوانی تۆ تێر و تەسەلە و خۆشت ئەوا لە برسان دەمری!!

بۆ دەبێ وا بێ و ئیتر هەتا کەنگێ هەر ئاوا دەبێ؟ بۆچی لە نێو کوردان دەبێ ئاڵا هەڵگرێک کە پێشەنگی کاروانی خەبات بێ، پەیدا نەبێ؟ هەتا کەنگێ لەبەر دەستەنگی و نەداری کەڵاشی خوارو خێچ و کراسی دڕاوی پینە لێدراو و کەوای چیت و میتتان لەبەردا بێ؟ دەبێ ئێوە هەتا کەنگێ نەتوانن کەڵک لە خاکی خۆتان وەربگرن؟ ئەو

هەژاری و نەدارییە هەتا کەی؟ بڕۆن راپەڕن و تەکان لە خۆتان بدەن و وەکوو مەردانی خوا وەرنە مەیدانی تێکۆشان.

خودا خۆی دەفەرمێ: (ان الله لایغیر ما بقوم حتی یغیروا ما بأنفسهم) بەڕاستی خوا حاڵ و ژیوای هیچ گەل و هۆزێک ئاڵوگۆڕ ناکا هەتاکوو ئەوان خۆیان حاڵ و ژیواری خۆیان نەگۆڕن و ئاڵوگۆڕ لە ژیان و شێوەی بەڕێچوونی خۆیاندا وەدی نەهێنن.. واتا بەرنامەی خوا ئەوە نییە کە شۆڕش بۆ خەڵک بکا بەڵکە دەبێ خەڵک خۆیان هەوڵ بدەن و تێبکۆشن و خواش بە مەرجی پێکهاتنی هەلومەرجی پێویست بۆ سەرکەوتن سەرکەوتوویان دەکا.

کەوایە ئێوە دەبێ راپەڕن، شۆڕش بکەن، دژمنانی ناوخۆ و لاوەکی رامالن و سەربەخۆیی خۆتان وەدەس بێنن.نابێ چیدیکە سەر دابخەن. سەرشۆڕی کاری مەردان نییە. ئەمن ئەی کاکی کوردم ئەو گریان و داد و هاوارەم بۆ تۆیە و دەمهەوێ ئەتۆ ببیە پیا و بێیە ریزی گەلانی دنیا و وەکوو خەڵکی جیهان بژی و ئیتر بە هیچ جۆرێک مەبەستم خۆم نییە و ئەتۆ هەرچییەک بی و هەر چۆنێک بژی من هەر مەلام و لەوە زیاتر نابم و تازە بە بەژنێم بڕاوە و شانازیشی پێوە دەکەم.

جا وادیارە مامۆستا مەلایەتی بەکارێکی گەورەو گرینگ دادەنێ و تەنانەت ئەو کاتەش کە کورد ببنە دەوڵەت و میری سەربەخۆشیان ببێ ئەو هەر دەس لە مەلایەتی هەڵناگرێ بۆ کارێکی دیکە و هەروا درێژە بە مەلایەتییەکەی خۆی دەدات.

هەر چەندە فەرموودەی مامۆستا ئەوەندە بەهێز و پێزە کە پێویستی بە هیچ جۆرە پاڵپشتێک نییە و بۆ ئەوەی دەبێ هەموو هەڵبەستەکانی لە لایەن هەموو کوردێکەوە لەبەر بکرێن و لە سەر

پەڕەی دڵی هەر کوردێک بنووسرێن، بەڵام بۆ بە هێز کردنی هۆنراوەکانی خۆم بە هی مامۆستا بە پێویستی دەزانم ئەو پارچە هۆنراوە.

## تەکیە و خانەقا

وەرە مەردانە تۆ پێم بێژە کاکە
چییە قازانج و چاکە و کەڵک و فەڕیان
لەواندا کام مەلا و پسپۆڕ و زانا
سەری هەڵدا و ببێتە رابەری گەل
ئەوان کە بۆ موسڵمانان بەکەڵکن
لەویدا کام بەنێو ئەندازیارە
وەیا کە رابەرێکی راستەقینە
ئەدی کوا کامە ئیسلامناسە چاکە
لە کوێ بینراوە دڵسۆزێکی ئیسلام
ئەدی کێ دی مەرەنگوزێکی دڵسۆز
وەیا کام پیاوی ئایینزانی راستی
بڵێ کەنگێ بووە پیاوێکی زۆر ژیر
پەیا بووبێ لە ئەم دەزگا بەرینە
برا ئەو جێیە جێگەی تەمبەڵانە
جێگەی شێخانە، جێگەی دەروێشانە
جێگەی تالانی مێشکوهەست و هۆشە
جێگەی راز و نیازی سیخوڕانە
بنکەی شۆفارەکانی دوژمنانە

لەوێـــدا هەســـتی پێـــشکەوتن کـــوژاوە
هەرچـــی کەڵکـــی هەبـــێ بـــۆ گەل و ئەوانـــە
ئەوەی قـــازانجی بـــۆ ئیـــسلام هەبێـــتن
هەرچەنـــدی خانەقـــا و تەکـــیەی بە نـــاوە
ئەوەی قـــازانجی بـــۆ ئیـــسلام بـــێ دوورە
ئەوانە گـــشتی مزگەوتـــی زیـــانن
لە قورئانیـــشا خـــوا پێـــی داوی دەســـتوور
کەوایە جـــا تـــۆ ئەی مەردی موســـڵمان
مەچـــۆ ناویـــان کە ناوەنـــدی خـــراپین
تەڵە و داون بـــۆ ســـاویلکە و نەزانـــان
ئەوانە گـــازینۆی ڕێبـــواری خـــاون
لە بـــۆ ناشـــارەزا کاروانـــسەرانە
بەڵام ڕێبـــوارێکی بزانـــی بەڕێـــیە
مەڵـــێ فیـــسار مەلا و زانـــاش لەوێـــیە
کەســـێ ئـــایینی یەزدانـــی بزانـــێ
لە تەیکەکـــێ هەبـــێ یـــاری نەیـــارە
ئەوانە دانـــی ســـەر داوی نەیـــارن
ئەوان چێـــشتەو چەقـــالتەی داوو تەپـــکەن
ئەوان بـــۆ ژیـــانی خۆشـــی ئەو جیهـــانە
دەنـــا جـــا چـــۆن مەلا و زانـــا لەوێـــیە
بەوانە قەت مەڵـــێ زانـــا و مەلا تـــۆ
ئەوانە ســـیخوڕی لاوەکیەکـــانن
ئەوەی زانـــا و موســـوڵمانی بەهەســـتە
لە مزگەوتـــێ مەلا خۆشـــە وتـــاری
وتەی قورئـــان و دێـــژەی خـــوا ئەبێـــژێ

ڕێگەی پەسڵ/ن و دنیا و ئایین و ژیان
کەوایە تۆ بچۆ مزگەوتی یەزدان
ئەوانەی بێ درۆ دڵسۆزی خەڵکن
مەلان و حوجرە و مزگەوتە جێیان
نە شێخی سیخوڕ و پیسخۆر و پەستە
موسوڵمانان دەبێ هۆشیار و ژیر بن
بزانن دوژمنی ئایینی خۆیان
مەلا و مزگەوت وقورئان و خودایان
دەزانن مرگ و تەکیە و شێخ و دەروێش
ئەوەی بۆ نیشتمان و ئایین و گەل
گەلێکیش هەن پزیشک و مەردی جوتیار
لە بازرگان و پاڵە و کاربەدەستان
بەڵام ڕاستی ئەوەی بێ درۆ و گریێە
لە تەکیە و شێخ نییە پیستر لە جیهان
ئەوەی گەر بیری زێد و ئایینی بێ
مەلای زانا و بە بیر و هەست و هۆشە
لە تەکیە و خانەقا چیت دیوە چاکە؟
لە بۆ ئایین گەلێکە زیان و زەرەیان
وەیا کام بلیمەت و پیتۆڵ و دانا
وەیا خۆ کەنگێ بۆ گەل بوونە جێی هەل
دژی خوا و ئایین و ویژدان و خەڵکن
گەیشتی بوو گەلەی ئاوا هەزارە
لەوێ هات بۆو گەل و قورئان و دینە؟
لە تەکیەی پێکەیی پێم بێژە کاکە
لە تەکیە پێبگا و چا بێ سەرەنجام

لە تەکـــیە و خانەقـــا پەیـــدا بـــێ بـــۆ هـــۆز؟
بڵـــێ کـــێ دی لە ئەم تەکـــیە هەڵـــستێ
بە هەســـــت و هۆشـــــیار، دڵڕوون و پڕبیـــــر
لەبـــــۆ ئیـــــسلام و ئەو قورئـــــان و دیـــــنە
جـــێگەی ناڕاســـت و پـــیس و گەنـــدەڵانە
دووکـــــانی بیرکـــــڕ و ئاوەزفرۆشـــــانە
جـــــێگەی ڕاوی دراو و نـــــان و دۆشـــــە
نە جێـــــی ئـــــایین و مەردان و کـــــوڕانە
جـــــێگەی ڕاوی دڵـــــی پیـــــاو و ژنـــــانە
چـــــرای ژیـــــری بە یەکجـــــاری کـــــوژاوە
دژن پێـــــی جـــــا بـــــرای کـــــوردم بـــــزانە
نیـــــیە هەرگیـــــز لەوێـــــدا دەس کەوێـــــتن
دژی مزگەوتـــــــــــی یەزدان نـــــــــــبڕاوە
لە تەکـــیە و خانەقـــا، لـــێم ڕوون و ســـوورە
دژ یەکبـــــوونی خەڵـــــک و هەم ژیـــــانن
لە مزگەوتـــــێ زیـــــان هەرگیـــــز مەچـــــۆ ژوور
هەچـــــی تەکـــــیەی هەیە دووری بـــــکە لێیـــــان
دەکەن تـــــاڵانی مێـــــشک و بیـــــر و ئـــــایین
بـــــۆ بێچـــــارە و هەژار و ناتەوانـــــان
تەڵەن بـــــۆ کـــــوردی بەدبەخـــــت دانـــــراون
بـــــرا ئەو دەردە دەردێکـــــــــی گـــــــرانە
چلـــۆن بـــاری دەخـــا لەو جـــۆرە جێـــیە؟
مەلا و زانـــــا لە فێـــــرگە نیـــــشتەجێیە
نیـــــیە مزگەوتـــــێ بـــــۆ تەکـــــیەی وەلا نـــــێ
دژی خەڵکـــــــــــی موســـــــــــوڵمانی هەزارە

لەبۆ فریودانی خەڵکی دەس بە کارن
دەبێ بۆ دوژمنی خەڵکی ئەوە بکەن
لەسەر تەپکەی نەیاران بوونە دانە
فێرگە و زانکۆیە بۆ زانایە جێیە
بڵێ فریوخۆر و فریودەر ڕەنجەڕۆ خۆ
موسڵمانان دەبێ زۆر چاک بزانن
لە تەکیە دوورە، مزگەوتی مەبەستە
موسوڵمانان دەکا ئامۆژگاری
وتاری پوختە بۆ گەل هەڵدەڕێژێ
دەدا نیشانی خەڵکانی موسوڵمان
مەچۆ تەکیە، مەچۆ تەکیە برا گیان
بۆ ئایین و وڵات و گەل بەکەڵکن
بە وردکەی خەڵکی دابین بوون لە دێیان
نە دەروێش و خەلیفەی بێ مەبەستە
هەموو وەک گورژی دڵ پڕهەست وبیر بن
بزانن کێیە دڵسۆزە لەبۆیان
وەلا نانێن لە بۆ دەرد و بەلایان
گەل و ئیسلامەتی نابەن بەرەو پێش
بە کەڵکە و هەر مەلاشە هێنەزی هەل
گەلێک ئەندازیار و پیاوی هۆشیار
گەلێکیان دەچنە ریزی دڵ بە هەستان
بە درۆ و بە گریە شێخ ئەو قسە بە جێیە
نییە کەرتر لە دەروێش و مریدان
نەیاری گش نەیار و خایینی بێ
نە شێخی خایین و هەم گەلفرۆشە

ڕاستی ئەو بنکە و بنیاتانەی،کە بە نێوی ئایین و دین دانراون و جگە لە حوجرە و مزگەوت هیچیان ئایینی نین و سنوورێکی خواییان لە سەر نییە و تەنانەت زۆریشیان دژی ئایین و نەیاری دینن. بەڵام مزگەوت شتێکی وایە کە پێغەمبەر دروودی خوای لەسەر بێ لە ڕێگوزەرە مێژووییەکەی خۆیدا هەوەڵین کارێکی کردی ساز کردنی مزگەوت بوو لە چەند جێگەی قورئانیشدا باسی کراوە بەڵام تەکیە و خانەقا لە تەواوی دەورانی پێغەمبەر و یارانیدا شتێک بەو نێوە نەبوو، هەتا پتر لە ٢٠٠–٣٠٠ساڵیش دوای کۆچی پێغەمبەر وەها شتێک هەر نەبووە. جا هەر بۆیە بە پێویستم زانی ئەو پارچە هەڵبەستەی خۆم بە نێوی مزگەوت لێرەدا بنووسم:

## مزگەوت

مـــزگەوت ئەی فێـــرگەکەی قورئـــان و دیـــن
ئەی پەیـــام بەخـــشی بە خۆشـــی دوایـــی ژیـــن
مــــــزگەوت ئەی مـــــاڵی یەزدانــــــی مەزن
ســـــەنگەری گـــــش ئەو کەســـــانەی نـــــابەزن
گـــــازینۆی ڕازاوەی ســـــەر ڕێـــــی خەبـــــات
تــــۆ قەڵاتــــی قەت نەڕووخــــی بــــۆ وڵات
پایەگــــــا و مەیــــــدانی مەردانــــــی خــــــودا
خــــۆزگە بەو مەردەی لە تــــۆ نــــابێ جــــودا
تــــۆ مەکــــۆی مەردانــــی پــــڕ ئــــاواتی خــــۆ
دەرکە ئــــــاواڵەی تەواوی کــــــاتی تــــــۆ
مـــــزگەوت ئەی بنکەیـــــی یەکـــــسانی ژیـــــن
مـــــزگەوت ئەی لابەری گـــــش تـــــوێژ و چـــــین

رازگەی رازدار و بـــــــــاوەڕ دارەکـــــــان
ئەی مەکـــۆی گـــش دڵــــتەر و دڵـــدارەکان
مـــــزگەوت ئەی جـــێگەی راز و نیـــــاز
رازگەی دڵــــــــداری ژیـــــــری دڵ بە ڕاز
ســـــەنگەری ئـــــازادی خـــوازانی دلێــــر
پایەگـــــای مەردی موســـــڵمانی بـــــوێر
مزگـــوت تـــۆ لانـــی شـــێرانی خـــودای
تـــۆ لە پـــۆز و فیـــز و نـــامەردی جـــودای
ئەی قەڵاتـــی قەت نەڕووخـــی دینـــی گەل
ئەی هیـــواگەی خەڵکـــی ژیـــر و دوورە هەل
مـــزگەوت ئەی بیچمـــی تـــۆ جـــوانترین دیـــمەن
تێکـــدەری بـــازاڕی شـــوومی ئەهـــریمەن
تـــۆلە جیهانـــا گەلێـــک پیـــرۆزی خـــۆ
نیـــازگەی مەردانـــی ژیـــری هـــۆزی تـــۆ
مەردی شۆڕشـــگێڕ و خـــوایی و قارەمـــان
هەر لە نـــاو تـــۆدا دەکـــا راوێژەکـــان
ئەی پەنـــاگەی گـــش رەهەنـــدەی ژیـــن تـــاڵ
ئـــاهورامۆزدای مەزن تـــۆی مـــاڵی مـــاڵ
چـــی مـــشەخت و بـــێ‌پەنـــایە و رێبـــوار
تـــۆی پەنـــای ئەی مـــاڵی خـــوای پەروەردگـــار
هەر لە مزگەوتـــــا ســـــەری زۆردارە گەر
دەچـــتە جـــێ پێـــی پیـــاوی لات و دەربەدەر
هەر لە مزگەوتـــــایە ژینـــــی یەک هەوا
خەڵـــک بێـــدارن لە رۆژو و هەم لە شـــەوا
هەر لەوێـــیە خەڵـــک هەموویـــان وەک یەکـــن
دڵ و دەروون و رەنـــگ و روویـــان وەک یەکـــن

هەر لە وێـــــیە گەر هەمـــــوو یەک رووگەنە
گـــش لە دەرکـــی یەک کەس و یەک جـــێگەنە
شـــــان بە شــــانی گـــــش هەژار و هەم نەدار
رادەوەســـــتێ ئـــــاتلی (ظـــــالم) و ســــەرمایەدار
مـــــزگەوت بـــــوو دەســـــکری پێغەمـــــبەری
خـــۆی دروســـــتی کـــرد لە کـــاتی کـــۆچەری
ئەو بــــــوو مزگەوتێـــــی قوبـــــا رازانـــــدەوە
تـــۆوی دوا رۆژێـــــی لەوێ بـــــوو چانـــــدەوە
هەر لە مزگەوتــــایە کەس جێـــی خـــۆی نیـــیە
جـــێش لە کەس بگـــرێ لەوێ کەس بـــۆی نیـــیە
مـــزگەوت هـــی گـــش کەســـە و هـــی کەس نیـــیە
هەرچـــی نـــوێژێ بـــکەی لەوێ قەت بەس نیـــیە
جێـــی بە چۆکـــا هـــاتنە و کڕنـــۆش و نـــوێژ
جێـــی کەســـێکە بـــۆ خـــودا فرمێـــسک رێـــژ
مـــــزگەوت نـــــابێ لە بـــــۆ شـــــۆخی و قومـــــار
جێـــی خەبـــاتی خـــوایی‌یە، نەک ئـــیش و کـــار
جێگەیـــە بۆ هـــەر کەسێکی خواپەرســــــــــــت
روو لە خـــوا کـــا تـــاکوو لێـــی دەبـــڕێ بڕســـت
جێـــی کەســـێکە خـــوای لە خـــۆی خۆشـــتر دەوێ
بـــــۆ رەزامەنـــــدی خـــــوا نەنـــــوێ شـــــەوێ
ســـــــەنگەری کێـــــشکی خوداناســـــانە هەم
جێـــی کەســـێکە کەم دەخـــوا و دەنوێـــت کەم
جـــــــــــێگەی وانە و وتـــــــــــاری رابەرە
رابەرێکـــــــــی جێگـــــــــری پێغەمـــــــــبەرە
ئەو مەلایەی دۆســـــــــت و دڵـــــــــسۆزی گەلە
هەوڵ و تێکۆشـــــــــانی ئەو گـــــــــش بـــــــــۆ هەلە

ئەو مەلایەی رێــــــگەی پێغەمــــــبەری
گرتــووە قەت نـابێ گەمـژە (ابـلە) و سەرسـەری
مـــــزگەوت زانکــــۆیەکی یەزدانیــــیە
چــــاوگە و کانگــــایەکی ویــــژدانییە
فێرگەیێکــــــی زانیــــاری خــــوایی‌یە
رێــزی لــێ نەگــری لەبــۆت ریــسوایی‌یە
مــزگەوت یــانەی مەلای زۆر باشــە بــاش
بــۆ ئەوێ نــابێ ئیتــر گەنــد و گەلاش
ئەم وتەش پڕپــــــڕ لە رێتــــۆنییە و لە راز
قەل نیــیە بــۆی بچێــتە جێــی شــاهێن و بــاز
مـــــزگەوت ئەی یــــانەی پێغەمــــبەران
رێــز و نــازی تــۆ لە ســەر چــاوە و ســەران
مــزگەوت هەرچەنــدە تێــت رامێــنم مــن
مــزگەوت هەرچەنــدی پێــت هەڵخــوێنم مــن
زۆر کەمە و هەر مــــاوە زۆر و زۆرتــــری
چــون لە جیهانــدا لە گــش جــێ چــاترێ
هەر کەســـێ رێـــزت نەزانـــێ مـــزگەوت
مــاڵ وێــرانە و وایە، وەک دە قــوڕێ کەوت
ئەو کەســەی هەر بــۆ ژیــانی تــۆی بــوێ
تەپرەشــــی تـــۆ بـــێ و لە تـــۆدا نەســـرەوێ
ئەو کەســەش هەر خــۆی بە تــۆ بکــاتن بەخێــو
چەنــدی گەورەش بــێ بە چەشــنی شــاخ و کێــو
ئەو کەســــــەش گەر وا لەبەر رازە هەڵــــــێ
هەر نەمێنــــێ کــــاکی گــــورژی وا دەڵــــێ

مەهاباد رەزبەری ۲۷۰۳ کوردی (مهر ۱۳۸۲)

# هیواداری مەلای کۆیی

دڵی پان و بەرین و پڕ لە هەست و بیر و باوەڕی مامۆستای کۆیی هەر لەو کاتەدا کە تژی دەرد و پەژارە و داخ و خەم و خەفەت بوو و لە تاوی گەل و نیشتمانە دابەشکراوەکەی دەسووتا و دەسژاو ناڵەی دڵی بە کوڵی کوورەی دەروونی نێڵ دەدا و تاو لە دوای تاوێ مەشخەڵی ئاوری ئەوینی پاکی خاکی چاکی کوردستان و هیوا و تاسە و ئارەزووی بووژانەوەی گەلە چەوساوەکەی بڵێسەی دەدا و تین و تەوژم و دووکەڵە شینکەی وڵات و نیشتمانی کوردی دەدایە ژێر تیشک و تینی خۆی و تەنانەت جاری واش دەبوو کە خۆی لە داخان و لە تاوان و لە بەر خەم و پەژارەی زۆر یێخەی خۆی دادەڕی و بێزاری خۆی لەم ژیوارە نالەبارە دەردەبڕی و بێکەیفی و بێشادی خۆی رادەگەیاند و دەیفەرموو:

مـــــن یەخەی خــــۆم لە بــــۆیە دائەدڕم<br>
ئێـــوە نـــابن بە هـــیچ و مـــن دەمـــرم<br>
دەبـــێ مـــن کەیفـــی چـــیم بە دنیـــا بـــێ<br>
قەومـــی مـــن وا رەزیـــل و ریـــسوا بـــێ<br>
ئـــەوەی زانایـــە نـــاو جەرگـــی پەلا ســـە<br>
ئەوەی نـــا دانـــە نـــازانی چ باســـــە

راستی دڵی بەکوڵی مامۆستا ئەگەرچی هەمیشە زامار و پڕ لە ناسۆر و دەردو کەسەر بووە پڕپریش لە هیوا و هومێد و تاسە و ئارەزوو و چاوەڕوانی دوارۆژی سەرکەوتن بووە، ئەو هەرگیز پێی وا نەبووە کە دەبێ هەتا هەتایە گەلی کورد هەر ژێر چەپۆکە و ستەم لێکراو بێ و قەت سەرنەکەوێ.

مامۆستا قەت دەستی لە هومێدێ بەر نەداوە و هێمن گوتەنی:

دەســـــــتم لە هومێـــــــــدێ بەر نەداوە
چـــــاوم لە پـــــــسانی بەنـــــــد و داوە

هەر بە هیـوای پـس پـس بـوونی داوی دوژمـن و رزگـاری بـوونی گەلەکەی لە یەخـسیرخانەی نەیـاران بـووە و هەمیـشە چـاوی بڕیوەتە ئاسۆی هیوا. ئەو بەڕێزە هەژار گوتەنی:

زانیـویەتی کە: بە رخ هـــە ر بـن سـە وە نـا بـێ
رۆژێ دێ شــــاخی پـــــە یــــدا بـــــێ

ئیـتر هەروا شل و کـول نـامێنێ، ئەو کـوردە پەڵـولەی دوێنـێ و سـەرەنجام وا تونـد دەبـێ کە هەر کەس بـیهەوێ بە نـاڕەوا بیخـوا ددانی بشکێنێ.

بە کـوردی و بە کـورتی کوردەکـانیش ببـنە خـاوەنی دەوڵەت و میریی سەربەخۆ و وەکوو گەلانی دیکەی دنیـا بە بێـتەل و تەلەفـون (بی‌سیم و تلفن) یەکتر بانگ بکەن و هەر لەو کاتەشدا زەلـزەلە دە نێو ملکی کەیخوسرەو کە یەکێـک لە داگیرکەرانـی کوردستان بـووە بخەن و هەموو ولاتی خۆیان بێننەوە ژێر دەسـتی خۆیـان کە دیـارە ئەوەش بۆ خودای گەورە کارێکی زۆر ئاسان و سادە و بەسێنەییە و ڕەوش و بەرنامەی خـوا واتـا (سنة اللـه) هەر وا هـاتووە کە پـاش مـاوەیەک ڕەزیلـی و زەبـوونی و لێقەومـاوی نـۆرەی خۆشـبەختی و کامەرانی و دوای ناخۆشی، خۆشی و دوای تەنگانە فەرحـانە و دوای برسییەتی تێری و دوای خەم و پەژارە شادی و دڵخۆشییە و خـواش خۆی دەفەرموێ: (ان مع العسر یسرا ان مع العسر یسرا) بـێ‌گومـان

لەگەڵ هەر ناخۆشییەک خۆشی و لەگەڵ هەر خۆشییەک ناخۆشی هەیە.

ان مـــع العـــسری کە یـــسرش قفاســـت
شـــاد بـــر آنـــم کە کـــلام خداســـت

جا ئەوەیە کە مامۆستا دەفەرموێ:

## هیواداری

زۆر بـــــــوە بەرخەکـــــــی لەڕ و لاواز
بـــــۆتە خەرتێکــــی دونــــگ زەلام و قەڵەو
یـــا منـــــاڵێکی ســـــیس و مردەلـــــۆخە
بـــوویتە مەردێکـــی گـــورج و گـــۆڵ و پـــتەو
گەلێـــــک مـــــیللەت وەهـــــا ســـــەرکەوتن
کە نـــــایەتە خەیـــــاڵ و وەهـــــم و خەو
بـــــۆیە ئومێــــد ئەکەم لە لـــــوتفی خـــــودا
خـــــــالقی مانــــــگ و رۆژ و شــــــەو
کوردەکــــانیش بکـــــاتە ســـــاحەبی جـــــاه
(ســـــنة الـــــلە فـــــی الـــــذین خلـــــوا)
تەلەفـــــۆنی بخـــــاتە نێـــــو کـــــوردان
بـــــانگی یەکتـــــر بـــــکەن بە دەنگـــــی هەڵەو
هەوهەوی میـــــــــــرەوان لە مەیـــــــــــدانێ
زەلـــــزەلە بـــــداتە مـــــوڵکی کەیخوســـــرەو
بێـــــتە ژێـــــر دەســـــتی میللەتـــــی کـــــوردی
هەر لە بـــــاتومەوە هەتـــــاکو دەهـــــلەو

بە نەزەر تـــــــۆ خـــــــودایە ئاســــــانە
بـــــاز و شـــــاهێن هەڵـــــێن لە ترســـــی کەو

• باتوم بەندەرێکی رۆژئـاوای یەکیەتـی کۆمارەکـانی شـۆڕەوی پێشوو بوو کە لـە سەر لێواری دەریـای رەش هەڵکەوتـووە و ئێـستا نێزیکەی یەکسەد هەزار کەس حەشیمەتی هەیە. رەوگە و ناوەنـدی بەڕێ کردنی نەوت و رەژی بەردە لە شۆڕەویڕا بۆ ئۆرووپایە.

• دەهـلـەو: نێـوی یەکێـک لە وڵاتـانی گەورەی ئیـسلامییە لە بـاکووری هیندووسـتانێ. پـایتەختی ئەو وڵاتەیە و دهلـی نەو و دهلـیشـی هەر پێدەگوترێ. نێوانی ئەو دوو جێگـایە کە یەکیـان لە رۆژهەڵات و یەکیان لە رۆژئاوای کوردستان هەڵکەوتووە، نێـزیکەی ســێ هەزار و سێـسەد و شێـست میلیـۆن کیلـۆمەتری تەواوە لە رۆژئـاواڕا بـۆ رۆژهەڵات بـریتییە لە وڵاتەکـانی گورجـستان، دەریـاچەی خەزەر، ئێـران، ئەفغانـستان، پاکـستان، جـاموو و کەشمیر

بەڵێ مامۆستا لێرەدا هەر بە کوردستان راناوەستێ و ئیتر وڵاتی خۆی پـانو بەریـنـتـر دەکـا و لـە دەریـای رەشـەوە بەرەو رۆژهەڵات سوپای کورد پارێزی خۆی دەئاژوێنێ و دەیبـا تـا دیهلـی پـێ داگیـر دەکـا، نـاهێڵێ پـشوو بـدا و ئیتـر لەوێـشەوە روون نیـیە داخـوا بەنگلادیـش و بیـرمە و لائـوس و تایلەنـد و ویتنـام و کـامبوجیش وەبەر خۆی دەدا و لە دەریای چین دەپەڕێتەوە فیلیپین و مـالزی و ئەندۆنەزیش هەر تاپۆ دەکا یان نا.

بەڵام لەو کارە گرینگ و حەستەمەشدا پـشتیوانی هەر خـودایە و بەس، و پێی وایە ئەگەر خودا بیهەوێ کارێکی زۆر سـادە و ئاسـانە چونکە خودا خۆی دەفەرموێ: (کـم مـن فئـة قليلـة غلبـت فئـة كثيـرة

باذن اللـه) چەنـدەها دەستەجاتی چووکەڵە چووکەڵە بە یـارمەتی خـوا زاڵ بـوون بە سـەر دەسـتەجاتی زۆر و بەهێـزدا. جـا بـۆیە دەفەرموێ:

بە نەزەر تـــــۆ خـــــودایە ئاســــــانە
بــــاز و شـــــاهێن هەڵـــــێن لە ترســـــی کەو
کوردەکـــــانیش بکـــــاتە ســـــاحەبی جـــــاه
(ســـــنة الـــــله فـــــی الـــــذین خلـــــوا)

دیـارە مامۆسـتا زۆری پـێ خـۆش بـووە و ویـستوویەتی کە ئەمپەڕاتـۆری گەورە و بەهێـزی ئیـسلامی کـوردی دەورانـی مـاد و ساسانی یان ئیمپراتۆری ئیسلامی کوردی سەلاحەددینی ئەییـووبی زیندوو کاتەوە.

جـا مـن لێـرەدا بە پێویـستی دەزانـم کە لە گەڵ گیـانی پـاکی مامۆستای خۆشەویست بدوێم و بڵێم:

ئەرێ خۆشەویستەکەم! تۆ کە هێندە دڵسۆزی گەلەکەت بووی و دڵیشت لێواو لێوی تاسە و ئـارەزوو و هیـوا و ئـاوات و ئامـانجی بەرز بـووە بـۆ کوردسـتان و کوردەکـان، چـۆن بـوو بـۆ ئەو مەبەستە وەخۆ نەکەوتی؟! دە خۆت رانەدی یـان دە گەلەکەت؟! یـان هەر دەتـهەویست شۆڕش و ئاڵوگۆڕێکی فەرهەنگی بکەی و لە کوشت و کوشتار و خوێنڕێژی بەدوور بی؟

# بیرو باوەڕی جاهیلانی خەڵەتاو و مامۆستا کۆیی

بیروباوەڕی ناڕاست و ناڕەوای نەزانان کە وەک چەقە پێیەوە دەنووسێن و بە هیچ جۆرێک دەستی لێ بەر نادەن و لەو لاڕێیە بە هیچ ڕێزان و لێزانێکی نایەنەوە سەر ڕێیە، ئەوەندەی زەرەر و زیان بۆ گەل و کۆمەڵ و ئایین و نیشتمان هەیە، کە هەر خوا خۆی دەزانێ و بەس، ئیتر بێگومان گرچووبڕترین زەبریش لەو ڕێیەوە وە گەلەکەی گەل دەکەوێ و ئەکرێ بڵێین ئازارە باریکەیەکی پیس و سەختە، کە کۆمەڵ ئەوەندە لاواز و چیلاز دەکا کە هەتا سنووری لە ناو چوونی دەبا یان وەک نەخۆشی شێرپەنجە (سرطان) لە کۆڵی نابێتەوە تا لە ناخێی رادەکا.

جا دیارە کە ئەو بیروباوەڕەش هەر شێخ و خەلیفە و گەندەڵە مەلاکان لە دڵی ئەو خەڵکە نەزان و نەخوێندەوارەیدا وەدی دێنن. چونکە ئەوان بە خەیاڵ ڕێبەر و ڕێنوێن و رازدار و هۆشیار و چاوساخی ئەو خەڵکەن و دەبێ دڵسۆزی خەڵک بن، بەڵام وای بە حاڵی ئەو خەڵکە کە ئەو جۆرە کەسانە ڕێنوێن و رابەر و چاوساخیان بن و عەرەبیش گوتەنی: (اذا كان الغراب دليل قوم فيهديهم الى الضلال) هەر کاتێ قەل، رابەری هەر هۆزێک بێ گومڕایان دەکا، یان کورد گوتەنی: (سەرچۆپی بە دەس گاوە بێ، شایی بۆ لای کادێن دەبا)، یان (کەر پێش قەتار بێ، کاروان دە قوڕێ دەمێنێ) بێگومان ئەوانە بەتایبەتی هێندێکیان وەکوو ئەو ڕێویە وان کە کردیان بە مەزنی دەعبا وردەڵەکان لە جەنگەڵ و هەموویانی بە گورگێک بە خواردن دان کە خۆی لە گەڵی هاوپەیمان بوو کەمێک لە بەرماوەکەی خۆی دەدایە! واتا بۆیە بەرماوێک

نەوانــی بە دژمـن بە خـواردن دەدا. بـۆ دەسرۆکەیەک قەیـسەرییەک ئاور دەدا.

ئەو خەڵکە جـا بە تـایبەتی خەڵکـی نەخوێنـدەوار و چەوسـاوەی کورد نەزانو بێئاگا و هەژار و چـاو بەسـتراون و لە فێـڵ و فـووتی ئەو فێڵبازانە ئاگادار نین و پێیان وایە کە جەنابی شێخ بارانیان بۆ دەبارێنێ و هەر بە چووکەترین فەرمـان وەک خـوای گەورە هەرچـی بـیهەوێ ئەنجـامی دەدا و هەمــوو دنیــای لە بەر دەســتایە و لە زەویــیەوە تــا ئاســمان و لە ئەســتێرەکانەوە تــا وردەڵەتــرین بـوونەوەری سـەر زەوی بـوون و نەبـوون و مـان و نەمـانی هەر بە دەستی پیری تەریقەتە و بەس.

ئەگەر وەک چاخی ئێستای خۆشمان کە دیارە ئەو کاتیش هەر وا بووە و رەنگە لە پێش ماموستاشدا هەر وا بـووبێ مەلایەکـی زانـا و رووناکبیر و ئاگادار لە ئایینی خوا بێت و بڵێ نابێ وا بـێ و ئەوەی کە ئێــوە ئەی خەڵکیــنە بە نێــوی ئــایین دەیــکەن دژی ئــایینە و گاوریەتی و ئاواڵ بۆ خوا دانان و لە رێی راستی ئیسلام دەرچـوونە هەزار نێو و ناتۆرە و شتی وای بۆ ساز دەکەن کە بێچارە خۆی هەر ئاگاشی لێ نییە و پێی دەڵێن (کەڵـبەش و وەهـابی) و سـەحابی بە هەر رەنگێک بێ لە بەر چاوی خەڵکـی سـووک و بـێبـایەخ دەکەن و رێز و پایەی ئایینی و کۆمەڵایەتی بـۆ نـاهێڵنەوە دیـارە ئەوانە کە ئەو جــۆرە کــارانە دەکەن لە خۆیــانڕا نیــیە و تەنیــا بە هێــز و نەخشەی خۆیان نییە بەڵکە هەر وەک گوتوویـانە: سـەگ بە هێـزی کلـک ئێـسقان ئەشکێنێ، ئەوانـیش هێزیـان لە جێیەکـی دیـکەڕایە. سەیری لە هەموو سەیران سـەیرتر ئەوەیە کە هەر رژێمێـک بە هەر جۆرە بیر و باوەڕێکەوە لەسەر کـار بـێ ئەوان لە گەڵـین و ئەویـش پشتیوانی وانە!! دەڵێی سەد ساڵە پێکەوە بران کە بەڕاسـتی جـێگەی سەرنج و تێڕامانە.

جا ئە لێرەدایە کە مامۆستای بلیمەت و هەڵکەوتوومان خوا لێی خۆش بێو پاداشی باشی بداتەوە هەموویان لە شێخدا دێنێتە بەر چاو و رووی تێدەکاو پێی دەڵێ: هەی ئەوەو ئەمە و فلان و فیسار

ئەتۆ کەی ئەوەی کە ئێستا لە سایەی بیر و رای نەزانان و چاو بەستراوانەوە هەی، دەبێ ئەتۆ بۆچی خۆت کردۆتە پاپای نەسرانییان و خێوی خاوەن ماڵ و خاوەنی دەسەڵاتی خوایی؟

مەگەر ئایینی پاکی ئیسلام وەکوو ئایینی گۆڕدراوی مەسیحییە کە پاپ گوناح و تاوانی خەڵکی ببەخشێ؟ مەگەر جەنابی شێخیش پاپە و ئێمەش مەسیحین؟ یا جەنابی شێخ ئاخوندە کە فتوا دەدا و دەڵێ هەرکەس سیغە بکا و دوای کاری وا مەلە بکا لە هەر تنۆکە ئاوێکی مەلەکەی٧٠٠٠٠ فریشتە ساز دەکرێ و ئەو هەموو فریشتانە هەتا رۆژی پەسڵان بۆ ئەو دەپاڕێنەوە و نزای بۆ دەکەن؟ ئاخر توخوا ئەو فێڵ و فووت و چاو بەستنە تا کەی؟!

یان خەڵک بنێرێتە دۆزەخ و یا بەهەشتێ و دەیان کاری ناڕەوای دیکەی دژی ئیسلامی لەو چەشنەش؟

مامۆستا موفتی زەهاویش خوا لێی خۆش بێ دەفەرموێ:

شیخا تو کە در عالم یکتا خردی
این رتبە ز دستار بدست آوردی
حیف است کە او دور سر تو گردد
بایستی کە تو دور سر او گردی

# وەهابیگەری لە روانگەی مامۆستا کۆییەوە

پێویستە لێرەدا کەمێک باسی وەهابیەت کە ئێستاکە تەواوی مەلاکانی جیهانی ئیسلام و بە تایبەتی مەلاکانی کوردستان پێیەوە گیرۆدە بوون و نەیارانی تەکپەرستی و لایەنگرانی پڕوپووچ پەرستیش، مەلا و موسڵمانە هۆشیار و ژیرەکان بەو نێوە بەد نێو دەکەن و ئەو بەرچەسپەیان لێدەدەن بکەین.

محەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب کوڕی سولەیمان کە لە ساڵی١١١١ی کۆچی لە دایک بووەو لە ساڵی ١٢٠٧ی کۆچی کۆچی دوایی کردووە و خەڵکی گوندی عوبەینەی نەجدی عەرەبستان و لە پەیڕەوانی پێشەوای بەڕێز ئەحمەدی کوڕی حەمبەڵە، یەکێکە لە زانایانی بەرز و هەڵکەوتووی ئیسلام و تەکپەرستێکی راستەقینە و خواناسێکی خۆناس و زانایەکی بەبڕشت و خاوەن باوەڕێکی بەخێرەت و هەڵکەوتوو و بلیمەتێکی هۆشیار بووە.

ئەو بلیمەتە گەورە لە دژی پڕوپووچ پەرستی راپەڕی و خەباتێکی خەست و خوێناوی وشێلگیرانەی لە دژی خواکەلی پووشاڵی کە دەسکردی نەیارانی ئیسلام و دژی خوداوەندی میری مەزن و پاک و تاک و بێهاوتا بوون، دەس پێ کرد و تا رادەیەکی زۆریش سەرکەوتوو بوو، بەتایبەت لە وڵاتی عەرەبستاندا.

ئەو بە تایبەتی دژ و نەیاری هەموو جۆرە ئاکارێک بوو کە بۆنی ئاواڵ دانان(شرک)ی لێ هاتبایە. بە هەموو هێز و توانای خۆی بەربەرەنی لەگەڵ بیر و باوەڕی نەزانانە و پڕوپووچ پەرستی و ئاواڵ دانان بۆ خوا دەکرد، بەڵام هەرگیز هەرگیزاو داوای ئەوەی نەکرد کە وەک سەرمەزەبێک پەیڕەوی لێ بکرێ و قەتیش خۆی وا

نیشان نەدا و خۆی بەو جۆرە نەناساند و قەت نەیگوت من پێشەوایەکم و پەیڕەویم لێ بکەن. چونکە ئەو خۆی پەیڕەو و شوێن کەوتووی پێشەوایەکی گەورەی ئیسلام بوو و ئیتر هەرگیز خۆی پێ لەوی پتر نەبوو و بە شانازییەوە دەیگوت من پەیڕەوی پێشەوا ئەحمەد کوڕی حەنبەلم.

نەیارانی ئیسلام ئەویان بە پیاوێکی دژی یاسای خوا و نەیاری بنەماڵەی پێغەمبەر و سەرمەزهەبێکی بێمەزهەب و پێشەوایەکی لەخۆبایی و کەڕ و گونگ و لە ڕێ لادەر بە موسڵمانانی سادە و ساویلکە و بێئاگا ناساند و هەر کەس بیر و ڕا و بۆچوونەکانی ئەوی قەبووڵ بکا بە نۆکەری بێگانە و ناموسڵمان و لە ڕێ دەرچوو تاوانباری دادەنێن.

جا بە تایبەتی لە وڵاتی کوردستانی بەڵا لێدرا و شێخ زەدە و ڕێ لێ ون کراودا هەر مەلا و قوتابی و خوێندکار و ڕۆشنبیرێکی کە دژی پڕپووچ پەرستی و شێخ و شێخایەتی و نەیاری ئاواڵ دانەری بێ، مۆری وەهابیگەری لە نێوچاوانی دەدەن و هەر وەک گوتمان ئیتر وەهابیگەرییان دروست بە نوختەی بەرانبەری ئیسلام بە خەڵک نیشان داوە و قۆڵێکیشیان کردوونەتە سۆفی و ئیتر بەو جۆرە لە بەرابەر یەکتریاند ڕاگرتوون و ئەوانیان تێک بەرداون و خۆشیان سەیران دەکەن!! زیان بە هەر لایەک بگا بە قازانجی وانە.

بە تایبەتی لە هێندێک لە شار و ناوچەکانی کوردستاندا مەلا و خەڵکی کوردی موسڵمانیان بەو دوو نێوە وەک ئاگر بە گیانی یەکەوە ناوە!! کە بەڕاستی جێگەی داخ و پەژارەیە چونکە ئیسلامی ڕاستەقینە کە خوا بۆ پێغەمبەری ناردووە بریتی نییە لە هیچ یەک لەو نێو و ناتۆرانە و هەر لە بنیڕا ئەو شتانەشی قەبووڵ نییە.

زۆر جاران تەنانەت بە خودی خۆشمیان گوتووە "وەهابی" یان فەقێکانمیان بەو نێوە بە خەیاڵی خۆیان بەدنێو کردووە!! جا منیش زۆر جاران بە فەقێکانی خۆمم گوتووە ئێوە کە پێڕەوی پێشەوا شافعین بڵێن خۆ ئێمە تەنانەت پەیڕەوی لە پێشەواکەی محەمەدی کوڕی عەبدولوەهاب (ئەحمەد کوڕی حەنبەڵ)یش هەر ناکەین تا دەگا بە خۆی، بەڵام ئێمە مرۆڤین و خوای گەورە بیر و ژیری پێداوین‌و چاکە و خراپە لێک جیا دەکەینەوە و هەر قسە و بیروڕایەکی چاک و پەسەند بە دڵ قەبووڵ دەکەین و پەیڕەویشی لێ دەکەین و خراپەکەشی ئی هەر لایەک بێ فڕێی دەدەین و وەلای دەنێین، خوای گەورەش خۆی دەفەرموێ: (فَبشر عبادي الذين يستمعون القول فيتبعون احسنه) جا تۆ مژدە بدە بەو بەندانەی من کە گوێ بۆ قسە و وتار رادەگرن و پەیڕەوی لە چاکەکەی دەکەن.

بەڵێ بەڕاستی جێی داخە، کە هەر مەلا و موسڵمانێکی رووناکبیر بۆ دامودەزگاکانی میرییە دەسەڵاتدارەکان لە وڵات و نیشتمانی ئیسلامیدا بە وەهابی لە پێنووس دەدەن و ئیتر هیچ بیر لەوە ناکەنەوە کە تەنانەت خودی محەمەدی کوڕی عەبدولوەهابیش خۆی وەهابی نەبووە، بەو مانایەی کە ئەوان دەیڵێن. رادەی بێئاگایی، یان خەڵک پێ شێت بوونی ئەوانە بە ئەو جێیە گەیشتووە کە تەنانەت ئەو زانا و بلیمەتانەش کە زۆریش لە پێش محەمەدی کوڕی عەبدولوەهابدا ژیاون بەڵام وەک وی یا پتر لەوی رووناکبیر بوون هەر بە وەهابی دادەنێن!

بۆ نموونە: بەڕێز شیخ الاسلام احمد بن تیمیه حرانی کە ٤٥٠ ساڵی تەواوی لە پێش محەمەدی کوڕی عەبدولوەهابدا ژیاوە دەڵێن وەهابی بووە؟! لە مەرجێکدا دەبێ ئەو ابن تیمیەیی بووبێ نە ئەم وەهابی. چونکە ابن تیمیه لە ساڵی ٦١١ کۆچی مانگیدا لە گوندی

حەڕرانی وڵاتی سوریا لە دایک بووەو گەلێکی خزمەت و ڕاژەی ئایینی پیرۆزی ئیسلام کردووە و ئاسەوارێکی گەلێک بە نرخی لە پاش خۆی بە جێ هێشتووە.

ئیتر ئەوان کاریان بەوەی نییە داخوا لە پێشدا بووە یان لە دوایە، بە هەر کەس کوێر کوێرانە نەڕوا و شت بە بێ بەڵگە قەبووڵ نەکا و قورئان بکاتە بەرنامەێی دەڵێن وەهابی! وەک دەفەرموێ:

مـــە لا گـــەر بـــێ و بڵـــێ نـــابی وهـــا بـــی
دەڵـــێن ئەفاســـقە بوتـــە وەهـــا بـــی
وەهابیـــشیان بە جـــۆرێ کـــردووە تەڵقـــین
وەهـــابی یـــانی بـــێ‌ئـــایین و دیـــن

جا مامۆستای کوڕی کوردی کۆییمان کاتێک کە ئەو ژیوارە نالەبارە بە چاوی خۆی دەبینێ و لەوانەشە هەزاران جار ئەو مۆرەیان لە نێوچاوانی خۆشی دابێ و بە وەهابییان ناساندبێ، پڕ بە دڵ تووڕە دەبێ و خەفەت لەوانە دەخوا، کە ئەو جۆرە نێو و ناتۆرانە بۆ موسڵمانان و بە تایبەتی بۆ مەلاکان هەڵدەبەستن و بەو شێوە خەڵکی موسڵمان لە یەکتر دڕدۆنگ دەکەن و تەنانەت بە گژ یەکتریاندا دەکەن.

جا ئەوەیە کە دەفەرموێ ئەگەر مەلاکە ئەرکی سەر شانی خۆیەتی لە بەرابەر ئەو جۆرە بیر و باوەڕە پەست و ناڕەوایەدا ڕاست بێتەوە و لە دژی پڕوپووچ پەرستی و ئاواڵ بۆ خوا دانان ڕابپەڕێ، پێی دەڵێن ئەوە وەهابییە و چونکە وەهابی ساز کراوی دەستی دژمنانیشیان ئەوەندە بە شتێکی خەراپ و ناحەز و دژی ئیسلامی بە خەڵک نیشان داوە، مەلای بێچارە لە بەر چاوی خەڵک

سووک دەکەن. بی گومان دەستیکی پیسی نگریسی چەپەڵ وخە یانە تکارانە لە بن پەردەیەکی رەشی تەپرەشانە هەیە، کە ئا بەو جورە مەلای دڵسوزی گەل لەبەر چاوی گەل سوک دەکا. هەزاران نیو نتکەی نام لە مەلا هەڵ دەدا . بە وەهابی و کەلبەش ومفتەخورو ملوزم وسەرباری گەلی لە پینوس دەدا جا ئەوەیە مامۆستاوە زالەدی و دلەگەورەکەی دیسان وەکوڵ دیتەوە و هەڵدەچی و دەڵی:

مەلا گەر بـــی و بلّـــیٚ نـــابیٚ وەهـــا بـــی
دەڵـــێن ئەو فاســـقە بـــۆتە وەهـــابی

جا بۆیە جێی داخ و خەمە کە تەنانەت زاناکانیش هێندێکیان بەو سازە هەڵدەپەڕن و نەزانانە خۆیان دەهاوێنە ناو ئەم گێژاوە بەڵێ مامۆستای خوا لێ خۆشبوومان لە بارەی باوەڕی جاهیلان و نەخوێندەوارانی فریودراو و خەڵەتێنراودا ئاوا دەفەرموێ:

## باوەڕی جاهیلانی نەخوێندەوار

ئەڵـــێن بـــاران بە ئەمـــری شـــێخ ئەبـــاری
بە ئەمـــری (کـــن فکـــان) وەک ئەمـــری بـــاری
خولاســـــە کـــــافڤەیی زەڕڕاتـــــی عـــــالەم
چ ئەفـــــلاک و چ ئەمـــــلاک و چ ئەنـــــجەم
بە ئەمـــــری حەزرەتـــــی شـــــێخە دەوامـــــی
حەیـــــات و مەوت و تەرتیـــــب و نیزامـــــی
مەلا گەر بـــیٚ و بلّـــیٚ نـــابیٚ وەهـــا بـــی
دەڵـــێن ئەو فاســـقە بـــۆتە وەهـــابی
وەهابیـــــشیان بە جـــۆریٚ کـــردووە تەڵقـــین
وەهـــابی یەعنـــی بـــیٚئیمـــان و بـــیٚدیـــن

جا ئەو جار دوای ئەو روون کردنەوە جوانە و دەرخستنی باوەڕی ناڕەوا و نابەجێی نەزانان و ناڵە و دەردە دڵ لەو حاڵە روو دەکاتە خودی شێخ کە لە ماکا هەر ئەو کار تێکدەر و هۆی بنەڕەتی دواکەوتنی موسڵمانان و باوەڕی ناڕەوای وان و بەردی بناخەی ناکۆکی و دووبەرەکی و خوێنمژی ناوخۆی گەلی کوردە و بە توندی تێیڕادەخوڕێ و قسەی ڕەقی پێ دەڵێ و دەفەرموێ:

ئەرێ ئەی شـێخە پیـسەی بـۆری چڵکـن
ئەرێ ئەی زگ هەمـانەی غـازی بـۆگەن
ئەتـۆ دەوواری چەرخـی بـێسـتوونی
ئیـرادەی تـۆیە نیـزام و شـوئوونی؟؟
ئەرێ ئەی شـێخە کـۆرەی خـواری مەخـزووم
ئەتـۆی نایـب مەنـابی حەیـی قەیـووم؟؟
ئەتـۆ ئەی پێـستەخۆرەی لینـگ گـواوی
لەگەڵ زەڕڕاتـی عـالەم تـێکەڵاوی؟!
ئەتـۆ مومتـازی رزقـی مـار و مـووری
ئەتـۆ ئینـشا کونەنـدەی نـار و نـووری؟!
بە حـوکمی تـۆ ئەبـێ عەفـوی گوناحـان
وەکـوو پـایی نەسـارا خێـوی غـوفران!
هەمـوو عـالەم لە ژێـر فەرمـانی تـۆیە!
حەیـاتی تـۆش بە مـستێک ئـاردەجۆیە!؟
ئەوی عەفـوی بـکەی جـێگەی نەعـیمە
ئەوی عەفـوی نەکەی مەئـوای جەحـیمە!

ئەمجا دێتە سەر ئەوە کە بە ئاشکرا رادەگەیەنێ کە هەموو شتێک هەر بە دەس خوایە و هەر موڵک و ماڵێک هەر ئی خودایە و شێخ و

مێخ و هێتم و مێتم (قطب و مطب) لە بنیڕا لە بەرنامەی خوادا نییەو ئیتر ئیسلام پێویستی بەو دووکان و بازاڕاه نییە و ئەو دووکان و بازاڕە شلۆق و پڕحەشیمەتە، داهاتەکەی بە هیچ جۆرێک بۆ ئیسلام و موسڵمانان نییە و بەڵکە پاریس و لەندەن و واشەنگتۆنی لێ پاراو دەبێ!! پارە و پووڵی موسڵمانان لە وڵاتانی ئیسلامی کۆ دەکرێتەوە و بۆ ئێرە و ئەوێ بەرێ دەکرێ!! جا بۆیە دەفەرموێ:

ئەگەر ملـــکە هەمـــووی ملْکـــی خـــودایە
ئەگەر شـــێخە ئەگەر قـــوتبە هەبـــایە
ئیـــرادە وقـــودرەتی خـــودای مـــن تەواوە
چ حاجەتمـــان بە شـــێخ رایـــی کـــراوە؟
بە ئەقتـــاب و بە ئەوتـــاد و بە ئەقـــوال
نەبـــوویە ئادیـــسۆن، ئەی مەردی بەقفـــال
لە عـــیلم و ئیختیراعـــا چـــی بە دەر خـــست
بنـــۆڕە میللەتـــی خـــۆی کـــوو وەســـەر خـــست؟
بە عیلمـــی کیمیـــا و قـــووەتی نـــوور
بە تەییـــارە و بە زەبلـــین و بە پـــاپوور
چلـــۆن قـــوتبی فەقیریـــان پـــێ نیـــشان کـــرد
پـــرۆژەی شـــێخ ئەفەندیـــشیان عەیـــان کـــرد
موســـڵمانان لە چنـــگ وان کـــورد زەلیـــل بـــوون
دەفەرمـــوو شـــێتەی شـــێخە گێـــژی مەجنـــوون
بـــزانم تـــۆ ئەوێـــستا چـــت لە دەســـت دێ؟
لە بەحـــر و بەڕ و چـــۆڵ و شـــار و لادێ؟
ئـــاخر تـــۆ چـــی دەکەی تۆخـــوا بـــۆ مـــیللەت؟
بـــۆ مـــیللەت هەر ئەتـــۆی باعیـــسی زیلـــلەت

ئەتـــۆ خـــۆ میللەتـــی خـــۆت بەدبەخـــت کـــرد
ئەوی هەیبـــــوو ئەوا گـــــش گـــــاوران بـــــرد

دوای ئەو هەموو دەردە دڵ و دەربڕینی کوڵ و پەژارە و بێزاری و دەربڕین لەو بیر و باوەڕە پووچ و بێنرخ و ناڕەوا و تانەو تەشەرو لۆمە و لەقەمە لە موسڵمانان لە سەر هەبوونی ئەو جۆرە باوەڕە و بە سەردا هاتن و سەرکۆنەی شێخە ستەمکارەکان ڕوو دەکاتە ئوممەتی خەیرولبەڕییە(خیر البریه)و پەیڕەوانی هەنتەشی محەمەدو دەڵێ ئاخر خۆ ئەی پەیڕەوانی باشترین بوونەوەرو چاکترین پیاوی خودا. دوای درووود و سلاو و دڵپاکی و خۆشەویستی پێشکەش کردن ئەمن بە دڵسۆزی پێتان دەڵێم کە:

ئەو قسانەی دەگوێی ئێوەیان هاویشتوە و ئەو جۆرە بیر و باوەڕە ناڕاستەی باوەڕ بوون بە شێخ و پیر و تەکیە و خانەگا و ئەو جۆرە شتانە هەم لە ڕوانگەی زانیاری و ژیری و هۆش و بیرەوە و هەم لە ڕوانگەی خواناسییەوە و هەم لەڕوانگەی قورئان و فەرموودەکانی پێغەمبەری مەزنەوە، پووچ و بێکەڵک و بێپایەن و لە ئیسلام بە دوورن و لە دوایە لە دین زیاد کراون و پێغەمبەری مەزنیش دەفەرموێ: (من احدث فی امرنا هذا ما لیس فیه فهو ردّ) هەرکەس لە ئایینی ئێمە شتێک زیاد بکا لێی قەبووڵ ناکرێ.

ئاخر ئێمە ئەگەر خودامان هەبێ ئەوهێتم و مێتمانەمان بۆچین و کەڵکی چییان هەیە؟ مەگەر خودا ناتوانێ کاری خۆی بکا هەتا ئەوانە کۆمەگی بکەن؟ مەگەر خوا دوورە و ئاگای لە ئێمە نییە هەتا ئەوانە هەواڵی ئێمەی پێ ڕاگەیەنن؟ مەگەر خوا بێمیهرو بەزەییە لەگەڵ بەندەکانی خۆی، هەتا ئەوانە هانی بدەن و داوای لێ بکەن تا بە میهرەبانی لە گەڵمان بجووڵێتەوە؟ مەگەر خودا ستەمکارێکی خاوەن زێفە کە دەبێ پارتی و مارتی بۆ ساز بکرێ؟ دەنا کەس

ناپارێزێ . و هەموو کەس وەبەر رق و قینی خۆی دەدات

ئێوەی ئەی ئۆممەتی خیر البریە بە قسەی نەزانان خۆتان مەگۆڕن و بە چاوی دڵ و تێگەیشتن بڕواننە جیهان و رازو رێئۆنی و فەلسەفە (حکمت)ی بوون و ژیان بزانن و ئیتر تێبگەن کە هەر لە ژێر زەمینیڕا هەتاکوو دەگاتە گۆیە جۆراوجۆرەکانی ئاسمان، چ دوور و چ نێزیک، بە هەموو چەند و چۆنێکیەوە و بەو ژیواری دژوار و سەخت و سەر سووڕهێنەرییەوە، بێجگە لە خودا بە دەس کێیە و ئاخر یە کێ هەڵدەسووڕێنرێ؟!

ئەوانەی کە بە لای ئێوەوە هەڵسووڕێنەری کاروبارن و پێتان وایە هەموو کارێک هەر بە دەس ئەوانە و لە بەر نەزانی خۆتان لێیان دەپاڕێنەوە و هانایان دەبەنە بەر و پەنایان بۆ دێنن و هاواریان لێ دەکەن و پێتان وایە لە هەموو حاڵەتێکدا ئامادە و ئاگادارن، لە لای خوای میری مەزن لە مێرووڵەش کەمترن (و الذین تدعونهم من دونه لایستطیعون نصرکم و لا انفسهم ینصرون) ئاخر کەسێک باوەڕی بە خودا و هێز و توانایی خودا هەبێ ئەو جۆرە بیرو باوەڕەی کە ئێوە هەتانە چۆن دەچێتە دڵی؟ ئیتر بەو جۆرەیە کە دەفەرموێ:

وەرن ئەی ئـــــوممەتی خەیـــــــرولبەرریە
لە پــــاش تەقـــدیمی ئـــیخلاس و تەحیـــــیە
بە عـــیلم و عەقــڵ و هــۆش و فکــر و عیرفــان
بە قەولــــی مـــستەفا و ئایــــاتی قورئـــــان
بــــزانن ئەو قـــــسانە پـــــاکی پـــــووچن
ئەگەر خوامـــان هەبـــێ، ئەقتـــاب بـــۆ چـــن؟

لە رێکخستنی شێخ و مریدایەتیدا بەرنامە وەهایە کە جیهان پڕ هێتم (قطب)و هەر هێتمەی کۆمەڵە مریدێکی لە دەورە هاڵاون و ئەو

هێتمانە جیهانیان بۆو خەڵکە راگیر و راوەستاو کردووە و ئەگەر ئەوان نەبن دنیا بە چاو لەسەریەک نانێک تێکدەڕووخێ جا مامۆستا دەفەرموێ: وەرن ئەی پەیڕەوانی باشترین بەندەی خوا دوای درود و سلاو با شتێکتان پێ بڵێم کە ئەویش ئەوەیە: هەم لە رووی زانست و زانیاری و ژیری و بیر و هۆش و خواناسییەوە و هەمیش لە رووی فەرموودەکانی پێغەمبەر و ئایەت و دیاردەکانی قورئانی پیرۆزەوە ئەو جۆرە بیر و باوەڕە و ئەو جۆرە شتانە پاکیان پووچن و بایەخێکیان نییە. بزانن ئەو قسانە هەموویان پووچ و بێمایەن ئاخر ئێمە ئەگەر خوامان هەبێ ئەو هێتم و مێتمانەمان بۆ چین؟

به قەولـــــی جـــــاهیلان خۆتـــــان مەگـــــۆڕن
بە چـــــاوی دڵ لە دنیـــــــایە بنـــبـــــۆڕن
لە ژێـــــر ئەرزێ هەتـــــاکوو ژوور و ژێـــــروو
لە مانـــــگ و رۆژ هەتـــــاکوو مـــــار و مێـــــروو
بە کەمـــم و کەیـــف و وەزع و چەنـــد و چـــوونی
بە ئەتـــــــــوارو بە ئەدوار و ســـــــــــکوونی
گەلاوێـــــژ چەفـــــتە، زەلـــــلام چەنـــــدە دووره
ســـــوها تـــاریکە یـــــا خـــــۆ زۆر بە نـــــووره
هەیـــــا چـــــۆنە لە چـــــی تەرکیـــــب کـــــرایە
نیزامـــــــــــــی ئەو گەڕانە چـــــــــۆن درایە؟
بە چـــــی ئەگەڕێ و بە کـــــێ ئەکـــــرێ ئیـــــداره
لە بـــــۆ کـــــێ دێـــــتە تەعـــــداد و ژومـــــاره؟
بەغەیـــــــرەز قـــــــوردرەتی دەوواری جەبـــــــار
بەغەیـــــرەز پادشـــــاهی خەلـــــلاق و قەهـــــار
بە قـــــــوتبێکی زەعیـــــــف و ناتوانـــــــا

ئیـــــدارەی چـــۆن دەبـــێ ئەی مەردی دانـــا
ئەوەی لای ئێــــــــوە دەوواری ئومــــــــــوورن
لە بەر دەســـــتی خـــوا کەمتـــر لە مـــوورن
کەســـێ ئیمـــانی بە خـــودا و قـــودرەتی بـــێ
چلـــۆن ئەو ئیعتیقـــادەی دەچـــتە قەلبـــێ؟

مامۆستا دەفەرموێ: ئێوە ئەی پەیڕەوانی پێغەمبەری مەزن! ئێوە هەرگیز بەقسەی نەزانان خۆتان مەگۆڕن و بە چاوی دڵ تەماشای جیهان و خوستان بکەن ولە ژێر زەوی و هەموو کەلێن و قوژبن و ژێرووکە و هەموو بوونەوەر و پەلەوەرێکی تێیدایە و ئەمجا گۆیەکانی ئاسمانی وەکوو مانگ و رۆژ و ئەستێرەکانی دیکە تەماشا بکەن و بڕوانن ئەو نەزم و نیزامە چۆن دروست کراوە و چۆن رێکوپێک کراوە و بزانن گەلاوێژ چۆن و چەفت و خوار و لاپانە و چۆنیش دەدرەوشێتەوە و زەللامیش کە کورەیەکی گەورەیە لەم حەوا و گێشوشە دوورەدا و چەندیش لێرانە دوورە؟ وە بڕوانن سوها کە ئەویش هەر کورەیەکی دیکەی ئاسمانییە چۆن پڕ شۆق و رووناکە یاخۆ زۆر تاریک و بێشۆقە، هەیا وێ دەچێ ئەویش بە زاراوەی مامۆستا یا هەر زاراوەیەکی دیکە کە ئەو زانیویەتی ئەستێرەیەکی ئاسمانی لەم گێشوشە بێ بڕانەوە (فضای لایتناهی)یەدا بێ و یا بە مانای هەیاران بێ واتا هەیاران جارێک لە خۆتان بپرسن ئاخر ئەو شتانە هەموویا، یا ئەو هەموو کورانەی ناو ئەو هەموو کاکێشانەی ناو ئەم گێشوشە بێپایان و بڕانەوە لە چین و چۆن ساز کراون و کێ سازی کردوون و سفنگەلی پێکهێنەر (مواد تشکیل دهنده)ی وان لە چییە؟

ئاخر ئەو هەموو کاکێشانە، کە هەر کامەی پێک هاتووە لە میلیاردها میلیار گۆ و ئەستێرەی گەورە و گچکە و هەر یەکەش بۆ

خۆی خاوەنی ڕێکخراوە (منظومە)یەکە و هەر یەکەی دوو جۆرە گەڕان و خولدانی هەیە. خولدان بە دەوری خۆیدا کە دەتوانین بەوەی بڵێین خۆخولی یا مامە خولە (حرکت وقعی) وە گەڕان بە دەوری ماکەکەی خۆیدا کە ئەوەش گەڕان و خولدانی عەوداڵی (حرکت انتقالی)یە و قورئانی پیرۆزیش دەفەرموێ (کل فی فلک یسبحون) واتا هەموو ئەو ئەستێرە گەورە و گچکانەی ناو ئەم گێشوشە بێسەروبنە لە چەرخەی خۆیاندا لە حاڵەتی مەلە کردندا ئەگەڕان و خولدان دان.

دەیجا ئێوە ئەی پەیڕەوانی باشترین بەندەی خودا سرنج بدەن و تێیڕامێنن و بزانن ڕێکخستنی ئەم جیهان و خوستانە بە دەستی کێ کراوە؟ ئایا وەک هێندێکتان نەزانانە بیر دەکەنەوە یا هەر بیریش ناکەنەوە و لە مێشکیان هاویشتوون بە هێتم (قطب)ێکی چیلاز و لاواز و بێهێز وەک شێخەکانی ئێوە دەگرێ و هەڵدەسووڕێ؟ یان کەسێک دەیگێڕێ و هەڵیدەسووڕێنێ کە هەمووی ئەوانەی بە دەستی هێز و توانای لە ئەژمار نەهاتووی خۆی بە بێ کەرەسە دروست کردووە؟

کوڕە خۆ ئەوانەی ئێوە پێتان وایە هەڵسووڕێنەر و بگێڕی کار و بارن و دنیا لە بەر دەستیاندا وەکوو دەسرۆکەیەک وایە تەنانەت خۆشیان لە بەر دەستی خوادا هەر لە مێرووله سوورکەیەکیش کەمترن جا ئەوەیە کە دەفەرموێ:

هەیـــا چـــۆنە لە چـــی تەرکیـــب کـــرایە
نیزامــــــــی ئەو گەڕانە چـــــــۆن درایە؟
بە چـــی ئەگەڕێ و بە کـــێ ئەکـــرێ ئیـــدارە
لە بـــۆ کـــێ دێـــتە تەعـــداد و ژومـــارە؟
بەغەیـــــرەز قـــــوردرەتی دەواری جەبـــــار
بەغەیـــرەز پادشـــاهی خەلـــلاق و قەههـــار

بە قـــــوتبێکی زەعیـــــف و ناتوانــــا
ئیـــدارەی چــۆن دەبـــێ ئەی مەردی دانــا
ئەوەی لای ئێـــــــوە دەوواری ئومـــــــوورن
لە بەر دەســـتی خـــوا کەمتـــر لە مـــوورن
کەســـێ ئیمـــانی بە خـــودا و قـــودرەتی بـــێ
چلـــۆن ئەو ئیعتیقـــادەی دەچـــتە قەلبـــێ؟

بەڵێ مامۆستای زانا و خوا ناسمان دەفەرموێ:

ئەو جۆرە بیرو باوەڕە باوەڕی نەزانان و خوا نەناسانە و هەر کەس باوەڕی بە خوا و هێزو وزەی خوا هەبێ و بەڕاستی خواناس بێ، چۆن ئەو جۆرە بیرو باوەڕە دەچێتە ناو دڵی؟

بەڵام راستی کاری مەردی خاوەن باوەڕو قارەمانی مەیدنی تەکپەرستی و خواناسییە، کە گش هێتم و مێتم و خوا گەلی پۆشاڵی و ساختەگی بە نووک شەق رابماڵێ و توڕیان دا و بیانهاوێتە زبڵدانی مێژووەوە.

من خۆم لە هاوینی ساڵی ٢٦٩٠ی کوردی ڕێکەوتی ١٣٦٩ی هەتاوی لە کاتێکدا کە مەلای گوندی خەلیفەلیانی ناوچەی سندووسی نەغەدە بوون لەبارەی تەکپەرستیدا ئەو سرروودەی خوارەوەم نووسیوە و پێم خۆشە لێرەیدا بگونجێنم. کە ئەوە دەقەکەیەتی:

## سروودی تەکپەرەستی

هەی ئەڵــلا ئەڵــلا ئەڵــلا بــاوەڕم پێـــتە وەڵـــلا
دروشـــــمی ســـــەرەکیمە لا اله الا الـــــــله
تەنیـا تـۆ دەپەرسـتم تـۆی مـایەی بیـر و هەسـتم

بـــوون و ژیـــتن لە تـــۆڕا، بە تـــۆ پەرســـتی مەســـتم
هەر تـــۆی یەزدانـــی زانـــا، بەهێـــز و پـــوگ و توانـــا
تەنیـا تـۆی فریـاکەوتوو، هەر بـۆ تـۆش دێـنم هانـا
کێل و گۆڕ و شێخ و پیر، ئاغا و کوێخا و بەگ و میر
هەمـووم بۆ تۆ وەلا نان ئەی بەخشەری ژیری و بیر
هەسـت و بـوون و ویـژدانم، گیـان و مـاڵ و سـامانم
لە ڕێـی تـۆدا بەخـت ئەکەم ئەی بژیـو بەخشی گیـانم
گـــش خـــواگەلی پوشـــاڵی بـــێ نێـــوەرک و خـــاڵی
بە نووکی شەق تێم هەڵدان هەرکە لێیان بووم حاڵی
بتگەلـــی زینـــدوو و مـــردوو، ئێـــستا هەبـــوو رابـــردوو
بتخـانە و بتـساز گـشتی، فـڕێم دا شـتی خـوا نەکـردوو
موســـــڵمانم موســــــڵمان، بـــــاوەڕم پێـــــتە یەزدان
خەبـــاتگێڕم، تێکۆشــــەر، لە ڕێــــی تــــۆدا وەک مەردان
کـوردم و لە ڕێـی تـۆدا، بەخـت ئەکەم گیـان و بـوونم
بـــۆ تـــۆیە تێکۆشـــانم، بـــۆ تـــۆیە هـــات و چـــوونم
هەر کەس تـۆ نەپەرسـتێ، هەر تـۆ نەبـێ مەبەسـتی
بـــێ نـــرخە بـــوون و مـــانی، هەر دەڕوا بەرەو پەســـتی
هەر کەس لە ڕێـــی تـــۆ لا دا، ژینـــی دەڕوا بە بـــادا
بەدبەخـــتە لە پەســـڵانا، کـــێ دینـــی بە دنیـــادا
مـــن بـــاوەڕم وەهـــایە، چـــی هەیە هـــی خـــودایە
بەرگـــــروان و بەرپرســـــە هەر کەس لە دنیـــادایە
ئەی خوای بە هێز و تینم، چاوگەی هەست و ئەوینم
هەر بـــۆ ڕەزامەنـــدی تـــۆ تێکۆشـــەرێکی دیـــنم
بڕیـــارە تـــاکوو مـــاوم، تـــاکوو دەبیـــنن چـــاوم
بـــۆ ڕازەی ئـــایینی تـــۆ، هەســـتاو و ڕاوەســـتاوم

سا مەرجە کورەی زەوی، ئاو و بەژ بەرز و نەوی
لە بتگەل خاوێن وەکەم، روون بێ وەک ئاوی شەوی
رزگار کەم مرۆڤایەتی لە بەندی بەندایەتی
بۆ بتگەلی جۆراوجۆر، کە نابن بۆ خوایەتی
سا دەبێ ئایین گشتی، خسر و پتوون و مشتی
هەمووی هەر بۆ خودا بێ، مرۆڤ گشتی سروشتی
گورزی تۆ دەبێ هەستی، دژی ملهورِ پەرستی
بکەویە سەر ڕێی ئازادی ڕێگەی خودا پەرستی

# روون کردنەوەیەک

مامۆستای بەڕێزمان بە هەمو هێزی زانیاری و ئەنبووژەنی خۆی لە دژی بازاڕی شێخ و شێخایەتی راپەڕیوە و بە هەر ئامێر و ئامرازێکی کە بۆی لوابێ بەربەرەکانی کردووە. ئەو بلیمەتە پسپۆڕە قورئان زانێکی کەموێنە و ئیسلامناسێکی بێهاوتا بووە، کەوایە بە هیچ جۆرێک ناکرێ و ناگونجێ و ژیری و ئاوازە نایگرێ کە ئەو هیچ شێخێکی قەبووڵ کردبێ و بێگومان لەگەڵ ئەو بازاڕە بوزی نەخواردووە.

ئێمە دەزانین کە گەورەترین، گرینگترین و ریکوپێکترین تەریقەت لە وڵاتی کوردەواری تەریقەتی قادری و تەریقەتی نەقشبەندین و ئەویش لە پێش هەمواندا ئەو دووانە بە دوژمنی سەرەکی ئیسلام و گەلی کورد دەزانێ و دەڵێ:

تەریـــــــقەی قــــــادری و نەقــــــــشبەندی
بە بــــــای دا رەونەق و ئـــــاهەنگی کـــــوردی

یا لە جێگایەکی دیدا بە سادەترین زمان و بێگرێ و گۆڵترین زاراوە هەموو شێخێک بە خەراپ و دژی ژین دەزانێ و دەفەرموێ:

هەتـــــا شـــــێخێک لە کوردســـــتان بمێنـــــێ
ئومێـــــــدی زینـــــــدەکانیت پـــــێ نەمێنـــــێ

نـــاکرێ بڵێـــین هێنـــدێک لە شـــێخەکانی قەبـــووڵ کـــردووە و هێندێکیانی وەلا ناوە. چونکە فەرموودەکانی ئەوەنـدە بێتـوێکڵن و ئەوەندە سادە و رەوانـن کە هەمـوو کەس بە ئاسـانی لێیـان حـاڵی

دەبێ و لە مەبەستەکەیان تێدەگا و بەڕاستی هیچ گرێپووچکەیەک لە وتارە شیرینەکانیدا نییە. هەروەها روونی و رەوانی زاراوە و قسە لە رووی ئەو بەڕێزە و جوانی قسە و خیرەت و هێزی زانیاری یەکجار زۆری وی زۆر لەوە باڵاتر بووە کە رووپامایی و دووڕوویی بکا یان لە رووی کەسێک دابمێنێ.

رەوش و بەرنامەی وی هەر ئەوەیە کە لە هۆنراوەکانیدا فەرموویەتی و لە نووسراوەکانیدا نووسیویەتی و ئەویش بە هیچ جۆرێک ئەوەیان لێ دەرناکەوێ کە مامۆستا هێندێک لە شێخەکانی پێ چاک ببێ. بەڵام ئەو هەرگیز دژ و نەیاری دۆستەکانی (اولیاء)ی خوا نەبووە، چونکە قورئان قەبووڵیان دەکا و دەفەرموێ: (ألا ان اولياء الله لا خوف عليهم و لا هم يحزنون) واتا هۆشیار بە و دەبێ بزانی کە دۆستانی خوا لە رۆژی پەسڵاندا هیچ ترسێکیان لە سەر نییە و هیچ خەم و پەژارەیەکیش نییە بۆوان.

بەڵام هیچ گومانیش لەوەدا نییە کە شێخ و وەلی زەوی تا ئاسمان لێک دوورن و وەکوو زێو و زەوی وان. جا هەر بەو بەڵگە و پەڕتۆیانە ئەو پارچە هۆنراوەی کە روو دەکاتە خەلیفەی شێخ عومەر و پێی دەڵێ ئەتۆ وا و وای و بەڵام شێخ عومەر شێخێکی وا پاک و چاک بووە

من بەئی مامۆستای نازانم و لام وایە کە بۆیان هەڵبەستووە و بە زمانی ویەوە دایانناوە، بۆ ئەوەی کە بە موسڵمانانی کوردەواری بسەلمێنن کە بەڵێ مامۆستای کۆییش دژ و نەیاری هەموو شێخێک نەبووە و ئەوەتا چۆن بە شێخ عومەرێک هەڵدەڵێ دیارە مەبەستیشیان ئەوەیە کە بە هەر جۆرێک بێ بیچەسپێنن کە بابە شێخ هەموویان خەراپ نین و شێخی باشیش هەیە و مامۆستادا قەبووڵیەتی، بەڵام بە هیچ جۆرێک لە گەڵ بیر و

باوەڕی مامۆستدا نایەتەوە و ناگونجێ و من قەت لەو باوەڕەدا نیم کە ئەو بەڕێزە شتێک بڵێ دژ و نەیاری بیر و باوەڕی راستەقینەی خۆی بێ. بە هیچ جۆرێکیش پیاو بۆی قەبووڵ ناکرێ کە تەنانەت حاجی مەلا عەبدوڵڵای باوکیشی مریدی هیچ شێخێک بووبێ.

بیر و رای مامۆستا لەمەڕ شێخ وشێخایەتی هەر ئەوەیە کە گوتمان و بەس. بیروڕای وی هەرگیز لەرزۆک و بگۆڕ نەبووە و باوەڕی پۆلایینی ویش قەت ئەوەی قەبووڵ ناکا کە لە جێیەک بە هەموو هێز و توانای خۆی بە گژ شتێکدا بچێ و لە جێیەکیش لەبەر بەرژەوەندی کاتی یان ... پێی هەڵبڵێ. بەڵام نازانم مامۆستا (گیو) چۆن بێ‌لێکۆڵینەوە چاپی کردووە و بۆچی هیچ لێکۆڵینەوەیەکی لەسەر نەکردووە.

جا بۆ ئەوەی خوێنەرانی خۆشەویست خۆیان داوەری بکەن، منیش ئەو پارچە هۆنراوەی وەک خۆی دەهێنمەوەو دادگەرییەکەی دەدەمە دەستی وان.

## بۆ خەلیفەیەکی ناخەلەف

تــــۆ خەلـــیفەی جەنـــابی شـــێخ عـــومەری؟
ئەدی مـــردووت مـــرێ بـــۆچ هێنـــدە کەری؟
شـــێخ عـــومەر زاتێکـــی زۆر مـــونەووەر بـــوو
خـــادمی شـــەرع و عیلمـــی ئەنـــوەر بـــوو
تـــۆ لەبـــۆ هێنـــدە پـــیس و بەد رەوشـــی
ئەحـــــمەق و جاهیـــــل و کەر و وەحـــــشی
غەیـــری ریـــشی درێـــژ و بـــێ‌خەبەری
چـــت زیـــاد کـــرد لە هیممەتـــی عـــومەری
لە تەریـــقەت بە غەیـــری پـــووچ خەیـــاڵی
لە ســـواری بە هـــیچ نەبـــووی حـــاڵی

شـــــەوق و زەوق و تەریــــــقەی نەقــــــشی
ســـــەفوەتی چـــی بە روحـــی تـــۆ بەخـــشی؟
غەیـــــری ژن گــــــان و بێـــــوەژن هێنـــــان
یـــا بە دوو نـــانی کـــۆیی وەکـــی دوونـــان

بەڵێ بۆدامودەزگای شێخ وشێخایەتی سووک کردنی خەلیفەیەکی کەم و نـۆکەرمەنیش و گەورە کردنـی شـێخێک شـتێکی ئاسـایی و ئاسـان و خـودی رامیارییەکەشـیان هەر وایە. مەگەر نـابینن کە دەوڵەتێک کەسێک یا چەند کەس هان دەدا بۆ ئەنجام دانـی کارێک کە دژی یاسای مرۆڤایەتی یا نێونەتەوایەتییە، هەر کاتێک ئاشکرا بوو حاشایان لێ دەکا و دەڵـێ بە هـیچ جۆرێک وابەسـتە بە ئـێمە نین! ئەگەر نەخشەکەشیان سەرکەوت، دەیانکاتە قارەمان

راسـتی رامیـاری زۆرلەوە قـووڵترە کە هەرئاواسـادە بیـری لـێ بکەینەوە، بۆ دامودەزگای پان و بەرینـی شـێخایەتی یـان تەنـانەت بگرە تەریقەتێکیش فیدا کردنی چەنـد دەروێـش و خەلـیفەی گەوج و نەزان هەر هـیچ نیـیە. ئەویـش جـا بە تـایبەتی کە تێـی رامێنـی هەرچەند لە باری کێش و تـۆن وە هەڵبەسـتەکە تەواو نییە، بەڵام زۆر زیرەکانە گوتراوە. نە شێخ عـومەر کە بە تەواوی ناسـێنراوە و نە خەلیفەکەش کەس دەزانێ کێیە!! سەرەڕای ئەوەش زۆر بـێتام و چێـــــژ و بـــــۆن و بەرامەیە و تەرازووی سروشـــــتی مامۆســــــتا نایخوێنێتەوە. چونکە بێگومان مامۆستا هەرگیز لەو جۆرە کەسانە نەبووە کە شتێکی٢٠٠-٣٠٠ساڵ دوای پێغەمبەر پەیدا بووبێ و لە دین زیاد کرابێ، ئەویش بۆی جیا نەکرێتەوەو بە نێوی دین قبووڵی بکا،جا کەوایە من بە راشکاوی دەڵـێم زۆر زۆر ویـدەچێ لە بنـیڕا ئەوپارچە هەڵبەستە بۆ مەبەستێکی تـایبەتی بە زمـانی مامۆسـتاوە هەڵبەسترابێ یا لانیکەم دەس تێوەردانێکی زۆری تێدا کرابێ.

# ئامۆژگاری

هەرچەنـد تەواوی وتە و فەرمـوودە و هۆنراوەکـانی مامۆسـتا هەموویـان هەر ئامۆژگـارییەکی وان کە دەبـێ بە ئـاوی زێڕیـان بنووسییەوە، بەڵام لە چاو هەموو هەڵبەستەکانی ئەو بەستەی ناو ناوە ئامۆژگاری.

لام وایە ئەو نێوەی بۆیە بۆ ئەو پارچە هەڵبەستەی هەڵبژاردووە چونکە ئەو پارچەیە تایبەتی بە لادێوە هەیە و لە پەیوەنـدی لەگەڵ ژیـواری نالەبـار و نائـامواری دێنشینە هەژارو فێـڵ لێکراوەکانـدا دایناوە کە لە پێشدا چـۆنیەتی حـاڵ و ژیـواری وان بە چـاکی روون دەکاتەوە و بە جوانی باسـی ئەوەی دەکـا کە لە دێـدا کەسـی بێکـار نییە و هەر کەسە خەریکی کارێکی تایبەتییە

سـەرەڕای ئەوەش خەڵکـی لادێ زۆربەیـان نەخوێنـدەوار و بـێ ئاگان و زۆر سادەو ساکارو بێفێڵ و فووتن،چونکە خۆیـان پـاک و بێفێڵن وا دەزانن کە هەموو کەس هەروەک خۆیانە، جا بە تایبەتی ئەو شـێخ و مێخـانە کە نێـوی رابەرایەتـی ئـایینی و دڵـسۆزی گەلیشیان لە سەر خۆیان داناوە. چونکە خەڵکی دێهاتی کوردستان هەمـوو موسـڵمانن، بەڵام موسـڵمانی نائاگـا و ناهۆشـیار و چـاو بەستراو. ئەوانە کە لایەنـی ئایینیـان بە خۆیـانەوە گرتـووە و جـا هەستی ئایینی خەڵکیش هەموو هەستێکی وە بن خـۆی داوە زۆر بە چاکی و بە ئاسانی توانیویانە خەڵـک بە تـایبەتی خەڵکـی سـادە و ساکار و ساویلکە بۆ لای خۆیـان راکـێش و بە کەیفـی خۆیـان و بـۆ قازانجی خۆیان مێشکیان ئاو بدەن و وەکاریان بخەن.

جا لێرەدا ئەوەی کە بتوانێ ئەو خەڵکە هەژار و رێ لێ ون کراوە رێنوێنی بکا و بیانخـاتەوە سـەر رێـی راستەقینە، بە رواڵەت و لە

ئەوهێنیشدا هەر مەلایە و بەس. بەڵام کە تەماشا دەکا ئەویش نەخوێندەوارێکی بێسەواد و نائاگا و فریو خواردووە، هەر بە رواڵەت مەلایە و لەبەرگی مەلایەتیدا نوێنەرێکی شێخە، تووک و نزای لێ دەکا و بێزاری خۆی لێ دەردەبڕێ و دەیداتە بەر توانج و پلار و بە خەڵک رادەگەیەنێ کە ئەوە راگەیەنەرێکی شێخە و ئەوەی ئەو دەیڵێ و ئەو دەیکا کاری نەزانێکی بە کرێ گیراوە و بەس. وە ئەو مەلایەش کە ئەوە ئاکاری بێ هەر ئەوەیە کە دەفەرموێ:

ئەویش بۆ شێخ وەکوو کەلبی موعەللەم
بە دەم کەروێشکی بۆ دەگرێ لە لانە

ئەوجاردێتە سەر کردەوە ورەفتاری شێخ لە دێدا ئیتردوای ئەوهەموو های و هۆی ئەو هەموو تێکەڵ بوونی ژن و پیاوە لە نیوەی دوایی شەودا ئەو جار مەلای نامەلا و نەخوێندەواری خۆفرۆش دەڵێ: ئەی خەڵکینە! یارمەتی کۆ کەنەوە. بە بێ خۆخوراندن وبە گورجی وخێرا و ئازایانە و هەرچی لە دەستتان دێ درێخی مەکەن، جا دوای رۆیشتنی جەنابی شێخ یەکێکی ژیر و زاناو تێگەیشتوو هاوار دەکا و بە خەڵک دەڵێ:

ئەی خەڵکینە! ئێوە لە فێڵی فێڵکەران شارەزا نین و ئاگاتان لە فێڵ و فووت و راو و رووتی ئەو فێڵبازانە نییە، بەڵام من گومانم لەوەیدا هەیە، کە ئاوات و ئامانجی ئەو شێخانە هەر وا رووت کردن و تالان و چەوساندنەوەی خەڵکە و بەس. ئیتر ئەوانە هەموویان لە لایەن دەزگای کوفرەوە رابەرایەتی دەکرێن و رێبازیان بۆ دیاری دەکرێ و خانەگاکانیشیان وەک روون و ئاشکرایە و وەک دەڵێن و دەیگێڕنەوە تەڵە و تۆڕن بۆ فریو دانی سادە و ساویلکە و ژن و منداڵی خەڵکی هەژار و نەخوێندەوار.

جا مامۆستا بەو جۆرە ئەو مەسەلە ناڕوون و نائاشکرایە بۆ دێنشینە هەژار و چاو بەستراوەکان روون دەکاتەوە و ئامۆژگارییان دەکا کە وە دوای ئەو فێلبازە چاو بەستانە نەکەون و چیدیکە فریو نەخۆن. چونکە ئەوانە سەرەڕای ئەوەی کە هەر لە لەوەڕ و خۆقەڵەو کردن و ماڵ کۆ کردنەوە دەگەڕێن، سیخوڕ و وابەستەی ئەم لاو ئەولاشن و خۆیان لە سەر ئێوە ئاوا دابەستووەو مامۆستا کۆیی گوتەنی: بە ناوی دین باش دەلەوەڕێن!!

خۆ ئایین هەر بە هیچ جۆرێک پێویستی بە شێخ و مێخ نییە و ئیتر ئەو بازاڕە بازاڕێکی رەشە بۆ لێک بڵاو کردنی موسڵمانان و لاواز کردنی ئیسلام دانراوە. ئەوەی قازانجی زۆر لەو بازاڕە وە دەس دێنێ شێخە سیخوڕەکانن و لەوانیش بالآتر ئاغاکانی وانن!!

چونکە لە لایەک لەو جێیەی کە خۆیان دەزانن کوێیە سیخوڕانەی خۆیان وەردەگرن و لە لایەکیش بە کەیفی خۆیان لە سەر ورگی ئەو خەڵکە هەژارە دەلەوەڕێن، چونکە لە خواش ناترسن بە کەیفی خۆیان نامووسی وان لەککەدار دەکەن. خۆ ئیتر لە ژنەگەلی خوا نەناس و بێئاگا لە ئاییینیش گەڕێ کە چۆن خۆیان دە تۆڕی ئەو راوچییانە داوێن و وا دەزانن کە شێخ هەموو شتێکی هەر رەوایە و بە فەرمانی خوا وا دەکا و ئیتر هەموو جێیەکی متفەڕکە!!

خۆم لە کۆڕی شێخێکیدا دانیشتبووم کە قسەی خۆشی بۆ دانیشتووەکان دەگێڕانەوە پێشێ خەریک بوو لەبەر من بسڵەمێتەوەو نەیانڵێ، بەڵام پێیان گوت: قەیدی ناکا و خۆ ئەویش ئەو قسانەی پێ خۆشە و ناشیانگێڕێتەوە، کوڕی چاکە و وەک خۆمانە!! (خوا نەکا وا بم) جا ئەویش دەستی پێ کرد و گوتی: لە کاتی ئیرشادی خۆمدا رۆژێک دیتم ژنێکی زۆر جوان و لەبار و تەڕو تۆڵ زیز ببوو هاتبووە خانەگایەکەی ئێمە. هەر کە دووراو دوور

چاوم پێی کەوت کرمی سەرم بزووت و لە دەروێشێکم پرسی ئەوە چییە؟ گوتی قوربان ژنی فیسارە مریدەی خۆمان لە فلانە گوندی لە مێردەکەی زویر بووە و سەری خۆی هەڵگرتووە و هاتۆتە ئێرە. جا ئیتر چاوەڕوانی هیممەت و بەرەکەتی ئەو خانەدانەیە. منیش هەر ئەوم ناردە لای و گوتم پێی بڵێ کە بە هیچ جۆرێک لە چەنگی حاجی شێخ سەیید رزگارت نابێ و ئاوا دەفەرموێ. ئیتر سەرەنجام پاشی چەند رۆژان مێردەکەی کە بە دوایدا هات و دەستی کرد بە پاڕانەوە و لالانەوە و دەردی دڵ کردن منیش کە زۆرم پێ ناخۆش بوو بیباتەوە ناچار پێم گوت رۆڵەم ئەو ژنەی تۆ زۆر کەر و بێئەقڵە، دەبێ جارێ ماوەیەک لێرە بێت، نسحەتی بکەم و ئا بەو جۆرە چەند جاری دیکەش هات و بە دەستی بەتاڵ ناردمەوە و چەند مانگێک ژنەم نەناردەوە لای مێردەکەی.

جا من ئەوەم لە زمانی خودی شێخ بیستووە بۆیە دەیگێڕمەوە و ئیتر ئەگەر خوا بکا درۆش بێ هەر هۆباڵەکەی بە ئەستۆی خۆیەتی. دەنا لەو بارەوە داستانی جۆراوجۆر ئەوەندە زۆرن، کە چەندین پەڕتووک و نامیلکەی ئاواش ناتوانن خڕکەرەوەی تەنانەت نیوێکیشیان بن.

بەڵێ جا ئەوەیە مامۆستای دڵسۆزمان باوکانە ئامۆژگاریمان دەکا و دەفەرموێ:

## ئامۆژگاری

قسێکت بۆ دەکەم چاکی بزانە
قەبووڵی کە بە بێ عوزر و بەهانە
لە سەر زار و زمانان گەرچی سووکە
لە میزانی حەقیقەت زۆر گرانە

به خێری خۆت به خەڵکی ڕاگەیێنه
هەتا زاهیر بێ ئەو سیرڕی نیهانه
هەتاکوو ئەهلی شار و دەشت و لادێ
خەبەردار بن له ئەحوالی ئەوانه
بۆخۆت ئەحوالی لادێ چاک ئەزانی
یەکێ جووتیار، یەکێکی بەرخەوانه
فلان ئاودێره، ئەویان عەرد ئەکێڵێ
شوانه ئەو، ئەویتریان سەپانه
خەریکی کارو بار و جووت و شوانین
له فێڵی فێڵکەران ناشارەزانه
مەلایەکیان هەیه سندانی لێ دا
نەخوێندەوار و ئەحمەق و گەوج و نەزانه
وەکوو کەر گەڕ ئەخوا دایم له دێدا
به ڕیشی پان دەڵێی مالی جووانه
ئەویش بۆ شێخ وەکوو کەلبی موعەللەم
به دەم کەروێشکی بۆ دەگرێ له لانه
ئەڵێ تۆبه بکەن لای شێخ به گورجی
قیامەت ڕائەبێ هەر بەو زووانه
دە زوو چێشتێ له بۆ شێخی دروست کەن
پلاو، ساوار و شلکێنه و کەلانه
به مام کوێخا بڵێن ئەسپابی ڕێک بێ
له بۆ شێخ شەو که دێته دیوەخانه
که نیزیک ساعەتی دوو بوو هەتا دە
له بۆ نێران بەسه، نۆرەی ژنانه
ژنی کوێخا و ئەهالی دێنه جەزبه

ئیتـــــر هــــــاوار و گریــــــان و فوغــــــانە
لە پــــاش ئەو هــــای و هــــۆی و تێکوتــــانە
دەڵـــــێ ئەی قەوم و گەل، کـــــۆ کەن ئیعــــانە
مریــــشک و هــــێلکە و چویــــشتر و کــــاوڕ
کەرە و دانـــــــدۆک و ســــاوار و هەمـــــانە
گـــــوریس و ســــیپەک و نــــاودۆک و مەشـــکە
جەواڵ و تـــــــوورەکە و تیــــــرۆک و خــــانە
هەمـــووی حــــازر بــــکەن بـــێ خــــۆ خورانـــدن
دە خێـــــرا بـــــن بە چوســــتی و عــــاقڵانە
بە هەر نەوعـــــێ کە شـــێخ تەشـــریفی رۆیـــی
یەکـــــی عاقـــــڵ هەڵئەســـــتێ لەو میــــانە
ئەڵـــــێ ئەی قەوم و گەل، ئێـــــوە بەڵەد نــــین
لە کەیـــــد و فێـــــڵ و نەیرەنـــگ و فـــسانە
لە لام مەعلــــووم بـــووە بـــێشــــک شــــوبهە
بە ئاســــــار و بە ئەتــــــوار و نیــــــشانە
ئەهەممـــــــی مەقـــــسەدی شــــێخی زەمــــانە
لـە دنــیـا ئـالـیــکـە و هـەم نـان و گـانـە
هەمـــوو تەزویـــر و کەیـــد و مەکـــری شــێخان
لە لایەن کــــــوفرەوە دەکـــــرێ نیـــــشانە
ئیتـــر گـــش خانەقـــای شــێخانی شــــەیتان
وەکـــــوو مەشـــــهوورە گۆیــــا خانەگـــــانە
موســــــڵمانی نەزانــــــی بـــــێسـیـــــوادیش
لە لایـــــان وایە گەر مــــــاڵی خـــــودانە

# شێخ عەبدولکەریم

مامۆستای بەهەشتیمان زۆر چاک دەزانێ کە شێخگەل و دەزگای شێخایەتی لە بنیڕا چین و بۆ چی دامەزراون و ئیتر ئەوەی کە بە تەواوی مەبەستیان نەبێ هەر ئایینی پیرۆزی ئیسلام و بەڕێوە بردنی یاساکانی و سەر لێ شێواندنی موسڵمانان و بڕبڕ بوونیانەو بەس.

جا هەر بۆیە هەر دەمێک بۆیان هەڵکەوێ و بۆیان بلوێ هەر بۆ ڕابواردن و خۆشگوزەرانی خۆیان هەموو یاسا و ڕێسایەک دەدەنە ژێر پێ و پێی ڕێ دەخەن.

داستان و بەسەرهاتی یەکجار زۆر لەو بارەوە دەگێڕنەوە کە هەموویان نیشاندەری ئەوەن کە لە بن ئەو نیوەکا سەدا کەسەیەکی گەورە هەیە و لە بن ئەو پەردە چکۆلەدا دنیایەک شێردراوەتەوە و هەر کاتێک ئەو نیوەکا سەلا ببرێ و ئەو پەردە چکۆلە لابدرێ، دنیایەکی سەیرو سەر سووڕهێنەر دەردەکەوێ!

جا وەهاشیان خۆ نیشانی خەڵکی نەزان و بێئاگا داوە کە بە قسەی خودی مامۆستا،

مەلا گەر بێ و بڵێ نابێ وە ها بێ
ئەڵێن ئەم فاسقە بۆتە وەهابی

ئیتر ماسکی وەهابیگەری لە نێوچاوانی دەدەن و هەر بەو دەردە گرانەش مامۆستا گوتەنی:

ئەوەی زانایە ناو جەرگی پەلاسە
ئەوەی نادانە نازانێ چ باسە

دەگێڕنەوە شێخێک گۆیا پتر لە دە ملوێن کەس مریدی دەبن خزمەتکارێکی تایبەتی دەبێ لە لای خەڵک بانگی دەکا ئافتاوە و لەگەنانی بۆ بێنێ تا دەستنوێژێ هەڵبگرێ، بەڵام گۆیا کاتێک، کە کەس دیار نابێ پێی دەڵێ: لایان بە دەستنوێژی چی؟

نازانم ئەو چیرۆکە تا کوێ راستە، بەڵام دەڵێن خودی خزمەتکارەکە گێڕاویەتەوە!! وەک دەڵێن هەر ئەو شێخە کە تەمەنی لە دەوری ٧٠–٨٠ ساڵیدا دەبێ یەکێک لە مریدەکانی کچێکی ١٤ ساڵانەی بێئەندازە جوانی دەبێ و ئەویش داوای لێ دەکا، کە بیداتێ. مریدەکە لە خۆشیان تڕی دە تڕێ راناوەستێ و گورجێ پێشکەشی دەکا. بەڵام بۆ قایل کردنی کچەکە هەموو دەست و پێوەندەکان دەکەونە کار و کچەش، کە قەت چاوی بەو شێخە گەورەو بە قەوت و بەنێوبانگە نەکەوتووە بەڵێنی نادا و سەرەنجام دەڵێ ئەگەر هەر وایە بچن وێنەیەکی شێخم بۆ بێنن، ئەگەر خۆشم نیشان نادا، با چاوم بە وێنەکەی بکەوێ.

ئەوانیش دەچن و وێنەیەکی تەمەنی سی ساڵی شێخی بۆ دەبەن، کە دیارە جەنابی شێخیش لە تافی لاویدا گەلێک بە دیمەن و جوان دەبێ. بەڵێ کچە وێنەکە وەردەگرێ و، کە دیارە زۆر جوان ولاو دێتە بەر چاوی بەڵێنییان پێ دەدا و زۆر، یا کەمی پێ دەچێ کچە بۆ شێخی دەگوێزنەوە و شەوێ هەوەڵ، کە زاوا دەچێتە لای بووکێ، بووک وا دەزانێ، کە ئەوە خەزوورەیەتی و باسکی ماچ دەکا و بە مامە مامەوە لای سەرووی دەخا و ئەویش دەڵێ ئاخر خۆ وا نییەو من مامی تۆ نیم و بەڵکە من مێردی تۆم و تۆ لە من مارە کراوی

بووکیش وێنەی سی ساڵییەکەی لە گیرفانی دەردێنێ و دەڵێ ئاغا من شووم بەو کەسە کردووە نەک بە پیرێکی وەک تۆ. وەک من

بیستم چەند ساڵان ئەو کچە لە ماڵی شێخی بە کچی مایەوە و شێخی نامەردی هەر دانەهێشتە خۆ و ئەویش هەر دەستی لێ بەرنەدا!!

گومان لەوەدا نییە کە ئەو جۆرە داستانانە ئەگەر ١٠٠% راست نەبن چەند لە سەدێکیان راستە و لە خۆڕا هەڵنەبەستراون. راستی ئەوانە وێڕای سیخوڕی بۆ ئەو لا و ئە لا یا وەرگرتنی کرێی کاریان بە زۆر و زەوەندی لە نێو ئەو خەڵکە هەژارەشدا هەر بە کەیفی خۆیان لە هەر بارێکەوە رایانبواردووە. وەک کابرا گوتەنی: تووتنی مفت و ئاغای کەریان بۆ هەڵکەوتووە و بە کەیفی خۆیان لێی خورن.

گەلێک لە شێخەکان خانەگای ژنانیان هەبووە و گۆیا ئەو خانەگایانەش جیاوازییەکی وایان لەگەڵ حەرەمسەرای شایانی ستەمکار نەبووە و ئەگەر وردیش بیری لێ بکەینەوە هەر دروست وان و بێجیاوازین ئەوانە خۆیان دە بن باڵی دۆستانی خوا (اولیاء الله)دا شاردۆتەوە و بە داخەوە زۆر کەسی نەزان و بێئاگاش پێیان وایە ئەوانە دۆستی خودان و دیسانیش بە داخەوە زۆر کەسیش هەمووان رەپێچەک دەدەن و بەربەرەکانی هەمووان دەکەن و جیاوازی لە نێوان شێخ و دۆستی خوادا دانێین!!

من بە گوێی خۆم لە شێخێکی زۆر گەورەم بیست کە وتاری بۆ خەڵک دەدا ناوی ستەمکارترین دەسەڵاتداری رۆژگاری وڵاتی برد و گوتی ئەگەر لێم بپرسن تۆ چ کارەی، دەڵێم هەر خۆم و خودی شاهەنشا دەزانین و بە هیچ کەسی دی پێوەندی نییە.

جا کە جار جارە ئەو رازانە ئاشکرا دەکەن پیاو هێندەی پێ خۆشە و دەبێ زۆریان لێ مەمنوون بێ ئەگەر لە پتەشیان دەربچێ هەر زۆرە. کە وێدەچێ ئەو پارچە هەڵبەستەی مامۆستای

بەڕێزیشمان هەر شتێک بێ لەو شتانە و ئیتر بۆلێکۆڵینەوە و توێژینەوە هۆنراوەکەی مامۆستا دێنین کە دەفەرموێ:

## مەمنوونی شێخ عەبدولکەریم

هەمـــوو مەمنـــوونی شـــێخ عەبـــدولکەریمین
کە ســـیرڕی ئەم تەریـــقەی ئاشـــکرا کـــرد
حیجـــابی بەینـــی نێـــر و مێـــی فـــڕێ دا
هەرامە و هینـــی پێکـــدی ئاشـــنا کـــرد
لە خەڵوەتخـــانەیی بەزمـــی مریـــدان
بە پێـی خـۆی دانـس و هەڵپەڕکێـی پەیـا کـرد
بە ئەفـــسوون و فـــسانەی ســـۆفی تۆفیـــق
هەزار مێـــرد و ژنـــی لێکـــدی جیـــا کـــرد
نەزۆکـــێ گەر بە ئـــیخلاس روو لەوێ کـــا
دەبینـــین شـــێخ کـــوڕێکی پـــێ عەتـــا کـــرد
ڕەواجـــــی دا بە دەســـــتووری ئیبـــــاحی
کتێبـــی شـــەرع و عیلمـــی بـــێبەهـــا کـــرد
تەیـــــاترۆیێکی وای دانـــــا لە عـــــالەم
تەوەللایـــان لە دینـــی مـــستەفا کـــرد
گەلێـــک مـــاوە لە ئەســـراری تەریقـــی
بەڵام جـــاری بەوەنـــدەم ئیکتیفـــا کـــرد

بەڕاستی هۆنراوەکانی مامۆستا - خوای گەورە لە بەهەشتی بەریندا نیشتەجێی بکا - هەموویان نموونە و ئاوێنەیەکی بالانوێنی کارەساتگەلی جۆراوجۆرن و بە هەر تاکە هەڵبەستێکی ئاماژە بۆ

ڕووداوێکی سەیر و سەر سووڕهێنەر دەکا کە لەوانەیە وێنەی وان لە ڕۆژگارانی دوای مامۆستاشدا دووپات بێتەوە ولە هەر ڕۆژگارێکدا بە جۆرێک شتەهایەکیان لێ ڕوو بدات.

لەو ساڵانەی دواییدا شێخێک پەیدا بوو خۆی بە نووشتە و گشتەک بەڕێ دەبرد و بەتایبەتی سەروکاری وەک دەڵێن لەگەڵ نەزۆک هەبوو. وەک دەڵێن بۆ پەیدانی بوونی منداڵ نووشتەی لە نێوکی ژنەکە دەنووسی و دەشڵێن بازاڕیشی زۆر گەرم بوو.

دەڵێن جارێک لە خەڵوەتخانەی مریداندا ژنێک گەرم داهاتبوو و جەزبەی گرتبوو و بە هیچ جۆرێک وە خۆ نەدەهاتەوە و هەرچی لەگەڵیان کرد هەر بێسوود بوو و نەهاتەوە سەرخۆ! ئاخری گوتیان بابە، با دەروێش عەوڵا ناوێک بیباتەوە ماڵێ، دەروێش عەوڵاش لە ڕێیە شەیتان چوو دە کڵێشەوەیە و تووشی کارێکی کرد کە نەدەبوو تووش ببێ. ئەمجا لە شەوەکانی دیکەی بەزمی مریداندا ئەو ژنە لە باتی زیکر و ئەوراد، هەر دەیگوت دەروێش عەوڵا بمباتەوە، وەک شەوی دیم لێ بکاتەوە.

دەیان و سەدان و هەزاران شتی دیکەی لەوچەشن ووێنەش هەن و روویان داوە و شتی زۆر سەیر و سەر سووڕهێنەریان تێدایە. بەڵام هەر شتە لە جێی خۆی جوانە و هەر شتێک نابێ بۆ هەر جێیەک، دەنا ئەو جۆرە شتە باوشکێنە(خارق العادە)انە زۆرن!!

دەگێڕنەوە کە لە مەڵبەندی موکریان شێخێک دەبێ و مریدێکی دەبێ، کە ژنێکی زۆر جوانی دەبێ و ڕۆژێک خۆی و ژنەکەی دەچنە خزمەت شێخ و شێخیش شەیتان دەچێتە کەللەیەوە و فریوێ دەخوا. بە مریدەکەی دەڵێ پێم خۆشە خێزانت ماوەیەک لێرە بەجێ بێڵی شێخ ژن پێی خۆشە ئەویش دەڵێ بە چاوان.

پاش ماوەیەک دەچێ ژنە دێنێتەوە و ئەویش هەرچی لە شێخی دیتووە ورد بۆی دەگێڕێتەوە مریدەش دوایە ماینێک زین دەکاو دەچێتەوە لای شێخ و دەڵێ قوربان بە سەدەقەی سەرت بم خێزانەکەم لە تاوی شێخ ژنێ وەک شێتانی لێ هاتووە و هەر هاواری شێخ ژنیەتی و ئێستا دەبێ هەر چۆنێک بێ چەند رۆژێکان لە گەڵم بنێری ئەویش بە سەر زاریدا دێ و دەڵێ باشە و مریدەش خێرا شێخ ژن سواری ماینەکەی دەکا و دەیباتەوە ماڵی خۆیان و دوای ئەوەی لێی وەڕەز دەبێ دەیباتەوە و روو لە شێخی دەکا و دەڵێ: بە خوا جەنابی شێخ تۆ چت کردووە منیش هەروا. جا بیڵێی دەیڵێم، مەیڵێ نایڵێم.

## بیڵێ و دەیڵێم، مەیڵێ و نایڵێم

دەڵێن جارێک مریدێک هێندە کەر بوو
لە کەر کەرتر لە بۆ شێخ بارەبەر بوو
لە لای شێخ بوو تەواوی هەست و خوستی
خاو و خێزان و ماڵی داببوە دەستی
ئەوەندەی باوەڕ و متمانە پێ بوو
بۆ گش فەرمانێکی چاوی لە رێ بوو
لە بۆ شێخ ئەو نەبوو خاوەن سەر و ماڵ
لە بۆ وی شێخ برا بوو، باب و هەم کاڵ
ژنێکی بوو لەبار و شۆخ و شیرین
گوڵێک بوو چەشنی سملی ناوی پەرژین
وەکوو شێخ ژن جوان و شۆخ و ناسک
رەزا سووک و خەرامان، چەشنی ئاسک

جەنـــابی شـــێخ دەیویـــست دەسـتی بیگـــاتێ
کە بەڵـــکە لانــــی کەم شـــتێکی بـــداتێ
گـــوتی بە مریـــدە خێزانـــت بنێـــرە
تـــا تـــۆبەی پـــێ بـــکەم لێـــرانە خێـــرە
لە تەکیەیـــدا لەگەڵ گـــش ئەو ژنـــانە
بمێنـــێ چەن شــەو و رۆژ لێرەکـــانە
گـــوتی قوربـــان بە چـــاوان ســـا کەوایە
هە ر ئەورۆ ئەیهێـــنم تـــۆ قـــسە ت رەوایە
ژنەی هێنـــا و مریـــدە چـــۆوە مـــاڵێ
دەجـــا بـــا شـــێخی تەپـــرەش تێـــی بهـــاڵێ
شـــەو و رۆژێ بە تـــۆبە و تـــۆبە دادان
ژنەی هێنـــا بـــۆ ســـەر حەولان و ئامـــان
ژنە دەیگـــوت ئەرێ ئەی مـــاڵ ئـــاوا
لەگەڵ مـــن چـــۆن دەکەی تـــۆ کـــاری ئـــاوا؟
دەیگـــوت هەی بـــێ ئەمەگ لە ژیـــان دووری
ئەمـــن خـــۆ تێـــدەکەم هێنـــدێک لە نـــووری
ئەتـــۆ بـــۆچ هێنـــدە ســـپڵە و پـــێ نەزانـــی
دەبـــوو چـــۆن تـــۆ بە چـــاکەی مـــن نەزانـــی؟
بـــۆ ژنەش نـــاخۆش ســـا ئەم هەوایە
دەیگـــوت ئیختیـــارت هەس یـــا شـــێخ کەوایە
هەتـــا ویـــستی بە کەیفـــی خـــۆی لەگەڵ کـــرد
لەلای پەروەردگـــار ئـــابڕووی نەبـــووی بـــرد
بە کۆڵێـــک تـــۆبەوە جـــا نـــاردیەوە مـــاڵ
لە گەڵ مێـــردی کەری دەدوا بە ســـەد حـــاڵ
بەرز بـــوو لـــووتی و دەعـــیە و دەمـــاری

لەگـــش ئاکـــاریکی تـــاوان ئەبـــاری
گـــوتی مێـــرد ئەی ژنە تـــۆ بـــۆچی ئـــاوای
چ قەومــــاوە لە ســــەر مـــن وا بەداوای؟
لە مـــاڵی شـــێخ پـــێم بێـــژە چ فێـــر بـــووی؟
لەوێ چـت دی و لە سەر مـن بـۆچی نێـر بـووی؟
گــوتی شــێخمان ئەوەنــدی تــێ کــردووم نــوور
کە لە پیــاوی وەکــی تــۆ دوور بــووم دوور
زمــانی خــۆی گەســت ئەو کــابرا هەژارە
کە چــۆن پەیــدا بکــا بــۆو کــارە چــارە
لە دڵـــدا دەیگـــوت بە خـــوا وا دیـــارە
کە شـــێخ خـــاین بە خـــوا و خەڵکـــی هەژارە
بە دەســتی خــۆم ئەمــن چــیم کــرد لەگەڵ خــۆم
بەڵام ئەو قــسانە تــا کەنگــێ، دەبــا بــڕۆم
لە مــاین ســوار بــوو یەکــسەر چــۆوە لای پیــر
دەســی مــاچ کــرد گــوتی ئەی پیــری زۆر ژیــر
خێزانـــی مـــن لەتـــاو خێـــزانەکەی تـــۆ
لە تـــاوی شـــێخ ژنە لێـــزانەکەی تـــۆ
وەکـــوو شـــێتانی لێهـــاتووە بە قوربـــان
منـــیش چـــارەم نیـــیە و ئیتـــر لە تـــاوان
لە دووی شـــێخ ژن ئەوا هـــاتوومە ئێـــرە
لە گەڵمـــا شـــێخ ژنـــی گەورە بنێـــرە
بە خێـــری خـــۆت بـــا چەن رۆژی لە لا بـــێ
ئیتـــر بـــا دژمنـــان ماڵیـــان خەرا بـــێ
گـــوتی باشـــە بـــڕۆ بیـــبە کە خێـــرە
لەگەڵ ویـــشا ژنەکەت بێـــرەوە ئێـــرە

دەبێ خۆم زۆرتری کاریێ لەسەر کەم
هەتا ئەو شێتی و مێتییەی لێ بەدەر کەم
گوتی قوربان ئەمر فەرموو بە چاوان
هەرچی تۆ پێم بڵێی هێزی هەناوان
دەڵێن جا مریدە ژنەی سوار ماینێ کرد
لە دێی دەرخست بەرەو ئاوایی خۆی برد
هەتاکوو گەینە ماڵی گۆیە چەن جار
لەگەڵ ئەو شۆخەدا کردی هەمان کار
کە شێخ کردبووی لە گەڵ ئی وی کەوایە
مریدەش لێی دا لە بۆ شێخ ئەو هەوایە
دەڵێن وەک شێخ بە کەیفی خۆی لەگەڵ کرد
ئەویش ئابڕووی بە چەشنی شێخەکەی برد
لەلای خۆی هێشتیەوە تا مەیلی لێ بوو
وەیا هێندەی کە خێزانی لەوێ بوو
لە پاشان بردیەوە و فەرمووی بە قەڵسی
تۆ ئەی شێخە مرۆڤی یانە وەڵسی
خۆ من نامووسی خۆم نابوو لە دەستت
ئەوا چیت کرد ئەرێ نەفرین لە هەستت
تۆ ئابڕووی خۆت و منت بۆچی وەها برد
ئەوا نامەردی ناکەس چیت لە خۆ کرد؟
وەفات بۆ مریدەکانی خۆت وەهایە
ویژدان و دین و نامووست هەوایە؟
نە تۆم شێخی و نە من مریدم لەمەو لا
کە تۆ ژیانت هەموو زیانە بە مەولا
چ پارسەنگێکت تۆ نابۆ تەرازووم

ئەوم هەڵگرت بە هێزی دەست و بازووم
لەبۆم خستییە تەرازوە سەرکەرەی خۆت
چت بۆ چاندم، منیش چاندوومەوە بۆت
ئەوەی تۆ کردت ئەمنیش هەر ئەوەم کرد
ئەتۆ چت برد منیش هەر ئەو شتەم برد
بە ئەڕبەی خۆت لە بۆم پێواویە وام
چێشتی منیش وەک ئی تۆ بێ تامە بێ تام
جا پێت خۆشە نە تۆ دەنگ و نە من دەنگ
دەنا وا ناکەی هەستە بێرە بۆ جەنگ
بیڵێ و دەیڵێم و مەیڵێ و نایڵێم قەت
ئیتر حاشا لە خۆت و هەم لە چاکەت
مەگەر تۆ خانەگاکەت خانەگانە
تەڵە و داوی کەران و هەم ژنانە؟
زەلامی مفتە خۆری مل بەرازی
مەگەر تۆ هەر بە ژن گانێ دەنازی؟
ئیتر سا مەرجە لەم لاوە هەتا هەم
ئەوەی شێخە لە دنیا رووی تێ ناکەم
هەزار نەفرین لە شێخ و خانەگای وا
لە دەزگا و تەکیە و هەم بارەگای وا
وتی شێخ سا نە تۆ دەنگ و نە من دەنگ
دەخیلت بم نە تۆ جە نگ و نە من جە نگ

سەرماوەزی ١٣٧٧ مەهاباد

گەلێکن لەو نمونانە و لەراستی دا ئەو داستان و بەسەرهاتانەی شێخەکان ئەوەندە زورن، کە پیاو ناتوانی دەرسەدیکی کە میشیان لی تۆمار بکات.

جا هەر بۆیە من نام هەوی ئەبا سە لەزمانی خومرا زور دریژە پی بدەم و وەدوای بکەوم، چونکە رێزدار مامۆستای کۆیی ئە وەندە زانایا نەو بی پەروا هەڵمەتی شیرانە یان دەباتە سە ر ودەیا ن کوتی کە رەنگە زور پێویستی خو زەحمە تدانی ئی دیکە نەبی.

# یەخە دادڕینی مامۆستا

لە کۆنەوە لە کوردەواریدا باو بووە کەسێک کە لە کەسێک بێزار بووبێ بۆ ئەوەی کە نیشانی بدا نایهەوێت و لێی بێزارە لە بەرابەریدا یەخەی خۆی دادڕیوە و مەبەستی ئەوە بووە، کە ئەو کەسە راستی و رەدا قەبووڵ ناکا.

جا مامۆستای خوا لێخۆشبوومان کە لە ژیواری نالەباری کوردەواری بێزار بووە و زۆر پێی ناڕەحەت و دەردۆمەند بووە و بە کوردەکانیشی گوتووە من زۆر بۆ ئێوە پەرۆش و دڵ بە سۆم، سەرەنجام گەیوەتە ئەو ڕادەیە، کە یەخەی خۆی دادەڕێ و هاوار دەکاو دەڵێ:

مــــن یەخەی خـــــۆم لە بـــــۆیە دائەدڕم
ئێـــــوە نـــــابن بە هـــــیچ و مـــــن دەمـــــرم
دەبـــێ مـــــن کەیفـــــی چـــیم بە دنیـــا بـــێ
قەومـــــی مـــــن وا رەزیـــــل و ریـــــسوا بـــــێ

ئەمجا بە خەم و پەژارەیەکی زۆرەوە لە خۆی دەپرسێ و دەڵێ من چۆن دڵم بە دنیا خۆش و چ کەیفێکم بە دنیا بێ، کە گەلەکەم ئاوا زەبوون و بێهێز و ژێر چەپۆکە و زۆر لێکراو بێ؟

گەلی من گەلێکی هەژار و رووت و نەدار و بێسەرو سەرفیرازی و رووت و رەجاڵ وبێکەس و بێدەروو و بێهەموو جۆرە جلوبەرگ بێ ئیتر بەو حاڵە من چۆن دڵم بە دنیا خۆش بێ. بەڵێ دەڵێ:

بـــــێکەس و بێـــــدەر و فەقیـــــر و هەژار
بـــێ ســـــەر و ســـــەرفراز و بـــێ ســـــەردار

کــــوردەگەل ئەمــــڕۆ وەک کەوی بــــرا بــــران
لە نێــــو ســـــێ دەوڵەتــــان دابەش کــــران
خۆشــــــیان ئەوەنــــــــدە نــــــــاڕێکوپێکن
لە بەر بەدبەختــــــی دژمنــــــی یــــــێکن

ئەمجــا دەکەوێــتە ســەر تــووک و نــزا و، لە خــوای گەورە دەپــاڕێتەوەو داوای لــێ دەکــا کە ئەو کەســەی ڕێــگەی لە کــوردان تێــکداوە و بەرەو هەڵــدێرگەی بــردوون و ڕێبــازی ڕاســتی لــێ ون کردوون لە بەزەیی و میهری خۆی بێبەشی بکا و تۆڵەی کوردانی لێوەکا، چونکە کورد لە خۆڕا دژمنی کەس نییە و لە گەڵ کەس بەشەڕ نایەت وەک ئەو هۆنراوەی من کە دەڵێم:

کـورد لە خــۆڕا دژمنــی کێــیە لەســەر مــافی نەبــێ؟
دژمنی کـورد ئەی خـودا گـڕوێ و دزێو و گـڕ بـکەی

ئیتر هەر لە سەر خـاک و زێدی خـۆی ولە سـەر مـافی خـۆی لە هەر چــوار پێــنج لاوە دمیــان لە گیــانی نــاوە و دەیخـــۆن و دەیکرۆسـنەوە و هەناسـەیەکی سـارد لە دەروونـی پـڕ لە سـۆزی هەڵدەکێشێ و دەڵێ:

ئەی وەتەن، لاوەکـــــانی خــــوێن شــــیرین
ئەو دوعـــــــایەی دەکەم، بڵــــــێن ئــــامین
ڕەببــــی هەر کەس کە دژمنــــی کــــورد بــــێ
چــــاوی بــــا دەرپەڕێ و ملــــی ورد بــــێ
ئەوی ڕێـــــگەی لە کوردەکــــان گــــۆڕی
لەعنەتــــــی خــــــودا لە ئەلـــــحەد و گـــــۆڕی
خــــوایە هەرکەس کە خــــوێنی کــــورد ئەمــــژی
کـــــوێر و مـــــادور بێـــــت ئەوەنـــــدێکی ئەژی

یادی بەخێر خوا لێخۆشبوو میرزا حوسێنی فەقێزادە خەڵکی سەرچناری چۆمی مەجیدخان بۆی گێڕامەوە فەرمووی: ئەو چوار تاکە هۆنراوەی مامۆستامان لە گۆڤاری هەڵاڵەدا نووسیبوو. جا هەر کاتێک تووشی یەکتر دەبووین پێش سڵاو و چاک و خۆشی، یا ئەو، یا من، ئەو هۆنراوانەمان دەخوێندەوە.

ئەمجا سکاڵاکەی خۆی لە لای خوای گەورە سەبارەت بە ستەم لێکراوی گەلەکەی درێژە پێ دەدا و بە جوانی ژیواری نائامواری کوردەواری لە پارچە هەڵبەستێکی چووکەدا دەداتە بەر تیشکی چرای بەزەیی و خەمخۆری و بە جوانی روونی دەکاتەوە و زۆر بە پەرۆشەوە دەفەرموێ:

میللەتی کورد فەقیر و بەستەزمانی
بە قسەی ئەو کەسانە چۆن خەڵەتان
وا ئەزانن کە عونسوری کوردی
بە زەلیلی بژیت و نامەردی
ئەوی کوردە چ گەورە چ سیغەر
ئێشەکی تورکە و گوێدرێژی قەجەر
ئەوی کوردە لە نەسلی بابادەم
دەبێ بارکێشی رۆم بێ و عەبدی عەجەم
کوردینە ئێمە هەتا کەی وا بین
نۆکەری خەڵک و بێبەش بین لە زین؟!

بۆ جارێکی دیکە روودە لاوە کوردەکان دەکاتەوە و دەردی دڵی دەردەبڕێ و بە پەرۆشەوە دەیاندوێنێ و دەڵێ نازانم قوڕی کام جێگاتان بۆ بگرمەوە و یان قوڕی کام جێتان بۆ وە سەر کەم؟ یا قوڕی کام جێتان وەسەر کەم؟ بۆ لە دەس دانی فلان وفیسار.

خۆ بۆ برایانی شۆڕشگێڕی جزیرو بۆتانێ کەوا بە داخەوە شۆڕشەکەیان لە گەڵ شکان رووبەڕوو بوو و سەرنەکەوت، قوڕ پێوان پێویستە و دەبێ هەموومان خۆمانیان بۆ لە خم دەین و بۆ ئازیزانی وان و ئەرزەڕۆمێ هەرچی خمی دنیایە دەبێ بەسەر خۆمانیدا کەین. بەو جۆرە دەڵێ:

قـــوڕی کـــام جـــێ بگـــرمەوە بۆتـــان
بـــۆ برایـــانی جزیـــر و بۆتـــان
خـــومی دنیـــا بکەیـــن بە ســـەر خۆمـــان
بـــــۆ عەزیزانـــــــی ئەرزەڕۆم و وان

ئەمجا دەکەوێتە سەرکۆنەی کوردان و بە سەریاندا دێتەوە و دڵسۆزانە سەرکۆنەیان دەکا و دەڵێ ئەنگۆ هەرچەندە هۆزێکی زۆرو خاوەنی مێژوویەکی روون و رابردوویەکی باشن، چ سوود؟ چونکە ئێوە هۆزی خۆخۆرن و هەر بۆیەش هیچتان لە دەس نایەت و ئێوە کە پێتان وایە کورد زیندوو و هۆشیارن، من لام وایە ئەو قسە وا نییە، چونکە وا بە چاوی خۆم دەبینم کە زیندوو و هۆشیار و بێدار نین. بەڵکە مردوون و بە تەواوی ژێرچەپۆکە و ژێردەستەی هەموو کەسن و ئەمجا دەڵێ خوایە ئەو گەلە ژیر و هۆشیارەی جاران کە دنیا لە ژێر پێیدا دەلەرزی بۆچی وای لێ هات؟ کە دەفەرموێ:

ئێـــــوە هەرچەنـــــد قەومێکـــــی زۆرن
فایـــدەی چـــی قەومـــی خۆخـــۆرن؟
وا دەزانـــن کە کـــوردگەل زینـــدوون
مـــن ئەبیـــنم عەلەلعومـــووم مـــردوون
وا وە ژێـــر کەوتـــوون بە بـــێ دەســـتەڵات
رەبیـــی ئەو قەومە بـــۆچی وای بەســـەر هـــات
مـــاد و ساســـان کـــورد بـــوون و ســـەلاحەددین

ئێـــوه بەو حـــاڵە قەت مەڵـــێن كـــوردین
خـــۆ قەومـــی وا ســـەركەوتوو نەبـــوو لە دنیـــادا
چ بـــوو ئەو هەمـــوو هێـــزەی بە بـــا دا؟!

دوای ئەو هەموو سكاڵا و داد و هات و هاوار و ئەو هەموو دەردی دڵ دەربـــڕین و كـــوڵی دەروون هەڵڕشـــتنە ئامـــاژە بە مێـــژووی كـوردەواری دەكـا و دەڵـێ ئـاخر خـودا بە ئەو هـۆزە بەهێـزە كە لە دەورانی سەلاحەددینی ئەییووبیدا هەموو دنیای ئیسلامی و جیهـانی موسـڵمانەتی لە ژێـر دەسـتیدا بـوو بە سـەری رادەگەیـشت و بە جوانیش رابەرایەتـی دەكـرد و، تـا مـاوەیەک سـەد و پەنجـا سـاڵی تەواو هەموو نیشتمانی موسڵمانەتی بە رابەرایەتـی سـەلاحەددین و كوڕەكانی وی، كە كوردێكی هۆزی شوانكارە بوو بەڕێوە دەبرا ئیتر هەمـوو گاورەكـانیش لە ترسـانیان نێوكیـان چووبـوو و نەترەیـان نەمـابوو. پـێش ئیـسلامیش دەوڵەتەكـانی مـاد و ساسـانی چەنـدە بەهێز بوون؟!.

بەڕێـــز جەنـــابی شـــێخ رەزای تاڵەبـــانی لەو بـــارەوە پـــارچە هەڵبەستێكی كورت و زۆر جـوانی هەیە كە لەوێدا ئامـاژە بە چەنـد رووداوی مێژوویـــی زۆر گەورە دەكـــا. یەكەم رێكـــوپێكی و دەوڵەتـــی بەهێزی سەربەخۆی بابـان، دووهەم خەم و پەژارە خـواردن بـۆ ئەو كاتە، سێهەم گیران و رزگار كردنـی شـاری بەغـدا بە هـۆی سـوپای بەهێزی سولەیمان پاشای بابان و هەروەها ئاماژە بۆسەلاحەدین و رۆژگاری وی و ترس ولەرزی فەڕەنگییەكان لە سەلاحەدین و شپرزە كردنی لەشكری والی (سنة) لە لایەن عەبدوڵڵا پاشای بابانەوە، كە دەڵێ:

لـــە بیـــرم دێ ســـولەیمانی كـــە دارولمـــولكی بابـــان بـــوو
نە مەحكوومی عەجەم، نـە سوخرەكێشی ئالی عوسمان بوو
لەبەر قـاپی سـەرا سـەفیان دەبەسـت شـێخ و مەلا و زاهیـد

مەتافی کەعبە بۆ ئەربابی حاجەت گردی سەیوان بوو
لەبەر تابووری عەسکەر ڕێ نەبوو بۆ مەجلیسی پاشا
سەدای مۆزیقەوو نەققارە تا ئەیوانی کەیوان بوو
دریغ بۆ ئەو زەمانە، ئەو دەمە ، ئەو عەسرە ، ئەو ڕۆژە
کە مەیدانی جریدبازی لە دەوری کانی ئاسکان بوو
بە زەربی حەملەیێ بەغدایی تەسخیر کرد و تێی هەڵدا
سولەیمانی زەمان ـ ڕاستت ئەوێ ـ باوکی سولەیمان بوو
عەرەب! ئینکاری فەزڵی ئێوە ناکەم ئەفزەلن ، ئەمما
سەلاحەددین کە دنیای گرت لە زومرەی کوردی بابان بوو
قوبووری پڕ لە نووری ئالی بابان پڕ لە ڕەحمەت بێ
کە بارانی کەفی ئیحسانیان وەک هەوری نیسان بوو
کە عەبدوڵڵاە پاشا لەشکری والیی سنەی شڕکرد
ڕەزا ئەو وەختە عومری پێنج و شەش تیفلی دەبستان بوو

**ڕوون کردنەوەیەک لە سەر هۆنراوەی شێخ ڕەزا**

**شێخ ڕەزا لەو تاکە هۆنراوەیدا دەڵێ:**

بە زەبری حەملەیێ بەغدای تەسخیر کرد و تێی هەڵدا
سولەیمانی زەمان، ڕاستت دەوێ باوکی سولەیمان بوو

**ڕوون نییە مەبەستی کامە سولەیمانی زەمانە کەوا باوکی سولەیمانە؟ و بەغداشی تاپۆ کردووە و هێناویەتە ژێر ڕکێفی خۆی، چونکە لە پاشایانی بابان تەنیا دوو کەس شەڕیان لەگەڵ بەغدا کردووە: یەکیان سولەیمان پاشای بابانە کە لە ساڵی ١١٧٥ کۆچی مانگیدا بە سوپایەکی زۆرەوە بە مەبەستی داگیر کردنی بەغدایە وەڕێ کەوت و لەو لاشەوە سوپای بەغدایە بەرەو پیری هات و لە دەروبەری شاری کفری پێک گەیشتن و دوای شەڕ و پێکدا**

دڵێکی زۆر، سولەیمان پاشا هەڵات و رایکرد بۆ دیوی ئێران و پەنای بردە بەر پاشای گەورەی کورد کەریم خانی زەند و ئەویش داینا لە جێگەی عەلی خانی کوڕی خۆی و کردی بە فەرمانڕەوای ئەردەڵان. سولەیمان پاشاش بە ماوەیەکی زۆر کەم بازنەی فەرمانڕەوایەتی خۆی گوشاد کردەوە و ناوچەکانی زەهاو و کفری و رانیەشی هێنایە ژێر دەسەڵاتی خۆی.

دووهەمیان مەحموود پاشای دووهەم کوڕی بەڕێز عەبدوڕەحمان پاشای بابانە کە داستانی ویش بەو جۆرەیە: ئەسعەد پاشای والی بەغدایە دەیهەوێ ئەوی لەسەر کار لابەرێ و لەو سەروبەندەشدا داوودبەگ کە لە نێزیکانی والی بووە بەخەیانەت تاوانبار دەکرێ و لە ترسی گیانی خۆی بەغدا بە جێ دێڵێ و هەڵدێ و پەنا بۆ مەحموود پاشا دێنێ. ئەسعەد پاشا چەندین جار داوا لە مەحموود پاشا دەکا کە داوود بەگی بداتەوە تا بە سزای خۆی بگەیەنێ. ئەویش هەرگیز ئەو کارە ناکا، زۆریش تووڕە دەبێ و دەڵێ ئەوە دژی خووخدەی مرۆڤایەتییە. جەنابی والیش زۆر هەڕەشەی لێ دەکا مەحموود پاشا لە ئەوپەڕی بێموبالاتیدا خۆی بۆ پەلامار دانی بەغدایە ئامادە دەکا. بە خۆی و داوودبەگ و دوازدە هەزار مەردی جەنگییەوە ڕێگەی بەغدایە دەگرێتە بەر. لەو سەردەمەشدا بە هۆی کەم بارانی و وشکەساڵی وڵاتی بابان تووشی قاتی وقڕی دێ و ئەویش ناچار لە کفرێڕا دەیهەوێ بگەڕێتەوە. شازادە محەمەد حسێن میرزا کە پێی دەزانێ لە نامەیەکدا زۆر سەرزەنشی دەکا و دەڵێ ئەگەر لە بێکەرەسەیی و تفاق دەترسی ئەوا بە ئەندازەی پێویستم هەموو شتێک بۆ ناردی. ئیتر مەحموود پاشاش دووبارە وەرێ دەکەوێتەوە و دەڕوا بەغدایە گەمارۆ دەدات و پاش ماوەیەک شارەکە دەگرێ و ئەسعەد پاشاش دەکوژێ.

جا دیارە ئەویش نە خۆی سولەیمانە و نە باوکیشی سولەیمان بووە، بەڵام وا دەردەکەوێ کە مەبەستی ئەوەیە سولەیمانی چاخی خۆی بووە و مەحموود پاشای وەک سولەیمانی پێغەمبەری مەزن چوواندووە.

بەڵێ هەر وەک هۆنەری پایەبەرزی کورد شێخ رەزای تاڵەبانی دەڵێ دنیاو بەتایبەتی جیهانی رۆژئاوا کە وا ئێستا بە هۆی پیشەسازی و یەکیەتی خۆی ئاغایەتی بە سەر هەموو جیهاندا دەکا لە ژێر سێبەری سەربازە گیانباز و پێشمەرگە لە مەرگ نەترساوەکانی کورددا دەلەرزێ. ئەورۆ بۆچی ئاوای بە سەر هاتووە و بەدبەختترینی گەلانی جیهانە و دیل و یەخسیری دەستی ئەم و ئەوە و سەرەڕای هەموو شتێکیش وڵاتەکەی دابەش کراوە و هیچی بە دەستەوە نەماوە و لە سەر ئەو حاڵەشڕا یەکتر ئەکوژن و خوێنی یەکتر ئەمژن و شیر و شمشیر لە یەک دەسوون و خەنجەریان بە خوێنی یەکتر سوور دەکەن و جا ئیتر هەر بۆیەش ئەگەر بە زگێک تێر بن، بە دووان برسین  ئیتر بەو شێوەیە کە دەڵێ:

پاشی سولْتان سەلاحی ئەییووبی
زۆر نەچوو بوو بە دەوری مەنکووبی
چ عەشیرەت چ ئەهلی شارستان
لە هەموو توول و عەرزی کوردستان
بوونە یەخسیر و نۆکەری ئەم و ئەو
باری خەڵکی دەبەن بە رۆژ و بە شەو
لە سەر ئەو حاڵەش یەکتری ئەکوژن
خوێنی یەکتر میسالی شیر ئەمژن
دەرحەقی یەک ئەوەندە زۆر ئەوەڕن

کەلەکەی یەک بە شـــیر و رمـــب ئەبـــڕن
بە زگێـــک تێـــر و بە دوو زگـــان برســـی
هـــیچ لە چـــاکە و خـــراپە ناپرســـی
جاهیـــل و بـــی‌کەمـــاڵ و شـــەرمی حـــوزوور
ئەبـــغەزی خەڵکـــی خـــوا فەقیـــر و فەخـــوور

لەو پارچە هەڵبەستەدا مامۆستای بەڕێز و خۆشەویست جارێک لە داخی ئەوەی کە هەموو کەس بۆتە کەس و کورد هەر لە جێی خۆی ماوەتەوە و هیچی بە هیچ نەکردووە و بە هیچ پلە و پایەیەک نەگەیشتووە یەخەی خۆی لە سەریڕا هەتا خواری دادەڕێ و بەرۆکی ئاواڵە دەکا و سینە مواوییە پڕ لە هەست و زانیارییە جوانەکەی کە بە بیر و باوەڕ ئاخنراوە وەدەردەخا و ناهومێدانە دەڵێ ئەمن دەمرم و بەڵام هێشتا ئێوە بە هیچ کوێ ناگەن لە ناکاوێک ئەمجا باسی هەژاری و لێقەوماوی گەلەکەی دەکا و هەر لەپڕ لەو کاتەدا ڕوو دەکاتە لاوانی نیشتمان و خودی نیشتمان و دەڵێ ئەمن تکا و نزایەک دەکەم ئێوەش لە خوای گەورە داوای قەبووڵ بوونی بکەن.

دوای ئەنجام دانی ئەو کارە و پاڕانەوەیەکی زۆر بەجێ و باش کە لە خودی پاڕانەوەکەشدا سزای ستەمکاران دیاری دەکا و لە یەزدانی مەزنی دەوێ کە چی و چییان بە سەر بێنێ، باس لە هەژاری و رووتی و بەدبەختی و رەجاڵی و بێ‌دەسەڵاتی و ستەم لێکراوی گەلەکەی دووبارە دێنێتەوە پێش و خۆی و هەموو لاوەکانی بۆ لە خەم دەدا و قوڕی بە سەر خۆیدا دەکا و دەس دەکا بە تانە و تەشەر و لۆمە و لەقەمێکی زۆر بەجێ و پێشیان دەڵێ ئێوە پێتان وایە کە بەو حاڵە زیندوون و من وا دەزانم بە تێکڕا هەمووتان

بوون، چونکە زیندوو، تەکان و جووڵانەوە و بزووتن و راپەڕینی هەیە و بەڵام خۆ ئێوە ئەو ستەم و زۆر و زیفەتان لێ دەکرێ هەر دەنگێ ناکەن! تەکانێک لە خۆتان نادەن!

ئەمجا دوای بیر هێنانەوەی مێژووی دەورانی ترووسکەدار و پڕ لە شانازی و رابردووی رووناکی و سەروەری و گەورەیی بۆیان باسی ئەوە دەکا کە لە چوارچێوەی وڵاتی پان و بەرین و دوور و درێژی کوردستان سەرکوت کراون و دیل و یەخسیرن و لەناو کۆت و زنجیرن و هەموویان لەو ژیوارە نالەبارەدا چ دێهاتی و چ شارستانی وەک یەک و هاوبەشن، بەو حاڵەش یەکتر دەکوژن و پێکەوە ناتەبا و نالێک و نامۆن کە بەڕاستی شەرم و شوورەیی و نەنگە و مایەی خەجاڵەتی و رووزەردییە و دەرحەقی یەکتر قسەی خەراپ دەکەن و دووبارە باس لە هەژاری و بەدبەختی گەلی کورد دەکاتەوە.

جا دوای ئەوانە هەموویان دەڵێ سەلاحەددینیش کورد بوو و ئێوەش کوردن!! بەڕاستی حەیفە ئێوەش بە خۆتان بڵێن ئێمەش کوردین!! کورد دەبێ وەک سەلاحەدین بێ نەک وەکوو ئێوە. ئەمجا بە کورد هەڵدەڵێ و تاریفی کوردان دەکا و دەڵێ ئەگەر حەز ئەکەی بزانی کوردایەتی چییە پێت ئەڵێم کوردایەتی بریتییە لە ژیری و ژیرۆمەندی و چوستو چالاکی و ئازایەتی و مەردایەتی و جوامێری و ئیتر هەر گەلی کوردە کە لە پیاوەتی خیرەت و شەرافەت و مەردایەتی و سەخاوەت دا لە سەروەی هەموو گەلانی دیکەی جیهانە و پێشەبڕی لە هەمووان کردووە.

کوردان خووخدە و رەوشیان وەهایە کە لاوەکانیان رێز و حورمەت بۆماک و ئەسڵی خۆ واتا بۆدایک و بابی خۆیان دادەنێن و پیرەکان دڵسۆز و ئامۆژگاری کەری لاوەکانن.

بە واتـایەکی دیـکە لاوەکـان ڕێـز و قەدری ئەسـڵی خۆیـان، کە خەبات و شۆڕشە دەگرن و دەسبەرداری نابن و خۆی لە سەر بەخت دەکەن و دیارە کە لاوەکان نەمان و خۆیان لە ڕێی خەبات و شۆڕشا لە نـاو بـرد پیرەکـان بـێ خزمەتکـار و ڕاژەوان دەمێنـنەوە و بە زەبـوونی و هەژاری دەژیـن و واش قەیـدی ناکـا و هەر دووک لایـان بەو کارە قایل و دابینن،کە واتە باپیرەکان بێ خزمەتکار بمێننەوەو لە زیللەتا بمرین.

جا هەموو لاوەکانی کورد لە سەر ئەو ئەسڵە دەڕۆن، بەتـایبەتی تازە پێگەیشتووانی فێرگەی کۆیە لەوانـی دیـکە پتـر دەبـنە پشت و پەنـای گەلـی خۆیـان و سـەرباز و پێـشمەرگەی بەوەفـا و بەوەجـی گەلی کوردی زۆر لێکراو دەبـن. بـێگومـان فێرگەیەکـی کەڵە پیـاو و بلیمەتی وەک وی فێرگەوانی بێ هەر ئەو چاوەڕوانییەی لـێ دەکرێ.

لە دوایی ڕوو لە لاوەکـان دەکـاتەوە و پێیـان دەڵـێ ئێـوە ڕۆڵەی جگەرگۆشـە و جەرگ و هەنـاوی مـنن و ئێـوە بینـایی و ڕووناکـایی گلێنەی چاومن و هیـوا و هومێـدی مـنن و تەمەنـی خۆتـان بە فیـڕۆ مەدەن، هەروا بە هەوانـتە بە بایـدا مەکەن. بەڵـکە تێکۆشـن بـۆ زانیـاری و فێـر بـوون و ئەمجـا بـۆ ئـازایەتی و مەردایەتـی و کوردایەتی.

جا مامۆستای زانـاو هێـژا کە ئەو هەمـوو مەبەسـتانەی لە یەک پارچە هەڵبەسـتدا کـۆ کـردۆتەوە، پیـاو کە تێـی دەفکـرێ لە لایەک دەڵێ ڕەنگە مامۆستا لێرەدا ئەوەندە پەرێشان و نـاڕەحەت و دڵ پـڕ قین و ڕق و پەژارە بووبێ کە بە تەواوی ئەسپی سەرکێشی بیـر و زەینـی بەربـووبێ و جـڵەوی لە دەسـتی خۆیـدا نەمـابێ بـۆیە وا کەوتۆتە سەر قسە پڕژاندن و هەر مەبەستەی لە جێیەکی هێناوە.

بەڵام لە لایەکیش کە برێک بە وردی لێی دەڕوانی و لێی ورد دەبینەوە ئەوەندە ژیرانە و زانیارییانە ئەو مەبەستانەی ئاوێتەی یەکتر کردوون کە هەرگیزاو هەرگیز پیاو بیری بۆ ئەوەی ناچێ بیرو زەینی مامۆستا پەرێشانی ڕێی بەرێتێ.

جا کەوایە دەبێ بڵێین ئەوە هەمان شتێکە کە لە زاراوەی زانیاری خۆش خوێنی (بلاغە)دا پێی دەگوترێ کەڵەکەی واتا (تداعی معانی). جا بەو جۆرە کە باس کرا مامۆستای خۆشەویست لە کۆتایی ئەو پارچە هەڵبەستە دوور و درێژەدا دەفەرموێ:

حەیفە بۆ خیرەتی سەلاحەددین
ئەو کەسانە بڵێین ئێمەش کوردین
حەز ئەکەی پێت بڵێم چییە کوردی
عاقڵی و چاپوکی و جەوانمەردی
عونسورێکی لە فەوقی جەمعی ئومەم
ساحەبی حەزم و ڕەزم و بەزم و کەرەم
لاوەکان قەدری ئەسڵی خۆ ئەگرن
پیرەکان با لە زیللەتا بمرن
خاسسە نەوباوەکانی مەکتەبی کۆ
دەبنە پشت و پەناهی میللەتی تۆ
ئێوە ئەولاد و جەرگ و هەناوی منن
ئێوە نووری گلێنەی چاوی منن
عومری خۆتان مەبەن بە خۆڕایی
تێ بکۆشن بە عیلم و ئازایی

# کورتەیەک لەژیانی سەرداری موسلمانی کورد سەلاحەددینی ئە یپوبی

شورەسواری کورد سەلاحەددینی ئەییوبی

پێم خۆشە لێرەدا کەمێک باسی سەلاحەددینی ئەییوبی، رۆڵەی هەڵکەوتووی کورد بکەم و تا رادەیەکی زۆر کەم لەو قارەمانە موسڵمانە کوردە بدوێم.

ئەو بەڕێزە کوڕی کوردێک بە نێوی نەجمەدین ئەییووب کوڕی شادی کوڕی مەروانە. لە تیرەی "رەوادی" لە شاری "دوێن" پێتەختی میری شەداد لە ناوچەی ئارانی ئازەربایجاندا نیشتەجێ بوون. رەوادی لکێکە لە تیرەی هەزبانی.

لە سەردەمی سەلجووقییەکان ناوچەکەیان لە لایان وانەوە داگیر دەکرێ و زۆریان پەڕیوەی ئەندەران دەبن. شادی باپیری سەلاحەدینیش بە هۆی ئەوە کە دۆستایەتی لەگەڵ والی بەغدا موجاهیدەدین بیهروزدا هەبووە، بیهروز کەسێکی بە دوای ویدا ناردو بردی بۆ لای خۆی و ئەمجا سوڵتان مەسعوود هەرێمی تکریتی بە مڵکایەتی دا بە موجاهیدەدین. ئەویش دۆستی بەڕێزی خۆی شادی لە سەر دانا و قەڵاتی تکریتی دەبەر دەستی وی نا.

جا بەو جۆرە شادی لەوێ ماوەتەوە تا کۆچی دوایی کردووە. دوای کۆچی شادی کوڕە گەورەکەی نەجمەدین ئەییووب لە جێی وی دانراوە و نەجمەدین شێرکۆی براشی کراوەتە راوێژگەر و هاوکار و یاریدەدەری.

ڕۆژێک ئەفسەرێکی قەڵاتی تکریت تەمایە لە ژنێک دەکاو ژنەکەش پەنا دەباتە بەر شێرکۆ و ئەویش نایکاتە نامەردی ئەفسەرەکە دەکوژێ. موجاهیدەدین بیهروزیش لە سەر ئەو کارە شێرکۆ لە وەکیل دەخا و داوایان لێ دەکا کە تکریت بەجێ بێڵن.

بەڵێ نەجمەدین و شێرکۆ ناچاردەبن بەشەو تکریت بەجێ بێڵن و بڕۆن بۆ لای عیمادەدین زەنگی لە موسڵ. جا دروست لەو شەوەدا کە ئەوان خەریک بوون باروبنەیان دەپێچاوە و هەڵدەهاتن لە تکریت، بەڕێز سەلاحەدین لە دایک بوو و ناچار بوون مەلۆتکەی نەبووژاوە و ئیشک نەکراوە بپێچنەوە و بەرەو موسڵ وەڕێ کەون و لە ڕێکەوتی ساڵی ٥٣٢ی کۆچی (١١٣٧زایینی) باب و مامی سەلاحەدین لە سەر شەرەف و مەردانەگی کۆچیان کرد و سەلاحەدین ئەو مەلۆتکە بێتاوانەش لە سەر شەرافەت و پیاوەتی باب و مام و بنەماڵەی خۆی لە هەوەڵین سات و کاتی ژیانیدا کەوتە کۆچ و هەڵاتن و ڕەوین.

ڕاستی جێگەی سەرنجە، کە سەلاحەددین لە هەوەڵین ساتی ژیانیدا لە سەر شەرافەت و مەردایەتی و ئایین و ئیسلامەتی ناچاری کۆچ کردن و ڕەوین بووە.

بەڕێز عیمادەدینی زەنگی پێشوازییەکی شایان و گەرمیان لێ دەکا و زۆریان بەخێردێنێ، چونکە لە ڕاستیدا ئەوانیش جارێکی عیمادەدینیان لە کوژران ڕزگار کردبوو. کاتێک لە ساڵی ١١٢٥ی زایینیدا لەگەڵ سەلجووقییەکان بە شەڕ هات و پێیان نەوێرا و شکانێکی گەورەی بەسەردا هات ئەو هەڵمەتی بردە سەر بەغدایە و بە خەراپی ناچار بە هەڵاتن و پاشەکشە بوو و ناچار دەبوو بە تکریتدا تێبپەڕێ و بەو جۆرە کەوتە بەر دەستی نەحمەدەدین ئەییوب و ئەسەدەدین شێرکۆ.

ئەوانیش هەروەک خووخدەی هەمیشەیی کوردان چاکەیان لەگەڵ کرد و ڕێگەی دەرباز بوونیان بۆ پانتاو کرد و تا گەیشتەوە موسڵ هاوکاری پێویستیان کرد.

پاش ماوەیەک عیمادەدین، نەجمەدین ئەییووب دەکا بە والی شاری بەعلەبەک. سەلاحەدین دەورانی منداڵی خۆی لەو شارە تێپەڕ کردووە و لەو ماوەدا خوێندنی سەرەتایی و قورئان و هێندێک لە کتێبە زانیارییەکانی خوێندووە و تا رادەیەکی تەواویش فێری جەنگ و جیهاد و خەباتکاری بووە و سەری لە رامیاریش دەرهێناوە.

لەو ماوەدا بە هۆی پیلانێکی ناجوامێرانە عیمادەدین شەهید دەکرێ و نوورەدین مەحموودی کوڕی لە شامێ لە جێی وی دادەندرێ. نەجمەدین و ئەسەدەدینیش دەچنە لای و پشتیوانی خۆیانی لێ دەردەبڕن. نوورەدین مەحموود، شێرکۆی کردە فەرماندەی سوپا و فەرمانداری شاری (صیموس) نەجمەدین بە قازانجی یەکێک لە کوڕەکانی عیمادەدین وازی لە فەرمانڕەوایەتی شاری بەعلەبەک هێنا و داوای کرد کە ڕێگەی بدرێ لە دیمەشقدا نیشتەجێ ببێ بەو کردەوە،ئەوەندە لەلای نوورەدین خۆشەویست و ڕێزدار ببوو کە جگە لەوی هیچ کەس بە بێ ودمی خۆی نەیدەتوانی بچێتە لای نوورەدین.

سەلاحەدین وەک فەقێیەک و خوێندکارێکی ئایینی دەستی پێ بە خوێندن کراوە و لە قوژبنی حوجرە و فێرگە ئایینییەکان و ناو ژووری مزگەوتاندا خوێندنی خۆی درێژە پێداوە.

لە خزمەت چەندین زانای وەک ئەبووتاهیری سەلەفی، ئەبوو تاهیری کوڕی عەوف، شێخ قوتبەدین نەیشابووری و عەبدوڵلا ئەلنەحوی وانەی قورئان و حەدیسی خوێندووە. لە زانیاری دێژە

(فقه)دا دەستێکی باڵای هەبووە و خۆی دیژەوانێکی بەرزی خاوەن را بووە. تەواوی قورئانی پیرۆزی لەبەر بووە. زۆریش حەزی لە هەڵبەست و هۆنراوە کردووە.

یەکێک لە مامۆستاکانی سەلاحەددین، عەبدوڵلا کوڕی ئەبوو عەسرونە کە زانایەکی بەناوبانگی ئەو سەردەمی جیهانی ئیسلام و سەرۆکی دادگەران (قاضی القضاه) بووە جەزیرەییە بووە. کاتێک ئەو پیاوە گەورە پیرو کوێر بووەو سەلاحەدین وەک کوڕێکی چاک و شاگردێکی بەئەمەگ دەیباتە لای خۆی و تا مردن خزمەتی دەکا.

سەلاحەددین کاتێک کە لە ساڵی ٥٦٤ کۆچی (١١٦٩زایینی) شێرکۆی مامی کە ئەو کاتە وەزیری مەلیک (عضد) بوو، تەنیا دوای دوو مانگ وەزیری کۆچی دوایی کرد، ئەو کرا بە وەزیر و لە جێی مامی خۆشەویستی خۆی دانرا. ئەو کاتە تەمەنی ٣٢ ساڵ بوو. دەستی کرد بە ئاوەدان کاری و ڕێکوپێک کردنی شیرازەی وڵات و گەلێک نەخۆشخانە و خوێندنگای دروست کرد و تەنانەت دوو فێرگەی گەورەی بە نێوی (الناصریه و الکاملیه) بۆ موسڵمانانی شافعی مەزهەب ساز کردووە و سەرەنجام تەواوی وڵاتی میسر و ئەم لا و لاش کەوتە ژێر دەستی. بەهائەدین قەرەقوش کە پیاوێکی کوردی ئازا و نەبەز و لێزان و دۆستی دڵسۆزی خۆی بووە کردوویەتە فەرماندەی کۆشک و تەلاری خەلافەت.

لە ساڵی ٥٦٧ی کۆچی مانگی (١١٧١زایینی) مەلیک عاضید کۆچی دوایی کرد و کۆتایی بە خەلافەتی زنجیرەی فاتیمیان هات. سەلاحەددین کە لە لایەن نوورەدینی زەنگییەوە هاتبوو بۆ کۆمەک و هاوکاری مەلیک عاضید، دوای مردنی ئەو لە جێگەکەی دانیشت و بەڵام سەربەخۆیی خۆی ڕانەگەیاند و هەر بە نێوی نوورەدینەوە سکەی لێدا و لە مزگەوتەکاندا بە نێوی وی وتار ئەدرا.

لەو ماوەدا سوڵتان سەلاحەدین رۆژ لەدوای رۆژ پتر بەهێز دەبوو کارو باری وڵاتی میسر رێکوپێکتر دەکرد، بەڵام نورەددین نەخۆش کەوت و لەرێکەوتی۱۱ی شەواڵی۵٦۹ کۆچیدا کۆچی دوایی کرد.

ئەمجا سەلاحەدین وەخۆ کەوت و بە سوپا رێکوپێکەکەی خۆی دەستی کرد بە ئازاد کردنی وڵات و شارەکانی ئیسلامی و لە ماوەیەکی کەمدا توانی تەواوی تەرابلوسی رۆژئاوا و قابس و تونس و شام و باکووری عێراق هەتا دەگاتەوە موسڵ بخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوە و ئەمجا یەمەنیشی رزگار کرد و تورانشای برای کردە فەرمانڕەوای ئەوێ.

لە رۆژی هەینی ۲۷ی رەجەبی ساڵی ۵۷۳ی کۆچی مانگیدا شاری قودسی رزگار کرد و یەکەمین نوێژی هەینی بە پێشنوێژی قازی محێدین زەکی بە نێوی سەلاحەدینەوە خوێندرا و بەڕێوە برا.

دوای ئەوە سەلاحەدین رۆژ لە دوای رۆژ سەرکەوتنی گەورە و گەورەتری وەدەس دەخست و سەرەنجام بوو بە خەلیفەیەکی هەرە گەورەی ئیسلامی و تا دوا هەناسەی ژیانی پڕ لە شانازی لە رێی ئیسلام و سەرکەوتنی ئیسلامدا تاوێک تکی نەدا.

ئەو بەڕێزە پیرۆزە هەڵکەوتووەی کورد لە رۆژی چوارشەممە۲۷ی سەفەری ۵۸۹ی کۆچی مانگی چاوە جوانەکانی لە سەرێک داناون و بە داخەوە هەڵینەهێناونەوە.

ئەو هۆنراوەم لە هۆنەرێکی ئازەری بە نێوی بەیتوڵڵا جەعفەری بیست کە دەڵێ:

بدی از دشمن و خوبی ز کرد است
بدان را خزی و سرکوبی ز کرد است
به دست کرد قدس آزاد گردید

صـــلاح الـــدین ایـــوبی ز کـــرد اســـت
تـــرا گـــرد دلاور خـــواهم ای کـــرد
تـــرا عـــازم به ســـنگر خـــواهم ای کـــرد
ز نـــسل تـــو پـــی آزادی قـــدس
صـــلاح الـــدین دیگـــر خـــواهم ای کـــرد

**هـۆنەری پـایە بەرز و دڵـسووتاوی کـوردیش مامۆسـتا قـانیع دەفەرموێ:**

تـۆ نەمـردووی ئەی سـەلاحەددینی ئەییـووبی لەقەب
هەربژی ئەی فەخری کورد و حاکمی مـوڵکی عەرەب
تـاکوو تـۆ بـووی لاوەکـانی کوردسـتانم دەرئەچـوون
بـۆ زەکـاتی میـسر و شـام و خەرجـی بـازاڕی حەڵەب

# بۆ ئاگاداری و هۆشیاری لاوان

مامۆستای هێژا و خوانـاس و خـزمخـواز و تەکپەرست و هەق مەبەست، کاتێک کە دەبینێ جگە لە خورافات و پڕوپووچ پەرستی و خەیاڵی خاو و خەونی هاتەران چیدیکە لە نێو کوردانـدا نیە و بە قـسەی گەنـدەڵە شـێخ و کـۆلکە مەلایـان باوەڕیـان بە شـتی وەک جرجاڵ و کەرە گوێ پانەکەی پەیدا کـردووە و پێیـان وایە کە عیـسا وا لە عاسـمانانە و نەمـردووە و دوایە دێـتەوە خـوارێ و جەنـابی مەهدیش کە گۆیا چەند سەد ساڵە وا لە چاڵاوی قووڵی سامەڕادا مـاوەتەوە و لەوێـدا دەژی، سـەر لەو چـاڵاوە دەردێنـێ و لە گەڵیـا دەبێ بە هاوکار و وێکڕا دەچـن بـۆ مەیـدانی خەبـات و تێکۆشـان و دنیایە پانتاو دەکەن و تا ئەو کاتی دەبێ خەڵک دەس لە سەر دەس دابنێن و بێدەنگ دانیـشن، چـونکە ئەوان جەنـگ لە گەڵ جرجـاڵ و عەبدی سۆفیان دەکەن و ئیتر ئەو دەم دنیا دەبێتە دنیای ئیـسلام و برایەتی و ئاشتی و گورگ و مەڕ پێکەوە ئاوێ دەخۆنەوە و مشک و پشیلە لە کونێکدا دەژین. جـا ئەگەر وابـێ کـورد و کـورد خـۆرانیش دەس لە ناو دەس پیاسە دەکەن!!

جا بۆ ئەو بیـر و بـاوەڕە دوور لە ئیـسلامییەش چیـها داسـتان و بەیت و باڵۆرە و بە قسەی خۆیان حەدیسیشیان ساز کردووە و(قال النبی و قوله و حدثنا و عن و عـن)ی زۆریـان لەو بـارەوە بـۆ تێـک خستوونەتەوەو بە خەون و خەیاڵ هەموو ڕێگەیەکـی پێشکەوتن و ناسینی ئیسلامی ڕاستەقینەیان لێ گرتوون و زانیاری و پیشەسازی لە نێو کوردانـدا بۆتە شتێکی بێنرخ و بایەخ و سووک و چـرووک و نەزانراوو و نەناسراو و بێبایخ و بێباوە!!

جـا بە تـایبەتی زانیارییەکـانی فیزیکـی و کیمیـاوی کە لە رووی وانڕا هەموو جۆرە ئاویتە و ئالیاژ و پیشەسازییەک دەزانـرێ و بە کورتی بڵێین هۆی پێشکەوتنی هەر گەل و هۆزێکە و.. جـا لە بـاتی هەموو فێر و زانست و زانیارییەک دەفە لێدان و دمبەگ و دەهـۆڵ و زوڕنا و هەڵپەڕین و سەما یـان فێـری کـوردان کـردووە. کە دیـارە ئاکام و بەرهەمی ئەو دامودەزگایەش هەر ئەوە بـووە و هەر ئەوەش دەبێ و نابێ هیچ چاوەڕوانییەکی دیکەی لێ بگرێ.

زۆر سـەیر و سـەر سـووڕهێنەرە، کە سـەدان سـاڵە ئەو جـۆرە بەرنامانە لە گوڕێدان و جگە لە دوورکەوتنەوە لە زانین و زانست و ئـایینی راسـتەقینە و هـونەر و پیـشەسازی بەرهەم و ئاکـامێکی دیکەیان نەبووە کەچی نازانم خەڵک بۆچی وا پێیەوە نووساون و دوای دەکەون؟

مامۆستای دڵ بە کوڵ و دەروون پڕ تاسە لەو پارچە هەڵبەستەی خۆیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکا کە شیر لە گوانی ئاژەڵ و مەمکی مرۆڤدا کە لەو ئـاوە، کە دەیخـۆنەوە و لە خـواردەمەنییەک کە دەیخـۆن، پەیدا دەبێ و هەروەها پەنیر، کە لە شیرەو بەهۆی هەوێن دەمەیێ و ژاژی یا شیرێژ کە ئەویش هەر لە شیرە و دوای ئەوە کە رۆنەکەی لێ گیراو کوڵێنرایەوە، دەگیرێ، یان دۆشاو، کە لە ئـاوی تـرێ و ئاوێتەی گڵی سپی پەیدا دەبێ و یـا کـاردوی تیـژ کە وەکوو کێـردی تیژ وایە، تیژاییەکەی بەترشی دەڕوا هەروەها هەزاران شتی سـادەو سـاکاری دیـکەش ئاکـامی زانیـاری کیمیـاییە و بەڵام ئێـوە لەو زانیارییە بێبەش و بەهرەن.

ئەمجا ئاماژە دەکا بۆ ئەوە کە لە پێشدا زانیـارییەکی زۆرگەورە لە نێو کوردان هەبووە بەڵام بە قسەی پڕوپووچی شێخ و شـۆفاران لە دەستیان داو لەبـاتی هەمـوو زانیـاری و پیـشەسازی و ناسـینی

خواو ئایاتی خوا دەف و دمبەگ لێدەدەن و سەما و هەڵپەڕکێ دەکەن.

ڕیزدارمامۆستا گیوی موکریانی دەفەرمۆێ: مەلای گەورەنەک تەنها بەسەر زانیارییە کۆن ونوێیەکاندا ئاگادار بووە و بەس بەڵکو بەسەر پێشکەوتنی زانیازی یە کۆمەلایەتیە پیشکەوتووەکانیشدا شارەزا و لایەنگیریشیان بووە و لەناو وانەکان(درس)یشی داباسی زانیارییە کانی کۆن و تازەی دەکرد

وەک رون ولەبەرچاوە ئەو زانا زۆر زانایە و ئەم د انا بێ هاوتایە سەرۆکی زانایانی کوردستان، موفتی کۆیە ؛ قازی کۆیە ؛ مەلای گەورەوگەورەی زانایان بووە. لەساڵی ١٣٣٤زایینی بۆتە نوینەری هەریمی موسل و یەکەم هەنگاوی ئەوە بووە، کە داوای چارەسەری مەسەلەی کوردی کردووە و دوهەم داوای لەدەوڵەتی ناوە ندی ئەوە بووە، کە لەشاری کۆیە فیرگەیەکی گەورە بکریتەوەو خۆشی پارچە زەمینیکی باشی لە پەنامزگەوتی گەورە بۆ ئەو فیرگەیە پیشکەش کردووە و هەر لەویش ئەوفیرگەیە سازکراوە.

دیسان مامۆستا گیو دە لاپەرەی ٨٠ واتا دوامین لاپەڕە لە دیاری مە لای کۆیی د ا دەفەرموی : چەند جار پەخش کردنی ئەم دیوانە، کە پڕە لە ئاموژگاری ڕاست و پاکترین بیرو باوەری ئاسمانی زانایە کیواناو دارو گەورە و سەر بڵیند ودڵسوزی کورد و کوردستان؛ بەمایە بیەختەوەری خۆمای دەزانم وشانازی پیوەدەکەم.

دوبارە مامۆستا گیوی موکریانی لە فەرهەنگی مەهاباد، لاپەڕەی ٧٧١ و ٧٧٢ دەگێڕێتەوە کە ئەحمەدی کوڕی نەبەتی لە پەڕتووکی "شوق المستهام فی معرفه رموز الاقلام"دا لە ساڵی ٢٤١ کۆچیدا

نووسیویەتی و دەڵێ لە بەغدا چاوم بە سێ بەرگ کتێبی کوردی کەوت (کە دیارە لەمەڕ زانیارییەکانی جۆراوجۆری رۆژەوە بوون) و ئێستاش لە شامی دوو بەرگم لەوانە هەر لە لایە و یەکیان باسی پەروەردە کردن و چەقاندنی دارە خورمایان دەکا و ئەوی دیشیان لەبارەی دۆزینەوەی ئاو لە ژێر زەوی و جێگای ئیشکارۆ دەکا و ئەوانم وەرگێڕاونە سەر زمانی عەرەبی بۆ ئەوەی هەموو کەس کەڵکیان لێ وەرگرێ.

هەروەها مامۆستا گیودە لاپەڕەی ٧٧٣ی فەرهەنگی مەهابادد ا دەڵێ: لە دەورانی حەجاجی کوڕی یۆسفدا تەواوی دیوانەکانی میری لە ژێر چاوەدێری کوردێکدا بوو کە ناوی زادان فەڕوخ بوو. ژێردەستی نووسەرەکانیش سالحی کوڕی عەبدوڕەحمان ناوێک بوو.

لە رووی ئەوەوە کە سالح لە لای حەجاجی رێزی لێ نەدەگیراو پێشی شەرم بوو، کە لە ژێر دەستی زادان فەڕوخیدا بژی دەماری توند بوو. رۆژێکی بە زادانی گوت ئەمیر بۆیە رێزم ناگرێ چونکە بە هۆی تۆوە دەمناسێ و ناشمهەوێ بگەمە پایەیەکی کە لە تۆ بەرزتر بێ و پێشت بکەوم.

بە کورتی بڵێین زادان فەڕوخ کە پیاوێکی کوردی نیشتمانپەروەر بوو پێی گوت دڵی خۆت بەو جۆرە شتانەوە سەخڵەت مەکە، خۆ ئەمیر پتر بە من ئاتاجە تا من بەو، چونکە تەواو ئەو یاسا و نامەو نامیلکانە کە لەبارەی کاروباری دەوڵەتین بە کوردین و هەر من دەتوانم بەو جۆرە لە رووی کوردییەکەوە بە عەرەبی کاری دەوڵەت هەڵسووڕێنم.

سالح گوتی ئەوەی تۆ دەیکەی منیش دەتوانم و تەنانەت لە دەستم دێ، هەمووشیان وەرگێڕمە سەر زمانی عەرەبی و ئیتر دوای

تاقی کردنەوەیەکی چووکەلە زادان فەڕوخ ئەو کارەی لێ قەدەغە کرد و پێی گوت نابێ وەها کارێک بکات، بەڵام ئەو قسەیە بە گوێی حەجاجی دەگاتەوە و ئەویش کە دیارە دژمنێکی سەرەکی گەلی کورد بووە لە شەڕێکدا بە نێوی شەڕی (ابن اشعث) زادان فەڕوخیان بە کوشت دا و ئەمجا سالحیان لە جێگەی وی دانا و دەستووری پێدا کە هەموو دەفتەر و یاسا و نامە و نامیلکە رەسمییەکانی دەوڵەت لە کوردییەوە وەرگێڕێتە سەر عەرەبی. لە دواییدا مەردان شای کوڕی زادان فەڕوخ گەلێک هەوڵ و تەقەلای لە گەڵ سالح دا کە پەشیمانی کاتەوە و بەر لەو کارەی بگرێ، بەڵام ناتوانێ لە هەر لایەکی نیشتمانی گەورەی کوردەوە کوردەکان هەوڵیان داوە بۆ بەرگری کردنی ئەو کارە و بە داخەوە نەیانتوانیوە.

زێڕینگەرێک لە شاری سەردەشتێڕا دەچێتە لای و داوای لێدەکا کە لە لای حەجاج بڵێ ناتوانم ئەوکارە بکەم وئیترئەوەندەی کە حەجاج لە ماوەی بیست ساڵاندا دەتداتێ من سەد ئەوەندەت دەدەمێ و هەر ئێستاش باتمانێکت زێڕی بێخڵتە پێشکەش دەکەم.

بەڵام هەمووئەو هەوڵ و تەقەلایانە بێکەڵک بوون و هیچیان بە ئاکام نەگەیون.

جا لێرەدا مەبەستم لە ئاماژەی مامۆستایە کە د ە فەرموێ کورد هەرئاوا نەزان نەبووە وبەڵکە زانیارییەکی گەورەیان لە نێو بووە و بە قسەی پڕوپووچ هەموویان لە کیس چووە.

ئەوەتا دەبینین لە ساڵی ٢٤١ی کۆچیدا ئەحمەدی نەبەتی چ دەڵێ لە بارەی زانیاری کوردان داویان دوای ویش لە دەورانی حەجاجی کوڕی یوسفدا تەنانەت هەموو یاسا وریسا ودام و دەستوورو بگرە سکە لێدانیش هەربە زمانی کوردی بووە و ئیتر دەیان و سەدان نموونەی تریش لەم چەشن ووێنەیە هەن.

ـ پاشان مامۆستا روو لە گەلى كورد دەكا و دەلێ:

بــە خــوا زۆر حــەيفــە، حــەيف و مــوخــابــن
مــيـلــلەتــى كــــورد ان هــــەتـا كـەى وا بن؟
جــــە هـــالــــە ت بــــروا دە ورە ى عـــيرفـانــە
كـــونـــــە بــــا بــــــروا نـــورە ى كــــورانــە
ئــە ى لاوى كــــوردى نـــورى دو چــــــاوم
قـــــووە تـــى د لــم و جــــە رگ وهــــە نــاوم
بـــــاوانـــى بـــاوم نــــە و خـــاوان مــە كـتـە ب
بــە عـــە قـل وعـيرفــان ، بــە عيلم وئە دە ب
بــە ئــە خــلاقــى چــاک ، بــە د يــن وئيمان
بـــــە ريــک وپــيـکـــى وە کـــــو بـــرايـــــان
لـــە گـــە ل يـــەكـتـرى وە ک رو ح وبــەدەن
ئيمتيــــزاج بکـــە ن بـــو عيـــززى وە تـــە ن

وەک دەبينـين بێـزارى خـۆى لە نەزانـى دەردەبڕێ و دەڵـێ بـا نەزانى بڕوا و ئێستا نـۆرەى زانيـارى ورۆڵەى زانـا و ئـازايە. كـە دەبى بەهێز ووزەى زانيارى هەمو پيسير و ئاستەنگێک شيتەڵ بكا.

جەهــــــالەت بـــــڕوا، نــــۆرەى عيرفـــــانە
كــــۆنە بــــا بـــــڕوا نــــۆرەى كــــوڕانە

پاشان جارێكى ديكەش روو لە لاوانى كورد دەكاتەوە و دواى خۆ نێزيک كردنەوە و دواى ئەوەى كە بە بينايى چاوى خۆيان دادەنێ و بە هێــــزى دڵ و جەرگ و هەنـــــاوى خۆيـــــان لە پێنــــووس دەدا رێوشـوێنێكى بـاش و جـوان و موسـڵمانانەيان بـۆ دادەمەزرێنـێ و پێيـان دەڵـێ كە دەبـێ ئێـوە ژيـرانە و زانايـانە و خواناسـانە و بە

ئەدەب و شێواز و خووخدەیەکی زۆر چاک و رەوشێکی زۆر پاک و هەبێ و بەدین و ئیمان وبیر و باوەڕ بن و بە رێکوپێکی و وەک برایان زۆر بە تەبایی یەک بگرن و پشتیوانی یەکتر بن و دەست لە ناو دەست و قەوەت لە خوا بۆ سەربەرزی و سەربەخۆیی نیشتمان تێکۆشن. ئەمجا پێیان دەڵێ ئێوە بۆ وڵات هەمووتان رۆڵەی پشت و جگەرگۆشەن، یا خوای گەورە سەرکەوتووتان کا.

لای من ئێوە لەگەڵ مەسعوودی کوڕم جیاوازیتان نییە و بە قەرا ویم خۆش دەوێن و من کە جیاوازی لە نێوان کوڕ و برازاکانمدا دانانێم و مەجید و سەلاح کە برازامن و مەسعوود کوڕمە و ئێوەش وەکوو وان چاو لێ دەکەم باوەڕم پێ بکەن کە دڵم بۆ ئێوە شپڕێوی حاڵی ئێوە لەبەر نەزانی و لە دەسدانی زانیاری بە کوڵە. ئیتر بەو جۆرە ئەو جارەش کوڵی دڵی خۆی دەردەبڕێ و دەڵێ:

## بۆ ئاگاداری و هۆشیاری لاوان

هەستە پێش کەوە ئەی لاوی کوردی
ئاگات لە خۆ بێ کاروان رابردی
بە نووری عیلم رێگا بە دەر خە
بە زۆری باسک کاری بە سەر خە
میسالی عیلم بفڕە وەک تەیران
بە هێزی عیلم هەڕۆ بن بەحران
عیلمی حیکایەت گەر کەڵکی هەبا
دەبوایە دنیا هەموو بۆ مە با
عیلمی کیمیات گەر نەخوێندووە
بە خوا نازانی خوا چی کردووە؟
ئێمە پابەندی وەهم و خەیاڵین

ئـــــێمە خەریکــــــی کەری جرجـــــاڵین
عیلمــــــی ســـــەنایع لای ئـــــێمە نیـــیە
گەر چـــــشتێک هەیە ئەویـــــش قەولیـــیە
پەنیــــــر و ژاژی شـــــیر و هەم لـــــۆرک
نەتـــیجەی عیلمــــی کیمیـــایە بـــێشـــک
بە گڵـــــــی ســــپی و بە ئـــــاوی تـــــرێ
دۆشـــاوی شــیرین چـــۆن دروســـت دەکـــرێ
کـــاردۆی وەکـــوو کێـــرد زبانـــت دەبـــڕێ
بە ترشـــی و ســـماق ژەهـــری چـــۆن دەبـــڕێ
عیلمێکــــی گەورە لە نێـــو کـــوردا بـــوو
بە قـــسەی پڕوپـــووچ لە کیـــسمان چـــوو
بە دەف و دمـــــبەگ، بە ڕەقـــــس و ســــەما
عـــیلم و مەعـــریفەت لای کـــوردان نەمـــا
بە خـــوا زۆر حەیـــف، حەیـــف و موخـــابن
میللەتـــی کـــوردان هەتـــا کەی وا بـــن
جەهـــــالەت بــــڕوا دەورەی عیرفـــانە
کـــۆنە بـــا بـــڕوا نـــۆرەی کـــوڕانە
ئەی لاوی کـــوردی نـــووری دوو چـــاوم
قـــــووەتی دڵـــــم، جەرگ و هەنـــاوم
بـــاوانی بـــابم، نەوخـــاوان مەکـــتەب
بە عەقـــڵ و عیرفـــان، بە عـــیلم و ئەدەب
بە ئەخلاقـــی چـــاک، بە دیـــن و ئیمـــان
بە ڕێکـــــوپێکی وەکـــــوو برایـــــان
لەگەڵ یەکتـــــــــــری وەک ڕوح و بەدەن
ئیمتیـــزاج بـــکەن بـــۆ عیـــززی وەتەن

ئێـــــوە بـــــۆ مەوتەن ئەولادی ســــــولبی
خــــودا تۆفیقتـــــان بــــدا یــــا رەببـــــی
هـــیچ فەرقـــو نــــاکەم لە گەڵ مەســــعوودی
خــــوا بوپــــارێزێ لە چنــــگ حەســــوودی
مەجیــــد و ســــەلاح لای مـــن وەک ئێـــوەن
ئێــــوەش بــــرازان پــــێم بــــاوەڕ بــــکەن

ماموٚستای خۆشەویست لێرەدا پێمان دەفەرموێ کە زانیاری و زانست کۆمەڵی مرۆڤ سەردەخا و مرۆڤ بە هۆی زانیاری بەتایبەتی زانیاری سروشتی دەتوانێ بفڕێ وەک مەل و بڕواتە سەرێ و کوراتی ئاسمانێ بخاتە ژێر پێی خۆی و هەروەها بچێتە ژێر دەریایان و بنی ئەقیانووسەکان راو بکا.

ئەمجا پێمان دەڵێ: خۆ ئێمە لە بەیت و بالۆرە و داستان دا دەستێکی باڵامان هەیە و بێوێنە و نموونەین لە سەر رووی زەمین، جا ئەگەر ئەوە کەڵکی هەبایە دەبوو تەواوی دنیا هی ئێمە بایە، ئەدی بۆچی هیچمان نییە؟ ئێمە هەر خەریکی وەهم و خەیاڵ و بەیت وباو و دەمەتەقە و داستان و حیکایەتین و خۆمان بە بیری کەری جرجاڵییەوە خەریک دەکەین و بە شتی پڕوپووچەوە مێشکی خۆمان داغان کردووە و ئیش و پژگاڵ و پیشەسازیمان وەلا ناوە و هیچمان لە نێو نەماوە و ئەوەی ماویشە هەر قسەیە و بەس، خۆ ئیتر قسەش ناچێتە ناو گیرفانەوە!

## شۆڕەژن

داستانی شۆڕەژن کە مامۆستای دڵسۆزمان بە هۆنراوە دەریهێناوە یەکێکە لەو هەزاران داستان و بەسەرهاتانە کە لەو بارەوە لە ڕۆژگارانی ڕابردوودا ڕوویان داوە و بە جوانی ڕووی دزێوی ژوورەوەی شێخەکان دەردەخەن.

مامۆستا قانعیش - خوا لێی خۆش بێ - داستانێکی چووکەڵەی لەو بارەوە بە هۆنراوە دەرهێناوە:

## دەروێش

دوێنێ دەروێشێ وتی کەف بەدەف و دەف بەتەرەب
دەبە دەب دەب!! دەبە دەب دەب!! دەبە دەب دەب
وتم ئەی ئەحمەقی ئاشوفتە وڵات چۆڵە وتی:
دەبە دەب دەب!! دەبە دەب دەب!! دەبە دەب دەب
هەرچی هەوڵم لەگەڵ ئەو ئەحمەقە دا هەر ئەیوت
دەبە دەب دەب !! دەبە دەب دەب!! دەبە دەب دەب
وتم وا چاکە لە فیکری خۆیەوە بۆی دەربێم
بە مرووری گەلی ئەییام لە ناو بەم دەبە دەب
دەفم هەڵگرت و بەحەی حەی دەسی شێخم ماچ کرد
وتم لێدەن بە عوموومی لە مقامی دەبە دەب
من و دەروێش و ژن و شێخ هەموو تێکەڵ بووین
شێخ لە فکری ڕەپی سوورو من و دەروێش دەبە دەب

قانیعا بەسیە موحەققەق بە دووسەد وەک من و تۆ
تەرک ناکەن بە یەکێ بەزم و مقامی دەبە دەب

جا بەهەر حاڵ مامۆستا گیو لە بارەی داستانی شۆڕەژندا ئاوا دەنووسێ: «ئەو هەڵبەستە بەو بۆنەوە دانراوە کە شێخێک دەیهەویست بچێ بۆ حەجێ و پارەشی نابێ. مریدێکی دەوڵەمەندی خۆی پارەی تەواوی دەداتێ. خێزانی مریدەکەش زۆری لە مێردەکەی دەکا کە بە خۆی و کچە عازەبەکەیەوە لەگەڵ شێخیان بخات بۆ حەجێ. چونکە جێی ترس نییە و پیاوی خودایە. کابراش ناچار دەبێ پارەی هەر سێکیان دەدا بە شێخی و ڕەوانەیان دەکات.

ئیتر حەزرەتی شێخ هەر لە موسڵەوە شەیتان دەچێتە کلێشەیەوەو تا دەگەڕێتەوە هەردووکیان ئاوس دەبن!! شێخی ناپاک دایک و کچەکە ڕەوانە دەکاتەوە و بۆ خۆشی خۆی لە تەویلەی ماڵی مەلای ئەفەندی دەهاوێو تا چەند ڕۆژان نایەتە دەرەوە. بەهەشتی مەلا ئەفەندیش لە بەر دەرکییەوە بانگی دەکاتە دەرەوە و تفێکی لە چارەی دەکات و دەفەرموێ: سەگباب تۆ ناموسی ئاییني ئیسلامت برد، لەبەر ئەوەی کە پەنات بۆ ئێرە هێناوە بە دەس دەوڵەتێتەوە نادەم. بەڵام بڕۆ هەر لە ئێستاوە لێرە نەمێنی»

وا دیارە ئەو کابرا کەر و هەژار و خۆشباوەڕە ناوی "عەلی فەتحی" بووبێ و بۆیە مامۆستا دەفەرموێ ڕوو بە شۆڕەژنی بە چ ڕوو دەچییەوە لای ئالییەفەتی؟ واتا ئەی شۆڕەژن ئەتۆ و کچەکەت کاتێ وەڕێ کەوتن بۆ حەجێ دوو کەس بوون، بەڵام ئێستا چوارن!! ئەو دوانەی دێت لە کوێ هێناون و بەو حاڵە چۆن دەچییەوە لای عەلی فەتحی مێردت؟

پێغەمبەر دەفەرموێ: (لا ایمان لمن لا امانه له) واتا باوەڕی نییە ئەو کەسەی لە ئەمانەتدا ئەمین و بەختەمام نەبێ.

جا بۆیە شێخی وا پاک دووی بۆ مریدەکەی کردوون بە چوار!! وا دیارە شێخەکان ئاوا ئەمینداری خەڵکن!! ئەرێ لالۆ ئەم خەڵکە خەفتگە کەی ئەغیار ئەبێتۆ؟! تۆخوا ئەمانە کەی هەست وە زامگەلی خۆیان ئەکەن؟!

## شۆڕەژن

شـــــۆڕەژن مـــــن لە هەوڵ پـــێم نەگـــــوتی
ئـــاخری حەزرەتـــی شـــێخ تێـــت دەکـــوتی
دێـــــتە یـــــادت کە بە شــــــەو دەردەپەڕی
ســـەری رووت ســـینەی رووت پـــای پەتـــی
وەکـــــوو مـــــاینی بەتەڵەب دادەوەشـــــای
لات نەبـــــوو ســـــەبر و قەرار و رەحەتـــــی
عـــاقیبەت کەوتیـــیە ژێـــر حەملەیـــی شـــێخ
بە دووســـــەد حـــیلە و مەکـــرد و دەوەتـــی
کـــو بە ئەفـــسانەی شـــێخ هەڵخەڵەتـــای
بە چ روو دەچیـــــــیەوە لای ئـــــــاڵییەفەتی؟!

# وەڵامی شۆڕەژن

شـــــێخ هومێـــــدێکی وەهـــــای دابـــــوو بە مـــــن
هەر لە بـــــۆیە ســـــەری خـــــۆم خـــــستە پەتـــــی
بـــــۆ رەزامەنـــــدی خـــــوا کەوتـــــمە دووی
دەمپەرســـــت مـــــن شـــــەو و رۆژ میـــــسلی بتـــــی
ئەوی دیـــــم و پەشـــــیمانیش بـــــووم
ئێـــــستەکەش مـــــاوە خـــــودا و مەرحەمەتـــــی

# لای لایەی دایک

ئەمجـارە مامۆسـتای مەزن و دڵ پڕ لە کوڵ، کـوڵی دڵـی پڕ لە سۆی خـۆی بە شـێوەیەکی تـرو بە جـۆرێکی دیـکە دەردەبـڕێ و لە قاڵبێکی دیکەدا ئامۆژگاری هەژارانی کوردەواری دەکا.

ئەوەی راسـتە مامۆسـتای دڵـسۆزی گەل لە تەواوی هـۆنراوە و هەڵبەسـت و ئامۆژگارییەکانیـدا تەنیـا دوو شـتی گەورە و گرینگـی مەبەسـتە کە بـریتین لە موسـڵمانەتی و کـوردایەتی و واش دەردەکەوێ کە هەردووکیانی یەک لە یەکی پتر مەبەستە و بە هـیچ جۆرێک لێکیان جیا ناکاتەوە.

بەڵام وەک مەرەنگـوێزێکی لێـزان و چـاک (دکتـر حـاذق) کە بە جۆرگەلی جۆراوجـۆر دەرمـان دەرخـواردی نەخۆشـەکەی خـۆی دەدا ئەو دوو مەبەسـتە گـرینگە بە شـرینقەی هەڵبەسـت و هـۆنراوە لە مێشکی پیر و لاوانی کورد دەچزێنێ (تەزریق دەکا).

هیچ هۆنراوەیەک و هیچ نووسراوەیەکی مامۆستا نییە کە ئەو دوو شتانەی لێ نەخوێنرێتەوە، بەڵام هێندێکیان وەک هەوری بەهاری لێی هەڵدەرژێن و هێندێکیان بە غوررەم و هێندێکیان بە خوناوە. ئەوەش نیشانەی ئەوەیە کە مامۆستای بەرێزمان کەسێک بووە کە زۆر بە چاکی لە قورئانی گەیشتووە و ئیسلامی راستەقینەی ناسیوە و بە هەموو هەست و ویژدانی خۆی تامی خۆشی ئایینی خوای چێشتووە و زانیویە کە خودی خۆشی لە جیهان و هەبووندا چییە و لە جیهانی ئیسلامدا کێیە و لە کوێیە و لەوێ دەبێ چۆن بێ و چۆن بژی و چی بکا و سەرەنجام چۆن بمرێ.

ئەو بەرێزە کەسێک نەبووە کە بەو لا و لایانەوە بەسترابێتەوە و خەتیان پێ دابێ و بە دوای خۆیاندا کێشابێ. بەڵکە بە پێچەوانە، پیاوێکی موسڵمانی زانای کوردی دڵ پڕ بیر و باوەڕی سەربەخۆی خزمخوازی خۆویستی خواپەرەستی نەترس و نەبەز بووە و لە دەورانی خۆیدا لە خۆی کوردتر و موسڵمانتر و زاناتر کەم بووە.

بۆ ئەو دوو مەبەستە بە هەموو هێزو توانای زانیاری و رامیاری خۆیەوە تێکۆشاوە و خەباتی کردووە و هەوڵی داوە و لە هەر شێوەیەک کەڵکی وەرگرتووە. ویستوویەتی راستەقینە بۆ خەڵک روون کاتەوە و لە دەوری ئەو دوو مەبەستە گرینگە گەلی کورد گرد کاتەوە. ئەوەتا دەبینین جارێک هیواداری دەردەبڕێ و ئاواتەخوازی دەکا و دەڵێ:

بۆیە ئومێد ئەکەم لە لوتفی خودا
خالقی خۆر و مانگ و رۆژ و شەو
کوردەکانیش بکاتە ساحەبی جاە
(سنة الله في الذين خلوا)

**یان ئاخان هەڵدەکێشێ و ناڵە دەکا بۆ ژیانەوەی گەل و دەڵێ:**

هەتـــا دەمـــرم لە بـــۆ کـــوردان دەنـــاڵم
عیلاجیـــان چـــۆن بـــکەم هـــاوار بە مـــاڵم
لە عـــیلم و مەعـــریفەت دوورن بە کـــوللی
خەیـــاڵی خـــاوە لایـــان فیکـــری میللـــی
لە بـــاتی باســـی دیـــن و روکنـــی ئیمـــان
مەلا بۆیـــان دەخـــوێنێ مەدحـــی شـــێخان؟

**یان لە پارچە هەڵبەستی قازانجی شێخەکانماندا دەڵێ:**

هەتـــا شـــێخێک لە کوردســـتان بمێنـــێ
ئومێـــدی زینـــدەکانیت پـــێ نەمێنـــێ
تەریـــقەی قـــادری و نەقـــشبەندی
بە بـــای دا رەونەق و ئـــاهەنگی کـــوردی
لە وان و ئەرزەرۆم تـــا حەددی جافـــان
تەوەلـــلا بـــوون لە عەقـــڵ و علـــیم و عیرفـــان

**یان لە پارچە هەڵبەستی باوەڕی جاهیلانەدا دەڵێ:**

وەرن ئەی ئـــوممەتی خیـــر البـــریە
لە پـــاش تەقـــدیمی ئـــیخلاس و تەحیـــیە
بە عـــیلم و عەقـــڵ و هـــۆش و فیکـــر و عیرفـــان
بە قەولـــی مـــستەفا و ئایـــاتی قورئـــان
بـــزانن ئەو قـــسانە پـــاکی پـــووچن
ئەگەر خوامـــان هەبـــێ ئەقتـــاب لە بـــۆ چـــن؟
کەســـێ ئیمـــانی بە خـــوا و قـــودرەتی بـــێ
چلـــۆن ئەو ئیعتیقـــادەی دەچـــتە قەلبـــێ؟!

هەروەها لە تەواوی هۆنراوەکانیدا نموونەی زەق و زیندوو و ئاشکرا هەیە و بەڵگە زۆرە بۆ ئەو دوو مەبەستە جوان و چاک و گەورە و پیرۆزە. جا بە تایبەتی لەو پارچە هەڵبەستەی (لای لایەی دایک)دا کە چەند جوان و بەجێیە لە کاتێکدا کە هێشتا کوڕەکە منداڵێکی ساوای شیرەخۆرەی سەر پشتی لانکێیە و مێشکی پاک و خاوێنی بە هیچ شتێک هاڵۆز و تێکەڵاو نەبووە و هەر وا بە پاکی ماوەتەوە و بەو دوو شتە پیرۆزە دەزرینگێنێتەوە و ئاوی دەدا و زاخاوی دەکا و دەڵێ:

لای لای رۆڵەکەم بە روح خزمەت دەکەم
تا خزمەتی مەفتەن کەی، بە ئازایی و چابوکی
ئومێدم وایە لاوە ئەتۆش هەروەکوو کاوە
لە بۆ کوردان هەڵبکەی رایەتی ئەتابوکی
کوڵی گریانم هەستا دین و دنیامان فەوتا
رووومان لە حەق وەرگێڕا لە بۆ شێخ و مامۆستا
لاوە بۆ خاتری خودا نەکەی هەڵبخەڵەتێی
دەنا وەڵڵا و بیللا بە جارێکی دەفەوتێی

جا مامۆستای دڵ بە کوڵ ئەو جارەش کوڵی دڵی پڕ لە هیوای خۆی لە لای لای کردنی دایک بۆ کوڕەکەی خۆی دەردەبڕێ و ئەو راستەقینەیەشمان لە هەوەڵە پێ دەڵێ کە هەوەڵین شتێک کەوا دەچێتە گوێی منداڵەوە قسەی دایکە و دایک دەتوانێ منداڵەکەی هەر جۆرێک بیهەوێ رابێنێ. یەکەمین مامۆستای منداڵ دایکە و تەنیا دایکێک دایکی چاکە کە مامۆستای چاک بێ.

دایک یەکەم خەمخۆر و راهێنەر و یەکەم هاودەم و هەوەڵین دوێنەرو یەکەم هاوکارو هاودەنگی منداڵە. ئەو منداڵە مێشکی پاک و

روون و خـاوێن و بـێگەردە و وەک قـاقەزێکی سـپی وایە کە هـیچ شتێکی لەسـەر نەنووسـرابێ و هەوەڵـین نووسـەر بە کەیفـی خـۆی دەتوانێ لێی بنووسێ و پڕی بکاتەوە.

هەر منداڵێک کە بێ بیر و باوەڕە، خوا نەناسە، بەد رەوشە لە پـێش هەمـوو کەسـدا دایکـی بەرپرسـە و دوایە بـاوکی و لە پـلەی سێهەمدا مامۆسـتاکەی. جـا بـێگومـان ئەگەر چـاکیش بـێ هەر بەو رێژەیە هونەرەکەی هەر بۆ ئەو سیانەیە.

دایـک دەبـێ منـداڵێکی بـاش و بە شـێواز و خـاوەن رەوش دوای حەوت سـاڵەی تەحـویلی بـاوکی بـدا و بـاوکیش دوای کـار لە سـەر کـردن و راهێنـان و بارهێنـانێکی چـاک بینێـرێتە لای مامۆسـتا تـا مامۆستا بتوانێ پیاوێکی باش و زانا و دانا و مەردێکی بەکەڵک لەو منداڵە دەربێنێ، بۆیە مامۆستای خۆشەویستمان دەفەرموێ:

ئەووەڵ چـشتێ دەچێـتە گـوێی منـداڵ لە نـاو لانکـێ
گەر چـــاکە و گەر خەراپە لای لایـــی دایکـــێ

مامۆستا خۆی یەکەم کەسە لە کوردانداا کە لەو بارەوە هۆنراوەی هۆنیوەتەوە و هەڵبەستی هەڵتراشیوە. بەڵام دوای خۆی گەلێک لە هـۆنەرانی کـورد بە دوایـدا رۆیـشتوون و لاسـایان کـردۆتەوە، بـۆ نموونە برایم ئەحـمەد، هەژار، سـوارە کە ئـی هەموویـان لە جێـی خۆیـدا بەنـرخە، بەڵام لە راسـتیدا ئـی مامۆسـتا لە ئـی هەمـووان گرینگتر و بەوەجتـرە و ئەوەش رچەیەکە کە ئەو کەڵە پیـاوە خـۆی لە هەوەڵەوە بە تەنـێ شـکاندوویەتی. ئیتـر ئەوەش لای لایەکەی مامۆستا.

# لای لایی دایک

ئەووەڵ چشتێ دەچێتە گوێی منداڵ لە ناو لانکێ
گەر چاکە و گەر خەراپە لای لایی دایکێ
لای لای رۆڵەکەم بە روح خزمەتت دەکەم
تا خزمەتی مەفتەن کەی بە ئازایی و چاپوکێ
ئومێدم وایە لاوە ئەتۆش هەروەکوو کاوە
لە بۆ کوردان هەڵبکەی رایەتی ئەتابوکی
ئەوەی بە دڵ و بە گیان خزمەتی مەفتەن نەکا
لە سەر جێگە و رێگەی خۆی دژمنی دەری دەکا
لاوژەم لای لایی ئەتۆش هەروەکوو دایێ
ئەوشۆکە خەوت نایێ لە خەفەتی دنیایێ
ئەی رۆڵەی موسڵمانم، لە نەتەوەی کوردانم
زۆرم هیوا بە تۆیە رزگار کەی نیشتمانم
تۆش وەک دایکی هەژارت وەکوو گش کەس و کارت
بێزاری لە ژێر دەستی و لە دژمنی زۆردارت
منیش ئەوا ئەگریەم رۆڵە لە بۆ قەومی تۆ
هەموو جەرگ و هەناوم ئەوا هاتە سفت و سۆ
کوڵی گریانم هەستا دین و دنیامان فەوتا
روومان لە هەق وەرگێڕا بە قسەی شێخ و مامۆستا
کۆلکە مەلای نەزان و شێخی بێخەبەر لە خوا
چی مەعدەنی وڵاتە هەمووی لە کیس ئێمە دا
روومان کردە زەویان و بووینە دەروێش و سۆفی
بۆیە ئێستێکە دژمن وەک سەگ هەڵماندەگلۆفی
بە قسەی وانی حیلەباز رۆڵە ئێمە تێکەوتین
لە بۆ قووتی لایەمووت خەریکی بەڕڕ و جەوتین
رۆڵە بۆ خاتری خودا نەکەی هەڵبخەڵەتێی
دەنا وەڵڵا و بیللا بە جارێکی دەفەوتێی

# عیسا لە ئاسمان مەهدی لە ناوبیر

باوە و دەنگۆیە لە نێو خەڵکی موسڵماندا کەوا هەنتەشی عیسای کوڕی مریەم لە ئاسمانانە و مەهدیش پێشەوای چاوەڕوان کراوی شیعان لە ناو چاڵاوی سامەڕەدا خۆی شاردۆتەوە، یەک لە بەرزو یەک لە نەوی، ئەم لە عەرد و ئەو لە ئاسمان هۆی مشت و مڕی زانایانن!

جا دیارە ئەوانە هەر یەکەی لەبەر هۆیەکی تایبەتی ئەوەیان بە سەر هاتوە و بەڕاستیش ئەو دوو مەسەلە هەردووکیان جێگای ناکۆکی و چەند بەرەکی و مشتومڕێکی زۆری زانایانی ئایینی ئیسلامن. هێندێکیان دەڵێن عیسا بە جەستە و گیانی خۆیەوە خوای گەورە بردوویەتەوە ئاسمانان و هێندێکیشان دەڵێن نەخێر، هەر بە گیان چۆتەوە ئاسمانان نەک بە جەستە. هێندێکیش دەڵێن، نەخێر، هەر نەچۆتە ئاسمانان، بەڵکە وەک هەر کەس مردووە. وە ئەمەش کە خوا دەفەرموێ: (انی متوفیک و رافعک إليّ) خۆی بەڵگەیە بۆ ئەو داوایە و بە چاکی دەیچەسپێنێ.

هەروەها لە مەڕ مەهدیش هەر زانایان ناکۆکی زۆریان لە نێوان دایە. هێندێکیان بە تایبەتی شیعەکان دەڵێن لە چەند سەد ساڵ لەمەو بەرەوە لە چاڵاوی سامەڕای عێراقێدا خۆی شاردۆتەوە و لە ترسی دوژمنان. جا بە قسەی هێندێکیان هەتا دنیا پڕ پڕ نەبێ لە ستەم و زێف و گوناح و تاوان، نایەتە دەرەوە. بە قسەی هێندێکانیش هەتا دنیا لە خەراپکاری پاک نەبێتەوە نایەتە دەرەوە.

جا بە قسەی هێندێکیان لە دواییدا عیسا لە ئاسمانان دێتە خوارەوە و مەهدیش لە ناو بیر دێتە دەرەوە و دەس وە دەستی یەک دەدەن و لە دژی جرجاڵ شەڕ دەکەن و بە یەکجاری دنیایە پانتاو دەکەن و جرجاڵ کە لە پێشدا هەموو خەڵکی فریو داوە و بە نان و ئاو هەموویانی وە دوای خۆی داوە دەکوژن و ئیترئەو کاتی گورگ و مەڕ پێکەوە ئاوێ دەخۆنەوە و زیان بە یەکتر ناگەیەنن و چەوسێنەر و چەوساوەش دەبنە دۆست و دڵسۆزی یەک!!

بەڵام بەشێکی زۆر لە زانایانی بەرزی ئیسلامی لە مەڕ مەسەلەی مەهدی سەرسەختییەکی زۆریان نیشان داوە و بە گشتی بەرهەڵستی ئەکەن و دەڵێن: هەر نەبووە و نەبێ و بەڵگە و پەڕتۆی زۆریشی لەسەر دێننەوە.

بەڵام لەبارەی هەنتەشی عیسادا هیچ کەس بەرهەڵستی ئەوتۆی ناکا و بەو شێوەی نەیاری نین و تەنیا ناکۆکییان لەوەدایە هێندێکیان وەک باس کرا دەڵێن خوای گەورە ئەوی مراندووە و گیانەکەی بردۆتەوە لای خۆی وەک هەموو پێغەمبەرانی دیکە.

جا ئەو قسەیە، کە چاکتر بە دڵەوە دەنووسێ و ئەقڵ دەیگرێ بەڵگەی یەکجار زۆر ژیرانەی لەسەرە. دەبێ ئەوەش قەبووڵ کەین کە بردنەوەی هەنتەشی عیسا بۆ ئاسمانان چ بە گیان و جەستە و چ بە گیانی رووت، بۆ گیانی گیانان کارێکی زۆر زۆر سادە و ئاسانە و بە هەر لایەکیان بێ زیانێک بە مەسەلەکە ناگەیەنێ و بەشێکیش نییە لە باوەڕی ئیسلامی.

بەڵام گرینگ ئەوەیە کە ئێمەی موسڵمان هەموو ئایەتەکانی خەبات (جیهاد) وفەرمان بە خەباتمان فەرامۆش کردوون و هەموو جۆرە ستەم و زێف و زۆرێک قەبووڵ دەکەین و مۆری نەنگ و شوورەییمان لە نێو چاوانی خۆمان داوە و بە تەمای ئەوەین کە

عیسا لە ئاسمانان بێتەوە خوار و مەهدی لە ناو بیر بێتەوە دەر و تۆڵەمان بۆ بستێنن!! بەڕاستی شتێکی سەیرە!!

پێمان وایە کە هەتا ئەو کاتی ئێمە هەر دەبیّ ژێر چەپۆکە و ژێر دەستە و ستەمکێش بین و هەموو جۆرە ستەم و زێف و زوڵمێک قەبووڵ کەین!!

ئەوا چەندین سەدەش رابردووە و هەر نەهاتن و چاوەڕوانی بێجێی ئێمەیان نەهێنایە جیّ!! چونکە ئەگەر واش بیّ و ئەوان ئەو کارەی بکەن بەپێی ئەو گێڕاو (روایت)انە کە باسیان دەکەن دوای وان دنیا زۆری نامێنیّ کە تێکدەچیّ و ئیتر لە پەسڵان (قیامت) نێزیک دەبێتەوە. با ئەوەشمان لە بیر نەچیّ کە هیچ ئایەتێک لە قورئانی پیرۆزدا باسی هاتنەوەی وان ناکا و ئەوەش کە باسیان دەکا هەر گێڕاوەیە و بەس. بەڵیّ قورئان باسی هەنتەشی عیسا دەکا و راڤەدەران (مفسران)ی قورئانیش بیرورای خۆیان دەربڕیوە.

جا مامۆستاش کاتێک کە دەبینیّ وا موسڵمانان لە سەدەی بیستەما هەر وا بە خەون و خەیاڵ دەژین و لە جیهانی خەیاڵ پلاوی نەکولاودا بە جاریّ سەرگەردانن و لەباتی ئەوەی کە خۆیان وەخۆ کەون و کاروباری خۆیان راپەڕێنن وەک کابرای خەوتوو لە بن دارە قەیسییەکە کە نەیدەتوانی هەستیّ و بچێتە سەر دار و یا لکی دارەکە بگریّ و رایوەشێنیّ و ئیتر بە کەیفی خۆی بخوا هەر دەیگوت (زردآلو بیا تو گلو) واتا قەیسی وەرە ناو زارم، هەتا دەنکە قەیسییەک هەڵوەری و وە چاوی کەوت و کوێری کرد؛ بەتەمان عیسا و مەهدی بێن و کارێکیان بۆ بکەن و ئیتر لە بیریان نییە کە خودا دەفەرمویّ: (ان الله لایغیر ما بقوم حتی یغیروا ما بأنفسهم) بەڕاستی و بیّگومان خوا ئاڵوگۆڕ لە حاڵ و ژیواری هیچ کەسدا وەدی ناهێنیّ هەتا خۆیان وە خۆ نەکەون و شۆڕش نەکەن و ژیواری نائامواری خۆیان بە کەیفی خۆیان نەگۆڕن.

کۆمەڵی شێخ و خەلیفە و دەروێشانیش بە شار و گوندەکانی وڵاتی ئیسلامی و بەتایبەتی کوردستاندا دەخولێنەوە و بە نێوی ئایین دەلەوەڕێن و خەڵکی هەژار و سادە و ساویلکە دەچەوسێننەوە؛ بۆیە مامۆستا لەو بەستە هەڵبەستی چووکەڵەی شەش تاکیدا دنیایەک دەردی دڵ و کوڵی دەروون و داخ و خەفەت هەڵدەڕێژێ و دەڵێ: ئێمەی موسڵمان هەر بە تەمای ئەوەین کە عیسا لە ئاسمانێڕا بێتە خوارێ و مەهدی لە ناو بیری بێتە دەرێ و کارێک بۆ ئێمە بکەن کەچی ئەوان هەر نەهاتن و حاڵی ئێمەش ئاوا شلۆق و نالەبار و ئیتر ئاوا بەدبەختی رۆژگارین!!

خوای گەورەش دەفەرموێ: (لیس للانسان الا ما سعی) واتا مرۆڤ بە هەوڵ و کۆشش و خەباتی خۆی نەبێ هیچ شتێکی دەس ناکەوێ.

## عیسا لە ئاسمان، مەهدی لە ناو بیر

عیسا لە ئاسمان مەهدی لە ناو بیر
حاڵمان شلۆقە یاران چ تەدبیر؟
نە ئەو دێتە خوار، نە ئەم دێتە دەر
جرجاڵیش زۆرن گشتی سواری کەر
لە دێ و لە شاران سەربەست ئەگەڕێن
بە ناوی دینی باش دەلەوەڕێن
ریش پان و درێژ، مل قەوی، شان کۆم
دوور بن لە دینی وەک 'حسایە' و 'ناحۆم'
دوویان دەکەون پیرێژن و منداڵ
بە غار و سەما بە جەزبە و بە حاڵ

پیرێــــزنە کـــۆنەیْ قـــوون قالـــب بەتـــاڵ
دوای جرجـــاڵ دەچـــێ وەک مـــاینی بەفـــاڵ

**جا هەربۆیە لە جێیەکی دیکەدا دەڵێ:**

بە ئومێـــدی ئیمـــامین یەعنـــی حەیـــدەری کەڕڕار
یـــا خـــۆ حەزرەتـــی عیـــسا لە ئاســـمان بێـــتە خـــوار
یـــا نە مەهـــدی مـــوختەفی لە نـــاو چـــاڵێ بێـــتە دەر
بە قـــووەتی ویـــلایەت دنیـــا بـــکە موســـەخخەر

**یان لە بەستەیەکی دیکەدا هەڵمەت دەباتە سەر ئەو بیر و باوەڕە نارێکوپێک و نەچەسپاوە و بە سەر سووڕمانەوە دەڵێ:**

عیـــسا دێـــتە خـــوار ئیمـــرۆ و ســـبەینێ
ئـــیش و کـــاری تـــۆ هەمـــوو پێـــک دێنـــێ
لای مەلا وایە هەر کە مەهـــــدی هـــــات
خەلاتـــــی بـــــۆ دێ جـــــوببە بە قەلات
وا چـــــاوەنۆڕی مەهـــــدی بێـــــتە دەر
خـــۆ هەر نەهـــاتیش جەرگـــت هـــاتە دەر
ڕەببیـــــی ماموســـــتا هەر وا بنـــــالێ
حەشـــری تـــۆ بـــکەن دەگەڵ جرجـــالێ
ئەم بـــاس و خواســـە هـــیچ کەڵکـــی نیـــیە
ئیمـــڕۆ بنـــۆڕە حـــالێ تـــۆ چیـــیە؟
حەزرەتـــی عیـــسا چـــی کـــرد لە بـــۆ خـــۆ
کە هـــاتە خـــواریْ چـــی دەکـــا بـــۆ تـــۆ؟

## مەسەلەی عیسا لە روانگەی زانایانی ئیسلامەوە

مەسەلەی مان و نەمانی هەنتەشی عیسا شتێکە کە لە کۆنەوە زانایانی ئسلام تێیدا ناکۆکن و لە سەری مشتومڕیانە، هەروەک باس کرا.

هێندێکیان دەڵێن خوای گەورە ئەوی هەر ئاوا بە جەستە و بە گیانەوە بردۆتەوە ئاسمانان بۆ لای خۆی. هێندێکیشیان دەڵێن خوای گەورە مراندوویەتی و گیانەکەی بردۆتەوە لای خۆی. جا هەر کامێکیان بێ، بۆ خوا کارێکی زۆر ئاسان و سادەیە.

بەڵام لە رواڵەتی ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزدا وا دەردەکەوێ کە ئەو بەرێزە مرێندراوە و ئێستا نەماوەو کاتێکیش کە دێتە خوارێ بۆ خوای زۆر سادەیە زیندووی بکاتەوە.

خوا لە سورەتی ئالی عیمران ئایەتی ٥٤دا دەفەرموێ: (اذ قال الله یا عیسی انی متوفیک و رافعک الی و مطهرک من الذین کفروا) ئەی عیسا ئەمن مرێنەری تۆم و بەرزکەرەوەتم بۆ لای خۆم و خاوێنکەرەوە و رزگاریدەری تۆم لەوەی کە کافرەکان بۆت هەڵدەبەستن و لەو داوانە کە بۆت دادەنێنەوە.

بەرێز دوکتور ئەحمەدی شەرباسی لە پەرتووکی (یسألونک فی الدین و الحیاه) بەرگی ٦ لاپەڕی ٣٤٩دا دەڵێ: (و معنی هذا ان عیسی قد توفی و مات. هذا ما یفهمه القارئ الخالی الذهن من الاقوال و الروایات لانه هو المتبادر من العباره و ایدته الشواهد من الآیات) مانای ئەوەش ئەویەە کە بەراستی عیسا نەماوە و مردووە. ئەوەش شتێکە کە خوێنەری بیر و مێشک بەتاڵ لە قسە و باس و گێڕراوە تێیدەگا و دێتە دە مێشکییەوە، چونکە هەر ئەوە دەفامرێتەوە لەو وێژامە قورئانییە.

بەڕێز شەهید سەیید قوتب لە تەفسیرە بەناوبانگەکەی خۆی (في ظلال القرآن)دا دەفەرموێ: (لقد ارادوا صلب عیسی و قتله و اراد الله ان یتوفاه و ان یرفعه الیه و ان یطهره من مخالطه الذین کفروا و البقاء بینهم و هم رجس و دنس فاما کیف کانت وفاته و کیف کان دفعه فهی امور غیبیه تدخل فی المتشابهات التی لایعلم تأویلها الا الله و لا طائل وراء البحث فیها لا في العقیده و لا فی الشریعة و الذین یجرون ورائها و یجعلونها ماده للجدل ینتهی بهم الحال الی المراء و الی التخلیط و الی التعقید دون ما جزم بحقیقته و دون ما راحة بال في امر موکول الی علم الله) جلد ١، ص ٤٠٣

واتا کافرەکان ویستیان عیسا هەڵواسن و بیکوژن. خوداش ویستی بیمرێنێ و بەرزی بکاتەوە بۆ لای خۆی و بیفڕێنێ و رزگاری بکات لە تێکەڵاوی. ئەوانەی ئەوتۆ کە کافرەکان بوون و لە مانەوە لە نێویاندا کە هەموو پیس و پۆخڵ بوون. بەڵام داخوا مردنەکە و بەرز کردنەوەکەی چۆناوچۆن بووە، ئەوە کاروبارێکی نهێنی و لە وەک یەکچووەکان (متشابهات)ی ئەوتۆیە کە خوای گەورە نەبێ کەس ناتوانێ لێکیان بکاتەوە و هیچ قازانجێکیش دە باس لێ کردنیاندا نییە. نە دە بیر و باوەڕ و نە دە شەریعەت و یاسادا. ئەو کەسانەش، کە وە دوای ئەوانە دەکەون و دەیانکەنە هۆی کێشە و بەرە تووشی سو و گومان و سەر لێشێوان و گرێپووچکە دەبن و بە هیچ راستەقینەیەک ناگەن و قەت ناگەن بە ئارامی و سووکنای دڵ لە کاروبارێکدا کە دەبێ هەر حەواڵە بە خوا بکرێ و بەس. چونکە قەبووڵ کردنی کارێکیش هەر پێوەندی بە خواوەیە بۆ قەبووڵکەرانی هەبوون و تاک و تەنیا و هێز و زانایی و دانایی و هۆزانی و لێزانی خوا کارێکی زۆر ئاسانە.

بەڕێــز زانــای بە ناوبــانگی بیــر تــازە مامۆســتا ئەحــمەدی نەوئەندیش لە تەفسیرە جوانەکەی خۆیدا (نو اندیش) بەرگی یەکەم لاپەڕەی ١٥٣دا دەفەرموێ: (جملة "متوفيک و رافعک إليَّ" دلالـت دارد کە حضرت عيسى قبض روح شده و وفـات نمـودەو روح او به مقـام اعلـى رسيده. پس اخبـارى که دلالـت برحيـات و عـدم فـوت او دارد مخدوش الدلاله و مخدوش السند و مجعول است)

هەروەهــا بەڕێــز مــستەفای مەراغــی لە بەرگــی ١ لاپەڕەی ١٦٩ (تفسير المراغى)دا دەفەرموێ: (و حديث الرفع و النزول آخر الزمـان حديث آحاد يتعلق بامر اعتقادى و الامور الاعتقاديه لا يؤخذ فيها الا بالدليل القاطع من قرآن و حديث متواترو لا يوجد هنا واحد منهمـا) واتا باسی بەرز کرانەوەی بە گیـان و جەسـتەی هەنتەشـی عیـسا و هـاتنە خـوارەوەی ئەو لە دوامین چاخـا تەنیـا بە حەدیـسی ئاحـاد چەسپێندراوە و بەس، کە دیارە ئەوەش شتێکە پێوەنـدی بە بیـر و باوەڕەوە هەیە و کاروباری بیر و باوەڕیش دەبێ تەنیا لە بەڵـگە و پەڕتــۆی بــێگومــان و پــتەو (قطعــی) کە بــڕیتییە لە قورئــان یــا فەرموودەی موتەواتر وەربگیرێن، خۆ حاڵیش وایە هیچ یەک لەوان لێرەدا نییە. هەر لە پێش ئەوەشدا دەفەرموێ (ان التوفى هو الاماتة العادية و ان الرفع بعده للـروح و لا غـرابه فـى خطـاب الـشخص و اراده روحه فالروح هى حقيقه الانسان و الجـسد كـالثوب المـستعار يزيـد و يـنقص و يتغيـر) بەڕاسـتی "تـوفی" هەر هەمـان مرانـدنی ئاساییە و بەرز کردنەوەش لە دوایە بۆ گیانە و هیچ سەیریش نییە ڕوو لە مــرۆڤ بکــرێ و مەبەســتیش گیــانی وی بــێ، چــونکە ڕاستەقینەی مرۆڤ هەر گیانە و جەستە وەکوو بەرگی وی وایە زیاد دەکا و کەم دەکا و ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێ.

خوای گەورە لە سورەی نیساءدا دەفەرموێ: ﴿ وَمَا قَتَلُوهُ وَمَا

صَلَبُوهُ وَلَٰكِن شُبِّهَ لَهُمْۚ وَإِنَّ ٱلَّذِينَ ٱخْتَلَفُوا۟ فِيهِ لَفِى شَكٍّ مِّنْهُۚ مَا لَهُم بِهِۦ مِنْ عِلْمٍ إِلَّا ٱتِّبَاعَ ٱلظَّنِّۚ وَمَا قَتَلُوهُ يَقِينًۢا ﴿١٥٧﴾ بَل رَّفَعَهُ ٱللَّهُ إِلَيْهِۚ وَكَانَ ٱللَّهُ عَزِيزًا حَكِيمًا ﴾ ئەویان نەکوشت و هەڵیاننەواسی، چونکە دەستیان ویێڕا نەگەیشت و نەیانتوانی، بەڵام لیان تیکچوو هاوڕییەکەی خۆیان خوا هیناییە سەر دیمەنی هەنتەشی عیسا و ئەمیان لە باتی وی کوشت. بەڕاستی ئەوانەی ئەوتۆ کە دووبەرەکی و ناکۆکییان ساز کرد بەڕاستی لە گومان دان لە بارەی عیسادا و هیچ زانیارییەکیان لەبارەی ویدا نییە و تەنیا پەیڕەوی دەکەن لە گومان و بە یەقینی ئەویان نەکوشت. بەڵکو خوا ئەوی بەرز کردەوە بۆ لای خۆی و خواش بەڕاستی بەهێز و توانا و لێزانە.

بەڕێز رەشید رەزا شاگردی شێخ محەمەد عەبدۆ لە بەرگی ٣ تەفسیری المنار لاپەڕەی ٣١٦دا دەڵێ: «و التوفی فی اللغه اخذ الشیء وافیا تاما و من ثم استعمل بمعنی الامانه. قال الله تعالی یتوفی الانفس حین موتها و قال قل یتوفاکم ملک الموت الذی وکل بکم فالمتبادر فی الآیه انی ممتک و جاعلک بعد الموت فی مکان رفیع عندی کمال قال فی ادریس( و رفعناه مکانا علیا» واتا: وشەی "توفی" دە فەرهەنگدا بریتییە لە گرتن و تەواو کردنی شتی و نەهێشتنەوە و براندنەوە، هەر بۆیەش بە مانای مراندن بە کار براوە. خواش دەفەرموێ: «خوا نەفسەکان دەگرێ و تەواو دەکا لە کاتی مردنیاندا» و دەفەرموێ: «تۆ بڵێ دەتانگرێ و تەواوتان دەکا فریشتەی مەرگ نەوەی ئەوتۆ کە بۆتان دیاری کراوە» جا ئەوەی لەو ئایەتە پیرۆزە دەردەکەوێ ئەوەیە کە ئەمن مرێنەری تۆ و دانەری تۆم لە جێگایەکی بەرز و بڵیند لە لای خۆم، هەرووەک لە بارەی ئیدریسدا - درووودری خوای لە سەر بێ - دەفەرموێ: ئەومان بەرز کردەوە بۆ جێگایەکی بڵیند.

ئەوە بیر و ڕای ژمارەیەکی زۆرە سەبارەت بە هەنتەشی عیسا و مان و نەمانی وی، بەڵام دەبێ ئەوەش بگوترێ کە ژمارەیەکی یەکجار زۆریش لە ڕاڤەدەرانی قورئانی پیرۆز ڕایان لە سەر ئەوەیە کە ئەو بەڕێزە هەر وا ماوە و ئێستا لە ئاسمانانە بە جەستە و گیانەوە خوا ئەوی بردۆتەوە لای خۆی. کە لەو دیوەی مەسەلەکە پرسیارگەلێکی زۆری بێوەڵام هەڵدەستێ. هەر بۆیە ئەو بیروڕایە بۆ زۆران قەبووڵ ناکرێ و بە پەسندی نازانن، چونکە پیاو هەر چەندە دەکا نازانێ چ ڕاز و ڕیئۆنییەک (حکمت) لە هێشتا هەرمانی حەزرەتی عیسا و خدر دایە کە دیارە بۆ خواش هەموو کارێک ئاسانە، دەتوانێ بیهێڵێتەوە و دەشتوانێ بیمرێنێ و هەر کاتێک ویستی وەیژێنێ و ئەگەر ویستیشی دەتوانێ بیکاتە هۆی سەرکەوتنی حەق و ڕاستی و ئایینی پاکی ئیسلام.

جا مامۆستای بەڕێز و دڵسۆزی گەلمان پێمان دەڵێ: ئەرێ ئەو هەموو مشتومڕ و کێشە و هەرایە کە لە سەر عیسا و مەهدی ساز کراوە چ قازانجێکی بۆ ئێمە هەیە؟ هەتا کەی ئێمە هەر وە دوای ئەو جۆرە شتانە بکەوین! کە ئەگەر هەزاران ساڵی دیش لە دوویان بڕۆین بە هیچ ئاکامێک ناگەین و بۆمان ساخ نابنەوە!!

چونکە هیچ بەڵگەیەکی قورئانی و فەرموودەی بە تەواتور گەیشتووی پێغەمبەری لە سەر نییە و هەر چەندی وە دوای بکەوین لە بیروڕا دەربڕینی خۆمان بەو لاوە چیدیکەمان لەو بارەوە لە دەس نایە. خۆ هەتا پتریش بیروڕایان دەرببڕین پتر سەرمان لێ دەشێوێ و مەسەلەکەمان لێ هاڵۆزتر دەبێ، چۆن بیروڕا هەمیشە جۆراوجۆرن.

بەڵێ، مامۆستا دەفەرموێ ئەو جۆرە هیوا و هومێدانە هیچ قازانجێکیان بۆ ئێمە نییە، جگە لەوە کە خەڵکی موسڵمان بەرەو تەمبەڵی و سستی و لە خەبات سارد بوونەوە ڕادەکێشن!!

ئـاخر خـوا دەفەرمـوێ تـۆ هیچـت دەس نـاکەوێ بە هەوڵ و تێکۆشـانی خـۆت نەبێ. خـوا حـاڵ و ژیـواری هـیچ گەل و هۆزێک ناگۆڕێ، هەتا خۆیان رانەپەڕن و حاڵ و ژیـواری خۆیـان نەگۆڕن. کەچی موسڵمانانی سادە و ساویلکەش هەر بە تەمـای ئەم و ئەون کەجا هەر بۆیە دەفەرموێ:

ئەم بـاس و خواسـە هـیچ کەڵکـی نیـیە
ئیمـرۆ بنـوارە حـاڵی تـۆ چیـیە؟

خەڵـک لە پیـشەسازی و زانیـاری دا وەهـا پێـشکەوتوون کە تەنانەت بە گۆی زەویش دابین نابن و ئێستا وا دەڕۆن بـۆ سـەر گۆیەکانی دیکەی ئاسمان.

ئەی هەزار رەحمەت لە گۆڕەکەی کە دەفەرموێ:

ئـێمە پابەنـدی وەهـم و خەیـاڵین
ئـێمە خەریکـی کەری جرجـاڵین
حەزرەتـی عیـسا چـی کـرد لە بـۆ خـۆ
کە هـاتە خـوارێ چـی دەکـا بـۆ تـۆ؟

ڕێزدار عەللامە سەعدەدینی تەفتازانی سەبارەت بە مەهدی نهێنی لە لاپەڕەی ٢٣٦ پەڕتووکی شرح العقائددا دەڵێ: (و انـت خبیـر بـان اختفاء الامام و عدمه سواء فی عدم حـصول الاغراض المطلـوبه مـن وجود الامام. وان خوفه من الاعداء لایوجـب مـنه الاختفـاء بحیـث لا یوجد منه الا الاسم. بل غایه الامـر ان یوجـب اختفـاء دعـوی الامانـة کمـا فـی حـق آبـائه الـذین کـانوا ظـاهرین علـی النـاس و لا یـدعون الامـامه. و ایـضا فعنـد فـساد الزمـان و اخـتلاف الآراء و اسـتیلاء الظلمه، احتیاج الناس الی الامام اشد و انقیادهم الیه اسهل).

یانی خۆت زۆر چاک دەزانی کە خۆ شاردنەوە و نەبوونی پێشەوا هەر دووکیـان هەر وەک یەکـن، نەهـاتنی ئامـانجە پێویـستەکانی خەڵکدا لە هەبوونی پێشەوا، بەڕاستی ترس ویش لە دژمنانی نـابێ ببێتە هۆی ئەوە کە خۆی لەبەر چاوی خەڵک ون بکا ، یـان خـۆی بـشارێتەوە بە جۆرێـک، کە نێـوەکەی نەبـێ نەمێنـێ، بەکـڵە ئەوپەڕەکەی ئەوەیە کە ببێتە هۆی شاردنەوە و دەرنەخستنی بـانگی پێـشەوایەتییەکەی و بەس، هەر وەک بـاب و بـاپیرانی خـۆی کە ئەوان لە بەر چاوی خەڵک دیار بوون، بەڵام داوای پێشەوایەتییان نەدەکـرد. سـەرەڕای ئەوەش دە کـاتی خەراپـی چـاح و نەبـاری و دژایەتی بیروڕا و زاڵ بوونی ستەمکاراندا خەڵک پتـر پێویـستیان بە پێشەوا هەیە و هەروەها چاکتریش بۆی ملکەچ دەبن و زۆر ئاسانتر وە دوای دەکەون.

بەڕێز ڕاڤەوانـی بەناوبانـگ جەنـابی مامۆسـتا سـەعید حەووا لە بەرگـی ٢لاپەڕە ١٢٣٢ ڕاڤە بەناوبـانگەکەی خۆیـدا کە (الاسـاس فـی التفسیر)ی ناوە دەفەرموێ:

(فـي نـزول عیـسی( فـی آخـر الزمـان اجمـاع الامـة المـسلمة، و النصاری کذلک یرون ذلک، و فی کتب الیهود لا یـشعر به وقد ورد اکثر من سبعین حدیثا عن رسول اللـه( فـي شـأن نـزوله، و حـوالی اکثر من اربعین اثـرا عـن الـصحابة فـي ذلـک، و قـد الـف فـي ذلـک عبدالـحی اللکنوی کتابه "التواتر الـصریح فـی نـزول المـسیح" فمـن انکر قضیه نزوله یکفر) واتا لە هـاتنە خـوارەوەی هەنتەشـی عیـسا گومـان نیـیە و کۆبـوونەوە و یەکیەتـی گەلـی موسـڵمانی لە سـەر هەیە، فەلە و مەسیحییەکانیش ئەو مەبەستە هەر وا دەبیـنن و هەر بەو جۆرە لێی دەڕوانن. لە کتێبەکانی جوولەکەکانیشدا شتێکی هەر وەک ئەوەی هەیە و هەر ئەوە دەگەیەنـێ. بەڕاسـتی پتـر لە حەفتـا

فەرمـوودەی پێغەمـبەری مەزنـیشﷺ لەبـارەی هـاتنەوە خـواری هەنتەشی عیسادا گوتراوە. هەروەها پتر لە چل شوێنەواری یارانی پێغەمـبەریش هەر لەو بـارەوە هـاتووە. بەڕێـز عبـدالحی الکنـوی کتێبی خۆی "التواتر الصریح فی نـزول المسیح" هەر لەو بـارەوە ناو ناوە، هەر کەس دوژمنایەتی و نەیاری ئەو مەبەستە بکات پێـی کافر دەبێت و لە دین وەردەگەڕێ.

زانای بەرز و بەڕێز و خواناس، عەللامە ئەحمەد نەوئەندیش دە لاپەڕەی ٢٦١ بەرگـی ١ ڕاڤە جـوانەکەی خـۆی (تفـسیر نـو انـدیش)دا دەڵێ: و در این آیات بیان کرده کە حضرت عیسی را یهود نکشتند و بـدار نیاویختنـد و ایـن کە فرمـوده خداونـد او را بـالا بـرده بـسوی خودش، توهم نشود کە خدا مکان داود و عیسی را بدانجا برده است بلکە مقصود ارتفاع مکان اوست و مقصود اینست کە خدا او را بجای برد یعنی بە عالم آخرت کە کسی را در آنجا امر و نهی نیـست بلـکە فقط امر او نافذ است و لذا فرموده الیە، چنانکە میگوییم: انـا لـلە وانا الیە راجعون.

هەروەها لە لاپەڕەی ٣٢٠ هەر ئەو بەرگەی ڕاڤەکەیا ئەفەرمێ: (در اینکە نصاری در حوایج خود توجە بە عیسی خیـالی خـود مـیکننـد شـکی نیـست. آیـا ندیـدەای کە در تمـام کلیـساها و در تمـام بیمارستانهای امریکا و اروپا شفای امراض را از عیسی میخواهند؟ و همین معنی است کە خدا عتاب میکند بە عیسی کە آیا تـو گفتەای در حوایج خود بە تو توجە کنند و تو را الە بدانند؟

حضرت عیسی با کمال عجز و انکسار عرض میکند: من نگفتەام و این چنین کفری سزاوار نیست زیرا من از امت خود بیخبر بودم پس از رحلت از دنیـا چە رسـد بە اینکە سمیع و بـصیر حـوایج ایـشان باشم و این معنی بە خوبی از آیە پس از این آیە روشن است. یکجـا

میگوید رب من ورب شما یکی است. یعنی من رب و ارباب شما نیستم و بمن رجوع نکنید. یکجا هم میگوید "فلما توفیتنی کنت انت الرقیب علیهم و انت علی کل شیء شهید" یعنی من که عیسی باشم مراقب احوال ایشان نیستم و فقط خدا مراقب حال همه و همه جا حاضر و ناظر است نه من.)

ئیسلامناسی بەڕێز مامۆستا محەمەد فەرید وەجدی لە بەرگی ١٠ کتێبی "دائره المعارف القرن العشرین" لاپەڕەی ٤٨٠دا دوای ئەوەی کە چەند حەدیسێکی کە بە نێوی پێغەمبەرەوە بڵاو کراونەتەوە دەهێنێ سەبارەت بە مەهدی چاوەڕوان کراو دەڵێ:

(هذا ما ورد من الاحادیث فی المهدی المنتظر، و الناظرون فیها من اولی الابصار لا یجدون فی صدورهم حرجا من تنزیه رسول الله من قولها، فان فیها من الغلو و الخبط فی التواریخ و الاغراق فی المبالغه و الجهل بأمور الناس و البعد عن سنن الله المعروفه ما یشعر المطالع الاول وهلة انها احادیث موضوعه تعهد وضعها رجال من اهل الزیغ و المشایعین لبعض اهل الدعوه من ظلبه الخلافة بلاد العرب او المغرب)

واتا ئەوە شتێکە کە لەبارەی مەهدی چاوەڕوان کراوا هاتووە، خوێنەرانی بینا و زانا هەرگیز لە دڵی خۆیاندا هیچ جۆرە نیگەرانییەک نابینن لەمەڕ دوور خستنەوەی پێغەمبەری خوا لە گوتنی ئەو جۆرە حەدیسانە و ئیتر خێرا دەقی پێدا دێنن کە ئەوانە هەرگیز فەرموودەی پێغەمبەری خودا( نین چونکە بەڕاستی دەواندایە لە زێدەڕۆیی و لێدان وپێشێل کردنی مێژووەکان و گۆڕینی ڕووداوەکان و ڕۆچوون دە زێدەڕۆیی و نەزانی و بێئاگایی لە سروشت و کاروباری خەڵک و دوور کەوتنەوە لە ڕەوشگەلی ناسراوی خوایی، شتێکی ئەوتۆ کە هەست و ویژدانە بێدار و

هۆشیارەکان هەر بە هەوەڵین دیتن لێی تێدەگەن و چاک دەزانـن کە ئەو حەدیسانە هەرگیز هـی پێغەمبەری خـوا نـین و بەڵـکە گـشتیان هەڵتراشرا و ساختەگەین.

بە ئەنقەست کەسانێک ئەوانەیان هەڵتاشیون و سازیان کـردوون کە لادەر لە ڕێی ڕاست و دوور کەوتووەوە لە ڕاستەقینەکانن، یـان پەیـڕەو و دواکەوتـوون و گـوێ لە مـستی کەسـانێکن کە خۆیـان داوتەڵەبـی مەزنییەتـی و جـێنـشینی و سـەرۆکایەتی لە وڵاتـانی عەڕەبی یان ڕۆژئاواییدان.

پاشـان دوا بە دوای ئەوە دە لاپەڕەی ٤٨١ی هەر هەمـان کتێبـدا دەفەرموێ: (فان تعجب من ذلـک فأعجـب مـنه مـن یعتقـد ان رسـول اللهو هو المؤید بالوحی یقول "ان ملک بختنصر سبع مـأة سنة!! و انت تعلم ان ملک بختنصر البابلی لم یزد علی ثمانی و اربعین سنة" زد علـی ذلـک ان بعـض تلـک الاحادیـث تـذکر دولـة القیاصـرة بالقسطنطنیة عند خروج المهدی علی ما کانت علیها حالتهما فی عصر الوضاعین للاحادیث مع علمک بان دولة قیاصرة القسطنطنیة انقرضت مـن لـدن القـرن الخـامس عشرللمیلاد و لـیس بهـا کنیـسة تحتوی علی ما جبه قیصر فیها من اموال بیت المقدس!!

و ان اضفت الی ذلک کله ما ورد من تلک الاحادیث من ان سلیمان بنی بیت المقدس بالذهب و الفضة و الیواقیت و الاحجـار الکریمـة. تحققت ان واضعی هذا الکلام تعمدوا الحط مـن شـأن الاسـلام. و قـد ضـعف کثیـر مـن ائمـة المـسلمین احادیـث المهدی و اعتبروهـا ممـا لایجوز النظر فیه. و اننا انما اوردناها مجتمعة لتکون بمرأی من کل باحث فی هذا الامر حتی لا یجرأ بعض الغلاة علی التضلیل بها علـی الناس).

بڵێ ماموستا فەرید وەجدی لەو بارەوە دەفەرموێ: جا ئەگەر تۆ ئەوەت پێ سەیر بێ، سەیرتر لەوەش ئەو کەسەیە کە بەڕاستی پێی وایە پێغەمبەری خوا کە دیارە هەمیشە بە نیگای خوایی بەهێز کراوە و لە هەر کاتێکدا سرۆش و نیگای خودایی هاوڕێ و پشتیوانی بووە فەرموویەتی:"پادشایەتی بەختونەسر حەوت سەد ساڵ بووە" تۆش زۆر باش دەزانی، کە پادشایەتی ئەو لەچل و هەشت (٤٨) ساڵ پتر نەبووە.

جا لەوەش هەر پتر بڕۆ و لێی زیاد بکە کە هێندێک لەو حەدیسانە باسی دەوڵەتی قەیسەرەکان لە قوستەنتەنیە دەکەن و دەڵێن ئەو دەوڵەتە لە کاتی ئاشکرا بونی مەهدیدا هەر لە سەر هەمان حاڵەتی خۆی واتا حاڵەتی هەڵتراشران و ساز کرانی ئەوان حەدیسانە دەبێ و دەمێنێتەوە!!

خۆ تۆ خۆشت زۆر چاک دەزانی کە دەوڵەتی قەیسەرەکانی قوستەنتەنییە لە سەدەی پازدەهەمی زایینی بە تەواوی بڕاوەتەوە و کۆتایی پێ هاتووە و بە یەکجاری لە بەر یەک هەڵوەشاوە و خۆ ئیتر هەر نەماوە. تەنانەت لەو شارەدا یەک دانە کلیساشی تێدا نەماوە کە ئەوەی قەیسەرێکیش لە سامانی بەیتولمەقدەسڕا هێناویەتی تێیدا مابێ.

ئەگەر ڕەگەڵ هەمووی ئەوانە بخەی شتێک لەو حەدیسانە کە دەڵێن (سولەیمان "بیت المقدس"ی دروست کردووە لە زێڕ و زیو و یاقووتگەلی جۆراوجۆر و بەردە بەنرخ وپیرۆزەکان) بە چاکی بۆت ڕوون دەبێتەوە و قەبوولی دەکەی کە دانەرانی ئەو حەدیسانە و ڕێکخەرانی ئەو جۆرە قسانە بەڕاستی مەبەستیان هێنانە خوارەوەی پلە و پایە و ڕێز و شکۆی ئیسلام و موسڵمانانەو دەیانهەوێ بەو

جۆرە شتە پڕوپووچ و بێنرخانە ئابڕووی ئیسلام و موسڵمانان بەرن!!

بێگومان گەلێک لە پێشەوایانی موسڵمانان و زانایانی ئیسلامناس و دڵسۆزی گەل تەواوی ئەو حەدیسانە کە لە بارەی مەهدی دان زۆر بە لاوازیان داناون و لەو جۆرە شتانەیان ژماردوون، کە تەنانەت هەر خوێندنەوەشیان و چاو لێ کردنیشیان هەر دروست نییە!!

ئێمەش کە ئەوانەمان هەموو بە کۆمەڵ هێناون و تۆمارمان کردوون بێگومان تەنیا مەبەستمان هەر ئەوەیە کە هەموو ئەو جۆرە کەسانەی دەیانهەوێ لەو بارەوە لێکۆڵینەوە و توێژینەوە بکەن دەستیان وێیان رابگات و بتوانن وردەکارییان لە سەر بکەن و بۆ خەڵکی بێئاگا بە جوانی شییان بکەنەوە و لە رووی زانیارییەوە بڕواننە مەسەلەکە. تا خیرەت نەکەن هێندێک لەو جۆرە کەسانە و ئەو ستەمکارە لە ڕێ دەرچووانەی کەوا ئامانجیان گومڕا کردنی خەڵکە، بە هۆی ئەو جۆرە بە نێو حەدیسانە موسڵمانان لە رێی راستی ئیسلامی راستەقینەی سەرەتای ئیسلام لا بدەن و بە یەکجاری سەر شێواو و گومڕایان بکەن.

گەلێک مەلای نەزانی واشمان هەیە کە هەر بێ لێکۆڵینەوە ئەو جۆرە وتانە قەبووڵ دەکا و تەنانەت ئەگەر لاوێکی روون و وریا و ئاگاداریش نەیاری بکات زۆر بە توندی بە گژیدا دێتەوە و بگرە بە ناحەزیشی بە خەڵک دەناسێنێ و پێی دەڵێ وەهابی بەڵام موسڵمانان و بەتایبەتی مەلاکان ئەو رۆژگارە دەبێ زۆر زۆر لەوەی وریاتر و زاناتر بن کە نەیاران و دژمنانی زانا و دۆستانی نەزان هەر شتێکیان پێ قەبووڵ بکەن.

ئەورۆ رۆژی زانست و زانیاری و سەرکەوتن و پێشکەوتنە نەک رۆژی چاوبەستن وچاوبەستران وفێڵ لێکران.

# تەڵاق

مامۆستای دڵسۆزوهۆشیاروراميارمان كه به هەموو هەست و ويژدانی خۆيەوه دەرده جۆراوجۆره سەختە كەمەرشكێنەكانی كۆمەڵی هەژاری دەردەداری كوردەواری وكوردستانی بەڵا لێدراوی هەست پێ كردووه و دەرمانيشی له لێزانی خۆی بۆديونەتەوه و زۆردڵسۆزانه دەردەكانی بۆ هاوڕەگەزانی خۆی دەست نيشان كردوون و دەرمانەكانيشی بەزمانێكی زۆرسادەپێ گوتوون.

جا ئەو جار لەو پارچه هەڵبەستەيدا دەردێكی ديكەی كوژەروله ناوبەری كۆمەڵايەتيمان پێ دەڵێ و دەرمانەكانيشی نيشان دەدا. ئەودەرده كۆمەڵايەتييه كه دەردێكی تەنينەوەی تەكييه و سەرەنجام سەردەكێشێ بۆدەردێكی راميـاری كۆمەڵايەتی وله ئاكا ماچاره نەكراوو بێدەرمان له كوردستانی بەڵا لێدراوی خۆماندا باوه كه به سەد داوونـاووبەزم و هەراو تەنانەت جاری واش هەيه، كه به سەد گوناح وتاوان وله رێ لادان، باوكان ژنێ بۆكوڕان دەهێنن يان كوڕان هەرخۆيان هەڵياندەگرن و دەيانڕەوێنن. بەڵام به داخەوه زۆری پێ ناچێ كه له يەكتردەكەونه بڕوبيانوووپەڵپ گرتن وبەهانه له يەكتردۆزينەوه كه رەنگه دايک و باب يان كەس‌وكاری ديكەی هەردووک لايانيش، بەتايبەتی داكيان لەو بارەوه بێ‌چەخەرو شوێنەوارنەبن.

بەڵام راستی شوێن و چەخەری دايک وباب هەرلەو جێيەڕايه كه منداڵەكانی خۆيان باش نەعاملاندووه و رايان نەهێناون به تايبەتی ياسا و دەستووراتی ئايينيان پێ نەگوتوون و له بوون ومان و واتای ژيانيان حاڵی نەكردوون، تەنانەت نازانن، كه ئامانجی بەرزی زەماوەنديش چييه. هەرلايان وايه ئەوكاره بۆهێنديک

رابواردن و هەوەس‌بازی و هەواخوازییە . خودیارە ئەگەر واش بێ دوای ماوەیەک رەنگە لێک وەڕەز ببن، یان هەرنەبێ هێندێک سارد ببنەوە کە ئەودەم دیارە یان لێک جیا دەبنەوە و بە یەکجاری دەس لێک هەڵدەگرن یان ژیانێکی بێ‌تام وسارد وسڕیان دەبێ و سەرەنجام هەرمنداڵێکی کە لەوانیش پەیدا دەبێ ناتەواو و ناپوختەو ناکامڵە وبەد ڕەنگ وچیلازولووت باریک ودەم بە لیک و چڵمن وقرخن وبێ‌هەست وبیروهۆش وناتەواوە ولانی کەم یەک دوویەکی لەو دەردانە بە ملیەوە.

جا ئەو جۆرە ژنانە، کە بە پشتیوانەیەکی کەمی ژیری و بیرو هۆش و خووخدەی جوانی کارزانی ودەس رەنگینییەوە دەچنە ماڵە مێردان، کە بێ گومان ئەوە خەیانەتێکە دایک و بابیان پێیان دەکەن هەمیشە هەر هەناسە سارد و بەدبەخت و دەربەدەرونەحەساوە و ماندوو و دڵ نابەجێ و بێ‌هێلانەی ژیانن و لەو ماڵەشدا بێ پشتیوان و بێ دۆست و دەرکراو و دڵ هەڵقەنراو و ناخۆشەویست و نا لەبەر چاون، لە پێش هەموو ئەندامێکی ئەو ماڵەدا لەوانەیە تەنانەت مێردەکانی خۆشیان هەر نەیانهەوێن کە ئیتر ئەودەم بەدبەختی وان مسۆگەرە و تەڵاق درانیان لە ڕێ دایە و ئەو کات لەوانەیە چەند منداڵێکی هەژاری بێچارەش بە خۆیەوە تووشی هەناسە ساردی بکەن!!

بەڵام بە پێچەوانە ژنێکی کە خاوەنی بیروباوەڕێکی جوان و خودایانە بێ وخۆشی ژیرۆمەندو تێگەیشتو و لێزان و میهرەبان و زمان شیرین و ڕەزا سووک وهەڵسووڕ و کارزان ودەس ڕەنگین و لە خوا ترس و خواناس و خۆناس و خەڵک ناس بێ و ڕێزی هەر کەس بە پێی پێویست و بە ڕێژە(نسبة)ی خۆی بگرێ و ئامانجی هەر خۆشی و ڕابواردنێکی کاتی نەبێ و بە داهاتووی خۆی و ماڵی

مێردەکەی هیودارا بێ، نەک هەر تەنیا خۆی لە خۆشی و کامەرانیدا دەبێ و هیچ کەند و کۆسپێکی نایەتە رێ، بەڵکە دەتوانێ ئەو ماڵەش بکاتە چاوگەی ئەوین و مەکۆی خۆشی و شادی و نموونەیەکی بەهەشتی بەرین. کە بە داخەوە زۆر کەمن ئەو جۆرە ژنانە!!

جا چونکە لە گەڵ مێردەکەشی یەکتریان زۆرخۆش دەوێ و تەنانەت کاری ژن ومێردایەتیش هەرلە رووی ئەوینەوە ئەنجام دەدەن بێگومان ئاکامی زۆر چاکی دەبێ.

ئەوژن ومێردانەی کە یەکتریان خۆش ناوێ، یان زۆر پێکەوە گەرم و گوڕ نین و لە سەر بناغەیەکی ئەویندارانەوە زەماوەندیان نەکردووە، رەنگە کاری ژن ومێردایەتیش هەر لە رووی ئەوینەوە ئەنجام نەدەن، کە ئەو دەمیش رەنگە ئاکامی ئەو کارە منداڵێکی تەواو و جوان چاک و لەبار و ژیرو زیرەک و هۆشیار نەبێ یا هەرلە بنیڕا منداڵێکی فەلەج، یا ناتەواو بێ یا لە باریک لە بارەکان نا تە واوی ونا پوختە یی تێدابێ.

جا ئا لێرەدایە، کە دایکان وباوکان دەبێ هۆشیاربن وخەیانەت بە ئەمانەت نەکەن ومنداڵەکانیان جابە تایبەتی کچەکان زۆر جوان رابێنن و دوای راهێنان و بارهێنانێکی چاک ومرۆڤدۆستانە و موسڵمانانە ئەمجا فێری هەرشتێکی پێویستیشیان بکەن ئیتر دەبێ بارهێنان وراهێنان بکەنە بەردی بناخەی فێرکردن.

پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ دەفەرموێ: (لا ایمان لمن لا امانة له) واتا هەر کەس ئەمینداری و بەختەمامەتی نەبێ باوەڕی نییە. ئەمینداری بەردی بناخەی دیواری ئیمانداریيە.

جا هەر بۆیە لێرەدا عەرزی دایک وبابەکان دەکەم تکایە ئاگاتان لە منداڵەکانتان بێ کە ئەمانەتی یەزدانین بە لای ئێوەوە و

بەتایبەتی باشیان بار بێنن وهۆشیاربن ئەو کچانە کە ماڵی کابرایەکی بێگانە یاخزمی ئێوەن وخوای گەورە بۆی لە لای ئێوە داناون بە خووخدە وبیروباوڕە وبارهێنان وفێر کرانێکی تەواووجوانەوە بیاندەنەوە بە خاوەنەکانیان.

هەرلە بیرمە جارێکی باوکی بەڕێز و خۆشەویستم یاخوا بە بەزەیی خوای گەورە شاد بێ، بۆی گێڕامەوە و فەرمووی (دوو برا هەبوون بە نێوی عەبدوڵلا و مەلا حەسەنی حەمە قوتەی، کە بە هۆی ئەوە مەلا حەسەن فەقێی بابم بوو و زۆری لە لای بابم خوێندبوو تێکەڵاوی بنەماڵەییمان هەبوو، مەلا حەسەن کە برا چووکە بوو بە کاک عەبدوڵلا دەڵێ: دەبێ فیسارە کچەم بۆ بێنی و ئەویش دەڵێ جگە لەوی هەر کەس بڵێی بۆت دێنم، بەڵام مەلا حەسەن مانی دەگرێ و دەڵێ: جگە لەوی کەسم ناوێ. کاک عەوڵا کە هەر قایل نابێ سەرەنجام مەلا، ئایشێ هەڵدەگرێ و بە پێی دابی هەرێم مەسڵەت دەکرێ.

بابم فەرمووی پاش نێزیکەی ٢٨ ساڵ لە کاک عەبدوڵلام پرسی ئەرێ مەلاژن چۆنە و ئەتۆ لەگەڵ براژنت چۆنی؟ گوتی عومەر بە حەزرەتی عومەر ماوەی ٢٨ ساڵە لێی لە بەهانەم و دەمهەوێ جارێک لێی تووڕە بم، بەڵام هێشتا بەهانەم دەس نەکەوتووە).

منیش خۆم ئەو ژنەم لە کاتی پیریدا دیتبوو،کە لە ناوچەکەدا بەناوبانگ بوو. خوای گەورە پاداشی ویش و هەموو ژنە باشەکان بداتەوە و ژنە خەراپەکانیش چاک بکات. جا لیرەدا پیم وایە بی جی نییە، کە ئەو دو پارچە هەڵبەستەی، کە لەبارەی ژنی ژیرو ژنی کەردا نوسیومن بگونجینم، کە بەوشیوەی خوارەوەن:

# ژنی ژیر

وەرە بـوت بـا س بکـە م ژینـی بـە خوشـی
ژیـا نـی د ور لـە دە رد و هەم رو شـی
ژیـانی پـر لـە شـادی و شـادما نـی
ژیـا نـی پـر ئـە ویـن وکـامـە رانـی
ژیانیکـە لەگەڵ یـاری کـە ژیـرە
ژنـێکـی گـە ر دڵـی پڕهـۆش و بـیـرە
ژنێکـی وا دڵـی پـڕپڕ لەهەستـە
دەرونـی پـڕ لـە ئـاوات و مـەبـەستـە
ژنـی ئـاوا ژنـی ژیـرەژنی ژیـر
ژنـی ژیـر پـشتیـوانە وشـیرە هـەم تیـر
چەکـی شـانە لـە مەیـدانی خەبـا تـا
دنـە هـەستە لـە چـوارچیـوەی وڵاتـا
ژنـی ژیـر مـاڵ وسـامانی جیهانـە
هـەویـنی زینـدەگـی و ئـاوی ژیـا نـە
ژنـی ژیـر چـاکترینی هەرچـی چاکـە
بـی هەمتـایە ولـە ئەود نـیایـە تـاکـە
رونـاکی حەوش ومـال ودەرک وبانـە
بزوێـنیی هـە ستە رامـاڵی خـەمانـە
لەبـو مێـردی وەکـو شـورەوقە لایـە
مـەتـاڵ ولـەمپـەری د ەرد و بەلایـە
رە زا سـوکو خـوین شـیرین و پاکـە
لـە هەرباریکـە وە تـو بێـژی چـا کـە
زەی گـش کـات لەسـەردولێوی قەنـدە

بـــە وێـــنەی بولـــبولی مەســـتە بەخە نـــدە
ئەگەردیـــت ودە چـــی وەک بریـــسکە وایـــە
لەنـــا ومـــا لیـــشا هە روینـــە ی چـرایـــە
بهەدیـــــمەن هەرگوڵـــە وریحانـــە بـــونی
نییـــە قەت بێتـــە بە رچـــا وت بەمونـــی
لەگەڵ گـــش کەس بەروخوشـــی وبەگەرمـــی
دەئاخـــــیوی بـــە روخوشـــیو بەنەرمـــی
ژنـــی ژیـــرد ینـــە ، ویژدانـــە ، ژیانـــە
ژنـــی ژیـــر دەوڵـــە ت و ماڵـــی جیهانـــە
بومـــاڵ و میـــردی خـــوی هێنـــد تێدەکوشـــی
هەمونـــە نگیـــک و رازیـــک دا دە پوشـــی
ژنـــی ژیـــررە مـــزورازی زینـــدە گـــانی
وەکـــو پیویـــستە بەوچـــە شـــنەی دەزانـــی
تـــریفەی مانگـــە ئەســـتیرەی بەیانـــە
شـــەپولی نـــادلی دەر یـــا یەکـــا نـــە
گڵـــو پیکـــە لە مـــالا شـــوقی ســـوکە
هـــە میـــشە هەر بـــەوینە ی تـــازە بوکـــە
لە دنیـــاداچ شـــت چـــاترلەوی نـــین
شـــیرین ورونـــە هەروەک راوی هەنگویـــن
وەنەوشـــــــە وسویـــــــسن ودەســـــــکی
ریحانـــە شـــەمامە یدەســـتی مەردی میهـــرە بانـــە
کلـــوکی ســـورە لیمویە،بـــە هییـــە
ئیتـــر ئەوجێیـــە خوشـــە ئەو لەوییـــە
نـــە باتـــە نوقلـــە هـــە م قـــە ندوگـــە زویـــە
چ شـــتی لـــە و چـــاترە گـــە ربـــە دلـــی تویـــە

زنـــی زیرئـــاوی بـــارانی بـــه هـــاره
زمـــان شـیـریـنـــه تـــه ر د ه ســـته بـــه کـــاره
زنـــی زیـــر چـــه شـــنی دوکـــانی گولانـــه
هـــه تـــوان ومـــه لحـــه مـــی زامـی دلا نـــه
زنـــی زیـــرره حمـــه ت ونـــازی خودایـــه
لـــه هـــه رچـــی پـــه ستی یـــه دوره وجـــود ایـــه
شـــنه ی بایـــه نمـــه ی بـــارانی ورد ه
لـــه ســـه ر چـــومی خـــوریني ژیـانـــی پـــرده
بـــو زامـــی دل وه کـــو یـــه ســـاته وایـــه
زنـــی وا ریـــزی زوری پـــی ره وایـــه
زنـــی زیرهیـــزی ده ســـت بینـــایي چـــاوه
وزه ی ئـــه ژنویـــه هـــه م هیـــزی هـــه نـــا وه
زنـــی زیـــر ســـملی پـــه رزینـــی گولانـــه
وه کـــو خونچـــه ی نـــه پـــشکو تـــو ی چـــلانـــه
زنـــی زیرچـــه شـــنی حـــوری ناوبـــه هـــه شـــته
هـــه قـــالی پیاولـــه مـــال وکیـــووده شـــته
ژیـــان بـــی وی هـــه موهـــه رزانـــی روتـــه
لـــه کـــه کـــره ش تـــا لتـــره هـــه رزه قـــنه موتـــه
بـــه چـــه شـــنی زینـــی گـــورژی ده ردومـــه رگـــه
هـمـوی هـه رخـوارد نـــه وه ی خـــوینـــاوجـــه
رگـــه

**مەهاباد مانگی بەفرانباری سالی ٢٧٠٣ کوردی**

# ژنی کەر

وه ره بـــوت بیـــژم رازیـــکی نیهانـــی
لـــه بـــوت بـد ویـــم لــه ده ریـکی جیهانـــی
هــه لــی ریــژ م لـــه لات ئـــه ود ه رود ا خــه
د لــم پــر پرلـــه ئیــش وئـــو ف وئـا خــه
گــه لـیکم چــه شـتووه ئــه وده رده تالـــه
کـــه ژینـــم گـــشتی ژانـــه وئـــا ه ونالــه
بــه لــی یــه کجـارگران وســه خـت وتوشـه
ئــه وه ی ئــه وده رده ی لیبــی ژیــانی پوشــه
ئیترخوزگـــه بـــه وه ی قـــه ت توشــی نایـــه
ژنــی کــه ر،هــه رژنــی ژنــی ژیـری لـه لایــه
گـه لی کـس وک منـی بـه دبـه خـت وبـی فـه ر
ژیانـــی پـــرله ژانـــه ومـــالی پــر شــه ر
لـــه ســـایه ی هاوژیـــانی زورکـــه روپـــه ســـت
زمانـد ارونـــه زان وگـــه وج وبـــی هـــه ســـت
چ ناخوشـــــترین ت خـــــه ســـــارکه ر
ئیترهاوارلـــه ده ســـت وزمـــانی ژنـــی کـــه ر
ملوزمـــــه ، میملـــــه ، وه ک درک ودالـــــه
لـــه گـوینـــی تـالتـــره ، وینـــه ی گـوز الـــه
زمـــانی هـــه روه کـــو دریـــشوکه مـــاره
بـــو مـــا ل ومیـــردی هـــه م خوشـــی ، نـــه یـــاره
ئـــه وه نـــده هـــیچ نـــه زان وپـــه ســـت وپوچـــه
تـــه واوی ژیـــانـــی هـــه رتـــاوان وسوچـــه

قــسه ی گــش هــه روه کوگوللــه ی تفــه نگــه
هــه میــشه مالــه کــه ی هــه رپرلــه جــه نگــه
بوخـــوی گوناحبـــاره میردیـــشی وه کوخـــوی
ده کاگوناحـــبا ر ئـــه وه نـــدی بلـــویتن بـــوی
د ژی شـــادی ونـــه یـــاری خوشـــی یـــه ئـــه و
لـــه جیـــشد ا هـــه رشـــه ری ســـازه هـــه موشـــه و
بـــه شـــوخیش بـــی دوینـــی شـــه ر لـــه گـــوره
هـــه میـــشه لـــیوولـــوت ولـــیچـــی شـــو ره
وه کـــو گـــونی قـــوره گـــه منـــدالی زورن
کـه مورکـه ی جـه رگی پیـاوی خـه م نـه خـورن
بـــه مـــونی هـــه روه کومـــه یمـــونی قـــه لـــسه
ده بـی شـه رکـه ی لـه گـه لیـا بیـژی هـه لـسه
هـــه رخـــوی داری ده داتـــه ده ســـتی میـــردی
لـــه بوشـــه رده ســـوی هـــه رســـاتوروکیردی
د ه ریـــز یـــت و د ه پرژینـــی شـــتی مـــا ل
لـه مـال زیـزه بـه روژ ومانـگ و هـه م سـال
ئـه تـو هـه رچـی هـه تـه بیـده یتـی هیـشتا
ده لـی چـیم دیـوه لیـت وچیـیم لـه مـشتـا ؟!
شـــه ووروژ هـــه رخـــه ریکـــی قـــاچ وقوچـــه
گـــه رانـــی نـــا وشـــه قـــام وشـــار وکوچـــه
بـــــه لاییـــــکه ژنـــــی کـــــه ر
چ ده رد یـــکی گرانـــه ود ار ی بـــی بـــه ر
ژنـی کـه ر چـه شـنی شـیری کـه کـره تالـه
رونـــاکی هـــه رنیـــیه وتـــاریکی
مـا لـــه درند یکه به چه شنی گورگ وووورچـه
رو گـــرز وتـــا ل و تـــرش ومـــون مرچـــه

ژیـــان شـــیوینه ؛ مـــال تیکـــــد ه ر ره زا تـــال
د و پـــشک وهـــه ژد یهـــا یـــه ومـــاری نـــاوما ل
خـــه مـــی مـــالیی نییـــه وزوریـــش نـــه زانـــه
نـــه کابانـــه و نـــه بـــوکی دیـــوه خانـــــه
نـــه هـــاو رازه نـــه هـــاو ده رده نـــه هـــاوژین
گـــه لیـــک تفتـــه گـــه لیـــک تالـــه نـــه شـــیرین
ئـــه گـــه رشـــوی بـــه دبـــه خـــت روژتـــا ئیـــواری
بـــد ابـــا ی بـــا لـــی بـــی ورچـــا ن لـــه کـــاری
لـــه بـــه رچـــاوی نییـــه وهـــه ر هـــا تـــه وه مـــال
ژیـــانی ســـه د ئـــه وه نـــده ی دیـــش ده کـــا تـــال
ده لـــی توخـــوت ده روی بوکـــه یـــف وخوشـــی
منـــیش لیـــره م لـــه نـــاو ده روپـــه روشـــی
کـــه میوانـــت هـــه بـــو ده یکاتـــه هـــه لـــلا
بـــه هـــه رچی بلیـــی هـــه یـــه ؟ ئیـــزی نـــه وه لـــلا
ده کاشـــه رمـــه نـــده تـــوشماننـــه نـــدی میـــوان
ده قـــیز یـــنی هـــه تـــا ده تـــکا پـــه شیـــوان
ده لیـــی خوایـــه ئـــه مـــن ئـــه وقـــسه م لـــه بـــوکرد
کـــه ئـــابروی خـــوم لـــه لای میوانـــه کـــه م بـــرد
ژیـــان نازانـــی تـــرسیـــشی لـــه یـــه زد ان
نییـــه وناشزانـــی واتـــای د یـــن وویـــز دان
بـــه لایـــه ، ده رد ه ، ســـند انـــه لـــه مـــا لـــی
زمـــا نـــی دریـــژ ی و ی قـــه ت چـــا کـــه نـــالی
ئـــه گـــه ر گـــو رزده کـــا هـــاوار لـــه ده ســـتی
ژنـــی کـــه ر کـــه س نـــه لـــی: بـــی بیروهـــه ســـتی

**مانگی خەزەلوەریسالی ٢٧٠٢ کوردی – شاری مەهاباد**

دەبێ ئەوەش بزانین خوا بە بەهەشتی بەرین هەڵدەڵێ بە تێدا بوونی ژنی جوان وچاک وپاک وخاوەن شێوازوخووخدەی بەرز و دەفەرموێ ژنە بەهەشتییەکان ئاوا و ئاوان!!

بێگومان هەر بنەماڵەیەکی دایکی چاکی تێدا بێ ژیانی ئەو بنەماڵە خۆش بێ لیوەییە و منداڵی چاکی تێدا پەروەردە دەکرێن و هەر گەل و هۆزێک ژنەکانیان چاک وپاکداوێن و ژیر و هۆشیار بن لاوەکانیشیان هەروەها بار دێن و سەرەنجام ئەو کۆمەڵە کۆمەڵێکی چاک و خودایی دەبێ و لەژیان و خەبات و تێکۆشانا سەرکەوتوو و سەربەرز دەبێ و دەتوانێ بگاتە هەموو ئاواتێکی خۆی.

بەڵام با شەرم بکەن و خەجاڵەت ببنەوە ئەو دایک و باوکانەی کە لە باتی خووخدەی باش و بیر وباوەڕی خوداییانەو بار هێنان و فێر کردنی موسڵمانانە کچەکانیان بە مۆدی رۆژی ئۆروپایی و رۆژئاوایی و ئەلمۆدەی گاوری و خوا نەناسی و رەنگ و رەنگ کاری و سورا و سپیاو رووت دەکەنەوە و دەرازێننەوە و وەکوو بووکە شووشەیەک دەیاندەن بە شوو، ئەویش بە هەزاران فێڵ و مەکر نازو نووزە و مارە بڕانەیەکی سەخت و زۆر و کەمەر شکێن و خەرج و پیتاکێکی ماڵ وێرانکەرەوە دەچنە ماڵی مێردی و شانازیشی پێوە دەکەن. داب و مۆدی موسڵمانەتی و کوردایەتییان وەلا ناوەو داب و نەریتی گاورانیان رەچاو کردووە!! کە بە داخەوە زۆر جاران ئاکامێکی زۆر چاکی نابێ و وەک مامۆستا دەڵێ دەبینی بووکی ساڵێ دەری‌دەکەن لە ماڵێ.

من خۆم گومانم لەوەیدا نییە، کە لە چاخی مامۆستا هەرگیز ئەو هەموو داب و نەریتە گلاوانە و ئەو هەموو مۆدە و مۆدەکاری و ئەو هەموو خەرجە بێجێیانە و ئەو هەموو مارە بڕانە زۆرانە هیچیان نەبوون و ئەو دەم وەک دابی کوردی رەسەن زۆر بە سادە و

ساکاری و بە ئاسانی کچیان بە شوو داوە و کچەش زۆر بەڕێز و حورمەت و رووسوورییەوە چۆتە ماڵە مێردی جا هەر وەک دیارە مامۆستای بەڕێز گلەیی لەو بارەوە نییە، چونکە ئەو دەم ئەوە نەبووە بەڵام گلەیی گەورەی لە خووخدەی کچەکانە کە ناتوانن خۆیان لە گەڵ ماڵی مێردەکەیان رێک خەن وخۆیان لە گەڵ کەشوهەوای ئەو ماڵە کە بۆ وان ماڵ ومزڵێکی تزەیە جۆر دەربێنن.

بەڵام لە چاخی ئەودا ئەوە هەبووە، کە بە هۆی ئەوەی، کە کچەکانیان بە ئی خۆیان نەزانیون زۆریان لەگەڵ بێ موبالات بوون هێندەیان گوێ نەداونەتێ و زۆرچاکیان رانەهێناون وبە باشییان پەروەردە نەکردوون و تەنانەت تا دەورانی خودی مامۆستا هەر نەشیانناردوونەتە فێرگە و پێیان نەخوێندوون و مامۆستا خۆی یەکەم کەسە لە کوردستاندا کچی خۆی ناردۆتە فێرگە و ئەو رچەی بۆ خەڵکی کورد شکاندووە.

جا بۆیە دەفەرموێ:

دەرحەق ژنان بێباکن، بۆیە بێ داکی چاکن
سەیری حاڵی خۆ ناکەن وەک دڕکن لە ناو عەردان

مامۆستا ئەوەمان بە جوانی بۆ روون دەکاتەوە کە بارهێنانی منداڵی لە پێشدا لە سەر دایکە و دەبێ زۆر بە چاکی باری بێنێ و خووخدەی باشی بکا و ئەگەر خۆشی چاک نەبێ و لە بنیڕا چاک بار نەهێنرابێ، ناتوانێ منداڵەکەی بە چاکی بار بێنێ و پەروەردەی بکات.

بەڵێ دایک مامۆستای سروشتییەو پەیدابوونی منداڵ لەویڕایە و لە بارەی ئەنبووژەنی و بژۆنی(مادی و معنوی)یەوە منداڵ لکێکە لە داری دایک و دەبێ هەر لەویشڕا پێ بگات ئەگەر دایک چاک نەبێ و

منداڵەکەی چاک ڕانەهێنابێ دووسەد فەرموودەی پێغەمبەرﷺ شوێنێک لە سەر منداڵەکە دانانێ و سەعدیش ـ خوا لێی خۆش بێ ـ دەڵێ:

پرتو نیکان نگیرد هر که بنیادش بد است
تربیت نااهل را چون گردکان بر گنبد است

واتا ڕەنگ و خووی چاکان هەڵناگرێ هەر کەس کە بناغەکەی خەراپە ڕاهێنانی ناکەس وەک گوێز لە گومبەد هەڵاویشتن وایە، کە هەرچەندی تێیهەڵاوێی دێتەوە خوارێ و نایگێرێتەوە.

ئەو جار دوای ئەوەی کە باوێکی نالەباری کوردەواری لە قاو دەدا و بە ناحەزی نیشان دەدا و بە خەراپی دەنوێنێ کە ئەویش زەماوەندی ناپەسەندی هێندێک لە بنەماڵە کوردەکانە و بە کورتی دوای ماوەیەک لە بەر یەک هەڵوەشانەوەی ئەو زەماوەندەیە دێتە سەر باسێکی دێژەیی (شرعی) و بۆمان باسی ئەوەی دەکا، کە بە بێ عوزرێکی قبووڵ و بێگوناح و تاوان بە هیچ جۆرێک ژن تەڵاق دان دروست نییە و تەنانەت پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێ: (ابغض الحلال عند الله الطلاق) ناخۆشەویستترین حەڵاڵ بە لای خوداوە تەڵاق و ژن بەردانە.

جا مامۆستا بە توندی ئەو کارە مەحکووم دەکا و بە ناپەسەندی نیشان دەداو دەڵێ دەبینی جاری وایە بووکی یەک ساڵە لەماڵی مێردی وەدەردەنرێ و تەنانەت رووتیشی دەکەنەوەو هەموو بەرگ و جل و خشڵ و زێڕ و زیوەر یشی لێ دەکەنەوە و بە توێی دەسماڵ و بە کەوشێکی رووت، کە ئەوەش کارێکی زۆر نامرۆڤانە و نامووسڵمانانەیە وەدەری دەنێن!!

ئاخر زۆر شتێکی سەیرە خۆ ژن ئەگەر ژن بێ وەکو گوڵێکی جوانی بۆن خۆش وایە، کە بۆن و بەرامەکەی ئەو ماڵە کە تێیدایە پڕ دەکا بەڵام لە کوردەواریدا ئەو گوڵە جوان و نازەنینە هەروا لە خۆڕا و بێ هیچ بەڵگەیەکی دێژەیی لک و پۆپی دەشکێنن و پەڕپەڕی دەکەن و هەڵیدەکێشن و فڕێی دەدەنە دەرەوە!!

جا بۆیە دەفەرموێ: ژنیش لە ژیاندا هەروەکوو پیاوە و ئەویش هەروەک پیاو چاو لادانی لە سەرە و فەرمانی خوا بۆ هەردووکیان وەکوو یەکە و جیاوازییەکیان نییە مەگەر لە هێندێک مەسەلەی تایبەتیدا. بەتایبەتی ئەرک و بەرپرسیەتی ژن گەلێک گەورە و گرینگە چونکە ئەو دایکەو دایکیش هەر وەک گوترا ئەرکی بارهێنانی منداڵی لە سەر شانە کە بەڕاستی ئەرکێکی زۆر سەخت و دژوار و گرینگ و گەورە و گرانە.

جا مامۆستا دەفەرموێ ئەرکی ژن گەلێک گەورە و گرینگە و دەزانی ئەو ئەرکە گەورەش چییە منداڵ بوون و پەروەردە کردنە و بارهێنانی منداڵەکەش بێگومان ئەرکێکی گەلێک گەورە و گرینگ و سەخت و دژوار و لە راستیدا بناخە و بنچینەی رەوش و خووخدەی خەڵک و گەل و کۆمەڵ هەمان راهێنان و بارهێنانی منداڵە کە لە لایەن دایکەوەیە، جا هەر بۆیەش لەو بارەوە دەفەرموێ:

ئەووەڵ چشتێ دەچێتە گوێی منداڵ لە ناو لانکێ
گەر چاکە و گەر خەراپە لای لایی دایکێ

بەڵێ مێشک و دڵی پاک وبێ گەردی منداڵ وەکو قاقەزێکی سپی و بێ پەڵەیە کە هیچ شتێکی تێدا نەنووسرابێ و هەوەڵین نووسەریش لە سەر ئەو قاقەزە پاکە دایکە و هەرچی لێی بنووسێ دەمێنێتەوە،

[illegible]یاری و فێر کردنی کاتی منداڵی وەکوو نەخشە کێشان لە سەر بەردییە و زۆر بە زەحمەت دەشۆرێتەوە.

ئەگەر کەسێک بیهەوێ کەسێک بە کەیفی خۆی رابێنێ دەبێ لە پێشدا تەواوی راهێنانەکانی، کە لە دەورانی منداڵی و وەرگرتووە و لە چوارچێوەی ژیانی فێری بووە لە دڵ و مێشکی وی بشواتەوە جا ئەو جار بە کەیفی خۆی لە سەری بنووسێ کە ئەوەش زۆر بە زەحمەتە و شووشتنەوەی بە یەکجاری هەر ناگونجێ و لە توانای کەم کەسدایە. تەنانەت جاری واش دەبێ کە کابرا هەر تێیدا سەرکەوتوو نابێ و شکستی دەخوا و رەنج بە خەسار و زەحمەت بە فیڕۆ دەبێ.

جا ئەگەر کەمێک لەو پارچە هەڵبەستەی مامۆستا ورد ببینەوە بۆمان دەردەکەوێ، کە چەندین باس و مەبەستی گرینگ و پڕ واتا و جوانی زۆر لێزانانە کۆ کردوونەتەوە و چۆن سەرەتای وتاری بە ئایەتی قورئان دەس پێ دەکا و پێمان دەڵێ کە ئەگەر موسڵمانین دەبێ بە پێی قورئان رەفتار بکەین.

## تەڵاق

خـــودا فەرمـــووی لە قورئـــان (الطـــلاق مرتـــان
فامـــــساک بمعـــــروف او تـــــسریح باحـــــسان
بڵـێن بە قەومـــی کـــوردان دەســـتی مـــن و دامێنیـــان
عەیـــبە بە حەقـــی قورئـــان ژن هێنـــان و تەڵاق دان
ژن زینەتـــــی دنیـــــایە ئەمـــــانەتی خـــــودایە
حەبیبـــــی مـــــستەفایە قەڵاتـــــن لە بـــــۆ مێـــــردان
ژن ئەگەر بە حـورمەت بێ، بێزیللەت و زەحـمەت بێ

بە تەربیە و خزمەت بێ، دڵگوشاد و لێو خەندان
کوڕی دەبێ وەکوو شێر ئاقڵ و دانا و دلێر
بە دڵ غەنی بە چاو تێر، سەردار و مەردی مەیدان
ژنێکی دەربەدەر بێ، دڵ پڕ غەم و کەدەر بێ
رەزیل و دەس‌بەسەر بێ، وەک مەحبووس لە ناو زیندان
دەبێ ئەولادی کوو بێ؟ بێ‌ڕەوت و هەم بێ‌ڕوو بێ
مێشکی وەکوو کەدوو بێ، ترسەنۆک وەک یەهوودان
زەرد و زەعیف و باریک، گوێ گران و چاو تاریک
لووت بەچڵم و دەم بەلیک،سارد و سووک و سەرگەردان
ئێوەی ئەی گەلی کوردان ئەی هەزارانی نەزان
ئەی بێئاگایان لە ژیان لە رێگەی راستی قورئان
دەرحەق ژنان بێ‌باکن، بۆیە بێ داکی چاکن
سەیری حاڵی خۆ ناکەن وەک دڕکن لە ناو عەردان
کێ دایکی چاکی نەبێ هەر بێ تەربیەت دەبێ
دواکەوتووی کوللی عالەم بێبەش لە هەر دوو جیهان
تەربیە لە لای داکە داک چابێ ئەولاد چاکە
باب لە ئەسڵا بێ باکە فەرقەکی ناکا چەندان
داک مامۆستای فیتریە پەیدا بوونت لەویە
بە مادی و مەعنەویە خەراپە لە رێی لا دان
کە داکی چاکی نەبێ دووسەد حەدیسی نەبێ
چلۆن تەئسیری دەبێ وەک پف لە پوتک و سندان
دۆڵ و زوڕنا و هەڵپەڕین ژنێ بۆ کوڕمان دێنین
زۆر پێ ناچێ دەبینین شەڕ و شۆڕ و تێکهەڵدان
ئەووەڵ خەزوور و خەسوو تێدەکۆشن دوو بە دوو
بە دزی یان رووبەڕوو لێکیان دەکەن بە فەندان

رۆڵە ژنـــت تەڵاق دە بـــۆت دەهێـــنم هەتـــا دە
لە کچـــانی بەگـــزادە، بیکەیـــنە خەنەبەنـــدان
دەبینـــی بـــووکی ســـاڵێ دەری دەکەن لە مـــاڵێ
بە تـــای سـۆل و دەســماڵێ بـێئـاوێنە و بـێکلـدان
لە شـــەریعەتی رەســـووڵ بـێعـــوزرێکی زۆر مەقبـــوڵ
حەرامە قەتعـی مەوسـوول، گونـاهە دەس لێـک بەردان
ژنـیش وەک مـوزەککەرە، عەیـنەن ئەویـش بەشـەرە
چـاو لادانـی لە سـەرە، هەر دوو لە یەک حـوکم دان
وەزیـــفەی زۆر گەورەیە دەزانـــی ئەویـــش چەیە؟
منـداڵ بـوون و تەربـیە بـێمەسـخەرە و جـوێن پـێ دان
ژنـان قەت تەڵاق مەدەن، لە گەڵ یەک مـومتەزیج بـن
وەکـــوو رۆح لەگەڵ بەدەن، بە ئـــولفەت و دڵـــشادان

# پارچە پەخشانێک سەبارەت بە نەخشی ژن

پیاو هەر دەڵێی شەتاوێکی رەوان و گەرم و کوڵهاتەیە کە لە رەوگەی خۆیدا هەمیشە هەر دەڕوا و شەپۆلان داوێ و زڵقان دەدا و بێڕاوەستان، زۆر بە توندی دەهووشێنێ و مۆنج و پێلان دەدات و بە غوڕڕەم بەرەو ئامانجێکی نادیار بە کوڵە کوڵ هەر دەڕوا و دەهاژێنێ، گەلێک لەکوڵ و زۆر لە جۆش و خرۆشە و راناوەستێ و هەدا نادا و داناسەکنێ و دانامەزرێ و ئیتر تاوێکیش تک نادا.

وەک شێرێکی سەرگڕە پێچەی تەندوورێکی نێڵ دراوە، کەفێ دەکاو هەڵدەچێت و زڵقان دەدا و پڕنچکان داوێ. یا ئاسنێکی داخی داخی سوورەوە بووی ناو کوورەیە و پرنجکی ئاوری لێ دەبنەوە و گش تیەن(حجم)ی ئاوری رووتە.وەک سۆبەیەکی داخراوی نێڵ دراوەو مەڵبەندێکی گەرم دەکا دانامرکێ و ناکوژێتەوەو هەریمێکی وە کوڵ دێنێ.هەروەک شێرێکی تووڕەیەو دێت و دەچێ و دەلرفێنێ و دەگرمێنێ و دەهاژێنێ دار و بەرد لێک رادەکێشێ و مەڵبەندێکی دەهەژێنێ و کام جێگایە زۆر حەستەمە و قەت نەڕووخە و قایم و قۆڵە و بڕبەندیش کاری لێ ناکا تێکی دەدا و دەیڕووخێنێ و دەیڕمێنێ و لەبەر یەکی هەڵدەوەشێنێ و بە یەکجاری کڵێسی دەکاو دەیکاتە کەلاوەیەکی وا کوندە بەبوو لێی بخوێنێ.

بێگومان دەبێ کەسێک هەبێ وەیلاوێنێ و دەستێکی میهرەبانانەی پڕ ئەوینی بەسەر سەریدا بهێنێ دەنا دنیا وێران دەکا ئاور و ئاسن تێکەڵ دەکاو دار و بەرد لێک رادەکێشێ، خەو لە چاوان حەرام دەکا، جووڵانەوەی هەموو زیانە و رەوشی وێرانکەرییە.

دیارە روون و ئاشکرایە و شتێکی گەلێک سروشتییە کە هەوێنی ئەو شیرە لە جۆشە و دامرکێنەری ئەو ئاورە بەتینە و هەروەها سارد کەرەوەی ئەو ئاسنە سوورەوە بووە وئارام کەرەوەی ئەو شێرە کەفپـڕژێنە و هێدی کەرەوەی ئەوسۆبە نێڵ دراوە هەرژنەوتەنیا ژنە وبەس، ئیترهەر ئەوە کە بتوانێ بیهێنێتەوە سەرژیواروحاڵەتێکی ئاسایی ولەوهەموورق وقین و تووڕەییە بیگێڕێتەوە

بەڵێ بەڕاستی ژن هەوێنی شیرو دامرکێنەری تەندووری نێڵ دراوو سارد کەرەوەی ئاسنی قاڵ و لاوێنەرەی شێری تووڕەو تۆسن رق هەڵستاوی پیاوە و بێگومان پیاو هەرلە پەنای ژندا ئارام دەگرێ وهەربە هۆی ژن ئۆقرە دەگرێ و هەر بە هۆی وی و هەر لە گەڵ وی تامێ لە ژیانی خۆی دەکا و چاک تێدەگا تام وبۆن و بەرامەی ژین چییە، ژیانی بە ژنەوە ژیانە، دەنا دەرد و کوڵ و ژانە، ژین بە ژن لە ژان دەردەچێ وهەر ژنیشە کە ژیانی پیاودەکاتە دەرد و ژان و ژەقنەمووت. جا ئەو حاڵەش کە ئاوایە دیاردە و نیشانەی خودایە و خۆشی لە قورئانی پیرۆزدا ئاوا ئەفەرمێ: ﴿ وَمِنْ ءَايَٰتِهِۦٓ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَٰجًا لِّتَسْكُنُوٓا۟ إِلَيْهَا ﴾ روم:٣٠. لە دیاردە و نیشانەکانی خوایە ئەوە کە دروستی کردووە بۆ ئێوە هەر لە خۆتان و لە چەشنی خۆتان هاوتا(ژن)انێک، تا لە پەنای واندا ئارام بگرن و بحەسێنەوە.

بەڵێ ژن هۆی ئارام گرتنی پیاوە و هۆی ئارامش و حەسانەوە و تەکدان و هەدادانیەتی. ژن ئەگەر ژن بێ و ژان نەبێ، گوڵی دەستەچنی پیاوە، چەپکە و دەسکەی ریحانەیە، شادی هێن و خەفەت بەرە و شیرین کەری زیندەگانی و تاڵی رەوێن و دژی دەردو کوڵ و خەمە. ژین و ژیان، مان و هەبوون، بێداری و خەو، لاوی و

پیری و ماڵ و سامان، دنیا و پەسڵان هەمووی هەر بە ژنەوە نەخشینە و هەر تەنیا بە ژنەوە رەنگینە. ژن مەڵحەم و هەتوان گش زام و برینێکی ناو دڵی پڕ کوڵی پیاوە، دەرمانی دەرد و ناسۆرە، هێمنی شەوی بێچرپە و پرتە و رووناکایی رۆژی روونە.

ژن هەسانە لە بۆ مێرد و ئامرازی تورنجی پیاو سوینە، ژن خونچەیە و گجولەی داری بەرییە، گوانی ئاژەڵی ئاوسە و داوەستاوی هیوا و هومێدی ساوایە، ژن بۆن وبەرامەی گیابەند و خاو ترووسکەی گوڵ و بسکی بەڕەزا و بیزایە، ژن نەسرین و نەستەرەنە و شەوبۆ و شلێر و شەشپەڕە، شەمامەی بەردەستی پیاوە بۆ راموسین و هەڵمیسین شەو و رۆژ لە دەستی دایە، ژن گوڵێکی زۆر نەخشین و ژن رێحانەی ناو پەرژینە، ژن لە گوڵەباغ، دەنکی هەنار، دوڕ و مەرجان، گەوهەر، یاقووت، لە نەقیمی ئەنگوستیلەی قامکی چووکەی بووکی سەنگین و رووسووری تازە و یەکشەوەش جوانترە، لەبارترە، دڵگرترە، بەرچاوترە و زۆر چاترە، ژن گوڵێکی نەشمیلانە و خشتیلانە و رەزا سووک و خوێن شیرین و دڵڕفێن و هەست بزوێنە، ژن شەوچرای دیوەخانی گەورە پیاو و مێرخاسانی رۆژگاری تازە و کۆنە، وەکوو هەوری بەهارانەو خوناوەی ژین دەبارێنێ، شەواوی بێستانی تینووی تیەنی پیاوی تەمەنداری تامەزرۆیە.

ژن تام و بۆی تون بەتونی چێشتە خۆشکەی دەستی کابانی قازاخە،گرشە و ورشەی ئەستێران و پێلی مانگ و تیشکی رۆژ و مەندی ئاوی دەریای قووڵ و هەوای هاوینی کوێستانە، ژن ئەوینی راستەقینە و ئیشتیاو ئارەزوو و ئامانجی بەرزی پیاوی هیواداره،رازی دڵی دڵداران و ئەوینی ئەویندااران و هەستی مێشکی هۆشیاران و بیری روونی خاوەن بیری گەلێک ژیری کەمێک پیرە.

ژن دیمەنی چیا و چیمەن و قنەی کەو و رەوتی کۆتر و دەنگی زوڵاڵی تاڤگەیە و ئاهەنگی شمشاڵی شوانی کێوەکانی کوردستانە.

ژن فاز یا نۆڵی بریسکەیە و بێ وی هیچ گڵۆپێک نایسێ، ژن گەرمایی ماڵی سارد و سرِی پیاوی رووتە و شەوقی ماڵە و بە تەنیا نیوەی جیهانە، ژن بۆ پیاوی جلوبەرگە و داپۆشەری لەشی رووتی پیاوی لەش پڕ لە کەوەنە و شێرەرەوەی نەنگەکانەو شوورەییەکان دادەپۆشێ.

ژن وەکوو شانەی هەنگوینی شلْخە و پوورەی یەکساڵەیە، ژن وەک خامە یا توێ شیر و مەیرەو پەنیری تازەیە،ژن رۆنی زەنگ و کەرەیە،ژن لە هەویر نەرمترە،لە جوانی جوانتر و لە گەرمایی گەرمترو لە خودی تین بە تینتر و لە ئەوین پڕ ئەوینترە، لە شیرنایی شیرینتر و لە خودی تام بە تامتر و لە هێمنی هێمنتر و لە دایک و باب دڵسۆزتر و لە کوڕ و برا پشتیوانترە.

گەورەترین نازی خودایە و رۆژی گیانە و ژیری و بیر و هەستی پیاوە و خواش ئەوی بۆ پیاو داناوە، خۆشەویستی پێغەمبەری گەورەمانە و ئەمانەت و دیاری خودایە، پێغەمبەریشﷺ پێی هەڵدەڵێ و لە بارەیدا دەفەرموێ: (الدنیا متاع و خیر متاعها المرأة الصالحة) جیهان هەمووی هەر سامانە و چاکترینی ئەو سامانەش ژنی چاک و میهرەبانە

ژن شادییە، رزگارییە، خۆشییە هەم ئازادییە، ژن خۆراکی هەزار تامە و گوڵی هەزار رەنگ و سەدان بۆن و بەرامەیە.

بەڵام سەد داخ و مەخابن، هەزاران جار بە داخەوە ژنان زۆر کەمیان وا چاکن، کەمیان خاوەن ئەو شێوازەن، خووخدەی هەمووان وا نییە، هەموویان بەو رەوش و رەفتارە نین، ژنی وایە

زۆر بەدفەڕ و زۆر زماندار و بەدڕەوش و بەد کردارە، زمانی تیژ و درێژو بەدی وەک درێشوکەی ماری گانگێ بەو لاو لایاندا دەیگێڕێ و سام دەنوێنێ و خۆی رادەنێ، لە خووخدەی باش بێبەشە و روو هەڵماڵاو و رووڕەشە، وەک دووپشک و هۆڵەپەزە، دڕندە وەک گورگ و ورچ، لە خەزرین و مانگرتنا نە مالۆس و نە یەکانە دەسکانیشی لە دوا ناکەن، چڵکن، قرژن، مۆن و مرچ، وەک نەخۆشی شێرپەنجەی مێشک و خوێن وایە و بە یەکجاری پیاو سیس دەکا.

وەک ئازارە باریکەیە و هەر ژەقنەمووت و سندانە، گوژاڵ و کەکرە نایگەنێ و لە تاڵە گەزەش تاڵترە، وەکوو درووی دڕوو دوک وایە و لە کەنگر و کیفار دڕترە، ئۆقرە و ئارامی پیاو کوژە و زیانی بۆ ئاییندیش زۆرە، وەک گەردەلوول و گێژەڵووکەی چلەی جستانەو ئارامی و هێمنایەتی ماڵ و حاڵان رادەماڵێ و زیان لە خۆشی و کەس و کار و ماڵە مێردان دەشێوێنێ. کرێوە و تۆفان و باکوتە و پیاوی لە سەرمان دەکوژێ، گەرمای هاوین وسەمموونە و مێشکی مرۆڤ وە کوڵ دێنێ، تووڕە و تۆسن و قەڵس و قۆڵە و بزەی نایەتە سەر لێو و بەزەی بە خۆشیدا نایە، هەر هەوایەکی دەزانێ و ئەویش هەوای دژایەتی و نەیارییە، هەر ببزوێ زیانێک دەدا و ماڵ کاولکەر و دەس ڕەشە، زۆری واش هەن پیس و پۆخڵ و قوون قولەتێن و داوێن پیسن، پیسکێر و بێز هەڵستێنن، ڕێزی هیچ کەسێک نازانن و لە خوا نەترسو بێدینن، بێویژدانن، بێئایینن، مێرد نەناس، ژیان نەزان و ناخاوێنن، لە ماڵە مێرداندا دژ و زۆر نەبان و زۆر نامۆنە. ژنی وا هەیە هەر بەڵایە، بەدبەختییە و لە ماڵێدایە، هەرچی دەیکا بە شەڕ دەیکا، و ئاشتی لە جانتادا نییە، وای بە رۆژێک ژنی ئاوا بڕوا بە بووکی بۆ زاوا و ببێتە کابانی

ـالان، بـۆ بەدبەختـی کـابرای مێـردی ببێـتە دایکـی منـداڵان، دوور نەڕۆین گورژی گوتەنی: ژنی ئاوا یاخوا خـودا، بە دوژمنـی منیـشی نەدا.

جا هۆنەری کورد جەنـابی مـوفتی پێنجـوێنی لەو بـارەوە پـارچە هەڵبەستێکی زۆر جوانی هەیە کە بۆ رازاندنەوەی مەبەستەکە دێرەدا دەیگونجێنین.

## ژنی باش

گەر خـودا بـی دا بـە چـاکی دەوڵەتـی شـاهانە ژن
نیعمەتێکـە وەک بەهەشـت و هـاودەمی پیاوانـە ژن
بـۆ دڵێکـی بـێ‌خەم و شەخـسێکی بـێ‌دەرد و ئەلەم
گەوهەرێکـی شـەو چراغـی ژوورو بەر هەیوانـە ژن
گەر کەم و کوڕیـت لـە ماڵیـشا هەبـێ باکـت نەبـێ
بـــۆ کەم و کـــوڕی تـــرازوی کـــۆمەڵی خێزانـــە ژن
ژن لەلای پیـاوی نەزان و سەرسـەری نرخـی نـی‌یە
بـــۆ ژیـــانی کـــۆمەڵیی باشـتر لـــە میـر و خانـە ژن
بۆ سوپاسی باسـی چـاکی چـی بەیـان‌کەم هەر کەمە
جووت و ئاش و نان و بەرگ و باغچە و بێستانە ژن
باعیـسی ئـارامی قەلـب و مەرهەمـی دەرد و بـرین
بـۆ هەمـوو دەردێ دەوا بەخـشێکە وەک لوقمانـە ژن
دەوڵەتێکـی پـڕ لـە شـەوق و زەوقـە دایـم بۆ بەشـەر
نیعمەتێکـی خۆشەویـستی و بـێ‌سـەر و سـامانە ژن
کەی گـوڵ و گـوڵزاری باخـاتی ئیـرەم وەک ئەو ئەبـێ
بـاخی سـاحێب زینـنەت و پڕ لوئلـوء و مەرجانـە ژن

بـۆ کەسـێ نـووری سـولەیمانی لـە قەلبـا بـێ یەقـین
پایـە مەحـکەم کردنـی هەق، دیـن و هەم ئیمانـە ژن
زۆرتـری عەیـشی بەهەشـتی (حـوری العـین) کچـن
لەززەت و خۆشـــی بەیانـــانی لەنـــاو قورئانـــە ژن
بێتو گەر موڵکی کەماڵ و گەنجی حوسنی یەک کەوێ
گەر دووسەد گەنجی لەسەر دانێی ئەڵێم هەرزانە ژن

## ژنی خەراپ

گەر خـــودا نەیـــدا بـــە چـــاکی دوژمنـــی ئینـــسانە ژن
مـــار و دووپـــشک و پڵنگـــی شـــاخی هەورامانـــە ژن
گەر گلـۆپی دوو سـەدیش هەڵـکەی لـە مـاڵ و مەتبەقا
دووکەڵـی حەوش و حەسـار و ژوور و بەرهەیوانـە ژن
تـۆ دە پەیـدا کەی لـە رۆژا ئەو بـە سـێ داناکەوێ
هەر خەریکـی قـاووچ و قـوچ و بـردن و تالانـە ژن
گەر نەخۆشـینت نەبێ سـیل داری و دڵ پـڕ لـە خەم
چۆتـە نـاو جەرگـت بـە دایـم ئـێش و دەرد و ژانـە ژن
گەر لەگەڵ ئەودا بەهەشـتت پـێ بـدەن لێـی رائەکەی
تـا وەکـوو مـردن عەزیـزم دەردی بـێ دەرمانـە ژن
گەرچی شێوەی شۆخوشەنگ و دوورکوژ و پڕعیشوە بێ
تـۆ لەبەر چـاو و دڵـت شـێوەی وەکـوو شـەیتانە ژن
بـۆ خراپـی ئەو قەڵەم ئەشـکێ و زمـانیش کـوڵ ئەبـێ
قـابیزیش رازی نەبـێ هەر ئیـشی گیـان کێـشانە ژن
هەر بـڕی موفتی کـە وا دیـم لەڕێـی راسـتی ئەڕۆی
هەر بڵـێ تـا مردنـت دەرد و بەڵای ئینـسانە ژن

# مامۆستاو گاندی، یا کورد و هیندی

ماهاتما گاندی، کە پیتۆڵ و خەباتگێرێکی گەورەی هیندووستانێ بووە و لە نێوانی ساڵەکانی ١٨٦٩ و ١٩٤٨دا ژیاوە و ماوەی بیست ساڵی رەبەق بۆ رزگاری کردنی وڵاتی هیندوستان لە چنگی داگیرکەرانی ئینگلیس خەباتی شێلگیرانە و هێمنانەی رامیاری خۆی درێژە پێداوە و بە هەموو هێز و توانای خۆی بۆ ئەو کارە تێکۆشاوە و، تا دوا هەناسەی ژیانی پڕ لە شانازی لە خەباتی نەتەوایەتی رانەوەستاوە.

لە ساڵی١٩١٤گەڕایەوە بۆ وڵات و نیشتمانی خۆی و سەرکردایەتی بزووتنەوەی نیشتمانی هیندی لە ئەستۆی خۆی گرت و رابەرایەتی هێمنانەی گەلی هیندی، تا رزگار بوونی یەکجاری هیندوستان لە چەنگی خوێناوی ئینگلیستان کردووە و بۆ ئەو مەبەستە چەندین جار مانی لە خواردن گرت ، تا سەرەنجام لە ساڵی ١٩٤٧ هیندوستانی بە سەربەخۆیی گەیاند، بەڵام لەو رێیەدا گەلێکی سەختی تووش هاتن و گەلێک بۆئەو گەلە ماندو و مجرۆ و برسی و تینوو و گەلێکیش شەکەت و لە پەژارەدا بوو، تاڵی و سوێرییەکی یەکجار زۆری لەو رێیەدا چەشت و هەمیشە هەر هەناسە سارد و ماندوو بوو، مامۆستا ئاسا تا مردنی نەحەسایەوە.

جا مامۆستای گەورەش، کە دەتوانم بڵێم بۆ گەلی کورد لە گاندیش ماندیتر بووە و لەویش دڵسۆزتر و هەناسە ساردتر بووە خۆی وەکوو گاندی دادەنێ و دەڵێ:

منیش هەر وەکوو گاندی هەناسە سارد و ماندی
لە قەومی کورد و هیندی، ئەوی خێر بوو نەماندی

بەڵێ بەڕاستی جێی خۆیەتی کە مامۆستا دەفەرموێ: منیش هەروەها و لە چەشنی ماتما گاندی بۆ گەلەکەم دەردەدار و بە ئازارو خەمبار و پەژار و پەرۆشم و گەلێکیش شەکەژۆ و بێهیوا و هەروەها ماندوو و هەناسە ساردم.

منیش هەر وەکوو ئەوی خەمبار و بەرۆشدارم. منیش هەر وەکوو وی دڵ پڕ دەرد و پەژارەم، چونکە منیش هەر وەکوو وی دەبینم گەلەکەم برسی و هەژارو زوری لێکراو و رووت و رەجاڵە و ستەمکاران دەیچەوسێننەوە دەیخۆن و دەیبڕێننەوە.

بەڵام من دەڵێم دردی مامۆستا هەزار بەرابەر لە دەردی گاندی دژوارتر بووە و مامۆستاش خۆی زۆر زۆر لە گاندی ماندیتر بووەو مەنجەڵ دڵی پڕ لە کوڵی لە هی گاندی لە جۆشتر بووە.

چونکە گاند لەگەڵ یەک دەوڵەتی زۆردار ڕووبەڕوو بووە، بەڵام شەشسەد ملوێن هیندووزی بە پشتێوە بووە و وێڕای وی خەباتیان کردووە و تەنانەت لە قسەشی دەرنەچوون و هەرچی ئەو فەرمانی دابێ هەموویان خێرا بەڕێوەیان بردووە و خەیانەتکاریشیان لە نێودا نەبووە و هەموویان هەر دڵسۆز بوون.

بەڵام مامۆستای هەناسە سارد و ماندووی کوردستان لە گەڵ سێ دەوڵەتی زۆرداری وەک ئێران و عوسمانی و ئینگلیس پێوە بووە و کوردستانەکەی وییان کردۆتە سێ پارچە و کەسیش گوێی نەداوەتە هات و هاوار و ناڵە ناڵ و گریان و زاریی دڵسۆزانەی و بە داخەوە ئاە و هەناسەکەشی کەسی نەگرتووە و هەرچەندی لە بەر خوداش هەڵباوێشکاوە تووک و نزاکانی گیرا نەبوون.

کوردەکان لە باتی ئەوەی وەکوو هیندییەکان، کە پیاوانە کەوتنە دوای گاندی دڵسۆز و رابەری راستەقینەی خۆیان و زێد و نیشتمانەکەی خۆیان رزگار کرد و داگیرکەر و چەوسێنەریان بە

جۆکدا هێنا و لە وڵات بە جارێکی راویان نا، بکەونە شوێن مامۆستای لێزان و دڵسۆز و هۆزان و خەمخۆری کورد و کوردستان، بوون بە سەدان قۆڵ و هەر قۆڵەی کەوتنە داوی شێخێکی خەیانەتکار و لە باتی ئایین و رامیاری روویان لە تەریقەت کرد و گەل و نیشتمان و ئایین و خوایان لە بیر چۆوە!! چاکیان بە خەراپ گۆڕییەوە و دەس بەتاڵ و رەنج بە خەسار و ماڵ وێران و هەڵوەدا بوون!! خوایەکی گەورە و تاک و تەنیایان کردە سەدان خوا و شەریعەتیان دا بە تەریقەت و ئیتر تەریقەتیش ئەوەیە، کە دەیبینین.

من خۆم هیچ گومانم لەوەدا نییە، کە ئەگەر ئەودەم کوردەکان لە هەر سێک پارچەی ئەودەمی کوردستان راپەڕیبان و مامۆستای گەورەیان کردبا بە رابەری خۆیان و خەباتێکی خواییان دەست پێ کردبایە، سەرکەوتنیان لە سەرکەوتنی هیندییەکان مسۆگەرتر دەبوو. هەر لەو دیارییە چووکەڵەی خۆیدا، کە بە تیەن (حجم) زۆر بچووکە، بەڵام لە راستیدا جیهانێکە لە چەند جێیاندا بەرنامە و نەخشەی ئەوەندە جوان و بەجێ و رامیارییانە بۆ کوردان دادەڕێژێ، کە هیچ رامیار و پسپۆڕێکی رامیاری و سپایی و کۆمەلایەتی تا ئێستا نەیدیوە و نەیکردووە بەڵام بە داخەوە کوردی بێچارە و هەژار هەرگیز دۆست و دوژمنی خۆی لێک جیا نەکردۆتەوە و خۆی هاویشتۆتە باوەش هەر دوژمنێکی خۆی یا دوژمنی دۆست نوێن و لە دژی دۆستانی دڵسۆز و خەمخۆری خۆی راپەڕیوە و هەزاران نێوو ناتۆرەی بۆ هەڵبەستوە و ئەگەر یەکێک ویستبێتی ئەو خەڵکە هەژار و سەر لێشێواوە روون بکاتەوە، دەهۆڵی کافریەتی و زوڕنای بێئایینییان بۆ لێداوە و چەپڵەیان لێ تەقاندووە و بە کەیفی خۆیان ئازاریان داوە و دیارە داگیرکەرانی

کوردستانیش هەر ئەوەیان ویستووەو هەر بۆئەوەشیان هان داون و کۆلکە مەلاو گەندەڵە شێخەکانیش بە دەوریانەوە هەڵپەڕیون. هەر کەس پێی گوتبن وا نابێ و نابێ وا بکەن، خێرا بوونەتە دژ و نەیاری!!

مامۆستاش جوانی هەست بەو مەبەستە کردووە و بە پەرۆشەوەو بە دڵی پڕ لە کوڵەوە ئاماژە بۆ ئەوە دەکا و دەفەرموێ:

مەلا گەر بێ و بڵێ نا بێ وەها بێ
دەڵێن ئەو فاسیقە بۆتە وەهابی
وەهابیشیا بە جۆری کردوو تەلقین
وەها بێ یا نەبێ ئا یین وبێ دین

لە مێژیشە کە بەرچەسپی وەهابیەتییان بۆ مەلا زانا و دانا و هۆشیار و ژیرەکانی کوردستان ساز کردووە و ئامادەیە و هەردەم ویستیان بە نێوچاوانیانەوە دەنێن!

جا دوای ئەوەی کە خۆی لە گەڵ گاندی لەتەرازوویەکدا دادەنێ و لە ماندوویەتی و هەناسە ساردیدا خۆی بەوی هەڵدەکێشێ، دێتە سەر باسی ناکۆکی و دووبەرەکایەتی گەلی کورد و لە بەدبەختی و ناڕێکوپێکی و ژیواری کوردەواری دەدوێ و پاشی ئاخ و داخێکی زۆر دەڵێ حەیفە بۆ سەلاحەدینی ئەییووبی و نەوە و کوڕ و کاڵەکانی وی، کە جیهانی ئیسلامییان بۆ ماوەی سەد و پێنج ساڵی تەواو لە بەر دەستیدا بوو هەموو جیهانی کوفر لێی دەترسا ئەو جۆرە کەسانەش کە دوای وین بڵێن ئێمەش هەر وەکوو سەلاحەدین کوردین!! ئیتر بەو شێوە درێژە بە دەردی دڵی خۆی دەدا و کوڵی دڵی هەڵدەڕێژێ و دەفەرموێ:



مەلای کۆیە



ماهاتما گاندی

# من و گاندی

منیش هەر وەکوو گاندی هەناسە سارد و ماندی
لە قەومی کورد و هیندی هەرچی خێر بوو نەماندی
چەند لە قەومی کوردی تێ دەفکرم بە وردی
بە هیچ وەجهێکی نەمدی ئاساری ئیتتیحادی
قەومێکی وا لە یەک دوور، بێڕابەر و بێ شعوور
تاڵ و تیژ و تفت و سوور، خۆ بە خۆیی ئەعادی
نەبوون و نینە و نابن، مەگەر جاوەیی وا بن
سەد حەیف و سەد موخابن، بۆ سەلاح و ئەولادی
دەرحەقی یەکتر دژمن، خوێنی مێشکی یەک ئەمژن
باب و کوڕ یەکدی ئەکوژن، لە سەر چشتێکی عادی
میللەتی بێهۆش و گۆش، کەڵاش لە پێ، نمەد پۆش

خــواردنی پــۆڵکە و بــڕۆش، بە کفتەکــی حەشــاندی
مەلایان بێ عیلم و ماڵ، شێخیان بێ کەشف و کەماڵ
ئاغایــان رووت و رەجــاڵ، قــوتەی مــل نێــرکە کــاردی
بــێدەوڵەت و سیاســەت، دوور لە عەقــڵ و کیاســەت
بە دەرد و رەنــج و میحــنەت، نــۆکەرن بــۆ ئەعــادی
دژمــن پەرســت و خۆخــۆر، میللەتێکــی زۆر و بــۆر
بــۆ یەکتــر پــواز و هــۆر، بــۆ شــێخ وەکــوو ئەولادی
هونەریان هەر دەف وزەرگ، رووت و رەجاڵ و بێبەرگ
مەکری شێخ بڕیویە جەرگ، کوردگەل هەر ئەو خنکاندی
ئەی کــوردی گێــژ و نەزان، بێــبەش لە خۆشی و ژیــان
مــاڵوێرانی بەســتەزمان، مــاڵی تــۆ شــێخ رفانــدی

## روون کردنەوەیەک لەسەر گاندی

ڕێـزدار ماهاتما گـاندی پیـاوێکی پـسپۆر ولێهـاتوو و رامیـارێکی هەڵکەوتــووی هیندووســتانە کە گەلێکــی هەوڵ داوە و خەبــاتێکی شێلگیرانەی کردووە لە پێناوی رزگار کردنـی گەلـی ستەم لێکـراوی هیندووستاندا.

ئەو بەرێــزە هەر لە رێــگەی رامیــاری و خەبــاتی هێمنــانەوە ویستوویەتی هیندوستانی داگیرکراو لە چەنگی ئینگلیـزی داگیـرکەر رەهـا بکـا. خەبـاتی ئەو رامیـارە دڵـسۆزە کـارێکی وای کـرد کە شەشسـەد میلیـۆن کەسـی ژێـر چەپـۆکەی ئەودەمـی هیندوسـتانی هەژاند و هەموویان وێڕای گاندی بۆ رزگاری خۆیان و وڵاتی خۆیان یەک دەنگ هاواریان دەکرد.

ئەو خەباتکارە تێکۆشەرە کۆڵنەدەرە کە ماوەی ٧٩ ساڵ لە نێوانی ساڵەکانی ١٨٦٩ و ١٩٤٨دا ژیاوە هەرگیز لە تێکۆشان نەوەستاوە و ماوەی بیست ساڵی رەبەق لە خەباتی رامیاری و هێمنانەوە تاوێک تکی نەداوە و ساتێک نەسرەوتووە.

گاندی بەڕێز پیاوێکی مافناس بووە و لە ڕیشتەی مافا لە ساڵی ١٨٨٨ تا ١٨٩١ لە شاری لەندەنێ خوێندوویەتی و بڕوانامەی وەرگرتووە.

ئەو بەڕێزە هەمیشە لە رێی خەباتی هێمنانەوە کردەوە گلاوەکانی دەوڵەتی ئینگلیزی لەقاو داوە و شەرمەزاری کردووە و خەڵکی هەژار و چاو بەستراوی هیندوستانی هۆشیار دەکردەوە و لە حاڵی خۆیانی حاڵی دەکردن.

لە ساڵی ١٩١٤ گەڕاوەتەوە زێدی خۆی و سەرکردایەتی جووڵانەوەی نەتەوایەتی هیندوستانی وەئەستۆی خۆی گرتووە و بانگەوازی رزگاریخوازی بەرز کردۆتەوە و بۆ راماڵین و وەدەرنانی بیانییە بێگانەکانی داگیرکەر لە هیچ هەوڵ و تەقەلایەک نەپرینگاوەتەوە. بەڵام دەستی بۆ چەک نەبردووە و جەنگ و خوێنڕێژی پەسند نەکردووە. زۆریش زیندانی کراوەو چەندین جار مانی لە خواردن گرتووە. سەرەنجام دەوڵەتی ستەمکار و چەوسێنەرەوەی ئینگلیستان بە چۆکدا هێناوە و ناچاری کردووە کە وتوویژی لەگەڵ بکا کە دیارە لەو گفتوگۆیەدا خۆی خاوەنی چەخەرێکی دیار و بەرچاو بووە کە هەر لەو ئاخاوتنەدا هیندوستان بە سەربەخۆیی گەیشت و ئەویش وەک سەرەک شالیاریانی هیندوستان هەڵبژێردرا. دیارە ئەو رووداوە گەورە لە ساڵی ١٩٤٧ زایینیدا بووە و شاگردی وەفادار و لێوەشاوەشی جەواهیر لەعل نەهرۆ گەلێکی هاوکاری و هاوبیری کردووە.

گاندی دوای ئەوەی کە هیندوستانی بە سەربەخۆیی گەیاند لە ساڵی ١٩٤٨ ز لە ژووری کلێسادا کابرایەکی بورەهمایی بەرچاو تەنگی وشکە فەلە وەبەر خەنجەرانی دا بە لێدانی ١٨ خەنجەر ١٨ برینی گەورەی دە جەستەی بێتاوانی وی کردن و کۆتایی بە ژیانی پڕ لە شانازی وی هێنا. بەڵام ئەو لەو کاتەدا کەوا خوێن لە هەر ١٨ زامەکەی کفارەی دەکرد لە خوا پاڕایەوە و گوتی: (خوایە گیان کوژەری من نەزانە، بۆیە منی کوشت، خوایە من وا بەخشیم و تۆش بیبەخشە)

مامۆستای گەورە دەفەرموی:

منیش هەر وەکو گاندی
ئاساری ئیتیحادی لەقەومی کوردو هیندی ئەوی خیربو نە ماندی !!

منیش دە ڵێم:

مامـــوستـــای پیرو مـانـدی هـەنـاسـە ساردی کــــوردی
ئـــا ســاری ئیتتـیـحـــادی گــا نـــدی دیـتی تـونـەت دی

# خۆزگەی ئیمامی رازی

هێندێک لە وشکە سۆفی وبێئاگایەکان لە راستەقینەی ئایینی ئیسلام لایان وایە کە هێزی مرۆڤ بێ چەخەروشوێنەوارە و یترمرۆڤ هیچی لە دەس نایە و هیچی پێ ناکرێ وخۆی هیچ کارە نییە وتەنانەت لە چارەنووسی خۆشیدا هەربێدەوس (اثر) و شوێنەوارە وئیدی دەبێ بە یەکجاری دەس لە کەراسی دەربێنێ و چاوەڕوانی چارەنووس بێ چونکە هەر(جزء اختیار)یشی هەر نییە!!

بە گوێرەی ئەوجۆرە بیروباوەڕانە هەوڵ و تەقەلاوخەبات و تێکۆشانی مرۆڤ بێهوودەیە وخوداخۆی هەرچی بیهەوێ بۆبەندەی خۆی دەیکا و هەرچی نەیهەوێ نایکات. کەوایە خۆ لێرەو لەوێ دانی ناوێ و سەرەڕای ئەوەش زۆر کار هەن هەر بە هیچ جۆرێک لە کێڕ (دایرە)ی هێز و وزەی مرۆڤدا نین وئەگەرزانیاری وپیشەسازیش بگاتە ئەوپەڕی خۆی، مرۆڤی ئاسایی ناتوانێ لەو بارەوە هەنگاوێک هەڵبگرێ.

موسڵمان دەبێ لەجێی خۆی دانیشێ و هیچ کارێکی نەکات و بەتایبەتی لە باری رامیاری وسەربازی،چونکە ئەوالە دوامین چاخداعسا لە ئاسمانێ دێتە خوارێ و مەهدیش لە چاڵاوی قووڵی سامەڕڕا سەر دەردێنێ و ئیترئەودەمی تەواوی کاروباری دنیا رێکوپێک بە رووپیەیەکی دەبێ و هەموو ئیش و کارێکی موسڵمانان پێکدێنن و ئیتر هەتا ئەودەمیش دەبێ هەموو جۆرە چەوسانەوە و ستەمێک قبووڵ بکەین و هەتا زۆر و ستەم و خەراپکاری و زێف و لادان و گوناح و تاوانیش جیهانێ پڕ نەکەن، یا تەواوی دنیا رێکوپێک نەبێ و بەرژەوەندی تەواوی تێدا وەدی نەیەت، ئەوان نایەن.

کەوایە ئێستا قەیدێ ناکا و با ئەورۆ دەوڵەتی ئیسرائیل چەقڵی چاوی موسڵمانان لە ناوچە و لە جەرگەی خاکی ئیسلامدا باڵای بکا بە ئاڵا و خەڵکی موسڵمانی فەفەستین لە سەر خاک و زێدی خۆیان وەدەرنێ و بیانکوژێ و گەورەترین مەترسی بێ بۆ هەموو ئیسلام و بوسنی هەرزەگۆیین لە ژێر چەکمەی رەقی سیربی و کرۆواتییەکاندا بپلیشێتەوە و ژنەکانیان بە زۆر ئابڕوویان ببرێ و ئەریترە بە دەستی ستەمی ئیتیۆپی لە ناو بچێ و کوردستانی بەڵا لێدراو لەوەش پتر بەڵای لێدا و لە دەرەوە و ژوورەوەی نیشتمانی پان و بەرینی ئیسلامیدا خەراپکاری بێپەروا بکرێ و لە دژی ئیسلام و موسڵمانان ئاژاوە بنێنەوە و کۆسۆڤۆییەکان کۆست کەوتوو بکرێن.

سبەو دوویەکی دنیا دەگۆڕێ و عیساومەهدی دێن وجەنابی مامۆستا جبەی هەربە قەڵاتە بۆدێ وهەموخەڵک بە ئاواتی خۆی دەگا وشێخ دەبێتە خەلیفەی خواولە گۆڕەپانی خەیانەتدادەستی درێژتردەبێ!! جا هاتنەوەی هەنتەشی عیسا زانایانی ئیسلامی بەشی زۆریان قبوولیانە بەڵام ئەگەر بە چاوێکی رەدا بینانە و رامیارییانە چاو لە مەسەلەکە بکەین تێدەگەین کە دژمنانی ئیسلام چەندیان کەڵک لەو جۆرە بیر کردنەوە وەرگرتووە و ئیسلامی پیرۆزیش چەندەی زیان لێ دیوە!!

مامۆستای گەورەش دەفەرموێ بە هۆی ئەوەی کە ئەو جۆرە پێشەوایانەی کە ئاوا بیر دەکەوە و هێزی مرۆڤیان بێدەوس کرد _سلبی تاثیریان لە قودرەتی عەبدی کرد) گەلی ئاوا بەهێزی ئیسلام دیتت هەمووی بە زیندوویی مردولە ناوچو.

سەرتاسەری قورئانێ بگەڕێی چووکەترین ئاماژەیەکی بۆئەومەبەستە تێدانابینی وئەوەی هەیە چەندوتەیەکی پێغەمبەرە لەوبارەوە کە ئەویش بە تەواوی ناچەسپێ و هەموو زانایانی

ئیسلامناس قبوولّیان نییە. چونکە پتر لە چەندین هەزار حەدیس بە زمان پێغەمبەرەوە هەڵبەستراوە و دەڵێن رەنگە ئەوەش یەکێک لەوانە بێ و تەنانەت گێڕانەوەی گەلقک لەو حەدیسانە بە پیاوە گەورەکانی حەدیسیشەوە دەلکێنن و بۆ نموونە دەڵێن فلانە حەدیس موسلیم یا بوخاری یا ترمزی یا بەیهەقی و دارەقوتنی گێڕاویەتەوە!! کەچی وا دەبێ دە هیچ یەک لە کتێبەکانی واندا نییە. کە ئەوە بۆ کەسێکی لە خوا نەترسێ و شەرمی لێ نەکا و بەرنامە دارێژی کارێکی زۆر سادە و ئاساییە.

جا مامۆستای زانا و دانامان بێئەوەی کە ئەوبیروڕایە بە ئاشکراوبە روونی رەت کاتەوە ویان بیروڕای خۆی لە بەرامبەرئەودا دەرببڕێ بۆمان باسی زیانەکانی ئەوجۆرە بیروڕایە دەکا وپێمان دەڵێ لە سایەی ئەوجۆرە بیر کردنەوە ئێمە هەمووشتێکمان لە کیسە چۆ دەرێ و کیسەی کافرانی پێ پڕ بووە.

بە سەرسووڕمانەوە دەڵێ جا چۆن ئێمە هەرلە ئێستاڕاکە لەوانەیە نەگەینە نیوەی کاتی دنیا خەرا بوونیش هەر ئەو هەموو ستەم وزێف وزۆرە قەبووڵ بکەین وچاوەڕوان ئەوەی بین کە مەهدی یاعیسا بێن وتۆڵەمان وەکەن؟ بۆ ئەدی خۆمان چ کارەین؟ ئایا خۆمان بەرپرس و بەرگروان (ضامن) نین؟ مەگەر ناکرێ ئێمە ئێستا خۆمان کاری خۆمان بکەین وئەوانیش ئەگەرهاتن خۆیان کاری خۆیان بکەن؟ خۆئەگەرنەشهاتن ئێمە ئیشی خۆمان کردووە!!

ئەگەرچاوێک بە مێژووی چەوسێنەرەوە وکەڵەگاکانی کوفردا بخشێنین بۆمان دەردەکەوێ کە چۆن لە نێوئیسلامدائەوان ئەو جۆرە بیروباوەڕانەیان پەرە پێ داوە وبە هەمووهێزوتوانای خۆیان رایانگەیاندووە.

چونکە ئەوە بە قازانجی وانە کە موسڵمانان لە جێی خۆیان دانیشن و دەس لە کەراسی دەربێنن وچاوەڕوانی ئەوەی بن کە پاش هەزاران یا ملوێنەها ساڵی دیکە کە نە ئەوان دەمێنن ونەو ستەمکارەکان، عەلی و عیسا و مەهدی هەر یەکەی لە جێیەکڕابێن و تۆڵەیان بۆوەستێنن. و دنیایان بۆ پانتاو بکەن. ئیتر بەو شێوە بە فەرموودەی مامۆستا (سلبی تاثیر لە قودرەتی خۆیان بکەن).

بەڵێ جا ئەوەیە، کە مامۆستا دەفەرموێ:

## خۆزگەی ئیمامی رازی

خۆزی ئیمامی رازی لەم عەسرە زیندوو بایە
لە سەنعەتی بەشەری تەییارەی بدیبایە
ئەمجار ئیمانی دێنا بە قودرەتی بەشەری
قەت ئینکاری نەدەکرد بە تەقلیدی ئەشعەری
چونکی سەلبی تەئسیریان لە قودرەتی عەبدی کرد
ئوممەتی وا بە قودرەت گشتی بە زیندوویی مرد
پاکیان بە دەف و دمبەگ، بە دوعا و نوشتە و گشتەک
مەحرووم بوون لە ئاساری سونعی دەوواری فەلەک
رواه الدار قطنی و حدثنا الترمذی
پاکی لە کیس ئێمە دا لە واپۆڕ هەتا دەرزی
ئیمامی ماتریدیش یەعنی عەلەمولهودا
چەند لە قودرەتی هات رێگەی لە ئێمە تێکدا
ئەوی کە خەڵقی خوا بوو لە مەعدەن و کان و نەوت
هەمووی لە کیس ئێمە چوو، بە دەستی کافران کەوت
بە ئومێدی ئیمامین یەعنی حەیدەری کەڕڕار

یـا خـۆ حەزرەتـی عیـسا لە ئاسـمانێ بێـتە خـوار
یـا نە مەهـدی مـوختەفی لە نێـو چـاڵێ بێـتە دەر
بە قـــووەتی ویـــلایەت دنیـــا بکـــا موســـەخخەر
{یـا نە بە تەمـای شـێخی لە سـەر پـردی سـیراتێ
وەتپەڕێنێـــــتە ئەو بەر، فریـــات کەوێ بتگـــاتێ
خـۆ گیانیـشمان بێـتە دەر چاومـان پێیـان نـاکەوێ
ئەی موسـڵمانی نەزان بـۆ هەر سـەر دەکەی نەوێ؟!
ئەوا کـــوفری جیهـــانی بـــڕی ڕەگـــی حەیاتـــت
هەمـــووی هەڵلوشـــی ئـــاخر زێـــڕ و نەوتـــی وڵاتـــت
تـۆش لێـدە دمـبەگ و دەف، مـشتە و زەرگ هەڵگـرە
بــڕۆ شـــەرم کە لە خـــوا و خەجـــاڵەت بە و بمـــرە
چـۆن ئەو هەمـوو مەعـدەنەت ئـاوا ئاسان لە دەس دا؟
خـاکی پـاکی کوردانـت هەمـووی بە دەس دوژمـن دا؟
تـۆ بەو خێـرە و بێـرەتەوە چـۆن پەیـڕەوی یاسـینی
بە خـوا هەر وەک بـێ دنیـای بـێ ئـاخیرەت و دینـی
خـوا فەرمـوویە بەشی خـۆت هەرگیـز فەرامـۆش مەکە
کوردە تۆش دڵت بە درۆی ئەو شێخانە خۆش مەکە}

مامۆستای بەڕێز و پایەبەرزی کۆیی ئەوەنـدە پیـاوێکی زانـا و دانـاو بە هەسـت و هۆشـیار بـوە کە هـیچ شـتێکی هەر وا سـادە و سـاکار قەبـووڵ نەکـردووە و هە بەوەنـدە کە لێـی نووسـرابێ فـلانە گێـڕەرەوە یـان فیـسارە زانـایە گێـڕاویەتەوە و یـا گوتـوویەتی نەیخـــستۆتە ســـەرووی بەرنامەکـــانی و نەیکـــردۆتە پارســـەنگی تەرازووی ژیـانی و هەر وا بە ئاسـانی دەرخـواردی موسـڵمانانی نەداوە.

زۆر زۆریش لەوە بێزار بووە کە خەڵک ژیری و بیری خۆیان وەکار ناخەن و لێکدانەوە و توێژینەوەیان نییە و هەرچی بە نێوی فەرموودەی پێغەمبەر( بە گەروویاندا دەکەن قووتی دەدەن و سەرەنجامیش پێی دەمرن یا پێی تووشی نەخۆشییەکی وەها دەبن کە ڕەنگە لە مردن کەمتر نەبێ!!

ئەو لە هەموو کوڵە دڵەکانی خۆیا پێمان دەڵێ کوڕینە وریا بن دوژمن زۆر زیرەک و زانایە لە زانیاری فێڵ و تەڵەکەدا، داوی واتان بۆ دادەنێ، کە بە هیچ جۆرێک نایبینن. وەکوو ڕاوچییەکی کۆن و لە مێژینەیە کە هەموو فەند و فێڵێکی ڕاوێ دەزانێت و دان و داو وەها پێکەوە تێکەڵ دەکا و دادەنێتەوە، کە هەرگیز تۆی هەژاری سادە دڵ بۆت لێک ناکرێتەوە و وەک مەلێکی بێئاگا لە فێڵ و فووتی ڕاوچی، کە هەتا ملی بە داوێوە نەبێ نازانێ دان و داو لێک جیا بکاتەوە. تۆی سادە و ساکاریش هۆشیار نابیتەوە!! جا ئیتر ئەو کاتیش چ سوود؟! دوژمن دەیهەوێ ئەگەر بۆی بلوێ ڕاستەوخۆ بیر و باوەڕ و ڕای خۆی بە سەر تۆدا بسەپێنێ، جا ئەگەر ئەوەی بۆ نەکرا بە هەموو جۆرە فێڵ و فووت و دانە و داوێکەوە دێتە مەیدان و وەکار دەکەوێ.

بۆ نموونە بەهەر لەونێکی بۆی بلوێ تۆ لە ڕێبازی سەرەکی و ڕاستەقینەی خۆت لا دەدا و هەر نەبێ بیر و باوەڕی خۆییت بۆ ڕەگەڵ بەرنامەکانی خۆت دەخا و بەو شێوە ورد وردە لە بەرنامەی خۆت دوور دەخاتەوە!! جا چونکە ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش زۆر گەورە و گرینگ و پیرۆز و پێشکەوتنخوازە بێگومان دژمنەکانیشی زۆر زانا و زیرەک و فێڵبازن.

تەماشا دەکەی هیچ یەک لە گێڕەوە (ڕاوی)یەکانی فەرموودەی پێغەمبەر( نییە کە چەندین قسەی بە درۆیان وە پاڵ نەدابن و

پێیانەوە نەلکاندبن کە بەڵێ فلانە فەرموودەیە لە فیسارە گێڕەوە گێڕراوەتەوە بۆ ئەوەی بە ناوی پێغەمبەری مەزنەوە خەڵکی موسڵمان هەڵدێرن و لە ڕێی خۆی لا بدەن.

جا دەفەرموێ موسڵمانی سادە دڵیش هەموو هێز و توانای خۆمان لەو ڕێیەدا بە خەرج داوە و براندوومانەتەوە لە ئاکاما هەموو جۆرە کار و کۆشش و پیشە و پڕگاڵ و پیشەسازییەکمان لە دەس دەرچوو.

خەڵک بە پیشەسازی پێشکەوت و بە سەر هەموو کەند و کۆسپێکی ژیاندا سەرکەوت و دەستیان کرد بە پیشەسازی و وڵات پێشخستن و لە پیشەسازی (صنعت)دا شتی وایان وەدەر خست و بەدیهێنا کە جێگەی سەر سووڕمانە و هەر ڕۆژێکیان بە هەزار ڕۆژ و ساڵێکیان بە هەزار ساڵە، بەڵام ئێمەی موسڵمانی کوردی هەژاری بێچارەش تەنانەت ناتوانین دەرزییە سپیلکەیەکیش دروست کەین و بە کوردی و کورتی:

رواه الدار قطني و حدثنا الترمذي
پاکی لە کیس ئێمە دا لە پاپۆڕ هەتا دەرزی

# روون کردنەوەیەک لە سەر بیروڕای رازی و بەسەرهاتی وی و تیرمیزی و دارە قوتنی و ماتوریدی

## ۱. رازی

پێشەوا فەخرەدینی رازی ناوی محەممەدە وکوڕی عومەری تەبەمی بەکرییە و زانایەکی هەرە بەرز و بەناوبانگی جیهانی ئیسلامە. لە ساڵی ٦٠٦ کۆچی مانگی ڕێکەوتی ۱۲۱۰ زایینی لە شاری "رەی" لە باکووری ئێران و باشووری رۆژهەڵاتی تاران لە دایک بووە.

ئەوشارە کە شارێکی زۆر لە مێژینە و کۆنی وڵاتی ئێرانە لە ساڵی ۲۱ کۆچی مانگی لە چاخی جێنشینیەتی هەنتەشی عومەر بە فەرماندەیی عوروەی کوڕی زەید ئازاد کراوە و هێنراوەتە ژێر دەسەڵاتی ئیسلامی. ئەو شارە زانگەی هاڕوونەڕەشیدیشە.

مامۆستا رازی ڕێزدار هەر لەو شارەش کۆچی دوایی کردووەو وەک دەڵێن مردنەکەی بەو شێوەیە بووە:

ئەو بەڕێزە ،کە پیاوێکی زۆرزانا و دانا بووە لە زانیاری کیمیاویدا خاوەنی دەستێکی باڵا بووە و دەفرو ئامانی ماڵی خۆیان بە ئاوێتە(آلیاژ)ێکی تایبەتی وەها ساز کردبوون کە هەر خواردەمەنییەکی تێیانڕا لێنرابا، یان تێیان کرابایە تام و بۆن و بەرامەکەی دەگۆڕی و زۆریش خۆش دەکرد. ئەو بەڕێزە لەگەڵ فەرمانڕەوای ئەو شارە زۆر دۆست بووە و رۆژێک بانگهێشتی کردووە بۆ ماڵی خۆیان. خۆراکێکی کە دەو دەفر ئامانانەڕا لێنراوە و تێکراوە تام و بۆنێکی تایبەتی هەبووە و فەرمانڕەوا زۆری پێ خۆش بووە و سەرەنجام داوا لە رازی دەکا، کە ئەو شێولێنەرەی

بەڵێ و ئەویش بێ دڵی ناکا. بەڵێ پاشا ئەو ئاشپەزەی دەباتەوە و کەرەسەیەکی زۆری لە بەر دەستی دەنێ و دەڵێ جا چێشتانمان بۆ لێنێ و با تامێی لێ بکەین.

بەڵام هەرچی، کە ئەو کابرایە لێی دەنێ بە هیچ جۆرێکی وەک ئی ماڵی مامۆستای نایەتەوە و بەو شێوە خۆش نابێ. پاشا لێی تووڕە دەبێ و دەڵێ سەت هێندەی ماڵێ مەلات شت لە بەر دەستایە، ئاخر چۆن و بۆچی لەوێ چێشتی ئاوا خۆشت لێدەنان و لێرەش ئاوای؟

ئەویش دەڵێ پاشای بەڕێز هۆی خۆشی چێشتەکانی ماڵی مەلا خودی مەلا بوو نەک من. دەنا من لێرە و لەوێ هەر وەکێکیان لێدەنێم و مامۆستا خۆی هەور و هۆڵەکانی وا ساز کردوون کە خۆراکی خۆش دەکەن.

ناردیان بە دوای رازیدا و لە مەبەستیان حاڵی کرد. ئەویش فەرمووی من لەبەر پڕکاری و کاری زۆری نووسین و کتێب دانان ماوەم نییە لەگەڵتان خەریک بم. بەڵام کتێبێکم لەو بارەوە داناوە و فەرموون لە رووی وییەوە خەریک بن و قاپ و قاچاغی خۆتان دروست کەن.

کەچی لەبەر نەخوێندەواری خۆیان لە کتێبەکە حاڵی نەبوون و هەرچی کردیان بە ئاکام نەگەیشتن و لە داخان فەرمانڕەوا دەستووری دا هەر بە کتێبەکەی خۆی ئەوەندەیان لە تەپڵی سەری راکێشا هەتا مرد!!

مامۆستارازی راڤەوانێکی بەناوبانگ و گەورەی جیهانی ئیسلام و وەک دەڵێن گەورەترین زانای رۆژگاری خۆی بووە. گەورەترین راڤەی بە نێوی (مفاتیح الغیب) یا (تفسیر کبیر) نووسیوە لە چاخی خۆیدا بە نێوی شێخ الاسلام بەنێوبانگ بووە.

وانە ویژ و ئامۆژگاریکی زۆر چاک و نووسەریکی کەم وینە بووە. گەلێک کتێبی لە زانیارییەکانی ژیرامەیی و گێڕاوەیی (عقلی و نقلی)دا نووسیوە کە بڕێکیان بریتین لە:

١. راڤەی مەزن (تفسیر کبیر یا مفاتیح الغیب) ٢. المحصول فی الفقه ٣. فضائل الصحابة ٤. الاربعین فی اصول الدین ٥. ابطال القیاس ٦. الهندسة ٧. الملل و النحل ٨. لب الاسارات ٩. طب الکبیرو دەیان کتێبی دیکەش.

ئەو مامۆستا بەڕێزە کە ئاگادارییەکی تەواو و گش گری بەسەر هەموو زانیارییەکانیدا هەبووە بێگومان لەو جۆرە کەسانە بووە کە دەبوو ریگەی راست بۆ سەر شێواو و رێ لێ ون بووان وەدۆزن و بیانخەنە سەر ریگەی سەرکەوتن و هەرگیز شایان نەبووە کە ئاوەها زانایەک نەریت لە خەڵک دەربێنێ و لاسای ئەم و ئەو بکاتەوە و وە دوای ئی دەدی بکەوێ.

جا بەڕێز مامۆستای کۆییش کە بە تەواوی بەسەر زانیاری و هۆش و گۆش و ژیری و بیری ئەو بلیمەتەدا ئاگادار بووە و زانیویەتی وەها هەڵکەوتووەک دەبێ سەرقافڵەچی بێ و نابێ وەک یەکێکی ئاسایی رەگەڵ کاروان بکەوێ، بەڵام بە هۆی ئەوەی، کە نەریت و لاسا کردنەوە ئەو سەردەمە باو بووە و بە جۆریکی وەها ئەو جۆرە بیر کردنەوە گشگر (عمومی) بووە، کە تەنانەت زانایەکی وەک رازیش هەر نەیتوانیوە لەم رچە و جۆگەتە خەراپ شکاوە لابدا و خۆی بەخیرەتەوە پێش خەڵکی بکەوێ و رەوگەی راستەقینەی خۆیان نیشان بدا، یان لانی کەم لادەر لەو جۆگەتە بە گاور یان گومڕا نەزانێ بۆ نموونە ئەو بەڕێزە بە نەریت و لاسا کردنەوەی ئەبولحەسەنی ئەشعەری ئیندکێری و دژایەتی ئەوەی

کردووە کە مرۆڤ خۆی خاوەنی هێز و هێندێک دەسەڵاتە و هەموو شتێکی هەر حەواڵە بە قەزا و قەدەر کردووە و بەو جۆرە مرۆڤی بۆ چاوەڕوانی چارەنووس لە قون کوچکی داناوە و بەرەو دەورە بەردینەکانی گێڕاوەتەوە!!

بە پەژارە و خۆزگە و بریایەتی ئاوات دەخوازێ وەدڵێ خۆزگە ئەو زانا بەڕێزە ئێستا زیندوو بووایە و کردەوە و پیشەسازی (صنعت)ی مرۆڤ بۆ نموونە فڕۆکەی دیتبایە و بە چاوی خۆی چاوی بەو هەموو پێشکەوتن و سەرکەوتنەی مرۆڤ کە بە داخەوە موسڵمانەکان لێی بێبەشن بکەوتبایە جا داخوا چۆن بەرگی نەریتی لە بەر خۆی دادەڕنی و باوەڕی دەهێنا و دەیسەلماند کە مرۆڤ هێزو دەسەڵاتی هەیە و ئیتر دەبێ خۆی لە کاروباری خۆیدا تەنانەت بڕیاریش بدا و بیر و بۆچوون و لێکدانەوە و لێکۆڵینەوەشی هەبێ، چونکە چاوەڕوانی چارەنووس بوون و دانیشتن و دەس لە سەر دەس دانان بە هیوای ئاڵوگۆڕی سەرنویشت مرۆڤ بەرەو هەڵدێرگەی تەمبەڵی و تەوەزەلی دەبات و لە هەوڵ و خەبات و تێکۆشان دەیوەستێنێتەوە و سەرەنجام کۆمەڵ بەرەو بەیتوونیو بێبەرهەمی زادەکێشێ و ئیتر وەدیهێنان (تولید) و دەرامەد لە بزووتنەوە دەکەوێ. لە مەرجێکا کە وەدیهێنان هەمیشە دەبێ لە جم و جۆڵ و بزووتنەوەی بەرەو سەر چووندا بێ.

جا ئەو جۆرە بۆچوون و بیر کردنەوەش دژ و نەیاری گەلێک لە ئایەتەکانی قورئانی پیرۆزە. چونکە بۆ نموونە خوای گەورە دەفەرموێ: (لیس للانسان الا ما سعی) یان (انا هدیناه السبیل اما شاکرا و اما کفورا) لە جێگایەکی کە مرۆڤ هیچ شتێکی بۆ نەبێ و دەستی نەکەوێ، بە هەوڵ و تەقەلای خۆی نەبێ، گومان لەوەدا نییە کە دەبێ هێزی هەبێ و بتوانێ لەو هێزەش کەڵک وەربگرێ

دەنــا هەوڵ و تەقەلا مانــایەکی نیــیە. وەک ئامرازێــک دەچــێ کە بتدەنێ و بەڵام مافی کەڵک لێ وەرگرتنت لێ بستێننەوە.

هەروەها کاتێک کە مرۆڤ لە سەر دووڕێیانێک ڕاگیـراوە و پێـی گـوتراوە ئەوەیـان ڕێـگەی خۆشـبەختی و کـامەرانی و ئەمەشـیان ڕێـگەی بەدبەختـی و مـاڵوێـرانییە دەبـێ هێـزی هەبـێ و بتـوانێ بە لایەکیاندا وەڕێ کەوێ و بشتوانێ یەکیان هەڵبژێرێ دەنا ڕێ نیشان دان و سەر پشک کردنەکەی هیچ واتا و مانـایەکی نیـیە. دەنـا وەک ئەوەی دەچێ دوو کەسی ڕاوچی کەوێک و سمۆرەیەکیان ڕاو کردبوو ئەوەی بە دەســەڵات بەوی دی دەگــوت: کەوت دەوێ هــا ســمۆرە، سمۆرەت دەوێ ها سمۆرە.

جــا بەڕێــز ئەبولـحەسـەنی ئەشـعەری کە پیــاوێکی زۆر گەورەی جیهانی ئیسلامە زۆر بە توندی دەستەی "موعتەزیلە" کە پێیان وایە ژیریش لە ڕێنوێنی مرۆڤدا هەر بێ دەوس و شوێنەوار نییە و مرۆڤ ناکرێ وەک لایەزێکی کە بە چۆمێکیـدا بهێڵـرێ خـۆی بـداتە دەستی ڕووداوگەل(حوادث)، دەکوتێ و دژایەتیان دەکاو لە ڕاستیدا وەهایان لـێ ڕاپەڕیــوە کە بە یەکجـاری لە نـاوی بـردوون و جـگە لە بیـر و باوەڕەکەیان شوێنەوارێکی دیکەیان نەمـاوەتەوە و ئەوڕۆ هـیچکەس نییە بڵێ من موعتەزیلیم.

مامۆسـتای کـۆییش لەو کــارە ناقــایلە و فەخرەدینــی ڕازیــش سـەرکۆنە دەکـا کە بە نەریـت لە ئەبولـحەسـەنی ئەشـعەری و لاسا کـردنەوەی وی دژی دەسـتەی مـوعتەزیلە ڕاپەڕیـوە و هەر وەک ئەو بەڕێــزە دەڵــێ مــرۆڤ هــیچ توانــا و هێزێکــی نیــیە و خــۆی لە چارەنووسـی خۆشـیدا هەر بـێدەوس و چەخەرە و دەبـێ دەسـتەو ئەژنۆ دانیـشێ و چـاوەڕوانی چـارەنووس و ئـاڵوگـۆڕێکی کە خـۆی هیچ شوێنەوارێکی تێیدا نییە بێ!!

جا ئەیارانی لایەنگرانی چەخەری ژیری و هێزی مرۆڤ ئەو فەرموودەی (لا حول و لا قوة الا باللە) دەکەنە بەڵگە و خۆ دیارە بەو جۆرەش هەموو هۆ و هۆکار (علت و معلول یا سبب و مسبب)ەکان لە کار دەکەون و هەڵدەوەشێنەوە

جا هەر بۆیە مەلای بەڕێزی کۆیی سەری لێ سوور دەمێنێ دەڵێ چۆن دەبێ مەلایەکی وەک فەخرەدینی رازی هەر بە لاسا کردنەوە و بێلێکۆڵینەوە ولێکدانەوە و توێژینەوە کارێک بکا یان شتێک قبووڵ بکات یان رەدی بکاتەوە؟ بەڵێ وایە هیچ هێز و تواناییەک نییە بە هۆی خواوە نەبێ و هەموو کەسێک دەبێ ئەوە قبووڵ بکا و هێزی هەموو هێزدارێک لە خواوەیە و چاوگەکەی هەر هێزی بێپایان و لە بن نەهاتووی خودایە. بەڵام دەبێ ئەوەش قبووڵ بکرێ ئەو کەسەی کە فڕۆکەشی ساز کردووە یا شتێکی لە فڕۆکەش گرینگتر تەنانەت بگرە ئەگەر ئەو کەسە خۆی باوەڕی بە خواش هەر نەبێ هێز و تواناییەکەی هەر لە خودای مەزنڕایە و بەس. کەواتە (لا حول و لا قوة الا باللە= لا حول و لا قوة الا من اللە) و پیتە ژێر گێڕەکانیش (حروف جر) هێندێکیان بە مانای هێندێکیان هاتوون و (ب) بە مانای (من) دەبێ. ئەوەش هیچ بە مانای ئەوە نییە کە مرۆڤی بەندەی خوا هیچی لە دەسدا نییە و هیچی لە دەس نایە و لە هەموو شتێک و بگرە لە چارەنووسی خۆشیدا هەر ناچار و بێدەوس (اثر) و شوێنەوارە. دەنا ئەگەر وایە چون خوا ئەفەرمێ: (انا هديناه السبيل اما شاكرا و اما كفورا) ئێمە ڕێگەمان بە مرۆڤ نیشان داوە جا ئەویش خۆی کەیفی خۆیەتی و بە کەیفی خۆی یان سپاسگوزار و خواپەرست بێ یان گاور و لە ڕێ دەرچوو بێ. راستی مانای ئەوە کە خوا بەندەی لە سەر دووڕێیانێک داناوە و ئازادی کردووە چییە؟

جا هەر بە پێی ئەو ئایەتە پیرۆزە وا دیارە مرۆڤ هێز و توانای ئەوەی هەیە بە مەیلی خۆی یەکێک لەو دوو ڕێگایە هەڵبژێرێ

ئەگەر هێزی نەبێ پێیدا بڕوا هەڵبژاردنەکە هیچ مانایەکی نابێ و ئەگەر ئیختیاریشی نەبێ هێزیشی هەبێ بێکەڵکە و ئیتر چۆن دەتوانێ هەڵبژاردنەکە بکات؟

ئەوانەش هەر بەرج و بە جێی خۆی تەماشا دەکەی ئەوڕۆ مرۆڤ شتی وای دروست کردووە و هەر بەو هێز و توانا و زانینە کەمەی خۆی کە بەڕاستی جێگەی سەر سووڕمانە، تۆ هەر لە رادوێنەوە بگرە هەتا تەلەفیزیۆن و بۆمی ئاتۆم و فڕۆکەی بالاتر لە دەنگ و ماهوارەگەلی جۆراوجۆر و بگرە هەتا دەگاتە ژێردەریایی و مووشەک و شتی وەک مێشکی کامپیۆتێری و هتد.

دەیجا خۆ ئەوانە هەموویان هەر ئاکامی هێز و وزەی مرۆڤن کە لە رووی زانیارییەوە و بە ویستی خۆی دروستی کردوون. بەڵام دەبێ قبووڵ بکرێ کە ئەو ویست (ارادە) و هێزەش وەک فەرموودەکەی پێغەمبەر( دەقی پێدا هێناوە هەر لە خواڕایە و هیچ کەس ناتوانێ خۆی بە خۆی هێز و وزە ببەخشێ. بنەما و چاوگەی هەموو هێزەکان و ماکی گش توانینێکی هەر خوای گەورەیە و بەس. بەڵام ئەو هێز و وزەش کە ئاوا بە مرۆڤ دەگا بێدەوس و چەخەر نییە و ئەگەر بڵێین بێدەوس و شوێنەوارە گەلێک شت و بەرنامەمان لێ هەڵدەوەشێتەوە. هەر بۆیە مامۆستای کۆیی دەفەرموێ:

چونکی سەلبی تەئسیریان لە قودرەتی عەبدی کرد
ئوممەتی وا بە قودرەت گشتی بە زیندوویی مرد

مامۆستا کۆیی دەفەرموێ مەلاکان دەبێ زۆر زۆر وریا و هۆشیارو وردبین بن ودەبێ سەربەخۆوئازادە وتێکۆشەربن وچاولە پێغەمبەرﷺ بکەن، نەریت لەم و ئەو دەرهێنان وچاولێکەری و لاسا

کرێنەوە هەرگیز بۆ مەلا نابێ و هەروەها هەموو کەسیش هەر بۆ مەلا نابێ. چونکە مەلا چاوی زەقی گەلە و چاویش ئەگەرخەراپ ببینێ دەبێ چاوساغی بۆ پەیدا بکرێ. ئیتر ناکرێ بە تەمای وی وەرێ بکەوی! چونکە خۆ ئەو خۆشی ڕێگا نابینێ یا نازانێ. چاوساغ کاتیک بۆ چاوساخ دەبێ، کە خۆی چاو ساخی پیویست نەبی. بەلام بەداخەوە و هەزار مەخابن گەلێک لەمەلاکان خویان لەنەزانە کان خەراپترن . هەربۆیە بەڕاشکاوی دەلێم ئەگەر دەسەلاتی مالی و رامیاریم هەبایە زوربەی ئەو مەلایانەم تیر دەکردو نەم دەهێشت مەلایەتی بکەن وپیم دەگوتن بڕون بە ئاسودەیی لەمالی خوتان دانیشن وزیان بەگەلی هەژار وئیسلامی پیروز مەگەیەنن.

## ٢ . تیرمیزی

بەڕێز ئەبوو عیسا محەمەدی تیرمیزی پیاوێکی گەورەی گێڕەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەرە ﷺ و لەوریشتەدا یەکێکە لە مرۆڤە هەرە بەرز و دڵۆوانەکان کە زۆر زۆر سەرشوناس و بەناوبانگە و گەلێکی فەرمـوودەی پێغەمـبەری مەزن ﷺ گێـڕاونەتەوە و زۆریـشی خـڕ کردوونەتەوە.

کێتبێکی گەورەی لە فەرموودەکانی پێغەمبەر ﷺ بە نێوی (الجامع الصحیح) پێکەوە ناوە کە تا ئێستا بە نێوی سەحیحی تیرمیزی بەناوبانگە. ئەو بەڕێزە شاگردو فەقێی ئەبوو عەبدیللا محەمەدی بوخاری بووە ولە سالی ٢٧٩ی کۆچی مانگی لە شاری زانگای خۆی تیرمیز، کە شارێکی کۆنە ولە سەر رۆخی رووباری بەلخێ کە بە چۆمی جەیحوون بەناوبانگە هەلکەوتووە، کۆچی دوایی کردووە و لە ڕێکەوتی سالی ٨٢٩ی زایینی ئەو بەڕێزە لە سالی ٢٠٩ کۆچی ڕێکەوتی ٨٢٤زایینی لە شاری تیرمیز لە دایک بووە.

گەلێک بە عێراق و خوراسان و حیجازدا بۆ خڕ کردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ گەڕاوە. کتێبێکی هەیە بە نێوی(السنن)و یەکێکیش بە نێوی (العلل) و یەکی تر بە نێوی (الشمائل النبوية).

ئەو خوا لێخۆشبووە لە پەڕتووکی(الجامع الصحیح)دا گەلێکی تێبینی و توێژینەوە لە سەر پیاوانی گێڕەرەوەی فەرموودەکان کردووە و ئاگاداری داوە لە سەر جێگاکانی ناکۆکی لە نێوان (ئایینزا)مەزهەبەکاندا.

## ٣. دارە قوتنی

بەڕێز ئەبولحەسەنی عەلی عومەری دارە قوتنی کە لە ساڵی ٣٨٥ کۆچی مانگی و ٩٩٥ زایینیدا کۆچی دوایی کردووە، یەکێکە لە مرۆڤەکانی گێڕەرەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەرﷺ ئەو زانایە خەڵکی گەڕەکی دارە قوتنی شاری بەغدایە بووە و هەر لەوێشدا نیشتەجێ بووە وەهەربۆیەش بەو نێوە نێوبانگی دەرکردووە . قورئانی پیرۆزی هەمووله بەربووە وقورئان خوێنێکی زۆرباش و بەنێوبانگ بووە.

شاگردی زانای بەناوبانگی جیهانی ئیسلام "بەغەوی" بووە و گەلێکی لە خزمەت ویدا خوێندووە و هەروەها زۆریش بۆ خوێندن لە عێراق و میسر ماوەتەوە و هەر لە بەغدایەش کۆچی دوایی کردووە.

نووسراوەی زۆرن کە هێندێکیان بریتین لە: ١ـ السنن ٢ـ المختلف ٣ـ المؤلف.

ئەو بەڕێزە گەلێکی زەحمەت کێشاوە لە پێناوی خڕ کردنەوەی فەرموودەکانی پێغەمبەری مەزنﷺو یەکێکە لە پیاوە گەورەکانی حەدیس.

## ٤. ماتوریدی

بەڕێز محەمەد ئەبوو مەنسووری سەمەرقەندی ماتوریدی کە بە عەلەمولهوداش هەر بەناوبانگە لە ساڵی ٣٣٣ی کۆچی مانگی و ٩٤٤ زاییندا کۆچی دوایی کردووە.

ئەو پیاوە بەڕێزە دێژەوان (فقیه)ێکی پەیڕەوی بەڕێز پێشەوا حەنەفی بووە و خۆشی یەکێکە لە پێشەوایان و زانایانی زانیاری بیر و باوەڕ (علم الکلام) لە سەمەرقەندێ لە دایک بووە و هەر لەوێش کۆچی دوایی کردووە.

جا مامۆستاش سەبارەت بەوی دەفەرموێ:

ئیمامی ماتریدیش یەعنی عەلەمولهودا
چەندی لە قودرەتی هات ڕێگەی لە ئێمە تێکدا

ئاغای عەلەمولهودا گەلێک دژی دەستەی موعتەزیلە بوە و زۆر نەیاری باوەڕی وان بووە وچەندین کتێبی گەورەشی نووسیوە کە هێندێکیان بریتین لە: ١ـ التوحید ٢ـ ماخذ الشرایع ٣ـ شرح الفقه الاکبر. هەروەها چەند پەرتووکی دیکەش.

## ٥. موعتەزیلە

قۆڵێکن لە موسڵمانان، کە زۆرتر لۆجیک (منطق) وقیاس لەبارەی مەسەلەگەلی بیروباوەڕ(عقاید)دا بەکاردەبەن وکەڵکیان لێ وەردەگرن.

لە بارەی تەکپەرستی (توحید)دا زۆر توند و سەختگیرن و بەتوندی لایەنگری ژیری ومەنتیق وقیاسن و بە هیچ جۆرێک خەرافات ومردە پەرەستییان قەبووڵ نییەو بە سەختی دووری لێ

دەکەن. هەر بۆیەش خەرافات چییەکان بە توندی بەرهەڵستی و نەیاریان دەکەن .

گرینگترین بۆچوونەکانیان بریتین لە:

١. ئەوە کە دەڵێن ئەنجامدەری گوناحی گەورە (کبیرە) نە کافرەو نەموسڵمانە، بەڵکە شتێکە لەومیانەدا.
٢. دەڵێن قورئان کۆن (قدیم) نییە ودروست کراو(مخلوق)ی خودایە و لە کۆنەوە هەر نەبووە. بەڵێ وتاروفەرموودەی خودایە و لەوەشڕا هیچ پێویست نییە وەک خوا کۆن بی وتازە لە کۆن پەیدا دەبێ.
٣. دەڵێن مرۆڤ ئازادی دەسەڵاتی هەیە و خاوەنی ویستی ئازادەو بە هیچ جۆرێک ناچارنییە وکارەکانی کەس پێی ناکا وبەڵکە خۆی بە ویستی خۆی دەیانکا.

جاماتوریدیش زۆرلە دژی وان تێکۆشاوە وبە سەریداداون وبۆرەد کردنەوەی قسە وبیروڕای ئەوان هەوڵی داوە. جاماۆستای کۆییش داکۆکیان لێ دەکا و دەڵێ جەنابی عەلەمولهودا هەرچەندی بۆی لوا ڕێگەی لە ئێمە تێکداولە باتی تەکپەرەستی خستینیە سەر ڕێگەی بەد بەختی .
بەڕای من هەرگیز مامۆستا نەیاری ئەوە نەبووە، کە خەڵک پەیڕەوی لە فەرموودەکانی پێغەمبەری مەزنﷺ بکەن و بەڵکە تەنانەت زۆریشی پێ خۆش بووە و خەڵکیشی بۆ هان داوە. بەڵام فەرمودەی پیغەمبەرﷺ.

ئیتر ڕاستی کێهە جۆرە فەرموودەی ئەوە ؟! بۆخۆی مەسەلەیەکی مەزنە، چونکە دوای پێغەمبەرﷺ جوولەکە و دوو ڕووەکان گەلێکیان شت ساز کردووە و بە نێوی و بیەوە بلاویان کردۆتەوە، کە ئەو جۆرە حەدیسانە لە نێو زانایانی ئیسلامدا پێیان دەگوترێ

(ئیسرائیلیات)و گەلێک زۆرن ئەوانە و رەنگە دوای ئەو کاتیش نەیارانی زۆر زیرەک و بێویژدانی ئیسلام هەر لەو کارە رانەوەستابن.

بەهەر حاڵ ئێمە دوو دانە پارسەنگی گەورەمان هەیە بۆهەڵسەنگاندنی حەدیس کە بریتین لە قورئان و ژیری. جا هەر حەدیسێک دژایەتی لەگەڵ قورئان یان لەگەڵ ژیریداهەبێ ئەوە دەبێ فڕێ بدرێ وبە حەدیسی نەزانرێ.

بۆیە مامۆستای بەڕێز هاواری لێ بەرز دەبێتەوە ودەڵێ: ئێمە هەموو شتێکمان لە کیس چوو، هەروە دوای ئەوەی کەوتین فلانە کەس وادەگێڕێتەوە و فیسارە کەس دژی وی و ئەمیان ئاوا و ئەوی تریش بەشێوەیەکی دیکە بۆمان نەقڵ دەکا!! تەنانەت ئەو ناکۆکی و دووبەرەکییە بە جۆرێک تەنیویەتەوە و کە گەیوەتە یاساکانی زانیاریش!!

خۆ قورئانیشمان هەروەلا ناوەو ئاگامان لێی نەماوەو نازانین دەڵێ چی و ناشزانین رەوشی بەرزی پێغەمبەر چییە و ئاگاداری بەسەرهاتەکەشی هەر نین. دەنا بێگومان دووچاوری ئەو دەردە گرانەی نەدەبووین. چونکە قورئان هەموو شتێکی روون کردۆتەوە و رەوش و مێژووی پێغەمبەریش گەورەترین پشتیوانەیە.

## تووڕە بوونی مامۆستا

بەڕێز مامۆستای خۆشەویستمان دوای ئەوەی، کە ئەو هەموو دادو هاوارو پەند و ئامۆژگارییەی کرد و وەک بولبولی هەزار داستان خوێندی بۆ کورد و کوردستان و مەنجەڵی دڵی پڕ لە کوڵی زڵق زڵق کوڵی و ئاهو نزوولەی ناز و نووزی نازدارانیشی نەشێواند و لە هەوری هەناسەی هەڵمەتووک هەڵستا بەڵام بەو

حاڵەش کەس لێی نەبیت و گوێی نەدایە، تووڕە دەبێ و دەس دەکا بە تانەو تەشەر و بەسەر کوردان دێ و لۆمەیان دەکا بەپەرۆشی و دڵ ناخۆشـــییەکی زۆرەوە و بە خەم و داخ و پەژارە و دەردی دڵەوە دەڵێ:

ئەوەیە رێگای ئێوە، کە من پێم گوتن و پێم نیشان دان و بەو جۆرە کە شیاوی یەک رابەری دڵسۆزی گەل بێ رێنوێنیم کردن، جا ئەوە ئێوەن، کە هۆبالەکەی وە ئەستۆی خۆتان دەگرن ئەگەر بە قسەم نەکەن.

بەڕاستی کورد ئەوەندە هەژار و ماڵ وێران و بەدبەختە، کە دۆست و دوژمن و یار و نەیاری خۆی لێک جیا ناکاتەوە!! رێ نیشان دان و رێ لێ ون کردنی پێ یەکە. کەپری بۆ ساز کەی و کەپری لێ بڕووخێنی پێی وەک یەک وایە.

بۆ نموونە مەلا چاکەکان رێبازی پێغەمبەریان نیشان دەدەن و بەرنامەی قورئان و رێبازی رامیاری ئیسلام و سەر کەوتنی یەکجاری و شەقامی پانتاوی ئازادییان شارەزا دەکەن و دەیانخەنە سەر رەوگە (مسیر)ی مەردایەتی و بوێری و دلێری و رێگەی خەباتی خواییان پێ دەڵێن و هەرگیز خەیانەتیان پێ ناکەن، کەچی بە قسەیان ناکەن و وە دوایان ناکەون.

بەڵام شێخەکان بەرەو نەزانی و خەرافات و پڕوپووچ پەرستی و تاریکی و سەر لێ شێواوی دەیانئاژوێنن و جگە لە هەڵپەڕین و داپەڕین و زەرگ و دەف و دمبەگ فێرگەکەیان هیچیدیکەی تێدا نییە، تا فێریان بکەن و جا ئیتر بەو شێوە بە کەیفی خۆیان دەیانچەوسێننەوە و دەیانڕووتێننەوە و ئیتر گرینگترین هونەری وان مارگری و ئاوربازی و برچی ژنانەیە و بەس، کەچی زۆر چاکیان بە قسە دەکەن و وە دواشیان دەکەون کە دیارە و هەموو

کەسیش دەزانێ راست نییە و چاو بەستەکێنەیە کە لە خەڵکی سادەو ساویلکە ئەیکەن تەنانەت ئەگەر راستیش بایە و بنەمایەکی هەبایە کە نیشیەتی بە چ کەڵکێکی گەل و نیشتمان دەهات و ئاخر تاک و کۆمەڵ چ دەردێکیان بەوە دەرمان دەکرێ؟ ئاخو توخوا شەرم و شوورەیی نییە، کە خەڵک وا دەچێتە کورەی مانگ و میریخ و زەحەل و هتد، بەڵام هێندێک لە لاوانی کورد دەبنە دەروێش و سەرهەڵدەسووڕێنن و مل با دەدەن. ئەوانە بە خەیاڵی خۆیان لە بەر چاوی خەڵکی کشگێڕ (معجزە) دەنوێنن کەوا دەتوانن ئەو جۆرە کارانە بکەن لە حاڵێکدا کە خەڵکی سادە و ساویلکە ئەو کارانەیان لە دەس نایەن. بەڵام هێندێک لە زانایانی ئیسلام دەفەرموون ئەو جۆرە کارانە کە ئەوان دەیکەن (ئیستیدراج) واتە شتێکە (مرگ) شەیتان وردە وردە یارمەتییان دەدا تا سەرەنجام بە یەکجاری لە رێ لایان دەدا و جا چونکە لە لایەن شەیتانەوەیە و شەیتانیش خۆی لە ئاورە و ئاورریش کاری لە ئاوری ناکات ئەوان هەر بۆ لای شتی گەرم دەچن. دەنا ئەگەر راست دەکەن با بۆ ماوەی هەژ نۆ خولەک (دقیقە) سەر دە بن ئاوێ راکەن، داخوا ئاویش هەر کاریان لێ ناکات؟

ئەوە لە لایەک ولە لایەکی دیش کە دیارە و دەبینین و شتێکی زەق و بەرچاوە، کە کاری شێخەکان هەر راو و رووت و خەڵک فریو دان و لادان لەرێی راست و هەتڵە کردن و خەڵەتاندن و چاو بەستن و بەرەو خورافات و پڕوپووچ پەرستنە. ئەوان پێیان سپێردراوە کە خەڵک قۆڵ قۆڵ و دەستە دەستە بکەن و هەتا بۆیان دەکرێ لێکیان بپچڕن و لە مزگەوتی خوا دەریان بکێشن و بیانبەنە قوژبنی خانەگاکانەوە و لەوێدا مێشکیان بەو شتەی کە خۆیان دیانهەوێ و هەوڵی بۆ دەدەن زاخاو بدەن!!

ئەوە شتێک نییە هەر لە خۆڕا و لە خۆوە بگوترێ تەماشا کە هامفێر و ئەلمیس بێڵ کە دوو سیخوڕی ئینگلیسن لە نێو موسڵماناندا ئەو نهێنییەیان بە چاکی درکاندووە کە لە لایەن دەوڵەتی ئینگلیستانەوە پێیان سپێردراوە کە لە نێو موسڵماناندا هەتا بۆیان دەکرێ شێخان زۆر کەن و خانەگا و تەکیان ساز بکەن چونکە وا نەبێ موسڵمانان لێک ناپچڕێن و پڕش و بڵاو نابن!!

هەروەها پێیان سپاردوون کە مەلا چاکەکان بە هەر جۆرێک بێ لە بەر چاوی خەڵک سووک بکەن تۆمەت و چاو و ڕاو و پڕوپاگەندەیان بۆ بڵاو بکەنەوە بەڵام کۆلکە مەلا و مەلا مریدەکان بە هەر جۆرێک بێ بەهێز بکەن، خەڵکیان لە دەوری کۆ بکەنەوە و پووڵیان پێ بدەن تا جۆرە کارێکی پێویست ئەنجام بدەن و پلە و پایەیان بۆ پەیدا بکەن، چونکە هەر چەندی ئەوان سەرکەوتوو بن بە قازانجی ئێمەیە و پتر لە ئامانجی خۆمان نێزیک دەبینەوە!!

جا مامۆستای بەڕێزمان کاتێک ئاوا دەبینێ و هەر بە پسپۆڕییەتی خۆشی هەموو شتێکی زانیوە و تێی گەیشتووە بە قەڵسی و تووڕەییەوە چەند قسەی هێندێک ناحەز بە کوردەکان دەڵێ کە جێی خۆشیەتی.

ڕەنگە هێندێک کەس ئەوەیان پێ ناحەزبێ وبە دووری دابنێن کەسایەتییەکی وەک مامۆستا کە قسەی ئاوا ناشیرینی بە سەرزاریدا بێ و سەرەڕای ئەوەش پێنووسە ڕەنگینەکەی ئالوودە بکات !! ولە سەرڕووپەڕی دیارییە بەنرخەکەی کە وەک یادگارێکی گەورەی خۆی بۆ ئێمەی بە جێ هێشتووە تۆماربکات!! چونکە لە وەها زانیار و رامیارێکی وەک خۆی بەدوورە!! بەڵام من دەڵێم ئەوە زۆرکارێکی ئاسایی وسادەیە بۆ باوکێک یان برایەکی گەورە و دڵسۆزکە دەگونجێ قسەی سەختیش بە منداڵ یان برابچووکەکەی

پێی بڵێ وتەنانەت جاری وایە لێشی دەدان. چونکە خۆ ئەوبە دژمنایەتی پێی ناڵێ، بەڵکە تووڕە بوونەکەشی هەر تووڕە بوونی دڵسۆزیو میهرەبانییە و بۆ قازانجی وییەتی.

جا مامۆستا هەقیەتی، کە دەڵێ بیدعەتی وا دەکەن نە دیان کردبیەتی و نە جوولەکە و ئیتر ئەوان هەر وەک دیان و جوولەکە ئەهلی بیدعەت و خەراپکاری و شتی پڕوپووچن وەهایان کردووە کە ئەگەر جەنابی شێخ تڕیشی لێ بەر بێ دەڵێن ئەوە کەرامەتە و کەرامەتیشیان کردۆتە زانیاری نهێنی، یا نهێنی زانی (علم غیب)، لە مەرجێکا خوا خۆی دەفەرموێ: (لا یعلم الغیب الا اللە) جگە لە خوا هیچ کەس نهێنی نازانێ. بەڵام ئەوان بە پێچەوانە ئایەتی خوا هەموو شتێکی شێخ بە کەرامەت دادەنێن!!

جا پاشی ئەو هەموو ئاه و ناڵە و تووڕە بوون و تانە و تەشەرە، روو دەکاتە خالیدی شارەزووری کە پیاوێکی زانا و دانا و زۆر هۆشیار و زیرەک بووە بە نێوی مەولانا خالید بەنێوبانگە و ریشەی رێچکەی نەخشبەندی لە کوردستاندایە و بە کوردی پێی دەڵێ تۆ کە دڵسۆزی گەلەکەت بووی و مردی هیچت پێ نەکرا و رەنگە منیش بمرم و چم پێ نەکرێ، هەستە و سەر لە گڵکۆکەت بێنە دەرێ و بزانە گەلەکەی تۆ چی بە سەر هاتووە و چۆن لە رێی رەدا و راستەقینە لایان داوە؟ چۆن لە باتی یەکیەتی، بڕ بڕ بوون و لێک هەڵبڕاون و هەر قۆڵە رووی لە جێیەک کردووە و لە باتی زانیاری و پیشەسازی و پێشکەوتن، خەریکی پڕوپووچ پەرستی و بیدعەتن و چۆن بازاڕی راو و رووت و چەوساندنەوەی شێخانیان گەرم داهێناوە و بوونەتە مرید و دەروێش و بە چەپەڵ کاری خەریکن؟

جـا هەر بـۆیە ئەو جـارەش کـوڵی دڵـی خـۆی دەردەبـڕێ و بە زمانێکی دیکە و بە هەوایەکی دیکە دەیاندوێنێ و دەڵێ:

## ڕێگای ئێوە

تەریقــی وا لایــقە ئەوڕۆ بــۆ قەومــی کــوردان
جـرت و پـرت و هەڵپەڕین لێـک هـاتن و تێکهەڵـدان
(لە باتی عیلم و سەنعەت فێری ڕەقس و سەما بوون
لە ژیـن و دەوڵەت و دیـن بە کـوللی تەوەلـلا بـوون)
کەیفی لێ بێ مـام سـۆفی هەر بە یەک دوو سانییە
ســەد هەزار تــڕ بەردەدا مەترەلۆســیش وا نیــیە
حەیـا و ئادابیـان نەمـا غیـرەت و نامووسـیان چـوو
بیـدعەتی ئەوتـۆ دەکەن، نە دیـان کربێتـی نە جـوو
کەرامەتیــان کــردە تــڕ، تڕیــان کــردە کەرامەت
بە لەعنەتــی خــودا بــن لە دنیــا و لە قیــامەت
خالیــدی شــارەزووری ســەر لە قەبــرێ بێــنە دەر
تەماشــا کە قەومــی تــۆ چ دەردێکیــان هــاتە ســەر
دابەشــیان کــرد لە نــاوخۆ وڵات و نیــشتمانی
ئیتــر بــوونە کەڵەگــا لە ســەر ی دژمنــانی
بـوونە سـەد قـۆڵ و دەسـتە بە نێـوی تەریقەتـێ
بەو جــۆرە تەوەلــلا بــوون لە دیــن و شــەریعەتێ
دەف و دمبەگ و مشتە، زەرگ و نوشتە و گشتەک
لە جێـی تـۆپ و تەیـارەن لە جـێگەی قەڵەم و چەک
وای بە حــاڵی میللەتــێ نەناســێ دۆســت و دوژمــن
دۆستی لە لا دژمـن بێ و دژمنـی دۆسـت بێ لە کـن

ڕێـــگەی ئێـــوە قورئـــانە ئەی کـــوردانی بە ئیمـــان
دووری بـکەن لە تەکیە و دەس هەڵگـرن لە شـێخان
ئـــاخر ئەوانە کەنگـــێ دینیـــان فێـــری ئێـــوە کـــرد
لە بەر چـــی ئـــاوا بـــۆ وان لە ڕێبـــازا بـــوونە پـــرد؟!
مەســـــــــئوولیەتی ئەوان نەزان هێـــــــــشتنەوەتانە
تـــاڵانی مڵـــک و مـــاش و هەر شـــتێکی هەتـــانە
ئەوان خۆیـــان نـــۆکەری ئیـــستیعماری ئینگلیـــسن
خـــائین بەو مـــیللەتەن و دز و ناپـــاک و پیـــسن
دەسا کوردە هۆشت بێ، هۆشی خەڵک و خۆشت بێ
تـــا کەنگـــێ ئەو قورئـــانە هەر وا فەرامۆشـــت بـــێ؟!

# هەواڵی کورد و کوردستان

مامۆستای دڵسۆزی گەل ئەوجار دێنێ کەسێکی لە بەرابەر خۆیدا دادەنێ و وا دەنوێنێ کە ئەو کەسە دەیهەوێ لە هەواڵ و ژیواری کورد و کوردستان ئاگادار بێ و بزانێ ئەو گەلە گەورە حاڵ و ژیواریان چۆنە و چی دەکەن و چۆن دەژین و ئیتر ئەو کەسە ڕوو دەکاتە مامۆستا و لێی دەپرسێ و دەڵێ لە کوردستان چ باسە؟ هەواڵی کوردەکان چییە؟ زانیاری و ئایین لەو وڵاتە لە چ پلە و پایەیەکدایە؟

ئەویش وڵامی دەداتەوە و دەڵێ ئەگەر هەواڵی کورد و کوردستانم لێ دەپرسی گوێ ڕابگرە با پێت بڵێم و وەک بولبولی هەزار داستان بۆت بخوێنم: وڵاتێکی چۆڵ و هۆڵ و بێکەس و بێ سەرپەرشت و بێدڵسۆز و گەلێکی ڕووت و ڕەجاڵ و برسی و تینوو و هەژار و نەدارە، نە زانیاری و نە زانستی لێیە و نە ئایین و بیر و باوەڕ.

شێخ و شەیتان پێکەوە دەستیان وە دەستی یەک داوە و بە کەیفی خۆیـــان ئەو گەلە هەژارە بەرەو هەڵـــدێرگە دەبەن. ئەو دوانە بە هاوکاری یەکتر زانست و زانیاری و بیر وباوەڕیان لەم وڵاتە کە لەمەو بەر کانگای بیر و باوەڕ و زانست و زانیاری و پیاوەتی و مەردانەگی بوو ڕاماڵی. نە دینیان لێ هێشت و نە ئایین و نە خواپەرستی و بە جارێ کردیانە بازاڕی خۆیان و وەسەر ئاوەڵ بۆ خودا دانان و بت پەرستییان گێڕا و ئیترئەی خۆڵ بە سەرمان خۆ خواشیان هەر لە بیر بردینەوە. تەواوی زانین و هونەرمان بۆتە دمبەگ و دەف و هەڵپەڕین و داپەڕین. مارگرتن و پرچی درێژی ژنانە و ئاوربازی و دار و بەرد و پۆلوو خواردن!!

بەڵام راستی ئەوانە چ دەردێکی گەل دەرمان و چ ناسۆێکی کۆمەڵ تیمار دەکەن؟ چەندین سەدەیە ئەوا ئێمە بەو شێوە دەڕۆین، بە کوێ گەیوین و چمان دەس کەوتووە؟

ئەرێ بۆچی دەبێ ئێمە هۆشیار نەبینەوە و بۆ حاڵی خۆمان نەبین؟ ئاخر خۆ ئەو وڵاتە خۆشە و ئەو کوردستانە پیرۆز و پان و بەرینەمان هەر بەو شێوە لە دەس دەرهێنرا و هۆشمان نەبوو داکۆکی و پارێزگاری لێ بکەین. هەر وە دوای شێخ وشۆڤاران کەوتین وهەمووشتێکمان لە بیرچۆوە!! نەچووینە فێرگە بخوێنین و نە بۆخۆمان فێری پیشەیەکیش بووین.

وەک دەفەرموێ:

هەواڵی کورد و کوردستان دەپرسی
وڵاتی چۆڵ و قەومی رووت و برسی
لە سایەی شێخ و شەیتان، عیلم وئیمان
لە نێو کوردان نەماوە، خۆڵ وە سەرمان

جا ئەوجار دێنێ دیمەنە جوانەکانی کوردستان نیشان دەدا و بیچمە سروشتییەکانی نیشتمانی کورد دەخاتە بەرچاووقامک رادەدێرێ بۆشوێنێکی زۆرگرینگی ئەووڵاتە ودەڵێ: هەرلە شاری کۆیەڕاهەتا دەگاتە مەراغە، کە سنووری تازەی دەسکردی کوردستانە هەمووی هەرئاووەراووباخ وراخ و چیمەنی پڕدیمەنە. تەنانەت هەرلە کێوی بەرزی سەفین وکۆسرەت هەزار جێگەی وای لێیە کە هەردەڵێی لە گوێن بەهەشتی بەرین سازکراوە. خۆ سەری کێوی حاجی قەڵاوتاڤگە و ئاهەڵدێری چنارۆکیش هەر بەڕاستی بێوێنە و نموونەن لە ڕوی زەوی تەنیا هەرلە کوردستان ئەو دیمە نە رازاوەو جوانانە هەن و بەس.

بەڵام خۆ کوردی بێچارە لە بەرئەوەی هەروە دوای شێخ و شۆڤارەکان کەوتن ورووویان لە پێشکەوتن و سەرکەوتن و پیشەسازی وەرگێڕا نەیانتوانی کەڵکیان لێ وەرگرن . وەک کە دنیایە کە یان لە کیس چو دەری مەخابنو هەزاران جار بەداخە وە دینە کەشیان لێ تێک چوو،چونکە لە پیشەسازی پاش کەوتن گولی ئاواتنیان نە پشکوت و لە پێشکەوتن بی بەش بون وخۆ ئیتر گورژی گوتەنی:

پیشەسازی خەڵکی جیهانی وەها پێش خستووە
هەر گەلێکی پیشە نازانێ گەلێکە نوستووە
ئەوگەلەی تۆ بۆیەلێی قەوماوە کاکە کوردەکەم
چونکە تۆی هەرنیت وبەوشێوەش هەبی چت لی بکەم

جا هەر بەو شێوە هەموو کانگا و چاوە گرینگەکانمان لە کیس چووو نەیاران و بیانان هاتن و بۆ خۆیان دەریانهێنان و کەڵکیان لێ وەرگرتن. خودی مامۆستای بەڕێزیشمان لەوبارەوە دەفەرموێ:

لەبۆیە هەرچی لەو خاکە بە دەرکەوت
لە رادیۆم و لە زێڕ و پاقر و نەوت
هەمووی کەوتە ژێر دەستی فەرەنگان
چیا و چۆلان دەنۆڕن وەک پڵنگان
بیاننۆڕن چیایان چۆن دەکۆڵن
هەتا کەی ئێوە هەر بەرماڵ بە کۆڵن؟!

بەڵێ ئەوریزدارە زۆرهۆشیارە دڵ بریندارە بە هەموو کەیفی خۆی دەگری و هاواردەکات بۆئەم کوردستانە لە دەس دراوە وهۆکاری بنەڕەتی ئەوکارە نالەبارەش بە خەڵکی کورد دەناسێنێ و

دەفەرموێ: دووکەسن کە ئەو هۆباڵەیان لە ئەستۆیە، یەکیان دژمنی سەرەکی تیرەی مرۆڤە وئەوی دیش دژمنی تایبەتی تیرەی تیرە بەختی کوردە وئیترئاوا دەفەرموێ:

لە سایە ی شیخ وشە یتان عیلم وئیمان
لەنیو کوردان نەماوە خول وەسەرمان

جا ئەمجا دوبارە با دەداتەوە سەر باسی دیمەنە جوانەکانی نیشتمانی کوردە واری ودەڵێ:

لە شاری کۆیە هەتا دەچیە مەراغە
هەمووی ئاو و بەراو وباغ و راغە
لە تەک شاخی سەفین و کێوی کۆسرەت
هەزار جێگەی هەیە مانەندی جەنەت
سەری حاجی قەڵا و سۆڵی چنارۆک
بە بێوێنەن لەگەڵ شوێنی حەمامۆک

جا لێرەدا هەردەڵێی لە گەڵ کەسێکی ئینکێری‌کەر وتوویژدەکا و بە توندی لە بەریەکدا راوەستاون و کابرای رووبەڕووی بەقای پێ ناکا یا دەیهەوێ پتر بیدوێنێ وپترقسەی پێ بکاوپترکەڵکی لێ وەربگرێ. جا ئەویش وتارەکەی خۆی بە سوێند بۆبەهێزدەکا و دەفەرموێ:

سوێندت بۆ دەخۆم بەو خودای بێچوون
بە قسەی شێخۆلکان کورد لە دین دەرچوون
قەسەم بەو خودای دەوواری گەردوون
بە ژەهری شێخان کوردەگەل مردوون
قەسەم بەو خودای خەللاقی کورسی
مامۆستای برسی لە خوا ناترسی

ئەوجار مامۆستا تووڕە دەبێ ودەڵێ ئەو مەلایانەی کە وە دوای شێخان کەوتوون لەوانیش خەراپترن، هەموویان هەرفاسیدن، بەدخوون، بێدین و خوانەناسن، کاری شێخی حیلەباز، فریودانی خەڵکە بە تایبەتی خەڵکی نەزان و ناحاڵی، چونکە هەمیشە هەر ئەو مەلە دەتۆڕی ڕاوچی دەکەوێ، کە زۆرگێلەکە وناهۆشیارە ومە لی زیرە ک و هۆشیار هەرگیز ناکەویتە ناو تۆڕی ڕاوچی.

هەرچەندە گوتوویانە، کە (دەعبای زیرەک بە دندووکێ پێوە دەبێ) بەڵام بێگومان ئەوە لە هەمووجێیەکدا ڕاست نییە وهەمیشە دروست دەرنایە. چونکە دەعبای زیرەک لە خۆی وریایە ودژمنی خۆی دەناسێ، بەڵام هی نازیرەک وحۆل، دۆست ودژمن لێک جیا ناکاتەوە ومریدی کەریش جیاوازی لە نێوانی شێخ و شۆڤاردا دانانێ ونازانێ کە ئەوە گورگە دە پێستی مەڕدایە.

لە مامۆستای ئایینیش قەڵسە کە دەڵێ بە بەرتیل شەرعی دەگۆڕێ و خوای لە بیرنامێنێ کە چاوی بە ماڵی دنیایە کەوت. هەرچەند هەم لە خودی ئەم تاکە هۆنراوەدا وهەم لە هۆنراوەی پێشێدا هەرعوزری بۆمامۆستا هێناوەتەوە کە دەڵێ هۆکاری ئەوکارە خوارە ناڵەبارەی ئەوە یە کە ئە ومەلاهەژارە، برسییەتی و نەدارییە وەک دەفەرموێ:

قەسەم بەو خودای خەللاقی کورسی
مامۆستای برسی لە خوا ناترسی
مامۆستای فەقیر لارێ دەنۆڕێ
بۆ کوتکە ماستێ شەرعی دەگۆڕێ

بەڵام بەو حاڵەش هەرزۆری لێ تووڕەیە ودەڵێ دەبێ مەلا لە ئاسمان حەستەمترو لە کێو قاییمترولە پۆڵاپتەوترو لە خۆرپرشنگ هاوێژتربێ. چونکە هەرلە دوای ئەوە لە تاکە هۆنراوەیەکی دیکەدا

دەڵێ ئەوە هەرمەلانەزانەکانن کە ئاوا بێباوەڕولە خوا نەترس و شەرع گۆڕومریدە شێخن، دەنامەلازانا و داناکان هەروەختە لە داخی ئەوانە دیق بکەن وبمرن ئەوەندەیان لێ قەڵسن وەک دەفەرموێ:

قەسەم بەو خودای خەللاقی کورسی
مامۆستای برسی لە خوا ناترسی
مەلا و شێخەکان بێدین و بەدخوون
الا انهم هم المفسدون
شێخی حیلەباز بە فاڵ و نووشتە
سەد پیرێژنان دەبا لە خشتە
مامۆستای فەقیر لاڕێ دەنۆڕێ
بۆ کوتکە ماشی شەرعی
مامۆستای زاناش جەرگی پەلاسە
وەختە دیق بکا بەو باس و خواسە
رەببی شێخەکان کۆر و مادوور بن
ئەو فێلبازانە لە کوردان دوور بن
ئەو شێخە حیزەی چاو بە فرمێسکە
ئەم های و هوویەی بۆ نیسک و گیسکە
رەببی مامۆستای سەر و مێزەر زل
هەر دەربەدەر بی لە مەئوا و مەنزل

مامۆستای گەورە وگرانی کورد لەوچاخیداکە شێخە فریودەرەکان بە هەمووجۆرە مەکروماجەراتێک وهەروەها بە هەمووجۆرە فێڵ و فووتێک هەر خەریکی فریودانی کوردە بێچارەکان بوون وبە درۆ خۆیان پێ بە پیاوی خودا و پارێزگارو لە خواترس ناساندوون، بە

درۆلە بەرچاوی خەڵک فرمێسکی ریاکارانەیان هەڵوەراندووە و وایان نیشان داوە کە ئەوە لە خوادەترسن. جا هەربۆیە دەفەرموێ:

ئەو شــێخە حیــزەی چــاو بە فرمێــسکە
ئەم هــای و هــوویەی بــۆ نیــسک و گیــسکە
ئەی شــێخی جاهیــل زۆر چــاک بــزانە
خــــودا عــــالمی ســــیرڕ و نیهــــانە

جا ئەمجاردووبارە با دەداتەوە سەرمەلای نەزان، کە هەروە دوای خەرافــات وشــتی پڕوپــووچ ودوورلە راســتی دەکەون وئــایین و خواپەرستییان کــردۆتە مــستێک خەیــاڵاتی بێمــایە ولە راستی و راستەقینەیان دوورکــردۆتەوەو!! ورێــگەی راســتی ئــایینی پیــرۆزی ئیــسلامیان لە کــوردان تێکــداوە وبە هیــوای ئەوەی بەڵــێ ئەو ڕۆو سبەیەکی عیسا دێتە خوارولە ئاسمان دادەبەزێ ومەهدی لە چاڵاوی سامەڕە دێتە دەرێ وئیترهەربە تەواوی خۆشی ئیشک ناکــاتەوە کە وە خــۆدەکەون وهەمــوو کاروبــارێکی ئەوخەڵــکە پێــکدێــنن و تەواو ستەمکاران دەکــوژن ولە نــاودەبەن وستەم لێکراوەکــان ســەردەخەن وتۆڵەیــان دەکەنەوە، هەمــوو نــاڕێکوپێکییەک رێکوپێــک دەکەن و هەمووجــۆرە ستەمێک رادەمــاڵن ووا دەکەن کە گــورگ و مەڕپــێکەوە ئاوێ دەخۆنەوە وهیچ زیانێکیش بە یەکتر ناگەیەنن!! دنیا وای لــێ دێ کە دەبێتە دنیای ئاشتی و برایەتی و خۆشی و شادی و ئازادی و کەس لە کەس ناترسێ وکەسیش زیانی بۆ کەس نابێ وبە کورتی و بە کوردی ئەوبەهەشتە بەرینەی کە خوالە چەندین جێگەی قورئاندا باسی لــێ دەکا وپێــی هەڵــدەڵێ بــۆ نموونە دەفەرمــوێ: (فیها ما تشتهیه الانفس وتلذ الاعین) دەوێدا هەیە هەرچــی نەوسەکان پێیــان خۆش بێ وبۆ خەڵــک خــاوەن چێــژە (لــذت) بــێ وهەرچــی چاوەکــان

خۆشی ولەزەتی لێ بچێژن، ئەوان هەرلەو دنیایەدا بۆو خەڵکەی دادەنێن.

جاکەوایە ئەو هەموو زەحمەت و خەبات و تێکۆشانەی بۆ چییەو ئیتربەو شێوە ڕێگەی خەبات و هەوڵ و تێکۆشانیان لە خەڵک گرتووە و دەستیان پێ لە کەراسی دەرهێنان و دنیا و هەموو شتێکیان بۆ شێخەکان وئاغاکانی وان لێ ستاندوون، جا مامۆستا لەو جۆرە مەلایانە زۆر بە سەختی و بە توندی قەڵس دەبێ و دەڵێ هەی نەزانینە ئاخر ئێوە بۆچی لە کاتێکدا خۆتان وا لە برسان دەمرن بوونەتە جاشی بەلاش و نۆکەری بێ ئەولا و ئەملای شێخی خاین؟ ئاخر خۆ تۆ تاژی نی؟ کە خۆی ئەوا لە برسان زگ و پشتی پێکەوە نووساون و خۆی خۆشەویست دەکا و دەچێ کەروێشکێ بۆ خەڵکی دەگرێ!!

ئیتر بەو شێوە بە تووڕەیی پێی دەڵێ ئەو باس وخواس وفڵتە فڵتە هیچ قازانج و کەڵکی نییە و ئەتۆ بە تەمای سبەینێ خۆئەوڕۆشت هەرلە دەس داوە. بڕوانە لە حاڵی خۆت وبزانە ئەوڕۆ چۆنی. زانستێک بخوێنە کە بۆ گەل وهۆز و نیشتمانەکەت چاک و بەکەڵک بێ وگەل ونیشتمانەکەت بەهۆی زانیاری سەر بکەون. بە گوتنی وشەی هەڵوا زارت شیرین نابێ (لایعلم الغیب الا الله).

ئەو جۆرە شتانە هەر یەک بەشێکە لە رازگەلی نهێنی وخۆ رازی نهێنیش خوانەبێ کەس نایزانێ. سبەی ودووی وسەد ساڵ وهەزاران ساڵی داهاتوو چ دەبێ و چ روو دەدا، خوا نەبێ کەس نازانێ. عیساو مەهدی ئەوڕۆ لە گۆڕێدا نین وبە تەواویش روون نییە و هەمووکەس نایسەلمێنێ کە دێنەوە. هاتن و نەهاتنی وان بۆتە هۆی کێشە وبەرەومشتومڕی زانایانی ئایینی. یەک دەڵێ دێن و دووش

دەڵێ نایەن. بە هەر حاڵ ئەوان یا دێن یا نایەن. ئەگەر نەهاتن ئەوە هیچ و بەڕێزتان چاوی ڕەشتان کاڵ دەبێتەوە. خۆ ئەگەر هاتیشن ئەوە کاری خۆیان دەکەن و بەرپرسی خۆیان بەجێ دێنن. ئەتۆش ئەوڕۆ هەی و کاری خۆت بکە و بەرپرسییەتی خۆت بەجێ بێنە. تۆ چۆن بە هیوای ئەوەی کە لە داهاتوویەکی نێزیک یا دووردا کەسێک پەیدا دەبێ و تۆڵەت دەستێنێ، مل رادەکێشی و شانان کۆم دەکەی، هەرکەس هات بە کەیفی خۆی لێت راکێشێ. ئەویش خوابزانێ داخوادێت یانا. کوڕە هەمووشتێک ئەندازەی هەیە، خوا بتگرێ مەلای نامەلا. تۆ ئەگەر مەلا نی و هیچ نازانی، بۆنێوت لە خۆت ناوە مەلا ؟! ئەگەرمەلای وکەمێکت زانیاری ئایینی هەیە، چۆن ئەوجۆرە پڕوپاگەندەت پێ قبوڵ دەکرێ وئیتربەوجۆرە دەفەرموێ:

ئەی مەلای نەفام ئەتۆ بێ و خودا
لە بۆ چی رێگەت لە کوردان تێک دا ؟!
عیسا دێتە خوار ئیمڕۆ و سبەینێ
ئیش و کاری تۆ هەموو پێک دێنێ
لای مەلا وایە هەر کە مەهدی هات
خەڵاتی بۆ دێ جوببە بە قەڵات!!
وا چاوەنۆڕە مەهدی بێتە دەر
خۆ هەر نەهاتیش جەرگی هاتە دەر!!
رەببی ماموستا هەر وا بناڵی
حەشری تۆ بکەن لە گەڵ جرجاڵی
ئەم باس و خواسە هیچ فایدەی نییە
ئیمڕۆ بنوارە حاڵی تۆ چییە
عیلمی بخوێنە بۆ گەلت چا بێ

گەل و مەفتەنــــت بە عیلمــــی شــــا بـــیّ
هەتـــاکوو گەلـــت بە ســــەر بـــــکەویّ
لە نــــاو گەلانـــــا بەدەر بـــــــکەویّ
حەزرەتـــی عیـــسا چـــی کـــرد لە بـــۆ خـــۆ
کە هـــاتە خـــواریّ چـــی دەکـــا بـــۆ تـــۆ؟!

بەڕاستی ئێستاش مەلای ئاوا ناحاڵی وناتێگەیشتوومان کەم نییە.

وەبیرم دیّ فەقیّ بووم کاتیّ(ئاپۆلۆ) چووبۆ کورەی مانگیّ، لە نێو مەلاکانی وڵاتی خۆماندابووبە مشتو مڕو قڕە و هەڵلا . یەک دەیگوت راستە و چووە، چونکە ئامرازی فڕینیان هەیە وخودی "ئاپۆلۆ" رەنگە شتێکی وابیّ بتوانیّ پێی بچنە سەرکورەی مانگیّ و خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرمویّ: ﴿ يَـٰمَعْشَرَ ٱلْجِنِّ وَٱلْإِنسِ إِنِ ٱسْتَطَعْتُمْ أَن تَنفُذُوا۟ مِنْ أَقْطَارِ ٱلسَّمَـٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ فَٱنفُذُوا۟ ۚ لَا تَنفُذُونَ إِلَّا بِسُلْطَـٰنٍ ﴾ الرحمن :٣٣، واتا ئەی کۆمەڵی پەری و ئادەمیزادەکان ئەگەردەتوانن بگەڕێن بە بەشەکان وکەلێن وقوژبنەکانی ئاسمانەکان وزەویدا، فەرموون بگەڕێن دیارە ناشتوانن بچن بۆکوراتی ئاسمان وبەشە جۆراوجۆرەکانی زەوی، مەگەربە هۆی ئامرازوتوانایی زانیارییەوە.

جا مەلاکانی تێگەیشتوو دەیانگوت خوا دەفەرمویّ ئێوە ناتوانن بچـنە ئاسـمانەکان وکەلـێن وقوژبنەکـانی زەوی، مەگەربە هـۆی ئـامرازو دەسـەڵاتی زانیـاری. واتاهەرکـاتیّ ئەومەرجە هـاتە جـیّ دەتوانن، خـۆ ئەو مەرجەش شـتێکی مەحـاڵ ونەگونجـاونییە. بەڵام مەلامریدەکان بە هیچ جۆرێک قبووڵیان نەدەکرد و هەرگەمەیان پێی

دەهات. تەنانەت یەکێک لەوان رۆژێک لە ژووری دێتە دەر لەگەڵ پۆلێک خەڵک و عەبایەکەی بە سەرسەری خۆیدادەدا ودەڵێ نەوەک ئەوانەی چوونەتە سەر کورەی مانگێ لەوکاتەدا کاری ئاوێیان هەبێ و بەسەرمدا هەڵی وەرێنن!!

روون کردنەوەیەک لە سەر ژیانی خالیدی شارەزووری

(مەولانا خالید) مامۆستای بەریزمان ێوبە مەولانا خالید دەفەرموێ:

خالیدی شارە زوری سە رلە قە بری بینە دە ر
بزانە میللە تی توج دە ریکیان هیناسە ر؟!

خالیدی شارەزووری هەرهەمان مەولاناخالیدی بەنێوبانگە کە لە کوردستانداهەمووکەس نێوی وی بیستووە، ئەوپیاوە لە لای خەڵکی سادە و ساویلکە بە گەورەترین هیتم (قطب) ناسراە و زۆر زۆر بەرێز و بەهێزە لە ناو مریدەکانی خۆیدا.جا ما مۆستا خوا لیی خۆش بی مەبەستی لەوتا کە هونراوە ئەوە یە پیی دەلی خالید تۆ لەکاتی خۆتدا هیزو تواناییەکی زۆرت هەبو بۆ چی کاریکت بۆ ئەو کوردە هەژارە نەکرد؟! ئیستاش سەر لەگلکۆیەکەت بینە دەری و بزانە و ببینە پاشی تۆلە سایەی تۆوشیخانی دیکەی وەک تۆدژمنانی گەلی توچیان لەگەلی تۆکرد و چییان بەسە رهینا !!

رێزدارخالیدی شارەزووری کوڕی ئەحمەدی میکائیلی جافە و لە شارۆچکەی قەرەداغی کوردستانی عێراق لە پێنج فرسەنگی رۆژهەڵاتی شاری سولەیمانییە هەڵکەوتووە لە دایک بووە، ئەو بە پێی دوو گێڕانەوەی مێژوویی لە ساڵی ١١٩٢ یا ١١٩٣ کۆچی مانگی هاتۆتە سەر دنیایە. خێڵی میکائیلی یەکێکە لە هۆزە هەرە رەسەنەکانی کورد کە لە تۆرەمەی میکائیلە شەشەی جافن.

کاک خالید لە هەوەڵەوە هەر لە گوندی خۆیان واتا قەرەداغ قورئانی پیرۆزوکتێبە وردەڵە سەرەتاییەکانی فارسی وعەرەبی خوێندووە. ئەمجا بۆ درێژەدانی خوێندنەکەی چۆتە ئەولا ولایان و گەلێک شوێنی کوردستان گەڕاوە و لە خزمەت بەڕێزان جەنابی مەلا عەبدولکەریمی بەرزنجی، سەیید عەبدورەحیمی بەرزنجی، مەلا محەمەدی تەڕەماری، شێخ عەبدوڵلا خەرپانی، مەلا مەحموودی غەزائی، مەلا عەبدولکەریمی زیارەتی و... خوێندوویەتی و هەروەها ماوەیەکش فەقێی گەورە پیاوی کورد مەلا محەمەدی ئیبنوئادەمی باڵەکی بووە.

مەولانا خالید بە قطب الطریقة، ترجمان الحقیقة، پیری رووحانی، سەر سیلسیلەی تەریقەی نەخشبەندییە، ضیاء الدین وذی الجناحین‌یش هەر بەناوبانگە. ئەوئاغایە هەر وەکو و هەموو فەقێیەکی کورد گەلێک شوێن وجێی کوردەواری بۆخوێندن راو کردووە تا سەرەنجام لە ساڵی ١٢١٣ کۆچی مانگی لە خزمەت زانای بەناوبانگی کورد مەلا محەمەدی قەسەمی مەردۆخی لە شاری سنە و دەمی مەلایەتی وەرگرتووە و گەڕاوەتەوە سولەیمانییە ولەوێ لە جێگەی مامۆستایەکەی خۆی بەڕێز مەلا عەبدولکەریمی بەرزنجی کە بە تازەیی کۆچی دوایی کردبوو، دەبێتە وانەبێژ و دەس دەکا بە فەقێ راگرتن.

مەولانا خالید لە ساڵی ١٢٢٠ کۆچی مانگی چۆتە مەککە و پێویستی حەجی بە جێ هێناوە. وادیارە کە لە رێگوزەری حەجەکەیدا بەرپرسییەتی زۆری هەبووبێ وهەربۆیەش گەلێک شوێنی وڵاتی ئیسلامی گرتۆتەوە ولە چەندشاری وەک حەڵەب، زەهاو، دیاربەکروچەندین شاری فەلەستین لای داوە و بە چاکی ئەو جۆرەی کە پێویست بووە سپاردەی خۆی بەجێ هێناوە و هەر

ئەنـــدازە پێویـــست ببــێ لە هەر یەک لەو شــارانە مـــاوەتەوە و کاروباری پێویستی راگەیاندنی خۆی جێبەجێ کردووە.

مەولانا لەو رێگوزەرە (سفر)دا لەگەڵ گەلێک لە سەرانی رێچکەی قــادریش ئاشــنا بــووە و لەگەڵیــان کــۆ بــۆتەوە و راگــۆڕینەوەی کردووەو هەروەها بە درێژی باس و وتووێژی لەگەڵا کـردوون. دوای گەڕانەوەی لە رێگــوزەری حەج لە شـــاری ســـولەیمانییە دەس دەکاتەوە بە وانەوێژی و کاروباری فێر کردن و بارهێنان و راهێنانی شاگردەکانی رێچکەی نەخشی و پێگەیاندنی فەقێیـان تـا سـەرەنجام لە ســاڵی ١٢٢٤ مــانگی لە کاتێکـا کە ســەرگەرمی وانە وتــنەوەی فەقێیان دەبێ لە فێرگەی تایبەتی خۆی کابرایەکی رێبـوارکە تـۆز و خــۆڵی رێگــایەی هەرواڵە ســەر شــان ومــلان دەبــێ لە حــوجرەی وانەوێژی خالید وەژووردەکەوێ ودوای بەخێر هێنـان مەولانـا لێـی دەپرســێ کە چ کــارەی؟ خەڵکــی کــوێی؟ وڵامــی دەداتەوە کە مــن هەژارێکی رێبوارم ولە موسڵمانانی هیندوستانم ودەمهەوێ گەشت و گوزاربکەم وولاتانی ئیسلامی ببینم وئەگەرئێوە رێگەم بـدەن چەن رۆژێکان لێرە دەمێنمەوە تالە خزمەتتان بەهرەوەرببم.

مەولاناش دەڵێ فەرمووڵە خزمەت داین وحـوجرەیەکی دەداتـێ و هەموو کەل‌وپەلی ژیانی بۆئامادە دەکا وخزمەتێکی یەکجارزۆری پێ دەکا. پاش ماوەیەک مەولاناڵە میرزارەحیمی عەزیمئابادی دەپرسێ ئەرێ کاکە تۆلەگەڵ کامە تەریقەتەی نێوانـت خۆشـە؟ مریـدی کـام شێخەی؟ ئەویش دەڵـێ قوربـان من لەگەڵ تەریـقەی نەقشبەندیم و لەگەڵ مریدان وهەوادارنی سەرەک رێچکەی ئەورێبازە شا عەبدوڵڵا دەهلەویم. جا هەرکە ئەوەی لێ دەبیسێ کاکە خالید خێرائەوی دە ئامێز دەگرێ وتوند توندبە خۆیەوە دەگوشێ وسەرورووانی شەلاڵی ماچـان دەکـات ولە بەرتەوژمـی خۆشـی وشـادی ئاگـای لە خـۆی نامێنێ.

میرزا رەحیم کاتێک کە دە زانی وامەولانا خالید ئامادەگی تەواوی هەیە بۆ رێچکەی نەخشبەندییە وتەنانەت هەرزۆریش پابەندی ئەورێبازەیە وپیری ئەو تەریقەتەی یەکجارزۆرخۆش دەوێ پێی دەڵێ راستی من لە هیندووستانێرا بەرێز شا عەبدوڵای دەهلەوی ناردوومیە لای تۆکە بەڵکە بە شێوەیەک بتوانم تۆ بنێرم بۆخزمەت ئەوی کە کارێکی زۆرگرینگی پێتە. جا ئەگەرقەبووڵی بفەرمووی هەرچی زووتر خۆت بۆ ئەو رێگوزەرە ئامادە بکە و ئیتر لەوەی پتر دوا کەوتن رەوا نییە. هەرچی زووترە وە رێ بکەوە کە یار چاوەڕێتە.

جا ئیترهەرئەودەمە مەولانا خالیدحوجرە وفێرگە دەپێچێتەوە و پەرتووک وپەڕاو پێکەوە دەنێ و لە هێڵی سنە و کرماشان و هەمەدانەوە رێگەی هیندوستان دەگرێتە بەروبە شارەکانی بوستام و خەرقان وسمنان ونیشابووردا تێدەپەڕێ ولەم سەفەرەدا بەتایبەتی دەچێتە سەر گڵکۆی(ئیمام رەزا) بەتایبەتی مەشهەد ولە سەرگۆڕی ئە بەڕێزە ئیمام رەزا پارچە هەڵبەستێکی گرینگ وبالابڵیند بە باڵای ئەو هەڵدەڵێ کە ئاوا دەس پێ دەکات:

این بارگاه کیست که از عرش برتر است؟
وز نور گنبدش همه علم منور است

واتا ئەرێ ئەوە بارەگای کێیە کە لە عەرش واتا کورسی توانایی خواش بەرزترە؟ لە شۆق و رووناکای گومبەدی هەموو جیهان رووناک بووە
(ئەی خوای گەورە و بەتوانا! ئەرێ دەبێ ئەوە چ شتێک بێ کە لە پایەی دەسەڵات و هێزی تۆ بەرزتر و بالاتر بێ)؟ بەڵێ کاک خالید لە سولەیمانییەوە بە یەک ساڵی تەواو دەگاتە هیندوستانێ و بە ئاواتی خۆی دەگا.

زۆربە پێویستی دەزانم کە لێرەدا ئەوپرسیارە لە ڕێزدارمەولانا خالید بکەم: ئەرێ توخوا تۆی سوننی چۆنت توانی ئاوا بە گڵکۆیەکی بێگیانی شیعە هەڵبڵێی چڵ وچێوو بەردوگڵ، کە لەوێ لە سەرێک دانراوە لە تەختی خوایەتی و هێز و دەسەڵاتی خودای مەزنی بەرزتر و باڵاتر دابنێی؟ خۆ تۆ لە کنە خۆ مەلا بووی و لە مەلا نەزان و ناحاڵییەکانیش نەبووی!! ئاخر چۆن هەموو دنیا بە شۆقی گومبەدی ئەو گڵکۆیە ڕووناک دەبێ؟ ئەدی چۆن ئەوە شایانی شانی مەلایەکی زانای کوردە کە هەر خۆت دەڵێی:

رشـــتەای در گـــردنم افکنـــدە دوســـت
مـــی‌بـــرد هرجـــا کە خـــاطر خـــواە اوســـت

چۆن پیاوی زاناو ڕاناو مریدێکی بێدەسەڵات و چیلاز ولاوازی وادەبێ کە پیرەکەی داوە بەنێکی بهاوێتە ملی وبۆهەرجێیەکی کە بیهەوێ بە دوای خۆیدا ڕایکێشێ؟

ئەرێ مەگەر خودی برا شیعەکانیش گومبەدی گڵکۆی ئیمام ڕەزایان ئەوەندە گەورە کردۆتەوە، کە پێیان لە تەختی دەسەڵات و هێزی خوا گەورەتر بێ؟! بەڕاستی نەنگە بۆمەلایەکی سوننی مەزە ب ئەگەر مەلابی لە خورافات وزیدە رویی دا تەنانەت لە خودی شیعەکانیش هەر پتر هەنگاوی پڕو پوچ پەرستی باوی!!

ئەرێ تۆخواخوا لێخۆشبوو بەڕێزمامۆستا شێخ مارفی نۆدێی هەقی نەبوو کە ئاوابە گژتدا هات وکتێبێکی لە دژی تۆدانا؟ لەوهەمووددژایەتییەی ڕێزدار شێخ مەعرووفی نۆدێی کە بەناڕەوا کردت بە د نێوی دوا ڕۆژ نەبێ چیت پێ برا؟؟

تۆخوا خالید ئەوە شایانی شانی مەلایەکی زانا وحاڵی بوو؟ کوڕە خۆ تۆ بەو هەموو هێزی زۆرومریدی کەرانەوە کە هەتبوون بە ئاسانی دەتتوانی کوردستان رزگار بکەی! بۆ خۆت شەرمەزاری خەڵکی کورد و خوا کرد و نەتکرد؟!

وەک مێژوونووسان دەڵێن گەلێک لە مەلایان وزانایانی ئیسلامی ویستوویانە خالیدلەورێگوزەرە بگێڕنەوە وپەشیمانی کەنەوە، بەڵام ئەووەها گەرم داهاتبووکە بە هیچ کلۆجێک چاری نەدەکراوهەروابە ئاسانی سارد نەدەبۆوە. جا هەر بۆیە لە وڵاما هەردەیگوت:

رشتەای بر گردنم افکندە دوست
می‌برد هرجا کە خاطر خواە اوست

بەڵێ وا دیارە کاک خالیدی بەڕێز پەتی جەنابی شێخی خستۆتە ملی خۆی و هەر وەک خۆی دەڵێ بۆ هەر جێیەک شێخ بیهەوێ کەمەندکێشی دەکا، هەر بۆیە بە قسەی کەس ناکات و ناگەڕێتەوە و بەرەو دیهلی دەڕوا تا سەرەنجام لە رۆژی ٢٠ مانگی زیلحەجەی ساڵی ١٢٢٤ مانگی دەکاتە وێ و یەکسەر دەچێتە خانەگای بەڕێز شا عەبدوڵلای دەهلەوی و هەر ئێوارەی ئەو ڕۆژەش بە خزمەت شێخ دەگا و دیدار لە گەڵ شا عەبدوڵلا دەکات و بەو جۆرە بە گەورەترین ئاوات و ئامانجی دێرینەی خۆی دەگا و ئیتر هەر بە قسەکەی خۆی شا هەر بەو پەتەی کە هاویشتوویەتە ملی رایکێشاوە هەتا ئەو جێیە کە خۆی مەیلی لێ بووە واتا دیهلی!!

جا جەنابی مەولانا لەوێ پێنج مانگی تەواو بە مەشک وسەتڵ هەر ئاوکێشی دەکا ولە رێگەی دوورەوە ئاوێ دێنێ بۆخانەگا و مرید گەل و دەروێشانی پێ ئاو دەدا !! شا عەبدوڵلا هەر کە چاوی

بە مەولانا خالید دەکەوێ زۆر زوولێی حاڵی دەبێ کە پیاوێکی زیرەک ووریاوبلیمەت و هەڵکەوتوویە وهەموو کارێکی لەدەس دێ و بۆ ئەوەی دەبێ بیکاتە نوێنەری خوی و دەتوانێ پایەگایەکی گەورە بێ لە کوردستان بۆرێچکەی نەخشبەندی وشیاوی ئەوەیە کە ببێتە بنکەیەکی مەزنی ئەو بیروباوەڕە تازەیە. جاهەربۆیە ڕێزێکی زۆری بۆ دادەنێ وگەلێکی بەخێرهاتن دەکات وئەوجۆرەی کە شیاوی رابەرێکی گەورەیە گرینگی پێ دەداولە گەڵی دەجووڵێتەوە.

کاک خالید ماوەی ساڵ و نیوێک لەوێ لە خزمەتی شادا دەمێنێتەوە و دەورە دەبینێ و ئیتر زۆر بە چاکی یاسا و رێسا و داب و دەستووراتی رێچکەی نەخشبەندی فێر دەبێ و لەو رێبازەدا دەبێتە پسپۆڕ و گەورەترین نوێنەری شا. ئەمجا شا عەبدوڵڵا و نامەی بۆ دەنووسێ و هەر بە دەستی خۆشی عەبای بە شانیدا دەدات و بە ئامادە کراوی پاش ساڵ و نیوێک دەورەی تایبەتی پێ دیتن بەرەو کوردستان بەڕێی دەکاتەوە و لە رێوڕەسمی بەڕێ کردنەکەیدا خودی شا عەبدوڵڵا تا بەر دەرکی خانەگایەکە لە گەڵی دێت، بەڵام مرید و دەرویش و خەلیفە و مەلیفەکان تا رێگەی زۆر دوور لەگەڵی دەڕۆن.

مەولانا خالید لە ساڵی ١٢٢٩ مانگی دەگاتەوە سولەیمانییە و ئیتر پاش ماوەیەک دەچێتە بەغدایە و ماوەی پێنج مانگی تەواو لە گۆشەیەکی گڵکۆی شێخ عەبدولقادری گەیلانی (غەوس) دەمێنێتەوە ئەمجا دێتەوە سولەیمانییە و دەس دەکاتەوە بە کاروباری راگەیاندنی فێر کردنەکانی رێچکەی نەخشبەندی و تەکیە و خانەگا دروست دەکا و زۆر شێلگیرانە و بە سەرسەختی تێدەکۆشێ بۆ بڵاو کردنەوەی ئەم تەریقەتە لە عێراق و کوردستاندا کە تا ئەو دەم جگە لە نێوبانگ هەبوونێکی ئەوتۆی نەبوو لەو هەرێمەدا.

کاری مەولانــا خالیــد ڕۆژ لە دوای ڕۆژپتــرلە گەشــە کــردن و بەرەوپێش چووندا بوو. زانایانی ئیسلامی ومەلا دڵسۆزە باشەکانی کوردستان لە سەرەوەی هەموویان بەڕێز مامۆستا مەلامحەمەدمارفی نودێیی باوکی بەڕێزی گەورە پیـاوی کـورد کـاک ئەحـمەدی شێخ و باپیرە گەورەی شێخ مەحموودی نەمر کە لە هەموان پتـر هەست بە بەرپرســایەتی دکەن و کــاری مەولانــا خالیــد بە بیــدعەتێکی زۆر ناپەســەند دەزانــن و.. ئیتــر بەو شــێوە دەکەونە دژایەتــی و نەیـارییەکی زۆری دەکەن و بەو جـۆرە دەیـانهەوێ خالیـدی ناچـار بکەن کە دەس لەو کارە هەڵبگرێ و هیچ شتێک لە ئـایینی پیـرۆزی ئیسلام زیاد نەکا. چونکە ئەو ئایینە خۆی تەواوە وپێویستی بە لـێ زیادکردن نییە. ئەوە نییە خـوای گەورە لە دوامـین ئـایەتی خۆیـدا دەفەرمــوێ: ﴿ٱلْيَوْمَ أَكْمَلْتُ لَكُمْ دِينَكُمْ وَأَتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلْإِسْلَٰمَ دِينًا﴾واتـا: ئەوڕۆ ئیتـر ئەوا ئایینەکەتـانم بۆکامـڵ کـردن و نازی خۆمم بە تەواوی بە ئێوە بەخشی و ئیسلامم بە دین و ئـایینی ئێوە هەڵبژاردووە.

بەڵام هەرچــی ئەکەن خالیــدیان بــۆ پەشــیمان نــابێتەوە و ئەو ڕێبوارەیـان لەم ڕێبـازە تـازە و پـڕ لە زیـانە بـۆ نـاگەڕێتەوە!! تـا سەرەنجام کار دەگاتە جێگایەک کە بەڕێـز مامۆستا شێخ مـحەمەد مارفی نۆدێیی کتێبێکی چووکەڵە لە دژی مەولانا خالید دەنووسێ و لەو کتێـبەدا ئەوی بە گـاور و لە ڕێ دەچـوو لە پێنـووس دەدا و بە درۆزن و خوانەناسی بە خەڵک دەناسێنێ و لە دیبـاچەی کتێبەکەدا ئاوا دەڵێ:

وضعتها هدية الطلاب        تكفيرة لخالد الكذاب

واتــا ئەم نــامیلکەیەم دانــاوە بە دیــاری لە بــۆ شــاگرد و خوێندکارەکان کە حاڵی وەهایە گاوریەتی و بێدینی خالیدی درۆزن دەردەخا و روون دەکاتەوە.

یەکێک لە رامیارییەکانی شێخەکان ئەوەیە کە بە هەر نرخێک بێ نەیارانی خۆیان لە ناو دەبەن وهەر پەیام و وڵامێکی دژی بەرنامەی خۆیان بێ هەتـا بۆیـان بکرێ دەیبەتلێـنن. جـا وا وێدەچێ کە ئەو نامیلکە جوانەی مامۆستا نۆدێییش دوای نەمانی خۆی بەهۆی فێڵ و فووتی شێخەکان بە یەکجاری بەتلابێ چونکە بەتایبەتی پەیڕەوانـی رێچکەی نەخشبەندی بە سەختی دژ و نەیاری مامۆستا بوون.

ئەمجــا کــاتێ کە مەولانــا خالیــد خــۆی لە بەرابەر تەوژمـی رەداوێژی زانایانی وەک نۆدێییدا بۆ راناگیرێ و زۆر خـۆی لەوە بە چیلازتر (ضعیف) دێتە بەرچاو کە بە گژ وەها بلیمەت و پسپۆڕێکدا بێـتەوە جـا بە تـایبەتی کە تەنیـاش نەبـوو مەحکووم بە بەزیـن و ناچاربە هەڵاتن دەبێ وئیترلە ساڵی ١٢٢٨ مانگی کۆچ دەکا ودەچێتە بەغــدایە و دیــسان دەس دەکــاتەوە بە کاروبــاری رێکخــستن و راگەیاندن و بنکەی بەغدایەیان بەهێز دەکا وماوەی دووساڵی تەواو هەر خەریکــی بڵاوکــردنەوەی رەوش ورێــساویاسای نەخــشبەندی دەبــێ. بەوجــۆرە خەڵکێکــی زۆربــۆلای خــۆی ورێچــکەکەی خــۆی رادەکێشێ.

لەوماوەشداژمارەیەک وشکەمەلا وسادە ورووان ونیزیـکبـین و موسڵمانی ساویلکە دەکەونە نێـوبژی وهەرچۆنێـک بـێ مامۆسـتا نـۆدێیی لە کاتێکدا کە زۆری پـێ نـاخۆش دەبـێ ناچـاری دەکەن بە ئاشت بوونەوە لەگەڵ خالیدا، مامۆسـتای گەورە وگران بە رواڵەت لە بەردڵـی نێـوبژیکەران لەگەڵـی ئاشـت دەبێـتەوە، بەڵام لە دڵـدا هەرخۆشی لێی نایەت، ئەوەش کە لە هێنـدێک کتێبانـدا نووسـراوە

ـ گۆیان ماموستا نۆدیی لە کردەوەی خۆی پەشیمان بۆتەوە و داوای لێبوردنی لە مەولانا کردووە هیچ بەڵگەیەکی لە سەر نییە و بە هیچ کلۆجێک جێی باوەڕ نییە ولە بنی را درویە وساختە گییە. چونکە لەوبارەوە کەمترین نووسراوەی ماموستا لە دەسدا نییە. هێندێک کەسیش کە نووسیویانە ماموستا خۆی قادری بووە بۆیە نەیاری ودژایەتی مەولانای کردووە، بەڵام من راوشکاوی دەڵێم:

ئەوانە لەوداوا بێ پەرتۆیەیاندا مەبەستیان هەرئەوەیە کە لە رێزوهێزو خیرەت وبیروباوەڕی ماموستا کەم بکەنەوە ودەنا ماموستا زۆرزۆر لەوە گەورەترو بالاتربووە کە مریدوپەت بە ملی شێخ ومێخ وهەواداری رێچکە و مێچکەکان بێ وە ک مە ولا نا خالید!! و ئیتر بێگومان قادریشی هەروەک نەخشییان ناخۆش ویستوون و هەربەوپێیە نەیاری وانیش بووە.

ماموستا هەرگیز هیچی لە موجتەهید وسەرمەزەب ورێچکە شکێنەکانی گەورەی جیهانی ئیسلام کەمتر نەبووە و ئەوەندە نەبێ کە کورد بووە، ئەگەر لە گەڵ مەولاناش ئاشت بۆتەوە هەر لە بەر دڵی ئەو کۆمەڵە نێوبژی کەرە کە هەر خۆشیان نەیاندەزانی بۆچی لە لاوەڕا بۆ ئەو کارە هان دەدرێن و زۆر بە سەختی و پێداگیرانە داوایان لێ دەکرد و گوشاریان دەخستە سەر. خۆ ئاشت بوونەوەکەشی هەرئەوەندە بووە کە وەک جاران بە ئاشکرا لە دژی وی کاری نەدەکرد چونکە ئەو زۆر چاک دەیزانی کە ئاشت بوونەوەی لە گەڵ خالید زەبرێکی گرچووبڕە لە پەیکەری ئیسلام و کوردایەتی وهە روە هالە کەسایەتی خوشی.

بەڵام دیارە، کە ئەوشێخانە زۆر زیرەک و هۆشیارن وزۆرچاک دەزانن بە وەخت کەلک لە هەل وەربگرن وهەرگیز هەل نادۆڕێنن ودەرفەت لە دەس نادەن، هەروەک دەبینین کە مەولانا خالیدیش لە

کاتی خۆیدا زۆر بە وخت کەڵک لەو کەمە ئاشتییە رواڵەتییەش وەردەگرێ و خێرا دەگەڕێتەوە بۆ سولەیمانییە و تەکیە و خانەگاکانی دووبارە و لە جاران گرینگتر و بەبڕشتتر ئاوەدان دەکاتەوە و زۆر شێلگیرانەتر لە پێشوو خەریکی کاروباری راگەیاندن و رێکخستن دەبێ و رێچکەی نەخشبەندی کە تا ئێستا لە سەرووی دەرکراو و رەتێنراو بوو بە یەکجاری لێی قەدەغە کرابوو ئەمجا بە ئازادی بۆی دەس بە کار دەبێ و رایدەگەیەنێ.

ئەوجارە لە سایەی سەری وشکە مەلاومریدە کەلاوموسڵمانە بێڕامیاری وسادە وساویلکەکانەوە خالیدهاتەوە سولەیمانی وبە ئازادی و بێترس ولەرزخەریکی کاروباری خۆی بوووئیترگەلێکی خەڵکی سادە و ساویلکە و نەزان بۆ لای خۆی راکێشا و بەو جۆرە پایەگایەکی گەورەی بۆ خۆی و بۆ رێچکەکەی پێکهێنا و هێندەی دیشی کوردی هەژاری چاو بەستراو بەرەو پەرێشانی و لێک بلاو بوون و سەرگەردانی برد و.

بە داخەوە ئێستاش دوای نزیکەی ١٠٠ساڵی رەبەق هێندێک لە وشکە مەلاو موسڵمانە ناحاڵییەکان هەرحاڵی نەبوون ولە سەرئەورێبازە دەڕۆن. بەڵام موسڵمانە تیژبین و مەلا هۆشیار و دڵدارەکان چاک دەزانن کە مامۆستا شێخ مارفی نۆدێیی لەو دژایەتی و نەیارییەیدا لە گەڵ خالید چ ئامانجێکی پیرۆز و موسڵمانانەی هەبووە و ئەو بەڕێزە چەندە دووربین و تیژهۆش بووە. وە هەروەها دەشزانن کە ئەو بەڕێزە لە ئاشت بوونەوە لەگەڵ خالیدا چ ئەندازە زیانی کردووە و مەلا نەزان و بێرامیارییەکان بە ناچار کردنی بە ئاشت بوونەوە لەگەڵ ئەو چ زەبرێکی گرچووبڕیان لە خاڵیگەی ئیسلام و کوردایەتی داوە و چۆن ئەو بەڕێزەیان شکاندووە؟!

بەڵێ خالید، تا ساڵی ١٢٣٦ مانگی لە سولەیمانییە دەمێنێتەوەو پاشان لە جێی خۆیڕا دەستووری پێ دەدرێ کە سولەیمانییە بە جێ بێڵێ و بچێتەوە بەغدایە، چونکە کاروبارەکانی کوردستان تا ئەندازەیەک ڕێکوپێک کرابوون، بەڵام ئەوانی بەغدایە هەر وا بە نیوەچڵی و ناتەواوی مابوونەوە و لە بەر هێندێک هۆ و پێویستی مێژوویی نەبا نەدەبوو بە جێ بهێڵدرێن.

ئەمجا ئاغای شارەزووری یەکێک لە هەرە پاڵاوتە وپوختە کراوەکانی خۆی بە نێوی شێخ عەبدوڵلای هەرەوی لە سولەیمانییە لە جێگەی خۆی دادەنێ و بەرەو بەغدایە وەڕێ دەکەوێ و ئەو جارەش سێ مانگان لەوێ دەمێنێتەوە و بەو ماوە تا ئەندازەیەک پلە و پایەی خۆێ و ڕچەی نەخشی پتەوتر دەکا ولەوێوە بە هەموو لایەکدا خەلیفە و مەلیفە و نوێنەرانی خۆی بڵاو دەکاتەوە و لە بەغدایەڕا تیشکە دەهاوێتە هەر چوار لای خۆی و یەکێک لەو نوێنەرانە کەسێک بە نێوی شێخ ئەحمەدی خەتیبی ئەربیلی دەبێ کە دەینێرێتە شاری دیمەشقێ. شێخ ئەحمەد لەوێ زۆر بە چاکی ئەرک و سپاردەی خۆی بە جێ دێنێ و ژمارەیەکی زۆر لە خەڵکی بۆ ئەو ڕێبازە ڕادەکێشێ و ئیتر ئەو خەڵکە هەر خۆیان داواکاری هاتنی مەولانا خالید بۆ دیمەشقێ دەبن و شێخ ئەحمەد نامەیەکی لەو بارەوە بۆ مەولانا دەنووسێ و مەولاناش هەل لە دەس نادا و خێرا دێتە دیمەشقێ و لە ساڵی ١٢٣٨ مانگی لە گەڵ ژمارەیەکی زۆر لە مرید و پەیڕەوانی خۆی بەرەو دیمەشقێ وەڕێ دەکەوێ و لە لایەن هەواداران و مریدانی زۆر و زەبەندی خۆیەوە لەوێ پێشوازییەکی گەرم و گوڕی لێ دەکرێ و زۆر بە جوانی وەردەگیرێ. ئەمجا لەوێ دەمێنێتەوە و دەس دەکا بە ئەنجام دانی ئەرکەکانی خۆی و خەریکی ڕاگەیاندن و ڕێکخستن دەبێ و بەو جۆرە

پەیڕەوگەلێکی زۆر بۆ ڕێچکەی نەخشبەندی پەیدا دەکا.

لەو ماوەدا کە لە دیمەشقێ دەبێ سەردانی بەیتولموقەددەس دەکا و هەروەها بۆ جاری دووهەمیش دەچێتەوە مەککە و حەج بەجێ دێنێ.

مەولانا خالید دیمەشقی کردۆتە سێهەمین پایەگای خۆی و ئیتر تا دوا هەناسەی ژیانی لەوێ دەمێنێتەوە و خەباتی شێلگیرانەی خۆی درێژە پێ دەدا و تا سەرەنجام لە ڕێکەوتی ١٢ی مانگی زی قەعدەی ساڵی ١٢٤٢ی کۆچی مانگی بە نەخۆشی وەبا کۆچی دوایی کردووە.

مەولانا خالید گەلێکی هۆنراوە و نووسراوە بە زمانەکانی کوردی و فارسی و عەرەبی هەیە. هەروەها چەند کتێبیشی بەو سێ زمانانە داناوە کە پێم وایە هەموویان چاپ و بڵاو کراونەوە.

بە گشتی مەولانا خالید پیاوێکی گەلێک بەڕێز و بەهێز و فەرمانڕەوایەکی بە دەسەڵات و فەرمان ئەنجام دراو بووە لە کوردستاندا. ئەوەندەی لەو وڵاتەدا پەیڕەو هەبوون کە ڕەنگە ئەگەر ویستبای و باوەڕی بە سەربەخۆیی و ئازادی و ڕزگاری گەلەکەی هەبایە هەر بە یەک فەرمان دەیتوانی ئەو کارە بکا و گەورەترین شانازی و سەربەرزی بۆ کورد و کوردستان بچەسپێنێ. بەڵام کەمترین کارێکیشی لەو بارەوە ئەنجام نەداوە، جا هەر بۆیە بەڕێز مامۆستای گەورە لە دوایی ئەو پارچە هۆنراوەی خۆیدا ڕووی تێدەکا و پێی دەفەرموێ: ئەی خالیدی شارەزووری! تۆ خەڵکی شارەزووری ناو جەرگەی کوردستانی و لە دەورانی خۆتدا بە تەواوی گەلەکەی خۆت وەلا نابوو و زۆر کاریشت لەدەس دەهاتن و دەتتوانی بۆو گەل و نیشتمانە گەلێک کاری گەورە ئەنجام بدەی،

بەڵام هیچت نەکرد و بە داخەوە گەلی خۆت بۆ خەڵک وەلا نا و بە یەکجاری فەرامۆشت کرد.

بەوجۆرە گلەیی گەل وزێدونیشتمانەکەت هێنایە سەرشانی خۆت. لەباتی ئەوەی کە فەرهەنگی رەسەنی ئیسلامی و کوردی خۆت برەو پێ بدەی، چووی لە رۆژهەڵاتی دوورەوە لە ناوەندی هیندوستانی گاپەرەستڕا جۆرە بیر وباوەڕێکی تایبەتیی لاوەکی زۆرنامۆت هێناو لە کوردستان ورۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بڵاوت کردەوە وئیتر تۆش هەروەک پێشینیانی شێخ و مێخت، تا توانیت خەڵکی موسڵمان و جا بەتایبەتی خەڵکی کوردت لێک بڵاو کرد!!
تۆش تا توانیت تۆوی بیدعەت و وەدیهێنراوێکی دیکەت لە کوردستان و رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا بڵاو کردەوە و بە دەستی خۆت چاندت! بەو جۆرە تۆش هاتی و شتێکت لە ئایینی پاکی پێغەمبەر( زیاد کرد! ئەی ئافەرین خالید! لە منت نەکەویَ قەت دەبوو وا بکەی؟ چ دەبوو کە ئایینی پاکی پێغەمبەر( هەروەکوو خۆی کە هەیە رابگەیەنی هیچ شتێکی دیکەی رەگەڵ نەخەی؟ ئاخر تۆ خوا ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە هەوەڵەوە ئەو جۆرە شتانەی لەگەڵ بوون و تۆ چ ئاتاجییەکی بەو رێچکە و ئائییزا جۆراوجۆرانە هەیە؟

خۆ لە پێش تۆدا خەڵکی کوردەواری هەربە حاڵ نێوی رێچکەی نەخشبەندییان بیستوو وبەس. ئەوە تۆ بووی کە پەت و پێوەندی نەخشبەندیت هاویشتە مل و پێی کوردی هەژاری نەخوێندەواری بێئاگا لە هەموو فێڵ و فووت و لە هەموو داو و تەڵەیەک! تۆ نەزان نەبووی و هەرگیز ئەو کارەت لە رووی نەزانییەوە نەکردووە، تۆ هەموو شتێکت دەزانی و گەلێک زانا و ئاگادار بووی! زۆرم پێ سەیرە ئەی خالید! خۆ تۆ زۆر زانا و ناودار بووی، ئەریَ بۆ وات کرد؟! تۆ خوا هەر لە خۆت دەپرسم ئەو خزمەتەت خەیانەت نەبوو؟

بۆ مەگەر تۆ فەرمـوودەی پێغەمـبەری مەزنـتﷺ نەبیـستبوو کە فەرموویەتی: (من احدث فی امرنا هذا ما لیس منه فهو رد) هەرکەس شـتێک لەو ئـاییینەی ئـێمە زیـاد بکـات ئەو فـڕێدراوە و رەت کـراوەوەیەو قەت لێـی قەبـووڵ نـاکرێ. لە جێیەکـی دیکەشـدا دەفەرموێ: (من احدث فی امرنا هذا ما لیس منه فهو و ما احدثه فی النار) هەر کەس شتێک لەو ئاییینەی ئێمە زیـاد بکـا کە لەوی نەبـێ ئەوە خۆی و شتە زیاد کراوەکەشی لە دۆزەخدان.

یان دەفەرموێ: (ان اصدق الحدیث کتاب الله و احسن الهدي هدي محمد و شر الامور محدثاتها) بەڕاستی و بێگومان راستـترین وتـار کتێبـی خـوایە و جـوانترین رێنـوێنی، رێنـوێنی مـحەمەدە و خەراپترینـی کاروبـارانیش ئەوانەن کە دوای پێغەمـبەرﷺ سوەدیهێنراون.

مەگەر ئەو رێچکەی نەخـشبەندی، کە تۆ لە وڵاتـی هیندوستانێ ڕاهێنات بۆ کوردستـان لە چـاخی شۆق و رووناکیـدا و لە دەورانـی پێغەمبەری مەزندا هەبووە؟ تەنانەت زۆر پتر لە چوارسـەد ساڵیش دوای پێغەمـبەرﷺ وەدینەهێنـراوە؟ هەی لە منـت نەکەوێ کـاک خالید؟! ئاخر چۆن بوو تۆ بە قسەی مەلا باشەکانی سولەیمانییەت نەکـرد و فەرمـوودە بەنرخەکـانی مامۆسـتای دڵـسۆزی کـورد شـێخ مارفی نۆدێییت نەبیست و پەند و ئامۆژگارییەکانی ئەو بەڕێزەت دە گـوێ نەگـرتن؟ مەگەر پێـت وا نیـیە کە لە رۆژی پەسـڵاندا لێـت دەپرسـنەوە؟ دە هەر ئێـستاش دوای نیـزیکەی سـەد سـاڵ لە پـاش مردنت سەرێک لە گۆڕەکەت دەربێنە و بزانە و بە چاوی خۆت ببینە کە ئاکـامی ئەو کـارەی تـۆ جـگە لە دابەش کرانـی کوردسـتان و لەتلەت بوونی جەرگ و هەناوی دایکی نیشتمان و بێبەشی و مـاف خوراوی گەلی هەژاری کورد چیدی بووە؟

ئەگەر بە رای تۆ خواپەرستی بریتییە لەوە کە وە دوای رێچکە و مێچکان بکەوی و بەو لا و لایاندا برۆی؟ دە سەر هەڵێنە و ببینە و زۆر چاک بزانە کە گەلەکەی تۆ چ دەردێکیان بە سەر هاتووە؟

من ناڵێم شا عەبدوڵڵای دەهلەوی پیاوێکی کەمە، بەڵکە ئەولە رچە و رێبازی خۆی واتا نەخشبەندیدا گەلێک گەورەیە، بەڵام تۆپێت وابووکە بەڕێز مامۆستا شێخ مارفی نۆدێیی لەوی کەمترە کە هەرلە پەنا خۆشت بوو؟! یا بەڕێز مامۆستا محەمەد مفتی فەیزی زەهاوی کە دەفەرموێ:

شیخا که تو در عالم یکتا فردی
این رتبه ز دستار بدست آوردی
حیف است که او دور سر تو گردد
بایستی که تو دور سر او گردی

ئیتربە تەواوی نەیاری بازاڕی شێخایەتییە وبە هیچ جۆرێک قبووڵی ناکا نەزانە؟ زۆر سەیرە ئەو پیاوە گەورانە بە هەڵە نەچوون. هەرگیز، نەدەبوو تۆ بە شتی پڕوپووچ و ترەهات فریو بخۆی. تۆ مەلا بووی وخۆپڕوپووچ پەرستیش بۆمەلایان زۆرنەنگ و ئابڕوو چوونە. دەبوو قورئان بخوێنییەوە و بزانی داخواتاقە و شەیەکیشی لەبارەی پەسند کردنی ئەو بازاڕە تاریک و تنۆک و ڕەشە تێدایە؟!

ئەگەر پێویستە شێخ بۆ ئایینی خوا
بڵی پێم شیخی گش پیغەمبەران کوا
موحەممەد خوی و یارو یاوەرا نی
بەگشتیان شیخێکیان ببوایە دەبوا

بلیم پێت نای پەرستم ئەو خودایە
کە هەوساری لە دەستی شێخی دایە
ئەمن زەنند یقەم وئاور پەرستم
ئەگەر کو خوا نەکا خواما ن ئەوایە
برا ئەم دەزگا گەورە و درێژ و پانە
لە ئیسلاما نییەتی دیاردەو نیشانە
ئەگەر باوەر دەکەی جو سا زەگشتی
نەفەرمانی خوداو پیغەمبەرا نە

# ڕوون کردنەوەیەک لەسەر ژیانی مامۆستا شێخ مارفی نۆدێیی

چەند ساڵ لەمەوبەر وتارێکی کورتم لە مەڕ مێژووی ژیانی زانای پایەبەرزی کورد مامۆستا مەلا شێخ مارفی نۆدێییەوە نووسیوە کە لە ژمارە ٤٠ی گۆڤاری سروەدا چاپ و بڵاو کرایەوە. ئێستا لەبەر ئەوەی نامهەوێ زەحمەتی نووسینەوەی دووبارەی ژیاننامەی ئەو بەڕێزە بە خۆم بدەمەوە، هەر خودی ئەو وتارە لێرەشدا دووپاتە دەکەمەوە. کە ئەو دەم ئاوام نووسیبوو:

ئەگەر بە چاوێکی ڕەدا (حق)بینانە و کەمێک بە ورد بڕوانینە بەستێنەکانی مێژوویی، ویژەیی، ئابووری، رامیاری، ئایینی، هونەری، هۆنەری، پسپۆڕی، پیشەسازی، سوپایی، سەربازی، دادپەروەری وکۆمەلایەتیی هەر گەلێک دەبینینی کە لە هەر یەک لەو بەستێنانە کەڵە پیاوانێک راوەستاون و لە سەر لێواری زێی خوڕێنی ژیان چەقیون و شەپۆلە بێئامانەکانی ئەو شەتاوە هار و هاژە خەڵک هەڵلووشەیان زۆر بە سەختی خستۆتە ژێر چاوەدێری خۆیان و بواری رزگاری بە گەلەکەیان نیشان دەدەن.

بە چرای زانیاری خۆیان ڕێگا ڕۆشن دەکەن و دەستی خەڵک دەگرن و وەک مەلەوانی چاک لەو زرێبارە خوڕێنە دەیانپەڕێننەوە، ئەوان خوا پاداشیان بداتەوە نەک هەر تەنیا هاوچەرخانی خۆیان لە گێژاوی چۆمی خوڕێنی بێپرد و بەردە بازی ژیان بە هۆی مەلەوانی خۆیان دەپەڕێننەوە و بەس، بەڵکە بۆ تۆرەمە و بەرەی دوا ڕۆژیش ڕێی پڕ کەند و کۆسپ و پل و گیرگە و تۆرەمەی

داهاتووش بە هۆی هێزی کێشەری زانستی (قوە جاذبە علمی) خۆیان بە دوای خۆیاندا دەکێشن و دەیانگەیەننە لوتکەی هەرە بەرزی و ترۆپک و دوندی کێوی ئاوات و بە نیاز گەیشتن.

جا بە هەق جێی خۆیەتی کە ئەوانە دەبنە جێی شانازی و هۆی سەربەرزی گەل و گەلیش هەر بە هۆی وانەوەیە کە دەتوانێ خاوەنی ویژە و فەرهەنگ و مێژوویەکی جوان و پڕشنگدار بێ و بە رابردووی خۆیەوە بنازێ. بێگومان گەلی کوردیش هەر وەک هەموو گەلێکی خوا پێداو خاوەنی رابردوویەکی پڕ لە شانازییە و لە ئاسمانی هەساوی مێژووی کوردەواریشدا گەلێک ئەستێرەی پڕشنگدار و شۆق هاوێژ و تیشکە پژێن دەدرەوشێتەوە کە نەک هەر تەنیا هۆی شانازی و سەربەرزی گەلی کوردن و بەس، بەڵکە تەواوی گەلانی دیکەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و بگرە هەموو گەلانی جیهانی ئیسلام پێیانەوە دەنازێ و تەنانەت هێندێک لە مێژوونووسە نەتەوەییە بەرچاو تەنگەکانیش بێ هیچ بەڵگە و پەرتۆیەک ئەوان بە گەورە پیاوانی نەتەوەی خۆیان لە قەڵەم دەدەن.

راستی ئەوەندە بەسە بۆ شانازی و سەربەرزی نەتەوەکەمان کە دەیان و بگرە سەتان و هەزاران بلیمەت (نابغە) و پیتۆڵ (فیلسوف)ی وەک ئیبنولحاجب و ئیبنو قوتەیبە و ئیبنو خەلەکان و ئیبولحاج و ئیبنولخەتیبی ئەربیلی و ئیبنی عیسای هەکاری و ئیبنی کوردی و ئیبنولفەیراقی و مەلا ئەبووبەکری میروستەمی و مەلا محەمەدی فەیزی زەهاوی و مەلا عوسمانی کوردی، مەلە یۆسفی ئەسەمی سۆرانی بریسوەیی و مەلا ئەحمەدی خانی و جزیری و بێتووشی و مەلا مەحموودی کوردی و مەلا عەلی قزڵجی و قەرەداغی و مەلا عەلی شنۆیی مان لێ هەڵکەوتووە.

ئەوانە نەک هەر لە باری دێژەوانی (فقیهی)و راڤەوانی(مفسری) و وێژەوانی (ئەدیبی) بە کەڵکە لەبارەی هونەرگەلی جۆراوجۆری دیکەشەوە نموونەی دەوران وهەڵکەوتووی رۆژگار بوون و لە تەواوی زانیارییەکانی ژێرامەیی و گێڕاوەیی(عقلی و نقلی)یەوە بێهاوتا و کەموێنە بوون، بەڵکە تەنانەت رێنووس و رێزمانیشیان بۆ گەورەترین گەلی زیندووی جیهان واتا گەلی عەرەب کە لە سایەی ئیسلامەوە نیزیکە پتر لە هەزار ساڵە گەورەترین دەسەڵاتدار و زلهێزی دنیا بوون داناوە.

خۆ ئێستاش، کە ئێستایە لەتەواوی فێرگەکانی ئایینی کوردستان و هەموو جیهانی ئیسلامیشدا نووسراوەکانیان بە وانە دەخوێندرێن. بەڕاستی ئەگەر گەلانی دیکەی جیهان شانازی بە زانایانی رامیاری خەڵک پێک وەرکەر و زانایانی ئابووری بژیو هەڵلووش و پسپۆڕانی سازکەری فڕۆکەی تیژتر لە دەنگ و کەشتی هەواقەڵیش و گەمیی ژێر دەریایی غوولپەیکەر و هەروەها زانایانی تانک و تۆپ و مووشەک و جۆرگەلی زۆری گازگەل سازکەرەوە دەکەن و پێشیان وایە کە ئەوانە مایەی سەرکەوتن و پێشکەوتنی وانن بێگومان گەلی کوردیش مافی خۆیەتی کە شانازی بکات بە هەزاران هەزار زانای ئاییینی رێگای ژیان و پەسڵان نیشاندەر کە گیان و ژیان و تەمەنی خۆیان بە سەخاوەتەوە لەو پێناوەدا بەخت کردووە.

بەڕاستی گەلی کوردیش پتر لە هەزار ساڵە بێجگە لە مەلا زانا و داناکان پیاوی مێژوویی دیکەی زۆر لێ هەڵنەکەوتوون و ئیتر تەنیا حوجرە قوڕینەکانی کوردستان بوون کە هەم بوونەتە مایەی شانازی و سەربەرزی گەلی کورد و هەم بە هۆی بەرهەم و ئاکامی جوان و زۆر چاکی وانەوە تەواوی جیهانی ئیسلام ئێرەیی بە کوردو

کوردستانەوە برد و جا کەوایە حێی خۆیەتی کە کاکی خوێنەر بە هەر بیر و باوەڕێکەوە کە هەیبێ کەمێک گلەیی لەو کوردە سادە و ساویلکە بکات کە خۆشی بە کورد دەزانێ و کەچێ وێڕای نەیاران و دوژمنانی گەلەکەی مەلا واتا گەورە دڵسۆزی کورد و کوردستانی دەدزێ و ناخۆشی دەوێ و قسەی ناحەزی لە ئاقارا ئەکا و دەیداتە بەر توانج و پلار و تانە و تەشەر و لاتاری پێدا دەدات.

چونکە ئەو ئاغا بەڕێزە نەزانانە یا زانایانە پەلامار دەباتە سەر رابردوو و مێژووی پڕ لە شانازی گەلی خۆی و گیان و کاکڵی گەلەکەی لە بەر پێیاندا بە خەیاڵ دەپلێشێنێتەوە و لە راستیدا هەر دەڵێی شەرمی بە مێژوو و شانازییەکانی گەلەکەیەتی!!

جا ئەو جار با بێینە سەر مەبەست و بڵێین: بەڕێز جەنابی مامۆستا مەلا شێخ مارفی نۆدێییش هەر یەکێکە لەو هەزاران هەزار زانا و دانا رێنوێنانە کە بەراستی جێگەی شانازی و سەربەرزی گەلی کورد بەتایبەتی و گەلانی جیهانی ئیسلامن بە گشتی.

جا ئەو بلیمەتە هۆزانە کوردە ناوی پیرۆزی مارف (مەعرووف)ەو کوڕی مەلا سەیید مستەفا کوڕی سەیید ئەحمەد کوڕی مەلا سەیید محەمەدە کە بە کبریت احمر (شەمچەی سوور) ناوبانگی دەرکردووە، ئەو کبریتی ئەحمەرە یەکێکە لە مەلا هەرە ناودارەکانی مێژووی کوردەواری و باپیرە گەورەی ئەو بەڕێزە سەیید عیسای بەرزنجی کوڕی بابا عەلی هەمەدانییە.

وەک هەموومان زۆر چاک دەزانین کە هەمەدان سەردەمێکی پێتەختی میری گەورەی ماد و ناوەندی شارستانییەت و قزگە (مرکز)ی هێزی هەراوی هۆزی کوردان بووە و گەلێک زانا و دانای بەرز و زۆر بەنێوی لێ هەڵکەوتوون کە ئاوازەی زانیاری و جوامێری و پیاو چاکیان بە تەواوی کون و قوژبنی دنیا راگەیشتووە کە یەکێک لەوان رێزدار بابا عەلی هەمەدانییە.

ئەو زانا بەرزە، کە یەکێکە لە ناودارانی کوردەواری یەکێکە لە پسپۆڕانی کوردی سەدەی هەشتەمی کۆچی و یەکێک لە کوڕەکانی وی ناوی سەیید عەیسای بەرزنجییە کە بەڕێز مامۆستا شێخ مارفی نۆدێیی بە ١٣ پشت دەگاتەوە وی. واتا بابا عەلی هەمەدانی باپیرەی چاردەهەمینی مەلا شێخ مارفە و ئیتر خانەدانی سەیدەکانی بەرزنجی، سەید واتا تۆرەمە (نسل)ی فاتیمەی کچی پێغەمبەر( نین و لە ماکا (اصل) کوردی کەلهوڕن و عەرەبی رەمەکی و پەڕیوە نین!! بەڵام لەبەر وەی کە بنەماڵەیەکی یەکجار زۆر بەڕێز بوون و مەلای باش باشیان لێ هەڵکەوتوون پێیان گوتوونە سەیید، بەڵام مامۆستا مەلا کەریم لە (علماءنا)دا پارچە هەڵبەستێکی لە خودی خۆی دەگێڕێتەوە کە بەو پێیە ئەو بنەماڵە دەچنەوە سەر فاتیمە و ئەگەر وا بێ بنەچەکەیان کورد نییە و عەرەبە و بە هەردووک لادا هەر جێگەی ڕێزن.

مێژوونووسی گەورەی کورد خوا لێخۆشبوو ئەمین زەکی بەگی بەڕێز دەنووسێ: بابا عەلی هەمەدانی برای بلیمەتی کورد بابا تاهیری عوریانی هەمەدانییە. بەڵام هێندێک لە مێژوونووسانی کورد ئەو ڕایەیان پێ ڕەوا نییە، چونکە بابا تاهیری عوریان لە سەدەی چوارەمی کۆچیدا ژیاوە و بابا عەلی هەمەدانیش لە سەدەی هەشتەمدا و بە وپێیە نیزیکەی چوار سەد ساڵیان جیاوازی هەیە.

# ئەمین زەکی بەگ

ئەوبلیمەتە خواناسە، ئەوئەستێرە پڕشنگدارەی ئاسمانی ئایین و زانیاری کوردستان لە دەورانی بەڕێز سولەیمان پاشای بە پێنجەمین پادشای بنەماڵەی بەڕێزی بابانی لە ساڵی ١١٦٦ی کوچی مانگی ڕێکەوتی ١٧٥٣ی زایینی لە گوندی نۆدێ لە ناوچەی شارباژێری کوردستانی عێراق لە ٣٣ کیلۆمەتری شاری سولەیمانی لە بنەماڵەیەکی زانیاری ئایینیدا لە دایک بووە و پێگەییوە. دیارە کە وەک زۆربەی زارۆکە هەژارە کوردەکان زەجرو ڕەنجی نەبوونی و بێبەشی چێشتووە. هەر لە دەورانی منداڵیدا قورئانی پیرۆز و هەروەها هێندێک لە کتێبە وردەڵەکان و دەستووری زمانی عەرەبی (صرف و نحو) و زمانی فارسیشی لە خزمەت مەلا مستەفای باوکی بەڕێز و زانای خۆی خوێندووە. ئەمجا بابی هەڵگیرتووە و بردوویەتە قەڵاچوالان، ناوەندی دەوڵەتی بەهێزی کوردی بابان و لە فێرگەی غەزائییەی ئەو ناوەندە دایمەزراندووە.

فێرگەی غەزائییە فێرگەیەکی گەورەی ئەو سەردەمە بووە و لە لایەن بابانەوە بەڕێ براوە. جا بەڕێز شێخ مەلا مارف ئەودەم لاوێکی کەم تەمەن بەڵام پڕ هیوا بووە و زۆر شێلگیرانە هەوڵی داوەو خەباتی کردووە و تێکۆشاوە و کۆبە کۆ زانیاری لە سینەی پڕ هەستی خۆیدا کۆ کردۆتەوە.

ئەو بەڕێزە لەم زانکۆ گەورەیە ماوەتەوە تا ڕۆژێک کە ئەو دەم تەمەنی تەنیا ١٢ ساڵانە بووە بە شەهید کرانی پادشای گەورەی و موسڵمانی کورد سولەیمان پاشا، شار بە تەواوی شڵەژاوە. ئەو ڕووداوە دڵتەزێنە کە لە ١١٧٨ی کۆچیدا ڕووی داوە بە تەواوی بۆتە

خۆی پەژارە و پەرۆژشی خەڵکی کوردستان، جا بەتایبەتی مەلا و فەقێ و زانایان و تیپی خوێندکار.

ئەو کارەساتە شوێنەوار و جەخەرێکی وەهای لە سەر ڕێزدار نۆدێیی دانا کە ئیتر ویستی لەمەولا لە پێتەختی میری و ناوەندی رامیاری بگوێزێتەوەو بڕواتە گۆشەو قەراغان بۆئەوەی بێ باکانە و دوور لە هەرا و هووریا دریژە بە خوێندنەکەی بدات. جا هەر بۆیەش لەوێ رۆیشت و چووە گوندی هەزارمێرد لە نیزیکەی ٢٥ کیلۆمەتری رۆژئاوای شاری سولەیمانییە ولەوێ لە خزمەت زانای کەم وێنەی کورد مەلا محەمەدی ئیبنولحاج ماوەی چوار ساڵ مایەوە و لەو ماوەیەدا کتێبەکانی سیوتی حیسام کاتی عەبدولڵای یەزدی موختەسەر و لمەعانی شەرحولعەقایدی نەسەفی و چەندین کتێبی دیکەی زانیاری و دێژەیی (فقهی) خوێندووە و هەروەها چەندین کتێب و نامیلکەی زۆر جوان و باشی بە هۆنراوە و ویژامە (شعر و نثر) داناوە و بۆ مامۆستای بەڕێز و خۆشەویستی خۆی خوێندۆتەوە و ئەگەر پێویستیش بووبێ مامۆستا بۆی ریکوپێک کردووە.

لەو کاتەدا کە نۆدێی لە گوندی هەزارمێرد بوو پسپۆڕی بێهاوتای کورد مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی کە وانەوێژێکی باڵادەستی شاری ئیحساریە بوو هەوای گەل و نیشتمانەکەی دێتەوە کەللەی و بەرەو بێتووش لە ناوچەی ئالانی سەردەشت دەگەڕێتەوە و پاش ماوەیەک لە وێڕا دەچێتە سەردانی مامۆستی دڵسۆز و خۆشەویستی خۆی مەلا محەمەدی ئیبنولحاج.

کاتێ کە شێخ مارف ئەو هەلە گەورەی بۆ هەڵدەکەوێ داوا لە مامۆستا دەکا کە قبووڵ بفەرمێ ئەو چەند رۆژانەی وا بێتووشی لە هەزارمێرد دەمێنێتەوە لە حوجرەکەی وی بێ و ئەو شانازی ئامادە

بوون لە خزمەت بێتووشیدا دەس کەوێ. مامۆستاش چونکە دەزانـێ کە نـۆدێی دەیـهەوێ کەڵـک لە بێتووشـی وەربگـرێ و لـە خزمەتیـدا بەهرەمەند بێ قبووڵی دەکا.

نۆدێی لەو ماوە کەمەدا گەلێک شتی تازە لەبێتووشی فێر دەبێ و هێندێک لەنووسراوەکانی خۆی بۆدەخوێنێتەوە. جا بەڕێز مامۆستا بێتووشـی هەر کە دەزانـێ ئەو فەقێـیە خـاوەنی بیرێکـی زۆر وردو هۆشێکی هۆشـیارانەیە ئەوەی پێـی وا بـووە پێویـستە پێـی دەڵـێ و زۆریش هـانی دەدات بـۆ نووسـینی پەڕتووکـان، هەم بە هـۆنراوە و هەم بە ڕێژامە و ئیتر بێگومـان نـۆدێییش هەر لە وەهـا دەرفەتێـک دەگەڕا کە وا بە بێزەحمەتی خۆی خوای گەورە بۆی ڕەخساندبوو.

ڕێزدار نۆدێی پاش چوار ساڵ وانە خوێندن لە خزمەت مامۆستای گەورە و گرانی ڕێزدار ئیبنولـحاجدا دەگەڕێتەوە بۆ قەڵاچـواڵان و لە خزمەت بەڕێز مەلا محەمەدی غەزائی دادەمەزرێ و لەوێ دەمێنێتەوە تـا سـاڵی ١١٩٩کـۆچی و ١٧٨٤ زاییـنـی کە ئەودەم ئیبـراهیم پاشـای کوڕی ئەحـمەد پاشـای بەبە دەسـتی کـرد بە دروسـت کردنـی شـاری سولەیمانییە و بە مـاوەی یەک سـاڵ واتـا لە سـاڵی ١٢٠٠ کـۆچی و ١٧٨٥ زاییـنـی تەواوی کـرد و ناوەنـدی میـری گەورەی بابـانی گوێزتەوە بۆ ئەوێ و ئیتر فێرگەکەش بە نـۆدێییەوە وێـڕای تەواوی یانە (ادارە)کانی میری هێندرانە شاری تازە ساز کراوی سولەیمانی.

جا ئەمجا نۆدێی تازە مەلاش لەو تازە فێـرگەی ئەو تـازە شـارە بوو بە تـازە مامۆسـتا و لە مزگەوتـی گەورەی وێـدا دەسـتی کـرد بە وانەوێژی و دەیان و سەدان فەقێی لەو فێرگەیەدا پەروەردە کردووەو بۆ گەل و نیـشتمانەکەی پێـی گەیانـدوون و بە دوو دەسـتی ڕێزەوە پێشکەشی کردوون بە کۆمەڵە دوا کەوتووەکەی کورد.

فێرگەی گەورەی قەڵاچوالان کاتێ کە گوێزرایەوە سولەیمانییە، پاش ماوەیەک شێخ مارفی نۆدێی دەبێتە سەرپەرستی هەموو یا بەشێکی و ئیتر بە هۆی لێزانی و دڵسۆزی وی و وانەوێژ و کارگێڕەکانی لە ماوەیەکی نە چەندان زۆردا بوو بە یەکەم زانکۆی وڵاتی کوردەواری و هەروەها مەکۆی زانست و زانیاری و گەورەترین پەروەرشگای فەقێ و مەلا لە کوردستاندا و ئەمجا چەندین ساڵ دواتر فێرگەی گەورەی ئیسلامی کە سەتان بلیمەت و پسپۆڕی وەک ڕێزدار مەلا شێخ حوسێنی قازی و مەلا شێخ مەحموودی بەرزنجی و مەلا محەمەد فەیزی زەهاوی و بابە ڕەسووڵ و مەلا سەید محەمەدی بەرزنجی (سناء الدین) پێگەیاندوون و تەحویلی کۆمەڵی کوردەواری داون.

بەڕێز مەلا شێخ مارفی نۆدێی تیشکی بێپسانەوە ورۆژی قەت ئاوا نەبووی کورد خوێندەوارییەکی بەرزی بە زمانەکانی فارسی و عەرەبی و کوردی هەبووە وبە هەریەک لەو سێ زمانانە هۆنراوە و پەخشانی زۆرو زەبەندی نووسیوە. ئەوبەڕێزە نۆوە (انشا)یەکی بێوێنەی هەبووە وخاوەنی دەستێکی دەروشاوە بووە لە نۆوە نووسیندا. گەلێکی پەڕتووکی گەورە و گچکە ونامیلکە بە هۆنراوە و پەخشان داناوە، کە هێندێکیان چاپ وبڵاو کراونەتەوە و هێندێکیشان هەر واماونەتەوە وزۆربە داخەوە ڕەنگە تەنانەت هێندێکیان هەر نەشمابن وبە فێڵ ومەکری نەیارانی خۆی وگەل و ئایینەکەی بە یەکجاری بەتلێنرابن.

ئەو بەڕێزە چەندین چەکامە(قصیدە)، پێنج خشتەکی(مخمس)، چوارینە(رباعی)، سێ خشتەکی(مثلث)، تێهەڵکێش(ترجیع‌بند)، بەستە (قطعە) هۆنراوەی بەوسێ زمانە هەیە.

فەرهەنگۆکی ئەحمەدییەی بەڕاستی یەکێکە لە شاکارە بەرزەکانی کە هێناویەتی وشە عەرەبییەکانی بە وشەی کوردی ئاجڤە (ترجمە) کردوون وبە هۆنراوە دەریهێناون.

مامۆستای باس لێکراومان خوا لێی خۆش بێ، هۆنەرێکی وەها بالآدەست وبەتوانابووە کە هەرچی ویستبێتی توانیویەتی بە هۆنراوە دەریبێنێ ودە قالبی هەڵبەستدا دایبرێژێ. تەنانەت زۆربەی هەرە زۆری ئەوزانیارییانەی کەواله نێو مەلاوفەقێیانی ئیسلامیداباون ودەخوێنرێن کردوونیەتە هەڵبەست وبۆئەوەی فەقێکان بە ئاسانی بتوانن لە بەریان بکەن، بە شێوەی هۆنراوە لە سەرڕا دایڕشتوونەتەوە. بێگومان ئەو شاکارییانەی ئەو کردوونی تا چاخی خۆی لە هیچ وڵاتێکی ئیسلامیدا نەکراون.

سەرەڕای ئەوەش نۆدێی بەرێز لە تەواوی زانیارییە ئیسلامییەکان وەک (نحو، صرف، لغة، معانی، بیان، بدیع، عروض، آداب، کلام، شرع، حدیث، علم الحدیث، تفسیر، فرایض، بحث و مناظره، هندسه، جبر و مقابله، تجوید، فلکیات )دا مامۆستایەکی راهێنەر و نووسەرێکی داهێنەر و هۆنەرێکی باهونەر بووە و لەتەواوی ئەو زانیارییانەدا کتێب و نووسراوەی زۆرجوان و بەکەڵکی هەیە کە هێندێک لە کتێب و نووسراوەکانی بریتین لە:

١) تنقیح العبارات فی توضیح الاستعارات بە هۆنراوەی عەرەبی
٢) الفرائد فی العقائد بە هۆنراوەی عەرەبی.
٣) الجواهر النفید فی قواعد التجوید.
٤) شرح منظومه تنقیح العبارات.
٥) الشامل للعوامل بە هۆنراوە.
٦) الاحمدیه فی ترجمه اللغة العربیة باللغةالکردیة بە هۆنراوەی کوردی و عەرەبی.

٧) كفاية الطالب في نظم كافية ابن الحاجب به هۆنراوەی عەرەبی.

٨) منظومه اى شده في مديح حضرت خاتم الانبياء به هۆنراوەی فارسی.

٩) توصيف المباني في نظم تصريف الزنجاني به هۆنراوەی عەرەبی.

١٠) قطر العارض في علم الفرائض، به هۆنراوەی عەرەبی.

١١) كشف الغامض في شرح قطر العارض.

١٢) فتح الرؤوف في معاني الحروف.

١٣) التصريف بابواب التعريف.

١٤) نظم آداب البحث في علم الآداب به هۆنراوە.

١٥) فتح المجيد في قواعد التجويد.

١٦) عقد الدرر نظم نخبة الفكر به هۆنراوە.

١٧) فتح الرحمن في علمي المعاني و البيان به هۆنراوە.

١٨) سلم الوصول الى علم الاصول به هۆنراوە.

١٩) عمل الصياغة في علم البلاغة به هۆنراوە.

٢٠) الروضة الغني في الدعاء باسماء الله الحسنى.

٢١) غيث الربيع في علم البديع به هۆنراوە.

٢٢) نظم العروض في علم العروض به هۆنراوە.

٢٣) تنوير الضمير في الصلوات المشتملة على اسماء البشير به هۆنراوە.

٢٤) روض الزهر في مناقب آل سيد البشر به هۆنراوە.

٢٥) الجوهرالاسنى في الصلوات المشتملة على اسماء الله الحسنى.

٢٦) تنوير البصائرفي التحريز عن الكبائر.

٢٧) شرح الصدر بذكر اهل البدر به هۆنراوه.
٢٨) الفتح الالهى فى الصلاة المشتملة على المناهى.
٢٩) كشف الاسف فى الصلاة على سيد اهل الشرف.
٣٠) عقد الجوهر فى الصلاة و السلام المنفعة فى يوم الحشر.
٣١) ازهار الخمائل فى الصلوة المشتملة على الفضائل و الشمائل.
٣٢) راحة الارواح فى الصلوات و التحيات على حبيب الملك الفتاح.
٣٣) ايضاح المجة و اقامة الحجة.
٣٤) البرهان الجلى فى مناقب الامام على.
٣٥) كشف البأساء باذكار الصباح و المساء.
٣٦) الاغراب فى قواعد الاعراب به هۆنراوه.
٣٧) تنوير القلوب فى مدح حبيب علام الغيوب.
٣٨) اوثق العرى فى الصلاة و السلام على خير الورى به هۆنراوه.
٣٩) السراج الوهاج فى مديح صاحب المعراج.
٤٠) فتح الرزاق فى اذكار دفع الاملاق.
٤١) تنوير العقول فى احاديث الرسول.
٤٢) ويلة الوصول على علم الاصول.
٤٣) فتح الموفق فى علم المنطق.
٤٤) نظم الرسالة العضدية فى علم الوضع.
٤٥) زاد المعاد فى مسائل الاعتقاد الفريدة فى العقيدة.

گەورە پیاوی ئایینی کورد بەڕێز مامۆستا شێخ مارفی نۆدێی دەریای بێبنج و بناوانی زانیاری و شەتاوی مەندی خواناسی

یەکەمین کەسە لە جیهانـدادواى مەلا ئەحـمەدی خـانی کە رچەی نووسـینی فەرهەنگـی کـوردی بە دانـانی پەڕتـووکی ئەحـمەدی بۆهەمووکوردێکی خوێن پـاک کێشاوە وبە نـووکی پێنووسـی زمـان لوسی پڕنووسی پیـرۆزی خـۆی سەرمەشقی بـۆداداوە کە بەڕاسـتی جێـی ڕێزوشـانازییە کە تـا ئێـستاپترلە ٢٠٠ سـاڵە فەقێـی تەواوی کوردسـتانی سـۆرانی بە وانە دەیخـوێنن هەروەک فەرهەنگـۆکی نەوبەهاری بەڕێزمەلائەحمەدی خانی لە زاراوەی کرمانجیدا. کە بە راستی هە ردوکیان جیگە ی شانا زی وپە سن وسوپاسن.

مامۆستا شێخ مـارف بە پێچەوانەی ئەوەی کە نێوی شێخی لە سـەربووە هەروەک گەلێـک لە پیاوچاکـانی کوردسـتان وتەواوی شێخە بەڕێزەکانی بەرزنجی ونەهری وشەمزینی هەرگیزشێخایەتی نەکـردووە وقەت تەکـیە و خانەقـای رانەگرتـووە بەڵـکە بە هەمووهێزوتوانـای خـۆی فێرگە وزانکۆی ئـاوەدان کـردوونەتەوە و رازاندوونیەتەوە وکاروبـاری مزگەوتـی ئیـسلامی واتـا مـاڵی خـوای بەڕێوە بردووە. هەمیشە هەرخەریکی وانەوێژی وپێگەیاندنی فەقێ و مەلاوزانایـانی بەرزی ئیـسلامی بـووە وتەواوی تەمەنـی پڕبـایەخی خـۆی بە موتـاڵاووانەوێژی ودانـانی کتێـب ونـامیلکە وهۆنـدنەوەی هۆنراوە وخـۆش کردنـی کتێبەکنی پێشینیان وراگەیانـدنی ئیـسلام وقورئانەوەی بە سەربردووە. چاوی لە مـاڵی کەس نەبووە وخـۆی نەکردۆتە ملۆزم (انگل) وسەرباری خەڵک، خۆی لە فێرگە وانەوێژی کردووە لە میری بابان مووچەی وەرگرتـووە وخـۆی وخـاوخێزانی خـۆی پـێ ژیانـدووە. جـا نەک هەر ئەو بە تەنـێ بەڵـکە تەواوی وێژەوانەکـانی دیـکەی ئەو فێـرگەیە و هەمـوو فەقێکـان و تەواوی کـارگێڕانی فێـرگە و مزگەوتەکـانی دیـکەی هەمـوو کوردسـتنی سەربەخۆش مووچە و بەراتیان لە میری وەرگرتـووە. شێخ مـارف

کەسێکە کە لەوی پیاوێکی وەک کاکەحەمەدی شێخ کە گەورەترین مەلای کوردستان وگرینگترین خواناسی چەرخی ١٣ی جیهانی ئیسلامە پەیدا بووە ولە سەردەستی پێگەیوە.

کاکەحەمەدی شێخیش خوای گەورە پلە وپایەی بەرزوبەرزترکات، مەلایەکی کوردە کە باپیرەی دووهەمی بەڕێز کەڵە پیاوی کورد شێخ مەحموودی حەفیدزادەیە، شێخ مەحموودی نەمر، شێخ مەحموودی بەرزنجی، مەلیکی کوردستانە کە بە هەق جێگای سەربەرزی و شانازی هەموو کوردێکی موسڵمانە لە دنیاداوگەورەترین سەرداری کوردە لە کوردستندا (بە یاری خوای گەورە نیازم وایە لە بارەی ویدا کتێبێکی سەربەخۆ بنووسم، ئەگەر یەزدانی مەزن یارمەتیم بدات).

کاکەحەمەدی شێخ کە مامۆستا مەلا شێخ مارفی بابی کتێبی ئەحمەدییەی بۆ وی داناوە و بە نێوی ویشی نێو لێناوە لە ساڵی ١٢٠٧ (١٧٩٣زایینی) لە شارە جوانکیلانەکەی سولەیمانی هاتۆتە دنیایە. جا کاکەحمەد تەنیا کوڕێکی هەبووە بە نێوی محەمەد کە ئەویش ٧ کوڕی هەبوون کە یەکێکیان نێوی شێخ سەعیدە و ئەویش چوار کوڕی هەبوون کە یەکێکیان بەڕێز و پایە بەرز حەنابی شێخ مەلیک مەحموودی نەمرە و بۆیەش پێی دەڵێن حەفیدزادە واتا نەوەزادە، چونکە کوڕی نەوەی شێخ مارف واتا شێخ سەعیدی کوڕی کاکەحەمەدی شێخی کوڕی شێخ مارفە.

شێخ مەحموودی نەمری خوا لێخۆشبوو کە یادی وی هەرگیزاو هەرگیز لە دڵی هەر کوردێکی خاوەن هەست و ویژداندا نامرێ، لە ساڵی ١٢٩٨ (١٨٨١ زایینی) لە شاری سولەیمانی لە دایک بووە و لە ١٣٣٦ (١٩١٩ زایینی) لە تەمەنی ٣٨ ساڵیدا بە پشتیوانی کوردە ئێرانییەکانی هەورامان و مەریوان و دانیشتوانی ناوچەکانی

بـــووری سـولـەیمانی لە دژی داگیرکەرانــی ئینگلیـزی دەسـتی دایە شۆڕشێکی مەزن و بە زوویی شاری سـولـەیمانی و دەوروبەری ئـازاد کـرد و کـردی بە بـنکەی فەرمانـدەری و پێتەختـی دەوڵەتە پیـرۆز و تازە پێ گرتووە کوردییەکەی خۆی.

ئەو بەڕێزە، کە بە درێژی هەر لەو کتێبەشـدا باسم لـێ کـردووە یەکەم کەس بووە کە دوای سەقام گیر بوونی هێـزی ئیمپراتـۆریەتی کوفری بەریتانیا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا لە سەر ئیـسلام و مـافی مرۆڤ بەتایبەتی مرۆڤی کورد لەگەڵ گەورەتـرین هێـزی جیهانـدا بە شەڕ هات و هەر بۆ خـۆی و بە ژمـارەیەکی زۆر کەم لە چـاو هێـزی دوژمـن، لە کـوردە قارەمـانە دڵ پـڕ لە باوەڕکـانەوە بە گـژ وەهـا دڕندەیەکی خەتەرنکدا چـوو. بە هەق توانیـشی کە گەلێـک جیاڤـک (امتیاز)ی گەورە بـۆ کوردسـتان بەتـایبەتی و بـۆ هەمـوو عێـراق بە گشتی وەدەس بێنێ.

سەرەڕای ئەوەش کاتێ کە زانی دەوڵەتی تـورکی رەگەزپەرەسـتی عوسمانیش هەر دوژمنـی گەورەی گەلانــی نـاتورکە، لەگەڵ ئەویـش هەر بە شــەڕ هــاتووە و بە گــژ ئەو دێوەزمەشــدا هەر هــاتۆتەوە. بەڕاستی ئەو کەڵە پیاوە گەورەترین رابەر و دڵـسۆزترین رێنـوێن و رێزانتـرین رێ نیـشاندەر بـووە، هەرچـی لە توانایـدا بـوو دەبـوو بیکات بۆ کورد و بۆ ئیسلامی پیرۆز، کردی و ئەنجامی دا.

ئەو بەڕێزە دلۆڤانە بـۆ هەر کوردێـک وەکـوو بـاوکێکی دڵـسۆز و میهرەبان و فیداکار بووە، هەر بۆیە ئێستاش بە نێوی نەمر یـادی دەکر و بەڕێزەوە نێوی دەبرێ.

بە ڕاسـتی جێـی خـۆیەتی، کە زۆر زۆر لەوەش پتـر ڕێـزی لــێ بگیرێ و پلە وپـایەی بەرزتـر بکـرێ چـونکە دوای دەوڵەتـی بابـان، شێخ مەحموود یەکەم کەسە کە توانیویەتی دەوڵەت بۆ کـورد دابنـێ

کەوایە هەموو کورد و هەموو کوردستان بە شێخ مەحموودی نەمر وامدارە و دەبێ پێیەوە بنازێ.

بە هەق جێی خۆیەتی و هەر دەبێ واش بێ کە لە باوکی ئاوا و لە بنەماڵەی وەک بەرزنجی کەڵە پیاوی وەک شێخ مەحموودی نەمر پەیدا ببێ و خوای گەورەش لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ:﴿ وَٱلْبَلَدُ ٱلطَّيِّبُ يَخْرُجُ نَبَاتُهُۥ بِإِذْنِ رَبِّهِۦ ۖ وَٱلَّذِى خَبُثَ لَا يَخْرُجُ إِلَّا نَكِدًا ۚ ﴾ [الاعراف:٥٨، واتا زەمینی پاک و پاگژ و خاوێن و بێبژار و دڕک و داڵ، بە ودم و فەرمانی خوای خۆی شیناوەرد و گیا و گوڵ زۆر چاک ئەهێنێ و زەوی پیسیش بە کەمی نەبێ لێی شین نابێ و جگە لە بژار و دڕک و داڵ هیچی دیکە ناهێنێ.

بەڕێز جەنابی مامۆستا شێخ مارفی نۆدێی دوای٨٨ساڵ خەبات و تێکۆشانی شێلگیرانە و زەحمەت کێشانی بێوچان و بەربەرەکانی کردن لە گەڵ پڕوپووچ پەرستی و خەرافات و زیاد کراوە (بدعت) و زۆر و ستەم و هەروەها ڕێنوێنی و روون کردنەوەی خەڵک و وانە وتنەوە و ڕاگەیاندنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە ساڵی ١٢٥٤ (١٨٣٨ زایینی) لە شارە جوانکیلانەکەی سولەیمانی پێتەختی نەوە نێرینەکەی خۆی کۆچی دوایی کردووە وئیتر خەڵکی کورد بەتایبەتی وهەموو جیهانی ئیسلام بە گشتی بۆلە دەس دانی وەها بلیمەتێکی نەبەز و هەرگیزنەوەستاو ماتەمداروبەپەژارە بوون.

تەرمی پیرۆزی ئەو کەڵە پیاوە کوردە و ئەو خواناسە گەورە لە گۆڕستانی پیرۆزی "گردی سەیوان" لە پەنای ئارامگەی پادشای دڵسۆز و موسڵمانی کوردسولەیمان پاشای بەبە نێژراوە و بۆ تا ڕۆژی پەسڵان بە خاکی پاکی کوردستان سپێردراوە. خوای گەورە لە بەهەشتی بەریندالە گەڵ هاوباوەڕانی خۆی نیشتەجێی بفەرمێ.

# هەواڵی کورد و کوردستان

مامۆستای بەڕێزمان کاتێ، کە ئەوهەمموو پێشکەوتن و گەورەیی و سەردارییەی کوردی دێتەوە یاد و دەشزانێ کە ئەو بەدبەختی و ماڵویرانییەی ئێستاش هەمووی هەر لە بن سەری شێخ و بازاڕی شێخایەتی دایە، دێنێ چەندجاران بە خوای گەورە سوێند دەخوا کە ئەو بەدبەختی ورۆژە رەشییەی گەلی کورد هەمووی هەر لە بن سەری شێخەکاندایە و هەر بە قسەی وان کوردەکان لە دین و ئایینی خواش لایان داوە و هەموویان بە ژەهراوی وان مردوون و.. و مەلاکانیش هێندێکیان لە برسان هەمووشتێکی شێخەکانیان قبووڵ کردووە و لە برسانیش ترسی خوایان هەر لە بیر نەماوە و جا ئیتر بەڕاستی ئەو جۆرە مەلا و ئەو شێخانە خەراپکارن و هەر ئەوانەن کە خەڵکی لە رێی راست لا دەدەن.

ئەمجا باسی ئەوەی دەکا ئەم های وهۆیەی شێخ بۆ فریودانی خەڵک و نان پەیداکردنە و بەس. دەنا ئاخر ئەوە لە کوێی ئایینی پیرۆزی ئیسلامدایە و ئیتر ئیسلام چ ئاتاجی وپێویستییەکی بە وەها شتێک هەیە؟

جا شێخ ئاوا خەڵک بۆی کەر بووە وبە کەیفی خۆی دەیانچەوسێنێتەوەو ئاوابە خۆشی لەسەر ورگی خەڵک دەلەوەڕێ و مامۆستای هەژاریش وابزەی چاوی دێ و لاڕێ دەڕوانێ وتەنانەت بۆ کیتەڵە ماستێک شەرعی ئیسلامێ دەگۆڕێ!! بەڵام لە رووی ناچاری و بەرگری لە برسیایەتی خۆی و خاووخێزانی وبە پێی یاسای (الضرورات تبیح المحظورات)، کە ئەویش یەکەمجار زۆربە کەمی و بە دەگمەن.

پاشـان دوای هێنـدێک تـووک ونـزا لە شـێخ ومەلاکـان روویـان تێدەکاوچەند قسەی بە هەقیان پێ دەڵێ ولە مەولادێتەوە سەرباسی عیسا ومەهدی و دیسان دەڵێ ئەو باس وخواسە باپێیان وانەبێ کە بۆئێمە کەڵکی هەیە... کەوایە تۆئەوڕۆبزانە حاڵی خـۆت چییـە ووە دوای دەردی خۆت بکەوە و دەرمانێکی بۆ پەیدا بکە و ئیتـر بـا پێوە نەێ و تەشەن نەهێنێ. تۆ چووزانی تۆرەمەی داهاتوو ئەویـش پتـر لە هەزاران هەزارساڵی ئایندە چۆن دەبێ و چ دەردێکی لێ دەبێ؟

لە دواییـدا ئەوە دەگەیەنـێ، کە دەبـێ زانـست و زانیـارییەکی بخوێنی کە بە کەڵکی گەل و نیشتمانەکەت بـێ و گەل و نیـشتمانت پێی ببێتە شـای گەلان و لـە نێـو گەلانـدا دەرکەوێ و دیـار بـێ و بە گـوتنی هەڵـوا زار شـیرین نـابێ و قـسە هـیچ نیـیە و دەبـێ کـار و کردەوەت هەبێ. نابێ بە قسەی ئەو شێخۆلکانە بخەڵەتێن، چـونکە ئەوان بەڕاستی بەرپرسـی ئەوەیـان پێدراوە کە خەڵکـی لـە نەزانیـدا بهێڵنەوە و خۆ ئیتر هەر بـۆ ئەوەش دروسـت کـراون و بەس. ئەوان لە دژی زانـــست و زانیـــاری و لـە دژی ئـــایینی راســـتەقینە و تەکپەرستی شۆڕشێکی نهێنییان دەس پێ کردو هەرچی پێشکەوتن و زانست و هـونەر بـوو، رایانمـاڵی و لە چوارچێوەی ئەو نیشتمانە پانوبەرینە ئەو شۆڕشە ناپیرۆزە ئەنجام دراوە و بە جارێکی پەکـی ئەو وڵاتەی خستووە و خەڵـکە بەشـەڕەفەکەی جـارانی وەهـا بەرەو پەستی بـردووە کە ئەگەر هەتـا سـەر وا بـێ و بۆیـان بلـوێ بەش و مافی لە ناوچوونە!!

ئەو جار دێتە سەر باسی خۆشی و ئاو و هەوای کوردستان بـاس دەکـا و دەڵـێ لە گـوێن بەهەشـتێ سـاز کـراوە و کوردسـتان نمـوونەیەکی زینـدووی بەهەشـتی بەریـنە و هەر لـە شـاری کـۆیەڕا هەتا دەگاتە مەراغە هەمووی ئاو و بەراو و بـاغ و راغە. ئەوەش کە

مەراغە بە کوردستان دادەنێ ئاماژەیەکە بۆ ئەو راستەقینە مێژوویییە کە دەڵێ لە کۆنڕا تەورێزو تەنانەت بگرە ئیسفەهانیش هەر کوردستان بووە و وردە وردە کوردەکان بە هۆی گوشاروپاڵ پێوەنان پاشەکشەیان لێ کردوە و بە جێیان هێشتووە و تورکەکان و فارسەکانیش لە جێی واندا نیشتەجێ بوون. و ئیتر ئەو هەرێمانەیان لێ دابڕیون و کردوویاننەتە تورکستان.

خوا لێخۆشبوو مامۆستای گەورەمان هەمووبەڵا و بەدبەختی و نەگبەتییەکی ئەو کورد و کوردستانە لە شێخەکان دەزانێ و پێی وایە کە هەموو رۆژەڕەشییەکی ئەو گەل و نیشتمانە لە سایەی وانەوەیە و ئەوەش دەڵێ کە مەلا نەزانەکانیش هاوکاری وانن و نەک هەر هاوکار، بەڵکە نۆکەری وانن و تەنانەت وەکوو تاژی راویانن و کەروێشکیان بۆ لە لانێدا دەگرن واتا ئەو خەڵکەیان بۆ دەکەنە نێچیر و دەرخواردیان دەدەن. بەڵام مەلا زانا و دڵسۆزەکانی گەلیش وەختە لە داخان دیق بکەن و بگرین. جەرگیان رەش هەڵگەڕاوە و وەکوو پەڵاس و هیچیان بۆ ناکرێ، چونکە ئەوانیش هەر یەکیەتییان نییە یان ئاگایان لە یەکتر نییە. بێگومان بێ یەکبوون و یەکیەتیش هیچ کارێکی کۆمەڵایەتی و رامیاریش ناکرێ.

دەگێڕنەوە کە مامۆستا خۆی زۆر جار دەیفەرموو هەرچەند دەکەم سێ مەلام بۆحاڵی ناکرێن بە دڵ پێکەوە بن. ئەگەر بێتوو من سێ مەلام لەگەڵ بن سێ پارچەی کوردستانی دابەش کراو دەکەمەوە یەک و سەربەخۆی دەکەم.

جا بەڕاستیس هەموو هۆنراوەکانی مامۆستای بەڕێزمان بۆ ئەوەی دەبن کە بە ئاوی زێڕ بنووسرێنەوە ودیوانەکەشی بۆئەوەی دەبێ وجێی خۆشیەتی کە هەموو زێڕکفت بکرێ و زێڕەوشانی کەن. یان لانی کەم بۆ ئەوەی دەبێ کە هەموو کوردێکی بەشەڕەف تەواوی

هۆنراوەکانی و بەتایبەتی ئەو بەستەیە لە بەر بکا و هەمیشە وەک سروودێک بیخوێنێتەوە.

هەواڵی کورد و کوردستان دەپرسی
وڵاتی چۆڵ و قەومی رووت و برسی
لە سایەی شێخ و شەیتان، عیلم و ئیمان
لە نێو کوردان نەماوە، خۆڵ وە سەرمان
لە شاری کۆیە هەتا دەچیە مەراغە
هەمووی ئاو و بەڕاو وباغ و راغە
لە تەک شاخی سەفین و کێوی کۆسرەت
هەزار جێگەی هەیە مانەندی جەنەت
سەری حاجی قەڵا و سۆڵی چنارۆک
بە بێوێنەن لەگەڵ شوێنی حەمامۆک
سوێندت بۆ دەخۆم بەو خودای بێچوون
بە قسەی شێخۆلکان کورد لە دین دەرچوون
قەسەم بەو خودای خەللاقی کورسی
مامۆستای برسی لە خوا ناترسی
مەلا و شێخەکان بێدین و بەدخوون
(ألا إنهم هم المفسدون)
شێخی حیلەباز بە فاڵ و نوشتە
سەد پیرەژنان دەبا لە خشتە
مامۆستای فەقیر لاڕێ دەنۆڕێ
بۆ کۆتکە ماستێ شەرعی دەگۆڕێ
مامۆستای زاناش جەرگی پەڵاسە
وەختە دیق بکا بەو باس و خواسە
رەببی شێخەکان کوێر و مادوور بن

ئەو فێڵبازانە لە کوردان دوور بن
ئەو شێخە حیزەی چاو بە فرمێسکە
ئەم های و هوویەی بۆ نیسک و گیسکە
ڕەببی ماموستای سەر و مێزەر زل
هەر دەربەدەر بی لە مەئوا و مەنزڵ
ئەی شێخی جاهیل زۆر چاک بزانە
خودا عالمی سیرڕ و نیهانە
ئەی مەلای نەفام ئەتۆ بی و خودا
لە بۆ چی ڕێگەت لە کوردان تێک دا؟
عیسا دێتە خوار ئیمڕۆ و سبەینێ
ئیش و کاری تۆ هەموو پێک دێنێ
لای مەلا وایە هەر کە مەهدی هات
خەڵاتی بۆ دێ جووببە بە قەڵات
وا چاوەنۆڕە مەهدی بێتە دەر
خۆ هەر نەهاتیش جەرگی هاتە دەر
ڕەببی ماموستا هەر وا بناڵی
حەشری تۆ بکەن لە گەڵ جرجاڵی
ئەم باس و خواسە هیچ فایدەی نییە
ئیمڕۆ بنوارە حاڵی تۆ چییە
عیلمی بخوێنە بۆ گەلت چا بێ
گەل و مەفتەنت بە عیلمی شا بێ
ئەم قال و قیلە و ئەم های و هۆیە
گشتی مایەیی بەدبەختی تۆیە
عیلم و زانستی بێنە کایەوە
کە هەرکەس خوێندی پێی حەسایەوە

هەتـــــاکوو گەلـــــت بە ســـــەر بـــــکەویٚ
لە نــــــاو گەلانــــــا بەدەر بـــــــکەویٚ
حەزرەتـــی عیـــسا چـــی کـــرد لە بـــۆ خـــۆ
کە هـــاتە خـــواریٚ چـــی دەکـــا بـــۆ تـــۆ؟

# شۆخی کوردی

مامۆســـتای دڵســـووتاو و جەرگ هەڵقرچـــاوی کـــورد وەکـــوو ئەوینـداریٚکی بەسۆز و دڵ پڕ خۆشەویـستییە کە لە هـیچ کـات و ساتیٚکدا یارەکەی خۆی فەرامۆش ناکا و هەمیشە هەر لە یادیەتی و قەت لە بیری ناچیٚتەوە.

جا بەڕیٚزیشیان کە لە راستیدا ئەویٚنداری دڵ برینداری بەئـازاری گوڵی رزگاری کـوردەوارییەو ئەوەندەشـی رق لە دژمنـی گەلە ستەم لیٚکراوەکەیەتی کە هەر کاتیٚک بۆی هەڵکەویٚ دەیهەویٚ بەردیٚکی تـیٚ بگریٚ و سەرنیٚزەیەکی بگەیەنیٚتـیٚ و نـووکە خەنجەریٚکـی تـیٚ رۆ کـا یان گوللەیەکی پیٚوە نیٚ.

ئەو گەل ناسە دەیهەویٚ وەک خۆی خەڵک رابیٚنـیٚ و خـۆی ئاسا چینەکانی جۆراوجۆری گەل دۆست و دژمنی خۆیان بناسن.

جا هەر بۆیە ویٚـڕای ئەوەی کە لەو پـارچە هەڵبەستەدا ژیـواری خۆی و یارە خەیاڵییەکەی باس دەکا تیخی تیژ و ترونجی بڕڕەری زمـانی بە سکاڵا وە کـار دەخـا و دەڵـیٚ ئەو یـارە بـیٚ میهرەی مـن ئەوەندە مەکرۆ فیٚڵبازە کە هەر دەڵیٚی نەخشبەندییە.

نەخـــشبەندی و قـــادری کە دوو رچە (طریقـــت)ی شـــیٚخایەتی لە کوردســـتانن و هەر یەکەی بـــۆ فیٚڵبـــازی و فریـــو دانـــی خەڵـــک بە

پێیان رچەی دیکە دابەش دەبن و بەو جۆرە کوردستانی گەورە و موسڵمانانی کوردیان لە بەینی خۆیان دابەش کردووە.

مامۆستا وا دەگەیەنێ کە ئەوان ئەوەندە فێڵباز و مەکرۆن کە خەڵکی سادە و ساویلکەی کورد لە فێڵ و مەکری وان ناگەن و ناتوانن لە رامیاری رێوی رەوشانەی وان حاڵی ببن و .. جا بۆیە دەڵێ:

به پارچێکی برنجۆک خۆی دەپۆشێ
بەڵێ مەککارە بۆیتە نەقشبەندی
ئەگەر بێت و تەوەجوە کاتە قەلبم
بە جارێ دەبمە شێخی سوهرەوەردی
خەبەردانی لە خۆت کاتێ دەزانی
بە فێڵی ساحیرانە عەقڵی بردی

بەڵێ مامۆستا دەڵێ ئەو شێخانە کاریان وەهایە تا تۆ بێدار و ئەغیار دەبییەوە بە خۆت دەزانی ئەوان هۆش و بیر و ئاوەز و ژیریی تۆیان بە فێڵ و فێڵبازی بردووە، تۆ تازە بە جارێ لە رێی راست لادراوی.

ئەمجا دێتە سەرباسی خۆشەویستی زێد و نیشتمانەکەی و دەڵێ چ ئەندازەم شاری کۆیە بە تایبەتی لا خۆشەویستە کە وردکە بەردو خاک و خۆڵی وێ بە دوڕ و گەوهەر و مەرجان ناگۆڕمەوە.

هەروەها دەفەرموێ لە دنیایەدا هیچ شارێک ناگاتە شاری کۆیەو ئەو شارە لە هەموو شاران بالاتر و باشترە. جا بە تایبەتی دیمەنی بەهارانی کە باغ و راغ و دار و باری ئەو ناوچەیە پشکووت و گڵووکی زەرد و سووری تێکەڵ بوون و چۆم و زێ و رووبار و شەتاوەکانی هەڵستان و کێو و گرد و دەشت و دۆڵەکانی خەملین و

هەوای خۆش و ئاوی سارد و بێگەرد و خۆش و ڕەوانی وی بەو دیمەنە جوانەوە کە هەیەتی هەر دەڵێی بەهەشتی بەرین و جێگەی هەر مانەوەی خواناسانە لە ڕووی عەردی.

ئەو پارچە هەڵبەستەی جەنابی مامۆستا تەنیا پارچە هەڵبەستی ئاشقانە و دڵدارانەیەتی و جگە لەو پارچەیە هۆنراوەی دیکەی دڵدارانەی نەبووە و نەنووسیوە یا وەبەر دەستی ئێمە نەکەوتووە.
بەڵام ئەگەر کەمێک بەوردی سرنجێک بدەینە ئەوتەنیا هەڵبەستە دڵدارانەشی، دەبینین کە پڕپڕە لە ڕامیاری و سۆزی دەروون و دڵسۆزی بۆگەل وهۆزی و دەس نیشان کردنی چاوبەست و فێڵباز و هەروەها سۆزی نەتەوایەتی. هەروەها پڕ و ئاخنراوە بە مەسەلەگەلی مێژوویی و سروشتی و ئەوینداری ونیشتمانی و گەلدۆستی و وڵات ویستی.

مامۆستا هێمنیش پارچە هەڵبەستێکی هەیە من خۆم زۆرم پێ خۆشە هەر دەڵێی هۆنراوەکانی جەنابی مامۆستای بە وردی خوێندۆتەوە و بە چاکیش لێیان حاڵی بووە و تێیانگەییوە کە مامۆستای پایە بەرزی کۆیی لە هەموو حاڵەتێکدا زێد و نیشتمان و گەلە چەوساوە و دابەش کراوەکەی هەر لە بیرە و هەرگیز فەرامۆشی ناکا و ئیتر ئەو مەبەستەی زۆر ژیرانە و زیرەکانە لەوی وەرگرتووە و وەستایانە و لێزانانە لە قاڵبێکی دیکەی هۆنراوەدا دایڕشتووە کە ئاوا دەس پێ دەکا:

لە شاییدا لە وەختی پێکەنینا
لە خۆشیدا لە کاتی هەڵپەڕینا
لە کاتێکا کە ڕاکشاوم لە جێدا
لە شار و کووچە و کۆڵان و دێدا
لە سەیرانی دەمی ڕاو و شکاری

لەجێژوانـــێ کە دەکوشـــم مەمکـــی یـــارێ
لە کـــۆڕی مـــاتەم و گریـــان و شـــینا
ئەمـــن ئەی نیـــشتمان تـــۆم هەر لە بیـــرە
لە کاتێکـــــا کە رادەبـــــرم بە رێـــــدا
ئەمـــن ئەی نیـــشتمان تـــۆم هەر لە بیـــرە
لە مەزرایە کە خـــۆم هەڵکـــرد لە کـــارێ
ئەمـــن ئەی نیـــشتمان تـــۆم هەر لە بیـــرە

جا ئەوەش "شۆخی کوردی" مامۆستا کۆیی:

## شۆخی کوردی

تەماشـــــا لار و لەنـــجەی شـــۆخی کـــوردی
دەخیـــل ئەم عیـــشوەیە کـــێ فێـــری کـــردی؟
چ داغ و ئـــــــاگرێکی دا بە جەرگـــــــم
بە کـــولمی ســـوور و خـــاڵی لاجیـــوەردی!
بە پـــارچێکی برنجـــۆک خـــۆی دەپۆشـــێ
بەڵـــێ مەککـــارە بـــۆیتە نەقـــشەبەندی
ئەگەر بێـــت و تەوەجـــوە کـــاتە قەلـــبم
بە جـــارێ دەبـــمە شـــێخی ســـوهرەوەردی
خەبەردانـــی لە خـــۆت کـــاتێ دەزانـــی
بە فێڵـــی ســـاحیرانە عەقڵـــی بـــردی
لە شـــەکراوی بە بەفـــرێ خۆشـــترە لام
قـــسە و گوفتـــاری لاوی بەفـــری قەنـــدی
ئەوەنـــدەم شـــاری کـــۆیە لا عەزیـــزە

بە دوڕڕ و لەعلـــــــــــی نـــــــــادەم وردکە بەردی
لە دنیـــــــادا چ شـــــــار نـــــــاگەن بە کـــــــۆیە
بە رووبـــــار و بە دەشـــــــت و کێـــــو و گـــــــردی
کە پـــــــشکووت بـــــاغ و راغ و دار و بـــــــاری
کە تــــــێکەڵ بـــــوو گڵـــــووکی ســـــوور و زەردی
هەواکەی خۆشـــــە ئـــــاوی ســـــارد و خوشـــــی
بە عەینـــــــی جەننەتـــــول‌خولـــــدە لە عەردی

# سۆفیایەتی

روون کردنەوەیەک لە سەر سوهرەوەردی و ڕێبازەکەی.
ســـوهرەوەردی: چەن کەس لە زانایـــانی بەرز و بە ناوبـــانگی ئیسلامی بە نازنێوی سوهرەوەردی بەناوبانگن کە بریتین لە:

١ــ عەبـدولقادر ئەبوونەجیـب کـوڕی عەبـدوڵڵا ســوهرەوەردی پیـــاوێکی زانـــا و هەڵکەوتووبـــووە لە عێـــراق ولە ســـۆفیایەتیدا دەستێکی باڵای هەبووە. لە گوندی سـوهرەوەردی نێزیـک زەنجـانی کوردسـتانی ئێرانـێ لە سـەدەی شەشـەمی کـۆچی مانگیـدا لە دایـک بووە و چـۆتە بەغـدایە ولە فێـرگەی نیـزامییەی گەورەی ئەو شـارە خوێنـدنی خـۆی تەواوکـردووە وپاشـان گۆشـەگیری هەڵبـژاردووە و دووری لە خەڵکـــی کـــردووە تامـــاوەیەکی زۆر، پاشـــان خـــۆی دەرخستووە و هاتۆتەوە نێوگەل وخەڵکی بانگ کردووە بۆ ڕێبـازی سۆفیایەتی و ژمارەیەکی یەکجار زۆر پەیڕەوییان لێ کردووە.

پاشـان داوایـان لـێ کـردووە بـۆوانەوێژی (تـدریس) لە فێـرگەی نیـزامییەی بەغـدایە، ئەویـش قبـووڵی کـردوە وئەوپیـشە پیـرۆزەی

ئێژە پێداوە تاساڵی ٥٦٣. هەرلەوساڵەشداکۆچی دوایی کردووە. واوێدەچێ کە ئەو پیاوە پیرۆزە کوردە ئەگەرلە سۆفیایەتیەکەی پەشیمانیش نەبووبێتەوە زۆری گرینگی پێ نەدابێ. چونکە وانەوێژییەکەی پێ چاکتر بووە. خۆ روون و ئاشکراشە کە لە فێرگەی نیزامییەدا سۆفیایەتی نەخوێندراوە.

٢ـ ئەبولفەتح یەحیای کوڕی حەبەش سوهرەوەردی: پیاوێکی زۆر زیرەک و هۆشیار و زانا بووە و یەکێک بووە لە بلیمەتەکانی سەدەی شەشەمی کۆچی مانگی. چەندین کتێبی وەک: (١ـ التنفیحات فی اصول الفقه ٢ـ التلویحات ٣ـ الهیاکل ) داناوە وچەندین کەسی وەک مجدالدین الجبلی وفخرالدین رازی شاگردی وی بوون و لە خزمەتیان خوێندووە.

سەرەنجام لە تەمەنی ٣٨ساڵیدا لە حەڵەب مەلیک زاهیری کوڕی سەلاحەدینی ئەییووبی دەستووری کوشتنی وی داوە و کوژراوە. گۆیا سەلاحەدینیش دەستووری لە سەرکوشتنی سوهرەوەردی هەرداوە چونکە ئەو پیاوە وەک دەگێڕنەوە لە دژی دێژە(شریعت) زۆرفتوای جۆراوجۆری داوە، جائەگەروابێ سەلاحەدین هەر بۆیە دەبێ دەستووری کوژرانی وی دابێ. دیارە ماک و بنچینەی سۆفیایەتی وشێخایەتیش هەردژایەتی دێژە پیرۆزەی ئیسلامە بەلام لە ژێر پەردەدا و زۆربە نهێنی و ئیتر هەموو کەس ئاشکرای ناکاو.

٣ـ عومەری کوڕی محەمەدی شەهابەدین سوهرەوەردی ئەبوحەفس یەکێک بووە لە دێژەوان(فقیە)و زانا هەرە بەرزەکانی پەیڕەوی پێشەوا شافیعی. زۆرپارێزگاروزاناوخواپەرەست بووە لە ریشتەی سۆفیایەتیدا دەستێکی زۆربالای هەبووە و

لەوریێبازەداخەباتێکی شێلگیرانەی کردووە و سەرەنجام لە ساڵی ٣٦٢ کۆچی مانگی لە شاری بەغدایە کۆچی دوایی کردووە.

٤ـ محەمەدئەمین کوڕی عەبدوڕەحمان کوڕی محەمەد حەسەن کوڕی محەمەدساڵح سوهرەوەردی یەکێکە لە زانا بەرزەکانی کوردی جیهانی ئیسلام و لە بەغدایەدا ژیانی هەرە زۆری خۆی بردۆتە سەر.

ئەو بلیمەتە زۆرتر لە زانیاری مێژوودا کاری کردووە و لەو بارەوە دەستێکی باڵای هەبووە. دوای تەواوی کردنی خوێندنەکەی ماوەیەکی زۆریش وانەوێژی کردووە و شاگردی پێگەیاندوون. لە پاشان بۆتە ئەندامێکی دادگای پێداچوونەوە (تجدید نظر)و ماوەیەکیش شارەوانی شاری سامەڕا و هەروەها یەک دوو شاری دیکەش بووە.

ئەو هۆزانە نووسراوەشی زۆرن بۆ نموونە مێژووی بەغدایە، کە بە نێوی پەراوێزی مێژوو نووسیویەتی. هەروەها دیوانی هۆنراوە و هتد و لە ساڵی ١٣٢٠ لە بەغدایە کۆچی دوایی کردووە.

جالێرەداکە مامۆستای کۆیی دەڵێ:

ئەگەر بێــت و تەوەججــوە کــاتە قەڵــبم
بە جــارێ دەبــمە شــێخی ســوهرەوەردی

بــۆئێمە روون نــیە کە مەبەســتی کــامە ســوهرەوەردییە کە هەرکامیان لە وی دی گرینگترە و وەک شێخ رەزا لە بارەی کیژە جوانەکانی کۆیەوە دەڵێ:

شــاری کــۆیە کە لەبــالەب لە بتــی نــۆش لەبە
گەر فەلەک لێ بگەڕێ مەنبەعی عەیش و تەرەبە

دڵبەرانــی بە مەســەل هەروەکــوو ئەشـعاری مــنن
کامیــان لێــی بگەڕێــی ئەم لەمیــان مــونتەخەبە
غــارەتی عەقڵــی منــی کــردووە زیبــا ســەنەمێ
عــاریزی میــسلی قەمەر، قــامەتی نەخلــی روتەبە
زێــوی دانــاوە لە ژێــر لێــوی ئەمــم گــۆی زەقەنە
ســیمی خــڕ کــردووە وەک گــۆ کە ئەمیـشم غەبەبە
پێــی گــوت بــۆ مــاچێ رەزا کــافرە نەیــدایە وتــی:
ئەی خــودا ئەم کــوڕە شـێخ زادەیە چەن بــێئەدەبە

راسـتی ئـێمەش هەرکـام لە سـوهرەوەردییەکان بگـرین لەمیـان هەڵبژاردەیە و هەر کام لەویتر زاناتر و ورياتر و داناترە.

جـا لێرەدابە پێویـستی دەزانـم، کە کەمێـک لە سـەر تەسـەوف یاسۆفیایەتی بدوێم. تەسەوف یا سۆفیایەتی شتێکە دووسـەد سـاڵ دوای کۆچی پێغەمبەری مەزنﷺ پەیدا بـووە و پەیدا بوونەکەشی لەوەیڕا بـوو، کە زۆربەی خەڵـک روویـان لە دنیـاداری کـرد و تـا رادەیەک لە دیــن دوور کەوتــنەوە، بەڵام هێنــدێک هەر لە ســەر رەوشـی پێشوو مـانەوە و سـەرەنجام وای لێهات ئەوانە بە نیـازی دڵپاکی و پارێزگـاری و بە نیـازی دووری لە دنیـا بەرگـی زووری لە خـوری سـاز کراویـان دەبەر دەکـرد و چـونکە بە عەرەبـی بە خـوری دەڵێن (صوف) ئەوانە بە صوفی واتا خوری پۆش مەشهوور بـوون. جا لەوە بە دوایەش زۆر کەس کەڵکی خەراپیان بە قازانجی خۆیـان لێ وەرگرتووە و هەروەها لێشی وەردەگرن!!

بەڵام دەبــێ ئەوەی بــزانین کە ســۆفیایەتی راســتەقینە ئەگەر فێزیکی زیادی نەبێ ولە شتە وەدیهێنراوەکان نەبێ کە پێغەمبەرﷺ بە توندی بە سەر وەدیهێنەرەکەیان دادەنـاوە شتێکی خەراپ نییە. بەڵام هیچ پێویستیش ناکا نێوێکی تـایەبتی بۆ دابنرێ چونکە تـا

دوای دووسەد ساڵیش دوای کۆچی پێغەمبەرﷺ هیچ نێویک لە ئیسلام زیاد نەکرابوو و هەر کەس لە سەر ڕێبازی ئیسلام بایە پێیان دەکوت موسڵمان و ئەوی لە سەر ئەو ڕێبازەش نەبایە پێیان دەگوت کافر.

جا ئەوجارلەوێ بەولایەوە نێووناتۆرە ودەستە وگروپ وئایینزا (مذهب)ەکان وردە وردە سەریان هەڵداولە سەرەتای پەیدا بوونیشیاندا زۆرترینیان ژێر زەمینی بوون وبە دزی کاریان کردووە.

پێغەمبەری مەزنیشﷺ لەو بارەوە دەفەرموێ: (افترقت اليهود على احدى وسبعين فرقة ثم افترقت المسيح على اثنين و سبعين فرقة و ستفرق أمتي على ثلاث و سبعين فرقة و كلهم في النار إلاّ فرقة واحدة و هي الفرقة الناجية. قالوا: و ما هي يا رسول الله؟ قال: و هي التي على ما انا و اصحابي عليه).

بەڵێ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: جوولەکەکان بوون بە٧١ دەستە و فەلەکانیش دوای وان بوون بە ٧٢ دەستە و لەوە بەدواوە ئوممەتی منیش دەبن بە ٧٣ دەستە و هەموویان گومڕان و دۆزەخین جگە لە یەک دەستە کە ئەوان دەستەی ڕزگارن. کوتیان ئەو دەستە کێن ئەی پێغەمبەری خودا؟ فەرمووی: ئەو دەستەیەن کە لەسەر ڕەوشی من و یارانی منن.

جا بەڕاستی ئێستا زۆر لەوەش تێپەڕیوە و ڕەنگە دەستەجاتی موسڵمانان لە ٥٠٠ و هەزاریش تێپەڕ ببێ.

خوای گەورە دەفەرموێ: (وَمن يبتغ غير الاسلام دينا فلن يقبل منهو هو في الآخرة من الخاسرين) هەرکەس جگە لە ئیسلام ئایینێک هەڵبژێرێ تەنانەت ئەگەر بە نێوی ئیسلامیش بێ هەرگیز قەبووڵ ناکرێ و ئەو کەسە لە دواییدا لە خەسارومەند و ڕەنج

بەخەسارانە. (وماذابعد الحق الاالضلال) چییە دوای هەق و رەدا، جگە لە گومڕایی؟

خۆم لە کتێبی شێخ و شێخایەتیدا ئەو مەبەستەم لە زمانی چەندین زانای ئیسلامی گێڕاوەتەوە و نووسراوەکەی خودی وانم هێناوە.

بەڵێ زۆر بە داخەوە دەبێ بڵێین خەڵک ئەوا گۆیەکانی گێشوشی بێبڕانەوە (کرات فضای لایتناهی) یەک لە دوایِ یەک دێنێتە ژێر دەستی خۆی و رامیان دەکا بەڵام ئێمەی موسڵمانی هیچ نەزانیش هەر دەبێ بڵێین ئەرێ لەو هەموو رچە و رێبازانە کامیان رەوایەو وەک بەڕێز رەفیق حیلمی دەڵێ:

هیممەتی ئەربابی عیرفان بێستوون ئیحیا ئەکا
ئەو کەسەی دڵسۆزی میللەت بێ وەتەن ئاوا ئەکا
نووری عیلم و مەعریفەت وا شەرق و غەربی گرتووە
قە و می ئێمە تا زە تەعلیمی خە ت و ئیملا ئە کا
بەسیە فیکری بێسە مە ر ئیمڕۆکە وەقتی غیرەتە
خاکی کوردستان لە ئێمە هیممەتێ داوا ئەکا
ئێستە بێعیلم و هونەر ژینی بەشەر مومکین نییە
چۆن لە فەننی عەسری حازر کوردی ئیستیسنا ئەکا
ئەورووپا کەشفی زمانی چۆلەکە و مەیموونی کرد
تازە کوردستانی ئێمە باسی ئەلفوبا ئەکا

# هەناسە هەڵکێشان و پاڕانەوەی مامۆستا

مامۆستای گەورە وگران وخواناسی راستەقینەمان لە هیچ کات و ساتێکدا خـوای گەورەی لە بیرنەچـۆتەوە ولە هەمووحـاڵەت و ژیوارێکدا هەر پەنای بۆ وی بردووە وهانای هەربردۆتە بەربارەگای گەورەی وی ولە کەسـی دی نەپـاڕاوەتەوە و داوای قەت لە بـێجگە لەوی نەکـردووە و راز و نیـازی خـۆی هەرلە گەڵ ئەوی کـردووە و ئاتـاجی و پێویـستییەکانی خـۆی هەرلەوی ویـستووە و بـێگومـان بەڕاستی گوتوویەتی: (ایاک نعبد و ایاک نستعین).

ئەو بلـیمەتە پـسپۆڕە خـودای وەک زانـایەکی سـەرەتای ئیـسلام ناسیوە و پێـی وا بـوە کە بە بێویـستی وی هـیچ کارێـک نـاکرێ و هەرچـی ئەویـش بیکـات گەڕانەوەی نییە و هەر دەبـێ و دەبـێ هەر بشبێ و پێـی وا نەبـووە کە خـودا لە هەر گۆشـەیەکی زەوی کوێخـا یان گزیرێکی داناوە و هەموو کاروباری خۆی لەمەڕ خەڵکەوە بەوی ئەسپاردووە و هەرچی ئەو قوڵە شێخ و کۆنە کوێخا و گزیر و قوڵە چۆماغانە نەیکەن نابێ و هەر کەس ئەوان نەیبەخشن نابەخشرێ.

ئەو وەک خواناسـە گەورەکـان خـوای نـاسیوە و لە سـەر پـێ و شوێنی وان رۆییشتووە. هەرگیـز وەک ئیـسلام نەناسـانی زانـانوێن پێی وا نەبووە، کە گەڵ دۆستی و نیشتمان پەروەری و مەسـەلەی نەتەوایەتی دژی ئیسلامە و لەگەڵ ئایینی خوادی ناتەبا و نامۆیە.

ئەو ویـستوویەتی هەمـوو گەلێـک بە مـافی خـودا پێداوی خـۆی بگات و لە ژێر ئاڵای پیـرۆزی ئیـسلامدا وێکـڕا بـژین وبحـاوێنەوە و تـاقە رێـگەی کـامەرانی و خۆشـبەختی و ئـازادی ورزگـاری تیـرەی مرۆڤیشی هەربە ئیسلام زانیوە و بەخـتەوەری کۆمەڵگـای خەڵکـانی

ژیان بە گشتی و گەلی هەژار و دابەش کراوی کوردی بە تایبەتی هەر لە قورئان و ئیسلامدا دیتووە و بەس و بۆ چارەی هەموو دەردە کۆمەڵایەتییەکان هەر لە ئیسلام و قورئاندا گەڕاوە و ڕەوگە و ڕێبازە جۆراوجۆرەکانی ساز کراو و داتاشراوی دەستی خەڵکی قەبووڵ نەکردووە و وەلای ناون.

هەروەها ئەو قەت پێی وا نەبووە کە خودا لە بەردەستی شێخ و پیراندا بێدەسەڵات وگوێ ڕایەڵی قسە وفەرمان یان لانی کەم ئەنجامدەری بێ چی و چەند وچۆنی داواوتکا وفەرمانەکانی وانە وەک مریدگەل ووشکە سۆفی و موسڵمانە لە ئیسلام حاڵی نەبووە فریودراوەکان وادەزانن!!

ئەو بەڕێزە ویستوویەتی ئیسلامی پیرۆزلەگەڵ بیروهەستی گەلە بەشخوراوەکەی تێکەڵ ببێ وببێتە هەوێن وئاوێتەی وێژە و فەرهەنگی ڕەسەن وپوختە وپاراوی کوردی وبنەما وبەردی بناغەی ژیانی کوردەواری. جادەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەوە ویست وخواستی گەلێک لە خاوەن ویستانە. لە وڵاتی کوردستانا بەڵام لە بەرئەوەی لە ڕێگەی ڕاستی ئەو ویستە پیرۆزە لادەدەن نە بە ئاوات دەگەن و نە ئەو جۆرە کە پێویستە و دەبێ ببێ گوڵ دەکەن.

مامۆستای بەهەست و خودا ویستمان باوەڕی پتەووقایم وقوڵی بەوە هەبووە کە ئەگەر هەرکەس بە زمانی زگماکی خۆی لە ئایین حاڵی بکرێ باشترین هەنگاو بۆ بەرەو پێش بردن وپەرە پێدان و بایەخ دان بە ئایین هەڵگیراوە وخوداش هەربۆیە پێغەمبەرانی بە زمانی خۆیان بۆناردوون (وما ارسلنا من رسول إلاّ بلسان قومه).

خوا لێخۆشبوو گیوی موکریانی لە دیباچەی فەرهەنگی مەهابادا بەسەرهات و ڕووداوێکی زۆرناخۆش ودڵتەزێن وکەسەرهێن دەگێڕێتەوە و دەڵێ: کاکم حوسێن حوزنی داماوی موکریانی

پەڕتووکی ("منهاج الطالبين")ی بە کوردی وەرگێڕابوو. مامۆستای کۆیی و مامۆستای گچکەی هەولێری پێکەوە لەسەریان نووسیبوو: (ئافەرین حوسێن حوزنی تۆلات وایە کە بەو کارەت خزمەتت بە فەرهەنگ وزمانی کوردی کردووە، خوادەیزانێ خزمەتی ئایینی پیرۆزی ئیسلامت پتر کردووە). هە روەک ئاماژە ی پی کرا-

کاتێک کە خوالێخۆشبوو دەیهەوێ ئەو کتێبە چاپ بکا هێندێک لە بە رواڵەت مەلا و مەلا نوێنەکانی ناوچەی رەواندزی دەیانهەوێ بەرگری لێ بکەن و تەنانەت لە بەرکوردی نووسین و کوردی چاپ کردن ئەو دووبرایە بە گاور لە قەڵەم دەدەن ولە لای فەرمانداری شار گەلێک بەدبێژی دەکەن. ئەوانیش داوا دەکەن لە فەرمانداركە مەلایەکان کۆبکاتەوە و رووبەڕووی یەکتردایانبنێ و و دەمیان پێ بدا کە پێکەوە لە خزمەت ویدا بئاخێون. سەرەنجام وای لێ دێ تا دەگاتە ئەورادەیە کە فەرماندار لە دوویان دەنێرێ و دەیهەوێ کە بە شێوەیەکی سەخت و توند سزایان بدا.

کاتێک ئەو دووبرایە ومەلا نوێنەکان لە کۆشکی فەرمانداری لە خزمەت فەرماندارئامادە دەبن وباسەکە دەکێشرێتە پێش، بەڕێز خوا لێخۆشبوودااو دەفەرموێ ئەگەرزمانی کوردی زمانی گاو روزیندیقیانە و نووسینی پێ حەرامە ئەدی ئێوە بۆچی قسەی پێ دەکەن وسەرەڕای ئەوش خۆئێستا لە کوردستاندالە مامۆستای کۆیی ومەلای گچکەی هەولێری مەلاتروزاناترنییە، ئەگەرئەوان ئەوکارەیان پەسندکردبێ وپێیان چاک بێ ئێوە دەڵێن چی؟

ئەوانیش دەڵێن ئەو زانایانە شتی واناکەن. داماوی بەڕێزیش دەستخەتی خودی خۆیانیان نیشان دەدا کە لە سەرخودی کتێبەکەی وییان نووسیبوویان مۆریان کردبوو. مەلانوێنەکان دەڵێن تۆخۆت

پێت هەیە و مـۆرهەڵقەنی ئیتـرئەوە سـاختەی خـۆتە وئەوان هەرئاگاشیان لێ نییە.

ئەویش دەڵـێ فەرمـوون تەلەفونیـان بۆبکەن ولێیـان بپرسـن . دوای ئەوەی کە ناوێران پێوەنـدییان لەگەڵ بگرن فەرمانـدار لێیـان تـوورە دەبـێ ودەیـهەوێ هەمووپـان لە نهـۆمی سـەرێی کۆشـکەوە هەڵدێرێ بەڵام خوالێخۆشبووداماو تکایان بۆدەکاولە چەنگی رق و توورەیی فەرمانداررزگاریان دەکا.

ئیترسەدهەزاررەحمەت لە گۆڕی خۆی وکەس وکـاری فەرمانـداری واو مامۆسـتا گیوومامۆسـتای گەورە وگچـکە وحوسـین دامـاوی موکوریانی.

بەڵـێ راسـتی دەبـێ پـێ لەوراسـتییە بنێـین کە دوای ئەوهەمووشەڕوشـۆڕو شۆڕشـە زۆرانەی، کە لە کوردسـتانداکراون شۆڕشـی کوردجـار جـارە نەبـێ نەکەوتـۆتە سـەر رەواڵـی رەوا و رێبازی راستەقینەی خۆی، چونکە یـان بە رێبـازی سۆسیالیستی و کۆمۆنیـستی دا کـاروانی خەباتیـان ئاژوانـدووە کە وەک روون و ئاشکرایە ئەوانە هەر لە ماکا دژی نەتەوایەتـین، یـان دواکەوتـووی ئەم و ئەو بوون و تادوندی سەرکەوتن رۆیشتوون و لە نەکاوێک لە سەختترین هەڵدێرگە هەڵیانداشتوون و بەوشێوە تامـاوەیەکی زۆر دەنگی مافخوازی کـورد کـڕ کـراوە و ئەوەش چەنـدین جـار دووپـاتە کـراوەتەوە. بەڵام لەنێـو شۆرشـە فەرهەنگییـە کانـدا تەنیاشۆڕشـی مەلای کۆیی دەقاودەق لەسەر ڕێبازی ڕاسـتەقینەی شۆڕشـی کـوردی موسـڵمان بـووە و مـووبە مـوو لەگەڵ بەرنـامەی قورئـانی پیـرۆز بەرابربووە. دەبی ئەوەش بلیـین کـە: لـە نێـو شۆڕشـەکانی کـورددا چەنـد شۆڕشـیکی وەک شۆڕشـی شـێخ عوبەیـدلڵای نەهـری و شـیخ مەحمودی نەمرومە لاسـەلیمی دەرسـیمی میـری کـورەی ڕەوانـدزی و

شیخە بەڕێزەکانی بارزانی زروکوردانە وخۆمالییانە و موسلمانانە بوون، بەلام بەداخەوە ئەوڕۆکە هیندیک کەسی سادە و ساویلکە دژی ئیسلام ونهیاری نەتەوەی کوردخوشیان لییان نایە و بەدوواکەوتوکونە پەرستیان دەزانن!!

من خۆم لام وایە کە ئەگەر پێشەنگەکانی کاروانی خەباتی خوێناوی کوردەواری ئەو کاروانە ماندو و شەکەژۆیە بخەنە سەر ڕێبازی راستەقینەی ئیسلام، وقورئان بکەنە بەرنامەی ژیان و خەباتی نەتەوە چەوساوەکەیان تەنانەت ئەگەر سەد ئەوەندەی دیش ماندو و شەکەژۆبێ سەردەکەوێ. دەنا لەوانەیە هەر لەوحاڵەتی نەشکان ونە سەرکەوتندا، تا ماوەیەکی زۆری دیکەش بمێنێتەوە؛ یاخو خوا نەکاتیک بشکیتەوە.

جێگەی داخ و کەسەرە کە ئەوڕۆ هەر کەس دەم لە کوردایەتی و مەسەلەی کوردبدا لە لایەک لە لایەن دەوڵەتانی دەسەلاتداری فەرمانڕەوا وخۆسە پێن بە بە سەر کوردستاندا بە سەختی دەخرێتە ژێر گوشاروئازارو زەخت و ئەشکەنجەوە وتا سنووری سێدارە و پەت و قەنارە و کۆت وزنجیر دەڕوا و لە لایەکش ئەوانەی کە خۆیان بە دڵسۆزی کوردورابەری راستەقینەی شۆڕشی رەوای کورد دەزانن دەیبەن لە سەر گلکۆی ناپیرۆزی مارکس و ئەنگلس ولینین کڕنۆشی پێ دەبەن ولایان وایە کە هەرکەس کوردبێ دەبێ هەرکۆمۆنیست وخوانەویست و هەق نەبیست بێ!! وای لەوبەدبەختییە کە تووشی کوردهاتووە!!

جارێک لە ڕێکخراوەی یەکێک لە گروپەکانی کوردستاندا باڵتۆیەکەی خۆم راخست ودەستم کردبە نوێژ کردن بە تێکڕادەمیان کردەوە وگوتیان ئەوە چ دەکەی؟! تکایە ڕێکخراوەکەمان لێ نوێژاوی مەکە!! منیش گوتم وەڵلا ئەگەر هەمووشتان هەڵێن من نوێژی خۆم هەردەکەم.دابزانن خوشتان کافر ناکە ن ؟!

جارێکی دیکە بەرپرسێکی سادەی یەکێک لە سازمانەکانی کورد دەبینێ وا شۆفیرێک وشەی پیرۆزی(اللە)ی لە پێشی ماشینەکەی نووسراوە. دوای ناڕەحەت کردنی شۆفیرەکە دەڵێ دەبێ هەر ئێستا لێی وەکەی. ئەویش وەڵامی ناداتەوە ودەڵێ ئەگەر سەریشم ببڕی من وشەی ئەڵڵا لە ماشینەکەم ناکەمەوە.ئەویش خۆی هەڵدەستێ و بە چەقۆ دەس دەکا بە کڕاندنی و خەڵکەکەش دەس دەکەن بە رەخنە لێ گرتنی وناهێڵن وگەلیکیشی لی تورە دەبن و پێی دەڵێن تۆ ئەگەر ئاوابێت حاشالە خوت و لە...!!

جارێکی یەکێک لە ئەندامانی لێژنەی ناوەندی یەکێک لە سازمانەکانی کوردستان گۆیا شەقێک لە مزگەوتێ هەڵدەداودەڵێ هەتا ئەوکلێسخانە لە وڵاتدا بێ ئێمە سەرناکەوین! زۆربەی خەڵکی کوردستان ئەوەیان بیستووە و لێی ناڕازین.

جا ئێمە ئەگەر بە وردی ورد بینانە سرنجێک بدەینە هۆنراوە و نووسراوەکانی مامۆستای خۆشەویست وبەڕێزوکوردی راستەقینەمان بۆمان دەردەکەوێ کە هەردووک لایان تاوانبارەکاوهیچ کامێکیان پەسند ناکات. هەم دەوڵەتە دەسەڵاتدارەکان وهەم سازمانە کوردییەکان. چونکە ئەوکوردە و داوای کوردایەتی دەکا و کوردیشی لە هەموو کەس خۆشتر دەوێ لە هەموو کەسیش لە سەرمەسەلەی کوردودوای رەوای سوورترە.

بەڵام هەرگیزاو هەرگیز بەو لاو لایاندا نەڕۆیشتووە و لە رێگەی قورئان لای نەداوە و چارەی دەردی گەلەکەی تەنیا لە ئیسلامدا دیتووە. دەبینین کە چۆن هانا دەباتە بەرخوای گەورە وچۆن سکاڵا دەکاو لێی دەپاڕێتەوە وچۆن باسی هەژاری و لێقەوماوی و بێچارەیی و بێکەسی گەلی کورددەکا ئەمجا لە دواییدا چۆن بە سەر

کوردانـدا دێ و سەرکۆنەیان دەکا و دەڵێ:

# هەناسە هەڵکێشان و پاڕانەوە

یـــا رەببـــی بە لوتـــف و جـــود و ئیحـــسان
روحمێکـــــی بـــکەی لە حەققـــی کـــوردان
قەومێکـــــــی فەقیـــــر و ناتەوانـــــا
بـــــێپەروەر و بـــــێپیـــــاوی دانـــــا
بـــــێمورشـــــید و عـــــالمی سیاســـــی
بـــــێســـــەتوەت و قاعیـــــدەی ئەساســـــی
بـــــێروح و حەیـــــاتی ئیجتیمـــــاعی
بـــــێقـــــودرەت و قـــــووەتی دیفـــــاعی
بـــــێ دەفـــــتەر و کـــــاغەز و کیتـــــابەت
بـــــێ ســـــەنعەت و حیـــــرفەت و کەســـــابەت
{تـــــۆ خـــــوایە بە ئەو قەومە فەقیـــــرە
روحمێکـــــی بـــــکە ئەتـــــۆ ئەمیـــــرا
ئەو قەومە خـــــوایە تـــــاکوو کەنگـــــێ
بـــــۆ چـــــوونەوە مـــــاڵی خـــــۆی بجەنگـــــێ؟!
ئەو قەومە خـــــوایە بـــــۆ وەهـــــا بـــــێ؟!
بـــۆچی لە هەرچـــی ژیـــنە دەبـــێ جیـــا بـــێ؟!
بـــۆ ژێـــر چەپەرۆکـــی هەر کەســـێ بـــێ
بـــۆچ دژمنـــی سەرســـەختی دەبـــێ بە ســـێ بـــێ؟!}
خـــــاکێکی هەیە وڵاتـــــی کـــــوردی
ئەکـــــسیرە وەلـــــێ لە چەنگـــــی مـــــردی
خـــــاکێکی ئەوەنـــــدە پـــــاک و رەنگـــــین

قەومێکـــــی ئەوەنـــــد فەقیـــــر و بـــێ‌تـــین
ئەی کـــاکی نەفـــامی گەوجـــی مـــلهـــۆڕ
بنـــــــواڕە لە دەوری بــــــابە گوڕگـــــور
ئەو نەوتە چ بـــــــوو چلــــــۆن بەدەرکەوت
چــــۆن هەڵـــــدەقوڵێ مەنــــابیعی نەوت
ئەو نەوتە بـــــوو ئـــــاگری هەڵایـــــساند
چەنــــد دەوڵەت و تـــاج و تەختـــی فەوتانـــد
ئەو نەوتەیە بـــــوو کە چــــاردە ملیـــــوون
عەســـکەر لە فەرەنـــگ و نەســـلی مەیمـــوون
بـــۆی هـــاتە نیـــزاع و حەرب و کوشـــتن
تـــاکوو بە مەرامـــــی خـــــۆ گەییـــــشتن
ئەو نەوتە چ بـــــوو؟ ژیـــانی تـــۆ بـــوو
وەی خـــۆڵ بە ســـەرت ئەوا ئەویـــش چـــوو!!

مامۆستا زۆر چاک لە هەموو شتێک حاڵی بووە وبە تەواوی چۆتە بنج و بناوانی مەسەلەکە ولە فێڵی فێڵبازان ئاگادار بووە و زانیویەتی کە چۆن دژمنانی کورد ڕێگەیان لە کوردەکان گۆڕیوە و لەباتی هەموو جۆرە پیشە و پڕگاڵ وزانست وزانیارییەکی بەرەو تەکیە و خانەقایانیان بردوون و فێری تەپڵ و دمبەگ و دەفیان کردوون.

کوردی بێچارەیان وەها لە شارێگەی ڕاستەقینەی ژیان لاداوە کە دەبێ ساڵەهای ساڵ کاری لە سەربکرێ تا بێتەوە سەر ڕێی خۆی. جاهەربۆیە لە جێیەکی دیکەدادەڵێ:

ئەی وەتەن، لاوەکـــــانی خـــــوێن شـــــیرین
ئەو دوعـــــایەی دەکەم، بڵـــــێن ئـــــامین

ڕەببی هەر کەس کە دژمنی کورد بێ
چاوی با دەرپەڕێ و ملی ورد بێ
ئەوی ڕێگەی لە کوردەکان گۆڕی
لەعنەتی خودا لە ئەلحەد و گۆڕی

ئەو جار دەبینێ وانەوت لە سەراسەری دنیایەدا ئاوری هەڵایساندووە و تەنانەت لە فەڕەنگستانەوە بۆی دێن و شەڕی بۆ دەکەن و خوێنی بۆ دەڕێژن، چونکە خۆیان لە خاکی خۆیاندا ئەو کانگا گەورەیان نییەو بۆی دێنەرۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کوردستان و شەڕو کوشتاری بۆ وەڕێ دەخەن و خوێنی بۆ دەڕێژن و بەڵام لاوانی کوردیش لەو حاڵەدا لەباتی هەمو هەنگاوێکی پێویست و لەباتی خوێندن وفێر بوونی زانست وزانیاری تەپڵ و دەف ودمبەگ لێدەدەن ودوای شێخ ومێخان دەکەون وئیتربە جارێکی هەموو شتێکیان فەرامۆش کردووە لە خەوی بێ باکیدا پرخەیان دێ، بە تووڕەیی و قەڵسییەکی تەواوەوە دەفەرموێ:

ئەی کوردی نەفامی خانەوێران
وەی عەبدی زەلیلی شێخ و پیران
ئێستاکە گەلی مەعادینی دی
پەنهانە لە ناو دەروونی عەردی
وەک مەعدەنی زێڕ و زیو و سەردەف
تۆش لێدە لە تەپڵ و دمبەگ و دەف

بەڵێ مامۆستای کوردی دڵسووتاو، سەرکۆنەی کوردان دەکا و دەفەرموێ ئەی کوردی ماڵوێران و نەزان و ناحاڵی و ئەی بەندەی بێدەسەلاتی شێخ و پیران، تۆ ئەوەندە بەدبەخت و ماڵ وێرانی، کە

بە جارێکی خۆت لەبەر دەستی شێخ و پیران ناوە و خۆت وەها زەلیل و زەبوون کردووە و ئەوانیش وەهایان ئەتۆبە شتی پڕ و پووچ و بێکەڵکەوە خەریک وسەرقاڵ کردووە، کە هۆشت نەبووو ئاگات لێ نەبوو و نەتزانی کە گەورەترین و گرینگترین کان و سەرچاوەی وڵاتەکەت، کە نەوتە دژمنانی تۆ دەریان هێناو بۆ خۆیان بردیان و تۆش تەنانەت ئەگەر بڕی چرایەکی چووکەڵەشت پێویست بێ دەبێ زارە خوارە لە بەروان بکەی ولێیان وەپاڕێی. بەڵام نازانی ئەو نەوتە چ بوو؟ ئەو نەوتە ژین و مایەی ژیانی تۆ بوو و تۆش خاکت بەسەر ئەوا لە دەستت داو دژمن بۆ خۆی بردی.

بەڵام ئێستاش گەلێک کانگا وچاوەی دیکەی وەکو و زێڕو زێوو سەدەف لە ژێر زەمیندا ماون و ئەوانیش یان هەروالە ژێر زەویدا دەمێننەوە یان ئەوانیش وەک نەوتەکە دژمن دەیانبات، چونکە تۆلە باتی ئەوەی بچی زانیارییەک بخوێنی کە ئەوانەی پێ وەدۆزی ئەواخەریکی دەف و تەپڵ و دمبەگ لێدانی و ئیترگورژی گوتەنی:

خۆی دەکا ئامادەتر دژمن دژی تۆ و تۆش کەچی
کاری گەورەت بۆتە قومار و بەرەو پەستی دەچی
تولە باتی پیشە وپژگال وهە ول وتیکوشان
هە لدە ویستی سا لە سە رکوچە وشە قام وگویچکە بان

جا بە تووڕەیی وناڕەحەتییەکی زۆرەوە دەفەرموێ تۆشایستەی ئەوەت نییە کە ببیە خاوەنی ئەوکانگا وشتە گرینگانە کەوایە بڕۆ لێدە لە تەپڵ و دمبەگ ودەف کە توهەر شایانی ئەوجۆرە شتانەی. دەنائاخر:

ئەو نەوتە لە خاک و ملکی کوردی
کێ خستیە دەست و هات و بردی

لەم ئـــــاخیرەدا ئینگلیـــــز و ئەفـــــرەنج
پـــاش حەربێکـــی بە میحـــنەت و رەنـــج
بـــۆ فیکـــری عەمیـــق و حەدس و حیســـسە
گەر بێـــتە شـــەریکی نەفـــع و حیســـسە
ئەم مــــــیللەتە گەورە و عەزیـــــمە
ســـێ پـــارچە کـــرایە بـــویتە قـــیمە
هەرچـــــی هەیە بـــا لەبـــۆ ئەوان بـــێ
بـــۆ ئـــوممەتی ســـاحیبوززەمان بـــێ
قـــــولتێکی لە دەوری بـــــابە گورگـــــوڕ
نایـــــدەم بە منـــــارەی ئیمـــــام دوور
بـــــستێ لە ولات و ملکـــــی کـــــوردی
نایـــــــدەم بە هەزاری ســـــــوهرەوەردی
نەزر و هیـــــبە و عیـــــززە دەمێنـــــێ
ســـەد مەعـــدەن و کـــانی نەوت دێنـــێ
ئەو موجتەهیـــــدانە پـــاکی کـــوردن
ئێـــستاش بە تەمـــاعی مـــالی کـــوردن
هەر رۆژە لە دەوری مەرقەدێکـــــــــــــی
بۆیـــان گـــرد ئەبـــێ بە قەد کەلێکـــی
هەر کـــوردی فەقیـــری خـــانەوێران
نە قەبـــری هەیە نە بیـــر نە زینـــدان
ئەو نەوتەیە مـــــایەی حەیـــــاتی
ئەو نەوتەیە ســـــەروەتی ولاتـــــی
مەحـــــرـوومە لە حاســـلاتی عەرزی
بێچـــــارە ئەوا دەخـــــوا و دەلەرزی
قەتـــع و نـــەزەریش لە مەعەدەن و کـــان

لەو ئـــــاو و بەراوی مڵکـــــــی کــــــوردان
{ئەو کــــوردە لە ســــەر زەوی لە زێـــــڕی
چـــاو چـــاوی لە نـــــۆکەری دەگێـــڕی
ئێــــــستاکە لە بێکەســـــــی خەســــــارە
چـــــــی کـــــــوردی هەژاریــــــشە نەدارە
چـــی کـــوردە لە برســـــان و لە رووتـــــی
وا ئەمـــــــرێ لە بـــــێ رۆزی و قـــــووتی
بـــێ بـــە ش لە بە ر و بـــوو یـــی وڵاتــــە
کوردە لــــــە وەتـــــەن بــــێدەســــەڵاتـــــــە
واخوشـــی لــــە کـــوردە گـــە ل جـــو دایـــــە }

مامۆستای دڵ بە کوڵ و دەروون زامار، لە بەرنـارەحەتی زۆری دەروونی و لە تاوان و لە داخان وەک کابرای زۆرتووڕە و قەڵس و نـاڕەحەت، بەڵام دڵسۆز لەگەڵ لایەنـی رووبەڕوو هەر قسەی لە جێیەک دەکا، بەڵام هەمووشیان هەر هەق و ڕەق وبێتوێلک و مایەدارن.

وەک دەبینین، کە لە هەوەڵی ئەو پارچە هەڵبەستەدا لەبەر یەزدانــــی مەزن و میهرەبـــان هەڵدەباوێـــشکێ و داوای بەزە و میهروچاکەی بۆکوردان لێ دەکا و ئەمجا دێتە سەرباسی هەژاری و لێقەوماوی کورد و ژیواروحاڵەتی هەژارانەی کوردان باس دەکا.

پاشان دێتە سەرباسی پیت وبەرەکەتی کوردەواری و چاکی و پڕکانەو چاوەیی کوردستان،ئەمجا کورد دەکاتە لایەنی ڕووبەڕوو و ڕووتێکراو (مخاطب)ی خۆی و پێی دەڵێ هەی گەوجی نەزان تەماشا کە لە دەورووبەری باباگوڕگوڕ و بزانە چۆن و چەندین چاڵاوی نەوتی لێدراوە ودژمن دەیبا و دەیخواولە نەوسی خۆی خەرج دەکا

دوای ئەوە دێتە سەرباسی نەوت و دەفەرموێ ئەو نەوتە چ بوو چۆن وەدەرکەوت و سەرچاوەی کانی نەوتێ چۆن هەڵدەقوڵن بۆنەتزانی؟ و بێگانە و لاوەکییەکان هاتن و دەریان خست و بۆ خۆیان بردیان. ئەو نەوتە ئاوری کردەوە و چەندین دامودەزگا و میری و تاج و تەختی لە ناوبرد و چ شەڕو هەڵلا و هەنگامەیەکی لەسەر ساز بوو؟!

فەرموودەی مامۆستا گەلێک بەجێیە چونکە دەبینی کە ئێستاش شەڕی نەوتێ لە هەمووشەڕێکی سەختتروبەتەوژمتروزیانهێنترە.

ئەو جاریش دووبارە سەرکۆنە و لۆمەی کورد دەس پێدەکاتەوە و دەفەرموێ ئەونەوتە مایەی ژیانی تۆبوو ئەی خوڵ بەسەرت کەوا لە دەستت داوە، جا ئەگەرچی ئەوەشت لە دەس داوە بەڵام ئەوشتانەی دیکە لە دەس مەدە و چی دیکە بە نەزانی و فریو خواردوویی وە دوای شێخ ومێخان مەکەوە تەپڵ ودمبەگ ودەف لێ مەدە کە ئەوانە هیچ بە کەڵکی تۆنایەن و هیچ قازانجێکیان بۆخوت وگەلەکەت نییە جاکەوایە ئەی کوردی بەدبەختی ماڵوێرانی فێڵ لێکراو، هەستە وهۆشیار بەوە و ڕاپەڕە ورووەد خوێندن و زانین بکە وببە پیاو وخۆت کەڵک وقازانج لە خاکی پاک وپیرۆزی خۆت وەربگرە.

تۆ (وڵات) لە دەس بێگانە دابێ چارەنووسی ئە و گە لە
هەڵمەت و قوربانی دانە و ڕشتنی خوێنی گەرم

ئەوانەی تۆیان بەوشێوە فریوداوە چاویان بەستووی دارو لەی بێگانە و سیخوڕی دژمنانی تۆن، ئیتر گورزی گوتەنی:

ئەرێ هۆ کوردە تۆ بۆچ وا نەزانی
کلکی بێگانە بۆ بە خوا ئەزانی

ئەوان پەروەردەی دەســـــــــتی نەیــــــــارن
مەچـــــــۆ لایـــــان دەنـــــا تــــۆش هەر لەوانـــــی

دوای ئەوە دێـتە سەرباسـی پـارچە پـارچە کرانـی کوردسـتانی گەورەو دەفەرمـوێ ئەی خـوایە ئەوگەلە گەورە بـۆچی وای بەسـەر هات وبۆچی ئاوا پارچە پارچە کراولە بەربەدبەختی خـۆی کـراوەتە سێ پارچە!!

جـا لێـرەدا پرسـیارێک دێـتە پـێش کە کوردسـتان کواهەرسـێ پـارچەیە؟ ئـاخر ئەوە نـیـیە پێـنج پـارچەی تەواوە؟! وڵامەکەشـی ئەوەیە، کە ئەو دەمـی کوردسـتان هەرسـێ پـارچە بـووە، چـونکە کوردسـتانی تـورکیە وسـوریـیە وعێـراق یەک پـارچە بـووە ولـە ژێـر دەسەڵاتی دەوڵەتی عوسمانیدا بووە ودوای شەڕی یەکەمـی جیهـانی ئەووڵاتـانە کە بە سـەربەخۆیی خۆیـان گەییـشتن هەریەکەی بەشـە کوردوپارچە کوردستانێکیان بۆخۆیان دابڕی و وەبەرخۆیان.

جـادوای ئەوەش دێـتە سەرباسـی پـاکی وپیـرۆزی وچـاکی خـاکی پــاکی کوردســـتان و دەڵـــێ تەنـــانەت قــــوڵتێکی لە دەروبەری بــابەگوڕگوڕە نەوتـــاویەکەی خــۆم بە منـــارەی ئیمـــام دوڕیـــش ناگۆڕمەوە وهێندەم لە لام پیرۆزە.

ئەوەنـــــدەم شــــاری کـــۆیە لا عەزیــــــزە
بە دوڕڕ و لەعلـــــــی نــــــادەم وردکە بەردی

لە دواییدا باسی گەورەیی و سەروەری گەلی کـورد دەکـا و دەڵـێ ئەوپیــاوە گەورانە پاکیــان کــوردن و لە نێــو کــوردان چیهاپیـاوی گەورەو زاناو بەناوبانگ هەڵکەوتووە، کە ئەوەش مـایەی شـانازی گەلی کوردە.

دووباره بادەداتەوە سەر مەسەلەی نەوت ودەڵێ مایەی ژیانی کورد و سامانی ولاتی کورد ئەو نەوتەیە وکوردیش و لەوی و لە هەموو داهاتی دیکەی ولاتی خۆی بێچارە بێبەشە و بێجگە لەوانەش هەمووکان و چاوەکانی کوردەواری و هەموو ئاو و بەراوی ولاتی کورد و هەموو ملک وسامانی کوردان ئێستاکە لە بەربێکەسی خەسارە و کوردی هەژاریش لەسەر ئەو هەموو سامان و داهاتە زۆرە و لە سەر ئەو هەموو کانگا و چاوە و ناوەندی داهاتەڕا نەدارو هەژار و دەستەنگ و لەبەر بێ ڕۆژی و لە برسان هەروا خەریکە بمرێ.

جا ئەمجار زۆر بە تووڕەیی و ڕق هەڵستاوی ڕوودە کوردان دەکاو دەڵێ هەر وەختە لە داخی ئێوە بمرم، کە بۆچی بیرێک لە حاڵ و ژیواری خۆتان ناکەنەوە؟ بۆ دێڵن دژمنانتان ئاوا داهات و سامانی ولاتەکەتان ببەن ؟ ! خومن لە داخان بە خوای هۆش و ئارام و ئۆقرەم نەماوە. وەک دەفەرموێ:

هەر وەختە لە داخی ئێوە بمرم
ڕۆییوە قەرار وهۆش و سەبرم

بەڵێ مامۆستای دڵ لە کوڵ لێرەدا دەیدرکێنێ هیچ چارە و پەنایەک نییە یەزدانی مەزن و بێهاوتا نەبێ و هیوای بەکەس نەماوە لە کوردان، چونکە ئەو هەمووەی پێ گوتوون، تەنانەت لێشیان تووڕە بووە و بە هەر لەونێک ئامۆژگاری کردوون، بەلام بەداخەوە ئەوان هەرگوێشیان پێی نەبزووتووە وبۆ چارەی دەردی خۆیان وە خۆ نەکەوتوون جاهەربۆیە لە خوادەپاڕێتەوە ونزا دەکاودەڵێ خوایە تۆ هەر خۆت دەزانی چارە چییە دەخوایە گیان ئەو ستەم و زۆرییە قبووڵ نەکەی و هەر خۆت بەزەیەکت بە

کوردابێ ومن هیوام بە کەس نەماوە و هەر تەنیا میهرو بەزەیی تۆیە پەنای من.پاشانیش دووبارە هانا دەباتەوە بەریەزدانی تاک و تەنیاو بە پەرۆشی و پەژارەی زۆرەوە لێی دەپاڕێتەوە و دەفەرموێ:

چ بکەم چ بڵێم لە تاوی کوردان
ئاگر دەگرێ دڵم لە دەردان
چارە چییە خودایە تۆ دەزانی
خۆت عالمی زاهیر و نیهانی
ئەم زوڵمە قبوول نەکەی خودایە
ئەسڵا ئەمەلم بە کەس نەمایە
لوتفی تووە مەلجەء و پەناهم
روحمێکی بە کورد بکەی ئیلاهم

دووبارە بیری نەوتی دێتەوە سەرووەخت دەبێ لە دەروونی خۆیداگڕ بگرێ و بسووتێ، چونکە بیردەکاتەوە، کە ئەو خاکی پڕپیتی کوردستانە هیچ بەهرەیەکی وای بۆکوردان نییەو گورژ گوتەنی :

هەموو داهات و سامانی ولاتیش گاوران دەیبەن
موسڵمانیش سواڵ و راو درووتە بۆژیان دەیکەن.

بەڕاستی هەقیش هەر بەخۆیەتی، کە ئەو خۆوەک خەڵکی ئاسایی نییە کە ئاگای لە هیچ نەبێ ونەزانێ چ باسە وخۆشی لەوبارەوە فەرموویەتی:

ئەوەی زانایە ناو جەرگی پەلاسە
ئەوی نادانە نازانێ چ باسە

پاشـــان هەر لەو هەڵبەســـتەدا تـــاوان و هۆبـــاڵی هەمـــوو ئەو دواکەوتـــن و ئەو هەمـــو و هەژاری و نەداری و مـــاڵ و ێرانـــی و لێقەومـاوییە هەروەک کەوایە و هـیچ گومـانی تێـدا نیـیە وبـێجگە لەوەی هۆکـارێکی دیـکە بۆوکـارە دەس نـاکەوێ دەخـاتە ئەسـتۆی خودی گەلی کورد و دەڵێ هەرگەلێک، کە ئاوانەزان و بێفەرهەنگ و وێژە بێ و ئاوا رەزیل و بێدەسەڵات و بێ هێزو توانا بێ هەر دەبـێ ئاوابێ، بەڵکە دەبێ خەراپتریشی بەسەر بێ و وەکو و بزنـی گـڕوێ دەبێ دەربکرێ لە نێو مەڕ و نابێ تخـوونی بێـرێ و مەڕ بکـرێ، کە ئەوەش هەرماناو واتـای ئـایەتی قورئـانی پیـرۆزە، کە دەفەرموێ: (لیس للانسان إلاّ ما سعی) مرۆڤ هـیچ شـتێکی بـۆنییە ووەدەستی ناکەوێ بە هەوڵ وکۆششی خۆی نەبێ. یان (ان الله لایغیرمـا بقوم حتی یغیروا ما بانفسهم) بەڕاستی خوا حـاڵ و ژیـواری هـیچ گەل و هۆزێک ناگۆڕێ هەتا ئەوان خۆیان حاڵ وژیوای خۆیان نەگۆڕن.

بە غمخـــوارگی جـــز ســـر انگـــشت مـــن
نخـــارد کـــس انـــدر جهـــان، پـــشت مـــن

کەواتە گەلانی ژێردەستە دەبـێ خۆیـان بۆحـاڵی خۆیـان بیرێکـی بکەن و خۆیان بـۆراژە و خزمەتـی گەل و نیـشتمانی خۆیـان وەخـۆ کەون و بـۆ بووژانـدنەوەی وێـژە وفەرهەنگـی نەتەوایەتـی خۆیـان خەبات بکەن وتێبکۆشن چونکە گەلی دیلی خاوەن فەرهەنـگ وزمـان وەکـو و دیلێـک وایە، کە کلیلـی دەرکـی بەنـدیخانە، کە لە دەس خۆیـدابێ و هەر کـاتێ بـیهەوێ دەرکەکە هەڵـدەگرێ ودێـتە دەرێ و رزگار دەبێ بەڵام گەلی دیلی بێفەرهەنگ و زمان وەکوو دیلێک وایە کە کلیلی قفڵی دەرکی بەندیخانەکە لە دەس دژمنی زۆردار و خـاوەن دەسەڵاتی خۆیدابێ. کە دیارە بە ویستی وی نەبـێ رزگـاری نـابی و دیارە کە ئەویش قەت نایهەوێ.

جاڵەدوامین مەبەستی ئەو هەڵبەستەدا دووبارە رووده کوردان دەکاتەوە وپێیان دەڵێ ئێوەتا ئاوا لە گەڵ یەکتر خەراپ و بەدویست و خاون ئێرەیی بن و تائاواقینوولە یەکتربێ هەرئاوا ژێرچەپەرۆکی عەمروزەیددەبن و رزگاریتان مەحاڵە.

کەسێک کە لە زانیاری رەوانخوێنی ورە ونبیژی وخۆش خوێنی (بەلاغە) سەردەربێنێ وزانیارییەکانی لۆجیک (منطق) وریئۆنی (فلسفە) برێک بە باشی بزانێ وئەمجاهەریەک لە پارچە هۆنراوەکانی مامۆستای گەورە بداتە بەر جەنجەڕی لێکۆڵینەوە و توێژینەوە وسەرنجێکی رەدابینانەیان بداتێ زۆربە چاکی تێدەگا کە چ ئەندازە ناسکییەتی ونەرمی ونیانی ورازوریئۆنی دە هۆنراوەکانی مامۆستاداهەیە، جابەتایبەتی ئەوپارچە هۆنراوە.

بەڵێ بەڕاستی ئەو پارچە هۆنراوەشی هەروەک هەموو هۆنراوەکانی دیکەی لە ئەوپەڕی خۆش خوێنی و ڕەوان خوێنی دایەو پڕپڕە لە ڕازو ڕیئۆنی و ڕاژۆی جوان جوان. بەڵێ مامۆستای گەورەمان لەوبەستە هەڵبەستەدا شتێکمان پێ دەفەرموێ کە پترلە نیوسەدە دواتر هۆنەری هۆشیار و ژیری کورد مامۆستا هەژار ئاماژەی بۆ دەکا و دەفەرموێ:

مـــــــاڵ لە خـــــــــانەخوێ حەرام کـــــــــــراوە
مەســــــــەلەی کـــــــوردە و لە کــــــورد رووی داوە

ئەو بەڕێزە بۆمان باسی شتێک دەکا کە پێوەندی راستەوخۆی بە گیان و ژیانەوە هەیە، بۆمان باسی زێڕی رەش دەکاکە ئەوڕۆ وەک رەگی گیانی لێ هاتوە و کەمتر شتێک هەیە بە بێ وی ئەنجام بدرێ.

جاجەنابی مەلای گەورە ئاماژە بەوە دەکا، کە کوردستان نەوتی زۆرە و ئێمەی کوردیش ناتوانین کەڵکی لێ وەربگرین و ئەویشمان هەروەک زۆربەی کانە و چاوەکانی دیکە بۆ ئەولا و لایان دەرواوخەڵک و بێگانە کەڵکی لێ وەردەگرن، ئێمەش دەبێ هەرلە دوور ڕا تێیان وەڕامێنین و بزەی چاومان بێت. جابۆیە ئابەو جۆرە بە هەناسە ساردی وداخ وپەژارەی زۆرەوە رووما تێدەکا و دەفەرموێ:

وەک دێتە دڵم خەیاڵی نەوتی
هێند نامێنی جەرگەکەم بشەوتی
ئەو نەوتە چ بوو، حەیاتی تۆ بوو
وەی خۆڵ وە سەرت ئەوا ئەویش چوو
ئەی کوردی نەفامی خانە وێران
وەی عەبدی زەلیلی شێخ و پیران
قەومێ کە فەقیر و ناتەوان بێ
قەومێ کە رەزیل و بێ زمان بێ
ئەڵبەتە خەراتری بە سەر دێ
جێی ناکەنەوە لە شار و لادێ
وەک بزنی گەڕۆڵ دەبێ دەری کەن
نابێ کە تخوون بێر و مەڕی کەن
تا ئێوە لە حەققی یەک خەرا بن
بەدخواە و حەسوود و ناتەبا بن
تا ئێوە لە حەققی یەک بە کەیدن
هەر ژێر چەپەرۆکی عەمر و زەیدن
تا ئێوە وەها لە عەقڵ دوورن
تەنیا سەحەبی پیاز و توورن

تـــا ئێـــــوە لە یەکتـــــری جـــــودا بـــــن
وا پـــــــرش و بــــــڵاو و ناتەبــــــا بـــــن
بــــێشـــــک کە خراتـــــریش دەبیـــــنن
ئێـــــــستاکە رەزیلـــــــی رووی زەمیـــــنن
گەر ئێـــــوە هەمـــــوو یەک و بـــــرا بـــــن
بـــۆ یەکتـــــری هەر شـــــەمع و چـــــرا بـــــن
ســـــــەرکەوتن و ســـــــەرداری دەبیـــــنن
وەبـــــــزانن کە پادشـــــــای زەمیـــــنن

# ئەم خاکە

مێژوو نووسی گەورەی کورد خوا لێخۆشبو و ئەمین زەکی بەگ دەفەرموێ: (من لە ئەستەمبووڵ هەتاله پەنای دەوڵەتی خەلافەتدادەژیام هە ستم بەوە نەدەکردکەکوردم، بەڵام دوای تێکچوونی دەوڵەتی خەلافەت کەکەماڵ ئەتاتورک هاتە سەرکار و مەسەلەی تورکایەتی کێشرا پێش، منیش زانیم کەوا کوردم و دەبێ هەوڵ بۆکوردایەتی بدەم).

بەڕاستی ئەگەرکەمێک ژیرانە سەرنج بدەینە جیهان وبە تایبەتی جیهانی ئیسلام و گەلانی دنیا، بە چاکی بناسین کە هەریەکەی بۆخۆی و بۆگەلی خۆی تێدەکۆشێ و هەوڵ دەداوتەنانەت بگرە گەلی واهەیە هەرلە نێوئیسلامداکە نەک هەرخاوەنی سەربەخۆیی خۆیەتی وبەس، بەڵکە چەندین گەلی دیکەی موسڵمانیش دەچەوسێنێتەوە وخستوونیەتە ژێردەستی خۆی وبەوحاڵەش هەر هاواریەتی بۆماف وسەربەخۆیی خۆی جالەوکاتەشداتەماشای هەژاری و بەدبەختی وژێرچەپەرۆکی گەلەکەی خۆمان بکەین موولە لەشمان راست دەبێتەوە ودڵمان پڕدەبێ وکوڵمان هەڵدەستێ وکۆیی ئاسادەڵێین:

ئەم خاکە دایکی تۆیە کەوتە دەستی ئەجنەبی
ئەی کوردی ساحەب غیرەت تۆ چلۆن رازی دەبی؟!
نەوتی بابەگوڕگوڕ چۆن دەچێ بۆ پاریسێ
ئاگری حەسرەتەومەندی لە دەروونم داییسێ

ڕاستی من نازانم هێندێک کەللە وشک و چڵپاوخۆری خەڵکی بە چ بەڵگەو پەڕتۆیەکی ژیرانە ڕێگەی گەلخوازی و نیشتمان پەروەری لەگەڵی کوردی موسڵمان دەبەستن؟! ئاخربەکام بەڵگەی ژیرانە دەڵێن کوردایەتی نابێ ببێ و مەحکوومی دەکەن؟ من زۆرجاران لە سەر ئەو مەسەلەیە دەرگیر بووم و هەمیشە گوتوومە ئەگەر لە ئیسلامدا، یان لە یاسای سروشتی ومرۆڤایەتی دا کوردایەتی مەحکووم بێ دەبێ لە پێشدا عەرەبایەتی و تورکایەتیش مەحکووم بێ، دەنا کوردایەتی بە تەنیا هیچ دەقێکی تایبەتی لە سەر نییە.

بۆچی بیرناکەنەوە کە ئەوەی ئەوان دەیڵێن ودەیانهەوێ هەرگیزئایینی پیرۆزی ئیسلام پێی قایل نییە، بۆچی هەمووگەلێک نابێ مافی خۆی هەبێ؟ بە کام بەڵگە دەبێ کورد هەرژێرچەپۆکە و نۆکەربێ؟! ئەدی ئەوگەلە دەسەڵاتدارانەی نێوخاکی پاکی ئیسلام ئەگەرراست دەکەن بۆچی نەتەوایەتی خۆیان وەلا نانێن هەتاببنە نموونە وسەرمەشق بۆئێمەی هەژاری کوردیش؟!

ئەدی بۆئێمە دەبێ بەزۆر منداڵەکانمان لە فێرگەکانی واندا هەروانەی فارسی و عەرەبی و تورکی و ئەرمەنی بخوێنن؟! ئەرێ ناکرێ بپرسین ئەوە بەکام یاسای ئاسمانی لەسەرمان تاپۆکراوە و ناشێ بلێین ئەرێ کێهە ئایەتەی قورئان وتەورات و ئینجیل یان زەبوور و ئاوێستا و هتد ئەو ژیوارە ناهەموارو پڕ ئازارە زۆر دژوارە نامەردانەی لە سەرئێمە نووسیوە ؟! تاکەی دەبێ هەر ئاواش بێ؟!

من خۆم هەمیشە ئەوەم گوتووە ودەیڵێم ودەینووسم ودەیڵێمەوە کە هەر کاتێک لە تەواوی مافە کۆمەڵایەتی ورامیاری و فەرهەنگییەکانداجیاوازیم لە گەڵ فارسێک وتورکێک وعەرەبێک نەبێ، هەرگیزداوای هیچ مافێک ناکەم و باسی مەسەلەی

نەتەوایەتـیش هەرنـاکەم ولە پـێش هەمووکەسدامەحکوومی دەکەم. تەنیـابەومەرجەلەگەڵ وان یەکسان بـم و ئەوانـیش هەرمەحکـوومی بکەن.

ئەگەر کۆمەڵێک پـێکەوە لە جێیەک بن وچارەنووسیان پـێکەوە لکابێ و ناچاربن کە دەبێ پێکەوە بژین و بحـاوێنەوە هەتـا کاتێک کە مەسـەلەی مـن مـن و تۆتۆیـان بـۆ نـایەتە پـێش وهەرچـی هەیـانبوووێکرا بیخـۆن وکەڵکـی لـێ وەربگـرن و هـیچ کەس نەڵـێ فیـسار شـتە هەر بـۆمن وهەموویـان هەربڵێـین بـۆئێمە، ئەوە زۆربەباشـی پـێکەوە دەژیـن و دەحـاوێنەوە و ژیـانێکی ئـارام و هێمنانەو لە ئاسایشیان دەبێ.

بەڵام هەرکاتێک گەورە و بەهێزەکانی ئەوکۆمەڵە چاویان لەوەی بـوو، کە بەشـی ئەوانـی دیـکەش بخـۆن وهەرچـی ئیـشتیایان لـێ بوودایاننا بۆخۆیان و گوتیان ئەوە بۆمن ومنمنۆکێیان لە نێو داوە دیهـات بـێ هێزەکـانیش سـەرەنجام دەس پـێ دەکەن و ئیـتردەبێتە مشت و مڕلە نێوانیانـداو ئـاخری ژیـان لە هەموویـان تـاڵ دەبـێ و ئەودەم دیاریشە کە تاوانباری گەورە کـێهەیە وبـۆدوارۆژیش کـێ لە هەموان گوناحبارترە وسزای گەورەتری بەردەکەوێ؟

راستی خەڵک ئەگەربیانهەوێ وبە رێی راسـتی ئیـسلامدا بـڕۆن و بەراستی پەیڕەوی یاسای خودابن دەتـوانن دنیـابکەنە نموونەیەکی بەهەشتی بەرین و ئەگەروە دوای هەواو ئارەزووش بکەون، دەیکەنە نموونەیەکی دۆزەخ.

بە خوا زۆر سـەیرە نەتەوەیـی بـوون و داوای مـافی نەتەوایەتـی کـردن بـۆ ئـێمە گونـاح و تـاوان و لەرێ دەرچـوون و لە ئـایین وەرگەڕانە و کافر بـوونە ودژی گەلـی و دژی دیـنە و گـاورییەتییە،

هەرکاتێک داوای سەرەتاییترین مافی مرۆڤمان کرد هەژار گوتەنی:

دەڵێن هەی لە دین وەرگەڕاو
کورد و نان و بەرگ و پێڵاو؟!
وا دیارە بوویتە شعووبی
دەبێ لە ڕێگە دەرچووبی؟!

بەڵام بۆگەلانی دەسەلاتدارو فەرمانڕەوا لە سەرمان تاپۆی ئاسمانی و مۆری ناوگەلانی و مافی ڕەواوسروشتی وفەرمانی یەزدانییە؟!

لێرەدا پیاو ئەو فەرمودەی مامۆستای کۆیی بیر دەکەوێتەوە، کە کاتێک ئینگلیسیەکان لێیان پرسی ئەرێ تۆ ڕات چییە سەبارەت بەشێخ مەحموود و ئەو ئاژاوەی، کە ئەو ناویەتەوە؟ ئەویش دەفەرموێ: ئەگەرشێخ مەحموو دهاتباو وڵاتی ئینگلستانی داگیرکرد با ئێوە چیتان دەکرد؟ گوتیان شۆڕشمان بەرپا دەکردولەگەڵی بەشەڕ دەهاتین و یاخۆمان بە کوشت دەدا، یا ئەو دارودەستەکەی ویمان لە ناودەبرد، یا دەرمان دەکردنەوە. فەرمووی: خۆ دەیجا ئەویش هەر ئەوەی دەکا، کە ئێوە دەتانکرد ئەگەر لە جێی وی بان. بۆچی ئەوەتان بۆوی پێ تاوان و گوناحە، بەڵام بۆ خۆتان پێتان ڕەوایە وبە ئەرکی سەرشانی خۆتانی دەزانن؟ ئەرێ جا جیاوازی ئەو دوو مەسەلە دەبێ لە چیدا بێ؟!

ئەو ڕۆژانە گوێم لە ڕادیۆیەک بووکە بە نێو بۆ کورد دانراوە دوای وتارێکی دوورودرێژلە مەڕ مەحکووم کردنی مەسەلەی نەتەوایەتی کورد، کە بە ڕاستی پیاوی ژێربێزی لە هەمو وشە و ڕستە نادروستەکانی هەڵدەستا سروودێکی خستە سەرکە سەردێڕەکەی ئەوە بوو:

ئەی گەلی کورد تێبگە کێ تۆی کرد بە ئەو کوردە؟
بیــری ناسیۆنالیــستی تــۆی بــردووە بە ئەو دەردە

لەمەڕ جێگـاکە هەمــوو ژێــر و خــاوەن بیرێــک دەزانــێ کە کوردتەنیابە بیری نەتەوایەتییەوە ماوە وئەگەربیری نەتەوایەتی نەبایە هەربە یەکجاری لە نێو دەبراونیخەپەستیان دەکرد.
ئەوەش بەجێــی خــۆی، بەڵام نـاکرێ بڵێـین بـۆچی ئێـوە ئەو بیرەتــان ئەوەنــدە بەهێــزە کە تەنــانەت فەرهەنگــی ئێمەشــتان هەرخستۆتە ژێر تیشکی فەرهەنگی خۆتـان وبگـرە هەر ڕێگەشمان نادەن کەمێـک ئەو فەرهەنـگە ژاکـاوەی خۆمـان ببـووژێنینەوە و بـۆ هەموو کارێک و تەنانەت بگرە بۆ نـامەیەکی دۆسـتانەش هەر دەبـێ زمانی ئێوە بەکاربەرین؟! ئەدی مامۆستا گوتەنی ئەوکارە بۆچی بـۆ ئەنگۆرەوایە، بەڵام بۆ ئێمە تاوان و سووچ و بەڵایە؟

جا هەربۆیە من دەڵێم:

هە ر گە لێکــی نە بیــێ هە ستی نە تە و ا یە تــی
ژێردەستە، دیلە، پەستە، دەمرێ بە گـــــەدایــەتـــی
لـە لای خـوداش ڕورە شـە لـە پەسـلانیش بـی بەشـە
لە دنــیاش هە تاماوە لە نا ودیـــلان و هـــە شـــە

جامامۆسـتای خوالێخۆشـبوو کاتێـک، کە ئەوحـاڵە دەبینــێ و دیارە گورژی گوتەنی:

ئەو چـــا رە زە قەی ئــێمەیە ئاگـــایە لە بەدکـــار
ئاگـــا لە تەڵە و داو و لە نەخـــشەی بەدی زۆردار
تو کە نوستوی بـە بێ بـا کـی لـە نا و تـو کـی قـووا

گەر دەڵێی ئا گام لە د نیایە هەیە کوا نی کوو ا ؟!

خـــۆی بەتەواوی ئاگـــاداری ژیـــواری نالەبـــاری زۆر دژواری کـوردەواری بـووە و تەڵە و داوو نەخـشە نەگریـسەکانی دژمنـی لە دوور ڕادیتـووە، چـونکە داوی ڕەشـی دژمنـی لە سـەرخاکی ڕەش لە شەوی تـاریکی ئەنگوستە چـاودا دیتـووە. هۆشـداری داوە بەکـوردو تێی ڕاخوڕیوە و تانووت و تەشـەری لـێ داوە و پێـی فەرمووە، کە نیشتمان دایکی مرۆڤە و هەرکەسیش خیرەتی هەبێ نـابێ قاییـل بـێ بەوە کە دایکی بکەوێتە دەستی بێگانە وبێگانە بەسەریدازاڵ ببێ.

ســەرەڕای ئەوەش دەفەرمــوێ ئەمــن نەخــشەیەکم ئاگــالێیە کە تۆنایزانی ئەگەربێتوپیادەبکرێ پاشی چەندساڵێکی دیـکە هیچـت بە دەس نـامێنێ و ئەوەنـدەی هەشـتە لێـت دەسـتێنن، ئەمجـار ڕوودە کوردان دەکا ودەڵێ ئێوە لە سەرگۆی زەوی زەبوونترین ورەزیلترین خەڵکن وسەیرە لەسەرئەوحاڵەشڕا ئێستاخۆتان ناناسن؟!

ئەمجا بۆیان باسی دووسـێ ڕووداوی مێژوویـی نێزیکـی دەروانـی خۆیــان دەکـاو دەفەرمـوێ: خۆئەوڕووداوانەتـان بە چـاوی خۆتـان دیتووە یابیستووتانە، جا ئێوەش ئەگەروەک ئەوخەڵکە خیرەتتـان هەبـایە و وەخۆکەوتبـان و پیـاوانە هاتبـانە مەیـدانی خەبـات و تێکۆشان بێگومان شتێکتان لە دەس دەهات و وەک ئەوانە کارێکتان دەکرد بـۆ خۆتـان و گەل و نیـشتمانی خۆتـان لە چەنگـاڵی دژمنـان دەردەهێنایەوە.

ئەو جـار هـۆی هەژاری و نەداری و ڕووت وقـووتی خۆیـان پـێ دەڵـێ و دەفەرمـوێ: ئێـوە چـونکە لە سـەرمڵک ومـاڵی خۆتـان نـان خۆری خەڵکین؟! ئێوە هەژار و نەدار و لێقەومـاون، کاتێک خەڵـک لە سەرماڵی خۆت بە خێری خۆی خێرت پێ بکا لەوەی چاترنابێ.

دووبارە دەگەڕێتەوە سەرتانە وتەشەرودەفەرموێ: تا کەی وەک گاجووت لە ژێرنێری رەزیلی وزەبوونی بێدەسەڵاتیدا دەمێننەوە ؟! ئاخر خۆ ئەتۆش بە لای خۆتەوە گەلی و گەلیش دەبێ خاوەنی دەسەڵاتی خۆی و چارەنووسی خۆی بێ. خۆئازادیش مافی گەلانە ونابێ هیچ کەس لێیان تاپۆبکات. خوای گەورە هەموو کەسی ئازاد دروست کردووە و نابێ هیچ کەسیش ئەو ئازادی یەی لی بستێنێ. کە ئە وە مافی خودا پیداوی خویەتی.

پاشان دەفەرموێ سووری موو زەردی چاو شین کە مەبەستی لە کۆمۆنیستەکانی شۆڕەوییە، نەکەی بە هیوایان بی و تۆ قەت بە هەویای ئەم لا و لا مەبە و تەنیا بە هیوای خوا و هێزی دەس و مەچەکی خۆت و گەلەکەت بە و بەس.

مامۆستا عەبباسی مامۆستای بەڕێزی من ـ یادی بەخێر ـ لە پارچە هەڵبەستێکی خۆیدا دەفەرموێ:

بە راســـــت و چەپــــا هەڵمەخولێـــــوە
تەنیــــا هێـــــزی گەل رزگـــــاری پێـــوە
رۆژهەڵات هەڵات لە کــــــۆڕی خەبـــــات
کەس بە رۆژئــــــاوا نەگەیــــــیە ئـــــاوات

دیسان جارێکی دیکەش هەڵمەت دەباتەوە سەر خەرافات و پڕوپووچ پەرستی و دەفەرموێ کار بە زانیاری و کردەوە دەڕۆن بەرەو پێش و بە نەزانی و تەمبەڵی هیچ کارێک ناکرێ و کەوایە پۆست و زەرگ و دەف و دمبەگ فڕێ بدە چونکە ئێستا کاتی تۆپ و تفەنگ و تانک و فڕۆکەیە و ئیتر چاخی ئەمڕۆ لە گەڵ دوێنێ زۆر لێک جیایە و هەر بە هەوای دوێنێ ناگەیە مەنزڵێ و لە ڕێدا دەمێنیتەوە!!

بەڵێ جا ئا بەو شێوە دەس پێ دەکا و دەفەرموێ:

## ئەم خاکە

ئەم خـاکە دایکـی تـۆیە کەوتە دەسـتی ئەجنەبـی
ئەی کوردی ساحەب غیرەت تۆ چلۆن رازی دەبی؟
بـۆ خـۆت ئەوا دەبینـی دوژمـن عەرزت دەکێڵـێ
پاشـی چەنـد سـاڵێکی دی هیچـت بە دەس نـاهێڵێ
لە سـەر ئەم کـورەی زەوی ئێـوە ارذل الناسـن
ئەمەش گەلـێ غەریـبە کەوا خۆتـان ناناسـن
بە قـووەی زۆری بـازوو، رەزاخـانی پەهـلەوی
دانیشت بە غیرەت و جاە لە سەر تەختی خوسرەوی
مـستەفا کەمـاڵ پاشـا ش ئـا لـی عوسـمانی تێکـدا
سـەیید فەیـسەڵی مەکـی بـوو بە مەلیـک لە بەغـدا

کوردستانی گەورە، کە کوردە نەتەوەخوازە کان داوای دەکەن، یا بە قسەی مامۆستا (ئەم خاکەی دایکی تۆ).

# چەند ڕوون کردنەوەیەک

١ـ ڕەزا خانی پەهلەوی: ڕەزا شای پەهلەوی یە، کە لە نێوان ساڵەکانی ١٨٧٨ و ١٩٤٤ی زایینیدا ژیاوە و ماوەیەکی زۆر پادشای ئێران بووە. لە ساڵی ١٩٢٥ زایینی بە هۆی کودەتایەکی بێ خوێنڕێژی کە لە ئەحمەد شای قاجاری کرد چۆتە سەر تەختی پادشایەتی ئێران و لە ساڵی ١٩٤١ کاتێک کە هاوپەیمانەکان ئێرانیان داگیر کرد ناچار کرا بەوە کە بە قازانجی محەمەد ڕەزای کوڕی خۆی واز لە تەخت و تاجی پادشایەتی بێنێ و تەحویلی وییان بدات.

٢ـ مستەفا کەماڵ پاشا ئەتا تورک: سەرۆکی ڕێکخراوەی نیشتمانی تورک و دامەزرێنەری کۆماری تورکیە و تێکدەری دەوڵەتی بەهێزی ئالی عوسمانییە کە لە نێوان ساڵەکانی ١٨٨١ و ١٩٣٨ زایینیدا ژیاوە. یەکەم سەرۆک کۆماری ڕەگەز پەرستی تورکیا بووە لە ساڵی ١٩٢٣ دوای لە بەر یەک هەڵوەشانی دەوڵەتی عوسمانی هاتۆتە سەر کار و خۆی نێو ناوە (ئەتا تورک) واتا باوکی تورک.

ئەو پیاوە هەر چەندی بۆی کرا زەبری لە ئیسلام و کورد و کوردستان دا و لە ڕاستیدا دژمنێکی سەرەکی و سەرسەخت و کەللە ڕەقی هەموو موسڵمانان و بەتایبەتی کوردان بووە و لە گەڵ ڕەزاخان هاوپەیمان بوون و وێکڕا لە دژی ئیسلام و کورد هەرچی لە دەستیان هات کردیان و دروشمی جیاوازی ئایین و ڕامیارییان لە ناوچەدا وەها بەرز کردەوە کە هێشتاش هەر بێ لێ حاڵی بوون خەڵک خۆی بۆ بە کوشت دەدەن و سینگی بۆ دەکوتن!!

ئەتاتورک ئاڵ و گۆڕێکی زۆری لە تورکیادا وەدیهێنا. ئەلفوبێتکەی لاتینی لە جێی ئەلفوبێتکەی عەرەبی دانا و کردییە شێوەی نووسینی تورکی، زمان و فەرهەنگی کوردی قەدەغە کرد و جلوبەرگی کوردی لە بەر کورد داڕنی!! چارشێوی لە سەر ژنان لابرد و بە سەروملی رووتی وە دەشتێی خستن. لەمپەری لە سەر رێی پاکداوێنی لابرد!!

٣ـ ئالی عوسمانی: بریتییە لە زنجیرەی خەلیفەکانی بنەماڵەی عوسمانی کوڕی تەغرەلی تورک نژاد لە تورکیا کە ماوەیەکی یەکجار زۆر جڵەوی کاروباری دەوڵەتی گەورەی ئیسلامیان لە دەسدا بووە. یەکەم کەسیان کە دامەزرێنەری زنجیرەی عوسمانییە، عوسمانی کوڕی تەغرەلی گەورەی تورکان لە دۆڵی قەرەسووی ئەنادۆڵێیە.

ئەو بەڕێزە لە نێوان ساڵەکانی ١٢٥٨ و ١٣٢٤ ژیاوە و لە ساڵی ١٢٨١ بۆتە گەورەی تورکان و لە جێی سولەیمان پاشای تورک کە بابی خۆی بووە دانیشتووە و زنجیرەی خەلیفە یا سوڵتانەکانی عوسمانی دامەزراندووە. تەغرەل یا ئەرتەغرەل کوڕی سولەیمان پاشای تورکە.

وەختی خۆی هێزی تورک لە ژێر سەرکردایەتی ئەو سولەیمان پاشایەدا کۆچیان کردووە و چوونەتە خوارەزم و لەوێ لە پەنای سەلجووقییەکان بە سەرکردایەتی عەلائەدینی سەلجووقیدا ماوەی شەش ساڵ ماونەتەوە.

ئەمجا سولەیمان پاشا خەڵک و سوپاکەی خۆی گێڕاوەتەوە بۆ وڵات و زێدی باب و باپیرانیان و ویستیان نیشتمانی خۆیان ئاوەدان بکەنەوە. بەڵام لە گەڕانەوەدا سولەیمان پاشا خۆی لە چۆمی فوراتدا خنکا و نەگەیشتەوە وڵات.

ئەو کابرایە چوار کوڕی هەبوون و دوای باوکیان ناکۆکی و دوو بەرەکایەتییان لێ پەیدا بوو، لە سەر پلە و پایە و لە سەر ئەوە بچنەوە بۆ ئەنەدۆڵێ یان نا. تەغرەل لای وا بوو کە نەچنەوە و قۆڵێکی لە گەڵ بوون. هێندێکیشان دەیانگوت لێرە دەمێنینەوە و ئەوانیش بە تەنیا نەبوون. سەرەنجام بوونە دوو دەستە: هێندێک مانەوە و هێندێکیش چوونەوە. تەغرەل کوڕێکی خۆی ناردە لای عەلائەدینی سەلجووقی و داوای لێ کرد کە زەمینێکی باشیان بداتێ تا تێیدا دانیشن و بمێننەوە. ئەویش لە نێزیک ئەنقەرە ناوچەی (قەرەجەتاغ)ی بۆ دیاری کردن و ئەوانیش تێیدا نیشتەجێ بوون.

ئەو ڕووداوە لە ساڵی ٦٣٠ کۆچی مانگیدا ڕووی داوە. لە ساڵی ٦٦٧ کۆچی شەڕێکی خەست و خوێناوی لە نێوان سەلجووقی و مەغوولییەکاندا ڕووی دا. تەغرەل بە خۆی و هێزەکەیەوە کۆمەکی بە سەلجووقییەکان کرد و بو بە پشتیوانیان لە پاداشی ئەو ئەمەکناسییەیدا عەلائەدینی سەلجووقی ناوچەکانی تومانیج و ئەشکی شەهریشی هەر بۆ بڕدان و پێشکەشی کردن. لە ساڵی ٦٨٠ تەغرەل کۆچی دوایی کرد و عوسمانی کوڕی لە جێگەکەی دانرا و بوو بە سەرکردەی هۆز.

سەرەنجام عوسمان بوو بە دامەزرێنەری زنجیرەی دەسەڵاتدارانی عوسمانی و ماوەیەکی زۆر خۆی و کوڕ و نەتیژە و نەبیرە و نەدیدەو..کانی جڵەوی فەرمانڕەوایەتی تەواوی جیهانی ئیسلامیان بە دەستەوە بووە.

عوسمان لە سەر ڕێوشوێنی باوکی ڕۆییشت و هەروا بە هاوکارو یارمەتیدەری سەلجووقییەکان مایەوە.

سوڵتان عەلائەدینیش زۆرتری ڕێز لێ نا و دەسەڵاتی وی پتر کرد و هەروەها دەستووری پێدا کە لە هەرێمی خۆیدا دەوڵەتێک

پێک بێنێ و سەر بەخۆیەتی خۆی رابگەیەنێ و سکەش هەر بە نێوی خۆی لێ بدات و پێی گوت کە دەستوور بدا لە مزگەوتەکانا نێوی هەر دووکیان وێکڕا ببرێ و پێی گوت کە دەس بکا بە گرتنی وڵاتانی پتر و رزگار کردنی هەرێم و ناوچەکانی دیکە.

عوسمان بە دەستووری عەلائەدین دەستی کرد بە داگیر کردنی هەرێم و ناوچە و شارەکانەی وڵاتی رۆم. لە ساڵی ٦٩٩ کۆچی، دەوڵەتی سەلجووقی بە یەکجاری لە ناو چوو و شوێنەواری بڕایەوە. ئەمجا عوسمان سەربەخۆیی تەواوی راگەیاند و فەرمانڕەوا و کارگێڕ و کارمەند و پیاوە رامیارییەکانی دەوڵەتی سەلجووقی یەک لە دوای یەک پەیوەندییان بە عوسمانەوە گرت و بوون بە کارمەندی دەوڵەتی عوسمانی و ئیتر لە ساڵی ٦٩٩ بەو شێوە دەوڵەتی گەورەی عوسمانی پێک هات و ئەمجا پتر دەستی کرد بە ئازاد کردنی هەرێم و شار و گوندەکانی دەوڵەتی رۆم و هەموویانی ئازاد کرد و لێی تاپۆ کردن و جگە لە شاری قوستەنتەنییە هیچ جێگایەکی دیکە لە ژێر دەسەڵاتی رۆمیاندا نەمایەوە.

بەڵام ئەو شارە بە ناوچەکەیەوە تا ساڵی ٨٥٧ کۆچی مانگی (١٤٥٣ زایینی) کە بە دەستی سوڵتان محەمەدی دووهەم ئازاد کرا و کۆتایی یەکجارەکی بە دەوڵەتی رۆم هێنرا هەروا لە ژێر دەستیاندا مابوو.

دەسەڵاتی عوسمانییەکان هەر درێژەی هەبوو، تا تەواوی (شبە جزیرە)ی باڵکان و هەموو وڵاتانی یۆنان خرایە سەر وڵاتی پانوپۆڕی ئیسلامی و سوڵتان سەلیمی عوسمانی لە ساڵی ٩٢٣ کۆچی مانگی وڵاتی میسریشی خستە سەر وڵاتی عوسمانی و ئیتر جار دەگەڵ جار و رۆژ لە دوای رۆژ هێز و دەسەڵاتی دەوڵەتی

بەهێزی عوسمانی زۆرتر دەبوو و زیادی دەکرد و ئەو زنجیرە دەسەڵاتدارەی عوسمانی تورکی وڵاتی خۆیان وەها بەرفراوان کردبۆوە کە بەشێکی زۆری وڵاتانی ئۆروپاییشیان هەر چەندە موسڵمانیش نەبوون خستبۆ سەر وڵاتی خۆیان و دەسەڵاتی ئیسلامییان بە سەردا سەپاندبوون.

نێزیکەی سی کەس لە تورکان بە نێوی سوڵتان یا خەلیفەی ئیسلام یەک لە دوای یەک دەسەڵاتیان بە دەستەوە گرتووە کە هەوڵیان عوسمانی کوڕی تەغرەلە و لە ساڵی ٦٩٩ کۆچی مانگیدا سەربەخۆیەتی دەولەتی عوسمانی راگەیاندووە و دوامینیان موحەمەد رەشادی پێنجەمە کە لە ٢٦ی ئاوریلی ١٩٠٩ زایینی هاتۆتە سەر کار و تا کۆتایی شەڕی دوهەمی جیهانی کە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان پەلاماری وڵاتەکەیان دا و پایتەختەکەیان گرت و بە یەکجاری دەوڵەتەکەیان لە بەرێک هەڵوەشاند و کەسێکی بەکرێ گیراوی خۆیان بە نێوی مستەفا کەماڵ لە ئاسیای بچووکدا بە نێوی سەرکۆماری تورکیا دانا هەر پایەدار و بەردەوام بوو و درێژەی بە خەباتی خۆی دا.

موحەمەد رەشادی پێنجەم مرۆڤێکی زۆر هۆشیار و رامیارو لێزان و تێگەیشتوو و سەردەرچوو بوو، خەڵک زۆریان خۆش دەویست و میر و بەگەکانی دەوربەری خۆی بە لێزانی خۆی هەموو خستبۆ ژێر فەرمانی خۆی. بەڵام بارودۆخی ئەوسای رۆژگار جۆرێک هاتبۆ پێش و بە شێوەیەک وەرچەرخابوو کە ئەو مرۆڤە مەزنەی لە دوندی کێوی حەستەمی دەسەڵات و هێزڕا هێنایە خواریێ و دە خۆڵێی وەردا.

راستی دەوڵەتانی هاوپەیمان کە بریتی بوون لە ئەمریکا و رووس و ئینگلیز زەبرێکی وەها گرچووبڕیان لە پەیکەری ئیسلام و

گەلانی ژێر دەستە دا کە ئێستاش ژانی نەشکاوە و برینەکەی ساڕێژ نەبۆتەوە و هەروا پێیەوە دەناڵێ، بەتایبەتی گەلی کورد. ئەوەش کە دەڵێم هەرگیز بە مانای پەسند کردنی کاری ئەڵمان و هاوپەیمانەکانی نییە. بەڵام ئەوە راستەقینەیەکی مێژووییە کە کوردستان و گەلانی ژێر دەستەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست کەوتنە ژێر دەستی هاوپەیمانەکان و ئەوانیش لەباتی هەموو خزمەتێک خەیانەتیان پێ کردن و لە نێو دەوڵەتەکانی دۆستی خۆیاندا دابەشیان کردن و هەر بەشەی دایان بە دەوڵەتێک، بۆ نموونە کوردیان کردە پێنج پارچە و پارچەیەکیان دا بە تورکیان و یەک بە ئێران و یەک عێراق و یەک سوریە و بەشێکی لە هەمووان کەمتر شۆڕەوی بۆ خۆی هەڵیگرت و بلووچیان لە نێوان ئێران و پاکستاندا دابەش کرد شۆڕەوی کە ئەو بەشە کەمەی بۆ خۆی هەڵگرت بە پێی داخوازی چۆنیەتی هەڵکەوتنی جوگرافیایی مەڵبەندەکە بوو کە کەتبۆ ئەوبەری چۆمی ئارازێ و نەک لەبەر هیچ هۆیەکی دیکە...

شەڕەکانی یەکەم و دووهەمی جیهانی و بەتایبەتی شەڕی دووهەم پتر لە هەموو کەس بە زیانی موسڵمانان و کوردەکان تەواو بوو. گەورەترین دەوڵەتی دنیای ئیسلام لە بەرێک هەڵوەشا. کوردی بێچارە کرا بە پێنج پارچە. نیشتمانی کورد هەر وەک نیشتمانی ئیسلامی یەک پارچەیی خۆی لە دەس دا. عوسمانی و ئەڵمانییەکان بەڵێنی سەربەخۆیەتیان بە کورد دا و بەو بۆنەوە سەدان هەزار لاوی خوێن گەرمی کورد بۆ سەرکەوتنی وان خۆیان بە کوشت دا و بوونە دەستەچیلەی ئاوری شەڕی ماڵوێرانکەر، کەچی بەڵێنیدەران بە کوردان خۆشیان تێداچوون و جگە لە زیان و تێشکان هیچ شتێک بۆ کوردی هەژار نەمایەوە.

لەو شەڕو و هەرا و هالۆزی و پشێوییەدا زۆر کەس قازانجیان کرد و کەڵکی باشیان لێ وەرگرت و توانییان دەور و خولی چاخ بە قازانجی خۆیان وەرچەرخێنن. بۆ نموونە بەچە قەسحاو لە وڵاتی ئەفغانستانێ توانی خۆی بکا بە ئەمیری وڵات و لە دواییشدا نادرخان توانی ئەوی لە سەر تەختی فەرمانڕەوایی بێنێتە خوارێ و دە زیندانێی بکات و خۆی لە جێگەی وی دانیشێ و مستەفا کەمالٌ لە ئاسیای بچووک توانی ئەو دەوڵەتە بەهێزەی ئیسلامی لە بەر یەک هەڵوەشێنێ.

بەڵام هەر کورد نەیتوانی هیچ کەڵکێک لەو ژیوارە هالۆز و شێواوەی جیهانی بۆ خۆی وەربگرێ و بەڵکە خەڵک بە قازانجی خۆیان کەڵکیان زۆر لە کورد وەرگرت . کوردی بیچارەیان بەرەو هەڵدیرگە برد و چاویا ن بەست و بەقازانجی خویا بەولاولایا نیان دادا و خاکەکەشیان بەسەر خویاندا دابەش کرد و نەیان هیشت بە هیچ جور بیر لەحالی خوی وەکات. هەزاران شێخ و تەکیەو خانەگایان بۆ دروست کردن و بەجاری لە مزگەوتی خواو مەلای جی نشینی پیغەمبەرﷺ یان بری و دوریا ن خستەوەو لەریبازی راستی ئیسلام لایان دا.

هاتن و نیشتما نەجوانەکەیان بەسەر چوار و پێنج وڵاتی دراوسێدا دابەش کرد. نازانم بۆچی هیندیک کەس و گروپ و دەستەجات هەر دەڵێن چوار پارچەی کوردستان هەر دەلێی پی لەپارچە کوردستانە چکۆلەکەی ئەوبەری چۆمی ئاراز نانین، کە لەپێش دا بەشیک بۆ لەخاکی شورەوی پێشو و ئیستاش بەشێکە لە تاجیکسات، کە بەرای من شتێکی زۆر سەیرو سەر سورهێنەرە.

ن هەمیشە دەڵێم پێنج پارچەی کوردستان نەک چوار پارچە. ئەمەش پارچە هەڵبەستیکەکە لەو بارەوە چەند ساڵێک لەمەوبەر هونیومەتەوە:

## وڵاتی ئێمە

وڵاتـــــی ئیمــــە داگیـــــر کـــــراوە بـــە پێــنج دە وڵـــە تـــی چەپە ڵــدراوە
ئەو پێــنج دەولەتەش گــشتیا لــە ئیمــە د ڵیــا ن پڕخـــوین و زوخـــاوو کیمــــە
هەمـــــو زور دار و بـــــی بەزەیینــــــە د ڵیـــــان بەداخ و خەفەت وقینــــــــە
پینوسـیان شـکاندوین زمانیـان بریـوین لـە لیـزگەی گەلان نیـو یـان سـریوین
گەلیـــــک لە میـــــزە ولات تاریکـــــە ڕچـە ی ژیانمـان سـەخت و باریـکــــە
ناخۆشـــــە نـــاخوش ئەو ژینـــە تاڵـــە وەک ئـی نـا بەنـد و زینـدان و چاڵــە
پـــــردەرد وتوشـــــە یەکجـــــار دژوارە بـــــەژان و ئـیش و ئــــوف وئـــازارە
بـــی دە سـە لات و دیـل ویەخـسیرین بەوحــالەش گــشتمان لەیەک زویـرین
هەمومـــان بـــو یەک وەک دژمنـــا نـین لــە یەکترنـــاموو قەلـــس ونەبـــا نیـــن
بـۆدژمن نوکـە ربـویەک بەد ویـستین لەیەک نەیـــــار و ناخۆشەویــــــستین
زور بەقلیـــــسو کـــین لەگەڵ یەکتـــــرا بـــا ب وکوربـــو یەیەک برابـــو بــــرا
بۆیـــــە واتوشـــــە ژیـــواری ئـیمــــــە گــشتی خـەراپـــە کــــرداری ئیــمە
گەلیکـــــین گەلیـــــک لەیەک بلاویـــــن کلاوبــــی سـەرو ســـەبی کلاویــــن
هەزارمە خـــا بـــن لەژ یـــری دوریــــن بـو خەڵـک بـاش و بـو یەک نـا جـورین
لـــە بـــو بیگانـــان بەوینـەی جاشـین جاشـــی بەپــول وجاشــی بـەلاشـیـــن
یـە کجـار خـە راپ ودوریـن لـە چاکـە دلمـان پیکـە وە پـیس ونـا پـا کــــە

رون لەیەک نیـــیەویەک نەگرتـــوین　　پــرش وبــلاوو گە لیــک بەد خوێــن

هەرکەس ئەوی دی دەدابـــە نـــانی　　کەس ریزونــرخی کەســی نـا زانـــی
گــش خــوی پــی زورەی دی پــی کـەم　　کەس نالی توش هەی هەردەلی من هەم
گـــولی نیـــشتمان هەر بۆیـــە ژاکـــا　　کەس پـــشتیوانی لەکەســمان نـــاکـــا
گە ل بوپلمزیـــاگ نیـــشتمان چـــول بـــو　　تیخــی تیژی کــورد بەجاری کــول بـــو
ڕۆڵەی دڵـــسوزی دایکـــی نیـــشتمان　　کــوڕی گــیان فــیدا بۆ گــەل پــشتیوان

بەنـــا هـومیـــدی وا مـــا وەتە وە　　لـــەد ا خــا ن پــشتی چە مـا وەتە وە
هەزاران هەزار بونـــە قوربـــانی　　گیانیـان بەخـت کـرد بـو کوردستانـــی

پێشمەرگەی شەرەف بەجەرگ و نەبەز　　خــوی کـردە فیـدای نیـشتمان بــەلــەز
سـالەهـای سـالە بەسـەد رەنـگ وجـور　　لە سەرمان دەدەن گەلانی کــورد خــور
بـە نیـوی ئـەنفـال سـەدان سـەدهـەزار　　بـــە شیـمـیـــابارا ن زاروکـــی هـــەزار

پـــیر و جەوا نـــی ئەو نیـــشتما نـــە　　بـۆ گـولـلـەی د ژ مـن بونە نیشا نـــە

سـەدان پیـشەوا لـەو کـوردەی هـەزار　　لەسـەر مـافی کـورد بـرا نــە سـەردار

لاوی کــــورد کـــوژراوبرا لـــەیاری　　زۆر جـــار بـــەمافی کـورد کـــرا یـــاری
لاشـە کـورد کـەوتـن وەک گـەلاداران　　فـرمـیـســک رژان وەک تـاوی بـــارا ن
جـەنـدەکـی کـوردان بـەپـول وبـەکـو　　وەژیر خاک دران ، شیوەن و رو رو
بوتـــە بـــەکـــاری روزانـــەی کـــوردان　　هــە زا را ن لا شــەکەوتن لەمەیـــدان
دەت هەوی بزانی کورد چی بەسەرهات　　بچـو هەلەبـجە ی وا بـی دەنـگ ومـا ت
ببـــینە لاشـــەی کـــوردانی هەزار　　شیـمـیایـی لێـدراو بە دەستی بەد کـا ر
هـەزاران جــەنـدەک بـی سـوچ وتـاوان　　کەوتون لەمە یدان بی دە نگ و بی گیان
گـش ئـەو کوردانـەی خنکـا ن وکـوزان　　هەم ئەو خوینـا نەی بـــە نـاهـــەق رژان

تاوانیان تەنیا کوردایەتی بـو ‏ ‏ ‏ ‏ بو نیان لەسە رریی مه ردایەتی بـو
هـەزارا ن ڕۆڵـەی نەبەز وئـا زا ‏ ‏ ‏ ‏ شەهـید بـو لـە چـیاو بەنـدەن و رازا
هەزارا ن هەزار مـا لـە کـورد رمـا ‏ ‏ ‏ ‏ بـە بـومبـای دژمـن و لاتما ن جمـا
بهەسـە د ا ن هەزا ر کـورد ئـاوارە ‏ ‏ ‏ ‏ بو رو لـە ی بـەنا زما ن لی بیچا رەبـو
ئـەوەی بـە روالـەت یارمـەیشی دایـن ‏ ‏ ‏ ‏ بـە دا و ی بـزرو نا د یا ری خـنکا یـن
دراوسـییەکـانی پـەسـت و ستەمکـار ‏ ‏ ‏ ‏ دژمـنـی گەورە ن بـو کـوردی هـەژار
ئـەوانـە گەلـیک بـی بەزەیـینە ‏ ‏ ‏ ‏ ترسیـان نە لە خـوا ونە لـە دوای ژینە
ئـە وان هە مویا ن ویکـرا ها وکا ر ن ‏ ‏ ‏ ‏ بەلام مەخا بـن کـورد نا هـۆشیـارن
ئەوەنـدە ناچـار یـا خـو نەزانـن ‏ ‏ ‏ ‏ کـە دژمنـی خـو بەدوست دەزانـن
هینـدیک کـەس دەلـین ئـەوکوردستانە ‏ ‏ ‏ ‏ کـە جـیی پاکا ن و هەم بەهەستـا نـە
لە نیـو چو ار دە ولـە ت دا بەش کراوە ‏ ‏ ‏ ‏ بەڵام مـن دەڵیـم پێنجـی تـەواوە
بـە پـشتیوا نـی یەزدا نـی پـاکـم ‏ ‏ ‏ ‏ دەس هەلـنـا گـر م لـە بستی خاکـم
کەرکـوکی وەک بـوک د لـی ولاتـە ‏ ‏ ‏ ‏ بـو وگـە لـە کورد ە شـورەو قـەلا تـە
دەبـی ببیتـە پـی تـەختـی کـو ردان ‏ ‏ ‏ ‏ خـە با تگیرا نی مەرد لەنا و مـەید ا ن
جـا ئـەودەم گـورژی شـاد وخوشـحالە ‏ ‏ ‏ ‏ ئیتربـە س د ەکـا گـریا ن ونا لـە

دوای ئەو مەبەستە گرینگە دو با ئەو بەریزە دژ من رەوینە بادەدا تەوە سەر شیخ و هەلمەتی شیرانەی بو دەبا و دیسانیش رو ی دەپەلوسی. چونکە دەزانی کە دژ منی نا وخویەو خو بی گومان دژ منی ناوەخوش لە دژ منی لاوەکی کەمتر نییە . جا بەراستی ئەو بلیمەتە قارەمانەو ئەو مامۆستا بەڕێزە دەڵێی لە راوە بەرازێیە و چەندین دڕندەو کێوی پڕ مەترسی بۆ هەڵکەوتووەو نێزەیەکی گەورەی پێیە و لە سەری دارێکی گەورەی درێژی بەستووە و هەرچی

بۆی هەڵکەوت نووکە نێزەیەکی دەگەیێنێتێ، بەڵام یەکانەیەکی لە عەرزی داوە و هەر تاو نا تاوێک نووکە نێزەیەکی دە ورگی رۆ دەکا و دەیهەوێ بە یەکجاری بیتۆپێنێ و هەر بۆیە دەڵێ بە فێڵ و مەکری شێخی جادووگەر لەو رێگە راستە لامەدە، چونکە دین هەر شەریعەتە و تەریقەت نییە. تەریقەت نیزیکەی ٣٠٠ ساڵ دوای پێغەمبەر پەیدا بووە و ئەو هەموو رێچکە و مێچکە پیس و لارێیانەی کە بە نێوی شێخایەتی و تەریقەت یان بە نێوی ئایین هێناونەتە روو هەموویان خەراپ و هەڵەن. چونکە رێ واتا رێی ئیسلام تەنیا یەکێکە و نابێتە دوو، ئیتر قەت هەق لە یەک بەو لاوە نابێ. جا کەوایە هەرگیز لەو رێگە راستە لامەدەن و هەر وە دوای هەق و رەدا بکەون و هەقیش هەر تەنیا ئیسلامە و بەس و ئەو رێچکە و مێچکەش هەموو لە ئیسلام جیان.

جا لەو کاتەدا ئەو پارچە هۆنراوە ئینگلیسییەی خۆمم بیر کەوتەوە کە لام وایە لە زینداني ورمێ چەند ساڵ لەمەوبەر دامناوەو وا لێرەدا دەیگونجێنم کە هیوام وایە خوێنەری خۆشەویست پێی ناخۆش نەبێ.

رەنگە لە نەنگ و لەنگی و دەبەنگیش خاڵی نەبێ، بەڵام ئەو کاتی هەر ویستوومە خۆم بە تاقی بکەمەوە و گوتوومە: دابزانم دەزانم؟ جا ئەگەر هات و نەمزانیبوو، کە دەزانم ئێستاش هەر نازانم، هیوام وایە نەنگانم بۆ بپۆشن و لەنگانم بۆ راست کەنەوە و چەنگانم لە چەنەی نەنێن و رەنگانم لێ نەدەن و جەنگانم لەگەڵ نەکەن و هەنگانم پێ هەڵنەهێنن. چونکە جگە لە خوای گەورە هیچ کەس بێنەنگ و لەنگ و جەنگ و رەنگ نییە.

جا ئەوە تۆی بەڕێز و ئەوەش بەستە هەڵبەستە ئینگلیزییەکە:

Who am Iam Kurdish boy in my Kurdistan

مای ئین بۆی کوردیش ئەم ئای کوردستان
My nationally's home had was Akpatan
ئەکپاتان واز هەد هۆم ناشنالیز مای
Which I am very poor in my living
لیوینگ مای ئین پور وێری ئەم ئای ویچ
But I don't afraid fram Gil or killing
کیلینگ ئۆر جیل فرام ئەفراید دۆنت ئای بات
Rigor and Raile at way my country
کانتری مای وای ئەت رایل ئەند ریگۆر
To me is laik haering poetry
پوئیتری هیرینگ لایک ئیز می توو
Midya and Soran are my grand father
فاذێر گراند مای ئار سۆران ئەند میدیا
They were prensipall on land and biger
بیگێر ئەند لەند ئۆن پرنسیپال وێر دەی
My father Kawah killed Azhdahak
ئەژدەهاک کیلد کاوە فاذێر مای
At the lik way only he was wak
واک واز هی ئۆنلی وای لایک دی ئەت
My cuntrys sitys wich are byutifull
بیوتیفوڵ ئار ویچ سیتیز کانتری مای
Dyarbakr, Karkook, Oromyah, Mosull
موسڵ، ئۆرومیا، کەرکوک، دیاربەکر
Qamishlu, Halab, and kifry and wan
وان، ئەند کفری ئەند حەلەب، قامیشلوو

Kirmashan, Zangan with all Loorstan

لوڕستان ئەڵ ویت زەنجان، کرماشان

Many plac on land Kurdish contry was

واز، کانتری کوردیش لەند ئۆن پلاز مەنی

Laik wery tawn history tell us

ئاز تێل هێستۆری تاون وێری لایک

Tabriz at laster had was Kurdistan

کوردستان واز هەد لەستێر ئەت تەبریز

Laik mor and mor plac and Asfahan

ئیسفەهان ئەند پلاز مۆر ئەند مۆر لایک

Kurdish yung men Goorghy wery much

ماچ وێری گورژی مێن یانگ کوردیش

Laik hem country, tawn or villag

ویلەج ئۆر تاون کانتری هیم لایک

کوردییەکەی دەبێتە:

## کێم ئەمن؟

من کوڕی کوردم لەکوردستانەکەمدا
ماڵی نەتەوایەتیم ئەکپاتان بووە
ئەگەرچی زۆریش هەژارم لەژیانمدا
بەڵام نەترساوم قەت لە کوشتن و زیندان
قسەی سووک و جنێو لە ڕێی نیشتماندا
بۆ من وەک بیستنی هۆنراوە و سروودە
میدیا و سۆران باپیرەی گەورەی منن
ئەوان بگێڕ و هەڵسووڕێنەری لە سەر زەوی بوون

باوکم کاوە، ئەژدەهاکی کوشت
لەو رێیەشدا تەنیا ئەو هەنگاوی هەڵگرتووە
شارەکانی وڵاتم کە جوانکیلانەن
دیاربەکر و کەرکوک و ورمێ و موسڵن
قامیشلی و حەلەب و کفری و وان
کرماشان و زەنجان لە گەڵ هەموو لورستان
زۆر جێش لە سەر زەمینێ وڵاتی کوردبوون
وەکو و زۆر شاران ؛ مێژوو وامان پێ دەڵێ
تەورێزیش لە زۆرکۆنا کوردستان بووە
وەک گەلێک جێگا و هەم وەک ئیسفەهان
لاوانی کورد گورژی گەلێک زۆر
نیشتمانی خۆیان خۆش دەوێ جا شار بێ یا دێ

هۆنەرێکی لاوی موسڵمان دەڵێ:

مـــن هەمبـــێ قورئـــان و حەدیـــس
چـــیمە لە رێچـــکە و مـــێچکەی پـــیس
گە ر هە ڵیـــــشمواسن بە گـــــوریس
نـــاکەومە شـــوێن پیـــری نەگـــریس

ئـافەرین بـۆ بـاوەڕی ئەم گەنـجە کەلام وایە مەلا عەلـی بـاپیرە. هەرکەس بی من سوپاسی دەکەم . شێخ مەحمودی نەمر خـوا لێـی خۆش بێ کاتیک کە دەوڵەتـی کوردستانی دروست کـرد یاسـایەکی تایبەتی بۆ نەنوسی و فەرموی هەر یاسـایەک مرۆڤ بینوسێ لـە قورئان چاکترنابی وئیمە ش یاسامان لە قورئان چاکتر ناوی.

بەڕاستی ئەو پیرانە هەموویان نەگریس و پیس و تەپڕەشن و هەموویـــان مەبەســـتیان خـــواردن ولە نـــاوبردنی گەل وســـۆزی نەتەوایەتـــی وخەفە کـــردن یـــان کـــز کردنـــی هەســـتی ئیـــسلامەتی راستەقینەیە. چونکە هەرزێبازەکە ئەوەیە.

دەبینی چەند کەس هەریەکەی لە بەرێکەوە دەردەکەون بۆ ڕاوی و هەر یەکەشـــی بە ئامرازێـــک و هەریەکەی بە شـــێوەیەک ڕاوی گیانلەبەرە بێچارەکان دەکەن. یەک بە ساچمەزەن و یەک بە تاپڕ و یەک بە تاژی وتولە یان بازو باشوویەک بە داوویەکێک بەتەڵە و ئەوی دی بە تەپـــکە و ئەوی تـــریش هەربە بەرد و قۆچەقـــانی کە هەریەکەشـــی بە شـــێوەیەک گیانـــدارە هەژارەکـــان دانەخـــۆر دەکـــاو دەیانخەڵەتێنێ.

ڕاستی کەسێک کە جوان بیرلە مەسەلەکە بکاتەوە و کۆیی ئاسا شت بناسێ دەزانێ کە ئەو پیرو میرو ئەو هەموو ڕێچکە و مێچکە و ئەو هەمـــوو گـــروپ و دەســـتەجاتانە هەموویـــان نـــاڕەوا و گـــشتیان ناڕەدان و مەبەستی هەموویان هەر یەکە وئەویـــش کەڵـــک وەرگـــرتن لە خەڵک و لەوڕێیەشدا نەزان هێشتنەوەمانە.

هەموو زانا و ژیر و بەبیرێک ئەوە دەزانـــێ، کە هەق هەریەکە و نابێ بە دوو، خواش خۆی دەفەرموێ: (وماذا بعد الحق إلاّ الـضلال) لە دوای هەق و ڕەدا جـگە لە گـومڕایی چیتـر هەیە؟! جـائەوەیە کە دەفەرموێ:

دەمـــاغی منـــداڵەکان پـــڕ کەن لە حـــوببی وەتەن
تەربییەتیـــان بـــاش بـــدەن، میللییەتیـــان فێـــر بـــکەن
هەرچـــی سەرخۆشـــی بـــدا مەیخـــۆن ومەیخـــۆنەوە
ئێـــوە لە عەقـــڵ و لە مـــاڵ زۆر فەقیـــرن و بـــێنەوا

{بە قسەی جاهیلی نەفام بە مەکری شێخی جادوو
لە ڕێگەی راست لامەدەن ڕێ یەکە و نابێ بە دوو
شێخی فێڵبازی جاسووس دژمنی سەرکەوتنە
نەیاری میللییەتە ئەم قسە گەلێک رۆشنە
خودا یەکە و هەق یەکە و دینی بەهەق هەر یەکە
ئەی کوردە یەک ڕێ بگرە و ڕێی هەق و دەق هەر یەکە
ئێوە چونکە لە مێژە هەر لادەدەن لەو هەقە
لە چاو کەلانی دنیا بەشتان هەر زللە و شەقە}

مامۆستای خۆشەویست وبەڕێزمان ئەوەندەی باوەڕ بە ئیسلام و یاساکانی ئیسلام هەبووە کە هەمووشتێکی هەرلە ئیسلامدا دیتووەو لای وابووە کە دەبێ تەنیاکەسانێک جڵەوی کەشتی کۆمەڵ بە دەستەوە بگرن کە موسڵمان ودینداروجێنشینی پێغەمبەر بن. مەلای بە جێنشینی پێغەمبەر زانیوە و پێی وابووە، کە دەبێ جێنشینی ئەولە ڕێبازی وی لانەدا و هەر مەلاشە کە لێی لاناداوکێش لە ڕێبازی پیرۆزی پێغەمبەرﷺ بە موولایدا مەلا نییە ولە جیاتی ئەوەی کە خەڵکەکە بەرەو شارێگەی یەکسانی وکامەرانی بەرێ و کاروانی خەبات بە شەقامی یەکیەتی وبرایەتیدابئاژوێنێ بەرەو هەڵدێرگەی ناکۆکی و دژایەتی و دووبەرەکایەتی دەباوپیاوی واش بۆمەلا نابێ.

هەروەها کاتێک کە ئەرک و سپاردەی خۆی بە جێ نەهێناوە و نەیتوانی وەک پێغەمبەرﷺ خەڵک رابەری بکات مەلا نییە ومایەی بەدبەختی خەڵکە و سەرەنجام دژمنی گەل بە سەر گەلدا زاڵ دەبێ و زێد و نیشتمانەکەی داگیردەکا و گەورەیی وسەرداری وئازادی خۆی لە دەس دەدا جا هەر بۆیە بە داخ و کەسەرێکی زۆرەوە دەفەرموێ:

مەلا ئەگەر مەلا با دنیا بۆ وای لێ دەهات؟
ئەورووپایی چی دەکرد لە سەر قەتعەی رۆژهەلات؟

ئەمجـا هەروەک هەمیـشە دوای دەردە دڵێکـی گـشتی وخەفەت خواردنێـک بـۆ هەمـوو موسـڵمانان دێتەوە سـەر دەردە دڵ کـردن و خەفەت خواردن بۆ کورد و کوردستان و دەفەرموێ: چـونکە نەوتـی بابا گوڕگوڕی کەرکوکێ دەچێتە پاریسێ و بیـان و لاوەکـی دەیـبەن وکوردی هەژاریش هەروا بزەی چاوی دێ و لـەماڵی خۆیان بێبەش کـراوو دەبـێ تەنـانەت بـۆ پـڕی چـرایەکیش نەوت بە لارەملـی لە بەربێگانان وەپاڕێن و بۆ کەمێک لە ماڵی خۆیان زارە خوارە لە بەر بێگانان بکەن!! لە دەروونمـدا ئـاوری خەفەت و داخ وکەسەردایێسێ کە لە راستیدا دەبێ ئەوئـاورە لە دڵ ودەروونـی هەمووکـوردێکی بـە شەرەفدا بڵێسە ببەستێ وگڕبگرێ ودووکەڵ و چرەچەمانەکەی چاوی دژمنان کوێربکـا و هەمـوو کـوردی دنیـا وێکـڕا یەک دەنـگ و کـۆیی ئـاسا بڵێن و هـاوار بکەن:

نەوتـی بابـاگوڕگوڕی چـۆن دەچـێ بـۆ پاریـسێ
ئـاوری حەسـرەتۆمەندی لە دەروونـم دایێـسێ

{هەرچی لەم زەوییەدایە چاوە و کانی کوردستان
یـا هـیچ کەس پێـی نـازانێ یـانە دەیـبەن دژمنـان
چـۆن نەوتـی کرماشـانێ هەڵیلووشـی بیـانێ
تەواوی وەجەکـانم وەکـوو یەک دەکەن زانـێ}

ئەگەرکەسـێک بە وردی سـەرنجێکی جـوانی رەدا بینـانە بە کتێبەکانی دەستووری زمان (صرف و نحو)و زانیارییەکانی دیکەش بداوتەماشایەکی پەراوێزوکۆبە وراقەکانیـان بکـابۆی دەردەکەوێ کە زۆربەی هەرە زۆریـان پێویـست نـین وبە خـۆڕایی مێـشکی شـاگردی هەژاروفەقێی بێچارەیـان پێـوە خەریـک دەکەن وبەو شێوە تەمەنـی

بڕبایەخی لاوی فەقێ بەفیڕۆدەدەن!!

جا بەتایبەتی جاری وایە هۆنەرێک یان تەنانەت بگرە هەڵدەکەوێ کە پیرێژنێکی عەرەب هۆنراوەیەک یا وتەیەکی عەرەبی گوتووە وزانایانی بەناوبانگی ئەوزانیارییانە راڤەی دوورودرێژ و کۆبە و پەراوێزی زۆرگەورەیان لە سەرنووسیوە و توێژکاری وردیان لە سەرکردووە.

لەوانەیە پیاو بڵێ ئەگەر یەک لە دەی ئەو توێژینەوە و لێکۆڵینەوە و وردەکارییانەیان لەسەر پیشەسازی یان وەدیهێنانێکیان کردبایە، حاڵی خۆیان و گەلەکەیان لە جێیەکی دیکە دەبوو. دیسانیش دەڵێم بە داخەوە دژمن کاریکی وای کردووە، کە تەنانەت زاناکا نمانیشی هەرلە مەبەستی بنەڕەتی تا ڕاددەیەکی زۆر دورخستوتەوە!!

جا هەربۆیە مامۆستای لێزان و گەورەمان بەتایبەتی نێوی چەند کەس لەو زاناگەورانە دەباو دەیانداتە بەرتوانج و تەشەر و پێیان دەڵێ ئێوە بۆچی وەدوای شتی پێویست و مەبەست ناکەون و شتی ناپێویست چ قازانجێکی هەیە ؟ تەمەن کورتە و زانیارییەکان یەکجار زۆرن، دەبێ گرینگەکەیان بگری دەنا فریایان ناکەوی و پییان ڕاناگەی.

لە نێو تاقمی ڕوحانیدا باوە کە بێئەندازە، دوای شتی بێجێ و قونە قەیدوشتی نامەبەست دەکەون و وردەکارییەکی لە رادە بەدەرلە سەرمەسەلە جۆربەجۆرەکانی زانیارییەکانی ئیسلامی دەکەن و ئەوەندەی لێ دەکولنەوە، کە بەڕاستی لە تام دەردەچێ!! دەبینی هۆنراوەیەکی یەکێک لە هۆنەرە عەربەکان یان هەر وتارو قسەی پیرێژنە عەرەبێکی بۆنموونە لە سەر یاسایەکی زانیاری دەهێننەوە، پاشان ئەوندەی لێ دەکۆڵنەوەو وە دوای دەکەون کە

خودی ئەو یاساو ڕێسایە کە دەبێ تێیدا بەڕێوە ببرێت هەر بە یەکجاری فەرامۆش دەکرێ!! یا هەر لە بیردەچێتەوە، کە ئەو هۆنراوە بۆچی بە نموونە هێنراوەتەوە!! دەیان لک و پۆپی لێ دەکەنەوە و کات و هێزێکی یەجگار زۆر بێهودە بەخت دەکەن.

یان دەبینی کتێبێکی دەستور زمان (ڕێزمان و ڕێنووس) یا ڕەوانبێژی و ڕەوانخوێنی (بلاغە)، یا لۆجیک (منطق)، یان ڕیئۆنی (حکمت و فلسفە)و هتد دەیان ڕاڤە (شرح و تفسیر)ی لەسەر کراوە، کە هیچ پێویست نییە،بە سەدان کۆبە و پەراوێز و قونەقەیدی لە سەر نووسراوە و چەندین مەتەڵۆکەی لەسەر هێنراوەتەوە، کە جگە لەوە مێشکی روونی شاگردی بێچارە تێکوپێک دەدا و مەبەستی راستەقینەی لە بیر دەباتەوە و بە جارێکی هەموو شتەکەی لێ هاڵۆز دەکا هیچ قازانجێکی دیکەی نییە.

باوێکی دیکەی هەر زۆر لەوەش چەوتتر لە نێو مەلا وفەقێکانی کوردستاندا ئەوەیە کە زۆر بە کەمی خەریکی خوێندنی قورئانی پیرۆز دەبن و هێندێک وشکە سۆفی و مریدە مەلا، وایان بە خەڵک سەلماندووە کە قورئان هەموو کەس نایزانێ و هەموو کەس فێری نابێ و بۆ ئەوەی نابێ هەموو کەس دەسی تێوەردا و ئیتر نابێ هەر کەس قورئان بخوێنێ. دەڵێن قورئان سەتان تویێە و هەموو کەس ناتوانێ ئەو تویێانە هەڵداتەوە و بزانێ چیان دە بندایە!! کە دیارە مەبەستی ئەو هەڵوێستەش جگە لە دوور کردنەوەی خەڵک لە قورئان هیچ شتێکی دیکە نییە و خۆ ئیتر وای بە حاڵی ئەو موسڵمانەش کە دوور بێ لە قورئان و لە مانا و واتای قورئان حاڵی نەبێ!!

ئیتر ئەو مێشک وشکانە هەرگیز بیر لەوە ناکەنەوە کە هەرگیز شایستە نییە خوای گەورە شتی ئاوا بە زەحمەت و سەخت بۆ

خەڵک بنێری و خوا لەگەڵ خەڵک شەڕە مەتەڵۆکە ناکات!! هەر خۆشی لە قورئانا ئەفەرمێ: (و لقد یسرنا القرآن للذکر فهل من مدّکر) بەڕاستی ئێمە قورئانمان بۆ فێر بوون ئاسان کردووە، جا ئەرێ هیچ کەس هەیە فێری بێت!!

زانایانی بێگانە فڕۆکە وکەمی دەریایی و هەوایی وبێتەل ورادیۆو مووشەکی جۆراوجۆر و لەیزەر و بریسکە و هەزاران شتی گرینگە و گەورەی وەهایان سازکردووە کە پیاوسەری لێی سوڕدەمێنێ، بەڵام زانایانی ئێمە خودا پاداشیان بداتەوە هەر هاتن عەمر و زەیدیان تێک بەردان، لە ئاکاما ئێمەش هەموو شتێکمان لە دەس چوو وئێمە وەک گەلێکی لە گوێی گادا خەوتوو بێ ئاگا لە هەموو شتێک و ئیتر کانگا و چاوەکانمان لە دەس داو خەڵک بۆ خۆیان بردیانن و پێی پێشکەوتن و ئێمەش لە دواکەوتوویيدا ماینەوە!! گۆرژی گوتەنی:

پیشەسازی خەڵکی جیهانی وەها پێش خستووە
هەر گەلێکی پیشە نازانێ گەلێکە نوستووە

خوای گەورەمان دەفەرموێ: ﴿وَلَقَدْ صَرَّفْنَا فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ لِيَذَّكَّرُوا﴾ اسراء:٧١. واتا بەڕاستی ئێمە لەو قورئانەدا هەموو شتێکمان روون کردۆتەوە تا فێر بن و بزانن. دووبارە هەر لەو سووڕەتەدا دەفەرموێ: ﴿ وَلَقَدْ صَرَّفْنَا لِلنَّاسِ فِي هَٰذَا الْقُرْآنِ مِن كُلِّ مَثَلٍ ﴾ وە بەڕاستی روونمان کردۆتەوە دەو قورئانەدا بۆ خەڵک هەموو نموونەیەک.

راستی پیاوی ژیر کاتێ سرنج بداتە ئەو جۆرە ئایەتانە دەبێ خەجاڵەتی بکێشێ رێگەی خوێندنی قورئان لە خەڵک بگرێ. قورئان بۆ فێر بوون هاتووە وفێر بوونیش بۆ کردەوەیە، جا ئەوەیە کە

مامۆستا تووڕە دەبێ و پێمان دەڵێ ئێوە ئەوە خەریکی چین؟ ئەوەی ئێوە ئێستا بە نێوی دین و زانیاری دین خۆتانی پێوە خەریک دەکەن، هیچی نە دینە ونە دەستووری دینیشی لە سەرە. ئەنگۆ بۆچی ناچن زانیارییەکانی ژمێرامە و پێوانە (حساب وهندسە)و فیزیک و شیمی وزانیارییە سروشتی و پیشەسازییەکان و هتد بخوێنن؟!

جامامۆستا کاتێک کە ئەوەی بە چاوی خۆی دەبینێ مەنجەڵی لە کوڵی ناو دڵی پتروە کوڵ دێ وزڵقان دەداوئیتر بە خۆی نییە تورە دەبێ وجێی خۆشیەتی کە دەڵێ: ئەگەر ئێوەش وەک خەڵک پیاوبان دەبوو شتێکتان لە دەس هاتبایە و لەو هەموو ئاڵ و گۆڕەدا سەرە بەنێکتان وەدەس خۆتان خستبایە، ئێوە خیرەت نانوێنن وهەوڵ نادەن وتێناکۆشن، دەناکەسێک خیرەت بنوێنێ ووەخۆ کەوێ و هەوڵ بدا مسۆگەرە، کە خوای گەورەش سەرکەوتووی دەکات.(لیس للانسان الا ما سعی) فەرمودەی خوایە و شتیکی هە وانتە نییە، جا کوڵی دڵی ئەوجارەشی بەوجۆرە دەڕێژێ و دەفەرموێ:

بەچە قەساوو چاو پێکەوت چۆن بوو بە میری ئەفغان
لە ترسی وی هەڕای کرد مەلیک ئەمانوڵلاخان
نادرخانی جەنراڵیش بەچە قەسای ئەسیر کرد
تاج و تەختی ئەفغانی چلۆن بۆ خۆی تەسخیر کرد
ئێوەش ئەگەر پیاو بان چشتێکوو لە دەس دەهات
کەسێ خیرەت بنوێنێ خودا تۆفیقی دەدات
ئێوەن بێقەدر و قیمەت بێعەسکەر و بێعەلەم
بێتاج و تەخت و دەوڵەت ژێر دەستی کوللی عالەم
چونکە نانخۆری خەڵکی لە سەر ملک و ماڵی خۆت
خاکت هەموو مەعدەنە خۆت فەقیر و رووت و قوت

تـا کەی وەکـوو گـاجووتی لە ژێـر نیـری زیللەتـی
سەد حەیف و سەد موخابن لای خۆت ئەتۆش میللەتی
سووری مـوو زەردی چاو شین نەکەی بە ئومێدی بی
ئەووەڵ بە قـووەتی خـۆت دووهەم بە عەونـی رەببـی
عـیلم و عەمەل خـۆیەتی جەهـل و تەمبەڵـی مەرگە
پۆسـت و زەرگـان فـڕێ دە، وەعـدەی تـۆپ و تفەنـگە
ببـنە پـۆلیس و عەسـکەر بـۆ خزمەتـی مەفتەنـی
سـەعی و خیـرەت بـۆ وەتەن وەک روحە بـۆ بەدەنـی

مامۆستای بەڕێز وخۆشەویستمان خوا لێی خـۆش بـێ خەبـات و هەوڵ و تێکوشانی بۆ نیشتمان وەک گیان بۆ جەستە دانـا وە واتـا نیشتمانیک کە هەول و تێکوشانی بونە کری وخەباتی تـی دانـە بـی وەک جەسـتەیەکی بـێ گیـان وسـست و سڕو سـاردە وە بوویـە و ئەوپیـی وایـە وەک لـە ڕاستییـشدا هەر وایـە خەڵـک ئەو رو دەبـی شیوەی خەبـات بگـورن و ئیتـر چاخ چـاخی خورافـات و پڕو پـوچ پەرستی نییەو نابێ ئی دی لاوە خوین گەرمە باوەڕدارەکـان چـی دی وە دوای گەنـدەلە شـێخ و کۆلکـە مەلای لابــە لا بـکەون . چونکـە بەراستی وەک دەبینین، کە ئیتـرئەو نەزانانـە ؛ بەو جـۆرە هەمـوو خەڵکیـان خەڵەتانـدووە و ڕێـگەی پێـشکەوتن و دۆزیـنەوەی ڕازە نهێنییەکانیـان لـێ گرتـوون و نـاهێڵن موسـڵمانی هەژاریـش وەک بیانییەکـان بە پیـشەسازی و داهێنـان و دەرهێنـان و ڕاهێنـان و تازەییەکانەوە خەریک بن و بە تەمای کەڕامەتی شێخ و زانینی شتە نـا لەبەرچاوەکـان لەلایەن ئەووەوە وهەروەهـابە تەمـای نوشـتە وگـشتەک وازیـان لە هەمووشـتێکی سروشـتی هێنـاوە وسـەرەنجام هەمووشتێکیان لەدەس داوە وهیچیان بۆنەماوەتەوە !!

جا دەفەرموێ: ئێستا دنیای زانیاری و پیشەسازی و پێشکەوتنە. ئەم درۆو دەلەسە وفێڵ وفووتە باوی نەماوە ولە بەرابەر تۆپ و تەیارەدا کاریێ ناکەن. مەحوی ئاسا کەسێ بەردت پێدادا دەبێ بەرقی تێبگری، وەک دەڵێ:

شوکرهوشیارە مە حوی تێ ئەگا دنیا خەراباتە
کەسێ شێتانە بەردم تێگریێ من بەرقی تێئەگرم

ئیترلە کاتی بۆمبابارانێدا ئەگەر هیچت لە دەسدا نەبێ، کە داکۆکی و بەرگری پێ لە خۆت بکەی، دەبێ لانی کەم راکەیە ناو ئەشکەوتێک و خۆت وەشاری بپچیە بنەبانێ وخۆت حەشار بدەی و لەبێ دەسەڵاتیدا هەڵاتنیش جۆرە دەس کردنەوەیەکە.

پاشان ڕوودە کوردان دەکاتەوە و دەفەرموێ وازلەو فریودەرودرۆزن و دووزمان ودووڕوو وچەند ڕووانە بێنن و بەس فریوی وان بخۆن. ئێوە چەندین ساڵە وە دوای وان دەکەون ولە بەدبەختی و ماڵوێرانی و برسییەتی و هەژاری و نەداری و پاشکەوتوویی بەدەر هیچتان پێ نەبڕاوە کەوایە وەرنە سەر ڕێی ژیری و بیروهۆش و گۆش بۆخۆتان هەوڵ بدەن نانێک وە دەس بێنن، چونکە بە برسیایەتی وئاشەک (معدە)ی خاڵی چتان پێ ناکرێ وچێکڵدانی بەتاڵ راناوەستێ وهەر بە پەراستووی پڕەوە کاردەکرێ. داکۆکی وپارێزگاری لە گەل و زێد و وڵات پێویستی بە فیداکاری و لە خۆ بوردوویی و گیانبازی هەیە و ئیتر کێ ئامادەیە، کە شتێک هەر نەیهەوێ و خۆشەویستی نەبێ، بەڵام خۆی بۆ بە کوشت بدا و فیداکاری وگیانبازی لە ڕێگەی ئەو شتەدا بکات؟

هەروەها دەفەرموێ دڵ ودەروون و دەماغی منداڵەکانتان پڕ بکەن لە خۆشەویستی زێدو نیشتمان وهەستی نەتەوایەتییان فێر بکەن و

لە دڵیان بهاوێن وزۆرچاکیان پەروەردە بکەن وهەرچی کە سەرخۆشیو مەستی دەهێنێ دووری لێ بکەن و مەیخۆن و مەیخۆنەوە، چونکە ژیری و ئاوەزتان تێک دەچێ وبیروهەستی خۆشەویستی و تەنانەت لێک جیا کردنەوەی چاکە و خەراپەشتان نامێنێ ودژمن بە کەیفی خۆی بە سەرتاندا زاڵ دەبێ.

لە هەر وڵاتێکی میری، یان فەرمانڕەوایانی وڵاتەکە ناخەڵکی و دژی گەلی و ستەمکار وتەپرەش(خائن)ی گەل و وڵاتەکە بن خەراپکاری و ئامرازگەلی خەراپکاری و گوناح و تاوان و بێوێڵی لە وڵات نەک هەر بەرگری لێ ناکەن بەڵکە وە بایەخیشی دەخەن و برەویشی پێ دەدەن. چونکە دەیانهەوێ خەڵک و بەتایبەتی لاوەکان کە خوێنی پاکیان وەک حەوجۆشی نێو گرەپێچەی تەندووری نێڵدراو لە کوڵە و بەو هیوایەوە دەژین کە رۆژێک بێت ئەوانیش بتوانن وەک خەڵکی دیکە گەل و نیشتمانەکەیان بە پلە و پایەیەک بگەیەنن وە سەر فەساد و خراپکاری و بێهۆشی و سەرگەرمی بگێڕن تا هۆشی ئەوەیان نەمێنێ کە لەوان راسێن وبیانتاسێنن و داوای مافی خۆیانیان لێ بکەن.

لە دوای ئەوە دەفەرموێ هۆشتان بێ و بیربکەنەوە و بە قسەی پیاوی نەزانی و تێنەگەیشتوو مەکەن، چونکە نەزان تەنانەت بەشی خۆشی نازانێ و دۆستی نەزان لە دژمنی زانا گەلێک خەراپترە.

ئێوە بۆچی زانیاری سروشتیتان وەلا ناوە؟ لە حاڵێکدا، کە زانیاری سروشتی یەکێکە لە رۆشنترین وگەورەترین رێگاکانی خواناسی وخۆناسی و خەڵکناسی ،هەروەها یەکێکە لە گرینگترین رێبازەکانی فێر بوونی زانست و پیشەسازی و دیاریشە، کە پیشەسازی مایەی ناسین و دۆزینەوەی تازەکانی ئاشکرا و نهێنی

خودایە. هەروەک خۆی دەفەرموێ:

هەتـــاکوو نەبـــنە خاوەنـــدی ســـەنایع
هەمـــوو ئەنعـــامی خـــوا ئەڕوا بە زایـــع

بەڵێ ئەو بەڕێزە کە دەبینێ مامۆستایانی ئایینی لەباتی هەموو پێشکەوتن و پیشەسازی و وەدیهێنان و داهێنان وراهێنانێک هەر خەریکی کۆبە و پەراوێزلە کتێبە کۆنەکان نان و پەراوێز نان لە دیوانی هۆنراوەی ئیمرِوئولقەیس و زوهەیری ئەبووسەلما و تورفەی کوڕی عەبدی بەکری و عەمری کوڕی کولسومن دەیانداتە بەرتوانج و پلارودەفەرموێ:

بڵێـــنە ســـیبوەیهی و مـــازەنی و خـــالوەیهی .
کانی نەفتین لە کیس چوو بە ریشی نەفتوەیهی
ئەتۆ و خودا پێم بڵێ مامۆستای رووت و برسی
هیچ ئیشی تۆ پێکدێنێ شیعری ئیمرۆئولقەیسی
کەرامەت کەڵکی نەما لە گەڵ تۆپ و تەییارە
عولەمـــایی تەبیعـــی شـــوێنیان ئەودا دیـــارە
کاکە ئەم عەسرە نەما برام ئەو دەورە رۆیی
شێخ لە هەوادا دەفڕێ یا لە سەر ئاوێ رۆیی
درۆ فاییـــدەی نیـــیە وەعـــدەی بۆمبـــا بـــارانێ
راکە لە بـــۆ ئەشـــکەوتێ غـــار بـــدە بـــۆ بنەبـــانێ

نازانم بۆچی مامۆستاکان زانیارییە بەکەڵکەیان وەلا ناوە و هەر نایخوێنن!! وە هەروەها نازانم چ قازانج وسودیکیان دەو هەمووە دوا کەوتنەی زانیارییە کانیوە ک(نحو وصرف وهتد)دا دیوەتەوە !!

مامۆستا گوتەنی:

مەلای نـــــادان بە عینــــوانی شـــــەریعەت
حەرامـــی کـــرد لە تـــۆ عیلمـــی تەبـــیعەت

بە داخەوە مەلای کـوردەواری ئەوەنـدە وەدوای شـتی نـاگرینگی وەکوو رِێزمان و رێنووس (صرف و نحو) وکەشف وکەرامەت دەکەون کە وێراناگەن هیچ زانیارییەکی بەکەڵک فێربن !! چونکە نا وەندێکی فێرکاریش لەوڵات دانییە وهەر کەس بە سەلیقەی خویدە خـوێنی و ووانـە ویـژی دەکا کەس نییـە لەوەهلـە روییـە بییـان گێرێتـە وە و بەراسـتی تەنـانەت فێـری شـێوەی راگەیانـدن و بانـگ کـردنیش هەرنابن و بە داخەوە لەبەرئەوەی، کە گرینگترین کاری وانە زۆر و زۆرتـر کۆڵینەووکـۆبە وپەراوێـز و قـونە قەیـدە نـاتوانن وەدوای زانیارییە بەکەڵکەکان بکەون و بیانخوێنن. بەڵێ رێزمان و رێنووس پێویستە، بەڵام بەمەتەلەی کوردی : هەمووشتێک بە خوێ وخوێش بە مانا.

گەورەتـرین زاناوپـسپۆری ئیـسلامیش ئەگەر تەنـانەت لە شـاری کەرکـووک و کرماشـانیش بـێ دەبـێ شـەوێ لە تاریکیـدا دانیـشێ و نـاتوانێ پـری فتیلەیەکـیش لەو هەمـوو نەوتە زۆرە هەڵینجـێ و کەڵکی لێ وەربگرێ!! جا بۆیە مامۆستا تووڕە دەبێ و دەڵێ:

بلێـــــنە ســـــیبوەیهی و مـــــازەنی و خـــــالوەیهی
کـانی نەفتـین لە کـیس چـوو بە ریـشی نەفتـوەیهی
ئەتـۆ و خـودا پـێم بلـێ مامۆسـتای رووت و برسـی
هـیچ ئیـشی تـۆ پێکـدێنێ شـیعری ئیمـرو ئولقەیـسی
کەرامەت کەڵکـی نەمـا لە گەڵ تـۆپ و تەییـارە
عولەمـــایی تەبیعـــی شـــوێنیان ئەودا دیـــارە

یان دڵسوزانە ڕیگەمان نیشان دەداو دەڵێ:

عیلمـــی بخـــوێنە بـــۆ گەلـــت چـــا بـــێ
گەل و مەفتەنـــــت بەو عـــیلمە شـــا بـــێ

جا ئەو بەڕێزە، دڵسۆزانە پێمـان دەڵـێ، کە بەسیەتی وچیـدی وە دوای ئەو جـۆرە شـتە پڕوپووچـانە مەکەون، چـونکە دەورە وچـاخی شتی نەماوە.

مامۆسـتا لەو چەنـد تـاکە هـۆنراوەی دواییـدا ئامـاژەی بـۆ ئەوە دەکا کە شێخە فێڵبازەکان بە درۆ و دەلەسە خەڵـک دەخەڵەتێـنن و چاویان دەبەستن کە بەڵـێ ئەون بە کەرامەت چ دەکەن و چ ئەنجـام دەدەن بە حەوادا دەفڕن و لە سەر ئاوی دەڕۆن.

# روون کردنەوەیەک لە سەرئەفغانستان

ئەفغانـــــــستان ئەم وڵاتە یەکـــــێکە لە وڵاتە هەژارو نەدارو زۆرلێکراوەکـانی ئیـسلامی کە لە رۆژهەڵاتـی ئێـران ولە بـاکووری پاکـستان وباشـووری تاجیکـستان وئۆزبەکـستان و تورکەمنـستان هەڵکەوتـــووە و مـــاوەیەکی زۆریـــش هەربەشـــێک بـــووە لە هیندوستان،هەر بۆیە کەسێک بیهەوێ مێژووی ئەو وڵاتە لێکداتەوە دەبێ لە پێشدابە مێژووی هیندووستاندا بچێتەوە.

لەووڵاتەدا هەمیشە دەوڵەتەکانی شورەوی و پـێش ویـش تەزاری رووســـی و ئینگلـــستان بـــۆلە ژێردەســـتی خۆنـــانی پادشـــایان و ئەمیرەکانی وێ ململانەیان کردووە وگەلێک لە وابەستەکانی خۆیان لەوێـدا بە ئەمیـری گەیانـدووە وبەو جـۆرە هەمیـشە دەسـتیان لەو وڵاتەدا هەر هەبووە و خۆتی هەڵقوتاندنیان کردووە.

پادشـــایان و ئەمیرانـــی زۆری هەواداری ئینگلـــستان هـــاتوونەتە سەرکار. بۆ نموونە ئەمیر عبدالرحمن کە هەتـا سـاڵی ١٩٠١ زایینـی هەرلە سـەرکاربووە و دوای ویـش ئەمیرحبیـب اللـه بە پادشـایەتی گەیـشتووە. کێـشە و بەرە و ململانـێ و رەقەبەرایەتـی لە نـاوەوەی وڵاتدا هەر هەبووە و ئاوری ئاشووب وئاژاوەی ناخۆش لە بـنەوەدا هەر ئایساوە و سـەرەنجام لەو نێـوەدا ئەمیـر حبیـب اللـه کـوژرا و برای وی ئەمیر نـصرالله بە دەسـەڵات گەیـشت کە ئەویـش زۆر زوو بەرکەنار کرا. پاشان یەکێک لە کورە لاوەکانی حبیب الله بە نێـوی امان الله خـان لە جێگەی مامی بوو بە فەرمـانڕەوای ئەفغانـستان و زۆر کاری باش و ئاڵوگۆڕی جوانی لە نیشتماندا وەدیهێنان.

امان الله خان زۆری کار کرد بۆ ئەو وڵاتە و سەرەتای کارەکانی ئەوە بـــوو، کە پەلامــــاری بـــردە ســــەر هێزەکـــانی ئینگلـــیس لە هیندوستان و بە کردەوە نیشانی دان کە ئیتر ئەو ژێر چەپۆکەی وان نییە و سەربەخۆیەتی وڵاتی ئەفغانستانی دەوێ. ئەو هەڵمەتەی لە مانگی مەهی ١٩١٩ زایینیدا بوو.

امـان الـلـه خـان رامیـارییەکی وەهـای گـرتە پـێش کە بە زوویـی سرنجی خەڵکی بۆلای خۆی راکێشا و هەرچەندی تـوانی نوێکـاری و خاوێنکاری لە وڵاتدا ئەنجام دا.

لە سـەرەتای سـاڵی ١٩٢٨ زاییـنیـدا مەلیـک امـان الـلـه خـان بـۆ سەفەرێکی دوور و درێژ ئەفغانستانی بەرەو ئەورووپا بەجێ هێشت. بەڵام لە مـاوەی دیـار نەبـوونی ویـدا لە لایەن بەکـرێ گیراوانـی ئینگلـستانەوە پڕوپاگەنـدەیەکی یەکجـار زۆر لە دژی وی دەکـرا و ئـاژاوەی لە سـەر کـار لابرانـی وبیـان دەگێڕا. پـاش مـاوەیەک ئەو هـاتەوە بـۆ وڵات و بەرژەوەنـدی و کـارە گرینگەکـانی خـۆی درێـژە پێدایەوە.

سـەرەنجام لە کۆتـایی سـاڵی ١٩٢٨دا شۆڕشـێکی گەورە دەسـتی پێکـرد و لە ژێر رابەرایەتـی کەسـێک بە نێـوی بەچە قەسـاو کـاری خۆی دەس پێکرد و لە ساڵی ١٩٢٩دا سەرکەوت.

امان الله خان بە خۆی و خـاوخێزانییەوە هەڵات و بەچە قەسـاو بوو بە ئەمیری ئەفغانستان. بەڵام ئەو کـابرایە تەنیـا پێـنج مـانگ تـوانی رابەرایەتـی ئەو وڵاتە بە دەسـتەوە بگـرێ. چـونکە هەر دوای پێـنج مـانـگ یەکێـک لە شـالیارەکانی امـان الـلـه خـان بە نێـوی نادرخان لێی راپەڕی و لە سەر کاری لابرد.

بەڵام ئەو هەر بە قازانجی خۆی راپەڕینی کرد و امان الله خانی نەهێنایەوە سەر کار، بەڵکە خۆی بە نێوی نادرشا لە سەر تەختی دەسەڵات دانیشت.

ئەمجا دووبارە ئاژاوە لە وڵاتدا سەری هەڵدایەوە بەڵام چونکە نادرشا دۆستی نیزیکی ئینگلیسییەکان بوو و زۆریان یارمەتی دەدا توانی خۆی راوەستاو بکا و بمێنێتەوە.

سەرەنجام لە ساڵی ١٩٣٣ زایینی (١٣١٢کۆچی هەتاوی) محەمەد زاهیر شا بە دەسەڵات گەیشت. لە ساڵی ١٣٥٣ هەتاوی (١٩٧٣ زایینی) داود خان کە بە یارمەتی شوڕەوی و کومونیستەکانی دیکە هاتە سەر کار و لە راستیدا ئەو ریگای بۆ خو لە باوەشی کومونیستی هاویشتن ئەفغانستان خۆش کرد و لە ١٣٥٧ (١٩٧٨) کومونیستەکان بە رابەرایەتی نوور محەمەد تەرەکی کودەتایان کردو سەرکەوتن و ئەمجا لە ١٣٥٨ (١٩٧٩) بە بڕەک کارمەل بە وەلانانی حەفیروڵلا ئەمین هاتە سەر کار.

جا مامۆستا کۆیی هەموو شتێکی بە چاوە زیت و زەقەکانی خۆی دیتووە و لە بەرابەر هەر رووداوێکدا هەڵوێستی گرتووە و خۆی بێلایەن نیشان نەداوە.

وەک دەبینین هەر لەو پارچە هەڵبەستەدا دەستوورات و یاساگەلێک بۆ کوردان دادەنێ و پێیان دەڵێ مێشکی منداڵەکانتان لە خۆشەویستی نیشتمان پڕ بکەن و بە کوێرایی چاوی کەم بینی ئەو نۆکەرانەی بێگانەکە پێیان وایە خۆشەویستی نیشتمان و گەل دۆستی و نەتەوە ویستی دژی ئایینی پیرۆزی ئیسلامە.

جا هەر بۆیە مامۆستای خوا لێخۆشبوومان دەفەرموێ منداڵەکانتان باش رابێنن و فێری سۆزی نەتەوایەتی بکەن و مێشکی پاکیان بە بیر و هەست و سۆزی نەتەوایەتی و نیشتمان پەروەری ئاو بدەن کە ئەوە خۆی ئایینە نەک دژی ئایین.

نازانم هێندێک کەس بۆچی هێندە بیرکورتن بۆ مەگەر موسڵمانان لە سەریان پێویست نییە بەرگری و داکۆکی لە خاکی پاکی ئیسلام و لە سنوورەکانی ئیسلامی و لە گەلی موسڵمان بکەن؟ مەگەرئەوە بە مانای ئەوە نییە کە دەبێ موسڵمان خۆشەویستی گەل ونیشتمانی ئیسلامی دە دڵدا بێ؟ کە بە بێ ئەو خۆشەویستییە ئەو داکۆکی نەگونجاو و ناهەڵسووڕاوە.

بەڕێزبێکەس هۆنەری کورد دەڵێ:

داری ئازادی بە خوێن ئاو نەدرێ قەت بەر ناگرێ
سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەرناگرێ

ڕاستی دەبێ ئەو ڕاستەقینەش قبوڵ کە ین کە ئەفغانستان هەرچەند لەبار فەرهەنگی و ئابوری گەلیک لەپاشە بەڵام لەبوار وبەستینی ئایینی و بیر و باوەڕەوە، تا ئەوجییە پتەووبەهیزە، کە تا ئیستا چەند جار خوی قوربانی ئایین و بیر و باوەری ڕاستەقینەی ئیسلام کردووە ولەگەڵ چەند زلهیزی ملهوڕی زۆردارو داگیرکەر بەشەڕ هاتووە و لمبوزیش پی دەخولێ وە رداون وە لە وڵاتی خوی وەدەر نا و نەتەوە.

هەر لە دەورانی ئیمە داو، کە بە چاوی خۆمان دیتومانە لەگەڵ دو دانە زلهێزی ملهوڕی کەلەگای جیهان واتا شورەوی و ئەمریکا دا بەشەڕها تووە و خەباتی خوایی خۆی درێژە پیداوەو سەری بۆ هیچ لایکیان شوڕ نەکردووە و مەردانە لەسەر ڕێبازی ڕاستەقینەی ئیسلام تەنانەت زۆر بە ماندویی و.شەکە ژوییش هەر ڕۆییشتووە .

# پەیام بۆ ئەفغانستان

دڵـــم پرپـــڕ لە خـــوێن و هەم زووخـــاوە
خەم و داخ و جخـــــــــــارم زۆرە ئەوڕۆ
دەبـــا بگـــریم بنـــاڵێنم بە دڵ مـــن
شـــەپۆڕ و شـــین و زایەڵەم لە تـــاوان
بەخـورِ بێـت و بەگـورِ بێـت بـۆ موسـڵمان
بـــکەم هـــاوار لە بـــۆ تیپـــی هەزاران
برێـــژم ئەشـکی سـوور و سـوێری چـاوم
وەهـا هەڵکێـشم گەر خـوێنی لەگەڵ بێ
لە بـــــۆ ئەفغانـــــستانی زۆر بەرێـــــزم
لە بـــۆ زێـــدی موســـڵمانانی چـــاکم
ئەفغانـــستان وڵاتـــی پـــڕ لە دیـــنم
چلـــۆن چـــاوم بە تـــۆ هەڵبێ ئیتـــر مـــن
رەهـــێڵەی مووشـــەک و بـــۆمبی ملـــۆزمی
درنـــدەی لاشـــەخۆری بـــێبەزە و پەســـت
بە گـــش هێـــزێکەوە هـــاتوونە مەیـــدان
هەتـــاکوو تـــۆ بە بۆمبایـــان وەکـــێڵن
دەڵـــێن نـــابێ موســـڵمان بێـــژێ مـــن هەم
تەواوی گاورەکـــان و بـــتپەرەســـتیش
تەواوی تەپـــــــرەش و دووڕوو و درۆزن
منـــیش ئەفغـــانی دینـــدار و بەرێـــزم
کە مـــن کـــوردم لە کوردســـتانی گەورە

بە بـۆم و مووشـەک و تانـگ و فـڕۆکە
هەمـووی کێڵـڕاوە چەن گاسـنەش کـراوە
بـرای ئەفغـانی مـن بـۆ تـۆ پەرۆشـم
هـۆ ئەی هـاوبیر و هاوئـایین و دەردم
هەچەنـدی دژمنـی ئەو دیـنە پـاکە
لە مـن راسـاوە لێـی داوە لە سـەر دیـن
هەچەنـدی مووشـەک و ناپـاڵمی دژمـن
لە دووڕرا گەر دەبیـنم دێـنە خـوارێ
هەمووش دەدرێن لەجەرگو دڵ و هەناوم
ئەرێ ئەفغانییەکـانی رووت و بـێمـاڵ
بـکەن شـانازی بەو حـاڵە شـەلاڵە
بە خـوا ئەو ئـاورەی بەربـۆتە ئێـوە
گـڕە و بەردراوەتە گیـانی موسـڵمان
دژی ئیـسلام و قورئـان و خـودایە
بە زۆری و ملهـوڕی و هێـز و توانـا
دەبـێ گـشتی موسـڵمان نـۆکەرم بـێ
دەبـێ نەوتـی ولاتـانی موسـڵمان
کە ئینگلـیس پیـری کەمتیـاریش بەدوودا
بە دووڕوویـی لە دووی تێـرۆر چیـانن
ئەوەیـی دەیڵـێن رواڵەت درۆیە بـایە
هەق وراسـتی و رەدا ئەورۆ نەمـاوە
بەڵام ئەی قوربەسـەر ئەو دژمنـانە
چلـۆن ئەو بیـرە پووچـانە وەهـایە
لە کام بیـرگە و لە کـام یاسای مرۆڤـدا
خەڵـک ئـاوا بە گەل کوشـتن رەوایە

چلــۆن ئەو بێــرە پووچـــانە قەبـــووڵە
خەریکــن ســاز بــکەن جەنگێکــی تــازە
بە جۆرێـــک زنجیـــر کەن دە پـــێ خەن
ئەگەر وابـــێ بـــزانن قـــورِ بە ســـەریان
ئیتـــر ئیـــسلام لە نـــاو نـــاچێ بەوانە
لە رێـــی ئەو ئـــایین و زێـــد و وڵاتە
ئیتـــر هەرکەس موســـڵمانە لە جیهـــان
هەمـووی هەروا بە بیر و هەست و هۆشی
چلــۆن نەکــوڵێ دڵـــی لاوی موســـڵمان
ژن و منـــــداڵ و پیرێـــژنەی فغـــانی
لە ترســـی وەی نەوەک ببـــنە بەهێـــزێ
بە گـــاز و مووشـــەک و بـــۆمبی ژەهـــردار
ســــتەمکارن ئەوانە پەســـــت و دوو ڕوو
ئەوەنـــدە پەســـت و بـــێویـــژدان و دیـــنن
بـــڕۆن ئەی رێـــویە پیـــرەی رۆژئـــاوایی
نە ویژدانتـــان هەیە نە خـــواش دەناســـن
لە ئەمریکـــا و لە ئنگلیـــستانی خۆتـــان
ئیتـــر گـــورزی شـــەو و رۆژێـــی نـــزایە
خـــودایە خـــاکی ئینگلیـــستان وەکـــێڵە
هەموویـــان بێـــنە ســـەر رێبـــازی ئیـــسلام

نەمـــامی بـــوونی پـــڕ هیـــوام ژەکـــاوە
دەروونیـــــشم پـــــڕی ناســـــۆرە ئەورۆ
بـکەم زاری لەگەڵ شـیوەن بە کـوڵ مـن
وڵاتـــی پـــڕ بکـــا و ئـــاوم لە چـــاوان

موســـــڵمانی هەزاری خـــاکی ئەفغــان
بنــــــــاڵێنم لەتــــــــاوی دەردەداران
هەناســـەی بۆســـۆداری دڵ و هەنــاوم
هەناســێکی وەهــا گــشتی دووکەڵ بــێ
دەبــا بگـــریم هەتـــاکو مــاوە هێــزم
بـــرای ئەفغـــانی لەم رۆژگـــارە تـــاکم
دەبـــێ بمـــرم کەوا ئـــاوات دەبیـــنم
کەوا کەوتـــوویە ژێـــر دەســـرێژی دژمـــن
لەســەر تــۆیە ئەتــۆش خــۆهەر لەهــۆزمی
چ ئەمریکــا و چ ئینگلــستانی بــێهەســت
تەواوی نۆکەرانیـــــــشیان لە گەڵـــــدان
لەســـەر ئەو خــاکە ئیــسلامێک دەهــێڵن
بڵـــێ هەم مەرجەمـــن ناپـــاڵمی لێـــدەم
موســــــڵمانی نەزان و دوورە هەســــتیش
دژی تـــۆ بـــوونەتە هاوکـــاری دژمـــن
لەرێتــا بەخــت ئەکەم گــش تــین و هێــزم
گەلـــێکم دیـــوە ئەو ســـووڕان و دەورە
کەژ و دەشـــت و چیــا و دۆڵ و خــرۆکە
بەشـــی منــیش هەروەکــو ئــی تــۆ بــڕاوە
لە تاوانـــــت نەمـــــاوە بیـــــر و هۆشـــــم
وەکـــو خـــۆم دەردەدار و رەنـــگ زەردم
لەتـــۆ راســـی ئەمـــن پـــێم وایە کـــاکە
موســـڵمانان دەبــا گــشتمان وەهــا بــین
لە تـۆ دەدرێ لەســەر دیـن و لەســەر مـن
دەڵێـــی گـــشتی بەســـەر منـــدا دەبـــارێ

لە سینە و سەر، لە باڵ و ران و چاوم
هەزار و دەربەدەر دیندار و ژین‌تاڵ
کە بۆ خوایە هەمووی ئەو ژینە تاڵە
دەسووتێنێ ئەوەی ئیسلامی نێوە
موسڵمانی هەموو جیهان و ئەفغان
سەرەی ئاژاوەگێڕان ئەمریکایە
دەڵێ ئیسلام نەمێنێ لەم میانا
کە نابن وەرگری گوللەی گەرم بن
هەڵیلووشین لە بۆ پاراوی دڵمان
کە هەر ئاوا بوو بیری ویش لە زوودا
لە ماکیشا نەیاری دین و ژیانن
ئەوەی من پێت دەڵێم بێ‌سۆ وەهایە
ستەمکاری بەهێزە خێوی باوە
نەمان بۆو ترسەنۆکانەی ژنانە
مرۆفگەل قڕ کرێ کەنگێ ڕەوایە
لە کام فێرگە و لە کام ڕێسای مرۆڤدا
هەزار نەفرین ئیتر لەو ئەمریکایە
تەواوی کاری وان بۆ ماڵ و پووڵە
بە شێوەی نوێ و ئیتر بەو سازوبازە
چەلیپاییێکی دیکەن بۆ وەڕێ خەن
سەلاحەددینێکی دیش دێتە سەریان
بە بۆمبارانی گش ڕۆژ و شەوانە
موسڵمان گشتی ئامادەی خەباتە
پەرۆشە بۆ موسڵمانانی ئەفغان
هەتا ماوە لە بۆ دین تێدەکۆشێ

لە تــاو ئەفغــانی ژێــر بــارانی بۆمبــان
ئەوا زلهێــزی ســەر کــوفری جیهــانی
موســـڵمانی جیهانیـــان بێـــنە ڕێـــزێ
شــەو و ڕۆژ دەیرشــێنێ پەســتی بەدکــار
شــەو و ڕۆژ بەربــوونە گیــانی مــن و تــوو
نەیــاری ئاشــتی و یەکــسانی ژیــنن
کە ئێـــوەن دژمنـــی ئاشـــتی و تەبـــایی
لە دەســـتی ئێـــوەدا خەڵکـــان کەساســـن
خەڵـــک پێـــو دژمـــنە چـــی مـــاوە بۆتـــان
خـــــودایە هەر نەبـــێ ئەو ئەمریکـــایە
لە گـــاوران تـــاقە یەکێکـــیش مەهـــێڵە
بـــرا بـــن بـــۆ مە ســـا گـــشتیان ســـەرەنجام

**مەهاباد ـ ١٢ ڕەزبەری ٢٧٠١ی کوردی[١]**

١ ــ مـن بۆخـوم ڕام وایە کە هەرگیـز موسـڵمانان نـابێ خۆیـان دە باوەشـی زلهێـزە گاورەکان باوێن و هەر وەها نابێ دڵیشیان پێ خۆش بکەن. چونکە بەڕاستی ئەوان دوژمنی ئیـسلام و موسـڵمانانن و بـۆ قـازانجی خۆیـان نەبـێ هـیچ کـارێکی نـاکەن. بەڵام دەکـرێ موسڵمانان هۆشیارانە و زیرەکانە دۆستیان بن و کەڵکیان لێ وەربگرن و بۆ قازانجی خۆیان لە گەڵیان ڕێ ببڕن.

هـیچ گومـان لەوەدا نییـە کە ئـێ وا هەیە ئەو قـسانە و ئەو هـۆنراوانە پەسـند ناکـا و بەتایبەتی لەبارەی ئەمریکادا و بە داخەوە پێی وایە ئەو فریشتەی ئازادییە. بەڵام من دەڵێم: مەگەر فەرهەنگی پێشکەوتووی ئەمریکا نێربازی نییە؟! دەیجا بە کوێی هەڵبلێم؟!

# روون کردنەوەیەک لەسەر ئەو زانا ناو براوانە

## سیبویە:

ئەو بەڕێزە کونیەی ئەبو بەشیر و ناوی عەمرە و کوڕی عوسمان کوڕی قەمبەرییە و نازناوی (سیبوەیهە) پێشەوای ڕێزمان و ڕێنووس (نحو وصرف)ە ئەو زانایە زانیاری ڕێنووسی (نحو) لە خەلیلی کوڕی ئەحمەد و عیسای کوڕی عەمر و یۆنسی کوڕی حەبیب فێر بووە و هەروەها لە ئەخفەش و چەند ناوداری دیکە زانیاری وشە (لغة) و هتد فێر بوە.

لە ساڵی ١٩٤ کۆچی مانگیدا کۆچی دوایی کردووە و تەمەنی تەنیا ٣٢ ساڵ بووە. کەوایە لە ساڵی ١٦٢ کۆچی مانگیدا هاتۆتە سەر دنیا.

## خا لویە:

حوسێنی خالوەیهی لە ساڵی ٩٨٠دا کۆچی دوایی کردوە و خەڵکی هەمەدانە و بەرواری لە دایک بوونی بۆ ئێمە روون نەبۆوە.

## مازنی:

ئەبوو عوسمانی بەکری زانایەکی نەحوی و لوغەوی خەڵکی بەسرەیە و لە ئەخفەش فێری نەحو بووە وانەی نەحو و لوغەی بە سیرافی وابن دورەید و نەفتەوەیهی و ئەبووبەکری ئەبناری گوتووە. پیاوێکی زۆر زانا و وردبین بووە لە نەحو و لوغەدا.

## نفطویە:

ئیبراهیمی نەفتەوەیهی کە لە نێوان ساڵەکانی ٨٥٩ و ٩٣٥دا ژیاوە پێشەوایەکی گەورەیە لە زانیاری نەحو و ڕێنووس و وێژەدا. خەڵکی عێراقییە و لە بەغدایە کۆچی دوایی کردووە. جا لە نێو مەلاو فەقێی کوردەواریدا باوە کە ئەوەندە لە بارەی ڕێنووسی عەرەبیدا لێکۆڵینەوە و توێژکاری دەکەن و وەدوای بزێوکە (اعراب) دەکەون کە هەموو شتێکیان لەوەدا کورت هەڵێناوەتەوە و زۆربەی شتە گرینگ و زانیارییە گەورەکانیان بە تەواوی فەرامۆش کردووە!

هەر لە سەر یەک هۆنراوەی(امرء القیسی) دەیان لاپەڕە ڕەش دەکەنەوە و چەندین ڕۆژان بە بەڕێک هەڵا دەڕۆن. لە مەرجێکدا کە لەبارەی زانیاری سروشتی بە تەواوی کۆڵیەن و هیچ لە هیچ نازانن و بە تەواوی ئەو گەلی هەژار و نەدار هەمیشە دیل و دەس بەسەرە و بۆ نانێک پشتی نۆکەری دوولا دێنێتەوە بۆ ئەم و ئەو کڕنۆش دەبا.

مامۆستا دەفەرمویَ ئەی مەردی دڵ و دەرون ڕووناک گویَ لە قسەی من ڕابگرە و هەرمن دڵسۆزی ڕاستەقینەی تۆم. ئێوەی ئەی کوردینە خاکەکەتان هەمووی کانگای زێڕ وزێو وشتی بەنرخ و بایەخدار وشاخ وداخ وکێو و دەشتی وڵاتەکەتان پڕە لە دوڕو گەوهەرو یاقووت و مەرجان و مەڕمەڕو گرانیت، بەڵام ئێوە لە بەر نەزانی ودەبەنگی خۆتان نازانن ئەو سفنگەل (مواد)ە جۆراوجۆرە و کانەکانی وڵات چۆناوچۆن وەدەس دێن وچۆنیان کەڵک لیَ وەردەگیریَ.

وڵاتێکتان هەیە پڕکان و مەعدەن     بەبێل و پێمەرە دو قورتی لی بدەن

یـا لە جییە کی دیکە دا دە دەفەرموی:

دەزا نـی نـا و عەردی چـی تـیدایە  وەلی مـەرقـومی ئەمری کیمیا یـە
هەتاکو ئەو عیلمە زۆر چاکی نە خوینن  دەبی هەر با قـلە و سلقـان بـچێنـن

بەڕێز ئەحمەد موختاربەگی جافیش دەڵێ:

لە خەو هەڵسن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە
هەمـوو تـاریخی عـالەم شـاهیدی فەزڵ و هونەرتـانە
بە خـۆڕایی لە دەسـتی بەرمەدەن ئەم خـاکە شـیرینە
کە تۆزی وەک جەواهیر، سورمە و کوحلی بەسـەرتانە
بە سـەر خاکا ئەگەر نازیش بـکەن حەقتـانە کـوردینە
تەماشـا سـێبەری ئەم شـاخ و کێـوانە لە سـەرتانە
دەسا تێکۆشن ئەی قەومی نەجیب و بێکەس و مەزڵووم
بە گورجی قەتعی کەن ئەم ڕێگە دوورەی وا لە بەرتانە
زمانی حاڵی ئەحمەد هەر ئەڵێ وریان بن ئەی خەڵکە
بـزانن بەردی ئەم شـاخانە ئەڵمـاس و گوهەرتـانە

لە دواییدا دەفەرموێ پـوختەی وتـار ئەوەیە کە پێتـان دەڵـێم. بە فەرمانی پێغەمبەری خوا کە دەفەرموێ (الدنیا مزرعـة الآخـرة) واتـا جیهان کێڵگەی پەسڵانە وچۆن کابرالە مووچە و بەرەکەی شیناوەرد دەکا و بەرو بووەکەی هەڵـدەگرێ و دەیهێنێـتەوە مـاڵێ و دەیخـوا، ئاواش دەبێ لە جیهان بۆپەسڵان کەڵک وەربگری و خەلە وخەرمـان هەڵبگری و چاڵ و کەند و هوڕ و جەواڵان پڕبکەی. بە گشتی خـووی سروشت هەروەهـایە کە دەبـێ (هەر ئەورۆ بـۆ سـبەینێ تێبکۆشـی)، یان دەفەرموێ: (لیس الرجل رجل الدنیا ولاالرجل رجل الآخـرة بـل

الرجل رجلهما) پیاو ئەو پیاوە نییە، کە هەر پیاوی دنیایە بێ و پیاو ئەو پیاوەش نییە، کە هەر پیاوی ڕۆژ دوایی بێ بەڵکە پیاو ئەو پیاوەیە، کە پیاوی هەردووک لا بێ . هەروەها بە پێی چەندین فەرموودەی دیکەی ئەو پێغەمبەرە بەڕێزە دەبێ دین و دنیاو جیهان پەسڵان ڕێک بخەن و بە جوانی بۆ هەردووکیان تێکۆشن و بە هۆی هەوڵ و تێکۆشانی خۆتان، خۆتان بگەیەننە ریزی گەلانی جیهان. چونکە بێ هەوڵ و تێکۆشانی خۆتان هیچتان دەس ناکەوێ کە خوا خۆی دەفەرموێ (لیس للانسان إلاّ ما سعى) واتا مرۆڤ بە هەوڵ و تێکۆشانی خۆی نەبێ هیچ شتێکی بۆ نییە و لە جێگایەکی دیکەدا دەفەرموێ: (ان الله لایغیر ما بقوم حتى یغیروا ما بانفسهم) بەڕاستی خوا ئاڵوگۆڕ لە ژیوار و حاڵی هیچ گەل و هۆزێکدا وەدیناهێنێ هەتا خۆیان ئاڵوگۆڕ لە ژیواری خۆیاندا وەدینەهێنن.
جا ئەوەیە کە دەفەرموێ:

بۆ خۆتان سەعی بکەن نانێکوو بێتە دەستی
ئینسانی مەعدە خاڵی ناو زگی ڕاناوەستی
{میللەت ئەگەر فەقیر بێت ئاخر دەبێتە ئەسیر
گوێ لە قسەی من ڕاگرە ئەی مەردی ڕۆشن زەمیر
خاکوو هەموو مەعدەنە، مەعدەنی زێڕ و زیوی
پڕ لە لەعل و یاقووتە ناو شاخ و داخ و کێوی
ئە توش ئەو اله برسان زگت قۆڕە قۆڕیە تی
منالت گڕوی گرتووە بو نان نورە نوریە تی }

# مامۆستای کۆیە و کانەکانی کوردستان

مامۆستای بەڕێزوخۆشەویستمان هەرجارێ کوڵی دڵی خۆی بە جۆرێک ولە بۆشتێک دەردەبڕی چونکە بە داخەوە بە هەرلایەکدا کە دەڕوانێ لە ناتەواوی و ستەم لێکراوی گەلەکەی بەولاوە چیترنابینێ، جا هەربۆیە وەک باوکێکی دڵسۆز، یا وەک رابەرێکی کارامە و لێهاتوو، یا وەک فەرماندەرێکی لێزان و دووربینی جەنگی کە لە هەرلایەکی مەیدانی شەڕداله هێزەکانی خۆماڵیدا کزی و لاوازییەک ببینێ تا دژمنی زەبوون نەتوانێ زەبری لێ بوەشێنێ، خێرا راستی دەکاتەوە وبە جوانی پێی ڕادەگا و هەڵەکان پڕدەکاتەوەو ناتەواوییەکان تەواو دەکا و خاڵە بێ هێزو لاوازەکان بەهێزوگوڕ دەکا. زۆربە ئاشکرایی قامک دخاتە سەر ئەو خاڵانە و ئاماژەیان بۆ دەکاو پێمان دەڵێ، کە لە کوێوە تێشکاوین ویان لە کوێ خەریکە بمانشکێنن!! هەروەک دەبینین کە جارێک لە باری رامیاری و کۆمەڵایەتی و جارێک لەباری وێژەیی و فەرهەنگی و جارێک لە باری گەڵدۆستی و نەتەوایەتی و جارێک لە باری نیشتمان پەروەری و دامەزراندنی دەوڵەت و میری، هەروەها جارێک لە باری پاکسازی و خاوێنکاری ناوخۆیی وە ئیتر ئەمجارە لە بارەی سروشت و زانیارییە سروشتییەکان و کانەکانی کوردستانەوە بۆمان دەدوێ و دەفەرموێ: کوڕینە! لاوە کوردەکان! هۆ خەڵکی کوردستان! پەندی پێشینیانی کورد دەفەرموێ: (دەستی ماندوو لەسەر زگی تێرە) یان دەفەرموێ: (ئەوەی دانایە دانایە) و (ئەوەی نادانە لە دوایە)، دەجا ئەگەر وایە هەستن دەستی من و دامێنتان چی دیکە نەیدۆڕێنن!! ئێوەش هەروەک گەلانی دیکەی جیهان وەخۆ

کەون وخۆتان زانا ودانا بکەن وەک دەفەرموێ:

میـــــسالی عـــــیلم بفـــــڕە وەک تەیـــــران
بە هێـــــزی عـــــیلم بچـــــۆ بـــــن بەحـــــران
عیلمێکـــــی گەورە لە نێـــــو کـــــوردان بـــــوو
بە قـــــسەی پڕوپـــــووچ لە کیـــــسمان چـــــوو
بە دەف و دمـــــبەگ، بە ڕەقـــــس و ســـــەما
عـــــیلم و مەعـــــریفەت لای کـــــوردان نەمـــــا
ئـــــێمە پابەنـــــدی وەهـــــم و خەیـــــاڵین
ئـــــێمە خەریکـــــی کەری دەججـــــاڵین
بە خـــــوا زۆر حەیـــــفە و مەخـــــابن
میللەتـــــی کـــــوردان هەتـــــا کەی وا بـــــن
جەهـــــالەت بـــــڕوا دەورەی عیرفـــــانە
کـــــۆنە بـــــا بـــــڕوا نـــــۆرەی کـــــوڕانە

ئیتر ئەنگۆش زانایانە و لە رووی زانیارییەوە بکۆشن و خەریکی کار و کۆشش و هەوڵ و خەبات بن و بۆ خۆتان نانێک وەدەس بێنن و بە زەحمەتی خۆتان بژین و هەرگیز چاو لە دەستی کەس مەبن و چاوتان هەرلە هێزی شان و باهۆی خۆتان بێ. مرۆڤ نابێ هەرگیزاو هەرگیز وەک ئاغاوات و شێخەکانی کوردستان ببێتە ملۆزم ولە سەرورگی خەڵک بلەوەڕێ وخەڵکی نەزان و نەخوێندەوارکەربکا و بچەوسێنێتەوە. هەروەها نابێ وەک هێندێک لە لاوە تەمبەڵەکانی کوردەواری هەر بە تەوەزەلی و بێکارەیی رایبوێرێ و هیچ کارێکی لە دەس نەیەت.

چونکە ئەگەر ببێتە ملۆزم و خۆی بە خەڵکی بەخێو بکات هەر تا کاتێک خەڵک هۆشیار دەبنەوە و لە خەوی بێئاگایی وەخەبەر دێن

بتوانێ بیخوا و بەوجۆرە لێی بخوڕێ وتاکاتێک فێڵ وفووت و تەڵە و داوەکانی بۆخەڵکی نەزان و چاو بەستراو دەردەکەون بەو شێوە بۆی دەلوێ و دەتوانێ خوێنی خەڵک بمژێ دەنا بێگومان ئەودەم مستی پڕ لە قینی لە دەم دەدەن ودەم و ددانی تێکدەشکێنن. بەختی سەرەوخوون دەبێتەوە و تاج و تەختی وەردەگەڕێ. ئەگەر تەمبەڵ و تەپلۆسیش بێ هەرگیزتێر و تەسەل نابێ و هەمیشە هەردەس تەنگ و نەدار و رووت و برسی دەبێ و خۆ پیاوی برسیش هیچ کارێکی لە دەس نایە، بێگومان ئەگەر تەکتەکی بنەماڵەکانی کۆمەڵیش هەژار و نەداربن جگە لە کۆمەڵێکی زۆر هەژار و نەدار و برسی چی دیکەی لێ پێک نایەت و خۆ کۆمەڵی نەداریش جوێ لەوەش، کە هیچی هەرلە دەس نایە و ناتوانێ بەرەی خۆی لە ئاوێ دەربێنێ لەگەڵ کاروانی پێشکەوتن ناتوانێ بەرەو شاری ئاوات بڕوا و کەشتی هیوا بئاژوێنێ و لەوەش پترخۆشی هەر دەبێتە ژێر چەپۆکەی خەڵک و دیل و یەخسیری دەستی دژمنانی خۆی دەبێ و دژمنانی هەروا لەسەری زاڵ دەبن و ناتوانێ دەستی خۆی لە بن باری خەڵک دەربێنێتەوە و بە جارێ نیخە پەستی دەکەن و ناهێڵن کە سەری هەڵێنێ و دەنگی هەڵببڕێ.

جـا مامۆسـتای خۆشەویـستمان کە ئەو دەردانەی هەمـوو زۆر بە چاکی دەزانێ و بەڵـکە بە هەمـوو هەست وبـوونی خـۆیەوە ئـێش و ژانەکەی چاشتوون و دڵە پڕ هەستەکەی وەسۆ هـاتووە و ژانەکـانی کولاونەوە و لێرەشدا کوڵی دڵی خۆی لەوە دەردەبڕێ کە والاوەکانی کــوردەواری لەبەر نەزانـــی خۆیـــان هەر بە تەمبەڵـــی و نەزانـــی رادەبوێرن و ناچن بۆ فێرگە وخەریکی فێربوونی زانـست و زانیـاری نابن وناتوانن بە چاکی کەڵک لە خاکی پاکی خۆیان وەربگرن!!

ئیتر هەر بۆیەش تەواوی ئەوکانە و چاوە گرینگانەی کوردستان یا بێگانە و دژمنان دەریان دێنن و بۆخۆیان دەیانبەن و کەڵکیان لێ وەردەگـرن یـا هەروا لە ژێرزەویـدا دەمێنـنەوە وکەڵکیـان لـێ وەرناگیرێ، کوردەکـانیش هەروا بە ڕووت ورەجـاڵی وبە هەژاری و نەداری دەمێننەوە.

مامۆستا لێمان تووڕەیە و پێمان دەڵێ کەڵک وەرگرتن لەو کانەو چـاوە گرینگـانە پێویـستی زۆری بە زانـین و فێـر بـوون هەیە و بـێگومـان بە نەزانـی ئەوانە دەرنـاهێنرێن و نەوتەکەمـان لە کـیس چووە، با ئەو شتانەی دیشمان لە دەس دەرنەهێنن!! خۆمن هەر کاتێ نەوتەکەم وە بیر دێتەوە ئاورم دە هەناوان بەردەبێ، بەڵام چ بکەم هیچم لە دەس نایە. وەک دەفەرموێ:

چـــۆن دێـــتە دڵـــم خەیـــاڵی نەوتـــێ
هێنـــــد نـــــامێنێ جەرگەکەم بـــــشەوتێ
نەوتـی بابـاگوڕگوڕی چـۆن دەچـێ بـۆ پاریـسێ
ئـــاوری حەســـرەتۆمەندی لە دەروونـــم داییـــسێ

منیش هەربەودمی ئەوی ئەوتاکەم لێ زیاد کردووە هیوادارم پێی نـاخۆش نەبێـولێم قەلـس نـە بـێ، چونکـە هەر لـە دلـی ویـم قسە کردووە دیارە لە زۆر جێـی دیکەشـدا ئەوکـارەم کـردووە وەک فەقـی دەڵێن (بەزەننی رەزا) :

چـون نەوتـی کرماشـانێ بـۆ خـۆی دەیبـا بیـانێ
تەواوی وەجەکـــانم بە ویکـــڕا دەکەن ژانـــێ

خوای گەورە کوردستانی خۆشەویستمانی وەهـا دروست کـردووە کە هەمووی هەر کانگا و سەرچاوەی زۆر گەورە و گرینکە و شتگەلی

خزانەهای وەها بەنرخی تێدایە کە وڵاتانی دیکە لێی بێبەشن وەک کانی زێڕ و زێو و یاقووت و زومرڕوت و ئەڵماس و نوقرە و ئەو جۆرە شتانە. تەنانەت شاخ و کێوەکانیشی هەمووی هەر کانگای شتگەلی زۆر بەنرخی نایابە، دەتوانین بە راشکاوی بڵێین، کە (کوردستان بووکی رازاوە بە خشڵی کانە).

جا مامۆستای بەڕێزمان بە تووڕەییەوە دەفەرموێ: بەڵام ئێوە لە سەر ئەو خاکە چاکەڕا لەبەر گێژی و نازیرەکی خۆتان ناتوانن کەڵکیان لێ وەربگرن و بۆ خۆتان دە کاریان بکەن. وەک دەڵێ:

ئەمما ئێوە نەزانن لە بەر گێژی و دەبەنگی
ئەو زومرڕووت و یاقووتە چلۆنتان دێتە جەنگی
ئێوە لەسەر ئەو خاکە دەبوو خۆتان بە کوشت دەن
داگیرکەران بکوژن یا لە وڵاتیان دەرکەن
ئێوەش خۆ بە قسەی خۆتان گەلێکی خاوەن خاکن
بەڵام نیسبەت بە خۆتان بێموباڵات و باکن
بە خوا لە داخی ئێوە من هەر خەریکە بمرم
یا بخنکێم لە قینان یانە زەردوویی بگرم

راستی پیاوکاتێک هۆنراوەکانی مامۆستا دەخوێنێتەوە و چاوێک بە شاخ و چیاحەستەمەکانی گاگەش و کارگ و هەرمێ و پانەسەرو شارستێن و کۆنە کێچ و هەنگەوێ و مێشەدێدا دەخشێنێ و بە درێژایی نێزیکەی پتر لە ١٠٠ کیلۆمیترو بەرینایی ٥٠ کیلۆمیتر هەوایی هەمووی هەرگڕانیتی رەش وسەوزە و پڕپڕیشە لە میکا ئەگەرهەزاران ساڵ بە خەڵوارلێی دەربێنرێ هێشتا رەنگبێ نیوەش نەبێ وئێستا لێشاوی بەردگڕانیتی ئەومەڵبەندە لە چەندین جێگەی ئەورووپا سەری دەرهێناوە یا ئەگەر چاوێک لە کێوەکانی نێوان

شاوەلە ودەشتی قوڕێ بکاوببینێ کە ئەوچیا دوورو درێژومەزنە هەموی هەر سەنگی سپی چینییە . یا تەماشا کانگا مەڕمەڕی پلە یەکەمی گوندی قزل قوپی شارویران بکەی کە ئەوا چەندین سالە بیگانەک بوخوی دەیبا و دەیخواو رەنگە بەشی هەمووخانووبەرەکانی هەمو قارەی ئەورووپا یان تێدا بێ یاخۆلە دەیان وسەدان وهەزاران جێگای دیکەی ئەوکوردستانە کەوابە تازەیی دەیان و سەدان و هەزاران کانگای بەردی مەڕمەڕ و مەڕمەڕیت و باڕیت و میکا ونیکل و ئاسن و فافۆن و نەوت و گازو زومڕووت و پیرۆزە و گۆگردومس و جۆرگەلی زۆری رەنگیان دیتۆتەوە وبێگومان لە دەیان وسەدان جێگەی دیکەی کوردەواریش کە کانگای پاقڕ و رادیۆم و ئۆرانیۆم و زێڕو یاقووت هەبێ رەنگە لانی کەم لە دڵی خۆی دا بڵێ ئەرێ خوایە مامۆستای کۆیی ئەو هەمووشتانەی لە کوێ زانیوە؟! خۆخوا خۆی دەفەرموێ: (لایعلم الغیب إلاّ الله) جگە لە خوا هیچ کەس نهێنی نازانێ، دەنا دەکرا بڵێین ئەو بەڕێزە زانیاری نهێنی یا بە وتەی پیر و مریدان کەڕامەتی هەبووە.

بەڵام راستی ئەوەیە، کە مامۆستای بەڕێزمان لەهەموو زانیاری و فێرێکی، کە لە وڵاتدا باو بووبێ دەستێکی باڵای هەبووە و زۆر لێزانانە تونیویەتی هەموو شتێک لێک بداتەوە و هەموو شتێکیش یا بە زانیاری ولێزانی یا بە تاقیکاری و تێکەڵاوی بۆ مرۆڤ روون دەبێتەوە و دەردەکەوێ.

پیاو ئەگەر بیر لەو مامۆستا بەڕێزە دەکاتەوە راستی سەری لێی سووڕ دەمێنێ، چونکە ئەو لە هەر بوار و بەستێنێکدا پسپۆڕ و شارەزا بووە و لە هەر بابەتێکەوە سەرامەد و سەردەچوو بووە. هەر دەڵێی ئەندازیارێکی کانی یا سروشتی بووە زۆر چاک زانیوە،

کە ناوی زەوی چی تێدایە و ئەوەی تێدایە بۆچی دەبێ و چۆنیش دەردێنرێ و چۆنی کەڵک لێ وەردەگیرێ. هەروەک خۆی دەفەرموێ:

دەزانـــی نـــاوی عەردی چـــی تێـــدایە؟
وەلـــێ مەرقـــوومی ئەمـــری کیمیـــایە
هەتـــاکوو ئەو عـــیلمە زۆر چـــاکی نەخـــوێنن
دەبـــێ هەر بـــاقڵە و ســـڵقان بچێـــنن
عیلمـــــی کیمیـــــات گەر نەخوێنـــــدووە
بە خـــوا نـــازانی خـــوا چـــی کـــردووە

مامۆستا هەر کاتێ بیری لەو هەموو کانگا و چاوە گرینگانەی کوردستان کردۆتەوە کە یا بێگانە دەیانکەن و دەیانخۆن دڵە رووناک و پڕلە هەست و زانیارییەکەی پتر وەکوڵ هاتووە و وەک مەنجەڵی سەرگرەپێچەی تەندووری نێڵدراو زڵق زڵق کوڵیوە. کوڵی گریانێی لە تاوان دە ئەوکێ ماوە ولە لایەک دیتوویەتی گەلە هەژارەکەی هەروا بە هەژاری ماوەتەوە ولە لای دیـــش کە روانیویەتی وا دژمنان بە کەیفی خۆیان کەڵک لە خاکی پاکی کوردستان وەردەگرن لە کوردان تووڕە بووە و تانووتی لێداون ویستوویەتی پێیان بڵێ ئێوە نەزانن و لە نازیرەکی و گێژی و هۆری خۆتان هەر ناشزانن کە ئەو کانە و چاوانە چین، دەنا چۆن دەبوو بێڵن دژمنانی خۆتان ئاوا مایەی ژین و ژیان ئێوە بەرن و کەچی خۆشتان ئاوا رووت و رەجاڵ و نەدار بن؟

لە ساڵانەدالە گوندی ئالاوانی ناوچەی مەنگوڕایەتیدالە ماڵی خالان بووم ویستم بە پێیان بە شاخ و کێوەکانی گاگەشێدا بەرەو مەهاباد بگەڕێمەوە، لە پانەسەری کە لە گەڵ کوڕە خاڵێکم بووم لە چادرێکی لامان دا بۆ ئەوەی، کە نەختێک بحەسێینەوە و

برسیایەتی و تینوایەتی دەربکەین. خاوەن چادرەکە ڕێزێکی زۆری لێ گرتین ولێم پرسی و گوتم کاکە گیان ناوت چییە بەخێر؟ فەرمووی ناوم ئەبوبەکرە وئێستاکە گوندی پانەسەر بە هۆی شەڕێکی خوێناوی کە چەند ساڵ لەمەوبەرلە نێوانی هێزی پێشمەرگە وجاشاندانێی کراوە پێیان چۆڵ کردووین و خانووەکانیشمان هەرلێ سووتێنران، دەنا لە پێشدا ئێمە خەڵکی ئێرە بووین و ئێستا بە ناچاری چووینەتە گوندی شارستێن.

منیش گوتم: کاک ئەبوبەکر تۆ چۆن لەو هەموو کانگا بەردە گرانیتە جوان و چاکانە بۆخۆت جێیەکت نەگرتۆتەوە؟ بە زمانێکی زۆرسادە و ساکار فەرمووی : جا مامۆستا کوردی پانەسەر و کانگا؟ منیش بە تووڕەییەکی دۆستانەوە عەرزم کرد : بۆکوردی پانەسەری لەگەڵ کابرایەکی تاران چ جیاوازییەکی هەیە؟ من ئەوەت لێ قبووڵ ناکەم و زۆریشم پێ ناخۆشە وا دەڵێی، ئەویش هەناسەیەکی ساردی هەڵکێشا و گوتی: بە قورئانی لێت خوێندووە ساڵێکیش دەبوو ، کە لێرە بۆڵدزێر کاری لە سەر ئەو بەردە گران بەهایە دەکرد، بەڵام خەڵکی ئێمە هەر دەیانگوت ناوانییە، بەردچۆن دەفرۆشێ و ، شتی وا هەرنابێ. بەڵام ئەوە مریشکێکی زێڕبە چەند جوچکەوە لە بن گڵی دایە و لەوی دەگەڕێ! گوتم: بە خوا لەوەی تۆدەیڵێی گەلێک گرینگترە. ئەوبەردە بریقەدارە سەخت و ڕەقە. کاری مریشکی زێڕنییە کە ئە و کابرایە لە کێوە دەری دێنێ!!

جامامۆستای گەورە پێمان دەفەرموێ ئەی کوردینە ئێوە چۆن دەبێ لە سەر ئەو هەموو پیت وبەرەکەتەی کوردستانیڕا ئاوا هەژارو چاو لە دەست و نەدار بن. کوڕە زۆر زۆر نەنگە. خۆ ئێوە:

خاکوو هەموو مەعدەنە، مەعدەنی زێڕ و زێوی
پڕ لە لەعل و یاقووتە ناو شاخ و داخ و کێوی

ئەممـــا ئێـــوە نەزانـــن لە بەر گێـــژی و دەبەنگـــی
ئەم زومـــڕووت و یـــاقووتە چلۆنتـــان دێـــتە چەنگـــی
ئەوەی خەڵقـی خـودا بـوو لە مەعـدەن و کـانی نەوت
هەمووی لە کیس ئێمە چوو، بەدەستی کافران کەوت

راستە کە دەبێ فێری زانیارییەکـانی فیزیـک و کیمیـا و زانیـاری سروشتی زۆر بە چاکی بخوێنن،جا بە هۆی ئەوان بتوانن ئـاڵوگۆڕ لە سفنگەل (مواد)ی بن عەرز و سەر عەرزیدا بەدی بێنن و بتوانن لە شتێکەوە بیانکەن بە شتێکی دیکە،ئەمجا بە کەیفی خۆتـان کەڵکیـان لێ وەربگرن، ئیتر بەو زانیارییانە و بە هۆی کەڵک وەرگرتن لەوان کان و چاوانە سەرکەوتن لە دوای سەرکەوتن وەدەس بێنن. وڵاتـی رازاوەی کوردەواری پتر وەڕازێنن و بەرەو پێشی بەرن. زۆر نەنگە گەلە بەجێماوەکەتان لە دواکەوتوویی و بەجێماوی رزگار بکەن:

ئەو بەڕێزە هیچ ناهەقی نییە کە دەفەرموێ:

هەروەخـــــتە لە داخـــــی ئێـــــوە بمـــــرم
رۆییـــــــوە قەرار و هـــــــۆش و ســـــــەبرم
چ بـــــکەم چ بڵـــــێم لە تـــــاوی کـــــوردان
ئـــــاگر دەگـــــــرێ دڵـــــــم لە دەردان

ئەمجا پەنا دەباتە بەر یەزدانی مەزن و بێهاوتـا و هانـای بـۆ دەبا و لێی دەپاڕێتەوە و دەڵێ:

چـــارە چیـــیە خـــودایە تـــۆ دەزانـــی
خـــۆت عـــالمی زاهیـــر و نیهـــانی
ئەم زوڵـــمە قبـــووڵ نەکەی خـــودایە

ئەسـلا ئەمەلـم بە کەس نەمـایە
لـوتفی تـووە مەلـجەء و پەنـاهم
روحمێکـی بە کـورد بـکەی ئـیلاهم
وەک دێـتە دڵـم خەیـاڵی نەوتـێ
هێنـد نـامێنی جەرگەکەم بفەوتـێ

بەڕێز جەنابی مامۆستای کۆیی لەوەش هەر زۆر قەڵسە کەوا لە نێوکوردانـدا پیـشەسازی و وەسـتاکاری زۆرکەمە و هەرخەریکـی حیقایەت و داستان وشتی بێ ئاکامن ، یـان خەریکی لێکدانەوەی هۆنراوە و قسەی رەق و تەقی عەرەبـانن و دوای زانیـاری سروشتی ناکەون پێمان دەڵێ کوڕینە ئەوەی ئێستا ئێمە دەیکەین ولە سەری دەڕۆین بە کارنایە چونکە هیچ کەڵکی نییە:

ئـێمە پابەنـدی وەهـم و خەیـاڵین
ئـێمە خەریکـی کەری جرجـاڵین
عیلمـی سـەنایع لای ئـێمە نیـیە
گەر چـشتێک هەیە ئەویـش قەولیـیە

مامۆسـتای بەڕێزوخۆشەویـستمان گەلێـک لەوەش قەڵـسە کە مامۆستاکانی ئـایینی هەرواخەریکـی سـاخ کـردنەوەی قونەقەیـد و مەتەڵۆکی عەرەبی وهۆنراوە سەخت و ڕەقەکانی هۆنەرانی تەنانەت پێش ئیسلامیـشن وگوێیـان بەوە نـابزوێ کە ئـاخر بـابە ئەوە هیـچ کەڵکی نییە وئیترفلان پیریێژنە عەرەبە لە خـۆڕا قسەیەکی چەوت و هەڵەی بە سەرزاریدا هاتووە ئەو هەموو لێکدانەوە و لێکـۆڵینەوە و تـوێژینەوەی بـۆچییە؟ بـۆیەک کەڕەت نـاڵێی هەڵەیە و لە کـۆڵی ببیەوە و ئەو هەموو زەحمەت و رەنجە لە پیشەسازی یـا لانـی کەم

لە توێژینەوەی ئایەتێکی قورئاندا بە خەرج نادەی؟ یان ئەوە کە زانیاری سروشتی (طبیعی)تان بە یەکجارەکی وەلا ناوە و جەنابی مامۆستاش ماشەڵڵا بە ناگایی فتوائەدا کە حەرامە خوێندنی ئەو جۆرە زانیارییانە و هەر لە خۆڕایی و بێبەڵگە دەڵێ ئەوە عیلمی شەیتانییە!! بەو جۆرە لە خەڵکی موسڵمانی قەدەغە کردوون!! ناهێڵێ لاوە خوێنگەرمەکانی کورد فێری ئەو زانیارییانە بن و تەنیا زانیارییە خەیاڵی (تئوری)یەکانی بۆئێمە هێشتوونەتەوە وهێندێک (قال اقول و قوله ویقول ) کە بەڕاستی ئەوەش هیچ کەڵکی نییە.

مامۆستا کاتێ دەبینێ لە فێرگە خواییەکانی کوردستاندا کە ئەو هەموو گەنج و لاوە تەمەنی پڕبایەخی خۆیان بۆ فێر بوونی زانیارییەکانی ئایینی تەرخان کردووە بەڵام بە پێچەوانەی رابردووی روحانییەتی کورد کاتێ تەواو دەبن و دم وەردەگرن و گۆیا دەبنە مەلا تەنانەت ناتوانن بە هیچ جۆرێک لە باری پیشەسازییەوە سەر دەربێنن و لەباری پزیشکی و دەرمانییەوە هیچ نازانن و لە ئەندازیاریدا هەر زۆر کۆڵن و لە باری رامیاری و کۆمەڵایەتییەوە یەکجار زۆر لە پاشن و لەبەر چاوی وان شێخە جادووگەرەکان خەڵکی کورد بە نێوی ئایین دەچەوسێننەوە و فریویان دەدەن و دەیانخەڵەتێنن، نەک هەر بەرەنگاریان نابنەوە بەڵکە هاوکاریشیان دەکەن و بە فەرموودەی خۆی ئەویش بۆ شێخ وەکوو کەلبی موعەللەم، بە دەم کەرویشکی بۆ ئەگرێ لە لانە!! هەروەها دەیان و سەدان ناتەواوی و ناڕێکوپێکی دیکەش دڵە پاک و خاوێنەکەی دیسان وەکوڵ دێتەوە و دەفەرموێ:

عیلمی تەبیعەت عیلمی خودایە
قال و قولە گشتی هەبایە
عیلمی کیمیات گەر نەخوێندووە

بە خـــوا نـــازانی خـــوا چـــی کـــردووە؟
عیلمـــــی حیکـــــایەت گەر کەڵکـــــی هەبـــــا
دەبـــــوایە دنیـــــا هەمـــــوو بـــــۆ مە بـــــا

جا مامۆستای دڵسۆزمان لێرەدا دەیهەوێ پێمان بڵێ کە ئێوە ئەو جۆرە زانیارییانە نازانن و لە پیشەسازیدا ئاوا لە پاشن ناتوانن کەڵک لەو هەموو کانگا و چاوانە وەربگرن کەوا خوای گەورە بۆ ئێوەی لە خاکی پاکی کوردستانیدا داناون. خۆ هەر بە هۆی ئەو نازیرەکی و دەبەنگییەتانە کەوا چاوە نەوتەکانی وەک باباگوڕگوڕو کرماشان و هتد لە کیسمان چوو و نەیاران هاتن لەو لاوەڕا بۆ خۆیان دۆزیانەوە و کەڵکیان لێ وەرگرتن. جا بەو شێوەیە بە تووڕەییەوە روومان تێدەکا و دەفەرموێ:

ئەی کـــاکی نەفـــامی گەوجـــی مـــلهـــۆڕ
بنـــــــواڕە لە دەوری بـــــــابە گوڕگـــــــوڕ
ئەو نەوتە چ بـــــوو؟ ژیـــــانی تـــــۆ بـــــوو
وەی خـــــۆڵ بە ســـــەرت ئەوا ئەویـــــش چـــــوو
ئەو نەوتە چ بـــــــوو چلـــــــۆن بەدەرکەوت
چـــــۆن هەڵـــــدەقوڵێ مەنـــــابیعی نەوت

ئەمجا پاشی ئەو تووڕە بوون و دەردە دڵ کردن و نارەحەتییە دەیهەوێ هەر نەبێ هانمان بدات بۆ ئەوەی کە لانی کەم ئێستا کە نەختێک وەخۆ کەوین و هۆشمان بێتەوە بەر و هەر نەبێ نەهێڵین چی دیکە کانگا و چاوە گرینگەکانی کوردستانمان لە دەس بچن و نەیاران وەک ئەوانی دیکە بێن و بۆ خۆیان دەریانبێنن. چونکە بەڕاستی خاکی کوردستانی خۆشەویست هەمووی هەر فەڕ و پیت و

بەکەڵکە و لە چاو ئەندەران زۆربەی هەر کانگا و سەرچاوەی شتگەلی جۆراوجۆرەو هەر بستە خاکێکی گرینگترە لە گەوهەرێکی و بە فەرمانی خوای گەورە شتی وای تێدایە کە بێگومان لە جێی دیکەدا هەر نییە یا زۆر کەمە. جا بۆیە دەفەرموێ:

ولاتێکتـــان هەیە پـــڕ کـــان و مەعـــدەن
بە بێـــڵ و پـــێمەڕە دوو قـــۆرتی لـــێ دەن
خـــاکێکی هەیە ولاتـــی کـــوردی
ئەکـــسیرە وەلـــێ لە چەنگـــی مـــردی
بـــستێ لە ولات و ملکـــی کـــوردی
نایـــدەم بە هەزاری ســـوهرەوەردی
قـــوڵتێکی لە دەوری بـــابە گوڕگـــوڕ
نایـــدەم بە منـــارەی ئیمـــام دوور

جا کەوایە ئەی کاکی کوردە ئەتۆش هەروەک مامۆستای دڵسۆزی خۆت ڕێزی خاکە چاکە پاکەکەت بگرە، خۆشت بوێ و بیپارێزە و مەیدە بە دەستی بێگانە و پێشت وانەبێ کە تازە کوردستان هیچی تێدا نەماوە و هەمووی بە دەستی بێگانەکان دەرهێنراوە چونکە کوردستان خەزێنێکی گەورەی لە بن نەهاتووی وایە کە ئەگەر هەزاران ساڵ لێی دەربێنرێ هێشتا چەندانێکی لێ کەم نابێتەوە و ئیتر دەریایەکی مەزنی بێبنی وەهایە کە هەرچەندی لێی هەڵێنجی خاڵی نابێتەوە. جا هەر بۆیە بە تووڕەییەوە دەفەرموێ:

ئەی کـــوردی نەفـــامی خـــانەوێران
وەی عەبـــدی زەلیلـــی شـــێخ و پیـــران
ئێـــستاکە گەلـــێ مەعـــادینی دی

پەنهـــــانە لە نـــــاو دەروونـــــی عەردی
وەک مەعـــدەنی زێـــڕ و زێـــو و سـەدەف
تـــۆش لێـــدە لە تەپـــڵ و دمـــبەگ و دەف

واتا تا کەی ئەتۆ هەر فریوی شێخ و پیرانی چاوبەست دەخۆی و وە دوای زانست و زانیاری ناکەوی و فێر نابی کە چۆن کەڵک لەو چاوە و کانانە وەردەگیرێ و هەر لە باتی هەموو پێشکەوتن و سەرکەوتنێک تەپڵ و دمبەگ و دەفمان بۆ لێدەدەی؟ ئاخر ئەو کارە نالەبارەت چ دەردێکی تۆ چار دەکا؟ بۆچی وەهۆش نایەوە، کەی ئەوە کارێکی ژیرانەیە؟ وڵات کەی بەو جۆرە شتە پڕوپووچانە بەرەو پێش دەڕوا؟

کانگا و چاوەکانی جۆراوجۆری کوردستان ئەوەندە زۆر و باش و بەکەڵکن کە دەتوانین بڵێین ئەگەر دەوڵەتێکی ڕێکوپێک و دڵسۆزی کورد بە سەریان ڕابگا و سەرپەرستیان بکا بێگومان هەزاران ساڵ ئەو گەل و هۆز و وڵاتەی پێ هەڵدەسووڕێنرێ و هەزاران بەرنامە و پڕۆژەی باش باشیشی پێ دادەمەزرێ و ئیتر ئەو وڵاتەی پێ دەڕازێنرێتەوە و سەرەڕای ئەوەش دەتوانرێ کە یارمەتی مرۆڤ دۆستانەی باشیش بە ئەولا و ئەم لا بکرێ.

جا ئیتر هەر بۆیەشە کە دەوڵەتە داگیرکەرەکانی کوردستان بە هیچ کلۆجێک ئامادە نین دەستی لێ هەڵبگرن و لەو ڕێیەدا هەزاران هەزار و بەڵکە میلیۆنەها سەربازی کوڕی خەڵک بە کوشت دەدەن و بە هەر نرخێک بێ لە ژێر چەوسانەوەی خۆیاندا دەیهێڵنەوە و ئیتر توندە توند بە خرێنەکانیان دەیگرن و لە هەر چوار پێنج لاوە دەیکرۆسنەوە، بەڵام بەو حاڵەش چونکە بە تەواوی دڵنیا نین و ترسی ئەوەیان هەمیشە هەر لە دڵدایە کە ڕۆژێک هەر دەبێ لاوانی

کوردیش وەک ئەحمەد موختار بەگ دەڵێ:

ئەورۆ بـا وا بـێ بەڵام ڕۆژێ ئەبـێ ئەولادی کـورد
بێـنەوە مەیـدان بە عـیلم و سـەنعەت و عیرفـانەوە
خانەقین و مەندەلی و خاکی لوڕستان یەک بە یەک
وەک وەسـا ئەیـدوورن بە لای مەنتـیقەی بابـانەوە
کێـو و کەژ ئەبێـتە بـاخ و جـادە و قەسـرە ڕێ
بـۆ تەماشـای دەسـتە دەستە دێـن لە ئینگلیـستانەوە

بەڵێ هەمیشە ترساون کە ڕۆژێک دەبێ لاوانی کوردەواریش بچنە فێرگە و زانکۆ و زانستگا و فێری زانست و زانیـارییە پێویـستەکانی ڕۆژبن و هێزێکی گەورەو کۆک و پۆشتە و تەیار بەچەکی زانیـاری و لێهاتوو و کارامە پێک بێنن و لێیان ڕاپەڕن و کوردستانیان لە بنـی ددان و بەڵکە لە گەرووش دەربێننەوە و هەر بۆیەش لە زۆربەی ئەو وڵاتە داگیـر کـراوەدا سـەرمایە گوزارییـان نەکـردووە و ناشـیکەن چونکە دەزانن کە ڕۆژێک هەر لێیان بەجـێ دەمێنـێ و ڕاسـتی ئەوان تەنیـا لە شـوێنێکیان سـەرمایەگوزاری کـردووە یـان دەیـکەن و کارخانەو پرۆژە و بەرنامەی گەورە و درێژخایەنی تێدا دادەنێن کە بە تەواوەتی توانیبیان یا بتوانن ئەو شوێنە بە یەکجاری بە کوردان چـۆڵ بـکەن و پێیـان بە جـێ بـێڵن. بە کـوردی و بە کـورتی ئەو جێگایانەی کە بە تەواوی و بە دڵنیایی لە ژێر دەستیاندا نەبووبێ هیچ خەرجییەکی ئەوتۆیان لێ نەکردووە و لێی ناکەن.

جا مامۆستای خۆشەویست و خـوا لێخۆشـبوومان زۆر بە چـاکی ئەو ڕۆژەی پـێشبینـی کـردووە و زۆر چـاک زانیـویەتی کە بە ڕۆشنایی زانست و زانیـاری و هێزی بـازوو نەبـێ ئەو وڵاتە ڕزگـار نابێ و بە ئاوات و بە ئامانجی خۆی ناگـا، ئیتـر بەو شـێوە تێمـان

رادەخورێ و دەیهەوێ لە خەوی بێئاگایی هەڵمانبستێنێ و پێمان دەڵێ:

هەستە پێش کەوە ئەی لاوی کوردی
ئاگات لە خۆ بێ کاروان رابردی
بە نووری عیلم ریگا بە دەر خە
بە زۆری باسک کاری بە سەر خە
میسالی عیلم بفڕە وەک تەیران
بە هێزی عیلم هەرۆ بن بەحران
عیلمێ بخوێنە بۆ گەلت چا بێ
گەل و مەفتەنت بە عیلمی شا بێ
هەتاکوو گەلت بە سەر بکەوێ
لە ناو گەلانا بەدەر بکەوێ

ئەمجا مامۆستای گەورە و دڵسۆزمان هەر لە دوایی ئەو بەستە هەڵبەستەدا دووبارە روو دە کوردان دەکاتەوە و دەکەوێتە سەرکۆنەو لۆمە کردنیان و تانووت و تەشەریان لێ دەدا و دەفەرموێ:

ئێوەش خۆ بە قسەی خۆتان گەلێکی خاوەن خاکن
بەڵام نیسبەت بە خۆتان بێموبالات و باکن
ئێوە لەسەر ئەو خاکە دەبوو خۆتان بە کوشت دەن
داگیرکەران بکوژن یا لە وڵاتیان دەرکەن
بە خوا لە داخی ئێوە من هەر خەریکە بمرم
یا بخنکێم لە قینان یانە زەردوویی بگرم
ئاخر چۆن ئەوە حاڵە لە چاو کوللی میللەتێ
هەر کوردی خانەویران بژی لە ناو زیللەتێ

ئەمجا هەر لەو بەستە هەڵبەستە جوان و پڕ واتایەدا باسێک لە رابردووی گەلی زۆر لێکراومان بۆ دەکاو دەفەرموێ: ئێوە کوردینە پێتان وانەبێ کە باب و باپیرانیشتان هەروا وەکو ئێوە زەبوون و یەخسیری دەستی دژمنانی خۆیان بوون، ئەوان نەک هەر وا نەبوون و بەس، بەڵکە دوو زنجیرە پادشای زۆر بەهێز و بەناوبانگی ماد و ساسان کە لە کاتی خۆیاندا لە جیهاندا بێوێنە و نموونە بوو و لە هەر یەکەیان پتر لە سی کەس بۆ ماوەی چەند ساڵان پادشایەتییان کردووە، نەک هەر تەنیا لە خاکی پاکی کوردستاندا سەربەخۆ بوون و بەس بەڵکە دەسەڵاتی بەشێکی زۆری وڵاتانی جیهانیشیان هەبووە و گەورە و خاوەن دەسەڵاتی زۆر و بەهێزترین دەوڵەتی رۆژگاری خۆیان بوون و ژمارەیەکی زۆری گەلانی دیکەی جیهانیشیان لەبەر دەستیدا بووە و فەرمانبەر و فەرمان هەڵگری وان بوون و لە کاتی خۆیدا هیچ کەس بەوان نەوەستاوە، هەر کەسێک نەیاری و دژمنایەتی کردبن خێرا و زۆر بە ئاسانی توانیویانە کە تەمبێی بکەن و چەپەڵۆکی خۆیانی پێدا دەن.

بۆ نموونە کیاکسار یا هوەخشەترە، یا هۆخەشتەر سێهەمین پادشای زۆر بەڕێز و بەهێزی ماد کە بە پێی هێندێک لێکدانەوەی مێژوویی لە ساڵی ۷۰۰ پێش لە دایک بوونی هەنتەشی مەسیح بە سوپایەکی یەکجار زۆرەوە هەڵیکوتاوەتە سەر دژمنی لەمێژینە و بەهێزی خۆی واتا دەوڵەتی ئاشوڕ لە نەینەوایە و پاش چەند مانگ گەمارۆدانێکی زۆر سەخت و دژوار بە سێڵاوێکی گەورەی دەستکردی شوورە و بارووەکانی شاری نەینەوایەی کە بە خشتی کاڵ دانرابوون رووخاند و بەو جۆرە شارەکەی گرت و پایتەختەکەی بە یەکجاری وێران کرد. بەڵام هەر وەک لە خودی ئەو پەڕتووکەدا دەیخوێنینەوە پادشای ئاشوڕ کاتێ کە بە یەکجاری دڵنیا بوو

تەمابڕ بوون لەوەی کە بتوانێ دەست بکاتەوە و تێگەیی کە تازە بێگومان بە دەستی هێزەکانی ماد بە دیل دەگیرێ و.. خۆی و خاوخێزانی و تەواوی ماڵ و سامانی خۆی لە کۆشکی شایەتیدا ئاگر دان و سووتاندنی. ئەو ڕووداوە بە پێی هێندێک لە لێکۆڵینەوە مێژوییەکان لە ساڵی ٦١٥ بەر لە دایک بوونی هەنتەشی عیسا بووە.

بە هەر حاڵ ئەو بەڕێزە لە گەڕانەوەیدا لە شاری هەولێر جێژنێکی گەورەی گرت و ئەو جێژنی سەرکەوتنەیان دانا بە سەرەتای بەرواری کوردی. جا بەو پێیە ئێستا بەرواری کوردی دەبێتە ٢٥١٦، بەڵام بە هێندێک لێکدانەوەش کە ئەوەیان فەرمی (ڕەسمی)یە ئێستا بەرواری کوردی دەبێتە ٢٧٠١. واتا ساڵی ١٣٨١ کۆچی هەتاوی بەرابەرە لەگەڵ ٢٧٠١ مادی کوردی.

بە هەر حاڵ بەرواری کوردی لەو ڕۆژەدا هەڵگیراوە کە کیاکسار یا هۆخشەترە بەهێزترین پادشای ماد کە بە پێی گەلێک سەرچاوەی مێژوویی لە ساڵی ٦١٥ پێش لە دایک بوونی مەسیح کۆچی دوایی کردووە و دوای مردنیشی سەرکەوتنە مەزنەکەی خۆی بە سەر گەورەترین دژمنی گەل و دەوڵەتی مادا واتا ئاشوورییەکان لە شاری هەولێرێ ئەو جێژنە مەزنەی کە باسی کرا گرتی.

جا دیارە دوای زنجیرە پادشای ساسانی، کە دەورانی ئیسلام دێتە گۆڕێ و ئایینی پیرۆزی ئیسلام دەسەڵاتی بە سەر تەواوی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ئاسیای میانە و باکوورو ڕۆژئاوای ئەفریقادا سەپاند و تەواوی ئەو گەل و هۆزانەی کە لەو مەڵبەندەدا دەژیان زۆربەیان بە ئامێزێکی ئاوەڵاوە پێشوازییان لە ئیسلام کردو هاتنە ژێر ئاڵای ئیسلام و موسڵمان بوون و کەمێکیشیان ئامادەیی خۆیان دەربڕی کە سەرانە بدەن و ماوەیەک بۆ بیر کردنەوە

موڵەتیان خواست. کوردیش وێڕای گش ئەو گەلانە سەربەخۆیی نەبووە، لە ژێر دەسەڵاتی میری ئیسلامیدا بووە، بەڵام شتێکی زۆر لە خودموختاری پتری هەبووە، دیارە کورد و هەموو گەلانی دیکەی بن دەستی ئیسلامیش بەو برە خودموختارییە قایل و دابین بوون.

ئەو جار دوای ماوەیەک لە سەدەی پێنجەمدا سەرداری بەڕێزی کوردی موسڵمان سەلاحەددینی ئەیوبی هاتۆتە مەیدان و بۆتە فەرمانڕەوای تەواوی خاکی پاکی ئیسلام و تەواوی موسڵمانانی جیهانی بە کورد و ناکوردەوە و بە عەرەب و ناعەرەبەوە لە ژێر ئاڵای پیرۆزی ئیسلامدا کۆ کردۆتەوە و هیچ گەل و هۆزێکی موسڵمان بە نێوی نەتەوایەتی خۆیەوە کارێکی نەکردووە و هەرچی بووە و کراوە هەر بە نێوی ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلامییەوە بووە و کراوە. بەڵام هیچ گەل و هۆزێکیش زێفی لێ نەکراوە و مافی نەخوراوە.

جا ئیتر پتر لە یەک سەدەی تەواو لە سایەیی سەلاحەددینەوە کورد نەک هەر فەرمانڕەوای کوردستان بووە و بەس بەڵکە تاقە دەسەڵاتداری تەواوی خاکی پاکی ئیسلام و هەموو موسڵمانانیش بووە و هەموو گەل و هۆزە موسڵمانەکانی ئەو ناوچەیە لە ژێر فەرمانی کوردی موسڵماندا بوون. بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەو باسە زۆر دوور و درێژە و پێداچوونەوەیەکی زۆری پێویستە ماموستای بەڕێزمان لێرەدا هەر ئاماژە بەوە دەکا کە دەبێ لە مێژوودا وەخوێنرێ و بەو جۆرە دەفەرموێ برۆ مێژوو وەخوێنە و بزانە، کە گەلی تۆ رابردوویەکی چەندە رووناک و پڕ لە شانازی هەیە و پێت وانەبێ کە هەمەیشە ئاوا هەژار و رووت و پەتیارە بوویێ، ئەمجا بە هۆی ئەوەی، کە ئەو کانە و چاوانەی یەکجار لە لا گرینگە و نایەهوێ کە چیدیکە کورد سەبارەت بەوان بێموبالات بن و خەڵکیش

هەروا بۆخۆی دەریانبێنێ و بیانخوات، بەڵکە دەیەوێ هۆشیار ببنەوە و فێری زانیارییە سروشتی و فیزیک و کیمی و پیشەسازی ببن و بتوانن بۆخۆیان ئەوان دەربێنن و کەڵکیان لێ وەربگرن. جا بەو شێوە دەفەرموێ:

ئەمن ئەوا پێم گوتن ئێوەش مەیلی خۆتانە
نەکەن لە دەستی دەرکەن ئەو مەعادین و کانە
(و ما علی الرسول إلاّ البلاغ المبین)
ئاخر تو خوا تا کەنگێ ئاوا بە زیللەت بژین؟
حاسڵی عەرزوو دەکەم بە ئەمری "خیر الانام"
دین و دنیا ڕێک بخەن نامە تەمام وەسسەلام

ڕاژۆیەکی گرینگ لێرەدا هەیە کە ئەویش ئەوەیە مامۆستا جاری وایە دەڵێی جاڕس دەبێ و دەڵێ جا من ئەوا پێم گوتن و سپاردەی خۆم ڕاگەیاند و بەرپرسییەتیم لە سەر خۆم لابرد. ئێوەش بە قسەم دەکەن بە قازانجی خۆتانە و بە قسەشم ناکەن مەکەن، خۆ هەر بە زیانی خۆتانە. بەڵام چونکە هێندەی گەلەکەی خۆی خۆش ویستووە هەر خێرا دووبارە بای داوەتەوە سەر پەند و ئامۆژگارییە بەنرخە دڵسۆزانەکانی خۆی و هەر دەڵێی ئاگاشی لە خۆی نییە وەک لە بیری چۆتەوە کە هەر ئێستا تووڕە بووبوو و دەیگوت کارم پێتان نیە چونکە بە قسەم ناکەن.

ڕاستی ئاخر ئەو هەر خووخدەی چاکە و دڵسۆزی و بەختەمامییە چۆن دەتوانێ کە لە ئامۆژگاری گەلەکەی روو وەرگێڕێ؟ ناکرێ و نابێ، ئیتر ئەوە هەر لە بازنەی گونجانا نییە. جا هەر بۆیە هەر لەو کاتەدا کە دەڵێ ئەمن ئەوا پێم گوتن ئێوەش مەیلی خۆتانە، کە مانای وایە کارم پێتان نییە و من ئەوەندەم لەسەر بوو پێتان بڵێم و

ئەوا پێشم گوتن، با دەداتەوە سەر راسپاردە و بەرپرسییەکی زۆر گەورە کە دەیخاتە سەر شانی کوردەکان و دەڵێ نەکەن لە دەستی دەرکەن ئەو مەعادین و کانە.

جا هەر لە وێنە و نموونەی ئەو فەرمایشتەیەتی کە لە جێگایەکی دیکەدا دوای ئەوی زۆری ئامۆژگاری کوردان کردووە و گەلێکی شێر و رێوی بۆ هێناونەتەوە و وە بەری هەڵخوێندوون و لێیان بێ هیوا بووە، کە بە قسەی بکەن بە تووڕەییەوە پێیان دەڵێ: ئەتۆ چۆنێک دەژی من هەر مەلامە. واتا ئەمن ئەو هات و هاوارەم هەمووی هەر بۆ تۆیە و بەس، ئیتر من بۆ ئەوەم نییە خۆم بە پلە و پایەک بگەم، چونکە من مەلام و مەلایەتیشم پێ گەلێک گەورەیە و نامهەوێ لەوەی بالاتر بم کە ئێستا لە جێی پێغەمبەرم و ئیتر چ پلە و پایەیەک لەوەی بالاتر دەبێ؟

بەڵام دووبارە بە خۆی ناوەستێ و هاواری لێ بەرز دەبێتەوە و دڵە پڕ هەست و ئەویندارەکەی دووبارە وەکوڵ دێتەوە و ناچار وبێئیختیار دەڵێ: برا بەسیە ئیتر، خەتمی کەلامە. واتا بەسیەتی ئەی کاکی خۆم واز لەو تەمبەڵی و تەوەزەلییەت بێنە و وەخۆ کەوەو فێری زانیارییە پێویستەکان ببە و بۆ گەلی خۆت و نیشتمانی دابەش کراوی خۆت تێکۆشە و ئەو ژیانە تاڵە ئاڵوگۆڕ بکەو تاڵی و خەفەت گۆڕ بکە. ئاخر هەتا کەنگێ پێو بڵێم و هەتا کەنگێ دڵم لە تاوی ئێوە وە کوڵ بێت، خۆ من:

هەروەختە لە داخی ئێوە بمرم
رۆییوە قەرار و هۆش و سەبرم

جـا ئـا بەو جـۆرە لێرەشـدا کـوڵی دڵـی خـۆی هەڵـدەڕێژێ و دەفەرموێ:

بـۆ خۆتـان سـەعی بـکەن نـانێکو بێـتە دەستی
ئینـسانی مەعیـدە خـاڵی نـاو زگـی ڕاناوەسـتی
{مـیللەت ئەگەر فەقیـر بـێ ئـاخر دەبێـتە ئەسـیر
گوێ لە قسەی من ڕاگرە ئەی مەردی ڕەوشەن(ضمیر)
خـاکو هەمـوو مەعـدەنە، مەعـدەنی زێـڕ و زیـوی
پـڕ لە لەعـل و یـاقووتە نـاو شـاخ و داخ و کێـوی
ئەممـا ئێـوە نـازانن لە بەر گێـژ و دەبەنگـی
ئەو زەمـرووت و یـاقووتە چلۆنتـان دێـتە چەنگـی
{ئێوەش خـۆ بە قسەی خۆتـان گەلێکی خاوەن خـاکن
بەڵام نیـسبەت بە خۆتـان بـێموبـالات و بـاکن}
{ئێوە لەسـەر ئەو خـاکە دەبوو خۆتـان بە کوشت دەن
داگیـرکەران بکـوژن یـا لە وڵاتیـان دەرکەن}
{بە خـوا لە داخـی ئێـوە مـن هەر خەریـکە بمـرم
یـا بخنکـێم لە قینـان یـانە زەردوویـی بگـرم}
{ئـاخر چـۆن ئەوە حـاڵە لە چـاو کـوللی میللەتـێ
هـەر کـوردی خـانەوێـران بـژی لـە نـاو زیـللەتێ}
{تـو نـە تـە وە ی میـدیا وقوبـاد وکـە یخوسـرە وی
هە ستە خیرە ت بنوێنە هەتا کە نگی دە خـە وی ؟!}
{زۆر شە رمە بۆ ڕۆڵەی کورد هێندە سەرنە وی کرد ن
تـو هـەرجـا ریـکی دەمـری مە مرە لەترسی مـرد ن}
{بـاب و بـاپیرانی تـۆ کەی وا بە زە لیلـی چـوون
دەوڵەتـی مـاد و ساسان گەورەی هەمـوو دنیا بـوون}
{ئەمجـا لە دوای ئەوانـیش سەلاحـەدد یـنی د لـێر

ها تـه مەید انی خەبات، کورە کــوردی نێـــرە شێر}
بــرۆ تەئـــریخ وەخـــوێنە کـــوردی فەقیــــر و هەژار
{بــزانە مــیللە تــی تــۆ کەی ئــاوا بــووە پە تیــا ر}
{ئـە ومیللـە تـە کوردە ی تـو ڕۆژێـک نیـوە ی جیهانی
لـــە ژ ێـر ڕکـــێفی دابـــو بـــهلّام ئـە تـــو نا زانـــی
{ئەمـــن ئەوا پــێم گـــوتن ئێـــوەش مەیلــی خۆتـــانە
نەکەن لە دەســـتی دەرکەن ئەو مەعـــادین و کـــانە}
{کو ردی مە ردی بە خیرە ت دەسا هە ستە پێشکە وە
خۆکـــورد لە ڕێی ئازادی پیش قفلە یـــە و پیشڕە وە}
(و مـــا علــــی الرســـول إلاّ الـــبلاغ المبـــین)
ئـاخر تـو خـوا تـا کەنگـێ ئـاوا بە زیللەت بـژین؟!}
حاســـڵی عەرزوو دەکەم بە ئە مـــری خیــــر الانــام
دیـن و دنیـا ڕێـک بـخەن نـامە تەمـام وەســـەلام

# چەند نموونە لە دراوەکانی سکەلێدراوی ساسانیان




نموونەی (١)



Coins of the Sasanian kings, showing their crowns.

نموونەی (٢)




**نموونەی (٤)**

## گەڕانەوە سەرباسی پێشوو:

جا کاتێ ماموستای بەڕێزمان ماموستای کۆیی ئەو هەموو هێزودەسەڵات و سەرداری و سەروەری و گەورەییە و ئەو هەموو ئازایەتی و دلێری و پیاوەتی و ئەو هەموو شانازییەی دەورانی مادەکان و ساسانییان و سەلاحەددینی ئەییووبی بیردێتەوە لەگەڵ ڕەزیلی و زەبوونی و هەژاری و داماوی و بێدەسەڵاتی و چەوساوەیی و ژێر چەپۆکی و بەدبەختی ئێستای کوردان بەرابەری دەکات وەهە لێ دەسەنگێنی، دڵی بەخۆی و بەحاڵی گەلەکەی دا دەمێنێ و مەنجەڵی لەکوڵی دەروونی پتروە جۆش دێ و زلق زلق دەکوڵێ و داخ و خەفەت و پەژارە بۆ ئەو کاتی دەخواو زۆر پەژار و خەمبارو داماو دەبێ و بە پەرۆشەوە هەناسان لە وەها دڵێکی پڕلە کوڵی خۆی هەڵدەکێشێ ودەڵێ:

{{ئێوەش خۆ بە قسەی خۆتان گەلێکی خاوەن خاکن
بەڵام نیسبەت بە خۆتان بێموبالات و باکن
ئێوە لەسەر ئەو خاکە دەبوو خۆتان بە کوشت دەن
داگیرکەران بکوژن یا لە وڵاتیان دەرکەن
بە خوا لە داخی ئێوە من هەر خەریکە بمرم
یا بخنکێم لە قینان یانە زەردوویی بگرم
ئاخر چۆن ئەوە حاڵە لە چاو کوللی میللەتێ
هەر کوردی خانەوێران بژی لە ناو زیللەتێ
باب و باپیرانی تۆ کەی وا بە زەلیلی چوون
دەوڵەتی ماد و ساسان گەورەی هەموو دنیا بوون
ئەمجا لە دوای ئەوانیش سەلاحەددینی دلێر
هاتە مەیدانی خەبات، کوڕە کوردی نێرە شێر

بــڕۆ تەئــریخ وەخــوێنە کــوردی فەقیــر و هەژار
بــزانە میللەتــی تــۆ کەی ئــاوا بــووە پەتیــار}}

ئەمــن ئەوا پــێم گــوتن ئێــوەش مەیلــی خۆتــانە
نەکەن لە دەســتی دەرکەن ئەو مەعــادین و کــانە
(و مـــا علـــی الرســـول إلاّ الـــبلاغ المبـــین)
ئــاخر تــو خــوا تــا کەنگــێ ئــاوا بە زیلــلەت بــژین؟
حاســڵی عەرزوو دەکەم بە ئەمــری "خیــر الانــام"
دیـن و دنیـا بـا ڕێـک بخەن نـامە تەمـام وەسسەلام

# ژیانی وا بەئالام و بەمیحنەت

ماموستای دانـا وزانـا و هۆشـیار و هەسـتیاری دڵ پـڕلە کـوڵ دووبارە مەنجەڵـی دڵـی لە کوڵی زۆر بە تەوژم وەک حەوجۆشێکی زۆرلە جۆش زڵقان دەدا وجۆشی نانیشێتەوە. چونکە بیر لە ژیـانی تفت و تاڵی وەک ژەقنەمووتی کوردی هەژار دەکاتەوە و کوڵی دڵـی تاو لە تاوێ لە جۆش و خرۆشتر دەبێ.

ئەو بەڕێزە کاتێک تەماشا دەکا ژیانی کورد هەمووی هەررەنج و ئـازار و خەم و دەرد و کـوڵە وهەرچـی کـوردە تەنـانەت لە گیـانی خۆشی هەر ئەمین نییە و هەمیشە دژمنەکەی بۆی لە بۆسەدایە ود ەیهەوێ لە کەمینی بخا وبە یەکجاری نیخەپەستی بکـا و لە نـاوی بەرێ، بە کورتی ژینی کورد و مرۆڤی کورد لە ژینی هەموو کەسێک تاڵترە و ناخۆشترە وبگرە لە سەرخاکی خۆشی ولە مـاڵی خۆشیدا لە گیـانی خـۆی بـێمەترسـی نیـیە نەخـشەی تواندنەوە و لەنـاو بردنیشی هەرلە گۆڕێدایە.

جـا مامۆسـتاش بە هەمـوو ئەنـدام وە ژیریـی و هەسـت و ویژدانییەوە بەهەموو بیرو ئاوەزی هۆشیار و بێدارییەوە دەیبینێ و هەستی پێ دەکا، ناچار کوڵی دڵـی دەردەبڕێ و پڕ بە زاری هـاوار دەکا و دەڵێ ژیانی ئاوا بۆچی دەبێ ئەو ژیانە ژانە، برکە و کوڵ و دەرد و خەمە، ئیتر ژیـانی وا بە ڕەنـج و ئـازار و پڕ لە پەژارە یـا خوا هەر نەبێ و بەنەفرین بێ،چونکە بەڕاستی هێندە تاڵ و توژن و سەخت و دژوارە، کە لە تاڵی و تفتیدا نە گوژاڵ و کەکرە دەیگەنێ و نە ژاڵە.

جـا مامۆسـتای تـاڵی چێـژ و راسـتی وێـژی کوردمـان دەفەرمـوێ سەرەڕای تاڵی و تووشی و ناخۆشی هەمیـشەیی ئەو ساڵ هەر زۆر

زۆر لە ساڵەکانی دیکەش تاڵترە و ناخۆشترە. ئەو ساڵ ئاسمان لە باتی بارانی رەحمەتی سالانی لە ماتەم و شیوەندا قوڕی وەسەر خۆی کردووە.

بەڵام بە داخەوە جەنابی مامۆستا روونی نەکردۆتەوە داخوا ئەوساڵ بۆچی و لەبەر چی وا ئاسمان و گیاو گوڵ و دارو درەخت و باغ و راغی شاری کۆیە و هەموو کورد و کوردەواری ماتەمینە و ئاوا قوڕیان وەسەر خۆیان کردووە؟ ئیتر بۆ ئێمەی چاو لە زاری وی ڕوون نەکردۆتەوە کە لەو ساڵەدا چ بووە و چ رووی داوە؟

بەڵام وەک من بیرم بۆی دەچێ ڕەنگە ئەو ساڵە ساڵی بە برینداری بە د یل گرانی کەڵە پیاوی زۆر هۆشیاری کورد شێخ مەحمـوودی نەمر و هەروەها تێکچوونی دەوڵەتەکەی و گیرانی پایتەختەکەی، واتا شاری سولەیمانی کەوا بە تازەگی دەوڵەتێکی نەونەمامی موسڵمانی کوردستانێ تێدا دامەزراندبوووبێت کە بەڕاستی جێی خۆیەتی زەمین و ئاسمانی کورد و دار و بەردی کوردستان لە ماتەمدا بێ و شینێ بگێڕێ و قوڕ وە سەری خۆی بکا.

# بەدیل گیرانی شێخ مەحموود

شێخ مەحموودی نەمر واتا زیندەیاد لە شەڕێکی قارەمانانەدا لەگەڵ دەوڵەتی زۆرداری ئینگلیس لە مەڵبەندی دەربەندی بازیان لە بەرواری ١٩١٩/٦/٩ زایینیدا زۆر بە سەختی بریندار بوو بە کەنەفتی کەوتە بن بەردێک کە لە دوایی بە یادی ئەو شێخە قارەمانە خوا لێخۆشبوە ناویان نا بەردە قارەمان.

بە داخێکی گرانەوە ئەو رۆژە ئەو بەڵا گەورە بە سەر گەلی کورد هات و رۆژی تێکشکانی ئەرتەشی کورد و رۆژی چارەڕەشی گەلی کورد بوو. چونکە هەر ئەو رۆژە لە دەربەندی بازیان سوپای کورد وەها شکا کە خۆی پێ نەگیرێتەوە. بەڵام بەو حاڵەش تا بەشێکی هەرە زۆری ئەو ئەرتەشە دلێرەی کورد لە ناو نەچوو، مەیدانی شەڕیان چۆڵ نەکرد و قارەمانانە بەربەرەکانیان کرد و فیداکاری و لەخۆ بوردووییان نیشان دا. ئەو رۆژە کوشتە و برینداری کورد لە ژمارەدا نەبوو، شەڕگەکە پڕپڕ بوو لە لاشەی کوژراو و برینداری هەردووک لا، بەڵام هی کورد زۆر پتر بوون لە هی دژمن.

مەلیک مەحموودی قارەمان لەو بریندارانە بوو کە زۆر کەنەفت و کەلەلا بوون و خۆیان پێ قوتار نەدەکرا. ئینگلیسییەکان کە بەو سەرکەوتنەیان سەرمەست بوون، دە نێو لاشەی کوژراو و و بریندارەکان دەگەڕان تا جەندەکی بێگیان یا نیوەگیانی مەلیک مەحموود وەبینن و لەگەڵ خۆیان بیبەن. کەسێک بە نێوی موشیر لاشەی نیوە گیانی مەلیکی خوا لێخۆشبووی دیتەوە و هەڵیانگرتەوە و بردیان بۆ بەغدایە.

جا دوای ئەوەی کە برینە سەختەکانی لەشی ساڕێژ و زامە قووڵەکانی دڵی قووڵتر بوون لە بەرواری ٢٥ مانگی تەمووزی ١٩١٩

زیندانی لە دادگایەکی زۆر نادادگەرانەدا بڕیاری خنکێنرانی خۆی و هاوڕێیەکەی شێخ حەمە غەریب کە وەزیری ناوخۆ بوو، درا.

مەلیکی خوا لێخۆشبوومانیان زۆر لە زیندانیدا هێشتەوە و نەیانوێرا بیکوژن. پاشان هەرخۆیان بڕیاری خنکێنرانی مەلیکیان گۆڕی هەڵیان شاندەوە وکردیانە زیندانی هەمیشەیی، بەوحاڵەش دووریان خستەوە بۆشاری (ئەندامان) لە هیندوستانی ژێرچەپۆکەی خۆیان.

جا هەرلەوشەڕەدا کە شێخ مەحموود بە بریندارى گیرا و ژمارەیەکی زۆریش لە پێشمەرگە قارەمانەکانی کوردستان خۆیان کردە قۆچی قوربانی و گیانی پاکی خۆیان فیدای گەل و نیشتمانەکەی خۆیان کرد ، سوپای سەرکەوتووی دژمن نەگەڕایەوەو ڕانەوەستا، بە شەڕو قوونەشەڕهات هەتا پایتەختی پیرۆزی یەکەم دەوڵەتی سەربەخۆی ئیسلامی کوردی داگیرکرد و هەموو دام ودەزگا وسازمان و ڕێکخراوە و ئۆرگانەکانی میری تێکوپێک دان و بە جارێکی لە بەرێکی هەڵوەشاندن.

جا ئەگەر وا بێ و مامۆستای بەڕێزمان مەبەستی لەو ڕۆژەی کە باسی دەکا ئەو ڕۆژە (ڕۆژی گیرانی شێخ مەحموود و داگیر کرانی پایتەخت و تێکدرانی دەوڵەتی کورد) بێ، بەڕاستی جێی خۆیەتی، کە نەک هەر مامۆستای بەڕێز و خەمخورمان بەڵکە هەرچی کوردە قوڕ وە سەر کات، چونکە مامۆستا خۆی گوتەنی ئەو ڕۆژە ڕۆژی شینی کوردە و هەموو کوردێک دەبێ هەر قوڕ بپێوێ و شاخ و کێو و دار و بەرد و گژوگیای کوردستانیش هەمووی هەر شینی بێ و قوڕ وەسەر خۆی بکات. جا بەتایبەتی شاری کۆیە شاری مەلای کۆیی، دەبێ تەنانەت باغ و ڕاغ ودار و درەختیشی هەر لە ماتەمدا قوڕبدا بەسەر خۆیا.

بەڵێ ئەو شینە شینی قەومی کوردە  نە قیامەت رابووە لەو دار و بەردە
سەماش ئیمساڵ لە جێی بارانی رەحمەت  ئەبارێنێ قوڕوخۆڵی مەزەللەت

جـا ئەگەر مامۆسـتا مەبەسـتی لە رۆژی شـینی کـورد رۆژی ۱۹۱۹/٦/۹ نەبـێ، بـێگومـان دەبـێ مەبەسـتی رۆژی ۲٤ کـانوونی دووهەمـی ۱۹۲۳ی زایینـی رۆژی مـۆر کرانـی پەیمـانی دژی کـوردی لـۆزان بـێ کە لەو رۆژەدا پەیمانێـک بە هـۆی پێـداگرتنی دەوڵەتـی ستەمکاری وەختی تورکیا لە دژی گەلـی کـورد نووسرا و مـۆر کـرا. بەو پەیمانە هەموو ئەو تا زیاری (امتیاز)انەی کە بە هۆی پەیمـانی سیڤەر بە کورد درابوون هەڵوەشانەوە.

جـــا مـــن خـــۆم لە پـــارچە هەڵبەســـتێکی دووروودرێـــژ بە نێوی"وتووێژی کورتەک وبێخـاڵ"دا ئاماژەم بەو پەیمانانە، کە بـۆ کورد ولە دژی کورد بەستراوە کردووە و گوتوومە:

## پەیمانەکانی دژی کوردو بۆ کورد لەزمان بێخاڵەوە

یەک دوو پەڕ مێـــژووی بەدبەختـــی کـــوردی
وەرە وەخـــــوێنین کەمێـــــک بە وردی
ئەو پەیمـــانەی وا لە ســـیڤەر بەســـترا
چـــرای هیـــوای کـــورد بەوی هەڵکـــرا
لەو پەیمـــانەدا کـــە ســـوێند خۆرەکـــان
ســـەر بەخۆییـــان دا بە بـــڕێ کوردســـتان
هەر چەنـــدەکەم بـــۆ ئەو تـــاقە چـــرایە
ئەو دڵـــۆپە ئـــاوە بـــۆ ئەو مەزرایە
بەڵام ئەســـتێرەی بەختـــی گەلـــی کـــورد
لە ئاســـۆی ئـــاوات ترووســـکەی دەکـــرد
کەچـــی بە زۆری و پێگـــری تورکـــان
پەیمـــانی ســـیڤەر گـــۆڕدرا بە لـــۆزان

ئەمجـــــا لە دژی هەمــــوو کوردســــتان
کـــــرایە ســـــەعداباد پەیمــــانی لـــــۆزان
ســـێ میـــری چەپەڵ ســـێ دێـــوەزمەی ڕەش
پەیمانیـــــان بەســــت کـــورد بنێـــنە هەش
لە دژی کـــــوردان دەیــــان پەیمـــــانی
ئـــــاوا بەســـــتراوە، دەبــــێ بزانـــــی

بەڵێ جا مامۆستای دڵ لە کوڵی کۆیی کاتێ کە ئەو هەموو دەردو کـوڵ و داخ و خەفەتەی گەلـی هەژاری کـوردی وە بیـر دێـتەوە کە دیارە قەتیشی هەر لە بیر نەچۆتەوە و ناچێتەوە، دەروونـی پـڕ لە جۆشـی وەکـوو دەریـایەکی پێـل‌هـاوێژ شـەپۆلان دەدا و دەکەوێـتە تێکەوە هاویشتن و کەف کـردن و هەڵمەکوتی لـێ بەرز دەبێـتەوە و شـەپۆڵەکانی وەک کێوەکـانی کوردسـتان گەورەن و بەرز دەبـنەوە. چونکە ئەو بەڕێزە دڵ پڕ کوڵە زۆر چاک دەزانـێ، کە ژیانی کـوردی بێچارە ئەوەندە ناخۆش و سەخت و تـاڵ و تووشە کە لە تـاڵیـدا نە گوژاڵ و نە ژاڵە و نە کەکرە هیچیان نایگەنێ.

سەرەڕای ئەو هەمـوو تـاڵی و تووشـی و سـەختییەی هەمیـشەگی ئەوساڵ لە باتی بارانی ڕەحمەت، ئاسمان قوڕ و خۆڵی زەبـوونی و هەژاری بە سەر کورددا دەبارێنێ، هەروەک بە دیرێژی و بە روونـی باسمان کرد.

وا دیارە ئەو ساڵەی کە مامۆستا ئاماژەی بۆ دەکا سـاڵی دابەش کرانی کوردستانی گەورە بێ یـان سـاڵی بەستنی پەیمـانی شـوومی لۆزان، یان پەیمانی سەعداباد و بەغداد بێ، جا دەفەرموێ تەماشا کە لەو ماتەمەدا شـاری کـۆیە تەنـانەت بـاغ و راغـی شـارەکەش لە ماتەمدا قوڕی وە سەر خۆی کردووە.

شــاری کــۆیە بە هــۆی پیــاوانی گەورە و دڵــسۆزی وەک مەلا عەبدوڵلای یەکەم و دووهەم و سێهەم و هەروەهـا مەلایـانی دیـکەی جەلی‌زادە و پیاوانی دووربینی وەک حاجی قادر و مامۆستای کۆیی کە خەمخۆر و پێشڕەو و سەرقافڵەی کاروانی خەباتی رزگاریخوازی کـورد و کوردسـتان بـووە لەگەڵ شـارەکانی دیـکە جیـاوازی هەیە. هەروەها بە هـۆی بەهـار و سروشـتی هـاودەنگی و هاوکـاری لەگەڵ کورد و کوردستان کردوە و بەرگی شینی تازیەباری لەبەر کـردووە، ئیتـر ئەوسـاڵ نە گـوڵ پـشکووت و نە بولبـوڵ خوێنـدی کە دیـارە مەبەسـتی گـوڵی هیـوا و شـادی و هومێـد و بولبـولی سروشـتی خۆیەتی.

راســتی مامۆســتا ئەو رووداوە دڵتەزێــنە ئەوەنــدە بە گەورە و گرینگ دەزانێ کە پێی وایە لە تاوی کورد و کوردستانی زۆر لێکـراو گیـا و گـوڵی زەویـش هەر لە ژینـی خۆیـان بێـزارن، ئیتـر لە هەر لایەک شین و شەپۆڕە و کوردەواری ماتەم دایگرتووە. جا لە دواییدا دەفەرموێ:

چ قەومــــــاوە لە دنیـــــــادا خـــــــودایە
چ شــــینێکە و لە بـــــۆ کــــێ دانـــــرایە؟!

پاشـان دەفەرمـوێ: بەڵـێ بـا هەمـوو کەس بزانـێ کە ئەو شینە شـینی کـوردە کە هەر دەڵێـی پەسـڵان و رووداوە گـرینگەکەی رووی داوە و ئیتر ئەورۆ هەرچی کوردە و لە هەر جێـیەکە دەبـێ هەر قـوڕ بپێوێ. بۆ کێ؟ بۆ شێخی نەمر. بۆ دەوڵەتی کوردسـتان. بـۆ دابەش کرانی وڵاتی کورد.

ئەمجا ڕوو لە خوای گەورە دەکا و دەس دەکـا بە نـزا و سکاڵا و پاڕانەوە و دەردە دڵ و گلەیی دەکا، کە خودایە ئەو گەلەی تۆیان چ

لێ کردو چ پێ کرد؟ ئەدی تۆ بۆچی لێی ناپرسی؟ خوایە هاوار و هانامان هەر وەبەر تۆیە.

هەروەها دەڵێ قوڕی کوێ من وەسەر خۆم کەم بۆ گەلی کوردی کە خۆت زانای ئەی خودایە چ دەردێکیان داوەتێ و چیان بە سەر هێناوە؟

دڵـــم بـــۆ کـــورد و کوردســـتان بە دەردە
ژیـانـم تـاڵ، هــەنـاســەم ســووک و ســەردە
ژیـانـــی هێـنـدە تیـــژ و تـــۆش وتـالـــــە
نـــە گـــوژاڵ هــــێندە نـــا خۆشـــە نەزاڵـــە

راستی مامۆستا هەقیەتی کە ئاوا لەم ژینە بێزارە چونکە بێگومان ژیانی وا شیاوی گەلێکی وەها گەورە وخاوەن زێد ونیشتمان و فەرهەنگ وزمان نییە وئیتر هەر بۆیەش دەفەرموێ:

## ژیانی وا بە ئالام

ژیـــــانی وا بە ئـــــالام و بە میحـــــــنەت
بە لەعـــنەت بـــێ، بە لەعـــنەت بـــێ، بە لەعـــنەت
چ ســـاتێکی لە نەفـــسی خـــۆت ئەمـــین نـــی؟
دەمـــــێکە یـــــانە دەڕوا یـــــا ئەمینــــــی؟
هەمـــــوو عـــــالەم لە حـــــاڵی خـــۆی بە دەردە
شـــــەهە، میـــــرە، جحـــــێلە، دەوڵەمەنـــــدە
ژیـــــانی هێنـــــدە تیـــــژ و تـــــرش و تـــــاڵە
نە گـــــــوژاڵ هێنـــــــدە ناخۆشـــــــە نە ژاڵە
ســـــەما ئیمـــــساڵ لە جێـــــی بـــــارانی ڕەحـــــمەت

دەبارێنێ قوڕ و خۆڵی مەزەللەت
تەماشای باغ و راغی شارەکەی کۆ
لە ماتەمدا قوڕی داوە بە سەر خۆ
بەهاریش ئەلبیسەی شینی لە بەر کرد
نە گوڵ پشکوت، نە بولبول چەهچەهی کرد
گیاش هەتا لە ژین بێزارە ئیمڕۆ
لە هەر لایێ فیغان و شین و ڕۆڕۆ
چ قەوماوە لە دونیادا خودایە
چ شینێکە و لە بۆ کێ داندرایە؟
بەڵێ ئەم شینە شینی قەومی کوردە
قیامەت ڕابووە لەم دار و بەردە
ئیتر ئەوڕۆکە ڕۆژێکە کەوا کورد
لە دەستی داوە هەرچی وەکۆی کرد
لە شار و دێ، لە دەشت و دۆڵ و کێوی
هەرچی کوردە دەبێ هەر قوڕ بپێوی
قوڕی کوێ کەم وەسەر خۆم بۆ گەلی کورد
خودایە ئەم گەلەی تۆیان چ لێ کرد؟
دڵم بۆ کورد و کوردستان بە دەردە
ژیانم تاڵ، هەناسەم سووک و سەردە

# شیوەن بۆ سەعد زەغلول



سەعد زەغلول

سەعد زەغلول کابرایەکی مافناس (حقوقدان)ی میسرییە و لە گەورە گەورانی خەباتکاری ڕێبازی سەربەخۆیەتی گەلی میسر بووەو لەساڵی ١٨٥٧ی زایینی لە میسر لە دایک بووە و لە ساڵی ١٩٢٧ کۆچی دوایی کردووە. واتا حەفتا ساڵی تەواو ژیاوە و لە ڕێی گەیاندنی خاوەن مافەکان بە مافی خۆیان خەباتی کردووە.

ئەو بەڕێزە لە زانستگای جامع الازهر خوێندوویەتی و یەکێکە لە فەقێکانی ئەو زانستگا ئیسلامییە و لەوێدا پێ گەییوەو شاگردی وەفادارو هاوکاری زۆر بەکاری بەڕێزان سەیدجەمالەدین ئەفغانی و شێخ محەمەد عەبدە بووەو لە ساڵی ١٩٢٤ زایینیدا سەرەک شالیارانی میسر و سەرۆکی کۆڕی نوێنەرایەتی میسری بە ئەستۆوە بووە.

حیزبی السعدی، یان الوفد لە میسردا دامەزراندووە و خەباتێکی زۆری بۆ سەربەخۆیەتی میسر کردووە و سەرەنجام لە ساڵی ١٩٢٧ زاییینیدا وەک باس کرا کۆچی دوایی کردووە.

جا بە هۆی ئەوە کە لە کارەکەی خۆیدا ڕاست بووە و بەڕاستی دڵسۆزی هۆزی خۆی بووە هەموو کەس هەر خۆشی ویستووە. بەڕێز مامۆستای کۆییش ڕێزی بۆ داناوە و تەنانەت دوای مردنیشی شینی بۆ گێڕاوە و شەپۆڕی بۆ کردووە و پێی هەڵدەڵێ و نزای بۆ لە خوای گەورە دەکا و بۆی دەپاڕێتەوە. کە بەو جۆرەی خوارەوە دەس پێ دەکا و دەڵێ:

## شیوەن بۆ سەعد زەغلول

عەرەب و کورد و هیند و قەومی مەغۆل
هەموو مەحزونە بۆ سەعد زەغلوول
ماتەمێکە لە عالەمی شەرقا
ئەگرین ئاسیا و ئەفریقا
ئەمەلی ئاسیا چلۆن دەڕوێ؟
ئاسیا ئاوی گەر نەما دەنوێ
سەیری سودان کە ڕەش هەڵایساوە
گەورە و گچکە خۆی لە نیل داوە
سەعدی میسری غروبی کرد و نەما
نیلی میسری دەڵێی خەمە لە خەما
بە وەفاتی زەعیمی بێهەمتا
دوور نییە کە بڵێم عەرەب فەوتا

نەکو تەنها وەزیری میسری بوو
بەڵکو حەقەن عەزیزی میسری بوو
تەختی میسری شکا لە بەدبەختی
کێ یە تەعمیری کا بە تەڕ دەستی
نەحسی ئەکبەر لە جانبی غەربی
سەری هێنا دەری خودا چ دەبێ
دەبێ خاوەر زەمینی ئالی زەمەن
چی بەسەر بێ لە ئافەت و لە میحەن؟
ئەوی عەقڵی هەبێ لە نێر و لە مێ
وەختە بمرن لەوی غەم و ئەلەمێ
ئەو لە میسر و ئەمن لە شاری کۆ
بۆی دەگریەم بە دەنگ و بانگ و ڕۆ
بۆی دەگریەم بە خاترێکی مەلول
دەکو لاڵ بم بۆ سەعد زەغلول
ڕەببی هەر تۆی کە خاوەن ئەمری
ئەوی زیندوو بێ غەیری تۆ دەمری
ڕوحی زەغلوول لە جەننەتولمەئوا
شادمان بێ (کیف ما یهوی)
تا لە میسرا حەیاتی میللی هەیە
ئەسەری هیممەت و حەیاتی ویە

ئالێرەدا بە جوانی بۆمان دەردەکەوێ کە مامۆستای کۆیی ئەگەرچی مرۆڤێکی نەتەوەخواز بووە بەڵام هەرگیز بەرچاوتەنگ نەبوە، بەڵکە زۆر مرۆڤێکی لێبوردوو و دڵفراوان و سەخی و میهرەبان بووە. ئەو هەرچەند لەبەر بەدبەختی گەلەکەی زۆرتر

هاواری هەر بۆ کورد بووە، بەڵام لە راستیدا پێوەندی بە هەموو گەلانی موسڵمانی جیهانەوە هەبووە و دڵسۆزی هەموویان بووە و دەتوانین بڵێین کە ئەو تەنیا هەر هی کورد نەبووە و پێوەندی بە هەموو چەوساوەکانی جیهانەوە هەبووە.

تەماشا کە چ شینێک بۆ عەرەبێکی چاک و پاک دەگێڕێ؟ لە مەرجێکا کە خۆی زۆر ئاگادارە و دەزانێ کە عەرەبەکان چ ئەندازە بۆ کوردان خەراپ بوون و چ ئەندازە ستەمیان لێ دەکردن. بەڵام مامۆستا خوا لێی خۆش بێ زۆر چاک دەزانێ کە ئەو ستەمەی لە لایەن عەرەبەکانەوە بە سەر گەلی کورددا سەپاوە بێگومان هەموو عەرەبێک پێی خۆش نییە و تەنانەت هەر لێشی قایل نییە و ئیتر ئەگەر پیاوی ستەمکاریشیان هەیە مرۆڤی باشی وەک سەعدی زەغلوولیشیان تێدایە و جێی خۆیەتی کە ئەگەرچی ئەو لە میسریشە و لە ناوەندی هێز و دەسەلاتی عەرەباندا دەژی، منیش لەشاری کۆیەم و لەهەرێمێکی چەوساوەی کوردستادا ژیانی بەژان و ژوار دەبەمە سەرێ، چونکە پیاوێکی چاک و بەڕاژە و خزمەتە و ئامانجی خەراپی نییە و ئاواتی هەردووکمان هەر یەکە بە بانگ و رۆ و داو و هاوار بۆی دەگریم.

بەڵێ بە دڵێکی خەمگینەوە بۆی دەگریت و خۆی بۆ لاڵ دەکا و بۆشی لە یەزدانی مەزن دەپاڕێتەوە کە گیانی پاکی لە (جنة المأوا)دا شاد و خۆش بکا و هەرچۆنێکی بۆ خۆی دەیهەوێ ئاوای لەگەڵ بکات.

ئەمجا دڵنیایی دەدا و دەڵێ کە هەتا گیانی نەتەوایەتی و هەستی گەلویستی لە ولاتی میسرێدا بمێنێ و هەر شوێنەوار و چەخەری ژیان و خەبات و تێکۆشانی ویە و راستیشە پیاوی گەورە و لێهاتوو قەت و قەت شوێنەواری کوێر نابێتەوە و بە درێژایی مێژوو

نێوبانــگ و چەخەر (اثــر)ی خەبــات و تێکۆشــانی هەر دەمێنــێ و ساڵەها لە دوای خۆیان خەڵـک ژیاننـامە و ناسـنامە و خەباتنـامە بۆیان دەنووسن و شانازییان پێوە دەکەن و پێیان هەڵدەڵێن.

بەڵــێ پیــاوی گەورە و هەڵکەوتــوو وەکــوو داری بەری وایە و خەڵک لێی دەخۆن و لە میوە و بەر و سێبەرەکەی کەڵک وەردەگرن. داری میـوە هەرگیـز کـاری بەوە نیـیە کە کـێ بەرەکەی دەخـوا. ئەو بەرەکەی دەگـرێ و میـوەی خـۆی پێـدەگەیەنێ و هەرکەس دەتـوانێ کەڵکی لـێ وەربگرێ.

چـرا خـۆی دەسووتێ و رووناکی خـۆی بە هەمـوو لایەکـدا بـڵاو دەکاتەوە و هەر کەس و هەر گیانلەبەرێک دەتوانێ رێگەی خـۆی بە تیــشکی ئەو وەدۆزێ و ســەر دەرکــا. بــاران دەبــارێ و هەور ئــاو هەڵدەرێژێ و هەرگیز هەور جەتون نییە و رژدی و دەس قووچـاوی ناکـا و بە بـێ جیـاوازی بەخشـشی خـۆی بە هەمـوو لایەکـدا بـڵاو دەکاتەوە.

راســتی پیــاوی گەورە و بەخــزمەت و زانــا و دانــاش ئامــانجی ئەوەیە کە هەموو خەڵک لە خزمەت و راژەکانی کەڵک وەرگرن. ئەو چــرایە و رێ بــۆ هەمــوو کەس روونــاک دەکــا. هەورە و بــارانی رەحمەت دەبارێنێ و هەموو زیندەوەرێک پـاراو دەکـا و تینـوویەتی زەوی دەشــکێنێ. داری بەرەو خەڵــک بەرد و پــلاری پێــدا دەدەن و ئەویش لە بەرابەردا میوەیان بۆ هەڵدەوەرێنێ.

# فێڵی شێخەکان

ڕێوی دەعبایەکی زۆر فێڵباز و وەینسازە. باوە کە دەڵێن دەچێتە لای مەڕ و دەڵێ من هەر لە تیپی ئێوەم و گیاخۆرم. دەچێتە لای گورگ و سەگ و دەڵێ منیش وەک ئێوە گۆشت خۆرم و شا کەڵپم هەیە و دەچێتە لای مەل و باڵندە و دەڵێ دۆستی دڵسۆزی ئێوە و پاسەوانیتان بۆ ئەکەم و لێتان وریا دەبم و دەچێتە لای شێر و ورچ دەڵێ من هەر نۆکەرو خزمەتکاری ئێوەم. ئیتر بەو جۆرە خۆی دەگەڵ هەموو تیپێکی ڕێک دەخا و هیچیان لێی حاڵی نابن و تێی ناگەن کە لە ماکا دژمنی هەمووشیانە و دۆستی بەڕاستی هیچکامیان نییە.

جا بەڕاستی شێخەکانی ئێمەش بەو جۆرەن، لە لای سونییان خۆیان بە سوننی و لە لای شیعان خۆیان بە شیعە و بە کورتی لە لای هەر تیرەیەکی ئیسلام خۆیان دەکەنە ئەو و دەچنە دە بەرگ و پێستی وی. کە دەشتوانم بە ڕاشکاوی بڵێم و گومانیش لەوەدا نییە کە لە لای گاورەکانیش خۆیان بە دژی وان نیشان نادەن.

مامۆستای بەڕێزیش کە زۆر چاک لە فێڵ و فووتی وان گەیشتووە و زۆر بەباشی ناسیونی فێڵەکانیان ڕوو دەکاو یەکێک لەوان دەکاتە ڕووتێکراوی خۆی و دەڵێ:تۆ بەوهەموو فێڵ وفووت و چاو نەزێری خۆتەوە کە بە هیچ جۆرێک ئەوانە لەگەڵ سونیان نایەنەوە خۆت بە سوننی نیشان دەدەی و هەروەکوو پاپ خەڵکی نەزان و نەخوێندەوار فریو دەدەی و بەهەشتیان پێ دەفرۆشی (ڕەنگبێ ئی وا هەبێ بڵێ مامۆستا لێرەدا زۆر زێدەڕۆیی کردووە، دەنا بەهەشت چۆن بە خەڵک دەفرۆشرێ؟) من دەڵێم مامۆستا

ڕاستەقینەی گوتووە و هیچ زێدەڕۆیی نەکردووە. هەر ئەو ساڵانە تەنانەت خەلیفەیەکی شێخی زەمبیلی کە نامهەوێ ناوی بێنم گۆیا ژنێکی زۆر جوانی لە سەر سێ دانگی بەهەشتێ مارە کردبوو. هەموو خەڵکی ناوچەش دەیانزانی تەنانەت من خۆم داکۆکیم لێ دەکرد و دەمگوت وا نییە. کەچی خەڵک پێیان وابوو منیش هەر لەو تیپەم بۆیە دەمهەوێ پاکانەی بۆ بکەم.

بەڵێ جا ماموستا پێی دەڵێ هەی قوڕت وەسەر چەندە بێهۆشی پێت وایە کەس ناتناسێ بەڵام ئەوەی ئایین و ژیرییەکی هەبێ زۆر چاک ئەتۆ دەناسێ و دەزانێ تۆ بۆیە خۆت بە سوننی نیشان دەدەی تا بڵێن ئەو هێتم (قطب) و خاوەنی پلە و پایە و ڕوتبەی گەورەیە!!

بەڵێ ئەتۆ سوننییەکی وای کە لە سایەی تۆ و کەرامەتی تۆوە ئێمە هەم دین و هەم دنیامان لە دەس دا. خەڵک بە هیوای تۆ پشتێندیان کردەوە و روویان دە کار و کۆشش و خەبات و شۆڕش نەکرد و تۆش لە هەموو پێشکەوتنێک دوورت خستنەوە مەگەر دەس بە گونی تۆ بگرن دەنا هیچیان بە دەس نەماوە!! تۆ خەڵکت وەها بەرەو مردە پەرەستی ڕاکێشا بوو کە ڕێگەی ڕاستت لێ ون کردبون و نەتدەهێشت خۆیان وەدوای دەرد و مەرگی خۆیان بکەون و بۆ خۆیان چەکی داکۆکی و بەرگری لە خۆیان پەیدا بکەن و داکۆکی پێ لە خۆیان و وڵات و زێدی خۆیان بکەن!!

چونکە دەتفەرموو فلان و فیسار لە ناو گۆڕا ئاگایان لە ئێوە هەیە و ڕێگە لە گاوران ئەگرن و نایەڵن ئەوان زەبرتان لێ بدەن و زەفەرتان لێ بێنن تەنانەت لە شەری یەکەم و دووهەمی جیهانیدا دەتگوت ئەوان ڕێگە لە کافران دەگرن و ناهێڵن بێنە بەغدایە و ئێوە لە جێی خۆتان دانیشن هیچتان بە سەرنایە. خەڵکت وەها بە تەما کردبوو کە جەنابی شێخ هەر بە فوویەکی فڕۆکە هەڵدەوەرێنێ

کەچی ئەو فلتەفلت و های‌وهۆیەی تۆ هەموو بە درۆ دەرچوو و هیچ شتێک بە خەڵک نەگەیشت و هیچیان بۆ روون نەبۆوە. بەڵام لەبەر بێمێشکی و نەزانی و بێژیری خۆیان ئێستاکەش هەروەکوو خۆیان وان و لەبەر کەریانیان بە دڵ و بە گیان هەر بەندەی تۆن!! بەڵام هۆبالی ئەو خەڵکە هەژار و نەزان و بەدبەختە هەمووی هەر بە ئەستۆی تۆیە... تۆ یا شێخ سوننی بە سەری بابی خۆت چاک دەزانی دەبێ هەروا بی.[1]

ئەمجا بە توندی لە دەمی دەدا و دەڵێ:

کەی سوننی وەک تۆیە؟! سوننی پەیڕەوی بەرنامەی خودان و لە سەر رێبازی راستەقینەی پێغەمبەری خودان و رێبواری رێگەی پێشینیان و جێنشینی راستەقینەی وانن. سوننی پێکەوە زۆر پاکن و هەرگیز وەکوو تۆ نین کە بە درۆ و دەلەسە ماڵی یەکتر بخۆن و یەکتر فریو بدەن و فێڵێ لە یەکتر بکەن:

رێبـــازی ســـــوننییان زۆر رێـــــک و راســــــتە
ئەتـــــۆ ســـــوننی بـــــی، خـــــودا نەخواســـــتە

چونکە لە رێباز و (مذهب)ی سوننیاندا کە رێبازی راستەقینەی پێغەمبەرو یارانییەتی، فێڵ و فووت و خوارو خێچی و شێخ و مێخ و

---

١ ــ بە داخەوە ئێستاش هێندێک کەس هەر پێیان وایە کە بە هیممەتی غەوسی بەغدایە هەرگیز بەغدا ناکەوێتە ژێر چەنگی گاوران چونکە گڵکۆی غەوس عەبدولقادری گەیلانی لەوێیە و گۆیا هەر کاتی گاور چوونە ناو بەغدایە (تۆپی کەلە) کە تۆپێکی ئەفسانەیی و تا ئێستا هیچ کەس نەیدیوە هەر بۆ خۆی وەکار دەکەوێ و هەموویان گوللەباران دەکا و لە ناویان دەبا کەچی ئەوە چوار پێنج ساڵە ئەمریکایی و ئینگلیسی داگیریان کردووە و بە کەیفی خۆیان تێیدا دەگەڕێن و هیچ هەواڵ و شوێنەوارێکیش لە ترو تۆپی شێخەکان نییە.

ڕۆ و دەلەسە هەر نییە و زانایانی سوننی بە توندی دژ و نەیاری ئەو کارەن.

بەڵکە ئەتۆ نەک هەر سوننی نی و بەس، هەر دوژمنی ئیسلام و موسڵمانانیشی و گورگی لە پێستی مەڕدای و خەڵکی چاو بەستراو هێشتا نەیانناسیوی دەنا بێگومان ورگت بە نووکە نێزان دەدڕن و کەلـلەی ناپاکت دەکەنە گۆی شەقێن و پێستی سەرت بە کایە داخننەوە، جا ئا بەو شێوە دەفەرموێ:

## فێڵی شێخەکان

تۆی شێخی ئەهلی سوننە و جەماعەت؟
بەو هەموو کەید و فێڵ و تەماعەت؟
هەروەکوو پاپی، بەهەشت دەفرۆشی
وەی قوڕت بەسەر گەلی بێهۆشی
تۆ بۆیە سوننی، تا بڵێن قوتبە
خاوەنی پایە و ساحەبی ڕوتبە
بەڵێ تۆ قوتبی، قوتبی ژیانی
دائیم گەڕ دەخۆی لە دەوری نانی
بەڵێ تۆ سوننی و سوننی وەها نی
تۆ ئەحواڵی خۆت چاکتر دەزانی
بەڵێ تۆ سوننی، ساحەب کەرامەت
ئەتۆی شافیعی ڕۆژی قیامەت
لە سایەی تۆوە و کەرامەتی توو
دین و دنیامان هەموو لە کیس چوو

بە ئومێـــدی تــۆ پـــشتیان کـــردەوە
دەســـتیان بە گونــت گرەویـــان بـــردەوە!!
دەتفەرمـــوو فـــڵان لە نـــاو قەبـــری
رێـــگە لە کـــافر و بـــێ‌دینـــان دەگـــری
نـــایەڵێ کـــافر بێـــنە بەغـــدایە
ئێـــوە دانیـــشن، چـــوو بە ســـەرنایە
وا بە تەمـــانە حەزرەتـــی شـــێخی
هەر بە فـــویەکی تەییـــارە بێخـــی
ئەم فڵـــتە فڵـــتە هـــیچ و پـــووچ دەرچـــوو
وەبـــاڵی مـــیللەت یـــا شـــێخ بە مـــل تـــوو
ئێـــستێکەش مـــیللەت هەروەکـــوو خـــۆنە
بە دڵ و بە گیـــان بەنـــدەیی تـــۆنە
تـــۆ ســـوننی یـــا شـــێخ بە ســـەری بـــابی
خـــۆت چـــاک دەزانـــی دەبـــێ هەر وا بـــی
ســـوننی تـــابیعی ئەهلـــی خـــودانە
ســـوننی پەیـــڕەوی رەســـولەڵڵانە
ســـوننی ســـالیکی رێگـــای ســـەلەفن
زاهیـــر و بـــاتین، نـــیعمەل خەلەفـــن
ســـوننی زۆر پـــاکن نەوەک وەکـــوو تـــۆن
بە درۆ و دەلەســـە مـــاڵی خەڵـــک بخـــۆن
رێگـــای ســـوننییان زۆر رێـــک و راســـتە
ئەتـــۆ ســـوننی بـــی؟! خـــودا نەخواســـتە

**بەڕێـز وخـوا لێخۆشـبوو مامۆسـتا مەلا کەریمـی فیـدایی پـارچە هەڵبەسـتێکی زۆر جـوانی لە بـارەی ئـاوات وئامـانج وخواسـت وویـستی شـێخەکاندا نووسیوە کە بـۆ بیـرەوەری ئەو بەڕێزە وبـۆ**

پیرۆزی نێوی ئەو بوێژە لێرەدا دەیگونجێنم.

ئەوپارچە هۆنراوەی کاتێک نووسیوە، کە مەلا مستەفای بارزانی لە کوردستانی عێراقیٚ دەستی بە شۆڕش کردووە ودەنگی کوردی بەرز کرد ۆتەوە وبە گوێی جیهانیانی راگەیاندووە.

جا بە هۆی ئەوە، کە مەلا مستەفای بەڕێز لە بنەماڵەی شێخە بەڕێزەکانی بارزانییە و، کە دیارە ئەوانیش هەمیشە لە خزمەت گەلی کوردا بوون، تا ئێستا خەیانەتیان لیٚ نەبینراوە، مامۆستا مەلا کەریمی رەحمەتی، مەلا مستەفاشی هەر بە شێخ داناوە دەنا مەلا مستەفا هەرگیز شێخ نەبووە و قەتیش داوای شێخایەتی نەکردووە. بەڵکە مەلایەکی دڵسۆزی راستەقینەی کوردوکوردستان بووە و تا ژیاوە ئەوپەڕی د اکۆکی لە کورد و مەلای کورد کردووە. من خۆم لە بیرمە کە جارێک مەلاکانی کوردستانی عێراقیی کۆکردبوونەوە پێی فەرمووبوون: (مەلاینە! تا منتان هەم بۆخۆتان کارێک بکەن دەنا دوای من رەنگە رێگەتان نەدەن.) دەنا شێخ و شۆڕش وگەل رزگا کردن شتێکی مەحاڵە.

شێخ مەحموودو شێخ سەعیدی پیرانیش هەردووکیان هەرمەلا بوون و لە بنەماڵەیەکی مەلازادە هەڵقوڵیون وجگە لە شۆڕشی مەلایانە چیدیکەیان نەکردووە ومێژووی ژیان وخەباتیان روونکەرەوەی ئەو مەبەستەیە.

جا ئەوەش بەستە هەڵبەستەکەی مامۆستا مەلا کەریمی فیدایی لەمەڕ وەزن و کێشی شێخانەوە:

## وەزنی شێخان

جەوهەرم زۆرە وەلێ جەوهەر ئەمن بێ‌فەڕ دەکا
داخ و دەردی ئەو زەمانەی ئێمە بێ‌جەوهەر دەکا
دوژمنی کەس نیم و چبکەم بەحری شیعرم دێتە جۆش
هەر بە وێنەی خیگەڕۆنی زەنگە ئەڕۆ سەر دەکا
من دەدەم پەندێ لەبۆ شێخم ئەگەر زیوەر نەبێ
گەر کەرامەت‌دار بێ بەو پەندە ئەو باوەڕ دەکا
پێی دەڵێم ئەی شێخە تۆ بڕوانە شێخی هەندەران
هەروەکوو شێرە دەگەڵ تۆپ و تەیارەی شەڕ دەکا
ئەو کەوا داوایی ماف و سەربەخۆیی گەل دەکا
روو لە یاسایی بەڕێزی دینی پێغەمبەر دەکا
تۆش دڵت ئەوڕۆ لە نێو دەریا و گۆلی ئارەزوو
حەز لە کیژی چاو کەژاڵ و یاری رەنگ ئەسمەر دەکا
شێخی خەڵکی مەنزڵی کێو و چیایە و هی منیش
خەو لە نێو خانوویی بەرز و دۆشەکی مەخمەر دەکا
شخی خەڵکی عاشقی تۆپ و تفەنگە و شێخەکەم
دەست‌بازی هەر دەگەڵ یاری سمت مەڕمەڕ دەکا
شێخی خەڵکی کۆنە چۆغێکی لە بەردا دێتە دەر
شێخەکەی من خۆ عەبایی سەوزی بێ‌ئەستەر دەکا
شخی خەڵکی لەتکە نانێکی هەبێ دەیدا بە خێر
شێخی من داوایی پووڵ و پارە و زیوەر دەکا
شێخی خەڵکی دێتە مەیدانێ وەکوو بەوری بەیان
روو لە دەستەی دژمن و کێشە و شەڕ و سەنگەر دەکا

دژمنـــی نـــامەرد دەشـــکێنێ لە چـــۆڵ و کێـــو و کەژ
دەیگـــرێ دەســـتی دەبەســـتێت و دەمـــی قەمـــتەر دەکـــا
شێخی مـن هەروا بە دەروێش و بە پرچ و موویی ریش
بیـــری داگیـــر کردنـــی ســـەرچاوەیی کەوســـەر دەکـــا
شـــێخی خەڵکـــی حەز لە لاوی زیـــرەک و زانـــا دەکـــا
شـــێخی مـــن مەیلـــی خەلـــیفەی شـــتنەزان و کەر دەکـــا
شـــێخی خەڵکـــی وا لە نێـــو خوێنـــاوە جلکـــی بـــوو شـــەلاڵ
شـــێخی مـــن بە درۆ بە فرمێـــسک ردێنـــی تەڕ دەکـــا
شـــێخ ئەوا هەوڵـــێ دەدا بـــۆ ســـەر بڵنـــدی قەومەکەی
شێخی مـن هەر باسـی جندی سـەر زل و شەشپەڕ دەکا
شێخی مـن ئەورۆ بە تەپـڵ و زەرگ و دەروێشی شـڕۆڵ
ڕوو لە بـــۆ نـــانێ لە گونـــد و تەکـــیە و مینـــبەر دەکـــا
شـــــێخی خەڵکـــــی قارەمـــــانێکە لە شـــــەڕدا نـــــابەزێ
شـــێخی مـــن کـــاتی شـــەڕێ دەبیـــیە ، زەرد و تەڕ دەکـــا
مـــن ئەوەم پـــێ ســـەیرە شـــێخی مـــن لە دیـــدا هەمـــدەمی
مـــامە ســـۆفی تەمـــبەڵ و مـــلیـــان و لۆزەنـــدەر دەکـــا
ئەی خـــودا چـــۆنی بەرابەر کەم دەگەڵ شـــێخی خەڵـــک
کردنـــی ئەو کـــارە مـــن دووچـــاری دەردی ســـەر دەکـــا
بـــۆ خەلـــیفە و شـــێخە دنیـــا بـــوو بە حەشـــری نێـــرەکەر
هەر فیدایی دێت و لەو حەشرەی سەری خۆی دەر دەکا

ڕەنگە ئەوپرسیارە لە مامۆستا مەلا کەریمـی ڕەحمەتـی بکـرێ کە بەڕێز چـۆنە مەلا مستەفای ڕەحمەتیـت بە شێخ دانـاوە؟ هەروەهـا چۆنە ئەوکەڵە پیاوەت بە شێخی خەڵکی ناساندووە؟

لە وڵاما من دەڵـێم دانـانی مەلا مستەفا بە شێخ هەروەک گـوتم بەو بـۆنەوەیە کە ئەوبەڕێـزە لە تـۆرەمەی شـێخە بەڕێزەکـانی بارزانی سەربەرزە وئەوەش، کە دەڵێ شێخی خەڵکی، ئەوە جگە لە

وێنێکی هۆنەرانە چی ترنییە. چونکە ئەگەربە ئی خۆی دانابا پێ هەڵگوتنەکەی هێندە خاوەن چەخەرە نەدەبوو.

سەرەڕای ئەوەش هۆنەران ئەوجۆرە وەینەیان زۆرن، شتی خەڵک بەئی خۆیان وئی خۆیان بەئی خەڵک وهەروەها خۆیان بە خەڵک و خەڵک بەخۆیان دەدانێن و هەمووشی هەربۆ رازاندنەوەی هەڵبەست و وتارە.

## لاڵ بم بۆ نەتەوەی کورد

باوە لە نێو کوردەواریدا کاتێک کەسێک دەرد و بەڵایەکی بەسەرهات یان تووشی کەند وکۆسپ وگیروگرفتێک بوو یان زیان و خەسارەتێکی لێکەوت وکابرا نەیدەتوانی بۆی تێهەڵێنێتەوە ولەو بەڵایە رزگاری بکا خۆی بۆکوێروکەڕولاڵ دەکا و دەڵێ بۆی کوێر بم یان بۆی لاڵ و کەڕ بم یان بۆی نەمێنم و هتد. واتا بریا لەباتی ئەوەی کە ئەتۆ ئەو دەردەت بە سەر دەهات من ئاوا و ئاوام بە سەرهاتبا و بەڵام تۆ یان ئەوم بەو شێوە نەدیتبایە.

جا مامۆستاش کاتێک ئەو هەموو دەرد و بەڵایانە لە سەر سەری کورد دەبینێ و پێشی چارەسەر ناکرێن و بەو هەموو داد و هات و هاوار و بەو هەموو تانوت و تەشەر و بەو هەموو پێشنیار و رێنوێنی تەنانەت بە هیچ کوێیەک ناگات و یەک هەزارەمی تاسە و ئارەزووەکانیشی نایەنە جێ وەکوو ناهومێدێکی دەس لە هەموو پچکێک بڕا و دەس دەکا بە ناڵەناڵ و بە باس کردنی دەردی گرانی گەلەکەی و خۆی بۆ لاڵ دەکا و ئیتر هەر لەو کاتەشدا تانە و تەشەریان لێ دەدا و سەرکۆنەیان دەکا و دەڵێ گەلی کورد لە نێو دژمنانی تورک وفارس و عەرەبی خۆیدا وەکی ئەسپییەک کە لە

نێوانی دوو بەرداندا هەڵکەوتبێ و وەختە بە جارێکی نیخەپەستی بکەن و بیپڵیشێننەوە و بە تەواوی جیقی دەربێنن و بە مەتەڵەی کوردی (ئەو لام تات و ئەم لام تات، وەی بابە جیقم دەرهات).

پاشان پڕ بە زاری هاوار دەکا و دەڵێ لەبەر زوڵم و زۆر و ستەمی فارس و تورک و عەرەبان کە بە هەموویان سواری شانی کوردان بوون و خەریکن دەیخنکێنن!! هەی خەڵکانی خوا و خواناسەکان! فریا کەون کوردەگەل مردا!! هاوار هاوار هاوار!!

ئەمجا بۆ خەڵکی خوا روونی دەکاتەوە کە ئەو کوردە هەژارە بۆچی وای بەسەر هاتووە و بە هۆی چی ئاوای لێهاتووە و دەڵێ چونکە ئەوەندە گەلێکی بێهەست و دەمارە کە هەر کەس هاتە سەری و داوای ئاغایەتی لە سەر کرد لەباتی ئەوەی کە مەردانە لێی راپەڕێ و بە مست گرچووی ببڕێ و بە زللە لاچاوی سوورەوە کاو بەشەق سمتی بتەزێنێ و قوونی بدڕێ، کڕنۆشی بۆ دەبا و هەرچی ئەو بیڵێ قبووڵی دەکا و دەستی بۆ بە سینگییەوە دەنێ.

سەرەڕای ئەوەش کوردەکان کاتێک کە روویان کردە تەکیە و خانەقایان کە بنکەی بەدخوازی و رێبازی ریابازی و فێڵبازی و پایەگای دژی گەلی و دژی ئایینن بە جارێک لە فێرگەو زانیاری و هەموو پێشکەوتنێک تەوەلا بوون و دوور کەوتنەوەو لە جیاتی هەموو کار و پیشە و پڕگاڵێک تەپڵ و دەف و دمبەگ و کەشکۆڵ و دەسحێب و رشتە و شۆڵ و دوگرد و وەکازیان دەس دانێ و هەموویان بوونە بە دەروێش و گەڕیدە،کە ئەوەش بە هیچ دەردێکی وان ناخوا و هیچ زامێکیان چارە ناکا و بەو جۆرە هەموو برینەکانیان تەشەنا دەبن و چڵکێ دەکەن و سەرەنجام پێیان دەمرن. ئیتر هەر بۆیەشە کە وا رەزیل و مەندەمۆر و کز و لاواز و رەنگ زەرد و بێهێزن.

پاشان دەفەرموێ وە نەبێ ئەو گەلە هەمووی هەرئاوا بێ هەست و بیرو هۆش بێ و هەمووی هەر ئاوا گەوج و گەمجە و نەزان بێ و گەلێکی خەمخۆری وەک من تا ئێستا لە تاو دەردی کوردی سەری نایەوە و ئەو ئاوات و ئامانجەی بردە ژێر گڵی.

ئەمجا ئەمە ئەگەیەنێ کە خۆی هەرچەندە وەکوو کێوی دەماوەند قایم و قۆڵ و پتەو و بەهێز و خۆڕاگرە بەڵام بەو حاڵەش هەناسەی سارد و ئاهی ناهومێدی و بێهیوایی لە دەورەی بۆتە تەومژ و ئاسۆی هیوای لێ تاریک کردووە. هەر دەڵێی کێوی دماوەندە و مژی لێ هاڵاوە!!

پاشان باسێکی مێژوویی دەکێشێتە پێش و دەفەرموێ کە گەلی من هەمیشە هەر ئاوا نەبووە، بەڵکە لەمەو پێش گەلێکی چوست و چالاک و ئازا و ژیرو هۆشیار و مەرد و نەبەز بووە. هەموویان ڕێکوپێک و خاوەن باوڕ و متمانە بە یەکتر بوون و هەموویان خۆگرو خۆڕاگر و هاوڕاز و هاودەردی یەکتر بوون. جا بەتایبەتی لە دەورانی سەرداری کوردی موسڵمان سەلاحەددینی ئەییوبی هیچ گەل و هۆزێک لە دنیادا وەکوو کورد نەبووە و لە سەر کورەی زەوی هیچ نەتەوەیەک نەیتوانیوە وەکوو کورد بێتەوە و یەکەتازی مەیدانی بەزێنە (مسابقە) بێ چونکە کورد هەر ئەوک وردەیە کە لە چاخی سەلاحەدینی ئەییوبی وەک کێوی ئەلوەند و قەندیل و زاگرۆس لە بەرابەر هێرشی لافاوی جوولەکە و فەلە و گاورەکانی رۆژئاوایی و ئورووپاییدا چەقی و خۆی ڕاگرت.

ئەمجا باسی گەورەیی و گرینگی ئەو شەڕە سەختە کە ئورووپاییەکان لەگەڵ گەلی کورد بەتایبەتی و هەموو ئیسلاما بە گشتی کردیان و بە سەریان داسەپاند دەکا و دەفەرموێ:

چ گەلێک بوو کە بە درێژایی حەوت ساڵ لەگەڵ حەوت پادشای

ڕۆژئاواییدا شەڕی کرد؟ مەگەر هەر کورد نەبوو کە بە تەنیا بۆئەوەی خەلیفەی ئالی عەباسیش یارمەتی بدا و تەنانەت بۆئەوەی سەربازێکیشی بۆ بنێرێ لە بەرابەر ئەو حەوت دەوڵەتە گەورەدا مەردانە ڕاوەستا و هەمووشیانی بە چۆکدا هێنان. ئەدی لەو حاڵەتە تورکی... لە کوێ و فارسی... چی دەکرد و لە کوێ بوو؟!

ئەگەر ڕاستیت دەوێ دەبوایە تا ڕۆژی پەسڵان هەموو خەڵکی ئاسیا و تەواوی موسڵمانان مەمنوونی کوردان بن و سوپاسیان بکەن کە ئەو بەڵا گەورەی لە سەر لابردن و بۆ داکۆکی لە ئیسلام و موسڵمانانی جیهان و لە خاکی پاکی ئیسلام ئەوپەڕی فیداکاری و لە خۆ بوردوویی نیشان داو سەریشی پێ لە بەردی ئەلحەدێ دان و هەموویانی تێک شکاندن و بە جۆرێکی وەها تەمبێی کردن کە تا ئێستاش نێزیکەی دوای نۆسەد ساڵی نەیانوێراوە و نەیانتوانیوە کە جارێکی دیکە بیری هێرش بردنە سەر ئیسلام و موسڵمانن بکەن.

بەڵێ گورژی گوتەنی:

لە دەورانی سەلاحەددین و شێرکۆ خانی کوردیدا
هەموو دوژمن هەڵستان و بەڵام سەریان لە بەردی دا
چەلیپا و خاچ پەرەست و جوولەکە و گاور بە تێکڕایی
هەموویان هاتنە مەیدان و شکاندمانن بە ئازایی
بەڵێنیان دا لە قورئان و لە ئیسلام و موسڵمانان
نەهێڵن شوێنەوار و بنکەنە گەپجاڕی دەورانان
بە پشتیوانی یەزدان و بە هێزی یەکیەتی و ئایین
وە کارن خست چەکی باوەڕ شکاندن دژمنی تایین
هەتا یەک بووین ئاوا بووین نەبوو هاوچەشن و مانەنن
سنووری دووری ئیسلامی بە هێزی باوەڕن تەندن
زراو و نەترەیان چوو دژمنانی ئایینی یەزدان

گەلێکن یارمەتی بێ هێز و دەستان کرد وەکوو مەردان
نەیـارانی لەخۆبـایی وە خـۆ کەوتـن بە خـۆڕایی
بە تێکـڕا هـاتنە مەیـدان و شـکاندمانن بە ئـازایی

ئەمجا دێتە سەر ئەوە کە ئـاهو هەناسە هەڵدەکێشێ بۆ ئەوەی کە هەموو تیرە و بنەماڵەکانی کورد خەسار بوون و هیچ کەڵک و بەهرەیەکیان بۆ گەلەکەی خۆیان نەبووە. چونکە ئەوەنـدە لە یەک دوور و بـێیەکیەتـین کە هەر تیرەیەک خـۆی بە تەنیـایە و لەگەڵ ئەوانی دیکە دژ و نەیار و نـاڕێکە. جـا لە میراودەلـیڕا بگرە هەتـا هەمەوەند و هتد. دەڵێ بەتایبەتی تەماشای تیـرەی میراودەلـی کەن کە یەکێکە لە تیرەکانی گەورەی کوردەواری و لە شـەڕی دووهەمـی جیهانیدا چۆن لە گەڵ سێ دەوڵەتی گەورە بە شەڕ هـات و چـۆنیش هەر سێکیانی بە چۆکدا هێنا و لمبۆزی پـێ ڕە زەوی خـستن و ئیتر هەر سـێکیانی لە شـەڕدا بەزانـد و زەبـری گرچـووبڕی دا لە هەر سێکیان. یەکەم هەڵمەتی خۆی بۆ دەوڵەتی تورکان بـرد و زەبرێکـی وەهـای لێـدان کە لە شـاری ئەسـتەمبووڵ پێتەختـی ئەو میـرییە سەرۆکی ئەو دەوڵەتە لەرزی و نەترەی چوو و بە جارێ تۆقی.

هێرشی دووهەمی خۆی بۆ دەوڵەتی ئێران برد و پاشـی شـەڕێکی خەست و خوێناوی ڕەزاخـان پاشـای ئێران بـۆ پـتەو کـردن و تـازە کـردنەوەی هێـزە شـپرزە بـووی خـۆی پەنـای بـردە بەر کێـوی دەماوەندو بنکەی فەرماندەری و بەڕێوەبەری کاروباری شەڕی بـردە دامێنەکـانی کێـوی سـەر دە ئاسـمان هەڵچـووی دەماوەنـد و ئیتـر هەڵمەتی سێهەمینیشی ئەوە بـوو کە هەڵمەتـی لە هێـزی ئینگلیـزی داگیرکەر دا و لە دەربەندی بازیانیڕا هەتـا بەغدایە ڕەپێـی نـاو لە بەشێکی زۆری خاکی پاکی کوردستان وەدەری نـایەوە، جـا لە گەڵ

تێیدا که ئاوا ئازا و ڕەشید و بەهەڵمەتن، چونکه لەگەڵ یەکتر ناتەبا و ناڕێکن و پەیمان و بەڵێنییەکیان له بەیندا نییە، ئەگەرچی لەبەر زۆریانیش نایەنە ئەژمار له نێو گەلانی جیهاندا هەر سووک و چروک و ڕەزیل و بێقیمەت و نرخ و پوکن. پاشان ڕوو دەکاتە خودای گەورە و لێی دەپاڕێتەوە و به هەژاری دەستەکانی بەرز دەکاتەوە و دەس دەکا به تکا و نزا و سکاڵای خۆی وەک مەردانی یەزدانی سەرەنجام هەر بۆ لای خوای خۆی دەباتەوە دەڵێ:

خودایە! خۆت دەزانی که حاڵی کوردان چۆنە و کەوایە خۆت بەزەیی و ڕوحمت پێیاندا بێ که تەنیا بەزەیی ورەحمەتی تۆیە له فریای هەمووکەس دێ وئیتر بیکه به خاتری گەورەیی و خۆشەویستی هەنتەشی محەمەد و به میهرەبانی خۆت، ڕوحمێکیان پێ بکه بەو شێوە دەس پێ دەکا:

## لاڵ بم بۆ نەتەوەی کورد

له بەینی تورک و فارسا میللەتی کورد
وەکی ئەسپێیەکە مابەینی دوو بەرد
له غەدری تورک و جەوری فارسی غەددار
هاوار ئەی عالەم وەڵلا کوردەگەل مرد
ئەوەند قەومێکی بێ‌حیسس و دەمارە
ئەوەی هاتە سەری سوجدەی لەبۆ برد
که ڕوویان کردە تەکیە و خانەقایان
تەوەللایان له علیم و مەدرەسان کرد
به تەپڵ و دمبەگ و کەشکۆڵ و ڕیشتە
به تەسبیح و وەکاز و شۆڵ و دووگرد

هەموویـــان بـــوونە دەروێـــش و گەڕیـــدە
ڕەزیـــل و مەنـــدەمۆر و رووت و ڕەنـــگ زەرد
گەلـــێ وەک مـــن لە دەردی قەومـــی کـــوردی
سـەری خـۆی نـایە ژێـر خـاک حەسـرەتەومەند
لەمەو پـێش میللەتـێ بـوون چوسـت و چـالاک
لەمەو پـــێش میللەتـــێ بـــون عاقـــڵ و مەرد
هەموویـــان ڕێکوپێـــک و مـــوعتەبەر بـــوون
هەموویـــان خـــۆگر و هەمـــڕاز و هەم دەرد
لە دەوری شـــا ســـەلاحەددینی کـــوردی
چ مـیللەت نەبـووە وەک کـوردان لە سـەر عەرد
کە هـــات بـــۆ ئاســـیا لافـــاوی غەربـــی
چ قەومـــێ پێـــشی گـــرت وەک کێـــوی ئەڵوەنـــد
چ مـــیللەت بـــوو لە تـــوول و عەرزی حەو ساڵ
لەگەڵ حەو پادشـــای غەربـــی شـــەڕی کـــرد
لە کـــوێ بـــوو تـــورکی بەد ئەفعـــال و کـــردار
لە کـــوێ بـــوو فارســـی نـــاهەموار و نـــامەرد
خەلـــیفەی مـــالخوری ئـــالی عەباســـیش
چ ئدیمـــــدادی نەدان حەتتـــــا بە یەک فەرد
هەتـــــا ڕۆژی قیـــــامەت ئاســـــیایی
دەبـا مەمنـوونی کـوران بـان وەکـی عەبـد
هەناســـەی ســـارد و ئـــاهی ناهومێـــدی
لە دەورەم بـــۆتە تەم هەروەک دەماوەنـــد
لە بەر بـــێخـــاوەنی پـــاکی خەســـار بـــوو
ئەگەر میراودەلـــــی بـــــوو گەر هەماوەنـــد
تەماشـــا عەشـــــرەتی میراودەلـــــی کەن

به سێ جار سەتوەتی سێ دەوڵەتی برد
له ئەووەڵ زەربەتێکی دا له تورکان
له ئەستەمبووڵەوە لەرزی خوداوەند
دووەم دەردێکی دا سەرداری ئێران
رەزاخان ئیلتیجای برد بۆ دەماوەند
سێهەم شەقی گەیاندە هێزی ئینگلیز
به بازێ چوونه بەغداوه له دەربەند
وەکوو میراودەلی پێنج سەد عەشیرەت
له کوردان بۆت بڵێم بێمیسل و مانەند
وەلێ چونکه لەگەڵ یەک ناتەبانه
له بەینیاندا نییه هیچ عەهد و پەیوەند
له بەینی میللەتان سووک و رەزیلن
ئەگەرچی نایەنه ژێر حەدد و ژێر عەد
خودایه خۆت تەرەحوم کەی به کوردان
به لوتفی خۆت و بۆ خاتری محەمەد

## عەشرەتی میراودەلی

تیره یا عەشیرەتی میراودەلی یەکێکه له تیره و هۆزەکانی بەناوبانگی گەلی کورد، که له کۆنەوه له ناوچەی پژدەرێدا دانیشتوون. پژدەر ئێستاکه ناوچەیەکه له کوردستانی عێراقێ و ناوەندەکەی شاری قەڵادزێیه.

وشەی پژدەر له ماکا (پشتدەر)ه که پشت دەربەند بووه و مەبەستیش پشت دەربەندی رەمکان واتا دەربەندی پشت رانییه.

بنەماڵەی میراودەلی لە ماکا کوردی خالیدی، هەروەک فەیزوڵلابەگی بانەیی و دارەشمانەیی هەموویان یەک بەرەبابن ووەک دەڵێن باپیرە گەورەی هەموویان هەر یەکە.

هێندێک لە پژدەرییەکان لە مەرگەدا نیشتەجێ بوونە وگۆیا میراودەلی و بابانی دوو بەرەبابن وتۆرەمەی دوو برایانن کە بە نێوی میرئاودەل (میر عبدالله) و فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەیی بەنێوبانگن. جا بابانییەکان لە فەقێ ئەحمەد و میراودەلییەکانیش لە میرئاودەل پاشەکەوت بوون.

وەک دەڵێن داستانەکە ئاوا دەس پێدەکا: لە رۆژگاری رابردوودا دووبرا هەبوون بە نێوی کاکەمیروکاکەشێخ کە لە هەرێمی مەرگێ دا دەژیان وبە هۆیەک کە بۆئێمە روون نییە هەردووکیان کوژراون. خێزانی کاکەمیرلەو کاتیدا دووگیان دەبێ و دوای ئەو رووداوە دەڵتەزێنە دەچێتە خدرانێ کە لە مەڵبەندی چنارانی پشتی خەلەکانییە (ومنیش لە ساڵی ١٣٤٨ زستانەکەی بە فەقێیەتی لە چناران ولە مانگە رەمەزانەکەشدا بە مەلا رەمەزانی لە بنکەی پێشمەرگەی مەلا مستەفای رەحمەتی لە خەلەکانێ و مە لای لقی حەوتی هێزی فارس باوە بووم . کە فەرماندەکەی کورە کوردێک موسڵمان بە نیوی گوڵە باغ بو. یادی ئەو کاتە بەخێر) ئەو بێوەژنە لەوێ کورێکی دەبێ و نێوی دەنێ ئەحمەدو، وەکو هەر بێوەژنێکی هەژاری کورد، کورەکەی بە دەرد و رەنج پێدەگەیەنێ و گەورەی دەکا.

بەڵام لە پێش گەورە بوونی ئەحمەد بە هەرهۆیەک بێ کە ئەوەش بۆ ئێمە نادیارە کە بۆچی لە خدارنێش دەڕوا و دەچێتە گوندی دارەشمانە کە لە حەوت میلی رۆژهەڵاتی شاری قەڵادزێیە. ئەمجا ئەحمەد دەنێرێتە نێو فەقێیان وبۆ مەلایەتی پێی دەخوێنێ.

جا لەبەرئەوەی فەقێیەکی زۆرچاک وزیرەک ووریا دەبێ زۆر بە زوویی نێوی دەکا و بە نێوی فەقێ ئەحمەدی دارەشمانەیی لە کوردستاندا نێوبانگی دەڕوا.

ئەحمەد سەرەڕای ئەوەش کە زۆر زاناو دانا و زیرەک دەبێ، زۆریش قارەمان و پاڵەوان و مەردێکی ڕەشید وئازا دەبێ. لە شەڕی موسڵمان و کافراندا بەشداری دەکا و گەلێک دلێری ورەشیدی لە خۆی دەنوێنێ . خاتوو کەیغان" کچی شای فەڕەنگ کە سەرکردەی بەشێک لە سوپاو پاڵەوانێکی زۆر ئازا و نەبەز دەبێ و، تا ئێستا هیچ یەک لە پاڵەوانەکانی موسڵمان نەیوێراوەنێ و پشتیان لە عەردی نەداوە، فەقێ ئەحمەدبە ئاسانی دەیگرێ و یەخسیری دەکا و لە مەیدانی شەڕێ دەباتە دەر و دەیهەوێ بیباتەوەماڵی خۆیان.

لەڕێیە تووشی شێرێک دەبن وبە گژیاندا دێ، فەقێ ئەحمەد لەشەڕ لەگەڵ شێرەکە دابە سەختی بریندار دەبێ و کەیغانیش هەڵدێ و خۆی قوتاردەکا. ئەویش دوای چاک بوونەوەی زامەکانی بە دوای کەیغاندا دەگەڕێتەوە ودەیبینێتەوە. جا خاتوو کەیغان چونکە لە بنیڕا خۆی بۆکەسێک داناوە کە پێی بوێرێ وبتوانێ بە سەریدا زاڵ ببێ و لە راستیشدا شێت و شەیدا و ئەویندارى فەقێ ئەحمەد ببوو، لەگەڵی دەگەڕێتەوە و وێکڕا دێنەوە دارەشمانە و دەس دەکەن بە ژیان وسێ کوڕیان دەبن کە هەر کامە لەوی دیکە قارەمانتر دەبێ.

یەکەمیان بابا سولەیمان بووە کە باپیرە گەورەی بنەماڵەی بابانییەکانە و زنجیرەی پادشایانی کوردی موسڵمانی بابانی لەوی پاشەکەوت بووە وهەموویان لە تۆرەمەی ئەو قارەمانەن.

دووهەمیان خان بود اغە کە ئەویش باپیرە گەورەی بنەماڵەی گەورەی میراودەلییەکانە، ئیتر میراودەلی و پژدەری

ونورەدینییەکان هەموویان لە نەتەوەی وین. خان بداغ کوڕێکی دەبێ بە نێو میراودەل کە میراودەلییەکان لەوین لە گوندی نورەدینـدا کە لە چوار میلی باشووری رۆژهەلاتی قەلادزێیە نیشتەجێ دەبێ. بە داخەوە کوڕەکەی دیکەی فەقێ ئەحمەد کە وەک دەڵێن موکریانییەکان لە تۆرەمەی وین بۆمان روون نەبۆوە ناوی چییە. جا هۆنەری هە ست ناسکی کورد خاڵەمینیش لەو پێیەدا زۆر بە بێهیواییەوە تاسە دەردەبڕێ و دەڵێ:

تـۆ بڵێـی بـۆ مە پەیـا بـێ مەردێـک
تـۆ بڵێـی هەسـتێ لە نێـو کـورد کوردێـک
بڵـێ مـن کـوردم و هەر کـوردم ئەوێ
جـگە لەو مـافە هەچـی بـێ نەیەوێ!
تـۆ بڵێـی یەکـدری کوشـتن بەس کەن
تـۆ بڵێـی گـوێ لە قـسەی هـیچ کەس کەن!
تـۆ بڵێـی تـۆرەمە گیـر خـا قەڵەمـێ
بەروبـووی ئـە و قەڵەمـێ بکـا هەڵەمـێ
ناهومێـد نـین لە بەزەت ئەی خـوایە
هەمـی لەم شـوێنە هەمـیش لە دوایە

## چەند چوارینە لە مامۆستاوە

مامۆسـتای بەڕێـز و خۆشەویـست هەرگیزکـاری هەڵبەسـت هەڵبەستن وهۆنراوە هۆنینەوە نەبووە، ئەگەرد ەبینین کە ئێستا د یـوانێکی ئـاوا گەورەی هەیە هەمـوو هەرهەڵڕشتنی دەرد و کـوڵ و ناڵەی دڵەو کولدوی دەرونی بریندار و پڕ لـە زامیـە تـی و نیشان دانـی هەسـت و هـاوار و سـۆزی دڵـسۆزییە کە بـێ ئیختیـار دەری

بچوە. جا هەر بۆیەشە، کە هێندێک جار دەس دەکا بە هات و هاوارو داد و بێداد و هێندێک جاریش نزا وپاڕانەوە ولالانەوە دەس پێ دەکات و لە بەر خوای گەورەوە هەڵدەباوەشکێ و گەلێک جاریش هەڵمەت دەباتە سەر هێندێک باوی پڕوپووچ و بە هۆنراوە ئاگرینەکانی بۆمبارانیان دەکا و زۆریش وا هەیە هێرش دەباتە سەر خودی پڕوپووچ و خەراپەکە و لە بەر پێیاندا پلچی دەکاتەوە و دەیهاڕێ.

ئامانجی مامۆستاش لە هۆنراوە هۆنینەوە تەنیا بەربەرەکانی کردنی خەرافات و پڕ و پووچ پەرستی و ئەو شتانە کە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام زیاد کراون و باوگەلی ناڕەوا ولە ناو بردنیانە. هەر بۆیەش گرینگی نەداوە بە چۆنیەنی هۆنراوە و کزی و لاوازی وشەو وتە و رستەی بەلاوە گرینگ نەبووە و بۆ ریکوپێک کردنی هۆنراوەکە واتا وکاکڵی مەبەستەکەی تێکنەداوە و زۆرتر گرینگی بە مانان و مەبەست داوە، نەک بە وشە و رستە تەنیا گرینگی داوە بە هێز و وزەی مانا و واتا و مەبەستی هۆنراوە کە لە راستیشدا هەموو مەبەستەکانی یەک لە یەکی بەهێزتر و جوانتر و گرینگ و گەورەترن.

جا هەر بۆیە زۆربەی هۆنراوەکانی مەسنەوین کە بۆ نووسینی مەبەستگەلی جۆراوجۆر و مێژوو داستان بەکارد ەبرێ و بە زۆری کەڵکی لەو شێوە و جۆرە هۆنراوەی وەرگرتووە. چەن بەستەیەکیشی غەزەلن و کەمێکیشی چوارینەن. جا هەر بۆ نموونە لەو چوارینەی خوارەوەدا کە لەبارەی بنەماڵەی نەقشبەندی نووسیویەتی دەفەرموێ ئەو تیرە جیا لە خەڵکەکە گۆیا نەقشین و نوقمن لە یادی خودا و لە خەڵک بێگانە و رەمەکین. لەگەڵ ئەوەی کە باراشی دەبا بۆ ئاشی بێجگە لە یادی کەرەشین هیچ شتێکی دیکەی لە دڵدا نییە و ئیتر وەک دەڵێن کابرایەک هەبوو چەند کوڕی بوون و خۆی ژنەکەی نەمابوو. هیچیشیان نەبوو ژنی پێ

بێنێ. رۆژێک پێکەوە دانیشتبوون و باسی ژن هێنانیان دەکرد و سەرەنجام یەکێکیان گوتی وەرن با لە پێش هەمووماندا ژنێک بۆ باوکمان بێنین و خۆشتان دەزانن کە جگە لە گوێدرێژێک هیچی دیکەمان نییە کەوایە با ئەوی بۆ باوکمان بە ژن بدەین.

بەڵێ زۆر، یان کەمی پێچووکارەکە نەکرا ولە دواییدا هەر کە کوڕەکان بە بێدەنگی دادەنیشتن باوکیان دەیگوت ئەرێ رۆڵە بۆچی قسەیەکی ناکەن. هەرکە دەیانگوت بابە باسی چی بکەین؟ دەیگوت باسی کەرەشینێ بکەن!!

تومەز ئەو جگە لە یادی کەرەشینێ پترلە دڵیدا نەبوو، هەردەیکوت باسی کەرە شینێ بکەن.

جا مامۆستاش دەفەرموێ هەرچەندە کە بەو باراشی دەبا بۆئاشی ودەبوو لە بیری ئاش لێ کردندا بێ بەڵام بێجگە لە یادی کەرەشین هیچی دیکەی لە دڵدا نییە وئەوبەرێزە هەر لە یادی کاری خۆیەتی و بیری خەڵکی لە دڵدا نییە کە بەو جۆرە دەڵێ:

ئەم تایفە مومتازە کە گۆیا نەقشین
موستەغرەقی یادی خودا و لە عالەم وەحشین
با وجوودی کە باراشی دەبا بۆ ئاشی
هیچ شتی لە دڵدا نییە غەیری کەرەشین

ئەمجا لەو چوارینەیدا گاڵتە بە یەکێک لە شێخەکان دەکا و دەڵێ ئەو هەنتەشە و ئەو جەنابە ئەگەرچی کەراماتی وی وەک سەگ دەوەڕێ ئیتر دەنگ و باسی کەرامات کەی مەڵبەندی پڕ کردووە بەڵام هەرکە نان وپیوازی لێ بڕا لە تاوان نێزیکە رەگی جەرگی ببڕێ و ئەو بێچارە ئەوەندەی ماڵ خۆش دەوێ و ئەوەندەی خوارن مەبەستە کە بۆ مستێک بڕوێش هەر دەگەڕێ کە بەو شێوە دەفەرموێ:

ئەو حەزرەتە وەک نـــان و پیـــازی دەبـــڕێ
نێـــزیکە لە تـــاوان ڕەگـــی جەرگـــی ببـــڕێ
هەرچەنـــدە کەرامـــاتی وەکـــوو ســـەگ دەوەڕێ
بێچـــارە لە بـــۆ مـــستێ بروێـــشی دەگەڕێ

ئەمجا لەو چوارینەدا هەڵمەتێکی قارەمانانە دەباتە سەر بیر و باوەڕی پەست و چەپەڵ و ناڕەوای مەسیحی و هێندێک لە وشکە موسڵمانەکان کە هەنتەشی عیسایان کرووە بە خوایەک و خوای گەورەیان بە جارێک فەرامۆش کردووە و لە بیریان بردۆتەوە. دەفەرموێ سازکەری زەمین و ئاسمان عیسایە. بە خوا ئەو قسە قسەیەکی بێمانا و واتایە و پیاوی زانا و دانا شتی وا بێمانا و واتا و پووچ و هەڵە وچەوت وناڕەوا ناڵێ وهەرکەس کە هۆش و گۆشێکی هەبێ لە شتیوا بە دوورە،ئاخر ئەو کەسەی کە زانا و دانا بێ چۆن شتی وا دەڵێ! کە دەفەرموێ:

خـــــالقی عەرز و ســــــەما عیـــــسایە
بەخـــودا ئەو قـــسە زۆر بـــێمەعنـــایە
کەســـــەکی هۆشـــــی هەبـــێ وا نـــاڵێ
چـــۆن دەڵـــــێ وایە ئەوەی دانـــایە

# بەزمی خانەقا و تەکیە

هۆنراوەکانی مامۆستا ئەوەندە سادە و ساکارن کە هەموو خوێندەوارێکیش بە ئاسانی لێیان حاڵی دەبێ و تێیان دەگا، چونکە ئەو بەڕێزە بە زمانی خەڵکی نەخوێندەوار و هەژاری کوردەواری

هۆنیونیەوە و ئیتر هیچ وەک هۆنراوەی هێندێک لە هۆنەرانی دیکە چیستان و چلتوێ و مەتەڵۆکە نین بەڵکە مەبەستگەلێکی جوان و روون و رووک و بێتویکڵی ئایینی و نەتەوایەتین و بۆمباران و دەسرێژێکی رامیاری لە سەر سەری ملۆزم و ملهوڕ و کەڵەگایەکانی کۆمەڵی کوردەوارین و هیچ پێویستیان بە توێژکاری و شی کردنەوەو ڕاڤەدان نییە،ڕەنگە هەموو کەس لە مانا و واتا و ناوەرۆکەکەیان بە چاکی تێبگات و هەر لەو کاتەشدا هەر هۆنراوەیەکی دەلاقێکە ڕوو بە دنیایەک کراوەتەوە و لە هەر بەستەو چەکامەیەکیشیدا ئەگەر ورد سرنجی بدەینێ لایەنێکی بەرزو بێوێنەی ئەو کەڵە پیاوەمان بۆ دەردەکەوێ و ئاگاداری و زیرەکی و هۆشیاری و لێزانی و هۆزانی ویمان بۆ روون دەبێتەوە و دەزانین کە چ ئەندازە دڵسۆزی ئیسلام و گەلی کورد بووە.

ئەوەتا دەبینین، کە لە پارچە هۆنراوەی بەزمی خانەقا و تەکیەدا شێرانە و ئازایانە و نەترسانە هەڵدەکوتێتە سەر ئەو بەرنامە خەراپە و ئەو باوە بێبایەخە و هاوار دەکاتە خەڵک و دەڵێ دەس هەڵگرن و واز لەم دژمنەی خۆتان کە نایناسن و گورگە لە پێستی مەڕدایە، یان دژمن و نەیارێکی وایە، کە جلوبەرگی براکەتانی لە بەر خۆی کردووە و داخەکەم ئێوەش زۆر ناوربا و ناهۆشیارن و بۆتان لێک جیا ناکرێنەوە بهێنن و چیدیکە روو مەکەنە نەیاری خۆتان و ئایینەکەتان. هەروەها ئەم خانەقا و تەکیە کە لە ماکا کەڵەی مزگەوت و فێرگەی ئایینین، وەلا نێن و بەس مزگەوتەکان چۆڵ کەن و ئەوان ئاوەدان کەنەوە.

هەروەها دەڵێ بۆ خاتری خودا بەسیەتی، تا کەنگی ئێوە وە دوای ئەو شتە پڕوپووچانە دەکەون و ئەو بەزمە چییە و کەنگێ

تەکیە و خانەقا لە بەرنامەی دیندا هەبووە و ئاخر لە کوێی قورئانێدا ئاماژەی بۆ کراوە؟

خۆهەروەک شێخ کەڵەی دینە، تەکیەش کەڵەی مزگەوتە و تەنیاو تەنیا بۆ لێک بڵاو کردن و پەرت و پەرێشان کردنی موسڵمانان ساز کراوە و وێنە و نموونەشی هەمان مزگەوتی"زیان"ە کە بە دەستووری ئەبوعامیری دووڕوو و هاودەستەکانی دووڕوو و بێئابڕووی وی بۆ کۆبوونەوەی خۆیان و بۆ بۆسە و کەمین دانان بۆ پێغەمبەرﷺ و پەرت و پەرێشان کردنی موسڵمانان و پەرە پێدانی کافریەتی دروستیان کرد.

ئەمجا مامۆستا بەوەشەوە ڕاناوەستێ و هەڵمەتێکی توند و شێرانە دەباتە سەر خودی خاوەن خانەقا و سازکەری تەکیە و ڕووی تێدەکا و پێی دەڵێ ئەی شێخ ئەفەندی بەس ئاوا ئەو خەڵکە هەژارە بچەوسێنەوە و لە خوا بترسە خۆ خەڵکی ماڵوێران چ حاڵێکی نەما و هەموو شتێکی لە دەس دا. تۆ کە دوژمنی ناڕاستەوخۆی و ستوونی پێنجەمی لە لایەک و دژمنانی ڕاستەوخۆش لە لایەک و ئیتر بە هەمووتان وەک ڕەوە گورگ دەمتان لە لاشەی ئەو گەلە هەژارە ناوە!!

گەلێ کەس ماڵی دا بە تۆ و خۆشی ئەوا لە برسان پشتی دەشکێ بەوحاڵەش ئاگایەکت لێی نییەو لێی بێهەواڵی و بەزەییت بەماڵ و منداڵیدا نایەت و لەبەر نەداری ژنەکەی دەربەدەر بوو و ماڵ و منداڵی بەجێ هێشت و چووە بۆتە قەرەواش و کارکەری ماڵان و لە ڕۆخی ڕەشماڵان و لە لاپانگی تاوڵاندا بە هەژاری و نەداری سەری ناهومێدی نایە سەر زەمینی ڕەش، بەڵام تۆ هەر لێشت نەپرسی ئەو بۆ تۆ ئاوا بوو تۆش بۆ وی ئاوای!!جا تو خوا ئەوەش ئایین و ویژدانە، یا ئەوەیە مرۆڤایەتی و مەردانەگی تۆ؟

هەروەها پێی دەڵێ بەدبەخت ئەو هەژارە کە مریدی تۆیە و سەمەندۆک کراو و لەغاو کراوی خۆتە گیانی شیرینی خۆی دا و بەختی کرد بۆ مستە ئاردێک، بەڵام تۆ بەهەشتی خوا دەفرۆشی بە زەمین و باغ و ئیتر تۆ زۆر لەڕێی خوا دووری و خوا هەر ناناسی و لەبەر هەرەیی و غلوور بوونت ترسی خوات نییەو دەک ومبەر رق و قینی خوا بکەوی تۆ کە دۆستی خوای چۆن دەبێ وا بێ؟! چۆن دۆستی خوا ئاوا لە خوا نەترس و بێئاگایە لە خوا؟ تۆ کە پێت وایە دۆستی خودای و تکاکاری ڕۆژی پەسڵان و فەرمانڕەوای ئەوکاتی چما بۆ خۆت دەچێتە بەهەشتێ؟ تاکوو بیفرۆشی و بە زەمین و باخ و پوولی بدەی؟ دەک جەنابی شێخ، ڕووت ڕەش بێ بۆ ڕەوش و ڕەفتار و بۆ کردەوە و ئاکارت.

هەروەها پێی دەڵێ تۆ چۆن لە سزای خوا ئەمینی و چۆن پێت وایە کە سزات نادا؟ دەک بەڵای خودا لێت دا. خوا ئاگاداری هەموو دیار و نادیار و هەموو راز و ئاشکارێکتە و دەزانێ دووڕوویی و باوەڕداری تۆ تا چ رادە و ئەندازەیەکە.

ئەمجا هیچ چاری نامێنێ چونکە دەزانێ هەر بە قسەی ناکا و ئامۆژگاری بۆ ئەو جۆرە کەسانە گوێز دە دیواری هەڵاویشتنە بۆ دوامین جار رووی تێدەکا و دەفەرموێ: تۆ بەو هەموو درۆ و دەلەسە و فێڵ و فووت و ئیفتیرایەت ئەی درۆزنی ڕووڕەش لە ڕۆژی سزا و ژمارەدا چۆن رزگارت دەبێ؟!

بێگومان دیارە لە ناو گڵی دۆزەخدا دەتسووتێنن و خەز و بەزت لە ئەندام هەڵدەچزێنن و ئیتر دەستی خۆت لە خەفەتان دەگەزێ و پەنجەکانی خۆت ڕادەنووسێی و خۆزگە و ئاوات و بریا دەخوازی و دەڵێی بۆ وام کرد و وەبەر فەرموودی خوا کە دەفەرموێ (یوم یعض

الظالم علی یدیه فیقول یا لیتنی اتخذت مع الرسول سبیلا یا لیتنی لم اتخذ فلانا خلیلا) دەکەوی.
ئەو ڕۆژە ڕۆژێکە کە ستەمکار بە دەستی خۆی رادەنووسێ و لە داخ و خەفەتان وەختە بتەقێ و دەڵێ سەد خۆزگە لەگەڵ پێغەمبەری ڕێگەم گرتبایە،ئەی بریا فیسارە کەسم بە دۆست و دڵسۆزی خۆم دانەنابایە و پەیڕەویم لێ نەکردبایە کە بە راستی ڕێی راستی لێ ون کردم و ئیتر ئەوان کە (اضلوا کثیرا و ضلوا عن سوا السبیل) زۆریان گومڕا کردن و خۆشیان ڕێگەی راستیان ون کرد.

بەڕاستی مامۆستای کۆیی مەلایەکی هەڵکەوتوو و تایبەتی وا بووە، کە خیرەت و پیاوەتی ئەوەی هەبووە هەرچی لەدڵیدا بێ بیڵێ و زانیاری خۆی نەشارێتەوە و وەک هێندێک کۆلکە مەلای بێئایین و دینفرۆش و خۆدۆڕێن نەبووە. راستی لە کەس نەشاردۆتەوە و شێرانە هەڵیکوتاوەتە سەر هەموو جۆرە خەراپکاری و پڕوپووچ پەرستییەک و فێڵ و تەڵەکە و تەپکە و داوی خوێڕیە شێخ و گەندەڵە مەلاکانی دەرخستووە و رووی کردووە و زۆر جارانیش رووی لە یەکی تایبەت و دیار کردووە و بە هۆنراوە جوان و رووەکانی خۆی کابرای وەها سەنگەسار کردووە کە لەبەر چاوی گشتی یا لانی کە لەبەر چاوی پسپۆڕانی گەلی خستووە.

ئەوەتا دەبینین، کە لە بەزمی خانەقا و تەکیەدا لە هەوەڵەوە خوا دێنێتە تکایە و دەڵێ بۆ خاتری خودا بەسە ئەو داب و نەریتە ناموسڵمانانەیە و ئەو باوە بێبایەخە و ئەمجا روو لە شێخ ئەفەندی دەکا و چەندین قسەی توند و هەق و رەقی پێ دەڵێ کە ئا بەو جۆرە دەفەرموێ:

# بەزمی خانەقا و تەکیە

بەسـیە بـۆ خـاتری خـوا بەسـیە ... تـا بە کەی بەزمـی خانەقا و تەکـیە
شـێخە فەنـدی بترسـە لە خـوا ... میللەتـی قـوڕ بە سـەر چ حـالی نەما
گەلێ کەس ماڵی خۆی هیبەی تۆ کرد ... عاقیبەت خۆڵ بە سەر لە برسا مرد
روحمەکـت قەت نەکـرد بە منـداڵی ... خەبەرێکـت نەبـوو لە ئەحـواڵی
هەر ئەوەندەت ناسی کە بە دەستی پڕ ... هاتە لات و ئیتر چی تر گیرفان‌بڕ
ژنەکەی دەربەدەر بـوو چەنـد سـاڵان ... تـاکو فەوتـا لە ڕۆخـی ڕەشـماڵان
تۆ بەهەشتت فرۆشت بە بستێ عارد ... ئەو ئەوا روحـی دا بە مـستێ ئـارد
تـۆ لە ڕێگـای خـودا گەلـێ دووری ... خۆفی خـوات هـیچ نییە لە مەغـروری
دەکـو قەهـری خـوات بە سـەردا بێ ... چـۆن وەلـی خـوا دەبـێ وا بـێ
وا دەزانـی کە تـۆ وەلـی خـودای ... هەم شەفیع و (مطاعی) ڕۆژی جەزای
تۆ لە بـۆ خـۆت چما دەچیـتە ئیـرەم ... تـاکوو بیـدەی بە عەرد و دار و درەم
چۆن ئەمینی لە مەکر و کەیدی خودا ... دەکـو یـا شـێخ بەڵای خـوات لێـدا
خـوا خەبیـرە بە سـیرڕ و ئیعلانـت ... خـوا دەزانـی نیفـاق و ئیمانـت
بەم هەمـوو ئیفتیـرایە ئەی کەزاب ... کـو نەجاتـت دەبـی لە ڕۆژی حیساب

**جا ئا لێرەدا ئەگەرچی جارێکی دیکە بەستەی هۆنراوەی خانەقاو تەکیە بخوێنرێتەوە زۆر بە جێیە، هەم هی مامۆستا و هەم هی من.**

# روون کردنەوەیەک لە سەر مزگەوتی زیان

ئەوەش باسی وەدیهێنەر و چۆنیەتی وەدیهاتنی مزگەوتی زیان (مسجد الضرار) و هەروەها داستانی ئەو رووداوە کە لە قورئانی پیرۆزدا بە روونی باسی لێ کراوە کە بۆ گومان ئەو تەکیە و خانەقایانە هیچ جیاوازییەکیان لەگەڵ ویدا نییە.

لە دەورانی پێغەمبەری مەزنداﷺ دووڕووەکانی مەدینە گەلێکیان کارشکێنی و خەراپکاری دەکرد و تەنانەت گەیشتنە ئەو جێیە کە بوختان بە بنەماڵەی پێغەمبەری بکەن و شتی نارەوا بۆ خاوخێزانی ئەو ساز بکەن دەیان شتی تریش کە هێندێک لەوانەیە مەسەلەی مزگەوتی زیان کە بەو جۆرەی خوارەوە بوو:

دوازدە کەس لە دووڕووەکان بە بەهانەی ئەوەی کە ماڵیان لە مزگەوتی قوبایە دوورە و شەوانەش تاریکە، یان زۆر جارانیش وا هەیە، کە باران دەبارێ و ناتوانن بگەنە مزگەوتی قوبایە ویستیان بە نێوی مزگەوت جێگەیەک بۆ کۆبوونەوەکانی خۆیان ساز بکەن تا لەوێدا کۆ ببنەوەو نامەکانی ئەبوعامیری راهیب بخوێننەوە، بەکورتی وەک خوای گەورە دەفەرموێ بۆزیان گەیاندن بە موسڵمانان و بۆ ئەوەی بیکەنە بنکەی بڵاو کردنەوەی کوفر و دووڕوویی و ئاژاوە لە نێو موسڵماناندا و بۆ لێک بڵاو کردنی موسڵمانان و پەرتەوازە پێ کردنی باوەڕداران، هەروەها بۆ بۆسە نانەوە بۆ پێغەمبەری خۆشەویستﷺ تا بەو جۆرە بتوانن لە بەینی بەرن.

ئەبوعامیر کەسێکی زۆر زیرەک و وریا و دووڕوویەکی رامیار بوو پێش هاتنی پێغەمبەر بۆ مەدینە بڕیار بوو ببێتە گەورەی هۆزی خەزرەج بەڵام بە هاتنی ئەو بەڕێزە مەسەلەی وی بە یەکجاری فەرامۆش کرا. هەر بۆیە بوو بە گەورەترین دژمنی پێغەمبەرﷺ هەمیشە دەیگوت هەرکەس شەڕ لەگەڵ محەمەد بکا دۆستی منە و بە تەواوی هێزو وزەی خۆم یارمەتی دەدەم. ئەو ناپاکە لە شەڕی حونەین بە هاوکاری کافرەکان لەگەڵ پێغەمبەرﷺ و یارانی بەشەڕ دەهات بۆیە خودا دەفەرموێ: (و ارصادا لمن حارب الله من قبل) جا کاتێ کە کافرەکان تێکشکێنران ئەو هەڵات بۆ شامێ و لەوێڕا نامەو پەیامی دەناردەوە بۆ دووڕووەکانی مەدینە و پێی رادەگەیاندن کە هەرچەندی بۆیان دەلوێ و لە دەستیان دێ چەک و چۆلە و هێزو شەڕکەر کۆوەکەن و نووسیبووی منیش دەچمەلای قەیسەری رۆمێ و بە سوپایەکی گەورەوە دەگەڕێمەوە بۆ لاتان و ئەوجا محەمەد و یارانی بە یەکجاری لە شاری مەدینە دەردەکەین یان هەموویان لە ناو دەبەین.

جا بەو دەستوورە دوو ڕووەکان کەمینگایەکیان بە نێوی مزگەوت ساز کرد و کاتێ کە لە خۆ بوونەوە، چوونە خزمەت پێغەمبەرﷺلە حاڵێکدا ئەو بەڕێزە ئامادەی سەفەر بوو و خۆی ئامادە دەکرد کە بچێ بۆ خەزای تەبووکێ. داوایان لێ کرد کە بێت و بۆ پیرۆزی نوێژی تێدا بکا و هەر بە دەستی خۆشی دەرکی بکاتەوە (ئیفتیتاحی بکات) بەڵام پێغەمبەرﷺ فەرمووی (نحن الان علی جناح سفر ان رجعنا انشاء الله تعالی) ئێمە ئێستا لە سەر سەفەرین ئەگەر گەڕاینەوە کە خوا بیهەوێ.

پێغەمبەرﷺو یارانی چوونە غەزای تەبووکێ و بۆ شەڕ لەگەڵ دەوڵەتی رۆمێ و دوای ئەوە پتر لە مانگێک لە سنووری وڵاتی رۆم

هەوردووی لێدا و کەس نەیوێرا بەرەو رووی بکۆخێ گەڕایەوە پاشان بە سەرکەوتنەوە گەڕایەوە یەک رۆژ پێش ئەوەی بگاتەوە مەدینە خوای گەورە نیگای بۆ نارد و ئەو ئایەتانەی ژمارە ١٠٧ و ١٠٨ و ١٠٩ی بۆ ناردن و فەرمانی پێدا کە نەچێتە مزگەوتی زیان چونکە ئەوە داو و تەڵەیە، یان تەپکەیەکە بۆوی دانراوە.

جا هەر بۆیە پێغەمبەرﷺ ناردی کە ئەو بە ناو مزگەوتە تێکدرا و هەڵیانوەشاندەوە و بەردی بناغەیان دەرهێنا و دار و پەردووەکەشیان سووتاند و ئاوریان تێبەردان.

جا بەڕاستی تەکیە و خانەگاکانی ئەورۆ هەموویان هەر لە چەشنی ئەو مزگەوتی زیانن و هیچ جیاوازییەکیان نییە.

بەڕێز عەللامەی نەوئەندیش لە تەفسیرە جوانەکەی خۆیدا لە جلدی ١ لاپەڕەی ٤٨٧دا دەفەرموێ: (اتفاقا در زمان ما اکثر مساجد موجب تفرقه و ترویج کفر و شرک و نشر مطالب ضد قرآنی است و سنگری شده برای منافقین، مانند خانقاهها که غیر خدا را می‌خوانند و آن را مکانی برای حزبی قرار داده‌اند).

## ناهومێدی

مامۆستای هێژا و زانا کە تەماشا دەکا گەلی کورد گەلێکی هەژارو لێقەوماوە و لەسەر ئەو حاڵەشڕا لە نێوان سێ دەوڵەتی گەورەدا دابەش کراوە و گەلێکی هەژاری نەداری ناهۆشیاری بێیەکیەتی نەخوێندەواری بێدڵسۆزە و کوردەکانیش زەبوون و بێدەسەڵات و رووت و قووتن و بیری داهاتووشیان هەر نییە و بە تەواوی بێبیر و هۆشن و هەر دەڵێی مردوون و بە خاکی بێهێزی و

چیلازی و زۆنگ و چاڵی ڕەشدا ڕۆچوون و سەرۆکەکانیان بێزانیاری و نەزانن و لەگەڵ ئەوەشدا دز و فێڵباز و بێشەرم و حەیا و شووڕەیین و هیچ نازانن و کەوتوونەتە داوی بێگانە و بێگانە پەرەستی و گەل و هۆز و زێدی خۆیان نەک هەر لە بیر نەماوە بەڵکە بە هەرزانیش دەیانفرۆشن!!

ئەوە لە لایەک، لە لایەکی دیکەش شێخەکانیان کە دژمنی گەل و دۆستی بێگانەن و لە ڕێبازی گەل و نیشتمان فرۆشیشدا گەلێک لێزان و هۆشیارن و بە فێڵ و مەکران وەک ڕێوی وان و بە جۆرێکی وەها خەڵکی کەر دەکەن کە خەڵک وا دەزانن ئەوە دڵسۆزییە بۆیان ئەنجام دەدەن، لە مەرجێکا کە نە بوونەکەیان پێویستە و نە بەرنامەکەیان بەشێکە لە ئایینی پیرۆزی ئیسلام و بەڵکە بە پێچەوانە دروست دژ و نەیاری ئەو ئایینە پاک و پێشکەوتنخوازانەیە وەک من لەو چوارینەدا گوتوومە:

ئەرێ هۆ کوردە تۆ بۆچ وا نەزانی
کلکی بێگانە بۆ بە خوا ئەزانی
ئەوان پەروەردەی دەستی نەیارن
مەچۆ لایان دەنا تۆش هەر لەوانی

ناهومێدی دەردەبڕێو بێهیوایانە دەیدرکێنێ کە چەندە لەو گەلە گەورە ناهومێد و بێهیوایە و دەڵێ پێم وا نییە و باوەڕ ناکەم کە هەتا چەندی دیکەش ڕابەرێکی دڵسۆز و هۆشیار و زیرەک و پیتۆڵ بۆو گەلە پەیدا ببێ و بتوانێ لەو چاڵی ڕەشی زۆنگی بەدبەختی دەریانبێنێ و دەستیان بگرێ و لە هەورازی ژیان سەریان بخا و بیانباتە ناو بەهەشتی ڕزگاری.

مامۆستای دووربین و پسپۆڕمان چاک دەزانێ کە مەرجی سەرکەوتن و پێگەیین رابەری دڵسۆز و زانا و یەکیەتی و برایەتییە لە گەڵ نەبوونی کرمی نێوخۆ کە بە داخەوە کوردی هەژار هیچیانی نین و بەڵکە هەموو لەگەڵ یەکتر دڵ پیس و لە یەکتر لە فێڵ و دابەش دابەش کراو و بێبەخت و هەژار و رەزیل و بێدەسەڵاتن.

سەرەڕای ئەوەش خۆ هەر خاوەنی ماڵی خۆشیان نین و نۆکەر و کاسەلێسی خەڵکین وڵاتی کوردستان لەنێوان سێ دەوڵەتی تورکیاو عێراق و ئێراندا دابەش کراوە.

راستی ئەگەر مامۆستا لەو چاخی ئێمەدا ژیابایە و بە چاوی خۆی دیتبای کە چۆن کوردستان کراوەتە گۆشتی قوربانی و بە پێنج بەش دابەش کراوە و هەر کەسیش بەشە کوردی بەرکەوتووە وا خەریکە بە ئاوری بێبەزەیی و ستەم دەیبرژێنێ و بە ئەوپەڕی دڵڕەقییەوە دەیچەوسێنێتەوە دەبوو چی کردبا و چ داد و هاوارێکی دەس پێ کردبایە؟

جا کەوایە جێی خۆیەتی کە پەیامێکی گیانی بۆ بەرێ بکەین و پێی بڵێین هۆ مامۆستای دڵسۆزم - دڵسۆزی گەل و هۆزم ئەی چرای نیشتمانم - تۆ جەرگت کرا بە سێ بەش - ئاوا پۆشیت بەرگی رەش - کرا بە سێ بەش کوردستان - هاوارت گەیشتە ئاسمان - بەڵام ئەی مامۆستا گیان - من کرا بە پێنج لەت دڵم - هیچ وەکوو تۆش ناکوڵم!! تۆ لە جێی من بای چت دەکرد؟! ژیانت چۆن دەبردە سەر؟ بە خوا رەنگە مامۆستا گیان هاوارت گەیبایە ئاسمان فریشتەشت حاڵی کردبان لە دەردی گرانی کوردان!

لێرەدا جێی خۆیەتی پیاو ئەو پارچە هەڵبەستەی مامۆستا ئاوارەی بیر بێتەوە کە بە نێوی پەپوو نووسیویەتی و پەپووسلێمانکە دەدوێنێ وهێندێک لە دەرد و رەنجەکانی خۆی

بۆباس دەکاولە ئاکامدا سەرکۆنە ی د ەکا و دەڵێ:

پەپـــوو گیـــان ئەمـــن بەو هەمـــوو حـــاڵە
وەکـــوو تـــۆ نـــاکەم گریـــان و نـــاڵە
مـــن لە جێـــی تـــۆ بـــم خـــۆم پـــێ پاشـــایە
ئێـــــره ناخۆشـــــە دەچـــــمە بەغـــــدایە

ئەوجار دێتە سەر باسی پاشماوەی دەوڵەتی بابان و شیرکەتی بەینی کورد و عەرەبان و هەبوونی چەند کەسێک لە وەزیر و گزیر و نوێنەری کوردان لە نێو عەرەباندا کە هیچیان ئی کورد نین و بۆ کورد نین و موختار جاف گوتەنی:

ئەو قەرار و مەجلیسەی وا خەڵک ئەڵێن بۆ کورد ئەبێ
هەر قـسەی رووتە وقـسەش نـاچێتە نـاو گیرفـانەوە

بەڵکە هەرنۆکەرو بەکرێ گیراوی ئەملاولایانن وسەرەڕای ئەوەش بەدسروشت و بێشێواز دارەدەستی خەڵک و زمان بەستراو و بێزێپک و زاکونن و لە مافی کورد ناپرسن و ئەوەی لە بیریان نەبێ و لێی بێباک بن هەر کورد و مافی کورد بەشی کوردستانە.

دوایە دەڵێ جا بە تەمای ئەوانە قوڕ بە سەر هۆزی کورد ئەوانە وەزیری چی و نوێنەری چین و چەند دوورە؟! خۆ هەموو خاک و ئاومان لە دەس دەرهێنرا و چمان بە دەستەوە نەما و ماڵوێران بووین و خاک و ئاومان داگیر کراو نیشتمانمان شڕ کرا و دەوڵەت و میریمان تێکوپەکان درا.

جا بە دەردی بۆخۆی دەفەرموێ: بۆخۆت ئەوا دەبینی دژمن عەرزت دەکێڵێ پاشی چەند ساڵێکی دی هیچت بە دەس ناهێڵێ.

مەحوی لەو بارەوە دەفەرموێ:

گەر حەسادەت مانیعی ئەو قەومە نەبوایە، بەبان
دەوڵەتی سەربەخۆ، ئاساری هێشتا دیارە کورد

ناومان لە نێو ناواندا نەما ئەو دەوڵەتە گەورە و بەهێزەی بابان ئێستا چووک کراوەتەوە و هاتۆتە سەر ئەوە کە چەند وەزیر و نوێنەرێکی بە نێوی بێنێوەرۆک ئەویش نەک لە ناو وڵات و زێدی کوردستاندا بەڵکە لە دەرەوەی کوردستان هەیە و بەس.

جا لە سەر ئەو حاڵەشڕا و بەو هەمو بەدبەختی و ماڵوێرانی و لێقەوماوی یەوە جەنابی شێخ دەگەڕێ بە تەپڵ و دمبەگ و زەرگ و رشتە خەڵک بانگ دەکا بۆ تۆبە و بانگیان دەکا بۆ رێبازی کەربازاڕی و مێشک و دڵیان تالان دەکا و ناهێڵێ بیر لە حاڵی خۆیان وەکەن، بەڕاستی جەنابی شێخ و داروودەستەکەی ستوونی پێنجەمی سوپای دژمنن لە نێو گەلی هەژار و لێقەوماوی کورددا و بەڕاستی ئەوان دژمنێکی زۆر خەتەرناکن! بەڵام خەڵکی نەزان نازانێ!! بە نێوی دین و ئایین وەهایان فریو داوە کە هەر لە دینیشیان لا داوە.

شێخ دڵی پڕ ئاگرەو وەکوو سۆبە گەرمە، بەڵام ئاگری بێدینی و خوا نەناسی و بێگانە پەرەستی، ئاگری فێڵ و تەڵەکە و خەڵک بۆ دژمن خەڵەتاندن و بە درۆ نزا کردن و دەس بە سەر نەزانانندا هێنان.

جا تۆ خوا وەرە کوڵاوی دانێ و سڵاوی لێ بکە!! وەرە ئەو کەرەی لەو قوڕەی دەربێنەوە، نەخۆشی هەژار سکی دێشێ دەستی رە پشتی دەخەن. کابرا برسیەتی و ئاوی بە گەروویدا دەکەن، بە دەردی مامۆستا خۆی گوتەنی سەیری ئەوێ سەیرانێ!!

# ناهومێدی

بەتەما نیم کە میللەتی کوردی
لە سەر ئەم عەرزە پاشی چەندی دی
کەسەکی وا بێتە ساحەبی وان
خاوەنی ئیعتیبار و ئاوی روو و ئیمان
وەک تەفەککور دەکەم لە فیکری وان
هەر لە کۆوە هەتاکوو مووش و وان
بە تەمامی ئەڵێی هەموو مردوون
پاک لە خاکی مەزەللەتا رۆچوون
هەموو بەدخواە و دژمنی یەکدین
با وجوودێ کە قەومێکن یەکدین
رۆئەسایان بە کوللی بێعیلمن
دز و قولابی و بێحەیا و شەرمن
عولەماکانیان دەڵێی کێوین
شێخەکانیان بە حیلە وەک رێوین
پاک لەگەڵ یەکتری بە دل پیسن
بە فڕ و فێڵ و کەید و تەلبیسن
عوسمانی و عرووس دەوڵەتی ئێران
دابەشیان کردووە وڵاتی کوردان
کوردی بێتالع هەژار و رەزیل
دەربەدەر بوون، سەقیل و خوار و زەلیل
ساحەبی مڵک و ماڵی خۆ نینە

قــــورِ بە ســــەر کاســـــە لێــــسی خەڵکیـــــنە
گەرچــــــی ئەمـــــرِۆ لە خیتــــــەی بابـــــان
شــــــــیرکەتێکیان هەیە لە گەڵ عەرەبــــــان
چەنــــــد کەســــێکیش بە نــــاوی کوردســــتان
لە وەزیــــــــر و لە نائیــــــــب و ئەعیــــــان
بەعزەکـــــی فــــورس و بەعزەکــــی تــــورکن
بەعزەکــــی جــــاو فرۆشــــی زۆر چڵکـــــن
بەعزەکــــی بــــێکەڵاش و بــــێزافـــــن
وەکـــــوو دەعبایەکــــانی پــــاش قــــافن
هەموویــــــان داربەدەســــــت و بەســــــتەزمان
قــــورِ بەســــەر قەوم و قیــــل کوردســــتان
نــــائیبی چـــی و وەزیــــر چـــی! هەیهــــات
ئــــاو و عەردیــــان گــــش لە دەس دەرهــــات
لە ســــەر ئەم زیلــــلەتەش جەنــــابی شــــێخ
دەگەڕێــــتن بە تەپــــڵ و دمــــبەگ و مــــێخ
دەعــــــوەتی خەڵقــــی ئەکــــا بــــۆ تــــۆبە
دڵــــــی پــــڕ ئــــاگرە وەک ســــــۆبە
پیـــــرەژن دێـــــتە پــــێش بە خــــۆ و هــــێلکە
دەڵـــــێ یــــا شــــێخ چــــاوێکم لــــێ کە
مـــــن ئومێــــدم بە هیممەتــــــی شــــــێخە
جـــــا فیــــدا ت بــــم دەســــتەکم رێــــخە

# زەكات بۆ ئاغاوات

مامۆستای بەڕێز هەمیشە ویستوویەتی کە مەلاکان ئازاد و سەربەخۆ بن و هەرگیز فتوای ناڕەوا نەدەن و دەوڵەمەند و ئاغا و دەرەبەگ و خاوەن زۆرەکان شوێنەواری پێچەوانە و نابەجێیان لە سەر دانەنێن و نەتوانن بیانکەنە بەندە و کۆیلە و گوێ لە مستی خۆیان.

ئەوەی خوا فەرموویەتی و پێغەمبەرﷺ رایگەیاندووە بیڵێن و بیکەن و ئەوەی خوای گەورە نەیفەرمووە، نەیڵێن و نەیکەن. خواش بۆ هەموو شتێک بەرنامەی هەیە. بۆ نموونە لەمەڕ زەکاتێوە دەفەرموێ: (انما الصدقات للفقراء و المساکین و ابن السبیل و الغارمین و فی الرقاب و العاملین علیها و المؤلفة قلوبهم و فی سبیل الله) واتا زەکات بۆ هەژاران و نەداران و رێبواران و وامداران، هەروەها بۆ ئازاد کردنی کۆیلە و ئەو کەسانەشە کەوا بە سەری رادەگەن و بۆ دڵدانەوەی نۆموسڵمانان و لە رێی خواشدا و بۆ ئەو کەسانەیە کەوا بە کاروباری ئایینی موسڵمانانەوە خەریکن کە دیارە وەرگرانی زەکات هەشت تیرەن و بە هیچ جۆرێک ئاغاکان و دەوڵەمەند و دەسەڵاتدارەکان و خاوەن زۆر و ستەمکارەکان وەبەر ناکەون و پێیان ناشێ، بەڵام بە پێچەوانەی فەرمانی دادپەروەرانەی قورئان و یاسای پێشکەوتنخوازانەی دێژەی پیرۆزی ئیسلام زۆر بیستراوە و بینراوە کە تەنانەت ئاغا گەورەکانی وڵاتی کوردستان زەکات و سەرفترەی خەڵکەکەیان بۆخۆیان کۆ کردۆتەوە و لە ئەوکی ئەو کەسانەی کە خوا بۆی داناون گێڕاویانەتەوە و بە ئەوکی خۆیداندا کردووە!! کە دیارە ئەوەش شێوەیەکی دیکەی چەوساندنەوەی چەوسێنەرەوانە.

جا مامۆستا بیستوویەتی کە یەکێک لە مەلاکان فتوایەکی وەهای داوە کە بە بەڵگەی ئەوە کە ئاغاکان دەستوپێ سپیلکەن و کاریان پێ ناکرێ زەکاتیان پێ دەشێ و تا ئەو ساڵانەش ئەو بەرنامە لە ئارادا هەبوو و ئاغاکان زەکات و سەرفترەیان هەر وەردەگرت.

جا مامۆستاش تووڕە دەبێ و ئەو پارچە هەڵبەستە دەمکوتکەرانە دەنووسێ، بەڵام بە داخەوە تەنیا هەر ئەو تاکەی هەوەڵیم دەسکەوت و ناچار خۆم کردۆتە شاگردێکی دڵسۆزی مامۆستا و بەو شێوەی خوارێ بۆم تەواو کردووتەوە:

## زەکات بۆ ئاغاوات

زەکاتی مەڕ و بزن
مەلا دەستی خۆ گەزن
زەکات لە بۆ رەئیسان
مەلا بمرن لە برسان
زەکاتی نیسک و نۆکان
مەلا بوشکێنن چۆکان
زەکاتی رەش ولاخان
مەلا بمرن لە داخان
زەکاتی پوول و دراوی
بۆ مەلاش بێ بەدناوی
خوا دایناوە لە قورئان
مەلاش نایداتە بەوان
زەکات بۆ بێدەستانە
نەک بۆ دەستەی مەستانە

زەکات بۆ بەگ و میران
مەلا دەربکەن لێیان
فەقێ بخوێنن بە سواڵ
بڕوا بۆ شێەی بەتتاڵ
شێخ و بەگ و ئاغاوات
بۆیان بۆتە بە داهات
حەقی خوا لە ماڵی خەڵک
ماڵ بێ بەر بێ وەکوو پەڵک
زەکاتێ بگرن ئاغا
مەلاش بمرن لە داغا
زەکات بۆ شێخ و میران
مەلا بجنێی بە شیران
هەژار لە برسان بمرن
بەشی شێخانیش پترن
بۆ زاڵمەکانی مەزن
سەیرێ ئەوێ سەیرانێ!!
یا بۆ دەستەی ئیبلیسان
سەیرێ ئەوێ سەیرانێ!!
بۆ دەستەی چاو چنۆکان
سەیرێ ئەوێ سەیرانێ!!
بۆ ئاغاوات و شێخان
سەیرێ ئەوێ سەیرانێ!!
بدرێ بە مام گوڵاوی
سەیرێ ئەوێ سەیرانێ!!
زەکات لەبۆ هەشت سینفان

سـەیری ئەوێ سـەیرانێ!!
هەم بـۆ دەسـتە وەسـتانە
سـەیری ئەوێ سـەیرانێ!!
نەک بـۆ رووت و فەقیـران
سـەیری ئەوێ سـەیرانێ!!
زەکـات بە تێـر و جەواڵ
سـەیری ئەوێ سـەیرانێ!!
مـالییەی چەنـدین سـناوات
سـەیری ئەوێ سـەیرانێ!!
بـا بخـۆن چینـی بـێکەڵـک
سـەیری ئەوێ سـەیرانێ!!
پێـی رابـوێرن لە باغـا
سـەیری ئەوێ سـەیرانێ!!
لێـی بێـبەش بـن فەقیـران
سـەیری ئەوێ سـەیرانێ!!
ئاغـاش زەکـاتی بگـرن
سـەیری ئەوێ سـەیرانێ!!

ئەگەر بە چاوێکی وردبینانە و رەدا بینانە تەماشای رازی پێویست بوونی زەکات بکەین بۆمان دەردەکەوێ کە خوای گەورە چ لوتف و مەرحەمەتێکی لەگەڵ ئەو خەڵکە کردووە کە ئەو بەرنامەی بۆ داناون.

لە پێش ئیسلامێدا زەکات باو بووە بەڵامماڵیاتێک بووە کە بۆ دەوڵەمەندان لە هەژاران و کارگەران و کاسبکاران ئەستێندراوە. کە بەڕاستی شتێکی سەیرە! ئاخر ئەو کۆمەڵەی کە دەوڵەمەندەکانی،

هەژارەکانی دەچەوسێننەوە چ ئەوین و دۆستایەتی و چ خۆشەویستییەکیان لە نێواندا دەبێ؟

بەڵام ئیسلام هێنای ئەو بەرنامە نادادگەرانەی ئاڵوگۆڕ کرد و فەرمووی زەکات دەبێ دەوڵەمەندەکان بیدەن بە هەژار و نەدارەکانی کۆمەڵ. دەستووریشی دا کە دەبێ ماڵدار خۆی داوتەڵەبانە لە ماڵی خۆی ئەندازەیەکی دیاری کراو هەڵبگرێ و بیدا بە هەژار و نەدارەکان و تا ئەویش دێتە رادەی وی و هەر دەبێ دەستی بگرێ و یارمەتی بدات و بە هیچ جۆرێکیش نابێ منەتی بە سەردا بکات.

جا بێگومان وەها کۆمەڵێک هەمیشە دۆستایەتی و ئەوین و خۆشەویستی لە نێوانی تاکە تاکەی حەشیمەتەکەی دایە و هەرگیز پێکەوە دژ و نەیار نین.

جا مامۆستا بۆیە تووڕەیە چونکە ئەو کەسەی کە ئەو بڕیارەی داوە کە زەکات بۆ ئاغا و شێخ و بەگ و میران دەبێ و.. بەرنامەکەی وەک پێش ئیسلام لێ کردۆتەوە! دیارە نایهەوێ کە زەکات لە جێی خۆیدا بە کار ببرێ و هەر کاتێکیش لە جێی خۆیدا بە کار نەبرێ، نە وەبەر دەکەوێ و نە کەڵکیشی لێ وەردەگیرێ. ماڵەکەش بە فیڕۆ دەڕوا و کابرای زەکات دەریش زەکاتەکەی هەر دە پێدا دەمێنێتەوە.

سەرەڕای هەموو ئەوانەش بێفەرمانی خوای گەورەش کراوە و زەکات وەرگرەکەش ماڵێکی حەرامی خواردووە و بۆ پەسلانیش خۆی پێناودار کردووە.

# تا کەی لە غەمت!

هۆنەری هێژا و هونەرمەندی هیوا کوژاومان مامۆستای دڵسۆزی گەل و رابەری هۆشیاری کۆمەڵی دڵ بێدارانی کوردەواری، دوای ئەو هەموو هات و هاوار و داد و فوغان و ئەو هەموو گریان و زاری و شیوەن و زایەڵە و هەروەها دوای ئەو هەموو پاڕانەوە و لاڵانەوە و ئەو هەموو تووک و نزا و ئاهو نزوولە و ئەو هەموو پەند و ئامۆژگاری و ئەو هەموو دڵسۆزی و بەختەمامییەی کە بۆو گەلە هەژار و زۆر لێکراوە دابەش کراوەی کورد کە دەیکا و هەر هیچی بۆ ناکرێ و هیچ سوودی نییە و هیچیشی لە دەس نایەت و تەنانەت ئەو خەڵکە خەو لێکەوتووەی هەر بۆش وەخەبەر نایەت و ئەغیار نابێتەوە.

چونکە ئەو خەڵکە وەها لە خەوی غەفڵەتدا تلاونەتەوە کە پرخەی خەویان تا رێی دوور دەڕوا و هەر دەڵێی مردوون و وەهاش بە زۆنگی تەمبەڵی و بێئاگاییدا رۆچوون کە هەرچەندی ستەمیان لێ بکرێ هێشتا هەر قبووڵی دەکەن و لاچۆ و مەکە و نابێ نییە، دێنێ هیوا و ئاواتە بەرزەکان و ئامانجە گەورەکانی خۆی بە خەیاڵ دەکاتە کیژێکی زۆر جوانی ئەبرۆ رەشی کوڵمە سپی وەک قەندی چاوماری (نەمر و هەر زیندوو) و لە بەرابەر خۆیدا دایدەنێ و ئەمجا پڕ بە چاوە زیت و زیندوو و پڕ ئەوینەکانی تێر تێر لێی دەڕوانێ و رووی تێدەکا و پێی دەڵێ:

ئاخر ئەی یارە جوانەکەم! تا کەنگێ لە داخی خەم و پەژارەی دووری تۆ من یەخەی خۆم دادڕم؟! تا کەی داماو و پەرۆش بم؟ ئاخر تا کەی ئەو حاڵ و ژیوارە؟ خۆ هەر وەختە لە داخ و دەردە و پەژارەی تۆ من بمرم؟

هەی هاوار! هەی هاوار! هەی هاوار! تۆ خواکەی ئەی یارە نازدارەکەم و نازەنینەکەم! کە قەت قەتم هەر نەدیوی و لە سوێیانیشت وەختە دڵم بتۆقێ، هەر نەبێ لە دوای نەمانم لە رووی وەفاوە جار جارە وەرە سەر گڵکۆیەکەم و سڵاو و درووودێکی دڵدارانەم لێ بکە. وەفا بنوێنە و ئەمن بدوێنە و جەفا وەتۆێنە و دڵم وەلاوێنە و خۆت وەڕازێنە و گۆڕەکەم هەڵپڕخێنە و بەرەو رووی من بزەت بێتێ و بەزت دابێ بە حاڵمدا و نەختێک لە رووما چاوە جوانەکانت هەڵێنە. ئاخر تۆ بۆچی وا بێ بەزەیی و نامیهرەبانی؟

بەڵێ مامۆستا دەڵێ: من ئاوام بەو یارە نازەنینەم گوت و خۆ بە هەزار دەردی سەری و خیرەت وەبەر خۆ نان و شەرمی خۆ بە زۆر شکاندن رامگەیاند کە تۆ ئاگات لە حاڵی منی بێچارە نییە و نازانی کە من چەندە هەناسە سارد و دڵ گەرمم؟

ئەویش لە ڕووی جەفاوە و بە تووڕەییەوە وڵامی دامەوە کە هێندەی دیشی ناڕەحەیی کردم و پێی گوتم جارێ ئەتۆ چیت دیوە؟ جگە لە نموونەیەک لە جەفای جۆراوجۆر و شیواشیوی من هیچت چاو پێ نەکەوتووە. تۆ کە بتهەوێ لێوی ئاڵی گوڵی رزگاری ماچ بکەی و بە کەیفی خۆت بیمژی پێویستە جەور و جەفا و ئازاری یەکجار زۆر بکێشی، کە ئەتۆ هێشتا هیچت نەدیوە.

بەڵێ دەڵێ گوتم ئاخر خۆ من ناتوانم تەنانەت لە دوای مردنیشم هەر جەفاکێش بم. خۆ رۆژێک نەتبینم دنیام لە بەر چاوان تاریکەو هەر شتێک و هەر کەسێک کە دەبینم بیرەشۆم پێی ناشکێ و هەروەها دەڵێ ئەو یارەی من ئەوەندە بێمیهر و وەفایە بڕوانە چۆن لەگەڵ من دەجووڵێتەوە تەماشا بۆ ئەوەی تەنانەت وێنەی من نەچێتە ناو چاوی چۆن چاوی لە من وەردەگێڕێ. من رۆژێکی لە بێچارەیی و پڕ ڕوویی خۆم پێم گوت ئەی یارەکەم، کە تۆ وەک بت

ڕەب بۆ ئاگات لە منی ئەویندار و بێچارە نییە کەچی پتر هەڕەشەی لێ کردم و گوتی چارێ لە کوێتە؟ ئەوەنـدەی دیتـووتە هەر کەمێکە لە جەفا و ئیتر گورژی گوتەنی ئەتـۆش ناچـاری کە دەبـێ قبـووڵی بکەی وبی کێشی.

کـــێ بمـــژێ لێـــوی بـــووکی رزگـــاری
دەبـــێ بە خـــوێنی خـــۆی بکـــا یـــاری
هەرکەس ئـــــازادی و سەربەســـــتی بـــــوێ
بـــــای گەرم و ســـــــاردی وە لەش ئەکەوێ

ئـەو کــەسـەی بگـری بـــەهـیـی سـینـەی یـــــا ر
نــابـــی بـتـــرســــی لـــــە لـــرفــــەی رەشـمــــا ر

## تا کەی لە غەمت

تـــا کەی لە غەمـــت یەخەی کراســـم بـــدڕم؟
نێـــزیکە لە دەرد و حەســـرەتی تـــۆ بمـــرم
بـــۆ خـــاتری خـــوا لە پاشـــی مـــردن جـــار جـــار
ئاهیـــستە لە ڕووی وەفـــا وەرە ســـەر قەبـــرم
گەر مەرحەمەتـــێ بە مـــن دەکەی،ســـا بـــیکە
نەممـــــاوە تەحەممـــولی جەفـــا چیـــدیکە
رۆژێکـــــی ئەگەر خـــــودا نەکـــــا نەتبیـــــنم
بـــێشـــک هەمـــوو دنیـــام لە نەزەر تـــاریکە
ئەبـــرۆی رەش و کـــوڵمی ســـپی و چاومـــاوی
ئەی دڵ عەجەبـــا ئەتـــۆ چـــۆن مـــاوی؟

بنـــوارە چلـــۆن چـــاوی لە مـــن وەرگێـــڕا
نەک ســـوورەتی مـــن بچێـــتە نـــا و چـــا وی
رۆژێکـــی لە بێچـــا رەیـــی و بـــێشـــەرمی
پـــێم وت ســـەنەما بە خـــوای ئەتـــۆ بـــێرەحمـــی
ئاگـــات لە منـــی عاشـــق و بێچـــارە نیـــیە
بـــۆ حـــاڵی هەناســـە ســـاردی و دڵ گەرمـــی
فەرمـــووی جـــارێ لە جەفـــا ئەتـــۆ چـــت دیـــوە؟
مەیـــدانی جەفـــا دۆڵـــو دەرە و شـــیو شـــیوە
مـــاچی لەبـــی لێـــو ئـــاڵی گـــوڵی رزگـــاری
پێویـــستی جەفـــای زۆرە، ئەتـــۆش ناچـــاری

# چەند نموونەیەک لە خیرەت و مەردانەگی و زیرەکی ماموٚستای کۆیی

ئەو بەڕێزە ئەوەندە پیاوێکی نەترس و بەخیرەت و بەتوانا بووە کە لە دەورانی خۆیدا هیچ کەس وەک وی پێی نەکراوە و بە راستی بێ لینگە و بێهاوتا بووە.

بێگومان هەر زانایەک زانایە و بەڵام هەر زانایەک توانا نییە و هەر زانایەکیش توانای نەبێ زانیارییەکەی بارێکە لە سەر شانی و بە کاری هیچ نایە و کەڵکی نییە. چونکە زانا دەبێ توانایی ئەوەی ببێ زانیارییەکەی خۆی رابگەیەنێ و ئەگەر خیرەتی راگەیاندنی زانیارییەکەی خۆی نەبوو ئەو زانیارییە بەڵایە بۆ وی و تۆقێکە بۆ دوا رۆژی پەسلانی و هەر بە هۆی ئەوەیەوە سزا دەدرێ.

بەڵام ماموٚستا کۆیی لەو زانا بەرزانە بووە کە خیرەت و شەهامەتی دەربڕین و راگەیاندنی زانیارییەکەی خۆیان هەیە و وەک تیخی دەبان وان و هەرگیز ژەنگاوی نابن و هەمیشە دەدرەوشێنەوە و دەبریسکێنەوە هەموو هۆنراوەکانی و تەواوی نووسراوەکانی و هەڵسووڕان و داسووڕانی و فەرمووده و وتارەکانی هەر یەکە خۆی گەواهێکی گەورەیە لە سەر ئەو داوایە.

جا لێرەدا بۆ چەسپاندنی داواکەم چەند بەسەرهاتێکی وی دەگێڕمەوە کە هەر یەکەی گەواهێکە و هەر کامەی گەورەترین بەڵگەو پەتۆیە لە سەر خیرەت و پیاوەتی ماموٚستا.

١ـ دەگێڕنەوە جارێکی ئینگلیسییەکان ماموٚستا راپێچ دەکەن و دەیبەنە یانەی ئاسایشی خۆیان و پاش جەزرەبە دانێکی زۆری شیاوی وی لێی دەپرسن ئەتۆ سەبارەت بە شێخ مەحموود بیرورِات

چۆنە؟ ئەویش لە وڵامیاندا دەفەرموێ: هەموو گەل و هۆزێک لە دنیادا مافی ئەوەی هەیە، کە میری سەربەخۆی ببێ و خۆی سەرنویشت وچارەنووسی خۆی دیاری بکاو گەلی کوردیش یەکێکە لەو گەلانە و شێخ مەحموودیش مافی ئەوەی هەیە وببێتە پادشا و سەرۆکی کوردستان و ئەورۆ کەس لەو وڵاتە لەوی باڵاتر نییە و ئیتر کاری ئەو کارێکی ڕەوایە.

٢ ـ هەروەها جارێکی دیکە بانگی دەکەن و لێی دەپرسن ئێمە نازانین کە شێخ مەحموود ئەو ئاژاوەی بۆچی ناوەتەوە و بۆچی وا دەکا؟! ئەتۆ لەو بارەوە چ دەڵێی؟ ئەویش لێیان دەپرسێ ودەڵێ: ئەگەر شێخ مەحموود هاتبا و وڵاتی ئێوەی داگیر کردبایە ئەنگۆ چیتان دەکرد و چ دژکردەوەیەکتان لە خۆ نیشان دەدا؟ ئەوانیش دەڵێن لەگەڵی بە شەڕ دەهاتین و لێی رادەپەڕین و ئەجەنگاین لە گەڵیا هەتا دەرماندەکردەوە. ئەویش دەفەرموێ دەیجا خۆ ئەویش هەر ئەوەی کردووە کە ئێوە دەتانکرد، ئەگەر لە جێی وی بان بۆچی بۆخۆتان بەڕەوا و باش دەزانن؟ بەڵام بۆوی بە گوناح و تاوان؟

٣ـ دیسان لە دەورانی نوێنەرایەتییەکەیدا جارێکی لە لایەن خەڵکی تووڕە و ڕق هەستاوی شاری بەغدایەوە پەلامار دەبردرێتە سەر کۆڕی خیبرەکان (مجلس نواب) و نوێنەرەکان جگە لە مامۆستا هەموویان هەڵدێن و خۆیان دێر و دەوێ رادەکەن و وەک جووجەڵە مریشکان خۆیان دەشارنەوە. بەڵام مامۆستا بە ئەوپەڕی خیرەتەوە لە جێی خۆی دەچەقێ و زۆر قسە بۆ خەڵکەکە دەکا و هەر چۆنێک بێ بڵاوەیان پێ دەکا. لە دواییدا کە خڕ دەبنەوە لە مامۆستا دەپرسن و دەڵێن ئەری تۆ چۆن نەترسای و خوت نەشاردەوە؟ بە خوا ئێمە زۆر ترساین. ئەویش دەفەرموێ: ئەمن بە سێ بەڵگە و

پێی وت (دلیل) دەبوو نەترسم و وەکوو ئێوە هەڵنەیەم. یەکەم: ئەوە کە من موسڵمانم و موسڵمانیش دەبێ بەخیرەت بێ. دووهەم: ئەوە کە من زانام و زاناش دەبێ بێخیرەت نەبێ. سێهەم ئەوە کە من کوردم و کوردیش لە هەموو کەس بەخیرەتترە.

وەک دەبینین مامۆستای بەڕێز مان یەسێ بەڵگەی زۆر بەهێزو قەوی خیرەت و ئازایەتی ودلێری خوی بەهەقا لەکانی خۆی سەلماندەو، کە بریتین لە:موسڵمانەتیو زانیاریو کوردایەتی.

کە دیارە لە روانگەی ویەوە هەر سێکیان هۆی خیرەت و دلێری و نەترسین، کە لەراستیشدا هەر دەبێ وابێ و نابێ هیچ موسڵمانێک ترسنۆک بێ، بەتایبەتی ئەگەر زانابێ و خوئەگەر ئەو موسلما نەزانایە کوردیش بی ئیتر هەر قسەی لی مەکە کە دەبی لەهەمو کەس بە خیرەت ترو ئازاترو دلیرترو نەترس تر بێ.

زور لەمیژە گوتویانە: چیای مەزن هەرکێیە هەبی بزن و هەرزن هەرگیز لەوی کورد نا بەزن.

خوا لێخۆشبوو مامۆستای کۆیی هەروەک، کە زانایەکی زۆر بەخیرەت و لێزان و هەڵکەوتوو بووە پیاوێکی زۆر بەڕێز و نەبەز و نەترس و بێمنەت و خۆناس و بەوەفاش بووە.

٤ـ جارێکی وەزیرێکی (گویا سە رە ک شالیاران د ە بی )عێراقی دێتە کۆیە و پیاو ماقووڵان بۆ پێشوازی ئەو بانگ دەکرێن و خەڵکێکی زۆر لەو بارەوە کۆ دەکرێتەوە و مەلا عەبدوڵلا ناوێکیش کە مامۆستای مەلای کۆیی دەبێ وێڕای مامۆستا لە ریزی بانگ کراوەکان دەبێ.

مامۆستا لە کاتی رۆیشتندا دەیهەوێ مەلا عەبدوڵڵا وە پێش هەمووان بکەوێ چونکە خۆی مامۆستای وی بووە و خۆی بە دوا مامۆستاکەی خۆیدا بڕوا و وەزیریش بە دوای ویدا بێت. وەزیر نایهەوێ وە پێش مامۆستای کۆیی بکەوێ و زۆریش گرینگی بە مەلا عەبدوڵڵا نادا و مەلا عەبدوڵڵاش بە هیچ جۆرێک وە پێش وەزیر ناکەوێ و پێ لە سەر ئەوە دادەگرێ کە وەزیر وە پێش هەمووان بکەوێ و سەرەنجام وەزیر پێش دەکەوێ و مەلا عەبدوڵڵا بە دوایدا دەڕوا و بەو پێیەش مامۆستای کۆیی دەبێتە سێهەمین کەس و کە تەماشا دەکا بە دوو زانای ئایینی وا نەزانێکیان وە پێش خۆیان داوە پێی ناخۆش دەبێ. لە پشتەوە پیلی مەلا عەبدوڵڵا دەگرێ و دەیخاتەوە دوایە و پێی دەڵێ وەرە دوایە وا دیارە ئەتۆ شایانی پێشکەوتنت نییە خۆ من لەبەر تۆ نەبێ وەزیری هەر بە پیاویش نازانم و ئتیر ئەو جار خۆی وەپێش وەزیری دەکەوێو مەلا عەبدوڵڵاش بە دوای وەزیریدا دەڕوا. گۆیا دوایە بە وەزیری دەڵێ ئاقڵت هەبێ قەت وە پێش مەلا و زانایان مەکەوە. وەزیریش خێرا دەڵێ قوربان بمبوورە من مەلا عەبدوڵڵا بە زۆر پێشی خستم.

مامۆستا هەر لەو کاتەدا کە پیاوێکی نەترس و باوەڕدارێکی بەبڕشت بووە و باوەڕی بە بیر و باوەڕ و بە کار و کردەوەی خۆی هەبووە و مەردێکی رەند و مەند و هێواش و لەسەرەخۆ و لێبوردووش بوە و هەرگیز خێرا هەڵنەچووە و بۆ تۆڵەی بە پەلە هەوڵی نەداوە.

ە ـ بۆ نموونە جارێک جەوانێک لە شەقامی شاری کۆیە لە پشتەوەڕا دەمانچەیەکی پێوەدەنێ و دەیهەوێ بیکوژێ بەڵام نایهەنگێوێ و دوایە کە مامۆستا ئاوڕی وێ دەداتەوە زۆر خەجاڵەت دەبێ و تێکدەچێ و دەمانچەکەی لێ هەڵدەوەرێ و مامۆستاش رووی

پێدەکا و پێی دەڵێ کوێری ئەوە بۆ نەتپێکا ڕۆڵە ئەوە دەتهەوێ مەلای کۆیی بکوژی؟ ئەمجا دەمانچەکەی بۆ هەڵدەگرێتەوە و وێی دەداتەوە و دەڵێ مەلای کۆیی تا خوا نەیکوژێ بە کەس ناکوژرێ وەرە بڕۆ لە ڕێی خۆت.

بنەماڵەی بەڕێزی مەلای کۆیی هەر لە بنیڕا بنەماڵەیەکی زانا و زانا پەروەر و زانست دۆست بووە و وەک باس کرا چەندین مەلای گەورە و زانای هەڵکەوتووی لێ سەر هەڵداوە و زنجیرەی مەلایانی ئەو خانەدانە پیرۆزە گەلێک درێژ و خاوەن ئالّقەی گەورە گەورەیەو چەندین پیاوی گەورەی وەک خۆی و باوکی لێ هەڵکەوتوە.

لام وایە ئەوەندە بەسە بۆ ڕانان و پێ هەڵگوتنی ئەو بنەماڵە کە وەک بەڕێز گیوی موکریانی دەڵێ حاجی مەلا قادری کۆیی لە نامەیەکیدا کە لە ئەستەمبووڵێڕا بۆ بەڕێز حاجی مەلا عەبدوڵلا جەلی باوکی بەڕێزی مەلای کۆیی نووسیویەتی دەڵێ:

بە غەیـــری جەددی ئێـــوە کـــێهەیە دانـــا
لە کوردســـتان بنـــاغەی عیلمـــی دانـــا

بەڕاستی ئەو بنەماڵە دڵسۆزی ڕاستەقینەی کورد و کوردستان و ئایین پاکی ئیسلام بوون جا بەتایبەتی خودی مامۆستا مەلا محەمەد خوا لێی خۆش بێ گۆیا ئەو بەڕێزە هەمیشە هەر فەرموویەتی هەر چەند دەکەم سێ مەلام لەو کوردستانەدا بۆ حاڵی ناکرێن دەنا سەربەخۆیی تەواوم بۆو وڵاتە دەستاندەوە و ئەگەر سێ مەلام بە چاکی لەگەڵ بان کوردستانم دەکرد بە گوڵستان.

دەڵێن هەر کاتێک باسی شێخ عەبدولقادری گەیلانی دەکرد هەر دەیفەرموو مەلا عەبدولقادری گەیلانی. جارێک لێیان پرسی قوربان

تۆ بۆچی قەت نالێی شێخ عەبدولقادر و هەر دەڵێی مەلا عەبدولقادر؟ ئەویش دەیفەرموو من نامهەوێ بچووکی بکەمەوە، چونکە مەلا جێنشینی پێغەمبەرە و گەلێک گەورەیە، بەڵام ئاخر شێخ چ کارەیە و چ پلە وپایەیەکی لە ئایینی پیرۆزی ئیسلامدا هەیە؟ عەبدولقادر گەیلانی هەرگیز شێخ نەبووە بەڵکە زانایەکی گەورە بووە.

جا راستیش ئەوەیە کە عەبدولقادر گەیلانی قەت شێخ نەبوو بەڵکە مەلایەکی گەورە بووە و گۆیا هەمیشە وانەی چل فەقێی گوتووە و ئیتر ئەگەر راگەیاندن و رێنوێنی خەڵکیشی کردبێ بە نێوی شێخایەتی نەبووە و تەکیە و مەکیەی رانەگرتووە و خانەقای نەڕازاندۆتەوە. بەڵکە فێرگە و مزگەوتی ئاوەدان کردوونەتەوە و فەقێی راگرتوون و دژی دەروێش بازاڕی و شێخایەتی بووە و خۆشی دە لاپەڕەی پەڕتووکی (الغنیة)ی خۆیدا دەفەرموێ: (هەر مورشیدێک چاوی لە ماڵی مریدەکانی خۆی بێ یان ئەگەر بۆیان برد و پێیدا نەناردنەوە بزانە ئەو مورشید نییە و بۆ وەدوا کەوتنێ نابێ).

مامۆستای کۆیی هەر کەسێکی خزمەتی گەلی کورد و زمانی کوردی و ئایینی پیرۆزی ئیسلامی کردبێ زۆری خۆش ویستووە و پتریش دنەی داوە. بۆ نموونە بە خەتی خۆی وێڕای مەلا ئەفەندی هەولێری لەسەر پەڕتووکی پێشەوای ئایینی داماو حوسنی حوزنی موکریانی(گچکە) کە دوو بەرگی (منهاج الطالبین)و (فتح المعین)وە وەرگێڕا بۆ سەر زمانی شیرینی کوردی بەو جۆرەی نووسیوە (ئافەرین سەید حوزنی، تۆ لات وایە کە تەنها خزمەتی زمانی کوردیت کردووە و بەس، خوا دەیزانێ خزمەتی ئایینی پاکی ئیسلامت پتر کردووە، خوا ئەمسالتان زیاد بکا).



حوسێن حوزنی موکریانی

٧- دەروێشێکی نەزان و دژمنی تیپی مەلا دەیـهەوێ لە مامۆسـتای بدا و رقی کۆن و نوێی خۆی پـێ برێـژێ لـە کاتێکدا کە ئەو بەڕێـزە لـە حەوشەی مزگەوتی سووری کۆیە رۆژێکـی زسـتان خەریـک دەبـێ دەسـتنوێژی هەڵبگـرێ و لـە بەر سـەرمایە دەرگـای حوجرەکـانیش هەموویـــان پێوەدرابـــوون و فەقێکـــان هیچیـــان لە دەرێ نەبـــوون دێوانەی غوولپەیکەری سەر قرژن لـە حاڵێکدا کە کوتەکێکی گەورەی سەرخڕی لـە پشت خۆی گرتبـوو دێت و لێـی دەپرسـێ و دەڵـێ مەلا ئەرێ ئەتــۆ گوتــووتە پێغەمــبەر لـە حەزرەتــی غەوس گەورەتــرە؟ دەروێـــش کە دەیـــهەوێ بەهـــانەیەکی دەس کەوێ تـــا مامۆســـتا کوتەککاری بکا چاوەڕوانی ئەوەی دەبێ کە مامۆستا بڵـێ جا هەر وایە ئیتر ئەویش دایبگژێنێ.

مامۆسـتا زۆر بە زووی لێـی حـاڵی دەبـێ و مەبەسـتە گـڵاوەکەی دەزانێ و بۆ ئەوەی فەقێکان پێ بزانن و بێنە دەرێ بە دەنگێکی بەرز دەڵـێ لە کێـت بیـستووە؟ جـا چـۆن بـاوەڕ دەکەی؟ خـۆ لە خۆمـت نەبیستووە؟

فەقێکان، کە گوێیان لە دەنگی مامۆستا دەبێ گورجێک دێنە دەرێ و دیوانەی دەگرن و دەکانیەکەی هەڵدەکێشن و بەو سەرمایە مەلەی پێ دەکەن و بەو جۆرە مامۆستا لە چەنگی ئەو خوا نەناسە رزگار دەکەن.

مامۆستا خۆی یەکەم کەس بووە لە کۆیە کە کچی خۆی ناردۆتە قوتابخانە و ویستوویەتی ئەو سنوورە بشکێنێ کە ئافرەت لە چوارچێوەی نەخوێندەواریدا بمێنێتەوە.

ئەو بەڕێزە تەنانەت خۆی پارچە زەمینێکی گەورەشی بەخشیوە بۆ دروست کردنی قوتابخانە لە شاری کۆیە و یەکەم قوتابخانەی ئەو شارە لە زەمینی ویدا دروست کراوە.

ئەو خوا لێ ی خۆشبێ هەمیشە بۆ چارەی کورد بە پەرۆش بووەو زۆر بە خەمی کوردی هەژار ولێقەوماوەوە بووە. لە کاتی ویدا هێشتا کۆمۆنیزم نەگەیوەتە کوردستان و لە کوردستاندا بەو نێوە خەڵک فریو نەدراوە و دژایەتی کردنی ئەو رێبازە هیچ پێویست نەبووە، هەر بۆیەشە کە لە هۆنراوەکانی مامۆستای بوتشکێن و خەرافات فرێدەرماندا هەڵمەت و پەلامار بۆ ئەو رێبازە لاوازە و پەیڕەوانی ئەو نەکراوە. دەنا بێگومان ئەگەر مامۆستا لەو رۆژگارەی ئێمەدا ژیابایە دەنگی رەخنە و بێزاری لەو بارەوە دەگەییە ئاسمان و گوێی پەریانی کەڕ دەکرد.

ئەوەی هەبووە هەر رێبازگەلی جۆراوجۆری شێخایەتی و دەروێش بازاڕی و مریدایەتی و تەریقەت و مەریقەت بووە و بە نێوی تەریقەت و مەریقەت شێخ و شێخ بازاڕی خەڵکیان لە شاڕێگەی ئیسلامی پیرۆز لاداوە و بە کوردی و بە زمانێکی سادە بڵێین لەو چاخیدا دژمنانی ئیسلام بە هیچ جۆرێک خیرەتی ئەوەیان نەبووە و نەیانتوانیوە راستەوخۆ لە دژی خوا راپەڕن و بڵێن و خوا

هەر نییە و نەبووە و نابێ ببێ بەڵکە خواشیان بە رواڵەت قەبووڵ کردووە بەڵام زۆر لێزانانە و هەر بە نێوی ئایین و ئیسلام و بە شێوەیەکی هۆشیارانەی وا کە هەموو بە نێو زانایەکیشی لێ حاڵی نەبێ و تێینەگا چەندین ئاواڵ و هاوتایان بۆ خودا داناوە و خەڵکیان لە ڕێبازی خواپەرەستی راستەقینە لاداوە و ئەو تاقە ڕێگەیان کردۆتە دەیان و سەتان و هەزاران ڕێگە و ئەو تاقە خودایەیان کردۆتە سەتان خودا!! دەبێ ئەوەش بڵێین وبیسەلمێنین کە ئەو مریدە بێچارانە هەرگیز پێیان وا نەبووە و نەشیانزانیوە کە ئەو ڕێچکە و ڕێبازانە ئیسلامی نین و دژی ئیسلامن دەنا بێگومان هەر ئەوان خۆیان لێیان رادەپەڕین و وەک زبلی ناو ماڵ و حەوشە رایاندەماڵین و دەیانخستنە ناو زبڵدانی مێژووەوە، جا هەر بۆیە رەنگە بەشێکی زۆر مریدە نەزانەکان هەر بە موسڵمان لە قەڵەم بدەین.

جا هەر بۆیە مامۆستا لە هۆنراوە و نووسراوەکانیدا و هەروەها لە وتارو قسە و کردارەکانیدا هەڵمەت دەباتە سەر ئەو جۆرە بیر و باوەڕە و ئەو شێوە بیر کردنەوە و ئەو خوا دەستکردانە خڕ دەکاتەوە و دەیانخاتە زبڵدانەوە و گورزی گوتەنی گش خواگەلی پووشالی - بێنێوەرۆک و خالی - بە نووکی شەق تێم هەڵدان - هەر کە لێیان بووم حالی و ئیتر هەموویان وەلا دەنێ و تەنیا خوای گەورە و وەدیهێنەری جیهان و بوونەوەر بە خەڵک دەناسێنێ و دەیهەوێ موسڵمانان بچنەوە سەر بیر و باوەڕی موسڵمانانی هەوەڵی و دەورانی پێش دووسەد ساڵ دوای کۆچی پێغەمبەری مەزن واتا بیر و باوەڕی راستەقینەی موسڵمانانی سەرەتای ئیسلام و ڕێبازی راستینی قورئان و بەو شێوە دەفەرموێ:

بە عیلم و عەقڵ و هۆش و فیکر و عیرفان

بە قەولی مستەفا و ئایاتی قورئان

بـــــزانن ئەو قـــــسانە پـــــاکی پـــــووچن
ئەگەر خوامـــــان هەبـــــێ ئەقتـــــابە بـــــۆچن؟
بە قەولـــــی جـــــاهیلان خۆتـــــان مەگـــــۆڕن
بە چـــــاوی دڵ لە دنیـــــایە بنـــــۆڕن
بە غەیـــــرەز قـــــودرەتی دەوواری جەبـــــار
بە غەیـــــرەز پادشـــــای خەلـــــلاق و قەهـــــار
بە قـــــوتبێکی زەعیـــــف و ناتوانـــــا
ئیـــــدارەی چـــــۆن دەبـــــێ ئەی مەردی دانـــــا
ئەوەی لای ئێـــــوە دەوواری ئومـــــوورن
لە بەر دەســـــتی خـــــودا کەمتـــــر لە مـــــوورن
کەســـــێ ئیمـــــانی بە خـــــوا و قـــــودرەتی بـــــێ
چلـــــۆن ئەو ئیعتیقـــــادەی دەشـــــتە قەلبـــــێ؟

راستی پیاو ئەگەر کەمێک ژیر بێ و هۆش و بیر و زانیاری خۆی وەکار خا و فەرموودەکانی پێغەمبەری مەزن و ئایەتەکانی قورئان و یاساکانی ئیسلام هەڵسەنگێنێ و بەراوردێکی ژیرانە و زانایانەیان لێ بکا دەزانێ کە ئەو قسە و چاو و ڕاوانە و ئەو هەموو خواگەلە پووشاڵییە دەستکردانە پووچ و بێمایە و بێنرخن و هیچ کاریگەریان لە دەس نایە و بە کەڵکی هیچ نایەن و ئەو چاو و راوو و قسە و باسانەش هەموویان درۆ و دەلەسە و بێبنج و بناوانن و قسەی نەزان و تێنەگەیشتووانن.

ئاخر پیاو دەبێ بە چاوی دڵ لە دنیایە بڕوانێ و قورئان گوتەنی: ﴿ أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَتَكُونَ لَهُمْ قُلُوبٌ يَعْقِلُونَ بِهَا ﴾ الحج:٤٦، ئایا گەشت و گوزار ناکەن و بەم سەرزەوییەدا ناگەڕێن و بیر ناکەنەوە و تێگەیشتن پەیدا ناکەن و خۆیان بە چەکی زانیاری و

ژیری ئامادە و پڕچەک ناکەن؟ جا هەتا دڵگەلێکی وەهایان بێ شتی پێ بزانن و بیری پێ بکەنەوە و پێی لە جیهان و بوون و بوونەوەر حاڵی بن و یاسا و بەرنامەی خوای پێ بزانن واتا بۆ ئەوەی ناکەن هەتا دڵگەلێکی وایان بێ؟

ئایا تا کەنگێ هەروا بە نەزانی بەرەو پێش دەچن و تا کەی لەو خەوی بێئاگایی هەڵناستن؟ تا کەی ئەو هەموو خورافات و شتە پڕوپووچانە و ئەو چاو و راوە بێبنج و بناوانە قبووڵ دەکەن؟ خۆ وەڵس و ئاژەڵ نین کە بۆ هەر لایەکیان لێ خوڕن دەڕۆن؟ مرۆڤ دەبێ لەگەڵ وەڵس و پاتاڵ و ئاژاڵ جیاوازی هەبێ و ئەو جیاوازییەش هەر بە ژیری و بیرە و بەس.

خوای گەورەش هەر کەسە بە ئەندازەیەک ژیری داوەتێ و ئیتر کەس نابێ ئەو بەشە خوا پێداوەی خۆی خامۆش و نیخەپەست بکا بەڵکە دەبێ ئەو چرایە بە چاکی هەڵبکا و ئەو ئەستێرە تیشکە هاوێژە شۆق پڕژێنە گەشەدارتر بکا و پتر و پتر بیدرەوشێنێتەوە.

بێگومان ئەو کەسەی بیر و ژیری و ئاقڵ و ئاوەزی خۆی وەکار دەخا و بەو پێیە لە دنیا و شتەکانی دنیا و یاسا و رێسا و بەرنامەکانی خوا دەگا وەک کەسێکی بینا و چاو ساخ وایە کە هەموو شتێک و بگرە وردترین شت لەبەر پێی خۆی و دەوروبەری خۆی دەبینێ و بە پێچەوانە کابرای چاولێکەر و لاساکەرەوە و دواکەوتووی ئەم و ئەو وەکوو کوێرێک وایە تەنانەت گەورەترین مەترسی و دڕندەترین دژمنی خۆی نابینێ کە بێگومان هەرگیز وەک یەک و یەکسان نین.

﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي ٱلْأَعْمَىٰ وَٱلْبَصِيرُ أَمْ هَلْ تَسْتَوِي ٱلظُّلُمَٰتُ وَٱلنُّورُ﴾ الانعام:١٦

، بڵێ ئایا وەک یەکن بینایان و کوێرەکان ئایا یەکسانن تاریکی و

ڕووناکی؟ لە قورئاندا کەم نین ئەو ئایەتانەی کە دەفەرموون (افلا تدبرون) ئایا لێ کۆڵینەوە ناکەن؟ (افلا تعقلون) ئایا تێناگەن و لێ حاڵی نابن؟ (افلا تذکرون) ئایا فێر نابن و وە بیر خۆ ناهێننەوە؟! ئامۆژگاری ناکەن؟ (افلا تعلمون) ئایا نازانن؟ (افلا تتفکرون) ئایا بیر ناکەنەوە؟.

جا مامۆستای بەڕێزمان لەو جۆرە موسڵمانانە بووە کە بە پێی فەرمانی قورئان بیر و ژیری و هۆش و زانیاری خۆی وەکار خستووە و بە چاوی دڵی لە جیهانێ وەڕاماوە و لێی حاڵی بووە. خوای گەورەی ئەو جۆرەی کە قورئان پێمان دەناسێنێ ناسیوە و هێز و وزەی خوای پێ لە سەرەوەی هەموو هێز و وزەیەک بووە. هەرگیز پێی وا نەبووە کە خوا بوونەوەرێکی وەهایە کە لە ژێر فەرمانی شێخ و خەلیفەدا کار دەکا و چاوی لە زاری وانە داخوا چی پێ دەڵێن تا وا بکا یان پێوەندییەکی خزمایەتی تەنگاتەنگی لە گەڵ شێخ و مێخ دا هەیە و ئەوانی کردۆتە نوێنەری قەت لانەبراوی خوی لە سەر زەمین و هەر کەس ئەوان بە خوای نەناسێنن هەرگیز خوا نایناسێ ؟ هەر وەک ئەو جۆرەی بیر کردنەوە گەلێک لەو تاقم و توێژانە و ئیتر گورژی گوتەنی:

بڵێم پێت ناپەرەستم ئەو خودایە
کە هەوساری لە دەستی شێخی دایە
ئەمن زەندیقەم و ئاور پەرەستم
ئەگەر کوو خوا نەکا خوامان ئەوایە
دەبا من پێت بڵێم کاکە بە کوردی
شتی ئاوا ئەرێ کێ فێری کردی؟
لە قورئانا نە شێخم دی و نە دەروێش
هەموو چەند جاری لێک داوە بە وردی

ئەگەر پێویستە شێخ بۆ ئاییني خوا
بڵێ پێم شێخی گش پێغەمبەران کوا؟
محەمەد خۆی و دۆست و یارەکانی
بە گشتیان شێخێکیان دەبوایە ببوا!!

مامۆستا ڕێکوڕاست لە هەموو هۆنراوەکانیدا و هەروەها لە تەفسیرە بەنرخەکەیدا دەفەرموێ شێخ پێویست نییە و نابێ ببێ و زیانی گەورەشی هەیە و ئەو وەک هێندێک لە زڕە مەلا و وشکە موسڵمانەکان نەبووە کە باوەڕیشیان بەو جۆرە شتانە نییە بەڵام لە ترسی خەڵک یا ترسی دەزگای دەسەڵاتدار بە ڕواڵەت قبووڵی دەکەن و دژایەتی و نەیارییان ناکەن، ئەوان کە لە خشەی قوڕێ هەڵدێن و لە سێبەری خۆیان دەسڵەمێنەوە و هەروەها وەک ئەوانەش نەبووە کە لە لای هەر کەس بوون لە گەڵ وین بۆ وی دەڵێن و بە کوردی لە گەڵ شوانی پاسێ دەکەن و لەگەڵ گورگیش کەلاکی دەخۆن!!

# چەند نموونەیەک لە خیرەت و دلێری و بوێری ماموٚستای کۆیی

ماموٚستا پیاوێکی راست و رەوان و یەک رەنگ و بێپێچوپەنا و بەخیرەت و نەترس و کۆڵنەدەر و نەبەز و ژیر و زانا و هۆشیار و رامیار و قسە لە روو بووە. شەرمی لە کەس نەکردووە و ئەوەی بە رەوای زانیبێ بە هەموو کەسی گوتووە و بێڕووپامایی بیرو ڕای خۆی دەربڕیوە. شاو گەدای بە لاوە یەکسان بووە و قسەی راست و رەوای خۆی بە گوێی هەمووواندا داوە.

١ـ جارێکی مەلیک بانگی دەکاتە بەغدایە و لەو کاتەشدا مانگی رەمەزانێ دەبێ سەرد ەمی نیوەڕۆیە مەلیک فەیسەڵ دەستووری خواردەمەنی ونانی دەدا. ماموٚستاش توورە دەبێ و دەفەرموێ بۆمەگەر رەمەزان نییە؟ لام وایە ئێوەی عەرەب ئیسلامەتییەکەتان هەردە مل کورداندا هێشتۆتەوە و بەس . وا دیارە خۆتان باوەڕتان پێی نییە وهەربۆوەی سواری ملمان بن بە ئەستۆی ئێمەتاندا هێناوە؟! خۆ دیاریشە کە لە سایەی ئیسلامڕا چاکترتان توانیوە خۆتانمان بە سەردا بسەپێنن.

ئەو بلیمەتە پسپۆڕەی کوردی کورد پەرەوەرە کاتێک کە دەچێتە میسرێ و ماوەیەکی زۆر لەوێ دەمێنێتەوە و خەریکی و لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی مەلاکانی میسرێ دەبێ کەس نابێ وی ناهێنێ و هەر کەس وتوویژی لەگەڵ دەکا زوو بۆڕی دەدا و بە چۆکیدا دێنێ و ناچاری دەکا دان بە گەورەیی و زانایی ماموٚستا و هەژاری و ستەم لێکراوی گەلی کوردا بێنێ.

کاتێ دێتەوە نیشتمان و زێدە خوشەویستەکەی لەبارەی مەلاکانی میسرێ لێی دەپرسن و دەڵێن ئەرێ ئەوان بە رێژە (نسبت)ی تۆ چۆنن؟ ئەویش دەفەرموێ لە میسرێ تەنیا دوو مەلای لێ بوو و بەس، ئەوانی تر هیچیان بۆوەی نابن کە تەمای مەلایەتیت پێ هەبن.

٢- دەڵێن جارێکی کابرایەکی دز ماڵێکی زۆری لە نەختینە و زێڕو زیوەر لە ماڵێ مامۆستا دزیبوو. زۆریان هەوڵ دا تا سۆراخیان کردو زانیان کە کێ دزیویەتی. دزیان گرت و هێنایانە مەیدانێ و تەواوی شتەکانیان پێ هێنانە دەرێ و لە مەیدانێ داینان. خەڵک نەیاندەزانی داخوا مامۆستا چ فەرمانێکی دەردەکا. دەیانگوت رەنگە لانی کەم بە پێی دەستووری قورئانی پیرۆز دەستوور بفەرمێ کە دەستی ببڕن. بەڵام ئەو بەرێزە زۆر لەوەی دڵاوا و دڵۆوانتر بووە کە تۆڵە لەو کەسەی بکاتەوە کە خەراپەی لەگەڵ کردووە. جا هەر بۆیە فەرمووی: رۆڵە ئەوا بەخشیمی و ئەو پووڵ و زێڕانەشم هەموو دایەوە بە خۆت و بە گەردن ئازایی بۆ خۆت بن بەو مەرجە چی دیکە دزییە نەکەیەوە.

٣- دەڵێن جارێک حاجییەک جووتە کەوشێکی لە مەککەی‌ڕا بۆ مامۆستا هێنابوو بە یادگار و پێشکەشی کردبوو. رۆژێکی لە مزگەوتێ کە خەڵکێکی زۆری لێ دەبێ و کەوش دێتنەوە بڕێک بە زەحمەت دەبێ مامۆستا کە هەڵدەستێ بڕوا دەڵێن کەوشی مامۆستای بێنن حاجیش دەڵێ جێم کەن ئەمن کەوشی مامۆستای دەناسم. مامۆستا کە گوێی لەو قسەی دەبێ راناوەستێ کە کەوشەکانی بۆ بێنن یەکسەر بە پێخواسی لێی دەدا و دەڕواتەوە. بەو شێوە نیشان دەدا کە هەم خۆی پیاوێکی بێمنەتە و هەمیش کەسێک کە چاکەیەکی کرد نابێ بە هیچ جۆرێک بە سەر چاوی کابرایدا داتەوە و پیاوەتییەکەی بەبادا.

خـوای گەورەش لەو بـارەوە دەفەرمـوێ: (یـا ایهـا الـذین آمنـوا لاتبطلــوا صــدقاتکم بــالمن و الاذی) ئەی باوەڕدارەکـان چــاکە و خێرەکانتان بە منەت دان و ئازاردانی ئەو کەسە کە چاکەتان لەگەڵا کردووە بەتاڵ مەکەنەوە و بێنرخی مەکەم

٤ــ دەڵـێن مامۆسـتا دەیفەرمـوو سـەرەڕای ئەوە کە بەرژەوەنـدی ئیسلام و پێغەمـبەر( لەوەدا بـوو کە پێغەمـبەرﷺ نەخوێنـدەوار بـێ هەردووکیـان قازانجیـان کـرد کە ئەو هەنتەشـە نەخوێنـدەوار بـوو. چونکە خوێنـدەواری ئەو سـەردەمی عەرەبـان بریتـی بـوو لە بڕێـک ئەفسانە و بەیت و باو و هێندک هۆنراوەی هۆنەرە بێباوەڕەکـان و خۆ ئەوەش شایانی شانی پێغەمبەرﷺ نەبووە.

منیش دەڵێم مامۆستاش و گەلی کوردیش و ئیـسلامی پیـرۆزیش زیانیان کرد کە مامۆستا لەو دەورانیـدا بـوو، چـونکە ئەو ئەوەنـدە لە پـێش خەڵـکەکەوە بـوو کە ئێـستاش تەنـانەت زۆر مـاوە خەڵـک بتـوانن بە تەواوی لە مەبەستەکانی مامۆسـتا حـاڵی بـن و بتـوانن قەبووڵی بیر و باوەڕ و روانگە و راکانی وی بکەن!!
من هیچ گومانم لەوەدا نییە کە پاشی چەند ساڵێکی دیکە کاتێـک کە خەڵک دەگەن بە پـایەیەکی بەرزی زانیـاری و رزگـاری و ئـازادی هەمـوو کەس بـۆی دەردەکەوێ کە مامۆسـتا بەڕاسـتی موسـڵمانێکی راستەقینەی کـوردی ئـازادی خـوازی نەبەز و تێکۆشـەر و دڵـسۆز و راستەقینەوێژ بووە و جگە لە خێـر و خۆشـی خەڵـک و راگەیانـدنی ئیسلامی راستەقینە هیچ شتێکی دیکەی مەبەست نەبووە.

٥ــ دەڵـێن جـارێکی مامۆسـتا لە وتـاری هەینیـدا رووی کـردە خەڵکەکە و فەرمووی برایان ئەوڕۆ لەگەڵ جوولەکەیەک سەودایەکم کردبوو!! لە حـاجیم دابوونێ بە جـوولەکەیەکی بەڵام لە بەدشانـسی

لێم پەشیمان بۆوە و لەگەڵی نەکردم دەنا بێگومان دەستیم لەبنیڕا بڕیبوو!!

ڕەنگە ئەو قسە زۆر کەس خۆشیان لێی نەیەت و تەنانەت تانەش لە مامۆستا بدەن و بڵێن جا چۆن پیاوێکی ئاوا دەبێ قسەی ئاوا بکا؟ بەڵام ئەگەر کەمێک لێی ورد ببینەوە بۆمان دەردەکەوێ کە مامۆستای بەڕێز لەو فەرموودەی خۆیدا چۆن تانە لە موسڵمانان دەدا و بە تووڕەییەوە ئامۆژگارییان دەکا! ئەو دەڵێ باشترین و هەڵبژاردەترینی موسڵمانان حاجییەکانن و ئەوانیش بە داخەوە لە بەر خەراپیان دەبێ دە کەسیان بدەی بە جوولەکەیەک و ئەویش لێت پەشیمان دەبنەوە!!

ساڵێکی من خۆم لە شاری پیرانشارێ فەقێ بوم کابرایەکی ددانسازی لێ بوو بە نێوی "ئەندەڕانیک" منیش ددانم وەژان هات و چوومە لای و بۆی کێشام. ئەو کابرایە خۆی فەلە بوو هەواداری هەنتەشی عیسای بەڕێز. لەوەیڕا وردە وردە خۆم لێ نێزیک کردەوە و لە دڵی خۆمدا دەمگوت پێغەمبەر( فەرموویەتی ئەگەر خودا یەک کەس بە هۆی تۆوە بێنێتە سەر ڕێی ڕەدایە بۆ تۆ چاکترە لە جیهان و لە هەرچی لە جیهاندایە، کەوایە با ئەو کابرایەی ڕێنوێنی بکەم بەڵکە خودای گەورە ئەو شانازییەم پێ ببەخشێ.

بەڵێ زۆر ڕۆژان دەچوومە لای و قسەم بۆ دەکرد و ئامۆژگاریم دەکرد و بانگم دەکرد بۆ ئیسلام و موسڵمان بوون و ئەوەی دەمزانی پێم دەگوت. خوا هەڵناگرێ زۆر چاکی گوێ بۆ رادەگرتم. بەڵام هەموو جارێ وڵامی ئەوەبوو کە موسڵمانەتی ئەگەر وەک فڵان حاجی و فیسار مەلا و ئەم و ئەو بێ بە کەڵک نایەت و هیچ نییە و فەلەییەکەی خۆم زۆر چاکترە و قەت بەوەی ناگۆڕمەوە. خۆ ئەگەر

وەکوو قورئانیش دەڵێ و وەک پیاوانی موسڵمانی راستەقینەی سەرەتای ئیسلام بێ زۆر باشە بەڵام من هەرگیز لە دەستم نایەت.

٦ـ دەڵێن مامۆستا کتێبێکی هەیە بە نێوی (قەل فڕی و قەلەڕەشەی لە جێ) کە بارەی ئەوەیدا دایناوە لە شێخێک دەمرێ و کوڕەکەی یا کەسێکی دیکەی خزمی لە جێی وی دادەنێن.

بەڕاستی ئەوەشی زۆر پڕمانا و توێدارە و گەلێک جوان و بەجێیە. من ئەو کتێبەم نەدیوە، بەڵام لە نێوەکەیڕا دیارە کە نێوەرۆکەکەی خاوەن مەزە و پڕ نێوەرۆک بێ و وێدەچێ بە فێڵ و فووتی شێخە فێڵاوییەکان بۆ ئەوەی کەس دەستی وێی ڕانەگا و فێڵی وانیش ئاشکرا نەبێ لە بەین برابێ، بۆیە لە هیچ جێیەک دەس ناکەوێ. زۆر نێزیکە وەک کتێبەکە ڕێزدار شێخ مارفی نۆدێی کە دژی مەولانا خالیدی نووسیویەتی لە لایەن ئەو دام و دەزگایەوە لەناو برابێ.

هەروەها لەبارەی هەنتەشی مووسادا دەڵێن دەیفەرموو خوا بۆیە لە ماڵی فیرعەوندا بە بەخێو کردنی دا هەتا بەخێرەت بێ و وەکوو جوولەکەکان ترسەنۆک نەبێ و بێگومان ئەگەر لەوێشدا بەخێو نەکرابا و گەورە نەبووبا ئاوا بەخێرەت و نەترس نەدەبوو. هەروەها بۆ ئەوەش بە چاکی لە فێڵ و رامیارییەکانی فیرعەونی حاڵی بێ.

٧ـ دەڵێن جارێکی لەگەڵ یەک دوو کەس لە فەقێکانی خۆی بە نێو ڕەز و باخی خۆیاندا دەگەڕا و کە سەری هەڵێنا دارێک، کە مێوێکی ترێ سپی لە سەر دەبێ و زۆری ترێ پێوە دەبێ، ئەودەم بەو فەقێیانە دەڵێ بڵێن با فەقێکان بەشی خۆیان لەو سپیلکەیە بکەنەوە (سپیلکە: داری ترێ سپی کە لە سەر داری تر بێ).

فەقێکانیش یەکیان دەگەڕێتەوە بۆ حوجرەی و بەوانی دیکە دەڵێ. بەڵێ فەقێ دێن و بە تەواوی میوەکە دەڕنن و هیچی پێوە ناهێڵن. لەو سەری کە مامۆستا لەگەڵ فەقێکەی دیکە دەگەڕێتەوە تەماشا دەکا دارە مێوەکە هیچی پێوە نەماوە. دەڵێ خەتای خۆم بوو ئەگەر گوتبام هەموو بۆخۆتان بێ ئاوایان لێ نەدەکرد.

دەڵێ فەقێیەک چوو لای حاجییەک و گوتی ئەو جستانە لێفەیەکم وێدە بە ئەمانەت، ماڵمان دوورە و هیچ نوێن و پێخەفێکیشم نییە. حاجیش لێفەیەکی زۆر باش و تازەی بۆ برد و وێی دا، تا بەهاری فەقێ لێفەکەی لە کەڵک و کەرەم کرد و بەهاری بە شڕۆڵەیی بۆی بردەوە و گوتی حاجی ماڵت ئاوەدان بێ و خوا خێرت بنووسێ. دەمهەوێ لێرە بڕۆم و ئەوە لێفەکەت.

حاجیش دەڵێ: جا خۆ فەقێ من بۆیەم نەدابوویەی بۆم بێنییەوە ئێستا بۆ هێناوتەوە؟ فەقێش دەڵێ: ئەی ماڵت خەرا نەبێ بۆ ئەو دەمی نەتگوت هەر بۆ خۆت بێ، وەڵلاهی ئاوام لێ نەدەکرد.

٨- مامۆستای کۆیی هەروەک پیاوێکی زۆر زیرەک و وریا بووە و زۆریش قسەزان و تێگەیشتوو و حازر جواب بووە و زۆر بە چاکی توانیویەتی ئەو کەسەی کە لە ئاقاریڕا هاتووە بۆڕی بدات و کڕ و ماتی بکات.

دەگێڕنەوە جارێک "کەفتانکوک" کە سەرلەشکرێکی گەورەی ئینگلیزی بوو لە کاتێکدا کە مامۆستا لە دادگایەک دەبێ دێتە لای و مامۆستاش لەبەری هەڵناستێ. ئەویش زۆری پێ ناخۆش دەبێ و پێی دەڵێ مەلا تۆ بۆچی لەبەر من هەڵناستی؟ مامۆستاش فەرمووی: چونکە لە تۆ گەورەتر لێرەیە کە قورئانە.

کەفتانکوک دەیهەوێ بە جۆرێک ماموٚستا بشکێنێ و بەو جۆرە تۆڵەی لێ بکاتەوە و بە جارێک وردی بکا. جا هەر بۆیە پێی دەڵێ مەلا راستە دەڵێن قورئان تەڕ و وشکی تێدایە؟

ئەویش خێرا دەفەرموێ: بەڵێ ئەوە نییە دەفەرموێ (و لا رطب و لا یابس إلاّ فی کتاب مبین) ئەمجا کەفتانکوک دەڵێ: ماموٚستا پێغەمبەر لە شەوی بەرز بوونەوە (معراج)دا بە کوێدا چوو بۆ ئاسمانان؟ خۆ هیچ ڕێگەیەکی لێ نییە؟

ماموٚستاش دەفەرموێ: هەنتەشی عیسا بە کوێدا چوو هەنتەشی محەمەدیش هەر بەوێدا ڕۆیی.

کەفتانکوک دەڵێ: جا کە دەڵێن هەموو شتێک لە قورئانیدا هەیە، ئێستا کە وا من لێرە ڕاوەستاوم ئەوەشی تێدایە؟

ماموٚستاش دەفەرموێ: بەڵێ ئەوە نییە دەفەرموێ (و ترکوک قائما).

کەفتانکوک دەڵێ: دوو کەس لە جێیەک بن یەکیان نوستوو بێ و یەکیشیان بێدار بێ، من سڵاو لە کامیان بکەم؟

ماموٚستا دەفەرموێ: لەوی نوستووە، چونکە بێدارەکە نیگەهبانی نوستووەکەیە و لە یاسای سوپاییشدا نیگەهبان نابێ قسە لەگەڵ هیچ کەس بکا جگە لە ئیست دان و ڕاگرتن.

ئەمجا کەفتانکوک دەڵێ: مەلا لەوڕۆ بەولاوە هەر کارێکت بە من بێ لە خزمەتت دام.

ماموٚستاش دەڵێ: هیچ کارێکم بە تۆ نابێ.

دەڵێن جارێکی یەکێک لە زانایانی سروشتی هاوچەرخی مەلای گەورە هاتە لای ماموٚستا بۆ باس و وتوویژو باسێکی زۆریان کرد و کابرا لە هەموو باسەکانیدا بۆڕی دەخوارد و ناچار بە تەسلیم

دەبوو و هیچی پێ نەما و ناچار هاتە سەر ئەوە، کە گوتی: جەنابی مامۆستا قورئان زۆر کێتێبێکی بەرزو بەهێز و جوانە، بەڵام نەنگێکی گەورەی هەیە، کە ناکرێ چاوی لێ بقووچێنرێت و ئەویش ئەوەیە، کە هیچ نەزم و تەرتیبێکی نییە و هەروا شتێکی تێکەڵ پێکەڵ و بێڕێسایە!!

مامۆستاش لە وەڵاما دەفەرموێ: بەڵێ بەڵێ لە پێشتریشدا زۆر کەس ئەو شەکرانەی شکاندووە و ئەو فەرمایشتانەی فەرمووە. بەڵام مەگەر ئێوە نازانن، کە نەزم و تەرتیب و ڕێسامەندی تایبەتی شتە وەدیهاتووەکانە (حادثات)؟ و هەرگیز لەگەڵ شتی کۆن (قدیم)دا بۆز ناخوات.

٩ـ جارێک مامۆستا لە حوجرەی وانەوێژییەکی خۆیدا خەریکی وانە گوتنەوە دەبێ و فەقێکان دەورەی لێ دەدەن. لەو کاتەدا کابرایەکی عەرەبی ڕووتەڵەی نەناسراو دێتە ژوورێ، کە هەر دەتگوت بە شێوەیەکی تایبەتی و بۆ مەبەستێکی تایبەتی خۆی گۆڕیبو و وەک ئەوەی دەچوو، کە بیهەوێ هیچ کەس نەیناسێ و بە مەبەستی خۆشی کە هەر دەتگوت تاقی کردنەوەی مەلای گەورە بووە بکات.

جا لەو کاتەدا مامۆستا، کە سەرگەرمی وانە گوتن و شی کردنەوەی وانەی فەقێیان دەبێ، هەر دەسبەجێ ڕاڤە و ڕوون کردنەوەکانی لە کوردییەوە دەگۆڕێ و دەیکاتە عەرەبی و مەبەستەکانی بە زمانی عەرەبی لە سەر وانەکە هەڵدەڕێژێ و دەڵێ خۆزگە هەر ئێستا مەلای تەنتاوی لێرەبایە تا لە وانە گوتن و ڕاڤەو ڕوون کردنەوەکانی من کەڵکی وەرگرتبایە و بۆ خۆی گەلێک شتم لێ فێر بایە.

**پاشـــان دوای تەواو بـــوونی وانەکە و رۆیـــشتنی عەرەبە رووتە فەقێکان لێی دەپرسن کە ئەورۆ بۆچی لە نێوەڕاستی وانەکەدا راڤەو روون کردنەوەکەت کرد بە عەرەبی؟**

**ئەویش دەفەرمـوێ: لەو کـاتەدا بە دڵمـدا هـات، کە ئەو کـابرایە مەلای تەنتاوییە و بۆ تاقیکاری و لـێ حـاڵی بـوونی مـن هـاتووە و ئیتر منیش هەر بۆیە ئەو قسەم پێ گوت.**

**جا دەڵێن جەنابی تەنتاویش ئەو مەبەستەی لە بیرەوەرییەکـانی خۆیدا نووسیوە و تۆماری کردووە، بەڵام من نەمدیوە.**

**١٠ـ دەڵێن جارێکی لاوێکی کوڕی دیمەن کچـانەی لاو و لووسیکەر ئەو تـاکە هۆنراوەی خۆی بۆ دەخوێنێتەوە کە دەڵێ:**

بە ڕیـــشی پـــان و پرچـــی پـــڕ لە ئەســـپێ
بنـــاخەی کـــاری کـــوردان چـــۆن دەچەســـپێ؟

**کە مەبەستی تانە و تەشەردان لە مامۆستا دەبـێ. ئەویـش خێرا رووی تێدەکا و دەفەرموێ:**

بە کـــــولمی ســـــوور و پرچـــــی ژنـــــانە
تـــــۆ رزگـــــار دەکەی ئەو کوردســـــتانە؟

# ژیانی پڕ لە ژانی مامۆستا

بەهەشتی مەلای کۆیی لە ساڵی ١٢٩٣ کوچی مانگیدا هاتۆتە جیهان و لەو شارە جوانکیلانەی کۆیە بۆ یەکەم جار دیمەنی دڵرفێنی خاکی پاکی کوردستانی بە چاوە بێدار و خەو لێنەکەوتووەکانی خۆی دیتووە و هەوای زور خۆشی ئەو هەرێمەی هەڵمژیوە و بە گیان و ژیری و هەست و ویژدانی خۆی ژیانی ژاناوی هاوڕەگەزەکانی خۆی دیتووە و هەستی پێ کردووە. ئەگەرچی ژیواری خۆی و بنەماڵەی خۆی تا ئەندازەیەک لە ژیواری نالەباری خەڵکی کوردەواری باشتر بووە بەڵام بۆ حاڵی تاڵی کۆمەڵی کوردەواری وەک شەم سووتاوە و وەک مەنجەڵ کوڵیوە و وەک بوڵبوڵ خوێندوویەتی. هەناسەی بۆسۆداری پڕ لە بڵێسەی هەڵکێشاوە و ئاوری خەفەت و خەم و پەژارە لە دەروونیدا ئایساوە.

ئیتر گیوی موکریانی گوتەنی: ئەو زانا گەورە و بلیمەت و هەڵکەوتووە بە مێشکێکی رووناک و گیانێکی پاک و ئازادی پەرەستانەوە کەوتە ناو کۆمەڵێکی نەخوێندەوارو دیل و ژێردەست و رێ لێگۆڕاو. کۆمەڵێکی خۆخۆری بێگانە پەرەستی حەفتا رەنگ. کۆمەڵێکی کە لە ترسی جرجاڵی دەلەرزی و بە ئومێدی هاتنە خواری عیسا و دەرکەوتنی مەهدی دەگەشایەوە و دەستی بۆ هیچ کار و پیشەیەکی نەدەچوو. کۆمەڵێکی کە پشتی لە مەلا و مزگەوتی خودا و رووی لە شێخ و شەیتان و تەکیە و خانەقا کردبوو.

ئەویش بەو هەموو زانیاری و ئەوینداری و خودا پەرستییەوە لە بەرامبەر ئەو هەموو کارەساتە بێجێیانە خۆی پێ رانەگیرا و

نەیتوانی چاویان لێ بپۆشێ و قۆڵی مەردانەی لێ هەڵماڵین و بە پێچەوانەی هەموو جۆرە ناکۆکی و ناڕێکی و ناڕەوایی و لەگەڵ هەبوونی ئەو هەموو کۆلکە مەلا و گەندەڵە شێخ و لەتکە خەلیفە ش بە بێ کۆڵ دان راوەستا و بەربەرەکانی کردن.

هەروەها مامۆستا گیو سەبارەت بەو کەڵە پیاوە دەنووسێ و دەفەرموێ: (زانای دڵسۆز و نەبەز بە بێگومان لە هەستی پاکی حاجی قادری برادەری باوکی بەهرەوەر بووە بەڵام تا ساڵی ١٩٢٣ بە کردەوە و وتوویژ تەنها خەریکی بەربەرەکانێتی شێخ و تەکیە و خانەقا و کۆڵکە مەلایان بووە چونکە زۆر رقی لەوانە بووە کە ئایینی دەشێوێنن و لە پەنای ئایینی پاکی ئیسلامدا کارانی بێجێ و ناڕەوا دەکەن و هەژاران دەرووتێننەوە، بەو هۆیە و چەند هۆیەکی ترەوە زۆر نەپرژابووە سەر ئەوەی کە ئاوڕێکی تەواو لە نیشتمانە دابەش کراوەکەی خۆی بداتەوە)

بابا مەردۆخی رۆحانی "شیوا" لە بەرگی ٢، تاریخ مشاهیر کرد، لاپەڕەکانی ٢٥٧ و ٢٥٨ کە باسی مامۆستا دەکا دەڵێ ئەو لە ساڵی ١٢٩٧ کۆچی مانگیدا لە دایک بووە) و بەو پێیەش چوار ساڵ لە تەمەنی پڕبایەخی مامۆستا کەم دەکاتەوە.

بەهەر حاڵ ئەو پیاوە بەڕێز و زیرەکە لە ژێر میهر و دڵسوزی باوکی بەڕێزی حاجی مەلا عەبدوڵلادا پێگەیی و لە ماوەیەکی کەمدا توانی ئیجازەی مەلایەتی وەربگرێ. ئەوەندە فەقێیەکی زرینگ و ئازا و تێکۆشەربوو کە بەو کەم تەمەنییەش فەقێکانی ئاواڵ و هاوپۆلی خۆی بەجێ هێشت و وە پێش هەموویان کەوتەوە و ئەو رێگەی کە فەقێکان بە دە دوازدە ساڵ دەیبڕن بە شەش حەوت ساڵ بڕی. زۆر زوو بوو بە مەلایەکی بلیمەت و زانایەکی زۆرزان و

ڕامیارێکی ڕاماو و هۆشیارێکی داماو و دڵسۆزێکی خەمخۆری کورد و کوردستان و ئایینی پیرۆی ئیسلام.

مامۆستا مەلای عەبدوڵڵای بابی، ئەوی لە جێی خۆی دانا و هەموو کارەکانی مەلایەتی و مزگەوت و فێرگەی حەواڵە بەوی کردن. ئەویش لێهاتووییەکی وەهای لە خۆی نیشان دا، لەو چاخی مێرمنداڵیدا بوو بە یەکەم وانەوێژی گەورە و لێهاتوو و پێشنوێژی هەینی شاری کۆیە.

لە ساڵی ١٣٢٦ کۆچی، کە باوکی کۆچی دوایی کرد بە هۆی لێوەشاوەیی خۆی هێندەی دیکەش گەورە بوو کردیان بە سەرۆکی زانایان (رئیس العلما) و هەروەها ساڵی ١٣٣٩ کۆچی بوو بەقازی و پێشەوای شاری کۆیە و هەموو مەلاکانی شار ڕێزیان بۆ دادەنا و دەستووریان لێ وەردەگرت و فەرمانیان ئەنجام دەدا.

لەوەش بە پێشەوە لە ساڵی ١٩١٢ زایینیدا بە ڕوو لێنانێکی زۆری دەوڵەت بوو بە مفتی شاری کۆیە و لە ساڵی ١٩٢٤ زایینیدا بوو بە ئەندامی جڤاتی دامەزراندنی عێراق (مجلس التأسیس العراقی) و لەو کاتەدا کە پلە و پایەیەکی جیهانیشی دەسکەوت وەک زۆر لە پیاوە سپلە و بێئەمەکان، گەل و نیشتمانە دواکەوتووەکەی خۆی لە بیر نەچۆوە و فەرامۆشی نەکرد و ئەوپەڕی هەوڵ و تەقەلای بۆ خزمەت و ڕاژەی زێد و هاوڕەگەزەکانی خۆی دا و هەرچەندی بۆی لوا خزمەتی کرد ـ خوای گەورە پاداشی باشی بداتەوە ـ.

لە دوای ئەوەش چەند جاران بە نوێنەری کۆڕی عێراقی هەڵبژێردرا و لە ساڵی ١٩٢٨ز. واتا ١٣٤٧ک. وازی لە تەواوی کاروباری دەوڵەتی هێنا و دەستی لە هەموو پیشەیەکی ڕەسمی

کێــشاوەتەوە و بایداوەتەوەســـەر وانەوێـــژی و مەلایەتـــی و نووسینەکەی پێشووی خۆی دەس پێ کردۆتەوە.

مامۆستای بەڕێزمان هەوڵ و ئاخیری تەمەنـی پڕبـایەخی خـۆی بە مەلایەتی، واتا پیرۆزترین پیشەی جیهانەوە رابـوارد. بە هەمـوو توانـای خـۆی تێکۆشـاوە بـۆ ئەوەی، کە مەلاکـان بەتـایبەتی و گەلەکەی خۆی بە گشتی لە رەزیلی و زەبـوونی و بەدبەختـی رزگـار بکـات و لە زەلکـاوی نەزانـــی و دواکەوتـوویی دەریـانبهێنێ. تــا ســەرەنجام ئەویــش وەک هەزاران هەزار خەمخـۆری دیـکەی گەلــی لێقەوماوی کورد سەری ناهومێدی ناوەتەوە و ئەو هەمـوو ئـاوات و ئامانجە بەرزانەی بردۆتە بن گڵـی و لە یەکەمـی خەزەڵـوەری ١٣٦٢ ک و ١٩٤٣ز چـاوە زیـت و وریاکـانی لە ســەر یەک دانـاون و بە داخەوە هەڵینەهێناونەوە و ئیتر ئەو ئەستێرە پڕشنگدارەی ئاسمانی هیوای ئایینی پیرۆزی ئیسلام و کورد و کوردستان بە یەکجاری ئاوا بووە.

بەڵام ئەگەرچی ئەو خۆی رۆییشت و وڵاتی کوردەواری بە رواڵەت بەجـێ هێـشتووە و مـالاوایی لە زێـد و گەل و ئامـانجە بەرزەکـانی کــردوە بەڵام نێــو و نێوبــانگی بەرز و پیــرۆزی و شــوێنەوار و پاشــەوارە بەنــرخ و بایەخــدارەکانی بە درێژایــی تەمەنــی کـوردی موسڵمان دەمێننەوە.

بێگومان هەتا کوردێک لە کوردستان بمێنێ و ئایینی پیـرۆزی لە وڵاتـی کوردەواریـدا پـایەدار بـێ، پەنـد و ئامۆژگـاری و نووسـراوە بەنـــرخ و یادگـــارە جوانەکـــانی لە دوای خـــۆی هەر یەکەی ئەســتێرەیەکی تیــشکەپڕژێن و چرایەکـی هەڵگیرسـاوە و لە زێـد و نیـشتمانەدا و ئیتـر تـا کوردێـک لە دنیـادا مـابێ جێـی خـۆیەتی کە نێوبانگی مامۆستای کۆیی بەرز و بەرزتر رادەگرێ و یـادی دەکـا و

لە هەموو نزا و پاڕانەوەیەکی خێر بێبەشی ناکات و گرینگتر لە هەموو شت تێدەکۆشێ بۆ بڵاو کردنەوەی نووسراوەکانی.

جا هەر بۆیە من بە دڵێکی بریندار و سۆزێکی زۆری دەروونەوە و بە پەرۆشی و پەژارەی زۆرەوە ڕووی تێدەکەم و گیانی پاکی ئەو ئەدوێنم و دەڵێم:

## بۆ مەلای کویی

ئەی ئەســــــتێرەی پرشـــــــگندار
ئەی کــــــوردی خۆشـــــی نەدیـــــو
زیـــــن تـــــاڵ و تــــــووش و دژوار
ئەی دڵـــــــسۆزی کوردســــــــتان
گەلێکـــــــــت زەحـــــــمەت کێـــــشا
زۆر زۆرت چاشـــــــــــــــت پەژارە
ڕابەرێکـــــــی ڕێـــــزان بــــــووی
ئیــــــــــــسلامناسی ئەو دەورە
دژی پرووپـــــــــووچ پەرســــــــتی
بە گـــــــش هێـــــز و توانینـــــت
زۆر تێکۆشــــــــــــــــای مەردانە
بەڵام حەیـــــــــــف ماموّســــــــتا
نەیـــــــانزانی کە تـــــــۆ کێـــــی
تـــــــــۆ کە ڕۆژی وڵاتـــــــــی
تـــــــۆ هەیاســـــی دورناســـــی
ســـــەد خـــــۆزگە ئێـــــستا هەبـــــای
تـــــۆ مەردی تێکۆشــــــەر بــــــووی

نەیاری زۆرداران بووی
دژی ملهوڕ و بەدکار
بە هۆشیاری و ئازایی
کێ بە قەد تۆ ئازا بوو
کێ وەکوو تۆ بوو بە کار
لەم زێد و نیشتمانە
لەنێو هەموو کوردانـدا
هەبان چەند مەردی وەک تۆ
گەلی بی‌دەرفەت و هەل
دەیگرت ڕێگەی خەباتی
هەرچەندە یەک دنیا بووی
تۆ مەردی تێکۆشەر بووی
بۆیە بە داخە دڵم
تۆ بەو هەموو ئاواتە
وا بە ناکامی مردی
وا منیش لەسەر ڕێی تۆم
ئەی مامۆستای بەڕێزم
دڵسۆزی کوردەواری
گورزی پەیڕەوی تۆیە
گەلی ئێمە هەزارە
کاریشی بۆ نەکراوە
پێویستی بە رابەرە
بۆ ئەوەی گەل سەرکەوێ
زۆریش کەمن ئی وەک تۆ

ئەی مەلای دڵ بریندار
لە ناو بەدبەختییا ژیو
نەساوە و ماندوو و پڕکار
پێشەوای دڵ بەهەستان
گیان و مێشک و دڵت ئێشا
بۆ ئەو کوردە هەژارە
دڵسۆزێکی کوردان بووی
تۆ بووی مامۆستای گەورە
دژی نارەوا و پەستی
بە هەست و بە زانینت
پیاوانە هەم کوردانە
کورد نەیناسی تا ئێستا
لە سەر کام ڕێباز و ڕێی
ئەی داخەکەم زوو هاتی
ئەودەم تۆیان نەناسی
کوردگەل یارمەتی دەدای
لە سەر ڕێی پێغەمبەر بووی
ڕێنوێنی هەژاران بووی
ستەمکاری بە ئازار
کردت خەباتی خوایی
کێ وەک تۆ بێپەروا بوو؟
کێ بە قەد تۆ بوو هۆشیار؟
لە گش ئەو کوردستانە
لە ئەم بەشەی جیهاندا

کوردگەل دەبوون سەربەخۆ
سەردەکەوت لە سەر کەل
دەشگەییشت بە ئاواتی
ئەی داخەکەم تەنیا بووی
کوردی پاک و رابەر بووی
وەک مەنجەڵی دەکوڵم
بۆ ئەم گەل و وڵاتە
بەختت یاری نەکردی
هەروەکوو تۆ رەنجەڕۆم
مەلای بەتوانا و هێزم
ژیای بە ژینی هەژاری
وەکوو تۆ دڵ بە سۆیە
زۆر ئاتاجی بە کارە
چی پێویستە هەر ماوە
بە زانست و هونەرە
چەند مەردێ وەک تۆی دەوێ
بۆیە دڵم هاتۆتە سۆ

# وتوویژ لەگەڵ یەکێک لە فەقێکانی مامۆستا

زۆرم هەوڵ دا، کە بچمە خزمەت چەند کەس لە فەقێکانی مامۆستای و بە درێژی قسەیان سەبارەت بەو کەڵە پیاوە کوردە لێ پرسم و وتوویژیان لەگەڵ کەم. بەڵام بە داخەوە بۆم نەلوا و سەرکەوتوو نەبووم و تەنیا توانیم بە خزمەت یەکێک لە فەقێ بەڕێزەکانی وی بگەم و وتوویژی لەگەڵ بکەم. بەڵام ئەویش بە داخەوە لەبەر پیری و نەخۆشی حەوسەلەی زۆر نەمابوو منیش نەمویست زۆری زەحمەت بدەم.

بەڕێز مامۆستا مەلا محەممەدی بارزانی دانیشتووی شاری شنۆ کاتێ کە بە تەلەفون عەرزم کرد کە دەمهەوێ بێمە خزمەتتان و سەبارەت بە مامۆستای کۆیی پرسیارگەلێکت لێ بکەم و زانیاری پێویستمان پێ بدەی و وەڵاممان بدەیەوە، فەرمووی: زۆرم پێ خوشە و هەرچی بیزانم پێت دەڵێم. بەڵام مامۆستا بارزانی بەڕێز لە بەر ئەوەی کە زۆر لە چاخی فەقێیەتییەکەی لە خزمەت مامۆستا کۆیی دوور کەوتبۆوە و پتر لە ٨٠ ساڵ دەبوو کە لە خزمەتی نەمابوو، هەروەها هیچ کاتێکیش چاوەڕوانی ئەوە نەببوو کە کەسێک ئاوا بێت و لەبارەی مامۆستایەکی خۆیدا لێی بپرسێ زۆر شتی لە بیر نەمابوو.

بەهەر حاڵ مامۆستا مەلا محەممەدی بارزانی پیاوێکی زۆر پیرۆز و مەلایەکی کوردی زۆر موسڵمان و خاوەن باوەڕە و ئیتر ئەوەش وتوویژێکی کە لە گەڵ ئەو بەڕێزەدا کردوومە. ئەوەش بڵێین ئەو مامۆستایە کە ئێستا لە شاری شنۆیە دەژی تەمەنی لە نێزیکەی نەوەد ساڵیدایە و ئەگەرچی زۆر بێهێز و چیلازە بەڵام زۆر پاک و خاوێن و سەری حاڵە.

* مامۆستا ئایا بەڕێزتان لە خزمەت مامۆستای کۆییتان خوێندووە؟

بەڵێ لە خزمەتیم خوێندووە و فەقێی وی بووم.

*پرسیار: مامۆستای بەڕێز چەند جاران لە دەورانی فەقێیەتی خۆتاندا لە خزمت ئەو زانا گەورەی کورد بوون؟

وەڵام: من لە دەورانی فەقێیەتی خۆمدا دوو جاران لە حوجرەی ئەو بەڕێزەدا بووم، جارێکی بە سوختایەتی و جارێکیش بە موستەعیدایەتی.

* پرسیار: ئەو کاتی بە سوختایەتی چیت دەخوێند و لە خزمەت چ کەسێکی لە موستەعیدەکانی مامۆستات دەخوێند؟

وەڵام: ئەودەم کە سوختە بووم لە خزمەت مامۆستا مەلا عومەری ئاکرەیی و کتێبی قاضی لاری منطقم دەخوێند، مامۆستا مەلا عومەریش کتێبی رسالة الحسابی دەخوێند و زۆریشی هەوڵ دا کە عیلمی هەیئەت بخوێنێ بەڵام نازانم بۆچی مامۆستا پێی نەدەگوت.

* پرسیار: مامۆستا بەڕێزتان لەگەڵ چەند فەقێی دیکە لە حوجرەی مامۆستا کۆییدا بوون و مامۆستا بەتێکڕا چەند فەقێی هەبوون؟

وەڵام: مامۆستا خۆی ئەودەم پتر لەبیست فەقێی خۆی هەبوون و بێجگە لە فەقێکانی خۆشی چەن فەقێی مەلا بەهادینیشی کە تازە وەفاتی کربوو دەهاتنە خزمەتی و وانەیان دەخوێند و مامۆستا بە هەموویان رادەگەیی.

* پرسیار: شێوەی دەرس گوتنی مامۆستا چۆن بوو؟

وەڵام: مامۆستا لەو ماوەدا کە من لەوێ بووم ماوەیەکی زۆر کەم دەرسی تەک دەفەرموو بەڵام لە دواییدا کردی بە حەڵقە

چونکە فەقێکان ئەوەندە زۆر بوون کە نەدەکرا هەر کەسە بۆخۆی وانەیەکی بخوێنێ و ئیتر کەلاسی مامۆستا هەمیە ژمارەیەکی زۆری فەقێ تێدا بوون و دەتگوت ئامانجێکی زۆر بەرز و بڵیندی هەیە و خۆی بۆ دەکوتێ.

* گورژی: ئایا مامۆستا چ کتێبێکی زۆرتر دەگوتەوە؟

وەڵام: زۆرتر هەر کتێبەکانی سەرەوەی دەگوتەوە و ئەوانەی کەوا لە نێو فەقێیاندا لە ئاخرماندا دەخوێندرێن و فەقێکان زۆرتر بۆوەی دەهاتن لە خزمەتی دەورەیەکی ئامادەیی ببینن و دوا پلەی خوێندنیان تێپەڕ بکەن.

* گورژی: ئایا هەروەک مەلای دیکە وێژامەی کتێبی دەخوێندەوەو دوایی وشە بە وشە مانای لێدەداوە؟ یان جۆری وانە گوتنی وی تایبەت بە خۆی بوو؟

وەڵام: نەخێر، وەک مەلای دیکە وانەی نەدەفەرموو بەڵکە کاتێک دەهاتە سەر دەرسێ لەبەرخۆیەوە وێژامەی کتێبەکەی دەخوێندەوەو زۆر بە گورجی چاوێکی ڕێ دەخشاند و لە بن لێوان بۆ خۆی دەیخوێندنەوە و پاشان سەری هەڵدێنا و دەستی دەکرد بە وتارو کاکڵی مەبەستەکەی بۆ شاگردەکانی بە درێژی باس دەکرد. ئیتر قەت گوێی بە وێژامە و مێژامە نەدەدا. هەر شتێکی باسی لێ کردبایە لە پێشدا باسی دەکرد و بیروڕای زانایانی لەسەر دەگوت و بە جوانی شی دەکردەوە و توێنەوەیەکی باشی لەسەر ئەنجام دەدا و ئەمجا ئەگەر پێویست بایە بیروڕای خۆشی لەسەر دەردەبڕی و دەیفەرمووو منیش بیروڕام ئاوایە.

* گورژی: مام ۆستای بەڕێز مەلای کۆیی خوا لێی ڕ ازی بێ، چۆنی فەقێکان بەخێو دەکرد؟

وەڵام: مامۆستای کۆیی ئەو هەموو فەقێیانەی هەر لە سەرئەرکی خۆی و بە ماڵی خۆی بەخێو دەکرد، بەڵام ئەگەر کەسێک یارمەتی دابایین مامۆستا بەرگری نەدەکرد و خوا هەڵناگرێ خەڵکی شاری کۆیەش زۆریان یارمەتی دەدایین. خودی بنەماڵەی مامۆستاش مەوقووفەی تایبەتی فەقێیانیان زۆر هەبوو ئەو مەوقووفانە جگەلە فەقێیان هیچ کەس مافی کەڵک لێ وەرگرتنیان نەبوو.

* گورژی: دەکرێ نێوی چەند کەس لە فەقێکانی مامۆستامان پێ بڵێی و بشفەرمووی کە زۆرتر چ جۆرەی فەقێیەکی رادەگرت؟

وەڵام: هێندێک لە وانەی کە لە بیرم ماون خۆم و مەلا ساڵحی پەسوێ و مەلا ئەبووبەکر و مەلا قاسم و مەلا محەمەدئەمین و مەلا تاهیرو مەلا مەعسووم ئەو فەقێیانەی کە دەهاتنە خزمەت مامۆستا زۆرتر کەسانێک بوون کە لە کۆتایی خوێندندا بوون یان تەنانەت دوای مەلایەتیش دەهاتنەوە و ماوەیەک لە لایان دەخوێند بۆ نموونە مەلا ساڵح ناوێک کە هەر ئەوەندەم لەبیرە دوای چەند ساڵێک تەدریس (وانە وتنەوە) فەقێ و فێرگەی بەجێ هێشتبوون و هاتبۆوە بۆ خوێندن و ماوەیەکی زۆری لە خزمەت مامۆستادا دەستی کردەوە بە خوێندن.

* گورژی: قوربان مامۆستا بێجگە لە شاری کۆیە لە چ جێیەکی دیکەش خزمەتی خۆی ئەنجام داوە،

وەڵام: من نەمزانیوە کە لە هیچ جێیەکی دیکە بووبێ و ئەوەندەی من دەزانم هەر لە کۆیە لانکە و بنکەی و قەڵاتی باب و باپیرانی خۆو هەر لە جێی وان و لە سەنگەری واندا ژیاوە و ئەرکی پڕ لە شانازی خۆی ئەنجام داوە و بە داکۆکی خەریک بووە.

* گورزی: ئایا مامۆستاش هەروەک هەموو مەلایەکی کوردستان بە بەرات و زەکات و بە بەدبەختی ژیاوە یان خۆی خاوەن ملک و ماڵ و سامان بووە؟

وەڵام: بنەماڵەی جەلیزادەکان لە کۆیەدا یەکجار زۆر دەوڵەمەندو ساماندار بوون و مامۆستاش خۆی زور دەوڵەمەند بوو و ماڵ و مڵکێکی زۆریان هەبوو بەتایبەتی گوندێکیان هەبوو بە نێوی پێبازوک و لە چنارۆکیش باخ و رەزی زۆریان هەبوو و داهات و دەرامەتی هەموویانی بۆ دەهاتەوە.

* گورژی: قوربان پلە و پایەکانی میریی مامۆستا چۆن بوون؟ چ بەرپرسییەکی هەبوو؟

وەڵام: راستی ئەمن زۆرم ئاگا لەوەی نییە و هەر هێندە دەزانم کە ئەو بەڕێزە لە پێشدا قازی کۆیە بووە و دوایە وازی هێناوە بەڵام برایەکی بە نێوی شێخ نووری هەبوو کە موعەلیم و وانەوێژ بوو لە کاری دەوڵەتیدا واتا فێر کردن و بارهێنان کاری دەکرد.

* گورژی: مامۆستا لە بەغدایە نوێنەری گەلی کورد لە چ کۆڕێکدا بووە؟

وەڵام: نازانم و لەو بارەوە هیچ ئاگاداریم نییە.

* گورژی: لە دەورانی نوێنەرایەتی مامۆستادا چ خاڵێکی بەرچاوت لەبیرە؟

وەڵام: بە داخەوە لەو بارەوە هیچ نازانم.

* گورژی: مامۆستای بەڕێز چ قسە و یان کردەوەیەکی خۆش و جوانی مامۆستات لە بیرە؟ بۆمان باس بکە.

وەڵام: جارێک مامۆستا دەیفەرموو کابرای نەزان (جاهل)زەڕ و

زیانی تەنانەت بۆ دار و بەرد و شتی بێگیانیش هەیە لەو دەمەدا کابرایەکی نەزان لەوێ بوو و لە داخان مستێکی لە پەنجەرەکە راکێشا و شکاندی. مامۆستاش فەرمووی هەر ئەوە خۆی بەڵگەیەکی گەورەیە.

جارێکیش قازییەک لێی دەپرسێ و دەڵێ سولح چەند جۆری هەیە؟ ئەویش خێرا دەفەرموێ سێ: الصلح عن اقرار و عن انکار و عن... بێدەنگە دەکا و چی تر ناڵێ. قازیش دەڵێ قوربان بۆ ئەوی دیت نەفەرموو ئاخر ناڵێی سێ جۆرە. مەلایەکیش لەوێ دەبێ و دەڵێ چۆن ئەوە نییە فەرموویەتی بێدەنگە کردنەکەی بە مانای گوتنە چونکە ئەوی دیکەش عن سکوت.

* گورژی: قوربان مامۆستا پیانێکی خۆ بە کەم زان و خاکی بوو یان بمکەر و خۆ بە زۆرگر و بەفیز بوو؟

وەڵام: ئەو بەڕێزە جاری وا بوو ئەوەندەی خۆ بە کەم دەگرت کە دەیگوت جا تۆ خوا هەڵپچڕاوێکی وەک من چییە و بۆ چی دەبێ؟ و تەنانەت خۆی بە کەمتر لە هەر کەسێک دەزانی. بەڵام جاری واش بوو کە خۆی ئەوەندە پێ گەورە بوو کە دەیگوت من بەو هەموو عەزەمەتەوە ؟ بەڵام هیچ کەس نەیدەتوانی لە بەرابەر ویدا خۆی پێ زۆر بێ و هەر کەس خۆی بە زل زانیبایە بە چاوێکی کەم و سووکی چاو لێ دەکرد.

* گورژی: قوربان مامۆستا سەبارەت بە دەوڵەتی عوسمانی چ جۆرە بیرورِا و بۆچوونێکی هەبوو؟

وەڵام: هیچ لەو بارەوە نازانم.

* گورژی: چەند کەس لە ئاواڵان و دۆستانی کوردستانی مەلای کۆییمان بۆ نێو ببە.

وەڵام: راستی کەسم لە بیر نەماوە، بەڵام ئەوەندە دەزانم کە خەڵکی کورد بە تێکڕا خۆشیان دەویست و لەگەڵ مەلا گچکەی هەولێریش دۆستایەتی زۆر خۆش بوو.

* گورژی: مامۆستای بەڕێز سەبارەت بە باوکی مامۆستای کۆیی چ دەزانی؟

وەڵام: باوکی مامۆستای کۆیی پیاوێکی زۆۆ ئازا و زانا و خاون بیروڕای راست و رێکەوتووانە بووە. بۆ نموونە مامۆستا مەلا محەمەد جارێکی لە خزمەت باوکی دەرسی المختصری دەخوێنێ و دوای باس و وتار هەڵڕشتنێکی زۆر مامۆستا مەلا محەمەد عەرزی باوکی دەکا ئاخر بابە ئەو خۆ مەلا سەعد وا ناڵێ؟

ئەویش دەفەرموێ: ئاخر ئەمن وا دەڵێم و خۆ منیش ئەگەر بەدبەختی نەبێ لەوی کەمتر نیم، بەڵام ئەو فارس بووە و منیش کوردم؟

* گورژی: مامۆستای کۆیی بە چ هۆیەک لەگەڵ شێخ مەحموودی نەمردا هاوکاری رامیاری نەکردووە و ئەگەرچی زۆریشی خۆش ویستووە و زۆر جاریش لە رووی ئینگلیزەکاندا داکۆکی لێ کردووە؟

وەڵام: باوەڕ کە لەو بارەوە هیچ نازانم و ئاگادارییەکم نییە.

* گورژی: قوربان مامۆستا سەبارەت بە مەلاکانی دیکە چۆن بوو، بیروڕای لە گەڵیان چ چۆرێک بوو؟

وەڵام: مامۆستا مەلا زاناکانی زۆر خۆش دەویست و بەتایبەتی ئەوانەی کە سەبارەت بە دین موخلیس بوون و هەوڵی دەدا کە فەقێکان بچنە لایان و لە خزمەتیان بخوێنن بۆ نموونە چارێکی لە فەقێکان تووڕە دەبێ و دەفەرموێ ئەوە جییە هەرچی راست بۆوە دێتە لای مەلا محەمەدی کۆیی؟ بۆ مەگەر هەرچی لە لای محەمەدی

کۆیی بخوێنێ دەبێتە محەمەدی کۆیی؟ دە بڕۆن لە لای مەلاکانی دیش بخوێنن و با ئەوانیش تەدریسیان هەبێ و ئەگەر تەدریسیان هەبێ ئەوانیش زۆریان دەبنە محەمەدی کۆیی.

* گورڕی: ئایا مامۆستا لە شێوەی نووسینی کتێبە کۆنەکان قایل بووە یان نا؟

وەڵام: نەخێر لە زۆران زۆر نەقایل بووە بۆ نموونە رۆژێکی هەر لە بن لێوان وێژامە (عبارت)ی خوێندەوە و هیچی نەگوت و لە دواییدا سەری هەڵبڕی و فەرمووی ئەوەی ئەو دەیڵێ بۆخۆی دەڵێ و ئەوەش کە لە هەمبانەی مندایە سبەینێ پێتان دەڵێم.

هەروەها زۆر لە کتێبی (جمع الجوامع) ناڕازی بوو هەربۆیەش کتێبی (المصقول فی علم الاصولی)ی خۆی لە بەرابەر ویدا داناوە.

* گورڕی: قوربان مامۆستای کۆیی چ جۆرە پیاوێک بوو؟ لەبارەی بیچم وقەڵافەتەوەم مەبەستە.

وەڵام: پیاوێکی گەورە و بە قەڵافەت و یەکجار زۆر بەسام بوو مرۆڤێکی چاو و برۆ رەش و سمێڵ پان و ریش پڕ و کۆڕپە و نێوچاوان پان و موو بەهێز بوو.

* گورڕی: مامۆستا گیان ئایا هیچت لە باس و گفتوگۆیەکانت لەگەڵ مامۆستادا لە بیر ماوە؟ بۆمان باس بکەی؟

وەڵام: بەڵێ ئەوەم لە بیرە کە مامۆستا رۆژێکی هاتە سەر دەرسێ و پاش قسە و باسێک و پاش ئەوە کە بۆی باسی ساز کرانی مرۆڤ کردین فەرمووی ئەوە نییە خوا خۆی دەفەرمویَ: (خلقکم من تراب) کە ئەوە ئاماژە (اشارە)یە بەو کە دروست کردن بە بێ سفن (مادە) نابێ.

منیش گوتم ئاخر ئەوە نییە دەشفەرمێ: (ان الله خلق سبع سموات و من الارض مثلهن) ئەویش فەرمووی لە میسلی دەپرسی یان لە خەلق؟

منیش عەرزم کرد لە خەلق. و پاشان گوتم باشە (تراب) لە چییە؟

ئەویش فەرمووی: لە (دخان) و منیش گوتم (دخان) لە چییە؟ فەرمووی لە هەیوولا. ئەمجا بێدەنگەمان لێڕا کرد.

* گورژی: ئایا مامۆستای بەڕێز چی دیکەت لەبیر ماوە؟

وەڵام: بەڵێ وا ئەوەشم بیر کەوتەوە کە رۆژێکی لە بارەی گیان (روح)دا لێم پرسی و عەرزم کرد قوربان گیان کە لە بەدەن جودا بۆوە دەچێتەوە (عدم) یان دەچێتەوە (وجود)؟

ئەویش فەرمووی دەچێتەوە وجود و قەت نامرێ. منیش گوتم ئەدی بەچی دەژی؟ فەرمووی بە ئەمری خودای گەورە.

هەروەها رۆژێکی لە بارەی ئەو ئەجننەی تەختی بەلقیسای هێنا لێم پرسی و گوتم: هێندێک دەڵێن ئەجننە هەمان میکرۆبە و زۆر وردیلەیە ئەگەر وابێ ئەو چۆن ئەو تەختە زەلامەی پێ هات؟

فەرمووی ئەجننبە سێ جۆری هەیە: یەکیان هەمان میکرۆبە و زۆر وردیلەیە و جۆرێکیشیان باڵدارە و بە باڵ دەتوانێ بۆ هەر جێیەک بفڕێ.جۆرێکیشیان زۆر زەلامن و رەنگە هەمان عیفریت بێ و خواش دەفەرموێ: (و قال عفريت من الجن انا اتيک به قبل ان تقوم من مقامک).

* گورژی: قوربان چساڵێک لە خزمەت مامۆستای کۆییدا بوویو ئێستا تەمەنتان چەند ساڵ دەبێ؟

وەڵام: ڕاستی لە بیرم نییە کە چ ساڵێک بوو کە من لە خزمەت ئەو بەڕێزە بووم، ئێستاش من ڕەنگە لە ٨٥ ساڵ باڵاتر بم.

* گورژی: قوربان چ شتێک مامۆستای ئاوا هان دەدا کە ئەوەندە داکۆکی لە مەسەلەی نەتەوایەتی بکات؟

وەڵام: وەڵڵاهی هەر فەقیری و لێقەوماوی خەڵکی کورد و بێبەشی و بەشخوراوی کوردان. بەڕاستی مامۆستا لە تاو کوردان ئاوری گرتبوو. دەتگوت پەپوولەیە و خۆی لە شەم داوە. یان ئاور لە دەروونیدا هەڵایساوە.

* گورژی: چەند کەس لە مامۆستا یانی مامۆستا کۆیی دەناسی ئەگەر بزانی پێمان بفەرموو.

وەڵام: وەڵڵا کەسیان لێ ناناسم و هیچ نازانم لەو بارەوە.

* گورژی: مامۆستا گیان زۆرت سوپاس دەکەم و هیوادارم خوای گەورە پاداشت بداتەوە و پایەدارت بکا.

وەڵام: خوا تۆفیقت بدا و خوای گەورە سەرکەوتووت بکا بۆ ئەوکارە باشانەت.

جێگەی باسە مامۆستا مەلا موحەممەدی بارزانی، کە مەلایەکی زۆر ژیرو پیرۆز بوو، ئێستا چەند ساڵێکە کۆچی دوایی کردووە خوالێی خۆش بێ و بە بەهەشتی بەرینی شاد بکات.

# نامەی یەکێک لە فەقێکانی مامۆستا

زۆرم هەوڵ دا نامە بۆ چەند کەس لە فەقێکانی مامۆستا بنێرم تا ئەوانیش وڵامم بدەنەوە و بە نامەکانی وان پەڕتووکەکەم برازێنمەوە بەڵام بە داخەوە ئەوانەی کە لە خزمەت ئەو زانا بەرزو هۆزانە لێزانەیان خوێندبوویان نەمابوون و کۆچی دواییان کردبوو یان خەڵکی هەرێمی ئێمە نەیدەناسین ومنیش خۆم ناسیارییەکم لەسەریان نەبوو.

سەرەنجام لە چەند کەسی کوردستانی گەرمێن (باشور)م پرسیار کرد کە دوو کەسیان لە فەقێکانی مامۆستا پێ ناساندم، یەکیان مەلا موسلیمی إلاّ اللهی مەلای مزگەوتی حەتکێ، یان گەرمۆکی شاری کۆیە کە هەرچی کردم دەستم وێی رانەگەیی ونامەم بۆ نەنێردرا بۆی بە داخەوە نەمتوانی کەڵک لە زانیاری و ئاگاداری وی وەربگرم.

یەکیشیان مەلا محەمەدئەمینی کانی مازوەیی لە ئۆردووگای حاجییاوایە کە ئەو نامەیەم بۆنارد وئەویش ئەو نامە جوانەی بۆ ناردمەوە کە زۆر سوپاسی دەکەم و هیوام وایە خوای گەورە پاداشی باشی بداتەوە.

# نامەکەی خۆم بۆ مامۆستا مەلا محەمەدئەمینی کانی مازوەیی

بە نێوی یەزدانی مەزن

مامۆستای بەڕێز و خۆشەویست جەنابی مامۆستا مەلا محەمەدئەمینی کانی مازوەیی!

وێڕای هەواڵ پرسین و دەس ماچ کردن لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە کە ساخ وسلامەت وسەرکەوتوو بیت .

لە پاشان سەروەرم هەرچەند یەکتر ناناسین، بەڵام کارێکی گەورەم پێتانە تکایە ناهومێدم مەفەرمو، وەڵامم بدەوە . خودا پاداشتان بداتەوە.

من چەند ساڵە خەریکم وکتێبێکم لەبارەی مەلای کۆیی د ا نووسیوە و دەمهەوێ لەوەی کە هەیە تەواوتروکامڵتری بکەم. ئەو کتێبە( ناوی کوڵی دڵی مەلای کویی )یە، ژیان و بەسەرهات وخەبات وتێکۆشانی مەلای کۆیی تێد ا باس کراوە. هۆنراوەکانی ویم هەموو هێناون وراقە وشەرحم داون.

جا تکایە بەڕێزتان کە فەقێی جەنابی مامۆستای کۆیی بوون لەهەر بابەتێکەوە کە ئاگات لێی هەیە بۆم بنووسە تا بە نێوی خۆت لە کتێبەکە می بهاوێم و ڕەگەڵی بخەم و پێی بڕازێنمەوە. بە تایبەتی لەو لایەنانەی خوارەوە:

١. ژیانی پڕ لە ژان و شانازی مەلای کۆیی چۆن بووە؟

٢. خاڵە بەرزەکانی ژیانی مەلای کۆیی وچۆنیەتی هەوڵ و تێکۆشانی وی.

٣. چۆنیەتی وانەوێژی (تدریس) و فەقێکانی و فێرگەکانی.

٤. پیشە دەوڵەتییەکانی مەلای کۆیی و قسە خۆشەکانی.

٥. هۆنراوەکانی جگە لەوەی کە گیوی موکریانی چاپی کردووە، هەرچیست لایە بۆم بنێرەوە بەتایبەتی هۆنراوەی فارسی و عەرەبییەکانی.

٦. ئازایەتی و دلێری و نەترسی وباوەڕی بەرزی مەلای کۆییم بۆباس بکە.

٧. بە کوردی هەرچی سەبارەت بەو مامۆستا بەڕێزە دەیزانی، ئەگەر دەکرێ ئەدرێس و نیشانی کاک مەسعود وچەند فەقێی مامۆستا کۆییشم بۆ بنێرەوە تا نامەیان لێ بنووسم.

ئەو کتێبەی من پتر لە ٦٠٠ لاپەڕەیە وهەمووی هەرسەبارەت بەو کەڵە پیاوە کوردەیە وپێم خۆشە پتر بیرازێنمەوە و هەرچیشم زانیوە ود ەسم کەوتووە نووسیومە وئەوەش کە نەمزانیوە ئێوە یارمەتیم بدەن و بەو ناونیشانە بۆم بنێرن:

کوردستانی ئێران، مەهاباد، گەڕەکی باغی شایەگانی، مزگەوتی بیلالی حەبەشی، کووچەی١، مەلا حوسێنی گورژی.

ئیتر بە خواتان دەسپێرم. خواتان لەگەڵ.

## ئەوەش وەڵامی نامەی مامۆستا مەلا محەمەدئەمینی کانی مازوەیی:

بۆلای جەنابی زۆرخۆشەویستم کاک مەلاحوسێن!

یەکەم زۆر ئەحواڵت دەپرسم و هیوام خۆشی و شادیتە. برای بەڕێزم لە بارەی جەنابی مەلای کۆیی داوای چەند ئاگاداریت لێ کردووم.

برام زۆر لە مێژە لە خزمەتی بووم لەوانەیە ٥٠-٦٠ ساڵ زیاترە، ئێستا زۆر بێتاقەتم، هێزم نییە، چاوم نابینێ، بۆخۆم ناتوانم هەتا شتێ بنووسم.

بەڵام لە بەر دڵی جەنابت هەر مەعلووماتێ لام بێ ئەوا بۆت روون دەکەمەوە:

١ـ ئەم عومرەی کەرابیبواردووە موحتاج بە هیچ کەسێ نەبووە لە باری ژیانەوە خەڵک موحتاج بەوبووە. دوو دێیان هەبووە تایفەی ئەوان. پیاوی گەورە دەهاتن بۆ خزمەتی لە هەولێروچەند شاری دیڕا، وەکوو موحافیز (پارێزگاری پارێزگا) و دوکتور وئاغا وشێخ ومەلا وچەند کەسانی دی.

٢ـ زۆر تەعەسسوبی کورد ایەتی هەبوو، دەیفەرموو:

هەتا دەمرم لە بۆ کوردان دەناڵم
عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بە ماڵم؟

دەیفەرموو بە قسەی ئاغاوات خۆت مەخە ناو ئاگر. بۆخۆت خۆت بهاوێ ئاگری، نەک بۆخەڵقی وخەڵقی مەکوژە.

٣ـ بۆخۆی خوێندنی لە مەدرەسەی خۆیان بووە لە خزمەت حاجی مەلا عەبدوڵڵای بابی لە شاری کۆیە وئیجازەی هەرلە خزمەت باوکی وەرگرتووە لەوێ. ١٥ موستەعیدی هەبوون جەنابی مەلای دەرسەکی ئی من بوو ئی توحفەی، دەرسەکی حەدیسی ئی کوڕی شێخی سەران مەلا محەمەد، تەفسیریشی ئی مەلا سەعدی قالاّدزێ، فەرمووی ناتوانم لەو سێ دەرسە زیاتر، ئەم سێیەی هەڵبژارد و گوتی ئەمەی دیکە کە ١٢ فەقێیە با سامیع بێ. هەتا ئەگەر فەلەکیاتی دەگوتەوە وەکوو لەوێ دانرابی وابوو دەستی خۆی دەکردە کورە لەروی وییەوە شەرحی دەدا و هەر دەیگوت خۆی لەسەر ئەو کوڕەیە، کە باسی دەکا.

لە باسی رضاعەوە مەلایەکان کێشەیان بوو، کاغەزێکیان بۆنوسیبوو دوورو درێژفەرمووی (علی رضیع) چی کە نا، یەعنی ئەو حورمەتە، یەعنی ئەو حەرامە هەربۆرضیعە. واتا بو شیرخۆرەکەیە.

لەو تەوسیفەدا دەفەرموێ: کابرایەک بە ژنی خۆی بڵێ تەڵاقت کەوێ ئەگەر محەبەتی فلاّن شەخسەت هەبێ، چونکە محەبەت شتێکی قەلبییە ونازانرێ زۆری لەسەر دەڕوا ئایا ئەو تەڵاقە دەکەوێ یان نا؟

جەنابی مەلا لە سەری نووسیوە: (هەرچی ساحەب یارە لە چاوانڕا دیارە.)

ئەگەر فەقێ دهاتە سەر دەرسی لاپەڕەیەکی دەخوێندەوە بۆخۆشی نەختەکی دەخوێندەوە و مەفهوومێکی دەفەرموو. فەقێ دەبوایە دەرسی خۆی بزانێ چونکێ زۆر شتی خارجی دەهاویشتە ئەو دەرسە.

٤ـ ماوەیەکی قازی بووە هەرلە کۆیە، حوکمێکی زۆرعەداڵەتی بەڕێوە بردووە.

هاوینان دەچووینە (چنارۆک) کە هاوینە کوێستان بوو. لە هەیبەت سوڵتان بەو دیوەدا بۆ دیوی رانیە ئەنواعی میوەجاتی تێدا بوو. هەموو فەقێکانی لەگەڵ خۆی دەبرد، ملکی خۆیان بوو.

جەنابی مەلای، شێخی ناشێخ خۆشیان نەدەویست. بانگی بەیانی دەدا نوێژی دەکردودەڕۆی وئەمن و مەلا محەمەد لە خزمەتی دەڕۆیشتین لە دوای وی و نەشیدەگوت وەرن. لە خزمەتیدا دەڕۆیشتینە خواری گەیشتینە بن دارەکی میوە سپیلکە ، کە ترێیەکی زۆری پێوە بوو، گوتی محەمەدئەمین بانگی فەقێیەکی کە لەم ترێیە بۆخۆیان لێ کەنەوە، بێجگە لەوەی گە رەزێکیشی دابووینێ ؛ بۆخۆیان کە هاتینەوە سەری بڵیند کرد هیچ هێشووی پێوە نەمابوو فەرمووی خۆ هەموویان لێ کردۆتەوە. گوتی خەتای خۆم بوو. فەقێیەک هەبوو لە شارەکی چۆ کن حاجییەکی گوتی: دەقەسرم لە سەرمان ئەم جستانە شتێکم دەیە، بە خۆیدا دەم.

حاجی لیفەیەکی نوێی دایە. فەقێ هەتا جستان رۆیی لێفەی هەلاهەلا کرد، بۆی بردەوە بە دڕاوی گوتی حاجی ماڵت ئاوا بێ. حاجی وتی خۆ بۆ ئەوەم نەداویە، کە لێت بستێنمەوە. گوتی بۆ زوو پێت نەدەگوتم لێت ناستێنمەوە؟ ئەوها لێکم نەدەکردەوە.

جەنابی مامۆستا ئەو میسالەی بۆ هێناوە و گوتی ئەگەر بمگوتبا ترێیەکە هەموو بۆ خۆتان بێ هەمووتان بە یەکجار لێ نەدەکردەوە.

٥ـ جارەکی هەموو دانیشتبووین لە حوجرە مارەک هاتە ژووریَ شەو بوو، فەقێکان هەموو بە دەر کەوتن لە چنارۆک بووین جەناب

مەلای لینکە پێڵاوێکی هەڵگرتەوە بە مارەکەیدا دا لە خەیاڵم نییە کوشتی یان نا.

٦ـ کتێبێکی لە عیلمی اصولدا داناوە بە موافق جمع الجوامع قورئانی تەرجەمە کردووە بە کوردی. دەفەرموێ: (الم) وەکوو هەلاو لە سەر تەلەفونێ بۆ ئاگادارییە.

کاک مەسعوود لە بەغدایە سەفەرەکی چوومە لای وەزیر بوو گوتی خەریکم تەرجەمەکەی باوکم لە چاپ دەدەم بەڵام ئیختیدارم نییە. گوتم چەندت مەعاشە؟ لە ساڵی ٩٧٠ گوتی ٣٠٠ دینار. گوتم ئەگەر لە جێی باوکت دانیشتبای باشتر نەبوو؟

گوتی: نەمدەتوانی، چونکە من هێندە گوناحم کردووە نەمتوانی لە جێی باوکم دانیشم.

گوتم: ان الله لایغفر ان یشرک بە و یغفر ما دون ذلک لمن یشاء.

گوتی: دەترسم لەوانە نەبم.

گوتم: ان الله یغفر الذنوب جمیعا.

چەند حدیس و ئایەتم بۆ خوێندەوە. مەسعوود گوتی: دەچووینەوە مزگەوتی گەورە زۆر شتم بۆ بەدەر کەوت لوقمەیەکم خوارد. لەو لوقمەی کە خواردم ئەوی دیتم نەمدیتەوە موحافزە. ئەمن بۆیە ناتوانم لە جێی دانیشتم

برام هۆنراوەکانی بە فارسی و عەرەبی لە خەیاڵم نەماوە و ئیتر هیوادارم سوودی هەبێ و بە خوات دەسپێرم.

برای خۆت مەلا محەمەدئەمینی مەلا عەبدوڵڵای کانی مازوەیی
لە ناحیەی خەلەکان

* ئەو نامەیەم نێزیکەی دوای یەک مانگ لە بەرواری نامەکەی خۆم پێگەیی، بەڵام بە داخەوە بەرواری لەسەر نەنووسرابوو.

# بیروڕای زانایان لەبارەی مامۆستادا

لەبارەی ژیان وخەبات و بەسەرهاتی مامۆستای دڵسۆزی کورد مەلای گەورەی کۆیی گەلێک لە زانایان و نووسەرانی کورد مەبەستگەلی جۆراوجۆریان نووسیوە کە بە داخەوە لێرەدا بۆمان نالوێ نێویکیشیان بهێنین. بەڵام بە پێویستی دەزانم کە ئەگەر بۆ ڕەنگاوڕەنگ بوونی کتێبەکەش بێ بەسەر هەموویاندا پاز نەدەم و چەند دانەیەکیان لە کۆتایی کتێبەکەدا هەر بە ویژامە (عبارت)ی خۆیان بهێنم.

مەسعوود محەمەد جەلیزادە لە پەڕتووکی گەشتی ژیانمدا لاپەڕە ١٠ و ١١ ئاوای نووسیوە:

### مەسعوود محەمەد

حاجی مەلا عەبدوڵلا لە ساڵی ١٩٠٨ز (١٢٦٣ک) لە کۆیە بە ڕەحمەتی خوا شاد بووە. دوای ئەو کوڕە گەورەکەی محەمەد کە دواتر بە مەلای گەورە ناوی دەرکرد لە جێی دانیشت. حەوت هەشت ساڵێک بوو خوتبەی جومعە و دەرسی فەقێکان لە لایەن باوکییەوە بەو سپێردرابوو.

هەر چەند ناساندنی ئەم مرۆیە بە خوێنەری کورد کاری سەرپێیی و پەلە لێ کردن نییە تا ئێستا لە شەپۆلەکانی سەرووی شەخسییەتی بەو لاوە چی ئەوتۆ لە قووڵایی دەروون و پاشخانی نەفس و سەقافەت و سەرجەمی هەوڵ و خەباتی لای خەڵق نەزاندراوە، چارم ناچارە لێرەدا لە بواری گەشتی ژیانی خۆمەوە

کە شەلەگەیەکم لە جێی ئەو، تەنها کورتەیەکی ژیانی بۆ خوێنەر بگێڕمەوە و بایی ئەوە بکات تەئسیر و تاوی بورکانی ئەو لە مندا روون بکاتەوە.

باوکم (١٨٧٦– ١٩٤٣ز) لە چەند نووسیناندا باسی هەندێ سەربوردەی ژیان و خەبات و فکری کراوە وەک گوتارێکی گەلاوێژی ١٩٤٣ (دوای مەرگی) کتێبی ئەمین زەکی بەگ لەبارەی ناودارانی کوردەوە، کتێبەکەی قزڵجی (مساجد السليمانيه)، دوو کتێبەکەی مومتاز حەیدەری و عەبدولخالق عەلائەدین، چەند گوتار لە رۆژنامە و گۆڤاری کوردی بە بۆنەی بیرەوەری وەفاتی، یا موناسەبەیەک پەیوەندی بەوەوە هەبووبێ. هەندێک لە نووسینەکانی مەغدید حاجی، ناوناوەیەک لە نووسینی خۆمدا کتێبی(الاعلام الزركلی)، کتێبی (علماء اربيل)ی زوبیر بیلال و هی دیکەش...

چەند قەسیدەیەکی مەدح ئامێزیشی پێدا هەڵگوتووە وەک هەڵبەستەکەی ئەسیری و هینەکەی مەلا ئەحەدی ئەشکەنەیی(چاپ نەکراوە)و یەکێکی مەلا مستەفای عاسی (چاپ نەکراوە) لە مەرسیەشدا لاواندنەوەکەی کۆمەڵەی (ژ.ک)ی مەهاباد و قەسیدەیەکی خادم و هی سەیید ئەنوەری حوسێنی و چوارینەکەی دڵزار و یەکێکی مەلا زاهیری مەلا سادق (چاپ نەکراوە) لە هەڵکەوتدا نووسەری وەک مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی و هەژار و کەماڵ مەزهەر و کەریم شارەزا و هی دیکەش بە چاکە باسیان نووسیوە.

دوای مەرگی لە پاییزی ١٩٤٣ تەئبینیەیەکی بۆ گیرا. لە رادیۆ مۆسکۆش لە ١٩٧٦ کۆبوونەوەیەکی ئەدەبی بیرەوەری سەد ساڵەی وەلادەتی بڵاو کرایەوە. لە رادیۆی تاران و شوێنی دیکەش ئەم

ڕۆهەڵاتە نێزیکە باسی کراوە و لە تەلەفیزیۆنی کەرکووکیش ناوناوە دوان و گوتاری لە سەر بڵاو کراوەتەوە.

لە کتێبە کوردییەکانی قوتابخانەی ڕەسمیش وەک ئەدیب و زانایەکی کورد لەسەری نووسراوە.

ناحەزەکانی بریتی بوون لە:

١ـ زۆردار ٢ـ ئەفسانە پەرەست ٣ـ مێشک ویشک ٤ـ دوژمنی کوردایەتی.

بەڵام لە ژیانی خۆیدا کەسێک لە ناحەزانی زاتی نەکرد بە نووسین ناوی بە خەراپە بهێنێ و یا ڕووبەڕووی دەنگ هەڵێنێ.

هەروەها لە لاپەڕە ١٢ی گەشتی ژیانمدا دەڵێ:

بەڵام وەک بابم بۆمانی باس کرد تا نەخرایە بەردەستی مەلا محەمەدئەمینی کونەفلووسەیی کە موستەعیدێکی لێهاتووی حاجی مەلا عەبدوڵلا و مەلایەکی هەڵکەوتووی دواتریش بوو لە هەولێر زیهنی بە چاکی ناکرێتەوە، دەیگوت مامۆستاکانم خەریک بوون بە شێوازی نالەباریان بمکووژێننەوە، مەلا محەمەدئەمین رزگاری کردم هەموو زانینم هی ئەو مامۆستایەمە لە سەرەتای دەس پێ کردنی خوێندنی پلەی دوای سوختایەتییەوە بە باوکی دەڵێ: من خوێندنی بە زیلـلەت ناکەم، نانی رادبە ناخۆم، ناچمە هەندەران بۆ فەقێیەتی، رابواردن و مەجلیسی تایبەتی خۆم لە مزگەوت و مەدرەسەدا نابێ لە ئی خاوەن قوناخەکان کەمتر بێ. ئاغازادە و بەگزادە ڕێی نەبێ خۆ هەڵداتەوە بە سەر ڕەجاڵی و مسکێنی کۆبوونەوەی فەقێیانماندا.

حاجی مەلا عەبدوڵلا قەول و بڕیەی لەگەڵ دەکات ئەو بە چاکی بخوێنێ و ئەویش هەرچی ئارەزوویەکی هەیبێ بۆی پێک بێنێ. بە

دژێرایــی خوێنــدنی مەجلیــسی بە قــاوە و قلیــان و ســەماوەر و دەنگخۆش و قسە خۆشییەوە بارتەقـای مەجلیـسی خـودا پێداوەکان بووە و بگرە لە هەندێ رووەوە لە هی ئەوانیش زیاتر بووە.

دیسان کاک مەسعوود لە لاپەڕەی ١٣شدا دەڵێ:

خوێندنی باوکم لە چاو دەوروبەری خۆی و باری ئەو سەردەمەدا هەروەک لە رووی بەسەربردنەوە لە هی خەڵکی دیکە جـودا بـووە، هەروەها لە لایەن چەند و چۆنیشەوە کەم مانەند بووە.

خەست خەست لەگەڵ مامۆستاکانی و دواتـریش لەگەڵ بـاوکی خەریکـی سـاغ کـردنەوەی کتێبە زانـستییەکان لە مـزگەوت بـووە و هەموو دڵ و مێشکی خۆی بەو کارە بەخشیوە. لە تەمەنی ١٧ ساڵیدا بۆ ماوەی یەک ساڵی تەواو لە مزگەوتی گەورە دەرنەچووە.

بەڕێـز عەزیـزی مـوحەمەد پـوور داشـبەندی لە پەراوێـزی ١٠٣ پەرتـووکی (آداب و رسـوم کردانــی) بەڕێـز مەحمــوود ئەفەنــدی بایەزیدیـدا سـەبارەت بە مەلای گەورەی کـۆیی لە بـارەی ئەو کەڵە پیاوە هەڵکەوتووە ئاوا دەڵێ:

چنانکه علامه و وحید عصر خود مرحوم ملا محمد کویی معـروف به جناب مەلا کـه یکـی از مـدافعان و روشـن‌بینـان اسلام و تـساوی حقوق و آزادی انسان‌ها بویژه آزادی زنـان از قیـود خرافـات مخـالف اسلام و غیر منطقـی و مبـارزه از بـین بـردن تقلیـد کورکورانـه قـرن بیستم از ١٩١٩تشرین اول ١٩٤٣ میلادی در کردستان عـراق بـه شـمار می‌رفت ایشان نظر به اینکه یکی از اهداف پیشرفته و خدا پسندانه‌ای که همواره مطمع نظر ایشان بـوده آزادی طبقـه زحمـتکش و در عـین حـال مربی واقعی جامعه بشریت یعنی زنان و مادران دلسوز اجتماع بوده است.

طلاق دادن زانان را که گاهگاهی در میان کردان اتفاق می‌افتاده مورد نکوهش قرار داده و آنان را از انجام اینگونه اعمال برحذر داشته است. بدین مناسبت قصدیه‌ای را هم تحت عنوان (ژن هینان و طلاق دان) (زن و طلاق) سروده که در پایان به اصل و چکیده ترجمه آن خواهیم پرداخت.

جناب ملا می‌خواست به این طبقه زنان که در آن موقع هم در خاور دور به عنوان یکی از کالاهای مرد به حساب می‌آمده و خرید و فروش می‌شده است ارزش واقعی خود داده شود. می‌خواست ایشان را از قید و زنجیر بی‌عدالتی‌هایی که به خواسته مردان به دست و پا و حتی افکار ایشان زده بود رهایی بخشد.

زنان در اجتماع آزادانه حق هر گونه فعالیت را داشته باشند، دوشادوش مردان در فراگیری علم و صنعت در راه پیشبرد جامعه مشترک خانواده بشریت گام بردارند. زنان نیز از کلیه حقوق طبیعی و اجتماعی و انسانی خویش بهره‌مندشوند از سلطه کابوس ترس و وحشت شرکت در کارهای احتماعی رهایی یابند.

ظلمت شب تار زندگی را با نور دانش و کوشش و تشریک مساعی مردان در هر امری به روز روشن سعادت و خوشبختی مجماعه مبدل سازند که در این امر توفیقی هم یافته بود، زیرا برای اولین بار به دستور ایشان دختران کرد در شهر کوی عراق توانستند دوشادوش پسران پا به مدرسه بگذارند و از آن پس در کارهای اجتماعی نیز سهیم شوند.

هەروەها ئەو بەڕێزە لە لاپەڕەی ١٠٣ هەمان پەڕتووکدا سەبارەت بە مامۆستای بەڕێزی بەرزی کۆیی ئاوا دەفەرموێ:

واینک شرح حال مختصر این یگانه ستاره تابناک جهان اسلام نام مبارکش محمد فرزند حاج ملا عبدالله جلیزاده کویی است که

این خانواده حداقل سیصد سال در پهنه کردستان به نشر و ترویج معارف اسلامی اشتغال داشته‌اند.

معظم له در سال ۱۲۹۸ ه.ق در شهرستان کوی عراق پا به عرصه ظهور گذاشته و در ۱۸ سالگی به دریافت اجازه و گواهینامه افتا و تدریس و اجتهاد از محضر پدر بزرگوارش نائل می‌گردد. در سال ۱۳۲٦ ه.ق به جای والد راحل خود نشسته و به لقب رئیس العلمائی ملقب می‌شود. در سال ۱۳۳٤ به عضویت مجلس ولایت موصل انتخاب شده و از والی موصل تقاضای تأسیس مدرسه‌ای را می‌نماید که در خاک اعطایی خود وی بنا می‌گردد.

در سال ۱۹۱۲ به مقام افتا و قضاوت شهر کوی اشتغال داشته و در سال ۱۹۱۹ که دوران اشغال عراق از جانب دولت بریتانیا بوده باز قضاوت را ادامه داده و در سال ۱۹۲٤ به عضویت المحلس التاسیس العراقی منتخب و پس از مدتی پیگیرانه خواستار حقوق ملی کردها شدند.

پس از آن در سال ۱۹۲۸ از مقام قضاوت و مقامهای دیگر کناره‌گیری کرده و تمام هم خود را صرف تدریس و تألیف می‌نماید و علما و افراد سرشناس بی‌شماری را از منبع پر فیض معلومات خویش سیراب کرده و ایشان را به درجه افتا و اجتهاد نایل می‌کند.

جناب ملا که به (مەلای گەورە) شهرت داشته است تالیفات زیادی را به زبان‌های کردی و عربی در زمینه‌های گوناگون از خود به یادگار گذاشته است. از جمله کتابهای عربی می‌توان از.

١. المصقول فی علم الاصول
٢. الكلام الجديد
٣. القائد فی العقائد
٤. ابهی المآرب فی اثبات الواجب

٥. كشف الاستاد فی مسئلة الاختيار
٦. ضياعان عظيمان
٧. المعجزات و الكرامات و چندين كتاب ديگر نام برد و از كتابهای كردی
١. عەقیدەی ئیسلام
٢. نوی‌کەرەوە
٣. تفسير قرآن را نام برد.

استاد كويی در سپيدەدم ١٢ تشرين اول سال ١٩٤٣ در شهر كوی جان را به جان آفرين تسليم می‌نمايد. روحش شاد و جنة المأوی مسكنش باد.



## مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس

بەڕێز مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕڕیسیش لەبارەی ئەو بلیمەتە پایە بەرزەدا ئاوا دەفەرموێ لە پەڕتووکی (علماءنا فی خدمة العلم و الدین) لاپەڕەی ٥٣٤ کە مەبەستەکەی وی بە زمانی عەرەبییە و لەوە پێشیش هێندێک لە دەقی وێژامە (عبارت)ە عەرەبییەکەمان هێناوە و وەریشمان گێڕاوەتە سەر زمانی کورد. ئەو بەڕێزە لە درێژایی وتارەکەیدا ئاوا دەفەرموێ:

الملا محمد بن الملا عبدالله الجلی هو العالم العلامة فرید الدهر و نادرة العصر، الملا محمد بن الحاج ملا عبدللە ابن الحاج ملا اسعد ابن الحاج ملا عبدالله ابن الحاج ملا عبدالرحمن الجلی رحمهم الله تعالی.

ولد فی قصبة کوي‌سنجق سنة الف و مأتین و اثنین و تسعین هجریة و تربی فی بیت العلم و الفضل حتی وصل حد التمییز، فبدأ بالقراءة، و ختم القرآن الکریم و الکتب الادبیة، ثم دخل فی تعلم العلوم العربیة و جد و اجتهد و سعی و راعی حق تحصیل العلوم فی مدرسة والده، فحصلها و تکامل و استوی و اخذ الاجازة منه

فبقی فیها مدرسا معاونا لوالده الماجد فی افادة الطالبین و سائر خدمات الدین.

و بعد مدة فوض الیه والده التدریس و الامامة و الخطابة، وقام الوالد بالوعظ و الارشاد فقط الی ان توفی والده، فبطبیعة الحال قام صاحب الترجمة بالجمیع خیر قیام. و لکنه بعد مدة من الزمن اوکل امر الخطابة الی اخیه لابیه الشیخ نوری و استمر هو علی الامامة و التدریس.

کان لصاحب الترجمة دور عجیب فی الحرکة العلمیة و توجیه الطلاب بل توجیه المسلمین کافة الی الیقظة و الاعتماد علی النفس، و التوجه الی معالي الامور والوحدة و الاعتصام، والابتعاد عن الاختلاف و الخرافیات، وفي الواقع کان احد الاحدین فی العلم و الفضل و الغیرة و الشهامة و الجسارة الادبیة و قوة القلم، و فلاحة البیان، و صراحة اللسان، و لو لا بعض الموانع لاستفاد الناس منه ما لایستفاد بکثیر من الزمان، فکان یختار لعماء الدین الترأس و الاستقلال بتوجیه المسلمین، و اخذ الزمام الامور المهمة، و الحرکة نحو الامام فی کافة الشئون الدینیة و الاجتماعیة و السبق علی سائر الناس.

فتخرج من تربیته فوج من العلماء الغیاری الذین لایخافون فی الله لومة لائم و کذلک کان له آراء قیمة فی شئون التعلیم و التدریس و رعایة الایام و الزمان، و لکن لیس التدبیر کل شیء فان التقدیر قد یضحک علی التدبیر.

و کان لصاحب الترجمة تألیفات کثیرة منها:

کتاب المصقول فی علم الاصول، کتاب فی اصول الفقه، و منها القائد فی العقائد، و منها رسالة بعنوان حقیقة الایمان، و رسالة فی الکلام بعنوان الکلام الجدید، و شرع فی تألیف کتاب علی غرار

المقاصد للتفتازانى سماه المشاهد. و الظاهر انه لم يتم، و منها تفسير للقرآن الكريم باللغة الكردية و قد طبع منه الى الان جزءان و نرجو الله توفيق نويه على طبع ما بقى منه فى المستقبل القريب. و قد كتب بخطه فى آخر تفسيره ما يلى (و اما مشربى و ميلى فليس إلاّ الى الاتحاد و نبذ الخلاف ما امكن، و اكرر على الدوام قوله تعالى "تلك امة قد خلت لها ما كسبت و لكم ما كسبتم و لاتسئلون عما كانوا يعملون" و قوله تعالى "ان الله لايغير ما بقوم حتى يغيروا ما بأنفسهم" نسأل الله الرحمة و السداد. انتهى فى يوم الاربعاء سلخ ربيع الثانى سنة الف و ثلاثماة و سبعين و خمسين. الحقير جلیزاده محمد) و ختم تفسيره فى سنة الف و تسعماة و ثلاث و اربعين ميلادية ١٩٤٣.

و توفى الى رحمة الله فى السنة نفسها فى الثانى عشر من التشرين الاول. رحمه الله تعالى و طاب ثراه. قلت و يظهر من جرأة قلمه و نبرات كلمه انه كانت له رحمه الله هوايات عالية، و امنيات غالية، و لكن الامور بيد الله، يتصرف فى الكون كما يشاء لا كما نشاء. هذه جهة و من جهة اخرى ان لكل شىء سببا، و المهمات لها اسباب، و اذا لم تكن الاسباب فى مستوى الطاقة لايمكن للانسان الوصول الى المخصوص و نفوض الامور الى الله ان الله بصير بالعباد.



بابامەردوخی رۆحانی

هەروەها بەڕێز بابا مەردوخی روحانی "شیوا" لە پەڕتووکی تاریخ مشاهیر کرد بەرگی دووهەم لاپەڕەی ۲۵۷ و ۲۵۸ لەبارەی ئەو هۆزانە لێزانە و ئەو کەڵە پیاوە کوردەدا ئاوا دەڵێ:

ملا محمد افندی فرزند حاج ملا عبدالله جلی دانشمند محقق و پژوهشگر از خاندان جلیزاده بسال ۱۲۹۷ (ه.ق) در شهر کوی متولد شد و در حجره پدر تربیت یافت و به تحصیل پرداخت. در سن ۱۸ سالگی بر اثر استعداد ذاتی و سعی و جدیت کافی به حد کمال رسید و پس از اخذ اجازه به تدریس و مطالعه و تحقیق و تالیف مشغول شد. بعد از وفات پدرش به سال ۱۳۲٦ (ه.ق) رئیس العلماء لقب کرفت و در سنه ۱۳۳۹ (ه.ق) قاضی کوی شد و متعاقب آن به نمایندگی در مجلس مؤسسان عراق راه یافت.

پس از آن چند بار دیگر به عنوان نمایندگی مجلس به بغداد رفت و در سال ١٣٤٧ (ه.ق) از تمام مشاغل رسمی دست کشید و کار خود را منحصر به مطالعه و تحیقیق و تدریس کرد.

محمد افندی دانشمندی بود اهل فلسفه و شعر و ادب و بیشتر اشعارش پند و واندرز و دعوت مردم است به اتفاق و رعایت حقوق هم و همزبانان.

و اما تألیفات وی.

١. المصقول فی علم الاصول.
٢. القائد فی العقائد.
٣. ابهی المآرب فی اثبات الواجب.
٤. کشف الاستار فی مسألة الاختیار.
٥. الاله و الطبیعة و العقل و النبوةو المعجزات و الکرامات.
٦. المشاهد علی طراز المواقف و المقاصد.
٧. الحدس سلم الارتقاء.
٨. غایتی و املي في علمي و عملي.
٩. خراب العالم.
١٠. رسالەای در حقیقت اسلام.
١١. رسالەای در حقیقت ایمان.
١٢. عەقیدەی ئیسلام بە زبان کردی.
١٣. دیوان اشعار کردی.
١٤. داستانی کردی (خەون و کەرامەت).
١٥. فڕی فڕی قەل فڕی.

همچنین کتابها و رسالەهای دیگری در اصول و منطق و حکمت و ادبیات که قسمت زیادی از این تالیفات به چاپ رسیده است.

ملا محمد جلیزاده به سال ١٣٦٢ (ه.ق) در کوی وفات یافته است.

لە بارەی بەڕێز جەنابی مەلای گەورەی كۆییدا گەلێک لە زانایان و نووسەران و بلیمەتانی كورد وتاریان نووسیوە و بیروڕای خۆیان دەربڕیوە. جا هەر لەو پێیەدا بەڕێز فوئاد حوسێن ئەحمەد لە لاپەڕەی ١٦٤ كتێبی (ئافرەت لە هۆنراوەی كوردیدا) لەبارەی ئەو كەڵە پیاوە چاونەترساوە و ئەو بلیمەتە هۆزانە لێزانەدا ئاوا دەنووسێ:

مەلای گەورە هەر لە منداڵییەوە دەستی كردووە بە خوێندن ئەمەش هەر لەبەر ئەوەیە چونكە لە بنەماڵەیەكی زانستی خاوەن پەڕتووک و خاوەن قوتابخانە بووە. لە سەرەتای پێ گەیشتنیەوە بەهرەی شاعیری هەبووە. درەوشانەوەی ئەم ئەستێرە گەشە پڕشنگدارە لە كاتێكی زۆر پێویستدا لە ئاسمانی كوردستان، كە لە ژێر چەپۆكی دەرەبەگایەتیدا دەتلایەوە بووە، مەلای گەورە بە هەستە ناسک و گیانە كوردایەتییەكەی و بیرە تیژ و هۆشیارییەكەیەوە قۆڵی مەردانەی لێ هەڵماڵیوە بۆ ڕزگار كردنی نەتەوەی كورد لەو هەموو نەخۆشییانەی كە بووبوونە هۆی دواكەوتنی. نەخۆشی نەخوێندەواری و نەزانین و بیری دوا كەوتوویی، ئەم بار و زرووفەی میللەتەكەمان كارێكی گەورەی كردۆتە سەر هەست و نەست و دەروونی شاعیری ناوبراومان. ئەوەش لە یاد نەكەین شێعرە نیشتمان پەروەرییەكانی حاجی قادری كۆیی كارێكی گەورەی كردۆتە سەر مێشک و بیری مەلای گەورە.

ڕیزدار حاجی قادری كۆیەش هەروەک گوتمان لەبارە بنەماڵە بەڕێزەكەی مامۆستادا فەمویەتی هەڵبەت پێش لە داییک بونی مامۆستاش:

بەغەیری جەددی ئیوەكی هەیە دانا  لە كوردستا ن بناغەی عیلمی دانا؟!

**کە ئەو بەڕیزە لەبارەی تەکییە وخانەقاکانیشا ئەفەرموێ:**



شکڵی تەکیە و خانەقای شێخەکان     لەم هەموو شێخ و مریدانەی ریا

**هەروەوها ئەو بەڕیزە لە پارچە هەلبەستیکی دیکەدا هەروەک گوترا دەلی:**

ئیبتیفا قە دلبەریکی بی کــەدەر     حاجی ئەنواعی لیباسی کردە بــە ر
بی جیاز و مارە یی دەید ابە شو     لە و هە مو کورد انە داخواز ی نە بو

واقـــیعەن رەنگیـــنە ئەم بـــۆ ریـــان
فەردێکـــی نـــاچێتە مزگەوتـــی خـــودا

**هەروەها لە لاپەڕەی ١٦٥ی هەر هەمان کتێبدا ئاوا دەفەرموێ:**

**ئەوەی یارمەتی مەلای گەورەی داوە بۆ فراوان کردنی ئاسۆی بیرو رۆشنبیری ئەوەیە، کە جگە لە زمانی کوردی زمانی عەرەبی و فارسی و تورکی باش زانیوە و لە شێوە و داڕشتن و بیر و بڕوادا**

چوونە قوتابخانەی شاعیری شۆڕشگێڕی مەزنی کورد حاجی قادری کۆیی و لە سەر ڕێبازەکەی ئەو ڕۆیشتووە و باسی گەلێ بابەتی نوێی کردووە.

دیسان بەڕێز فوئاد حوسێن ئەحمەد، دە لاپەڕە ١٦٥ی پەڕتووکی ئافرەت لە هۆنراوەی کوردیدا دەنووسێ:

مەلای گەورە نە تەنها بە قسە و وتوویژ، رای ڕووناک و ڕۆشنبیری و پێشکەوتووانەی خۆی لەبارەی ئافرەتەوە، دەرنەبڕیوە، بەڵکوو بە کردەوە ئەوەمان بو دەچەسپێنێ. ساڵی ١٩٦٢ز نەک هەر کوڕ، بەڵکوو کچی حۆیشی خستە قوتابخانەی کوڕانەوە و سەیری کۆمەڵی کوردەواری دەکرد.

ئەوەی دەیبینی بۆنی دواکەوتوویی و کۆنە پەرەستی و خورافاتی لێدەهات، هێرش و هەڵمەتی دەکردە سەر و ئیتر هیچ دیمەنێکی ئیجتیماعی نەما لە ناو کۆمەڵەکەی کە هەڵمەتی نەباتە سەر، کە گەشتێک بە نێو باغ و باغاتی هۆنراوەکانی شاعیری ناوبراوماندا بکەین و بزانین لەبارەی ئافرەتەوە چی وتووە و چۆن سەیری کردووە و لە چ جۆرە پلەیەکدا دایناوە، ئەوسا بۆمان ئاشکرا دەبێ تا چ ڕادەیەک پێشکەوتنخواز و بیر فراوان و تێگەیشتوو بووە. شاعیر چ لە کاتی هەرزەکاری و چ لە کاتی هەڕەتی لاوەتی یان چوونە ناو مەیدانی پیرییەوە هۆنراوەیەکی نەهۆنیوەتەوە کە باسی جوانی ئافرەتی کردبێ، یان وەکوو شاعیرانی پێش خۆی کە جۆرەها کەرەسەی جوانکاری و تەشبیە و لێکچواندن و خوازە و خواستە، کە جیهانی ئافرەتیان پێ ڕازاندۆتەوە و باسی ڕوومەت و خاڵ و زولف و باڵای دڵبەریان کردووە و لە لایەکی تریشەوە باسی ئەڤینی و دڵسووتاوی و هەڵقرچاوی خویانیانی کردووە و لە ئەنجامی دووری یاردا ئارامیان لێ بڕاوە و قسەی نالایقیان دەرهەق

کردوون. وەکوو بێوەفا، غەددار، جەللاد، خوێنڕێژ لێرەدا هەروەک دەبینین جیاوازییەک لە نێوانی شاعیرانی پێشوو و شاعیری ناوبراوماندا سەر هەڵدەداتەوە و ڕێبازێکی تایبەتی گرتۆتە بەر، کە حاجی قادری کۆیی رابەر و پێشەوای بوو.

هەروەها دە لاپەڕەی ١٧١ هەر ئەو کتێبەدا دەڵێ:

مەلای گەورە چەندین دیاردەی نالەباری کۆمەلایەتی رەچاو کردووە کە تیایا ئافرەت کڵۆڵ و زەلیل و ناهومێد بووە. لەم مەیدانەدا ئاسپی خۆی تاو داوە و بە هۆنراوە تیژ و رەوانەکانی کە هەموو کەس لێی تێدەگات رەخنە لە مەلا و شێخە درۆزنەکان دەگرێت کە پەیرەوی ئایینی ئیسلام ناکەن! و بە هەوەسی خۆیان و لە بەر بەرژەوەندی بێویژدانیان فتوا دەردەکەن! تیایا زوڵم و زۆرو ناهەق دەسەپێنن. دیسانەوە لە هەمان روانگەوە هۆشیاری خەڵکەکەش دەکاتەوە کە کێشە و ناکۆکییەکانیان و چارەسەر کردنیان دەدۆزێتەوە و وەکوو بەرماڵ لە بەر دەمیاندا رایدەخات، هەروەک لە هۆنراوەی تەلاقدا دەبینین چەند بە وردی و جوانی باسی مەسەلەکەی دەکات و بەرگری لە مافی ئافرەت دەکات، مەلای گەورە دەڵێ:

خودا فەرمووی لە قورئان (الطلاق مرتان
فامساک بمعروف او تصریح باحسان
بڵێن بە قەومی کوردان دەستی من و دامێنیان
عەیبە بە حەقی قورئان ژن هێنان و تەڵاق دان
ژن زینەتی دنیایە ئەمانەتی خودایە
حەبیبی مستەفایە قەڵاتن لە بۆ مێردان
وەزیفەی زۆر گەورەیە دەزانی ئەویش چەیە؟
منداڵ بوون و تەربیە بێمەسخەرە و جوێن پێ دان

هەروەها ئەو بەڕێزە دە لاپەڕەی ١٧٣ی هەمان پەڕتووکدا دەڵێ:

مەلای گەورە ئامۆژگاری مەلاکانی دەکرد کە هەرگیز کچان بە منداڵی لە کوڕان مارە نەکەن و مارە کردنیشی بە بێ ڕەزامەندی کچ لا ڕاست نەبوو، هەروەها دژی ئەوەش بوو کە ئەگەر هات و دایک و باوک لە یەک جیا ببنەوە باوک منداڵەکە ببات، واتا نابێ منداڵ بە ساوایی لە دایک دوور بخرێتەوە چونکە دایک زیاتر و چاکتر منداڵەکە بەخێو دەکات و پێی دەگەیەنێ. شاعیر (واتا خودی مامۆستا) دەڵێ:

داک مامۆستای فیترییە پەیدا بوونت لەوییە
بە مادی و مەعنەوییە خەراپە لە ڕێی لا دان

دیسانەوە هەر بەڕێز فوئاد حوسێن ئەحمەد دە لاپەڕەی ١٧٤ی ئافرەت لە هۆنراوەی کوردیدا دەفەرموێ:

مەلای گەورە چەند دووربین و هۆش فراوان بووە؟ پێوەندییەکی بەتین لە نێوان پەروەردەی چاکی دایک و خزمەت کردنی نیشتمانی پیرۆزدا دەخاتە ڕوو، دایکی دانا و تێگەیشتوو کە دەزانێت چۆن بەچکەکەی پەروەردە بکات تا دواڕۆژ ببێتە لاوێکی ئازا و بەجەرگ کە بتوانێ خزمەتی مەفتەن واتا نیشتمانەکەی بکات، بە کاوەی ئاسنگەری دەشوبهێنێ، چون تەخت و بەخت و تاراجی زوحاکی خوێنمژی ڕووخاند و میللەتی کوردی لێ ڕزگار کرد. وەک دەڵێ:

ئومێدم وایە لاوە ئەتۆش هەروەکوو کاوە
لە بۆ کوردان هەڵبکەی ڕایەتی ئەتابوکی
منیش ئەوا ئەگریەم ڕۆڵە لە بۆ قەومی تۆ
هەموو جەرگ و هەناوم ئەوا هاتە سفت و سۆ

بەڕێز محەمەدی مەلاکەریم لەبارەی ئەو بلیمەتە پایەبەرز و زانا هەڵکەوتووە کوردەدا دەڵێ:

هەر لە گیانی بەرزی حاجییەوە ئیلهامی وەرگرتووە و خاوەن رۆشنبیرییەکی فراوان بووە ئاگاداری جیهانی دەرەوەی کوردستان بووە، شیعرە سیاسییەکانی بەڵگەن بۆ قسەکانمان. ئاگاداری بەرهەمەکانی"محمد عبدەو جمال الدین افغانی و گاندی هندستانی و سعدی زغلول میسری" بووە و ئەو کارە ناڕەوایانەی کە داگیرکەرانی وەکوو ئینگلیز و فارس و تورک و عەرەب بەرانبەر بە گەلانی جیهان دەیکەن، هەموو ئەمانەی بە وردی زانیوە. بەڕێز کەریم شارەزا لە بارەی بەڕێز جەنابی مەلای گەورەی کۆییدا دەڵێ:

شاعیر سەر بە دوو پەیڕەوی ئەدەبی بە یەکترەوە بەستراوە، کە پەیڕەوی بیر و روونکی یا زانست پەروەری و پەیڕەوی ڕیئالیزمی رەخنەگرییە.

بەڵێ جا منیش دەڵێم: بە تێکڕا دەتوانین بڵێین کە بەڕێز جەنابی مەلای گەورە کە بە هەق مەلایەکی گەورە بووە، ژنی زۆر خۆش ویستووە و پێشی وا بووە کە ئافرەت لە جیهاندا بە گشتی و لە کوردستاندا بەتایبەتی زێف و ستەمی لێ دەکرێ و مافی خوا پێداوی خۆی لێ زەوت دەکرێ، بە چاوی سووک و بێڕێزی جاو لێ دەکرێ، مافێکی کە بە پێی یاسای ئاسمانی و سروشت بۆی دانراوە لە هەموو راستان لێی زەوت دەکرێ.

جا هەر لەو کاتەشدا پێی وا نەبووە کە ئافرەت دەبێ بگەیەنرێتە پلە و پایەیەکی بالاتر لە ئی پیاو، یان یەکسان لە گەڵ پیاو. بەڵکە پێی وا بووە ئەویش هەروەک پیاو دەبێ لە ژێر فەرمانی خوادا بێ و یاسا و رێساکانی یەزدانی بە جوانی بەڕێوە بەرێ و

ڕێی خوا بۆی داناوە لێی لانەدات، وەک دەفەرموێ:

ژنیش وەک مـوزەککەرە، عەیـنەن ئەویـش بەشـەرە
چـاو لادانـی لە سـەرە، هەر دوو لە یەک حـوکم دان

مەلای گەورەمان هەرگیز وەک هێندێک کەسی بیر نەکردۆتەوە کە دێـنن ژن دەکەنە ئاغـا و کوێخـا و باڵاسـەری پیـاو و ئیتـر هەمـوو جـۆرە تازیـاری (امتیـاز)ێکـی پێـدەدەن و تەنـانەت دژی فەرمـان و دەسـتووری قورئـانی پیـرۆز کە دەفەرمـوێ: (الرجـال قوامـون علـی النساء= پیـاوان سەرپەرشـتیارن لە سـەر ژنـان) پیـاوی بێچـارە بە جـارێکی بـێدەسـەڵات دەکەن و دێـنن دە بەر دەسـتی ژنێـی دەنـێن. ژنـیش بـۆ هەمـوو شتێک ئـازاد دەکەن، کە دیـارە دەیـان و سـەدان خەراپەی لێ پەیدا دەبێ وشیرازەی بنچینەی کۆمەڵیش بە یەکجاری تێکدەچێ.

هەروەها مامۆستا نەک وەک هێندێکانیش بووە کە هەموو جـۆرە مافێکی لە ئافرەتی بێچارە زەوت دەکەن، بگـرە هەروەکـوو ئـاژاڵ و پاتاڵ و وەڵس (حیوان)ی لە پێنـووس دەدەن و هـیچ جـۆرە مـافێکی پێنادەن کە ئەوەش هەمووی هەر خەراپە و لە ڕێ لادانە. لە ڕاستیدا نە ئەویان و نە ئەمیان یاسـای خـودا و بەرنـامەی ئـایینی پیـرۆزی ئیسلام نین.

ئیـسلام ئـایینێکی ئاسـمانی میـانەڕەوی لایەنگـری ئـازادی و سەربەستییەکی ئەوتۆیە کە بافت و شایانی شـانی مرۆڤ بێـت، نە زێدەڕۆی تێدایە و نە کەمڕۆیـی. (نە افـراط و نە تفـریط) بەڵـکە لە نێوان ئە ودوو ڕێیەدا ڕێگایەکی مامناوەندی هەڵبژاردووە. ڕێگایەکی وایە کە ئەگەر لەوە پتر ماف بە ژن بدرێ سەردەکێشێ بۆ خەراپی و شیرازەی کۆمەڵ لە بەر یەک هەڵدەوەشێ و ئەگەر لەوەش کەمتـری

پێ بدرێ ستەمێکی زۆری لێ دەکرێ و هەر کۆمەڵێکیش ستەمی تێدا بێ کۆمەڵێکی گەندەڵ و رزەڵۆک و نەخۆشە و بەرەو لەناو چوون دەڕوا.

جا مامۆستای گەورەی خوا لێخۆشبوومان ئەو رێگا میانجییەی هەڵبژاردووە و بە کۆمەڵی کوردەواریش پێشنیاز دەکات و دەیهەوێ کە گەلە هەژارە لێقەوماوەکەی ئەو رێیە بگرێتە بەر.

ئەو بەڕێزە لە پارچە هەڵبەستی تەلاقدا پێمان دەفەرموێ: ژن خشڵ و جوانی بووکی رازاوەی جیهانە و ئەمانەتی خوای گەورە و خۆشەویستی پێغەمبەری مەزنی ئیسلام و قەلات و پشتیوانی پیاوەو ئیتر دەبێ رێزی راستەقینەی خۆی بۆ دابندرێ و مافی خودا پێداوی خۆی بدرێتێ. چونکە ژن دایکە و خۆ دایکیش یەکێکە لە دوو پایەی قایمی بنچینەی کۆمەڵ. هەر ژنە کە بەخێوکەر و پەروەردەکەری رۆڵە بەئەمەگەکانی گەل و نیشتمانە و هەر ئەوانیشن کە راگری ئالای ئازادی و سەربەرزی و سەربەخۆیی کۆمەڵ و زێد و ولاتن و هەر ئەوانیشن کە کار دەکەن و چەکەی مل دەکێشن و بە زەحمەت و هەوڵ و تێکۆشانی خۆیان گەل و نیشتمان راگیر و راوەستاو دەکەن دیارە کە دایکیش نەبێ رۆڵە نابێ.

کەوایە دەبێ چینی لاوتازە پێگەیشتووی گەل زۆر ئازا و نەبەزو دلێر و چاونەترساو و ژیر و هۆشیار و بەجەرگ وخۆڕاگر بێ، چونکە هەرگیز گیا و گوڵ و شیناوەرد لە زەوی بێپێز و کەمهێز و بێپیت و بەرەکەت باش نابێ و جوان گەورە نابێ، هەروەها بەرهەم و ئاکامی چاکی نابێ. زەوی دەبێ خزمەتی بکرێ و خاوەن زەوییەکە بە چاکی پێی رابگا دەنا خەلە و خەرمانی چاکی لێ هەڵناگرێ.

خۆ دایکێکیش ئەگەر بێت و سەرکز و دەربەدەر و بێرێز و نادڵ بە جێ بێ هەرگیز رۆڵەی ئاوای نابێ بەڵکە ئەوەی لێی دەبێ

کەسێک دەبێ کە چاو چنۆک و زەرد و چیلاز و ترسەنۆک و بێهێزو لاواز و بێبیر و ژیری دەبێ کە بێگومان ئەو جۆرە کەسانەش نەک هەر بە کەڵکی خۆیان و کۆمەڵەکەشیان نیەن و بەس بەڵکە دەبنە سەربار و ملۆزمی کۆمەڵ و لەباتی ئەوەی کە گەل و وڵات بەرەو پێش بەرن زۆریشی وە دوایە دەخەن.

بەڵێ مامۆستای گەورەی خوا لێخۆشبوومان خوای گەورە پلەوپایەی پەسلانی بەرزتر کات لۆمە و سەرکۆنەی کوردان دەکا و دەفەرموێ: ئێوە ئەی کوردانی مەرد سەبارەت بە ژنان بێباکن و ڕێزو حورمەتی ئافرەتان ناگرن و خزمەتی پێویستیان پێ ناکەن، هەر بۆیەش قەت دایکی چاکتان نییە، ئێوە چاو لە حاڵی خۆتان ناکەن و یەکیەتی و هاوپەیمانیتان نییە و وەک دڕک و دڕووی ناو عەردانن کە هەرگیز یەک ناگرن و هەمووتان هەر تیژ و بڕەرن!

هەروەها دەفەرموێ فێر کردن و پەروەردە و بارهێنان و گەورە کردنی منداڵ لە ئەستۆی دایکە و راستی ئەگەر دایکیش چاک نەبێ هەرگیز منداڵەکەی چاک نابێ چونکە گوتمان دایک وەکوو زەمینە و خوای گەورەش لە سوورەی ئەعراف ئایەی ٥٨ی قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێ: (و البلد الطیب یخرج نباته باذن ربه و الذی خبث لایخرج إلاّ نکدا) زەمینی چاک و پاک و بەهێز و پێز شیناوەردەکەی دێتە دەر و دەڕوێ بە ودم و یارمەتی خوا بە شێوەیەکی وا کە خودی جووتێرەکەی سەری لێی سووڕ دەمێنێ، ئەو زەمینەش کە وا خەراپ و ناپاک و بێهێز و پێزە زۆر بە کەمی نەبێ گیا و گوڵی لێ شین نابێ، کە دیارە ئەویش بێکەڵکە.

بەڵێ مامۆستای بیروڕای وایە کە دایک مامۆستای سروشتی منداڵە و هەر دایک بەرپرس و بەرگروان (ضامن)ی خووخدەی ئەوە و جگە لە خەرج و پیتاک و خواردەمەنی منداڵ باوک هیچی لە سەر

نییە و جا ئەگەر دایک چاک نەبێ و منداڵەکە چاک بـار نەهێنـێ لە دواییدا سێسەد فەرموودەی پێغەمبەری مەزنیشی بۆ وەخوێنی شوێن و چەخەری لـێ ناکـات. بەڵـێ جـا مەلای گەورە ئـا بەو جـۆرە دەفەرموێ:

ژن زینەتـــی دنیـــایە ئەمـــانەتی خـــودایە
حەبیبـــی مـــستەفایە قەڵاتـــن لە بـــۆ مێـــردان
ژن ئەگەر بە حـورمەت بـێ، بـێزیلـلەت و زەحـمەت بـێ
بە تەربـیە و خـزمەت بـێ، دڵگوشـاد و لێـو خەنـدان
کـوڕی دەبـێ وەکـوو شـێر ئاقـڵ و دانـا و دلێـر
بە دڵ غەنـی بە چـاو تێـر، سـەردار و مەردی مەیـدان
ژنێکـــی دەربەدەر بـــێ، دڵ پـــڕ غەم و کەدەر بـــێ
ڕەزیـل و دەسبەسـەر بێ، وەک مەحبووس لە ناو زینـدان
دەبـێ ئەولادی کـوو بـێ؟ بـێڕەوت و هەم بـێڕوو بـێ
مێـشکی وەکـوو کەدوو بـێ، ترسـەنۆک وەک یەهـوودان
دەرحەق ژنـان بـێبـاکن، بـۆیە بـێ داکـی چـاکن
سـەیری حـاڵی خـۆ نـاکەن وەک دڕکـن لە نـاو عەردان
تەربـــیە لە لای داکە داک چـــابێ ئەولاد چـــاکە
بـاب لە ئەسـڵا بـێ بـاکە فەرقەکـی ناکـا چەنـدان
کە داکـی چـاکی نەبـێ دووسـەد حەدیـسی نەبـێ
چلـۆن تەئـسیری دەبـێ وەک پـف لە پوتـک و سـندان
وەزیـــفەی زۆر گەورەیە دەزانـــی ئەویـــش چەیە؟
منـداڵ بـوون و تەربـیە بـێمەسـخەرە و جـوێن پـێ دان

مامۆستا گیوی موکریانی دە لاپەڕەی یەکی پێشەکی دیاری مەلای کۆییـدا کە لە چاپخـانەی کوردسـتان لە هەولێـرێ چـاپ کـراوە،

دەفەرموێ:

بەهەشتی مەلا محەمەدی کۆیە جەلی‌زادە بەناوبانگی کۆیی ناوی محەمە د کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵڵا کوڕی حاجی مەلا ئەسعەد کوڕی مەلا عەبدوڵڵا کوڕی مەلا عەبدوڕەحمانە.

پڕشنگێکی هەرە گەورە و ترووسکەدارە لە بنەماڵەی خانەدانی زانستیی جەلییە، کە بە درێژایی ۳۰۰ ساڵان لە شارۆچکەی کۆیەدا خەریکی بڵاو کردنەوەی هونەرەکانی زانستی و خوێندەوارییەتی بوون.

بەهەشتی حاجی قادری کۆیی لە نامەیەکیدا کە لە ئەستەمبووڵەوە بۆ حاجی مەلا عەبدوڵڵای جەلی نووسیوە ددانی بە بەرزییەتی پایەی ڕاژەی زانیاری وان داناوە و فەرموویەتی:

به غەیری جه د دی ئێوه کێهه یه دا نا ؟!
له کورد ستا ن بنا غه ی عیلمی دا نا

زانای کوردستانی خۆشەویست لە ساڵی ۱۲۹۳ک لە کۆیەدا پێی ناوەتە کۆڕی ژیانەوە و لە تەمەنی ٥ ساڵانەییدا ڕەوانی پاکی دایکی رووی لە وڵاتی خامۆشان کردووە. ئیتر تەنها باوکی پەروەردەی دەکرد و سەبارەت بەزرینگی و هۆشیاریەتی زۆری خۆش دەویست و پێیەوە ماندوو بووە، هەر لە تەمەنی پێنج ساڵانەییەوە لە لای موستەعیدەکانی باوکی دەستی بە خوێندن کردووە، پەرتووکی الخادمی تەواو کر کە یادگاری مەلا عەبدوڕەحمانی جەلی‌زادەی باپیریەتی.

قۆناخی فەقێیەتی (سوختایەتی) بە ساڵ و نیوێک بڕیوە و لە تەمەنی ١٤ ساڵیدا باوکی وانەی پێ دەگوت، لە تەمەنی ١٨ ساڵیدا دەستووری کۆتایی خوێندنی وەرگرت.

چارەنووس وای کرد کە خۆی وانەی بە مامۆستایەکانی خۆی دەگوتەوە و لە پێش ئەوەدا کە تەمەنی بگاتە ١٩ ساڵی دەستووری کۆتایی خوێندنیشی دانی. کە لە ١٣٢٦دا باوکیشی رووی لە وڵاتی خامۆشان کرد سەرناوی سەرۆکی زانیاران (لقب رئيس العلماء)یی بۆ وی مایەوە و هەر بەو هۆیەوە کە بە مەلای گەورە ناو براوە.

لە ساڵی ١٣٣٤ای کۆچیدا بوو بە ئەندامی جڤات (مجلس) وڵایەتی موسڵ.

هەروەها ئەو بەرێزە دە لاپەڕەی سێی(٣) هەمان پەڕتووکدا لە بارەی ئەو هۆزانە پسپۆڕ وبلیمەتەدا دەڵێ:

مەلای گەورە هەر لەمنداڵییەوە هەوەسی لە هەڵبەست دانانی بووە و لە زۆر لایەنانەوە بە هۆنراوە دوواوە، بەڵام لە رووی ئەوەوە کە لە دەریای زانیارییاندا گەیشتبووە بەرزترین پلە، زانایییەکەی بە سەر بویژییەکەیدا زاڵ بووە، ئیتر هەمیشە هەر خەریکی وانەوێژی و پەڕتووک دانان و ئامۆژگاری کردن بووە. کاتێکی وای نەبووە کە بە پوختی خەریکی هەڵبەست دانانبێ بێت هەرچەندە هونەری هەستیارییەتی هەر لە منداڵییەوە لە باوکی و مەنفی و حاجی قادر و کەیفی و شێخ رەزا فێر بوو و لە گەلێک لایەنانەوە هەڵبەستی داناوە، بەڵام هەڵبەستە نیشتمانییەکانی لە هەموان پترن.

دیسان هەر مامۆستا گیوی بەرێزمان لە لاپەڕەی ٤ هەمان کتێبدا سەبارەت بە مەلای گەورەی کۆیی، کە زۆر جێی خۆیەتی ئێمە بڵێین مەلای گەورەی کوردستانی، دەفەرموێ:

ئەو زانا گەورە بلیمەت و هەڵکەوتووە بە مێشکێکی رووناک و گیانێکی پاک و ئازا و ئازادی پەرستانەوە کەوتە ناو کۆمەڵێکی

نەخوێندەوار و دیل و ژێر دەست و دواکەوتووی ڕێ لێ گۆڕاو، کۆمەڵێکی خۆخۆری بێگانە پەرست و حەفتا ڕەنگ، کۆمەڵێکی کە لە ترسی جرجاڵی دەلەرزی، بە ئومێدی هاتنەی خواری عیسا و دەرکەوتنی مەهدی دەگەشایەوە و دەستی بۆ هیچ کار و پیشەیەکی نەدەچوو، کۆمەڵێکی کە پشتی لە مەلا و مزگەوتی خودا و ڕووی لە شێخ و تەکیە و خانەقا کردبوو.

ئەویش بەو هەموو زانیاری و ئاییندار و خودا پەرستییەوە لە بەرامبەر ئەو هەموو کارەساتە بێجێیانە خۆی پێ ڕانەگیراو نەیتوانی چاویان لێ بپۆشێ و قۆڵی مەردانەی لێ هەڵماڵیوە و بە پێچەوانەی هەموو جۆرە ناکۆکی و ناڕێکی و ناڕەوایی و کۆلکە مەلاو بەدکردارێکییەوە بە بێ کۆڵ دان ڕاوەستا و بەربەرەکانی کردوون.

دووبارە مامۆستای گیوی خوا لێی خۆشبێ لە لاپەڕەی ٧٤ دیاری مەلا محەمەدی کۆییدا ئاوا دەفەرموێ:

مەلای گەورە نەک تەنها هەر بەسەر زانیارییە کۆن و نوێیەکاندا ئاگادار بووە و بەس، بەڵکوو بە سەر پێشکەوتنی زانیاری کۆمەڵایەتییە پێشکەوتووەکانیشدا شارەزا و لایەنگریشیان بووە. لە ناو وانەکانیشیدا باسی زانیارییەکانی کۆن و تازەی دەکرد و زۆر دژی ئەو پەڕتووکە درێژانەی وەکوو (صرف و نحو) و ئی تر بوو کە فەقێیان تێیاندا پیر دەبوون و سوودێکی واشیان نەبوو، بۆیە بە بەرژەوەندی دەزانی کە کورت بکرێنەوە و چتی نوێیان لەگەڵ بخوێندرێ هەر وەک فەرموویەتی:

عیلمی تەبیعەت عیلمی خودایە
قال و قولە گشتی هەبایە

عیلمـــــــــی کیمیــــــــات گەر نەخوێنـــــــــدووە
بە خـــــوا نـــــازانی خـــــوا چـــــی کـــــردووە؟

جـا ئـا لێـرەدا منـیش دەڵـێم: دەڵـێن مامۆسـتا خـۆی هەمیـشە دەیفەرموو من ئەگەر سێ مەلام لە تەواوی کوردستانی گەورەدا بـۆ حـاڵی کرابـان، سـێ پـارچەی کوردسـتانم سـەربەخۆ دەکـرد، بەڵام ئەمن دەڵـێم: سێ مەلای وەکـوو مەلای گەورە، نەک مەلای نـامەلا و بەڵا یان نیوە بەڵا!!

مامۆستا گیـوی موکریـانی لـە لاپەڕەی ١ دیبـاچەی دیـاری مەلای کویەد الە بارەی ئە و هوزانـە زۆرانـە دائـاوا دەنوسـی: جەلـی زادە بەناو بانگی کۆیی نـاوی (محمـد) کـوڕی حـاجی مەلا عبداللـە کـوری حاجی مەلا اسعد کور ی مەلا عبدالله کوری مەلا عبد الرحما نی یە. پرشە نگیکـی هەرە گەورە و تروسکە دارە لە بنەمـاڵەی خـانەدان و زانستی (جە لی)یە کە بەدریژایی ٢٠٠ سالان لـە شـارۆچکەی کۆیەدا خەریکی بڵاو کردنەوەی هونەر و زانست و خویندەوارییـن. بەهەشتی حـاجی قـادری کـۆیی لـە نـامەیەکی دا، کـە لە ئەسـتەمبوڵەوە بـۆ حاجی مەلا عبـداللەی جەلـی نوسیوە ددانـی بـە بەرزییەتـی پـایەی راژهی زانیاری وان داناو فەرمویەتی: بەڵێ حاجی مەلا قـادرە کـۆیی سەبارەت بە یە کگرتوویی کوردان بیر و ڕای ئەوەیە کە دەرفەرموێ:

ئیتیفاقە دلبەریکی بی کـــەدەر حاجی ئە نواعی لیباسی کردە بە ر
بێ جیاز مارەیی دەیدا بەشــــو لە کوردانە داخوازی نەبـــــــو

هەروەهـا لە بـارەی بنەمالـە گەورەی مەلای کوییـشدا بیـر ورای ئەوەیە کە وەک باسمان کرد لەنامەیەکدا کە لـە ئەسـتەمبولی ڕا بـۆ

بەڕێز حاجی مەلا عەبدوللای با بی ماموستای کویی نوسیویەتی :

بـە غـە یـری جـە ددی ئیـوە کـی هـە یـە دانـا
لـــە کوردســـتان بناغـــە ی عـــیلمی دانـــا

دیارە کـە ئەوە بیـرورای زانـا و هـونەریکی هونەرمەنـدی کـوردی کوردستان خوازی وەک ڕیزدار حاجی قـادری کـۆیی لەبـارەی مەلای کـۆیی و بنەماڵـە بەڕێـزەکەی دا ئەوەیە کـە دەفەرمـوی جگـە لـە بنەمالە وباب وپیرانی ئیوە چ کەسیک بناغە وبنچینەی ساختومانی فیرزانیاری لەزێد ونیشتمانی کوردەواریدا داناوە و ئیتر هەر باب و بـاپیرانی ئیـوە بـوون، کـە زانـست و فیریـان هێناوەتـە وڵاتـی خوشەویستی کوردستان. دیسان ڕیزدار مامۆستا گیـوی موکوریـانی لە لاپەرەی(٦) دیبـاچەی دیـاری مەی کـویی دادە فەرمـوی : زانـای دلسوزونە بە زبی گومان لە هەستی پـاکی حـاجی قـادری بـرادە ری باوکی بەهرەوەر بووە ؛ بەڵام تاسـالی ١٩٢٣بـە کـردەوە ووتـو ویـژ تەنیا خەریکی بە ربە رە کا نی شیخ وتە کیە وخانە قاوکولکە مە لایان بووە ، چونکو زوررقی لەوانە بوو کە ئا یین دە شێوینن و لە پەنـای ئـایینی پـاکی ئیـسلامدا کـارانی بـێ جـێ و نـا ڕەوا دەکەن و هەژاران دەروتێنـــنەوە، بەو هـۆیەوە چەنـد هـۆیەکی تـرەوە زۆر نەپرژاوەتـــە ســـەر ئەوەی کـــە ئـــاوڕیکی تەواو لـــە نیـــشتمانە دابەشکراوەکەی خۆی بداتەوە .وە هەر ئەو خوشەویستە لە لاپەڕەی (٤) هەمـــان کتیـــب دا دەفەرمـــوی : ئەو زانـــا گەورەو بلیمەتـــە هەڵکەوتووە بەمێشکیکی ڕوناک وگیانیکی پاک وئازادی خوازانەوە، کەوتە ناو گەلێکی نەخوێندە واروديل وژێردەست ودواکە وتـووری لـی گوراو؛ کـومەلیکی خـو خـوری بیگانـە پەرستی حەفتا ڕەنـگ ؛ کومەڵێـک کـە لەترسـی جرجـال دەلەرزی و بە ئومێـدی هاتنـە

خوارەوەی عیسا و دەرکەوتنی مەهدی دەگەشایەوە دەستی بۆ هیچ کارو پیشەیەکی نەدەچوو؛ کومەڵێک کە پشتی لە مەلاو مزگەوتی خودا و ڕوی لە شێخ و شەیتان و بێگانە کرد بو!! ئەویش بەو هەمو زانیاری و ئاییندارى و خودا پەرستی یەوە لە بەرابەر ئەو هەمو کارەساتە بێ جێ یانە خوی پی ڕانەگیراو نەیتوانی چاویان لی بپۆشی، قولی مەردانە ی لی هەڵماڵی و بەپیچەوانەی هەموجۆرە ناکۆکی ونا ریکی ونارەوایی وکۆلکە مەلاو بەدکرداریکی یەوە بەبێ کۆڵدان و ڕاوە ستان بەر بەرەکانی کردن.

# گۆشە یەکی دی لە ژیانی پڕ لە ژانی رامیاری و کۆمەڵایەتی مەلای گەورە

تەنانەت هەر مرۆڤێکی ئاساییش لەو جیهانە پان و بەرینەدا خاوەنی ژیانێکی پڕپڕە لە بەرزی و نزمی، تاڵی و تووشی،شادی و خۆشی، خەم و کوڵ و دەرد و پەژارە، سەرکەوتن و ژێرکەوتن، هیوا و ئاوات، تاسە و ئارەزۆ، رەنگاوڕەنگی و جۆراوجۆرییە و ئیتر هەر لە بنیشڕا بە پێی یاسای سروشت ودەستوری خوا (سنة الله) ژیانی هەر گیانلەبەرێکیش هەر ئاوایە و خاوەنی گەلێک لایەن و رەنگ و دیمەنە، ئیتر هەر لە ماکا رەنگینی و جوانی و شیرینی و خۆشی و تام و چێژەی ژیانیش هەر لەو رەنگاوڕەنگی و جۆراوجۆرییەدایە و بەس.

جا لە نوکیشا هەر ئەوەش خۆی یەکێکە لە نیشانە و دیاردەکانی یەزدانی(آیات الله) هەروەک خۆی لە ئایەتی ٢٢ی سوڕەی الرومی قورئانی پیرۆزدا دەڵێ: (و من آیاته خلق السموات و الارض و اختلاف السنتكم و الوانكم ) واتا: دروس کردنی ئاسمانەکان و زەمین و جیاوازی و جۆرا و جۆری و رەنگاوڕەنگی رەنگەکانی ئێوە و هەروەها جۆراوجۆری زمان و زاراوەکانی ئاخاوتنتان هێندێکە لە دیاردە و نیشانەکانی خوای گەورەتان. جا ئێمە ئەگەر کەمێک بە جوانی سەرنج بدەین و لە مەبەستەکە ورد بینەوە، بە چاکی بۆمان دەردەکەوێ کە مرۆڤ هەروەک شێوە و بیچمی لەش و جەستە و ئەندامی و رەنگی رووی و روومەتی و دەنگی زار و زمانی و زاراوەی گفتوگۆی جیاوازە و رەنگاوڕەنگ و جۆراوجۆرە، خووخدە و ژیان و بەسەرهات و رابواردنەکەشی هەر وایە.

داخەوە ئـــا لەو حـــاڵەت و ژیـــوارە دژوارانەدا نە کەس هەبـــووە ئـاوڕێکی دڵـسۆزانەی وە سـەر بـدا و کەمێـک ئەو ناسـۆر و زام و کەوەنانەی بۆ تیمار بکا و هەتـوانێکی هێدی کەرەوەی بـۆ لە سـەر دابنێ و هەروەهـا نە ئـاوپرژێنێکیش هەبـووە کە دڵـۆپە ئـاوێکی بـۆ لەو ئـــاورە بەتەوژم و بڵێـــسەدارەی دڵ و دەروونـــی پـــڕ کـــوڵی بپرژێنێ.ئەو دڵسووتاوە لێقەوماوە لەو کوردستانە پان و بەریـنەدا لە دوو بـــرای کـــوردی مەردی بە شـــەرەفی هۆشـــیاری دڵ بێـــداری ئەویینداری کوردستان (مامۆستا داماو و مامۆسـتا گیوی موکریـانی) هیچ کەسێکی دیکەی گومـان نەبـردووە کە بتـوانێ بە تەواوی گرێـی دڵـی خـۆی لە لا وەکـات. بەڵام هەر کاتێـک پـۆرگی دڵـی خـۆی بە پـــارچە هەڵبەســـتێک دڕیـــوە و گرێـــی دەروونـــی بە هـــۆنراوەیەک کـردۆتنەوە، پـێش بـڵاو کـردنەوەی نـاردوویەتی بـۆ ئەو دوو بـرا بەشـــەرەفە کە زانیـــویەتی ئەوان زۆر بە چـــاکی هەڵیـــدەگرن و دەیپـــارێزن و لانـــی کەم لە داهـــاتوودا ئەوان کـــارێکی وا دەکەن کە بەرەی داهــاتووی گەلـی کـورد کەڵکـی بـاش لە بیـر و راکـانی وی وەربگـرن. کە بەڕاسـتی کردیـان و خـوای گەورە پاداشـی باشـیان بـداتەوە. مەلای گەورەمـــان لە دەورانێکـــدا ژیـــاوە کە ســـەردەمی سەرکەوتنی نەزانی بەسەر زانیاری و نارەوا بە سەر ڕەوا و تەکیەو خانەقا بە سەر مزگەوتی ئیسلامی و شێخ بە سەر مەلای جێنـشینی پێغەمبەرﷺدا بووە بەڵێ، ئەودەم چاخێک بـووە کە دوو تەریقەتـی قـــادری و نەقـــشبەندی تەواوی کوردســـتانی گەورەیـــان لە نێـــوان خۆیـاندا دابەش کردبوو و وردکە تەریقەتەکـانی دیـکەش هەرکـام لە گۆشەیەک بەشی خۆیان بڕدابوو. تەنانەت ئەو کەسەش کە لایەنگـر راستی و ئایینی پاک بوو نەیدەتوانی و نەیـدەوێرا کە ڕاشکاوانە و بە ئاشکرایی بیروڕای خـۆی دەرببـڕێ و نەیـاری و دژایەتـی خـۆی

رابکەیەنێ. وەک مامۆستای گەورە پەرچەمی خەبات و بەربەرەکانی لەگەڵ پڕ و پووچ پەرستی لە مەیدانی مەردایەتی بچەقێنێ.جا مەگەر دلێر و بوێر و بەجەرگ و باوەڕ و پۆڵایینێکی وەک مەلای گەورە کە بە ئاشکرا هەموو کەس سامی لێ دەکرد و لێی دەترسا و خاوەنی پلەوپایە و ڕێزێکی تایبەتی بوو لە نێو تەواوی خەڵکا و تەنانەت بگرە فەلە و جوولەکە یش هەر ڕێزێکی زۆریان بۆ دادەنا. ئەو چاخیش هەروەک ئێستا زۆران زۆر تێبینانە و ترسەنۆکانە جاروبارە لە ترسی خوا یا لە ترسی لۆمەی ویژدان جۆرێک بیروڕای ڕەوای تێکەڵ بە ناڕەوایان دەربڕیوە و بۆ نموونە گوتوویانە (ئێمە نەیاری هەموو شێخێک نین و هەر لە گەڵ شێخە خەراپەکانمانە)، بەڵام مەلای گەورە بە تێکڕایی بە بۆمبای بەتەوژمی هۆنراوە جوانەکانی بۆمبارانی کردوون و گوتوویەتی:

هە تا شێخێک لە کوردستان بمێنێ
ئومێدی زیندەکانیت پێ نەمێنێ
بە ریشی پان وپرچی پڕ لە ئەسپێ
بناغەی کاری کوردان چون دە چەسپێ ؟!
بە کەشکول وسوال و فەقرو زیلەت
مەحالە کاکی خۆم تەشکیلی دەولەت

ئەمجا بەتایبەتی ڕووی چەکە ستەمکوژەکەی هۆنراوە ئاگرینەکانی لە دوو نەیاری زۆر دیاری سەرەکی گەل و زێدەکەی کردووە و هەردوکیان بە نەیاری گەل وریشە کیشی ژیانی خەلک لە قەلەم دەدا وبەخەلکیان دەناسینی و بەئاشکرایی و بێترس دەڵێ:

تەریقەی قادری و نەقشبەندی
بە بای دا ڕەونەق و ئاهەنگی کورد

لــــە وان و ئـــە رزە روم تـــا حـــە ی جافـــان
تــە وە لــلا بــو ن لــە عــە قــل وعــيلم وعيرفــا
بــە وی شــول وبــە وی عــە قــل و تــە ميــزی

موحە ققی قەومی کورد نايێتە ريزی مامۆستا لە ساڵی ١٩٢٤زدا بە ڕووڵێنانی خەڵک قبووڵی دەکا کە ببێتە ئەندامێکی جڤاتی دامەزرێنەری عيراقی (مجلس التاسيس العراقي) لە بەغدا و بە نوێنەری هە رێمی موسل هەڵبژێردراوە و بە شێوەیە کی زۆر ماقووڵانە و داب و دەستوورێکی زۆرگرینگ بەڕێ کراوە بۆهەولێرولەوێشەوە بۆ بەغدا.گوایا مامۆستای بەڕێز لە کۆڕی دامەزرێنەریدا هەوڵین هەنگاوی بۆ کورد و کوردستان هاویشتووەو لە پێش هەمو شتێکدا مەسەلەی کوردی کێشاوەتە پێش و لە نێو نوێنەرەکاندا باسی لێ کردووە. لەو کاتەدا کە ئەو بەڕێزە لەو کۆڕەدا نوێنەر دەبێ سەردانێکی مەلیک فەیسەڵی هەوەڵ دەکا و مەلیک زۆری ڕێز بۆ دادەنێ و داوای لێ دەکا لە کاتی پشوودانی هاوینەدا وانەی ئايينی و عەرەبی پێ بڵێ و مامۆستاش بەڵێنی پێدەدا و بڕيار دەدەن کە بۆ ئەو کارە لە شاری کۆيە لە مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد کە بە لەباری دەزانن فێرگەيەکی شياو دروست بکرێ و مەليک سێ مانگەی هاوينێ لەوێدا بێ و مامۆستاش بچێ و وانەی پێ بێژێ.بەڵێ مەليک پارەيەکی زۆر دەنێرێ و فێرگەکە دروست دەکرێ لە ساڵی ١٩٢٥ز، بەڵام گۆيا لە بەر گيروگرفتی هەرێمی موسڵ، مەليک بۆی ناکرێ هاوينەکەی بێتە کۆيە و نامەيەکی جوانی لێبوردنخوازی لەگەڵ چەندين پەڕتووکی چاکی کەم وێنە بۆ مامۆستا دەنێرێ. بەداخەوە نامەکەم دەس نەکەوت تا تۆماری بکەم.مامۆستای بەڕێز ناهێڵێ ئەو فێرگەيە چۆڵ و خاڵی

بمێنێتەوە و قۆڵێک لە فەقێکانی خۆی لەوێ دادەنێ و چەندین فەقێی هەر لە و حوجرە پیرۆزەدا بە پوولی مەلیک فەیسەڵی هەوەڵێ کە بۆ ویش دروست کرابوو پێ گەیاندون و ودمی مەلایەتی پێداون بۆ نموونە یەکێک لەو فەقێیانە، کە لەو فێرگەیەدا پێگەویون و لە خزمەتی مامۆستای بەڕێز ودمی مەلایەتییان وەرگرتووە مەلا ئەحمەد مەلای مزگەوتی (زێوە و مزورکا)ی شاری ئامێدییە کە لە ساڵی ١٣٤٦ کۆچی مانگی و ١٩٢٧ زایینی کۆڕێکی یەکجار زۆر جوان و باشی بۆ گێراوە و ودمی مەلایەتی پێداوە.

جارێک پێش ئەو رووداوەی سەرێ کە بە داخەوە بەروارەکەیم بۆ روون نەبۆوە مەلیک فەیسەڵ دێتە هەولێر و زانایان و پیاو ماقووڵان و گەورە گەورەکانی هەرێم بۆ پێشوازی و گوێ گرتن لە مەلیک بانگ دەکرێن.

بەڕێزان مەلای کۆیی و مەلا ئەفەندیش کە لە تیپی بانگ کراوان دەبن لە باداوەوە دێن بۆ پارێزگاری هەولێر سلاوێکیان لێ دەکا و خۆی وە پێشیان دەکەوێ و دەیهەوێ بڕوا و ئەوانیش بە دوایدا بێن، بەڵام مامۆستای کۆیی پیلی دەگرێ و دەیهێنێتەوە دوایە و دەڵێ جارێ نۆرەی ئێمەیە و تۆ مافی ئەوەت نییە وە پێش زانایانی ئایینی بکەوی.

موتەسەڕیف دەڵێ ببوورن من بۆ بەڵەدی پێشکەوتم و گوتم نەوەک شارەزا نەبن. مامۆستاش دەڵێ ئێمە زۆر چاک شارەزاین سوپاست دەکەین. جا ئەمجا ماموستا کە نۆرە قسەی دێ زۆر بە چاکی لە قسەکانیدا هەڵدەکوتێتە سەر مەلیک و گەلێکی رەخنە لێ دەگرێ و زۆر باش و بێترس دەیشێلێ هەروەک هەڵمەت بەرێتە سەر کەسێکی کەمتر لە خۆی...

جارێکیان لە وتاری ئێوارانەی ڕەمەزانی خۆیدا قسەیەک لە عەبدولقادری گەیلانی دەگێڕێتەوە و ناڵێ شێخ عەبدولقادری گەیلانی بەڵکە دەڵێ مەلا عەبدولقادری گەیلانی. هێندێک لە خەڵکە ناحاڵییەکە وەدەنگ دێن و مشتومڕیان لێ پەیدا دەبێ و گۆیا نەقاییلەتی خۆیان دەردەبڕن و قسەکە بە مامۆستا دەگاتەوە.لە ئێوارەیەکی دیکەدا باس و قسەکە بۆ ئەو جێیە دەکێشێتەوە و دەیباتەوە سەر مەسەلەی پێشوو و دەڵێ بیستوومە هێندێک کەس لێیان گران هاتووە کە من لەبارەی غەوسی گەیلانیدا گوتوومە مەلا عەبدولقادری گەیلانی. بەڵام با بزانن کە ئەوەی لەویەوە بۆ خەڵک کەڵکی هەبێ مەلایەتی و زانیارییەکەیەتی، کەشف و کەراماتی ئەگەر هەبووبێ لەگەڵ خۆی بەسەر چوون و مەلایەتیش ناوێک نییە نە بۆ غەوس و نە بۆ لەویش بالاتر هیچ کەمایەتیەکی تێدا بێ، چونکە مەلایەتی واتا زانایەتی و ئەویش خوا لێی رازی بێ پیاوێکی زۆر زانا بووە و من نامهەوێ چکۆلەی بکەمەوە و ئەگەر ئەو کەسانەی بەوە رازی نین من لەوە بەولاوە دەڵێم مەلاخوا!! واتا خواش هەر مەلایە چونکە زانایە.

بەڵێ مامۆستا مەلایەتی پێ لە هەموو پلە و پایەیەک گەورەتر و باڵاتر بووە چونکە مەلا جێنشینی پێغەمبەرە و تازەش کە هیچ کەس نابێتەوە بە پێغەمبەر و گەورەترین شانازی جێنشینی پێغەمبەرە دروودی خوای لەسەر بێ.

هەروەها پیاوێکی زۆر دەخۆڕادیو و بێمنەت لە خەڵک بووە و ویستوویەتی هەمیشە بە زەحمەتی خۆی بژی و هەرگیز چاوی لە شتی خەڵک نەبووە و قەتیش نەیویستووە لەبەر دەسەڵاتداران وەپاڕێ و لێیان مەمنوون بێ تا کارێکی بۆ بکەن یان شتێکی بدەنێ گۆیا جارێکی لە چنارۆکی خەڵکێکی زۆری لێ میوان دەبێ و شەوی

کە بۆ شەونشینی دادەنیشن لە نێو قساندا پێی دەڵێن تۆ بۆ سەفەرێکی بەغدایە ناکەی خۆ دەوڵەت هەر خوا خوایەتی کە تۆ داوایەکی لێ بکەی.

ئەویش لە وڵاما دەفەرموێ: واللە و باللە و تاللە ئەگەر بە نووکی وەکازەکەم ئاوراکێشم بۆ نێو باخ و دەبن دارێکی بکەم گەڵێکم پێ چاکتر و شەرافەتمەندانەترە لەوەی کە لە بەردەرگای مەلیک یان سەرەکوەزیر یان کەسێکی دیکە داوای روخسەتی چوونە ژوورەوە بکەم.

جا پاشان ئەو هۆنراوەیان بۆ دەخوێنێتەوە:

شاهی کە نەبێ رادەبوێرین بە فەقیری
بۆ ئەهلی قەناعەت لە پلاو خۆشترە داندۆک

چناڕۆک هاوینە هەوارێکی زۆر خۆش و لە چاو مەڵبەندەکە گەلێک فێنکترە لە قەدی کێوی بەرزی هەیبەت سوڵتانیدا هەڵکەوتووە ورێگای لێک بەستنی شارەکانی کۆیەو چوارقوڕنە و رانیە و قەڵادزێ و سەردەشت و بەتێکڕا بەشێکی زۆری کاروانی کوردستانی گەرمێن و کوردستانی کوێستانێ بەوێدا تێپەڕ دەبوو. خودی چناڕۆک خۆی بریتییە لە دوو بەش. چناڕۆکی بڵباسان و چناڕۆکی مەلایان. چناڕۆکی بڵباسان کەوتۆتە لای باکوور و ئەگەرچی پتر لە چەند کیلۆمەترێک لە کۆیە دوور نییە و بە پێیان هەر تەنیا رێگەی ٤٠ –٥٠ وردیلەیەک دەبێ و بەس، بەڵام لە شاری رانیە پتر لە رێگەی حەوت کاتژمێرە لە سەر رانییەیە و ئەوەش بە هۆی ئەوەیە چونکە تیرەی بڵباس زۆرتر هەر لە مەڵبەندی پژدەر و بیتوێنێدا ژیاون و ئەوێش ملکی وان بووە.

بەڵام چنارۆکی مەلایان، کە لە لای باشوور هەڵکەوتووە و زۆر باشتر و خۆشتر و ئاوەدانترە لە چنارۆکی بڵباسان و چاکتر پێی راگەیون. ئەو مەڵبەندە باغ و رەز و زەوی و زار و مووچە و بەرەی زۆری لێیە و کانی و سەرچاوەکانی هەموو ئاوەدانن و هاوینان چەند هۆبەی لێ پەیدا دەبن و خاوەن مڵکەکان بە هەوار و هەروەها بۆ رەنێو هێنانی زنجاتەکان و رەز و باخەکانیان دەچنە وێندەرێ و تا پاییزێکی درەنگ لەوێ دەمێننەوە. کە مامۆستای بەرێزیش لەگەڵ ئەو خەڵکە وێڕای فەقێکانی هاوینان چۆتە وێ و دەستی کردووە بە وانەوێژی و موتالا و نووسەری.

کێوی هەیبەت سوڵتان زنجیرە کێوێکی بەرز و بڵیند و باریکە کە لە پشتی سماقان و نێزیک دەربەندی دووکانێ ڕادەس پێدەکا و درێژ دەبێتەوە و تا لە شاری کۆیە و لە دەشتی کۆیەش تێدەپەڕێ و لەو دیوە و دیوان واتا بە دیوی کۆیەشدا و بەو دیوی رانیەشدا لە قەد و داوێنی کێوەکە گەلێکی دێهات لێ هەڵکەوتوون. بێ لە چنارۆک دەتوانین بۆ نموونە ئاماژە بە گوندەکانی گەلی گوڵان و کانیکەندو پێبازوک بە دیوی کۆیەداو کانی وەتمان و کانی مازوو و سماقان و باقلانە و شارۆچکەی خەلەکان و هتد بە دیوی رانیەدا بکەین. کە دەتوانین لە نێوی خەلەکان یادی بەرێز ناوداری کورد ئیبنو خەلەکان و لە نێوی باقلان یادی گەورە پیاوی ئایینی مەلا ئەبووبەکری باقلانی بکەین کە ئەمیان خەڵکی خەلەکان و ئەویشیان خەڵکی گوندی باقلانێ بووە و منیش چوومەتە هەر دووکیان و بە چاوی خۆم دیتوومن.

ڕەمەزانێک بە فەقێیەتی لە گوندی کانی وەتمانێ بووم لە گەڵ فەقێکانی ئاواڵم بە یادی مەلا ئەبوبەکری باقلانی سەردانێکی باقلانێمان کرد ڕەمەزانێکیش لە سەردەمی شۆڕشە پیرۆزەکەی مەلا

مستەفای بارزانی خوا لێی خوش بێ لە خودی خەلەکانێ مەلا ڕەمەزانی بنکەی پێشمەرگەکانی لقی ٧ هێزی فارس باوە بووم و ئەو مانگە ڕەمەزانە لەگەڵ ئەو پێشمەرگانە و جا بەتایبەتی فەرماندەی لق کاک گوڵەباخ زۆر بە خۆشیم بردە سەر، یادی بەخێر.لێرەدا پێم خۆشە ئەوەندەبڵێم کە هەموو کەس دەبێ ئەوەندەی بزانێ کە لە کاتی مەلا مستەفای ڕەحمەتیدا پێشمەرگە ئاوا دیندار و خواپەرست بوون کە لانی کەم مانگی ڕەمەزانێ مەلایان ڕادەگرت بۆ ئەوەی ئامۆژگارییان بکات و ڕێگەی ئایینییان پێێ بڵێ. لە بیرمە ئێوارەیەک پێشمەرگەکان و فەرماندەکەیان کاک گوڵەباخ هاتنە لام بۆخواحافیزی و ماڵاویی و داوای نزای خێریان لێ کردم و گوتم دەچن بۆ کوێ؟ گوتیان هەتا نێینەوە ناکرێ پێت بڵێین دەبێ ببەخشی. گوتم خواتان لەگەڵ سەرکەوتوو بن.

بەیانی کە لە خەوێ هەستام دیتم هەموویان هاتوونەتەوە و گەلێکیشیان کەلوپەلی سەربازی لەگەڵ خۆیان هێناوە. جا ئەو جار دیتم بۆیان گێڕامەوە کە ئەوشۆ چوونەتە سەر مەخفەری گەورەی شاری کۆیە و بڕیار وا بووە کە لەگەڵ بانگی خەوتنان ئەوانیش لە سەربانی مەخفەرەکە وێڕای بانگی مزگەوتەکانی شار بانگی بڵێن و سوپاس بۆ خوا ئەو کارەشیان کردووە و بە دەستێکی پڕیشەوە گەڕاونەتەوە.

بەڵێ پێشمەرگەی مەلا مستەفا ئاوا بوون و بەڵام وەک ئێستا دەبیستم دەڵێن زەمین تا ئاسمان جیاوازی هەیە!! گۆیا ئەو کەسەی خۆی پێ گەورەی پێشمەرگەیە شەقی لە مزگەوتێ هەڵداوە و گوتوویەتی "تا ئەو کلێسەخانەمان لە نێو بێ قەت سەرکەوتن بۆ ئێمە نابێ" یان دەڵێن سکرتێری زلهێزێکی کوردستان گوتوویەتی: "دەبێ ئەگەر ڕۆژێک ببێ و سەرکەوین وشترێک لە عەرەبوستانێ ڕا

بێنین و ئەو قورئانانە هەموو خڕ کەینەوە و لێی بنێین و بەرەو عەرەبستان بەڕێی کەینەوە و ئیتر نابێ تەنانەت کەری کوردستانیشی لێ خەسار کەین".

جا من لێرەدا نامهەوێ کە هیچی لە سەر بنووسم بەڵام هەر ئەوەندە دەپرسم دەبێ ئەوانە بەو جۆرە بیر و باوەڕانەوە چۆن داوای رابەرایەتی خەڵکی موسڵمانی کورد بکەن؟ یا خەڵکی موسڵمانی کورد چۆناوچۆن ئەوانە بە رابەری خۆیان قبووڵ دەکەن؟

بەڕێز مامۆستای کۆیی لە تەمەنی ٢٥ ساڵیدا کچە مامێکی خۆی بە نێوی نەعیمە کچی مەلا حەبیب مەلا ئەسعەد هێناوە و چەند منداڵێکی بووە بەڵام جگە لە کچێک هەموویان بە منداڵی مردوون.

دوای مردنی ئەو ژنەی خزم و دۆستانی زۆریان داوا لێ کردووە تا قبووڵی کردووە، کە دووبارە ژن بهێنێتەوە. ئەو ژنەی دووهەمی کچێک بووە بە نێوی حەبیبە کچی شێخ رەزای کوڕی شێخ قادری سندوڵانی ناوچەی پژدەر کە لەویش چەند مناڵێکی بووە و کاک مەسعوود محەمەد یەکێکە لەوان.

مامۆستا مەلایەکی وەها بووە کە مەلایەتی پێ لە هەموو پلە و پایەیەکی جیهان باڵاتر بوە و هەر بۆیە گەلێک شانازی پێوە کردووە و هەر بە چەکی مەلایەتی توانیویەتی بە گژ هەموو خەراپکاری و ناڕەواییەکدا بچێتەوە. جا هەر بەو هۆیەوە ئەوەندە بە مەلایەتی و زانستەکانی مەلایەتییەوە خەریک بووە کە زۆر بە چاکی خۆی تێدا تەیار و ئامادە کردووە و هەر بەو بەڵگەشەوە بۆتە پیاوێکی هەرە بەرزی زانای هەڵکەوتوو و بلیمەت و زمانپاراو و خۆشبێژ و رەوانبێژ و ئاگادار لە هەموو زانیارییەکانی ئیسلامی و مێژووی گەلانی جیهان و بەتایبەتی گەلی کورد و هەروەها مێژووی ئیسلام.

جا هەر بۆیە هەمیشە لە خۆی رادەدیت کە لە باس و وتوویژەکاندا زاڵ ببێ و نەیاران ببەزێنێ و هەرگیز ترسی لە دڵدا نەبوو، قەتیش تەمای بەوەی نەبوو کە ستەمکاران و دەسەڵاتدارانی نا هەق ڕێزی لێ بگرن و ئیتر هەر بۆیەش مەرایی و رووپامایی لەبەر کەس نەدەکرد. بڕوای تەواوی بە خۆی و زانیاری خۆی هەبوو و هەرگیز لە بەرابەر هەق و ناڕەوادا کت و مات نەبووە و وەڵام دانەوەی نەیاری پێ لە ئاو خواردنەوەش ئاسانتر بووە.

ئەو دەیگوت مەلا جێنشینی پێغەمبەرە، پێغەمبەریشﷺ لە هەموو کەسێک گەورەتر و ماقووڵترە، کەوایە جێنشینیەکەشی هەروەک خۆی دەبێ لە هەموو کەس باڵاتر بێ. دەیگوت مەلا دەبێ خۆی لە سەر هێڵ و ڕێبازی پێغەمبەرﷺ بڕوا و خەڵکی بە دوای خۆیدا بکشێنێ و قەت قەت نابێ ئەو وە دوای خەڵکی بکەوێ و قەتیش نابێ هیچ کەس خەتی بدا بە مەلا و دروست بە پێچەوانە مەلا دەبێ خەتی بە خەڵک بدا و دیاریکەری ڕێبازی گەل بێ.

کاک مەسعوود لە لاپەڕەی ٢٥ی کتێبی (گەشتی ژیانم)دا لەبارەی ئەو بەڕێزەوە دەڵێ:

باوکم مەلا بوو، بەڵام مەلایەک کە بتوانێ لە هەموو زانستەکانی ئیسلامیدا کتێب دابنێ. تەنانەت لە گەلێک مەسەلەدا ئیجتیهادی خۆی بەکاردەهێنا بەدرێژایی عومری مەلایەتی خۆی دەرسی گوتبێتەوە یەکسەر بێئامادە کردن دەرسی گوتۆتەوە. دەمدیت کە دەکەوتە سەر شەرح و تەقریری دەرسەکانی وەک تاقگە قسەی لێ هەڵدەڕژان.

ناوناو لە گەرمەی تەقریردا هەڵوێستێکی دەکرد و چاوی دەبڕیە شتێکی نادیار. دەیگوت لەو تەرزە حاڵەتەدا چەند ڕێبازێکی شەرح،

بـۆم دەکـرێنەوە، لەو هەڵوەسـتەدا یەکێکیـان پەسـند دەکەم واش دەبوو کە پێویست بە شەرح نەبووبێت بە چەند قسە و هێمایەک لە دەرسەکە دەبۆوە.

بـاوکم خەتیـب بـوو، بەڵام خەتیبێـک کە بتـوانێ بە کـوردی و عەرەبـی و تـورکی و فارسـی تـا حەز بکـات لە سـەر بـابەت بـدوێ بێحـازر کردن و بێ کاغەز و بێ ئەوەی پێشتر ئاگادار بووبێ لە چی دەدوێ.

باوکم لە دەروونـدا ئیمانی بە هەق هێنـابوو. لەو ئیمـانە تێکـڕای بوونەوەر لە بەر چاو و لە بەر تەبعی جۆرێـک لەنـگەری بەسـتبوو کە ئیتر گۆڕانی باری بوونەوەر نەتوانێ لەنگەر بەستنەکە تێک بدا.

بۆیە هەرگیز لە بارێکەوە بۆ بارێک نەدەگۆڕا. لە ماڵەوە لە نێو مزگەوت و لە نێو ئاپۆرەی خەڵق و لای دەسـەڵاتدار و بـێدەسـەڵات یەک زەڕڕە فەرقی بە قسە و ڕەفتـاری نەدەکـرا، چ لە ژووری خـۆی تەنها بایە و کتێبێکی خوێنـدبایە و چ لە دیوەخـان یـا لە مـزگەوت لەگەڵ خەڵق دانیشتبـایە یان لە هەر هەڵکەوت و هەڵوەستی دیکەدا بایە هەمان ڕەفتاری دەکرد.

واتا تەنهـا بـایە، یـا خەڵـق دیـار بـایە، بـایی سـەرە موویەک حەرەکە و سـەکەنەی نەدەگـۆڕا. هەر بە قەدە ر ئەوەی شـەرم لە سێبەری خۆی بکات شەرمی لە خەڵق دەکردەوە.

مـن بە لای کەمەوە ١٠ سـاڵێک بەر لە وەفـاتی گەیـشتبوومە تەمەنێـک مانای شتان تێبگەم. (٢٤ ساڵی بووم کە وەفاتی کـرد) لەو دە سـاڵەدا بەو لای هەمـوو سـنوورێکەوە ئەم دیـاردەیەی لەنـگەر بەستن و نەگۆڕانم لەو مرۆڤەدا بەدی نەکرد تا ئەوەی چەند جار بە

لای خۆشمەوە دیاردەکە نائاشنا خۆی دەنواند. هەر دەتگوت بە سەر مەتەڵێکەوە دەنۆڕم کە باشی تێناگەم.

وا بزانم ئەو قاڵ بوونەوەی بۆ هەق کە گوفتار و رەفتاری یەکچوون کردبوو، یەکێک بوو لە هۆی ئەو هەیبەتەی، کە لەو مەجلیسە دەنیشت ئەوی تێدابایە لە مەجلیس دانیشتنی بگەڕێین و سەیری ئەو رێگەیە بکەین کە پێیدا دەڕۆیشت. لە ماڵەوە بۆ مزگەوتێ دوو رێگە هەبوو یەکێکیان بە ناو بازاڕدا دەچوو، کە بە ناچاری ئەو رێگەیەی دەگرتە بەر، هەر لە زارکی بازاڕەوە کە بو ئەهلی بازاڕ دەردەکەوت تێکڕایان هەڵدەستانە سەر پێیان تا لێیان رەت دەبوو.

تەنانەت گاور و جوولەکەش وەک موسڵمانەکان بۆی راست دەبوونەوە. واز لە ئەهلی بازاڕ بهێنین بو منداڵی کۆڵانەکانی گەڕەکەکەی خۆی، عەسری رۆژانی کۆتایی بەهار و سەری هاوین کە لە ماڵەوە دەردەچوو بەرەو مزگەوتی حاجی مەلا ئەسعەد، منداڵی گەڕەکەکە سەرگەرمی قەپوقیری جگێنە و تۆپێنە بوون، هەر کە چاویان پێ دەکەوت کەلا و جگ و تۆپیان لە دەس بەر دەبۆوە و خۆیان بە دیواری ئەم بەر و ئەو بەری کۆڵانەوە دەگرت تاکوو لەبەر چاوانیان بزر دەبوو.. ئینجا وردە وردە دەگەڕانەوە بۆ گەمەکانیان.

من ئەمانە و سەدان شتی دیکەشم دەدیت لەو بابەتە کە لە کەسی دیکەم نەدەدیت. رۆژ لە رۆژ هەیبەتی لە دڵمدا کاریگەرتر دەبوو.

# دیارییەکی بەنرخ لە مامۆستایەکی بەڕێزەوە

راستی نووسینی کتێبێکی ئاوا گەورە وگش لایەنە لەبارەی پیاوێکی ئاوا گەورەدا کە لە چەندین لاوە مێژووی خەبات و شانازییەکانی گەلەخەباتکارەکەشمانە هەروا بەسادەگی و سووک و ئاسان پێک ناهێنرێ وهەروا بێزەحمەت ورەنج وکوێرەوەری ساز ناکرێ و هەرگیزاو هەرگیزلە شتە گونجاوەکان ناژمێردرێ. جا ئیتر هەر بۆیە منیش بە ناچاری داوای کۆمەک ویارمەتیم لە پێک هێنانی ئەو کتێبەدا لە گەلێک لە زاناودانا و پسپۆڕانی کوردستان کردووە وهەرکەس گومانی کەمە زانیارییەکیشم لە بارەی مەلای گەورەدا لێ کردبێ بە لەونێک دەستی نیازم بۆد رێژ کردووە .

جا یەکێک لەو کەسانەی کە داوای کۆمەک و یارمەتیم لێ کردوون وبۆرازاندنەوەی کتێبی (کوڵی دڵی مەلای کۆیی) دەستی خوازیاریم لە پێش پان راکردوون مامۆستای بەڕێزم جەنابی مامۆستا مەلا عەبدوڕەئووفی نەقشبەندی لە شارە جوانکیلانەکەی سەردەشتێ لە گوێن بەهەشت بوو.

لەو بارەوە یەک دوو جار باس ووتووێژم لە گەڵا کردبوو، لێی حاڵی ببووم کە زانیارییەکی باشی سەبارەت بە مامۆستای گەورە لە لایە و سەرەڕای ئەوەش دیتم کە ئەو بەڕێزە ڕێزێکی زۆری مەلایانە بۆ مەلای گەورە دادەنێ و زۆریشی خۆش دەوێ و شانازیشی پێوە دەکا، تەنانەت لە سەر نووسین و تۆمار کردنی ژیاننامە و راڤەی بیروڕا و هەڵوێستەکان و هەڵبەستەکانی ئەو مەزنە مەلایە زۆریشی دنە دام.

منیش زۆر بە گەرمی داوام لێ کرد کە هەر زانیارییەکی کە لەمەڕ ئەو هۆزانە لێزانە زۆرزانەوە هەیەتی پێشکەشم بکا و هەر ئەندازە دەتوانێ لەو بارەوە یارمەتیم بدات.

ئەویش بەڵێنی پێدام، بەڵام فەرمووی نەوەک لە بیرم بچێتەوە بە تەلەفۆن لەگەڵم باس بکەوە، دوو سێ جار تەلەفۆنم بۆ کرد و دوایی نامەیەکیشم هەر لەو بارەوە بۆ نووسی. جا ئەویش خوای گەورە پاداشی باشی بداتەوە لە وەڵاما ئەم دیارییە بەنرخەی بۆ ناردم، کە هەم لەبەر ڕێزی وی و هەم لەبەر چەند راژۆ (نکتە)یەکی زۆر گرینگ و سەرنج راکێش پەراوێزەکانی هەر بە دەقی وێژامە(عبارت)ی خۆی دەخەمە بەردەستی خوێنەرانی خۆشەویست و هیوادارم کە زۆر بە وردی بیخوێننەوە وسەرنجی بدەن. تا بزانن مامۆستای گەورەمان چ ئەندازە و تا چ رادەیەک دڵسۆزی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و کورد و کوردستان بووە و چەندە بۆ ئەو خەڵکە سووتاوە و چۆن خۆی بۆ لێر و لەوێ داوە و پەنای بۆ ئەملاو ئەولایان بردووە!! بزانن کە چۆن وێڕای بانگی گشتی و هاواری هەراو لە هەمووان وردە بانگ و وردە هاواری تایبەتیشی لە هێندێکان کردووە، بە هەموو جۆر گازی کردوون کە بێنە ناو مەیدانی خەبات و تێکۆشانەوە. بەڵێ ئەو دیارییەی مامۆستای بەڕێزم بریتی بوو لە ودنامە (اجازە نامە)یەکی خودی مەلای گەورە کە بۆ یەکێک لە فەقێکانی و دم وەرگری خۆی بەڕێز جەنابی مەلا سەعدی کۆیی قەڵادزەیی نوسیویەتی و هەروەها کورتە باسێک لە ژیانی مەلا سەعد و نامەیەکی کە جەنابی مەلای گەورە بۆ بەڕێز مەلا محەمەدئەمینی بێژوەیی (شێخەمین) نووسیویەتی و چەند داوایەکی گرینگی لێ کردووە و هەروەها نامەیەکی مەلا ئەحمەدی ئەشکەیی کە بە میرزا ئەحمەدی ئەشکەیی بەناوبانگە بۆ خودی مەلای کۆیی.

من خۆم لام وایە کە ئەو نامەی مامۆستای گەورە بۆ جەنابی مامۆستا مەلا محەمەدئەمینی بێژوەیی نووسیوە بەشێک یا نموونەیەکە لەوهەمووهەوڵ وتەقەلایەی کە ئەو بەڕێزە بۆحاڵی کردن وراپەڕاندنی خەڵکی کورد داویەتی.بەڕاستی وا وێدەچێ کە ویستوویەتی لانی کەم چەند کەسێکی وەک بەڕێز مامۆستا محەمەدئەمینی بێژوەیی بکاتە هاوبیروباوەڕوهاوکاری خۆی و بیانهێنێتە مەیدانی خەبات و لە دەوری خۆی کۆیان وەکاتوئیتر هەژار گوتەنی:

( بە رد) = خەڵک لە خۆی کۆ وەکا پێم وایە
شۆڕشـــی گەرمـــی لە بـــن ســـەردایە

وەک رابرد دەڵێن مامۆستای گەورە زۆر جاران دەیفەرموو: ئەگەر سێ مەلام لەگەڵ بان، یان سێ مەلام بۆ حاڵی کرابان سێ پارچەی کوردستانم سەربەخۆ دەکرد. جا من دەڵێم رەنگە بەڕێز شێخەمێن کە مەلایەکی زۆر زانا و دانا و هەڵکەوتوو بووە یەکێک لەو سێ مەلایانە بووبێ کە مامۆستا مەبەستی بوون کە لە گەڵی بن بۆ رزگار کردن و سەربەخۆ کردنی کوردستانی گەورە، کە هەر لە خودی ناوەرۆکی نامەکەشی وا دەردەکەوێ و دیارە کە چی لێ دەوێ.

بەڵام بە داخەوە بۆمان روون نەبۆوە کە داخوا وڵامی ڕێزدار شێخەمین چ بووە؟ئایا هەر بێدەنگی لێڕا کردوە و لەماکا بە ئاواڵ و هاوتای خۆی نەزانیوە؟ یا وڵامی داوەتەوە و بە بوون یا نەبوون بە جۆرێک حاڵی کردوە و لە مەبەستی خۆی و بەڵام ئەو گەنجینە مێژووییە دەس ئێمە نەکەوتوە بۆ ئێمە روون نییە.

بە راشکاوی دەتوانین بڵێین کە ئەو نامەی مامۆستا بۆ شێخەمین هەروەک نامەکان و هۆنراوەکانی دیکەی زڵقێکی چووکەیە لە کوڵی دڵی مەنجەڵی دڵی وەکوڵ هاتوو و دەروونی پڕ ئاگری ئەو ڕێزدارە. بەڵێ ئەو بەڕێزە لەم بەڕێزە لەو ڕێزە هۆنراوەدا جاری وایە بە توانج و پلار و تانە و تەشەر و لاتاو و تانووت و لادراو و وێچواندن و وەرگیرا و ڕێکوڕاست و راستەقینە (کنایە و مجاز و تعریض و تشبیه و حقیقیت و استعارە) پێی رادەگەیەنێ کە جەنابی مەلا تۆ پیاوێکی زۆر گەورە و بەڕێزی و لە نێو خەڵکدا قسەت دەڕواو فەرموودەکانت خاوەن شوێن و چەخەرن، کەوایە هەستە و راپەڕە و وەخۆ کەوە. ئەمڕۆ ئیتر رۆژی کڕ بوون و بێدەنگی نییە، پێشینیانی ئێمەش هەر کەسە بەشی خۆی تێکۆشاوە و ئێستا ئیتر نۆرە لە سەر من و تۆ راوەستاوە، دەوەرە با ئێمەش ئەرک و سپاردە و بەرپرسییەتی خۆمان بەجێ بێنین.

من زۆر لە مێژە خەریکم کە بۆ ئەو ئایین و گەل و نیشتمانە دابەش کراوەی کورد کارێک بکەم، بەڵام لەبەر ئەوەی بە تەنێم و دیارە، کە دەستکێش بە تەنێ تەقەی لێ نایەت تا ئێستا کارێکی ئەوتۆم بۆ نەکراوە و داخەکەم خەبات و تێکۆشانی بێوچانی من تا ئەورۆ ئاکامی دڵخوازی خۆمی نەداوە.

جا سەرەڕای ئەوەش ئەوەندەم کەند و کۆسپ و لەمپەری جۆراوجۆر لەسەر رێگەی خەبات و تێکۆشانە کە هەر چی دەکەم و دەکرێنم دەرچوون و دەرەتانم لێی نییە و شێخگەلی جۆراوجۆر و گاڕانی مرید و دەروێشانیش ئەوەندە زۆرە کە هەموو وڵاتیان لێ تەنیوم!! بە داخەوە توانیویانە خەڵکی هەژار و نەخوێندەواری کورد بە جارێ گومڕا بکەن و ڕێگەی لێ بگۆڕن و

رەببی ئەوی رێگەی لە کوردەکان گۆڕی
لەعنەتی خودا لە ئەلحەد و گۆڕی

بەڵێ ئەی شێخی ئەمین تۆی شێخی ئەمین و لە لات دەدرکێنم کە بە راستی ئەو نەیارانەی گەلی کورد، کوردیان لە رێی راستی لاداوەو بە لاڕێدا بەرەو ئامانجی گڵاوی خۆیان ئەوا دەیئاژوێنن. خۆت دەبێ بزانی کە ئەوانە لە هەر لایەکەوە وەها بەربوونەتە گیانی خەڵکی هەژاری کوردەواری کە بە جارێک مێشک و بیر و هەست و ئاوەزیان تالان کردووە و لە راستی و راستەقینە دووریان خستۆتەوە!! ئەوانە خۆت دەزانی کە دژمنی کوردن.

رەببی ئەوی کە دژمنی کورد بێ
چاوی با دەرپەڕێ و ملی ورد بێ

یا شێخ من بەو دەردەی دووچارم و هەرچی دەکەم و دەکرێنم بۆم حاڵی ناکرێن و لێم حاڵی نابن. دەڵێی ئەو ئایەتە کە دەفەرموێ: (صم بکم فهم لایرجعون) دروست لەگەڵ وانییەتی! بەڵام جەنابی مەلای تۆ زۆر چاک لە قسەم حاڵی دەبی و چاک دەزانی دەڵێم چی، خۆ گەلی هەژاری چاو بەستراوی لێقەوماوی دابەش کراو و ماڵ خوراو حاڵی نابێ و هەر پێی وایە شێخ خودا چکۆڵەی وییە و دەبێ هەر بە هۆی خودا چکۆڵەش پێوەندی لەگەڵ خوای گەورە هەبێ. ئێستاش هەر پێی وایە باران بە فەرمانی شێخ ئەبارێ و هەرچی شێخ نەیداتێ نایبێ و هەرچی شێخ بۆی نەکا بۆی ناکرێ!!

جا کەوایە هەستە و راپەڕە و وەخۆ کەوە و خەڵکی خەو لێکەووتووی کورد لەو خەوە خەستە وەخەبەر بێنە بانگی بێدار باشیان بە بن گوێدا لێبدە و با لەو خەوی چلە ئەغیار ببنەوە. هەستە وەرە مەیدانی خەبات و تێکۆشان و شۆڕش بکە بۆ گەل و ئایین و نیشتمانەکەت، وەرە با پێکەوە ئەم خەباتە خواییە (جهاد) دەس پێ بکەین.

یا شێخ! تۆ بەرپرسی کە دەبێ حاڵی بەدحاڵی گەلی هەژاری کورد بگۆڕی و بە هەموو هێز و توانای خۆت بۆ ئاڵوگۆڕ کردنی ژیواری کوردەواری هەوڵ بدەی.

چونکە تۆ ئەگەرچی شێخیش نیت و بەڵکە مەلای وڵاتی کوردەواری بەڵام چونکە نێوبانگی شێخایەتیت لەسەرە ئەو خەڵکە نەزان و نەخوێندەوارە چاکتر بە قسەی تۆ دەکەن. خۆ تۆ خۆشت زۆر چاک ئاگات لە حاڵی بەدحاڵی کوردی هەژار و ستەملێکراو هەیە و دەزانی کە لە چ حاڵێکدایە و ئیتر پێویست ناکا من بۆت باس بکەم.

کەوایە وەرە دەستت وە دەستم دەو وەرە مەیدانی هەوڵ و تێکۆشانەوە وبا پێکەوە لە ڕێی خوادا بۆ گەلەکەمان شۆڕش بکەین. من زۆر چاک دەزانم کە تۆ پیاوێکی زۆر چاک و شەریف و پیرۆزیو جێی خۆیەتی کە پێت بڵێم پیر و پێشەوا، بەڵام ڕاستی یا شێخ ئەو شێخانە کەوا لە وڵاتا هەن هەر هەموویان هیتم(قطب)ی دەستگیرن و دەستی خەڵک دەگرن و چاوی خەڵک دەبەستن! و لە هەموو کار و کۆشش و خەبات و تێکۆشانێک دەیگێڕنەوە. ئەوانە پێیان سپێردراوە کە خەڵک بەرەو تەمبەڵی و تەوەزەلی و نەخوێندەواریو بێکاری و نەزانی ڕابکێشن و دەستییان لە تەختەی ببەستن و لە ئامانجی بەرزی کەماڵ و تەواویەتی و تێگەیین و پێگەیین بیانگێڕنەوە و ئیتر حاجی قادر گوتەنی:

کە دەیگوت پیرم و من دەستگیرم
لە لام وابوو لە بەر جەهل و نەزانی
کە پیر بووم تێگەیشتم دەستی گرتم
لە کەسب و کار و تەحسیلی مەعانی

جا یا شێخ! تۆش دەستگیری و ئەوانیش هەر دەستگیرن! بەڵام تۆ بۆ کەماڵ و بەرەو کەماڵ و تەواوی دەستی خەڵک دەگری و بەرەو سەرکەوتن و خۆشبەختی دەیانبەی. ئەوانیش دەستی خەڵک دەگرن و لە کەماڵ و تەواویو کامەرانی دەیگێڕنەوە! کارەکانتان جیاوازییان زۆرە ئی تۆ بۆ کەماڵە و ئی وان لە کەماڵە یان هەر بۆ ماڵە. ئامانجی وان ماڵە و ئامانجی تۆش کەماڵە. جا کوردی هەژاریش زۆر خاوە و زۆر خەمبارە و زۆر هەژار و زۆر نەزانە تەنانەت شیرو خامەی شیر لێک جیا ناکاتەوە! هەر بۆیە نەیاران و دژمنانی بە شیر کەوتوونەتە سەروگوێلاکی و لە جێی شیرێک کە پێغەمبەر باسی لێ کردووە ئەوا بە شیر لە سەر و پۆتەڵاکی دەدەن.

ئەو خەڵکە کوردە هەژارە ئەوەندە نەزان و ناحاڵین کە فەرقی پێ ناکەن کە بە شیری بڕندە و دڕندە دەیبڕن و دەیدڕن هەروا دەزانن کە ئەوا (انهار من لبن و انهار من عسل مصفی) چۆمی شیر و هەنگوینە و شوکرانەی لە سەر دەکەن. جا کەوایە دە وەرە ئەی برای بەڕێز، با پێکەوە بیرێکی بنەڕەتی و تەگبیرێکی ژیرانە بۆ حاڵی بەدحاڵی ئەو خەڵکە لێقەوماوە بکەین (الا کلکم راع و کل راع مسؤول عن رعیته).

راستی هیچ ریایی و رووپامایت لەبەر ناکەم و زۆرم خۆش دەوێی و پێم پیاوێکی باشی و بە چاکت دەزانم و لاشم وایە ئەگەر وەخۆش کەوی و بانگەوازێکی شۆڕشگێڕانە بکەی و بتهەوێ خەڵک راپەڕێنی، قسەت گوێ لێ رادەگرن و فەرمانت بەڕێوە دەبەن، دەیجا تۆش قسەی من بە کەم مەگرە و رابە و بە بانگاوازی خۆت کوردستانی مەزن پڕ بکە (من اصبح و لم یهمتم بامور المسلمین فلیس بمسلم).

یا شێخ من بێفێڵ و تەڵەکە و بێدرۆ و دەلەسە لەگەڵتام و لەو ڕێبازەدا پشتت بەر نادەم. دەخیل و سەد دەخیل کاتی ڕاوەستان نییە. دەس لە دەست و قەوەت لەخوا، و خۆ ئیتر ئەگەر برا لەلای برای بێ مەگەر بەڵا لە لای خوا بێ، دەنا بێگومان سەرکەوتن مسۆگەرە و (ان الله یدافع عن المؤمنین)

جەناب، باوکم شێخ عومەری خۆش دەویست و منیش تۆم خۆش دەوێ، ئەوان هەردووکیان ڕۆیشتن و بە ڕەحمەتی خوا شاد بوون و ئێستاکە نەماون و نۆرەی من و تۆیە. بەڵام خۆشتان باش دەزانن کە نەباوکم دەروێش و مریدی شێخ عومەر بووە نەمنیش دەروێش و مریدی تۆم بەڵکە خۆشویست و دۆست و دڵسۆزتم.

خۆ تۆ یا شێخ زۆر چاک دەزانی کە وشەی شێخ وشەیەکی هاوبەشە (مشترک)ە و وشەی هاوبەشیش چەند واتایەکی لێ دەفامێتەوە. شێخیش هەم بە مانای پیر و دەستگیرە و هەم بە مانای شێخی خاوەن تەکیە و خانەگایە و هەم بە واتای پیر و بەساڵاچوویە و هەم بە واتای ڕابەر و پێشەوایە. خۆ وشەی هاوبەشیش چاوگەی خەراپی و کانگای فەسادە، چونکە هەروەک کە کەڵکی چاکی لێ وەردەگیرێ کەڵکی خەراپیشی لێ وەردەگیرێ و بۆ چاکە و خەراپە وەک یەک بەرکار دەبرێ. هەر ئەوە کە بابم شێخ عومەری خۆش ویستووە ڕەنگە کەڵکی خەراپی لێ وەربگیرێ و هێندێک کەسی سادە و ساویلکە پێیان وا بێ کە مریدی بووە لە مەرجێکا تۆ خۆشت لە ڕووی زانیاری زۆرتەوە دەزانی کە زانا و دانا و بلیمەتێکی وەک بابم قەت و قەت بۆ مرید نابێ. چونکە پیاوی نەزان و کەم ژیری نەبێ نابێتە مرید. من خۆم لە خزمەت تۆدا ڕێز و حورمەتێکی تایبەتیم هەیە و زۆرم خۆش دەوێی و باوەڕو متمانەم پێتە و دەمهەوێ کە بە هاوکاری بەڕێزتان کارێکی گەورە و گرینگ بۆ ئایین و گەل و نیشتمانەکەمان بکەم.

کاکی خۆم تۆ خۆت زۆر چاک دەزانی کە کۆلکە مەلاکان نۆکەری شێخە نارِەواکانن و ئەوانیش گومانی تێدا نییە کە سیخورِ و بەکرێ گیراوی ئەملا و ئەولایانن و ئایین و ژیانی گەلیان بۆ بێگانەکان تالاّن کردووە و بە کوردی دژمنان توانیویانە بە هۆی وانەوە گەلی کوردی بێچارەو هەژار و لێقەوماو لەئایین و ژیان و سەربەخۆیی و دەسەڵات و سەربەرزی و شانازییەکانی خۆی ببرِن!.

بە داخەوە خەڵکی نەزان و نەخوێندەواریش هیچ فەرقێی پێ ناکاو جیاوازی بۆ دانانێت و پێی وایە تەنانەت ئەو دژگەلییانەش هەر مەلا و پیر و پێشەوان. راستی ئەوەش کە وشەی مەلا و شێخ هەر کامە وشەیەکی هاوبەشە کۆمەک و یارمەتییەکی یەکجار زۆری بەو مەبەستە گلاوە دژی گەلییەی وانی کردووە و زەرەر و زیانێکی زۆری لە کوردستاندا بە ئاییني پیرۆزی ئیسلام و گەلی کورد گەیاندووە. چونکە خۆ بە کۆلکە مەلا و کۆلکە شێخە بێگانە پەرستەکانیش هەر دەڵێن مەلا و شێخ.

خۆت دەزانی و ئاگاداری کە هەر لە زۆر کۆنەوە و زۆر لەمێژە تا ئەمرۆ مەڵبەندەکانی ئالان و کۆیە مەڵبەند و ناوەندی زانست و زانیاری بوون و هەر دوو جێگەی بووژانەوە و بزووتنەوەی زانیاریو هەرێم و قزگەی (مرکز)ی رۆڵەی بەئەمەگی تا ئەندازەیەکی زۆر پێشکەوتووتر بوون. بێشەڵانی زانست و زانیاریو شێرە زاناکانی کوردەواری و پێگەی قارەمانانی هەڵکەوتووی زێد و گەل و نیشتمان بوون.

کاکە! تۆ خۆت زۆر چاک دەزانی کە مەڵبەندەکانی ئالان و کۆیە هەر لە کۆنەوە جێگەی شەرەف و زانست و زانیاری و هۆشیاری و بێداری و کوردایەتی و مەردایەتی و دلێری و بوێری بوون و ئێستاش لە دەورەتی دە زەمانان ئەوا نۆرە لە سەر من و تۆ

ڕاوەستاوە و خۆ ئیتر ئێمەش نابێ بیدۆڕێنین دەنا بێگومان ئابڕووومان دەچێ لە لای خوا و خەڵک. هەرگیز نابێ بهێڵین ئەو ئاڵا ڕەنگینەی زانست و زانیاری کە پێشینیانمان لەسەر شانی خۆیان دانابوو بە شنە بای ئایین و دینداری دەشەکایەوە، وە عەردی بکەوێ و دەبێ هەروا بەرز ڕایبگرین. چاخ هەر بەرەو پێش دەچێ و جەنگەی خەبات و دەمی ڕاپەڕینە، جا ئەگەر تۆش لەگەڵم بێیە مەیدانێ، بێگومان پێکەوە دەتوانین تۆماری نالەباری خەیانەتکاری شێخ بازاڕی بەو نەیارانەی ئایین و گەل وەپێچین و پێیان لوول دەین و دە زبڵدانی مێژووی بهاوێین.

کاکە گیان من وا لێرە لە کۆیە زۆر چاک خەریکم و هەر چۆنێک بێ توانیومە لانیرێکی ڕابگرم. من لەباتی ئەوەی کە وەک هێندێکان خەریکی خەڵک کەر کردن و مرید و دەروێش بازاڕی بم زۆر بە سەختی بە بڵاو کردنەوەی زانست و زانیاری و وانەوێژی و ئامۆژگاری خەڵکەوە خەریکم. وانەی زانایانی ئایینی دەڵێمەوە و مەلا و پێشەوا بۆ خەڵک پەروەردە دەکەم و نەزان و نەخوێندەوارەکان ئامۆژگاری دەکەم. خەو و خوم بۆتە نووسین و کتێب دانان و ڕاوەستانم نییە و دەمهەوێ بە زمانی شیرینی کوردی ڕاڤە (تفسیر)ی قورئانی پیرۆز بنووسم. کارم زۆرە و ئاوات و ئامانجگەلێکی زۆر گەورە و مەزنم لە پێشن.

جا تکایە تۆش قۆڵی خیرەت و هیممەت هەڵماڵە و وەرە مەیدانی هەوڵ و تێکۆشان و بۆ ڕزگاری ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە چەنگی خەرافات و گەند و کەلاشێکی کە بە هۆی دژمنانی زانا و دۆستانی نەزانەوە ڕەگەڵی خراوە و هەروەها بۆ سەربەرزی و سەربەخۆیی گەلی خۆت وەکوو مەردانی ئازا خەبات بکە.

وەرە با پێکەوە تێکۆشین بۆ رزگاری گەلی کوردی زۆر لێکراو و کوردستانی دابەش کراو. برالە! نەزان چی لە دەس نایەت و ئەوە ئەرکی سەرشانی ئێمەیە کە دەبیّ ئەوانیش حاڵی بکەین. خەڵکی نەزانی ئێمە خۆی لە زاری گورگی دایە و هەژدیها هەڵیلووشیوە.

راستە رێگای خەبات زۆر سەخت و تووش و دژوارە و گەلێک کەند و کۆسپی وەهای لەسەر چەقی رێگایە کە بە هەموو پاڵەوانێکیش لاناچیّ، بەڵام ئەوە بزانە کە لە رێگایەدا بە تەنیا نیت و لانی کەسێکی وەک مەلای کۆییشت لەگەڵە.

من ئەگەرچی زۆر بە سەختی دژ و نەیاری شێخگەل وشێخ بازاڕیم، بەڵام هەرگیز دژ و نەیاری تۆ نیم و بەرهەڵستیت ناکەم، چونکە بەڕاستی پێم وایە حیسابی تۆ زۆر لەوانە جیایە و تۆ زۆر زانا و دانا و مەلایەکی تێگەیشتووی، خو منیش هەر تەنیا دژ و نەیار و بەرهەڵستی خەرافات و پڕوپووچ پەرستی و ئەو شتانەم کە بە نێوی دین لە دینیان زیاد کردوون و دژمنی ئەو کەسانەم کە بە ناوی دین بوونەتە ملۆزم و لە سەر ورگی خەڵک دەلەوەڕن و هەر لە ماکا دژی رێبازی خودایین و نەیاری ڕەدا و راستەقینەن.

راستی ئەو کارەی ئەو نەیارانە دەیکەن گەلێک لە زانست و زانیاری و لە ئایین و رێبازی خودا دوورە، بەڵام چونکە تازە دڵیان وەکوو قیر رەش بووە ناگەڕێنەوە سەر رێگای راست و لەسەر رێگەی چەوت و چەوێڵی خۆیان دەڕۆن و خەڵک بانگ دەکەن بۆ دۆزەخ! و ئیدی هەر کەس وەدوایان بکەویّ هەتا ملان بە قوڕێدا دەچێتە خواریّ.

من زۆر چاک دەزانم و باوەڕم بەوەی هەیە، کە تۆ هەرگیز وا نیت و چاو لەوانە ناکەی. تۆ جگە لە رێگەی راست و رەوان و رەوشی چاک و پاکی پێغەمبەر( وەپێش خەڵک ناکەوی، چونکە تۆ

زانا و باش مەلای وڵاتی کوردەواری و ڕۆڵەی بنکەی بووژانەوەی زانست و کوڕی جگەرگۆشەی مەڵبەندی ئالان فێرگەی ئیبنولحاجی سنجووەیی و مەلا عەبدوڵڵای بێتووشیت. دیارە مەلاش ئەگەر مەلا بێ، دەبێ دڵسۆز و خەمخۆری خەڵک بێ و چاو لە ڕەوشی پێغەمبەری مەزنی ئیسلام بکا و هاوڕێ و هاوکارێکی دڵسۆز و بەختەمام (ئەمین) بێ بۆ خەڵکی هەژار.

برای بەڕێز، ئەو ڕێگایە گەلێک سەخت و دژوار و پڕ کەند و کۆسپ و پڕ خەتەرە و هەمیشە مەترسی مەرگی لێ دەکرێ، کە ئایە بۆ ڕێگوزەری لەو ڕێیەدا ئاواڵ و هاوڕێی دڵسۆز و هۆشیار و بەختەمام و ئەمین پێویستە و ڕێبواری ئەو ڕێگایە دەبێ وەکوو مووسا و خزر پێکەوە ڕاست و دروست و ئەمین و پاک و خۆیی بن.

جا ئەگەر بەڕێزتان مەیل و ئارەزووی هاوکاری و هاوخەباتی ئێمەتان هەبێ و ئامادەی هاوڕێییمان بن، من ئارەزووم زۆرە و مەیلم بەتینە، زۆر زۆرم پێ خۆشە لەگەڵتا هاوکار و هاوڕێ بم.

ئیتر کەوایە وەرە مەیدانێ دەس لە دەست و قەوەت لە خوا با پێکەوە بە هاوکاری یەکتر بۆ ڕزگاری گەلە چەوساوە و نیشتمانە دابەش کراوەکەمان لە چەنگاڵی ستەمی ستەمکاران و هەروەها بۆ ڕزگاری ئایینی پیرۆزی ئیسلام لە کوردستاندا لە چەنگی دژمنانی فێڵباز و زۆرزان و دۆستانی گەوج و نەزان و دەرهێنانەوەی جڵەوی کار لە دەستی شێخە خەیانەت پیشەکان و ئاغا زۆردارە خوا نەناسەکان وەخۆ کەوین.

کاکی خۆم ئەمە دەست و پێمان بەستراوە، قەڵەممان شکێنراوە، وڵاتمان دابەش کراوە و داگیر کراوە و هەر خوا خۆی دەزانێ چمان لێ کراوە، و چمان پێ کراوە، تۆ بە تەمای کێیت؟ پێت وایە شێخە زگ زلە گەل خۆرەکان بەزەییان بەو گەلە هەژارەدا دێت و کەمێک

کەمتری قووت دەدەن یان برێک بە گرانتری دەفرۆشن و چی دیکەی هەرزان فرۆش ناکەن؟ یان پێت وایە ئاغا ستەمکارەکان تیتۆڵێک لە هەمزاغای بەگوری مەنگوڕ دادەدڕن و چاوێک لە سمکۆخانی ئەردەڵانی شێری بێشەلانی سەلماس و چیهریق دەکەن و بۆ رزگاری گەلەکەیان وەخۆ دەکەون؟ سەرەنجام لە پێناوی کامەرانی هۆزەکەیاندا گیانی شیرنی خۆشیان بە سەخاوەتەوە دەبەخشن و پێشکەش بە دایکی نیشتمانی دەکەن؟ یا مەلاکان چاو لە پێغەمبەرﷺ دەکەن و بۆ خەباتی خوایی (جهاد) وەخۆ دەکەون؟،

راستی یا شێخ! من دەڵێم ئەورۆ گەلی کورد دڵسۆزێکی نییە کە خەمێکی بۆ بخوات. تەواوی گەلانی جیهانیش هەر بەو شێوە رزگار بوون و لە هەوەڵەوە هەر یەک یا چەند کەسێک خەمخۆریان بۆ کردووە و بۆی وەخۆ کەوتوون تا سەرەنجام راپەڕین هەروا و گشتی بووە رێگەی خەباتیان پانتاو کراوە و لە ئاکاما بە ئاوات و ئامانجی خۆیان گەیشتوون.

بەڕێز! من بە هاوکاری و هاوڕێیەتی تۆ گەلێک قاییلم و زۆریشم پێ خۆشە و شانازیشت پێوە دەکەم و ئامادەشم لە پێناوی پارازتنی ئیسلام و رزگار کردنی کورد و کوردستان و سەربەخۆیی وڵاتەکەم هەرچی لە دەستم بێت بیکەم و لە هەموو شتێکی خۆشم بگوزەرێم، چونکە بەڕاستی من بیر و باوەڕم وایە کە:

نەوتی باباگوڕگوڕی چۆن دەچی بۆ پاریسی
ئاوری حەسرەتۆمەندی لە دەروونم داییسی

جا تۆش وەرە وەک من بیر بکەوە با بەرگی دیلی و کۆیلەتی فڕێ دەین. لەو رێیەشدا لە هیچ سڵ مەکە و لە هیچ شتێک مەترسە. چونکە ئێمە، کە لە سەر رێی رەداین خوای گەورەمان پشتیوانە و

خواشمان بەسە بۆ یاریکاری و ئیتر ئەویش خۆی باشترین یارمەتیدەرە (حسبنا الله و نعم الوكيل نعم المولى و نعم النصير)

جا لە دواییشدا لە پەروەردگاری مەزن و بێهاوتا دەپاڕێتەوە و دەفەرموێ: ئەی خوای گەورە ئاخیرمان خێر بکە و دواییمان وەخێر بگێڕە. بەڕاستی تۆ هەر خۆت بیسەر و بینەری و چاک دەبیسی و ئاگات لیە کە من چ دەڵێم و دەشبینی و زۆر چاک دەزانی کە من چ دەکەم بۆ گەل و ئایین و نیشتمانەکەم و خۆشت دەزانی کە من دڵم چۆنە و چی تێدایە.

من زۆر چاک دەزانم، کە تۆ پیاوێکی زانا و دانا و لێهاتووی و زۆرم پێ ناخۆشە ئەوهەموو زانیاریو لێهاتوویيەی تۆخەسار بێ و هیچ کەس کەڵکی لێ وەرنەگرێ.

## روون کـردنەوەیەک لە سـەر ژیـانی مەلا مـحەمەد ئەمینـی بێژوەیی.

ئەو بەرێـزە کە نـاوی محەمەدئەمـین و ناوبـانگی شـێخەمینە زانایەکی گەورە و بلیمەتێکی هەڵکەوتووی کوردەواری و دڵسۆزێکی ئایینی پیرۆزی ئیسلام بـو لە نـاوچەی سەردەشت و لە مەڵبەنـدی ئالان.

ئەو ئـالانەی کە رازاوە بە رەز و بـاخ و گـوڵ و گـوڵزار و دار و درەخـت و میوەجـاتی جۆراوجـۆر ورەنگـاورەنگە. ئـالانیش وەک هەموو مەڵبەندەکانی دیکەی سەردەشتیٚ مەڵبەندێکی گەلێـک خـۆش ئاووهەوای خاوەن دار و درەخـت و رەز و بـاخ و بێـستان ولـرەوا و تەنانەت نێو جەنگەڵەکانیشی هەر پڕە لە میوەی سروشتی و مەگەر لە جـستانێدا دەنـا لە هـیچ وەرزێکـی سـاڵدا شـاخ و کێوەکـانی بێمیوەی جۆراوجۆر نـیە. ئـالان نـاوچەیەکی نە گەرم و نە ساردی مـامناوەنـدییە کە لە دامێنـی کێوەکـانی هـۆملی ٢١٣٠ متـری و لەکـلەکـی ٢٣٤٢ مەتـری و زەرتـک دا لە سـەر لێـوای جـۆمی بەناوبانگی کەڵوێ واتا زاب صغیر هەڵکەوتووە.

سروشتی ئەو مەڵبەندە وەهایە کە خوای گەورە زۆر خۆش ئاو و هەوای ساز کردووە و هەر چەنـدە زەوی وزاریـشی زۆر کەمە، بەڵام زۆر پڕ پیت و بەرەکەت و خاوەن ئاو و کانیـاوی سـارد و خۆشە و خەڵکێکـی زۆر بـاش و موسـڵمان و کـورد و بەشـەرەفی تێـدایە، هەرچەندە زۆر بە کەمی کەڵـک لە ئـاوی چۆمی کەڵـوێ وەردەگـرێ بەڵام زۆربەی خاکەکەی بەراوە و تـرێ و مێـوژە رەشـەی ئـالانێ لە تەواوی کوردسـتاندا بەنێوبـانگن و هەنـارو هەرمێـی زۆر و جۆراوجۆری هەیە.

زگە و ناوەندی ئەو مەڵبەندە گوندێکی گەورەیە بە نێوی بێژوێ کە زۆر کۆنە و لە داوێنی کێوی هۆمل هەڵکەوتووە و منیش خۆم لە ساڵی ١٣٥٢هـ ماوەیەک لەو گوندەم خوێندووە لە خزمەت مامۆستا مەلا ڕەئووفی نەقشبەندی کە نەوەی خودی مامۆستا مەلا محەمەدی بێژوەییە. ئەو کاتی هێشتا شوێنەواری حوجرە و مزگەوتەکانی چاخی مەلا محەمەدەمین هەر مابوو بەتایبەتی مزگەوتەکە کە لاشەی دوو یاری فیداکاری پێغەمبەر( تێدا نێژراوە دەستی لێنەدرابوو. جا من هەر جستانێ ئەو ساڵە لە لایەن ساواکەوە بە تاونی کوردایەتی دەستگیر کرام و تووشی گەلێک ئازار و ئەشکەنجە بووم و دوای ساڵێک زیندانی، کە ئازاد کرام نەچوومەوە وێ.

مەلا محەمەدئەمین کوڕی بەڕێزمەلا ئەحمەدی سەراوی ولە دەوروبەری ساڵی ١٢٧٧ک. لە دایک بووە ولە گەلێک لە ناوچەکانی کوردستان و شار و دێیەکانی ئەو وڵاتە خوێندووە و بۆ خوێندن لێیان ماوەتەوە و سەرەنجام لە گوندی بیارە لە خزمەت زانای بەڕێز مەلا عەبدولقادری کانی، کە بوودی ودمی مەلایەتی وەرگرتووە و ئیتر بە دەستووری مامۆستای خۆی گەڕاوەتەوە بۆ گوندی بێژوێ و بۆتە مەلا و دەستی کردووە بە ڕاگەیاندنی ئایینی پیرۆزی ئیسلام و وانەوێژی و ئیتر گەلێکی مەلای باش پێگەیاندوون.

ئەو مەلا گەورە هەرگیز کاتی خۆی بەفیڕۆ نەداوە و هەمیشە هەر خەریک بووە. کاتی خۆی بە چەند بەش دابەش کردووە بەشێکی بۆ موتاڵا و پەڕتووک خوێندنەوە و بەشێکی بەتایبەتی بۆ قورئان خوێندن و بەشێکی بۆ وانەوێژی و ڕاهێنانی فەقێکان و بەشێکی بۆ ڕاگەیشتن بە کاروباری خەڵک و کەمێکیش بۆ حەسانەوەی خۆی

دانابوو. ئەو خوا لێ خۆشبێ پیاوێکی گەلێک زانا و دانا و بەڕێز و ڕێزگر لە میوان و ڕێبوار و مشەختان بووە.

ئەو دوو کوڕی هەبوون کە هەردووکیانی کردۆتە مەلا و بۆ مەلایەتی پێی خوێندوون و مەلا محەمەد و مەلا مەحموود هەردووکیان لە پێش باوکیاندا کۆچی دواییان کردووە و خودی مەلا محەمەدئەمینیش دوای یەک سەد و پێنج ساڵ ژیانی پڕ لە خەبات و شانازی لە ساڵی١٣٨٠ک. کۆچی دوایی کردووە و هەر لە گوندی بێژوێ ئەسپاردەی خاکی پاکی کوردستان کراوە.

گەورەترین بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئەو بەڕێزە زانایەکی زۆر مەزن و بلیمەتێکی هەڵکەوتوو بووە ئەوەیە کە گەورەترین و هۆشیارترین مەلای کوردەواری واتا جەنابی مامۆستای گەورەی کۆیی لە چاو ئەو هەموو مەلایانە لەوێڕا داوای یارمەتی و هاوکاری لێ کردووە و بۆ چارەی دەردی گرانی گەلە هەژارەکەی ویستوویەتی دەستی وە دەستی بدات و هاوبیری و هاودەردی لەگەڵ بکات.

مامۆستای کۆیی زۆر چاکی تێڕادیتووە و بە ڕاشکاوی پێی گوتووە هەر لە کۆنەوە مەڵبەندەکانی کۆیە و ئالان جێگەی پیاوی گەورە گەورە و زانا و بلیمەت و هەڵکەوتوو بوون، بۆ نموونە چەندین زانا و دانای وەک ابن الحاج سنحوەیی، مەلا عەبدوڵڵای بێتووشی مەلای بەرکۆیی و حاجی مەلا قادری کۆییان لێ هەڵکەوتووە و ئیدی ئەوان لە چاخی خۆیاندا ئەرکی خۆیان بە ڕێژەی خۆیان و چاخی خۆیان بەجێ هێناوە و ڕۆیشتوون و رابردوون. بەڵام دەبێ ئێمە ئەوەی بزانین کە لەو گەڕ و چەرخ و سووڕانەی ڕۆژگاردا ئێستا نۆرە گەیوەتە سەر من و تۆ کەوایە هەستە و ڕامەمێنە و وەرە مەیدانی خەبات و تێکۆشان و با وێکڕا کارێک بۆ ئەو گەلە چەوساوە لێقەوماوەمان بکەین و بە هەر

لەونێک بێ کوردستانە دابەش کراوەکەمان کەوا داگیرکەران خەریکن قووتی دەدەن رزگار بکەین و ئایینیشمان هەر لە خەتەردایە و بە تەنیاش کارێک ناکرێ دەبا ئێمە دەستمان وە دەستی یەک بدەین.

بەڵێ مامۆستای گەورە بەو پیاوە بەڕێزە دەفەرموێ: چ بکەم و بڵێم چی؟ ئاخر بە هەموو مەلایەک هەر دەڵێن مەلا و بە هەموو شخێکیش دەڵێن شێخ. و شێخ وشەی هاوبەش و هاواتا وەک مەلا و شێخ و شیر و.. بنکەی خەراپی و تۆڕی راوچیانن و دەتوانن نێچیریان پێ بگرن! کۆلکە مەلا و کۆلکە شێخان ژیان و ئایینی گەلەکەمانیان تالان کردووە و بۆ دژمنانیان چاوی خەڵکی کوردیان بەستووە. جا تۆش هەرچەندە نێوبانگی شێخەتیت لەسەرە بەڵام بێگومان تۆ لەو جۆرە شێخە چاو بەستانە نیت تۆ زانای و ئەوەش هەرگیز لە شان و باهۆی زانایان ناوەشێتەوە. من لە کۆیە خەریکی گوتنەوەی وانەی زانایان و راگەیاندنی ئایینی ئیسلام و نووسین و پەند و ئامۆژگاریم، ئەدی تۆ چ دەکەی؟ ئایا تۆش چاو لە من دەکەی یان نا؟

جا گرینگ لێرەدا ئەوەیە کە مامۆستا محەمەدئەمین نێوی شێخەتی و هەواداری لە شێخ زیائەدینیشی لەسەر بووە و ئەو دەورانەش دەورانی شێخ بازاڕی بووە و جگە لە مەلایەکی وەک مەلای کۆیە کەس نەیتوانیوە لە ئاقاریاندا بێت و مەلای گەورەش هەمیشە هەر خەریکی پەیدا کردنی هاوکارێکی تێگەیشتوو و پێگەیشتوو بووە و نامەی رەسمیشی لەو بارەوە بۆ ئەو بەڕێزە نووسیوە نیشانەی چاکی و پاکی و تێگەیشتوویی و پێگەیشتوویی ئەو خاوەن رێزە بووە.

من هیچ گومانم لەوەدا نییە کە ئەویش بە لەونێک وڵامی مامۆستای داوەتەوە بەڵام بە داخەوە دوای خۆیان بەرچاو تەنگان ونیان کردووە و نەیانهێشتووە کە خەڵک کەڵکی لێ وەرگرن.

# نامەی مەلای کۆیە بۆ مەلا محەممەدئەمینی بێژوێ

بسم الله الرحمن الرحيم

ئەی شەخـــسی شـــەریف و عـــالم و ژیـــر
ئەی ئەو کەســـەی جێـــیە پێـــی بڵـــێم پیـــر
شـــــێخانی کە هەن لە نێــــــو وڵاتـــــا
ســـەرجەم هەمـــوو بوونەقـــوتبی دەس‌گیـــر[1]
تـــۆ بـــۆ کەمـــاڵ و هـــی وان لە کەمـــاڵ
فەرقـــی فـــرەیە لە لای خـــاوەن بیـــر
کەمـــــــاڵەهەدەف لە خـــــــزمەت ئەوان
کەمـــاڵە هـــی تـــۆش بە دیـــن و تەگبیـــر[2]

---

[1] ـ واتە شێخەکان کەوا بڵاون لە ناو هەرێمی کوردەواریدا هەموویان دەسگیرن بەڵام ئەو دەسبرِ و مووتە شێخانە دەستت ئەگرن و ئەبنە لەمپەر لە کەسپی کەماڵ و تۆش دەستیان دەگری و هاوکارییان ئەکەی و هانیان ئەدەی بۆ کەسبی کەماڵ. بە قەولی شاعیری فارسی:

خال محبوبان سیاه و دانه فلفل سیاه　　هر دو جان‌سوزند اما این کجا و آن کجا

یان بە قەولی شاعیری کوردی:

کە دەیگوت پیرم و من دەستگیـــرم　　لە لام وا بوو لە بەر جەهل و نەزانی
کە پیر بووم تێگەییشتم دەستی گرتم　　لە کەسب و کار و تەحسیلی مەعانی

[2] ـ لە بەینی کەماڵ و کەماڵ لە نیوە شیعری ئەوەڵ و دووهەمدا فەننی جیناس هەیە و وشەی ئەووەڵ مورەککەبە واتە چونکە ماڵ و سامان و مادیات هەدەف و ئامانجی ئەو گرۆهەیە کەوا ئەخولێنەوە و خەلیفەسازی و ئاوربازی ئەکەن و هەدەف و مەبەستی تۆش تەوجیە کردنی خەڵکە بەرەو کەماڵ و بەرزی سروشت.

جـــا کـــوردی هەزار خـــامە و خەم بـــارە
نـــازانێ کـــامە شـــیرە و خـــامەی شـــیر[1]
بە شـــیر کەوتـــوونە ســـەر و گـــوێلاکی
لە جێـــی چەمـــی شـــیر کە فەرمـــووی بەشـــیر
شـــیری بورنـــدە و شـــیری دوڕنـــدە
شـــوکری پـــێ ئەکەن لە جێـــی چەمـــی شـــیر
ئەی شـــێخی ئەمـــین تـــۆی شـــێخی ئەمـــین
تـــۆ لە قـــسەم حـــاڵی، نەک گەلـــی فەقیـــر[2]

---

[1] ــ جـا بـا دەداتەوە سـەر گەل و هـۆزی بـێهێـز و ئەڵـێ لەبەر ئەمەی بێـسەواد و نەخوێندەوارە و خامە و خاوو و کەمتەجرەبەیە هەرێ لە برێ ناکاتەوە و فەرقێ بە شیری تیغ ناکا لەگەڵ شیری نۆشین دەس ئەداتە شیر بازی و خۆی پێ موسڵە ئەکات و ئەبێتە نمایش‌نامە بۆ خەڵک لای وایە ئەو شیرە هەمان (لبنا سائغا للشاربین)ـە.
خامەی شیر واتە سەرشیر. لە بەینی خامە بە مانا خاو و دەستەوستان و خـامەی شیردا جیناس هەیە کە ئاماژە ئەکا بۆ شیعرەکەی مەولەوی:

کار پاکان را قیاس از خود مگیـــر — گرچە باشد در نوشتن شیر شیـــــر
کان یکی شیر است و مردم می‌برد — وان یکی شیر است و مردم می‌خورد
وان دگـر در بـــادیـــە مـــردم درد — ویـــن دگـــر در بادیـــە مردم خورد

بـادیە دوو مانـای هەیە یەک چـۆڵ و بیابـان واتە شـێری حەیـوان کە لەوێ ئەو پیـاوی ئەخـوا. بـادیەی تـر بە مانا کاسـە و قـاپ و قاچـاغ کە شـیر حـیەوان لەورا مەردم بە نۆشی ئەکەن. شیریش سێ مانای بۆ گوتراون: ١ـ شیر معادل سیف ٢ـ شێر بە مانا اسد ٣ـ شـیر بە مانا لبن.
[2] ـ لە بەینی بەشیر لە ئەووەڵی شیعر و ئاخری شیعرەکەدا جیناسی تەرکیب هەیە پێـی ئەڵێن موجەننەح، چونکە سـەروبنی شیعرەکە بە جینـاس تەواو بووە. هەی ئەوەڵیـان واتە بە شمـشیر کەوتـۆتە داپاچینی خـۆی و هەڵئەخـاتەوە و بەم لام و لادا وێنەی مەسـت پێـی وایە ئەو چۆمەنەی حەزرەتی بەشیر و نەزیـر باسـیان لێـوە ئەکـا (فیها انهار مـن لـبن و انهار مـن عسل مصفی) ئەم شیرە ژەنگاوییەی کە وا زۆر بە کارێکی جاونی ئەزانێ و شـوکری لە سـەر

حـــــاڵی بەدحـــــاڵی قەومــــــی بێچـــــارە
بـــــدە تەغییــــرێ قـــــسەت بە تەئـــسیر[1]
بـــابم مـــوخلیس بـــوو لە بـــۆ شـــێخ عـــومەر
مـــن موخلیـــسی تـــۆم بـــێ زۆر و تەزویـــر
چەبـــــکەم چە بڵـــێم لەفـــزی موشـــتەرەک
(ام الفـــــساد)ە و پێـــــی دەگـــــرن نێچیـــر[2]
بە کـــــۆڵکە شـــــێخ و بە کـــــۆڵکە مەلا
دیـــــن و ژینـــــی گەل تـــــاڵانە و ئەســـــیر
مەڵبەنـــــدی ئـــــالان مەڵبەنـــــدی کـــــۆیە
هەر لە کـــــۆنەوە بە بـــــێ کێـــــشە و گیـــر
(دار العلــــم) بـــــوون جێـــــی بـــــووژانەوە
بێـــشەی رۆڵەی دیـــن عەلـــلامەی و نحریـــرد
ئێـــــــستاش وا نـــــــۆرە لە دەورەی زەمـــــــان
هـــاتە ســـەر تـــۆ و مـــن بە ئەمـــری تەقـــدیر

---

ئەکا نازانێ فەرقی هەیە شیری مەتعووم دەبێ شەکری تێکەی و بینۆشی= لیس مشتری الافلاک کمشتری الاملاک

هەرچی سمێڵ سوور بوو هەمزاغا نییە بەینی ئەم دوو شیرە عاسمان و رێسمانە

١ ـ لە وشەی حاڵدا جیناس هەیە.

٢ ـ واتە لە کۆنەوە مەسەلەیەکە ئەڵێن لەفزی موشتەرەک ماکی فەسادە هۆی هەڵە و بە سەهوو چوونە من کە غەیبەت و مەزەممەتی شێخ و دەروێش ئەکەم و ئەو کەر بازارییەی ئەو کەرە گەلە ناویانەتەوە، بە ناوی دین و شەریعەت و تەریقەت دەرخواردی خەڵکی عەوامی ئەدەن فەرقی زۆر زۆرە لەگەڵ رێ و رێبازی پاکبازان

سگ آخر کە باشد کە خوانش نبند بفرمای تا استخوانش دهند

بە داخەوە تەریقەت و عیرفانیان کردۆتە داو، تا بازی مەل و مەردمی بێچارە تێکەون و ئەوان سفرەیان رەنگین ببێ و کاریشیان بە سەر مەسلەک و نەمانی دینەوە نییە. (ضعف الطالب و المطلوب)

بس مزور و صوفی نمای ازرق پوش کە اقتبـــاس کـــنند گفتگـــوی درویشـــان
بە زرق و دلق خلق را فریب دهند کە پر کنند شکم ز خوان و نعمت ایشان

یـــا شـــێخ مـــن لێـــره لەجیـــات دەروێـــشی
کـــــارم ارشـــــاده و تەدریـــــسه و تەقریـــــر
دەرســـــی عولەمـــــا و ئەنـــــدەرزی عەوام
خەو و خـــــووم بـــــۆتە نووســـــین و تەحریـــــر
بە لەفـــــزی کـــــوردی شـــــیرینی بـــــێ‌گەرد
نیـــــــازم وایە دەس کەم بە تەفـــــــسیر[1]
بـــکە هیممەتـــێ مـــونکیر نـــیم بـــۆ تـــۆ
مـــــونکیرم لە بـــــۆ مـــــونکیر و نەکیـــــر

---

[1] ـ وا دیاره ئەم نامەیە لە سەردەمی دەس پێ کردنی بووە بە تەفسیری کوردییەکەی و ویستوویەتی لەگەڵ مزگێنی مەشوەرەتیشی لەگەڵ بکا ئەو دەمە تەفسیر بە کوردی باو نەبووە تەنانەت یەکێ ئایەتێکی لە ناو میسالی پەرتووکە عیلمییەکانا بۆ فەقێیەکی مانا بکردایەوە ئەیانگوت کارێکی چەوت و خەراپە و نیزیکە لە کوفر و وەرگەڕان. جا دەفەرموێ لەم کاره خێرەدا دوعای سەرکەوت و دەسکەوتم بۆ بکە من ئاقیدەی باشم بە تۆیە کە عالمی عاملی ئەفەرمێ من موعتەقیدم بە پیاوانی ئەهل ئەم کاره وەکوو سەلەفی سالحین کە ڕۆیشتوون خویان و ڕاهو و ڕەوشیان گشت پاک و خاوێن بووە و ئەهلی مەعرەفەت بوون مەعرووف بوون بە ئەهلی عیرفان و مەعاریف منیش (آمری بالمعروف و ناهي عن المنكر)م و مونکری مونکەراتم کە ئە وبێ‌مایە و پایە و کەس نەناس و خوا نەناسانە واتە منکــر و نەکــره و مجهــول الحــاڵن خــستوویانەتە نــاو گەل و خەڵکــی کوردەوارییــان پــێ هەڵئەخەڵەتێنن و بە کەشف و کەرامەت و تەریقەتیان بە ناو عالەمـدا بڵاو کـردۆتەوە و پێیان ئەسەلمێنن ئەو کۆڵکە شێخ و کۆڵکە مەلایانە بوونە سەرەتانی گەل عەمەلیان لە سەر خەڵک هەر ئەخذ و جەڕڕە و خەڵکیش ڕەوانە ئەکەن بۆ سەر مەسیری اسفل السافلين واتە هەرگیز عاملی رافعە نین.

بۆ سەر بەرزی خەڵک تێناکۆشن هەر عاملی خافض و جاڕن و خەفضی خەڵک ئەکەن بۆ دۆزەخ جەڕڕی ماڵ ئەکەن بۆ گیرفانیان کە ئەویش وێنەی دۆزەخ لە کاتی پرسیار بە (هل امتلئت) وڵامەکەی هەر (هل من مزيد) بە هیچ پڕ نابێ بازێ پێیان وایە جەنابی مەلای مونکیر، عەزابی قەبر و گۆڕەوشار و سوئالی مەلەکەینە هەر بە هەوای ئەم شیعره، بەڵام وەکوو گوتمان گرشمەیە بۆ ئایەتی (كنتم خير امة اخرجت للناس تأمرون بالمعروف و تنهون عن المنكر) مەبەس لەو مونکەر و نەکیره وا دەرئەکەوێ فرشتەی قەبر نەبن (والله اعلم)

ئەو مـــــــونکەراتەی ئەو نەکیـــــــرانە
دوور لە مەعـــاریف دڵ رەش وەکـــوو قیـــر
دەیـــکەن کە هەمـــووی لە زیـــددی دیـــنە
تـــۆ خـــۆت دەزانـــی ئەی مەردی بەســـیر
شـــێخی وەک کۆڵـــک مەلای بـــێکەڵـــک
بانـــگ ئەکەن لە خەڵـــک بـــۆ (بئس المصیر)
ڕەفیقـــی ئەمـــین ئەشـــێ بـــۆ تەریـــق[1]
وەک خـــزر و مووســـا جـــا مەبە دڵگیـــر
ئەگەر مەیلـــت بـــێ مەیلـــم بە تیـــنە
لەیلـــی بـــێمەیـــل ئەبەخـــشێ زنجیـــر
ئەنـــازم پێـــت و دوعـــا ئەخـــوازم
(حـــسبنا الـــله و نعـــم النـــصیر)
ربنـــا ارزقنـــا حـــسن الختـــام
انـــک انـــت الـــسمیع البـــصیر

[1] ـ ئاماژە ئەکا بە وشەی ئەمین بە دوو مانا ١ـ واتە شێخەمین ئەشێ بۆ ڕەفاقەتی تەریقە کە ئەڵێن الرفیق ثم الطریق ٢ـ مەبەست لە ئەمین پیاوی دروستکار و ئەمینە.
ئیشارە ئەکاتە جەریانەکەی حەزرەتی خزر و مووسا کە گوتی (هل اتبعک علی ان تعلمنی مما علمت رشدا) ئەڵێ ئەگەر لێم دڵگیر نەبی وەکوو خدر ئەتۆ بێسەبریم لەگەڵ نەکەی و منیش سابر بم و مەیلم بە ڕفاقەتی تۆوە هەیە بەو شەرتەی تۆش مەیلت بێ و پێت باش و خۆش بێ دەنا بە تاقی تەنێ هەر من حەز کەم و تۆ کەیفت لێ نەبێ ئەوە ئەبێتە عەشقی یەک تەرەفە و بێئاکامە.
گر نه از جانب معشوق بود خود کششی کوشش عاشق بیچاره به جایی نرسد

## نامەی میرزا ئەحمەدی ئەشکەیی بۆ خزمەت جەنابی مامۆستای کۆیە

بسم الله الرحمن الرحيم

کەلامی میرزا ئەحمەدی ئەشکەیی نامەیەکە بە سوورەتی شیعر ناردوویەتی بۆ لای ماموستای کۆیی لەو غەزەلەدا زۆر جیناس و وردەکاری بە کار بردووە و تەنانەت مەلای کۆیی رەحمەتی خوای لێ بێ کۆ بە کۆ فەرموویەتی ئەم کابرایە یا هیچ نازانێ یا هەموو شت ئەزانێ، جا وا بۆ بیرەوەری ئەودوو زاتە بە نموونەی ئەدەبی کوردی دەقی غەزەلەکەی نووسرایەوە:

لە تـــاقیبی[1] حەقیقەتـــدا کەســـێ دانـــای ئەســـرارە
لە نـــاحەق لا بە حەق مـــولحەق، حەقـــایق بیـــنە بێـــدارە[2]
لە واقفـــیە کە تـــوفیقە بە وەقفـــی وەقـــفە مەوقـــوفە
قەفـــــای قەف قەف بە قـــــافی قـــــوە دەووارە
بە جـــە هـــدی حاصـــلی تحـــصیل و استحـــصال محـــصولی

١ ـ تاقیب: تاقی کردنەوە، تەحقیق
٢ ـ لە ناحەق لا: واتە دوورە لەو لامۆیی لێ ئەکا ناچێتە کانالی بەتاڵەوە بە حەق مولحەقە یانی مل راکێشە بۆ حەق بە دڵ مورزەم بووە گەردنی بۆ دانەواندووە. مولحەق گەردن کەچە لە مولحەقی عەرەبییەوە هاتووە حەقایق بێنە ئیشارە بەو مەسەلە کەلامییەیە کە ئەفەرمێ حەقایق الاشیاء ثباتة واتە سۆفستایی نییە بێدارە بەخەبەرە نووستوو نییە خەبەردارە گرشمە ئەکاتە زۆر شت.

محـصل حوصـلەی حاصـل بە ئەصـلی مـا حـصل دیـارە[1]
مـــدقق بـــا لە دار الفكـــری دق البـــاب دقـــت كـــا
بە تەدقیقـــی دقـــایق دەق دەزانـــێ كـــۆیە ئەو شـــارە
خەزێـــنە نەقـــدە نەقـــدینەی نقـــوداتی نەقـــی زاتـــی
مەلا مەوسـوم و مەرسـومی لەسـەر رێـی فەخـری موختـارە
بە تەسـدیقاتی سـددیقی سـەداقەت موسـەددیقی سـیدقە
خیتـــابی خـــوتبە خەتتـــابێ خیتـــابی ئەمـــری غەففـــارە
کە زیـنـــوورەینە چـــاوەی نـــوور ئەوە چـــاوی لەبەر چـــاوە
حەیـــاتی بـــۆ حەیـــاتی حەی پـــڕ و یەحیـــای حەیـــا دارە[2]
لە عیلمـــی حەزرەتـــی عەلـــیە ولایـــاتی بە مەعلـــوومی
شـــەرایع شـــارعە و مەشـــرەع شـــرووعی رۆژی ئەتهـــارە[3]
ئەئیـممەی ئەربەعەی هەر یەک لەسـەر روبعـی کە ئوستادن

١ . بە کۆشش و خەباتی کە هەیبوو لە پێناو تەحسیلی علووم و بە هۆی داوتەڵەبی بۆ حسوولی مەحسوول و ئاوات ئەو موحەسیلە شاگردە حەوسەڵەی هەبووە بە دەستاوەردەکەی کە دەسکەوتی ئەوە لەم هەوڵ و تەقەللایەدا دیارە.
٢ . کە عثمان ذی النورین سەرچاوەی نوورە ئەم چاوە خانووی حەیا و زانستەی لە بەر چاوە حیاط کۆشک و حصاری بۆ ژینەوە حەی قەوم و قەبیلەی خۆی پڕە هەموو وەخت جێی کردنەوەی ئاواتە وەکوو یحیی کوڕی زکریا بە حەیا و هەیبەتە وسیدا و حصورا
٣ . عیلمی ئیجازدەر ئەچێتەوە سەر عەلی بە مەعلوومی بۆ شەریعەت وێنەی شارعە ڕێباز واز کە خەیابانی پێ ئەڵێن وەکوو مەشرەعە سەرچاوەیە کە ئاوی لێ ئەخونەوە رۆژی پاکی بۆ تلووع لە کن ئەوە دەس پێ دەکا.

(بەڵام من هیچ گومانم لەوەدا نییە کە ئەوەش هەر نەخشەیەکە بۆ گەورەتر نیشان دانی هەنتەشی عەلی لە یارەکانی دیکەی پێغەمبەرﷺکە دیارە ئەوەش زۆر مەبەستی گەورە گەورەی لەبندایە. دەبێ ئەوەش بزانین کە لە نێو یارانی پێغەمبەردا گەلێک پیاوی وا هەبوو کە لانیکەم وەک وی هاتۆتەوە بۆ نموونە عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس یەکەم ڕاڤەدەری قورئانەکەوایە بێ‌گومان ئیجازەنامەکانی وڵاتی کوردەواری لە ڕووی نەخشە براونەتەوە سەر عەلی./ گورزی).

وەلیعەهــدی هەموویــانە مــحەمەد یــاری هەر چــوارە[1]

لە کەرکوکـۆ وەکـوو کـۆ هەر لە کـۆ نـاکۆن لە کـن ئێـوە

کەوا کـۆی کـۆیی تـووکن کـن مەکـان و کـانی ئەدوارە[2]

جەلیـزادە جەلـی جیلـی مەجـال و هەم ئەجەللـی جیلـی تـۆ

مەجەلـلەی جلوەیـان جـێ کـرد لە جـۆگەی ئەو جلـوەدارە[3]

بەحـوکمی عـیلم و حـیلم و سـەبر و شـوکر تـۆوە سـەربەرزین

وە ئـــیللا جـــاهلی وەک ئەشـــکەیی گـــومڕایە بێچـــارە

ئیلاهــی تــا لە دنیــا عەمــر و زەیــدێ بــێ، ســەلامەت بــێ

ئەبــوو مەســعوود ئیبنولحــاج کە بــۆ دیــن ســەرجەمی کــارە

جەسارەت بوو کە من کردم بە کوردی وا لە سوێت مردم

نەفـامی بــوو لە دەســتم چــوو قــسوورم عەفــوە ئەمجــارە

چ بێـژێ ئەشکی ئەشکی کورتە ئەشـکی خـۆی ئەبێ بڕێـژێ

ئەگەر مــاوم لە گەرمــاوم بە گەرم ئــاوی ســەرەو خــوارە[4]

---

١ ـ چوار ئیمامەکان بۆ گوتنەوەی دەرسی روبعی موجیب و موقەنتەر کەوا زۆر سەختن لە سەر پشتی ئەرز روبعی مەسکوون ئوستادی ئەون کە جێنشینی هەموانە و یاری هەر چوارە.

٢ ـ لە شاری کەرکوک وەکوو ئەستێرەی کۆ (پەروین) هەر لە قەدیمەوە بۆ فێر بوونی دین و دنیا جەم ئەبن لە کن تۆ لە کاتێکا کەوا کووچەی شای کۆ هەموو کون و کەلەبەری مەکان و مەعدەنو سەرچاوەی نوور و بەرەکەتە.

٣ ـ ئەی جەلیزادە جلی باپیرەت و شێخی جیلی حەزرەتی غەوس لە بۆ مەیدانی نەتەوەی جیلی تۆ رۆژنامەکانیان جلوەیی دا کە نوی (جلوە) بوو کە سەرچاوەکەی هەڵئەگیرا لە رووی نوسین. سەرمەقالەکەی بە پێنووسی تۆ کە جیلوەی زانینی و مارفەت لە مست تۆدایە.

٤ ـ ئەشکی ئەووەڵ ئیشارە بە نازناوی خۆیەتی ئەشکی دوایی بە مانا پەل و قاچ و قول و ئەشکی سێیەم واتا فرمێسکی خەم و پەژارە ئەڵێ ئەڕێژم فرمێسکی گەرمم هەتا ماوم = ئەگەر مـاوم لە گەرمـاوم . واتە ئەو گونـدەی کە لێـی بـووە گەرمـاو بـووە کەوا لەبەر بێتووشـەوەیە بە گەرمئـاوی واتە بە ئـاوی گەرمـی فرمێـسکی کە لە چـاوم سـەرەو ژێـر

لە نامەکەی ڕیزدار ئەشکەیی دا هەست و سۆزیکی زۆر پاک و خاوین دەبینری ود یارە کە لەدڵ و دەرونیکی زورپاک وخاوین وبێ خەوش هەڵقوڵیوە و بەڵام بە داخەوە کەمیکی بولای پڕو پوچ پەرستی، یا کە سپەرستی باو لەوسەردەمی دا بایداوە تەوە، کە ڕەنگە جەنابی مامۆستاش ئەگەر وەڵامی نەدابیتەوە هەر لەبەر هێندێ بوبێ.

---

هەڵئەرژێ ئەبێ لەم (گەرمابە) واتە حەمام خۆ خاوێن بکەمەوە چونکە (العنان تجريان لمن له العينان تجريان).

# دەقی ئیجازەنامەی مەلای کۆیە بۆ مەلا سەعدی قەڵادزەیی

دەقـی ئیجازەنـامەی جەنـابی مەلای کـۆیە مەشـهوور بە مەلای گەورە مەلا محەمەد بـن الحـاج ابومـسعود بـۆ جەنـابی ابوالفضائل رکن الدین حاجی مامۆستا مەلا سـەعدی کۆیی قەڵادزەیـی رحمهمـا اللـه:

بسم الله الرحمن الرحیم

الحمـد للـه الفـالق الحـب و النـوی خـالق الانـسان و مـا لـه مـن المدارک و القري، العالم بما ابـرزه و مـا اضـمره و مـا نـوی، فـان تجهر بالقول فانه یعلم السر و الخفی، القدیر الذي استوی له ملک السموات و الارض و ما بینهما و ما تحت الثری، هـو الاول و الآخـر و الباطن و الظاهر منه المبـدء و الیـه المنتهـي الهـادي، مـن سلک منهاج الشریعة الی حقیقة الطبیعة، حتی بلغ الغایة القـصوی هـو الخـالق الـرازق الـدلیل المرشـد القریـب المجیـب الـسمیع البـصیر المدبر المقدر البارئ المصور له الاسـماء الحـسنی فـسحبنا اللـه و کفي

و الصلوة علی صاحب الرسالة و محدد جهات العدالة، المبعوث بالکتاب و المیزان مفسر آیات الاکوان بآیات القرآن، نبي الحکماء و حکیم الانبیاء، طب الارواح و دوائها و عافیة الاشباح و شفائها. نور حدیقـة الوجـود و نـور حدقـة الـشهود، الامـام المعـصوم و المعلـم المعلوم سید البشر السعید الاکبر و البدر الاتم و النیر الاعظم فخـر

الانام و واضع الاحكام و العضد الاقوي معدن الصدق و الصفا سيدنا و سندنا محمد المصطفى صلى الله عليه و على آله الاذكيا و اصحابه الازكياء و التابعين لسنته و القائمين بنصرته و الحافظين لملته و الحارسين لامته و الناشرين لدعوته و الراوين لاخباره و الناقلين لآثاره و على كل من به اقتدي و اهتدي و اليه سمي و ثمي صلوة ارق من النسيم، و احلى من العسل المصفى.

اما بعد فيقول افقر الوري محمد بن عبدالله الجلي ما ذل قوم و العلم فيهم عزيز و ما عز قوم و العلم فيهم ذليل. هذا عيان لا حاجة الي دليل فعليكم بالعلم و احترامه لتبتغوا ذروة المحمد و سنامه و اقتبسوا من نوره ليخرجكم من الظلمات و يفتح لكم ابواب السموات و ينجيكم من غياهب الاوهام و الخيالات.

العلم كرامة فوق الكرامات. بالعلم يمتاز الحق عن الباطل و يعلم الممكن عن المستحيل علما يعرف به احوال المواليد و به يسخر و يخسر الهواء ويلان الحديد علما ينفع البشر في الدنيا و المحشر و لله الشكر توجه في هذا العصر جمع الطلاب نحو خلاصة الحقائق و الب الالباب لا يشغلهم تصريف السيارات عن دقائق الاشارات و لا يعمهم المباني عن المعاني و المبادئ عن المقاصد و المواقف عن المشاهد و من جملتهم ابوالفضائل ركن الدين الملا محمد سعدالدين ابن سليمان الكوبي ثم البشدري وفقه الله لما يحبه و يرضاه و اعانه علي التدريس و اغناه فانا راض من نفسه و لازم درسنا و اخذ منا علوما، فاجزنا له تدريس العلوم العالية و نشر الفوائد من الفنون الغالية كما اجازني والدي و استاذي و سيدي و سندي و مولاي ابومحمد جمال الدين جليزاده الحاج ملاعبدالله افندي باجازته عن والده الامجد جليزاده ضياءالدين الحاج محمد اسعد باجازته العالم الرباني عبدالرحمن افندي الروزبهاني عن صبغة الله

الماورني عن والـده مـصطفى افنـدي الـزادي عـن صـبغةالله افنـدي الصفوي الحسين آبادي عن والده ابراهيم بن حيدر عن والـده حيـدر بن احمد عن والده احمد بن حيدر عن والـده حيـدر الاول عـن مولانـا زين‌الدين الكردي البلاتي عن نصر الله الجلالي عـن ميرزاجـان عنـو خواجه جمال‌الدين محمود الشيرازي عن محمـد بـن اسـعد الـصديقي الدواني عن والده اسعد الصديقي الدواني عن السيد علـي الجرجنـي عن مبارک شاه البخاري عن القطب الرازي عن العلامة الشيرازي عن الكاتب القزويني عن فخرالدين عن والده ضياءالدين عمر عن الشيخ سلمان نـصرالدين الانـصاري عـن الامـام الحـرمين عبـدالملک ابـي المعالي عن ابي‌طالب المكي عن ابي عثمان المغربـي عـن ابـي عمـرو الزجاج عن ابي القاسم الجنيد البغـدادي عـن خالـه الـشيخ الـسري السقطي عن معروف الكرخي عن الامام علي الرضا عـن والـده الامـام موسي الكاظم عن والده الامام جعفر الصادق عن والده الامام محمـد باقر عن والـده الامـام زيـن‌العابـدين عـن والـده الامـام حـسين سـيد الشهداء عن والده مظهر الغرائب و العجائب النجم الثاقب علـي[1] بـن ابـي‌طالـب كـرم اللـه وجهـه و رضـي اللـه عنـه حـضرة منبـع صـدق الوجود معدن الصدق و الصفا سيدنا ابي القاسـم محمـد المـصطفي عليـه ازكـي الـصلوة و انماهـا عـن طـاوس ملائكـة المقـربين مولانـا جبرئيل الامين عن الملک القـدوس الـسلام المؤمن المهيمن العزيـز

---

١ ـ زۆر شـتی وا هەیە و بـووە و دەبـێ کە کـابرا لە منـداڵیڕا فێـری دەبـێ و خـووی پێـدەگرێ و لەگەڵ هەسـت و ویژدانـی تـێکەڵ دەبـێ جـا وا هەڵـدەکەوێ، کە ئەو شـتە لە راستەقینەش دوورە، بەڵام کابرا تازە ناتاگایانە یا ئاگایانە دەیڵێ و دەیکا و ئیتر گوێی لەوەی نییـە و هەر ناشپرسـێ دروسـتە یـا نـا؟ هەر وەک ئەو بـردنەوە سـەر هەتنەشـی عەلـی (رە) هەمـوو ئیجازەنامەکانی کوردستان. مـن زام وایە کە مامۆستا هەر بیریـشی لـێ نەکـردۆتەوە دەنا بێ‌گومان بیرێکی لێ دەکردەوە و بیرێکی بۆ دەکرد.

الجبار المتكبر الخالق الرازق البارئ المصور حضرة الله جل جلاله و عم نواله و هو الذي تعالي علمه عن كسب و نظر فسبحان الله و الحمد لله و لا اله إلاّ الله و الله اكبر.

اللهم اجعل هذه الايادي متصلة بحبلك المتين الذي لايتقطع و محصنة في حصنك الحصين لايتصدع.

اللهم اجعل هذا العهد مقربا اليک و وسيلة لديک.

اللهم يا اكرم الكرماء اكرم العلم و العلماء و روّج الشريعة الغراء و آمننا من الفتن الفاضحة بحرمة النبي و بحرمة سورة الفاتحة.

كتبت هذه لاجل قرة عينا عبدالرؤوف اللهم وفقنا وفقه بحرمة سيد المرسلين آمين.

له رۆژی شەممۆ هەشتی رەمەزانی سەنەی هەزار و سێسەد و حەفتا و حەوتی هیجری قەمەری (١٩٥٨/٣/٢٩ میلادی)

باقی یادگاره لەگەڵ ارشاد العباد بۆم رەوانه كردی.

# روون کردنەوەیەک لەسەر ژیانی حاجی مەلا سەعدی کۆیی

مەلا سەعد کۆیی کوڕی مەلا سلێمان کوڕی مەلا قادری کۆییە لە سەرەتای هەزار و نۆسەدی زایەنیدا لە شارۆچکەی کۆ هاتۆتە دونیاوە سەرەتای خوێندنی لە مزگەوتەکانی کۆدا پێک هێناوە و دوایی هاتۆتە ناوچەی پشدەر بەشی زۆری لە لای مەلا حەسەنی کوڕی شێخ بیلال هێرۆییدا ماوەتەوە بۆ پلەی دوایی چۆتە خزمەت مامۆستای کۆ لە خزمەت ئەودا ئیجازەی عیلمی وەرگرتووە دوایی بۆ ماوەیێ هاتۆتەوە وڵاتی پشدەر بە دەرس و بەحس و گوتنەوە و نووسینەوە خەریک بووە تا لە ئاکاما مامۆستایەکی نموونە و خوێندەوارێکی شارەزای لێ دروس بووە.

دوایی دەستی لە مەلایەتی هەڵگرت و رووی کردە موعامەلە و هاتە شاری قەڵادزە بەڵام لایەنی عیلمەکەی بەرنەدا و هەر بە موتاڵاو کۆشش لەو رێبازەدا بەشی زۆری وختی خۆی ئەبردە سەر یەکێ بوو لە موریدانی شێخەمینی بێژوێ و جەنابی مەلای کۆش لوتفێکی تایبەتی لە گەڵا هەبوو، لە دیانەت و تەقوا و عیلم و شارەزایی ئەو یەکجار رازی بوو و ئەیفەرموو بە حەق موجازی منە. ئێستاکەش مزگەوتێ لە قەڵادزێ بە ناوی مزگەوتی مەلا سەعدی هەر ماوەتەوە و مەشهوورە ناوبراو لەگەڵ دنیایەک لە عیلم و تەقوا و خزمەت بە ئیسلام و موسلمین لە ساڵی ١٩٧٨دا بەرەو ماڵی ئەبەدی گەڕایەوە. یەکێک لە شاگردە نموونەکانی مامۆستای کۆ رەحمەتیان لێ بێ کۆ بە کۆ.

ئەمەی ئەو دیـوەش نمـوونەی ئیجـازە نـامەکەیەتی کە وەختـی خۆی بە ناوی یادگار و تەزکار لەسـەر داوا و ئیلحـاحی خـۆم بـۆی نوسویمەوە منیش کردم بە دیاری بۆ برای زانا و خۆشەویـستم مەلا حوسێنی گورژی وفقه الله علی مراضیه و جعـل مـستقبله خیـرا مـن ماضیه.

عبدالرئوف

# بیروڕای جەنابی حاجی مەلا سەعدی لەبارەی ماموستای کۆیەدا

فەرمووی جەنابی مەلا بۆی گێڕامەوە جەلێک وا ڕێکەوت بە سۆنگەی کارێ کەوا باوکم ناردمی بۆ کەرکوک و ئەویش لەگەڵ حاجی شێخ عەلی کوڕی حاجی شێخ عەبدوڕەحمان برای شێخ ڕەزا زۆر نێوانی خۆش بوو. ڕایسپاردم کە لە کەرکوک میوانی حاجی شێخ عەلی بم و نامەیەکیشی بۆ نووسی، منیش کە چووم بۆ وێ هێشتا واردی شار نەبوو بووم کە ئەو خەبەری زانیبوو کەوا کوڕی حاجی مەلا عەبدوڵلا دێ بۆ کەرکوک و لەوێ میوان دەبێ. کاتێک نزیک بوومەوە لە ماڵەکەیان دیتم شێخ لە قاپیەی ماڵەکە بە حاڵەتی ئامادەباش لەگەڵ جەماعەتێک ڕاوەستاوە بۆ پێشوازی و ئیستیقبالی من. منیش بەو شێوە کەوا گەجێک بووم و ئەو هاوتای باوکمە و ماموستایەکی پیر و بەساڵاچووە و شەرمم کرد و زۆر باسی لێ بوردنیم کرد کە بەو تەشریفاتە قاییل نیم.

خولاسە بەو ڕێز و حورمەتە واردی مەنزڵ بووین و دانیشتم لە خزمەتیا و تا ئێستاکەش من بە خزمەت جەنابی شێخ عەلی نەگەیشتبووم بۆ ماوەیێ بێدەنگیم حاسڵ کرد گوێم لە فەرمایشاتی ئەو ڕاداشت دوایی فەرمووی ئەوە بۆ قسە ناکەی گوتم ئەمەوێ کەڵک وەرگرم لە خزمەت تۆدا و پێم وایە لە خزمەت تۆدا کە (صديق الوالد عم الوالد) کە لە جێی مامی منی بێ ئیجازە حەقی وتووژێم نییە. فەرمووی نەخێر پێم خۆشە قسە بکەین. فەرمووی منیش هەر ئەو باسەی کە تێیدا بوو جەنابی شێخ ئیستینادی بە حەدیسێک و ئایەتێک کردبوو هاتمە سەر تەحقیقی حەدیسەکە و

گوتم لە بوخاریدا لە فلان بابەیدا ئەو حەدیسەی گێڕاوەتەوە. ئەو فەرموودەیەش راویەکەی فلانە لە فلانی الی آخر الحدیث. جارێ لە پێشەوە حاڵی روات و ژیاننامەی ئەوانم بۆ باس کرد زۆر بە گرینگی و بە وردی دوایی هاتمە سەر ئایەتەکەی کە ئیستینادی پێ کردبوو لەوێشا نەزەری فەخری رازی و شێخی بەیزاویم بۆ تەحلیلکرد کە لە ئاقار یەکتر هاتوون و هەر یەکە نەزەری تایبەتیان هەیە ئەوسا نەزەری خۆشم بەیان کرد و گوتم ئەوەش قەولی سالس رای منە شێخ تەحریرو تەعەجوبی کرد لەم ئاگاهی و تەبەحورە کە من نیشانم دا. راست بۆوە ناوچاوانی ماچ کردم و گوتی شوکر کەوا بە چاوی خۆم بە گوێی خۆم بۆم روون بۆوە کە جەنابی حاجی مەلا وەجاخی روون و رۆشنە.

دەستی بە ریشیدا هێنا، جا فەرمووی ئەو چەندەکە لەوێ مامەوە عولەما و ئەعیانی کەرکوکی دەعوەت ئەکردن ئەهاتن منیش لەگەڵ هەمووان بە زبانی خۆیان ئەدوام ئەو چەندە، کە لەوێ مامەوە لە خزمەت شێخا بە کۆڕێکی علمی و ئەدەبی و خۆشی و شۆخی بەڕێوە چوو.

تەنانەت کە گەڕامەوە شێخ بۆ بەدرەقە کە زیاتر لە ئیستیقبالەکە تەشریفی هێنا واتە تا قاپی هاتبوو بۆ ئیستیقبال، بەڵام بۆ بەدەرەقە تا ئینتیهای گەڕەک لەوێ کە دەستم ماچ کرد عەرزم کرد من ئەوەندەی لە قاپیەکەڕا بەولاوە دڵم پێی خۆشە چونکە ئەوەی بە ماڵی خۆم ئەزانم ئەوەی تا قاپی تەشریفت هێنابوو ئەوە لە سۆنگەی باوکمەوەیە منیش لەوانەم کە ئەڵێم:

ا نا ا بن نفس و کنیتی ادبی    من عجم کنت او من العرب
ان الفتی یقول ها انا ذا    لیس الفتی من یقول کان ابی

# فڕی فڕی قەل فڕی

خۆشەویست دروودی خوای لەسەر دەفەرموێ: العلم فی الصغر کالنقش فی الحجر) واتا فێر بوونی زانیاری لە منداڵیدا وەکو نیگارە لە سەر بەردی. کە دیارە زۆر دەمێنێتەوە و رەش نابێتەوە.

بەڕێز مامۆستای کۆیی کتێبێکی زۆر چووکەڵە و پڕبایەخ و بەنرخی هەیە بە نێوی (فڕی فڕی قەل فڕی) من خۆم ئەو کتێبەی مامۆستام لە تەمەنی منداڵیدا لە کوردستانی عێراقێ کاتێک کە فەقێ بووم جارێک خوێندبۆوە و راستی کاکڵی واتاکەی لە بیرگەمدا هەر مابۆوە و لە مێشکمدا دەجووڵایەوە و وەک کەسێک کە شتێکی زۆر خۆش دەخوا و تا ماوەیەکی زۆر تام و چێژەکەی لەبنی ددانیداهەر دەمێنێ.

من ئەو کاتە نە خەیاڵی نووسینی کتێبێکم لەبارەی مامۆستادا هەبوو نە ئەوەندەشم دڵ بە هەڵگرتنی کتێبان خۆش بوو. زۆرتر ئەو جۆرە کتێبانەمان بۆ سەیر و پێکەنین دەخوێندەوە بەڵام کاتێک کە دەستم کرد بە نووسینی کتێبی کوڵی دڵی مەلای کۆیی هاتەوە بیرم و گەلێکم پەکوو پەکوو و زۆرم ئاخ و خەفەت دەخوارد کە بۆچی ئەو کتێبەم هەڵنەگرتووە.

ناچار دەستم کرد بە پرسین و بەولاو لادا هەڵسووڕان کە داخوا کێ هەیەتی و لە ناو کتێبخانەکەیدا هەڵیگرتووە تا ماوەیەک لێی وەربگرم. دەنا دەمزانی لە کتێبفرۆشییەکان بە هیچ جورێک پەیدا نابێ زۆرم هەوڵ دا تا سەرەنجام لەو هەموو گەڕان و هەوڵدان و تێکۆشان و پرسیارانەدا لە ناکاوێک بە ئاکام گەیشتم و ئیتر دووبارە بڕوام بەوە هێنایەوە کە هەوڵدەر بێئاکام هەر نابێ. ئەوە

بوو کە دۆستی بەڕێز جەنابی حاجی مەلا محەمەدی محەمەدزادە ماموستای گوندی مەمەلیانی سندووس موژدەی پێدام کە ئەو هەیەتی.

بەڵام دیار بوو کە زۆر دڵ پێوە بوو بە مەرجی وێدانەوە وێی دام. دۆستێکی دیکە کاک عوسمانی زاکیری بە زۆر لێی وەرگرتم و بە پەلە چۆ شار و دوو دانە روونووسی بە فتۆکۆپی لێ هەڵگرتەوە یەکیان بۆ من و یەک بۆ خۆی و بەو جۆرە ئەو دەنکەمان کردە سێ دەنک و ئەمانەتییەکەمان بە خاوەنی خۆی گەیاندەوە.

جا بە هۆی گرینگی و کەمی کتێبەکە و بۆ ئەوەی هەموو کەس لەمەولا بتوانێ دەستی وێی رابگات و ئەو دەنکە زێڕ و تەڵای دەستەوشانەش بە یەکجاری نەبەتلێ تەواوی دەقی کتێبەکەم خستە ناو مەنجەڵی لەزلقی کولی دڵی مەلای کۆیی. کە دیارە ئەویش هەر زڵقێکە لەو کوڵە و بڵقێکە لەو مەنجەڵە، کە لە سەر گڕەپێچەی تەندووری سوورەوە کراوی دایەخراو و سەرنراوە و چەندین ساڵە قژقژ دەکوڵێ.

جا ئەوەش دەقی کتێبی فڕی فڕی قەل فڕی

# دەقی نامیلکەی فڕی فڕی قەل فڕی

ئینسان ئەگەر بە گەورەیی ئەحواڵی منداڵی لە یاد بێ قیاس لە ئەحواڵی گەورەیی بکات فەرقێکی زۆر سەیر دەبینێ و ئەگەر بە چاوی دڵ تەماشاکا دەزانێ ئەو فکرەی کە لە ساتی منداڵیدا هەیبوو زۆر پاک و زۆر چاک بووە ئەمما بە تەربیەی دایک و باوک و کەس و کاری فکری لێ گۆڕا و لێیان تێکدا.

لە یادمە کە بە منداڵی گەمە (یاری)یەکمان دەکرد (فڕی فڕی قەل فڕی) چەند منداڵ دەورەیان لێک دەدا یەکی ناوی چەند باڵندەیەکی دەهێنا و لەگەڵ ناوی باڵندەکە منداڵەکان دەستیان بەرز دەکردەوەو لەو میانەدا ناوی چشتێکی دەهێنا کە نەفڕی ئەوی دەستی هەڵبڕیبا تێدەکەوت ناوی ئەو چشتە نەختێک وێچوو بوو لە گەڵ نوی باڵندەیەکی، بۆیە ئەو منداڵە لێی تێک دەچوو مەسەلەن دەیگوت: "فڕی فڕی فڕی قەل فڕی کۆتر فڕی فڕی کوتک فڕی" ئەوی دەستی بڵیند کردبا تێدەکەوت و منداڵەکان تێر پێدەکەنین و گەپیان پێدەکرد: فڕی فڕی قازی بازی فڕی فڕی فڕی قاز فڕی قاضی فڕی" دیسان تێدەکەوت چەپڵەیان بۆ لێدەدا قەشمەری (گاڵتە)یان پێدەکرد یەعنی ئەو منداڵانە فکری فیتری خۆیان جیاوازی و تەمیزێکی باشیان هەبوو چی دەفڕێ و چی نافڕێ چۆن دەفڕێ و بە چی دەفڕێ بە چاکی دەیانزانی لە پاش گەورە بوون و فکر و هۆشی قەوم وەرگرتن دەبینین فەرقێکی زۆری هەیە. بە جارێ واش سەرەوبن بووە.

ئێمان بە کەرامەتی فکری فیتری بە تەواوی گۆڕیوە مەسەلەن بە هیممەتی شێخ (فڕی فڕی کەر فڕی) دەبێ دەست بەرز کەی. (فڕی فڕی شێخ بۆ خۆی فڕی) دەست بەرز کەی. هەی هاوار بو خاتری

خوا بۆ خاتری پێغەمبەر چۆن دەست هەڵبڕم ئەو کەرە گوێدرێژە ئەو شێتە سەر زلەی ورگ پانی مل ئەستوورە چۆن دەفڕێ؟

هەی ماڵ وێران تۆ ئیمانت نییە، کافری زەندیقی، لە دین دەرچووی، نازانی شێخ خۆشەویستی خوایە، ئەمە کەرامەتی ئەولیایە، تو نەتبیستووە لە مەلایانی موتەبەحیر کەرامەتی ئەولیا حەقە، هەرچێکی لە خوای بخوازێ بۆی دەکا، تۆبە بکە دەست هەڵبڕە.

برام لازم نییە ئەوی خۆشەویستی خودا بێ بفڕێ وفڕین قاعیدەی هەیە، پێغەمبەر، ئەبوبەکر، عومەر، عوسمان، عەلی خۆشەویستی خوداش بوون و نەشفڕین. بەڵام چوێلەکە دەفڕێ و خوشەویستی خوداش نییە.

کوڕە ماڵڕماو ئەوە چشتێکی ترە وەرە ئیمان بێنە دەنا شێخ غەزەبت لێ دەگرێ. خوداش لێت خۆش نابێ و پێغەمبەریش شەفاعەتت بۆ ناکات.

خولاسە بە سەد دەسیسە و فڕوفێڵ منداڵەکە وەردەگێڕن و لە سەر فکری فیتری حەقی لادەدەن.

دیسان فڕی فڕی فڕۆکە (طیارە)ی ئینگلیزی فڕی هاتە سەر شاری کۆیە (لە ساڵی ١٩٢٢دا) ئینگلیز شاری کۆیەی بۆمبارانمان کرد و بۆمباردمانی دەکات.

منداڵە پاکەکە خێرا دەست هەڵدەبڕێ، گەورەکان دەست هەڵنابڕن. منداڵەکە دەپرسێ بۆچ دەست هەڵنابڕن؟

دەڵێن: بڕۆ کەرە چ حەددی هەیە فڕۆکە چیە چۆن دەفڕێ ئەوانە کافرن چۆن بە حەوا (ئاسمان) دەکەون؟ خۆ شێخ و ئەوالیا نین بفڕن؟

منداڵەکە: وەرن بۆ خاتری خودا دەست هەڵبڕن دەنا زەرەر دەکەن بە خوا ئەوە هات گرەگڕی دێ، بۆمبای زۆر پێیە یەکەکتان پێدا بدا بەر بکەون هەموو پارچە پارچە دەبن.

گەورەکان: بڕۆ منداڵی نەفام، تەماتە هەڵمانخەڵەتێنی تا تێکەوین، پێمان پێبکەنی؟

منداڵەکە: بە خودا مەقسەدم ئەوە نییە، بۆ ئێوەمە، حەیف دەکەم بفەوتێن.

گەورەیەک: ئەها بە خودا ئەوا هات، کوڕە ڕاست دەکا، تەقەی بۆمبای هات، لەبەر قشڵەی[1] تەقی، عاردی لەرزاند، دەنگێکی زۆر بەهێزی هات هەر وەخت بوو پەردەی گوێم بدڕێتن. مەترسن شێخ بە هیممەت ناهێڵێ زیانمان پێ بگات.

منداڵەکە پێکەنی و وتی: باوکم خۆتان بشارنەوە ئەوە ئیشی شێخ و مێخ نییە. ئەها، ها بنۆڕن شێخ ئەوا بۆخۆشی هەڵدێ، تەق بۆمبا تەقی، شێخ هەڵات. ئەوجار فڕی فڕی لە ترسان باڵی گرت. ئەها ئەوە غار دەدا بۆ کونێکی خۆی بشارێتەوە، ئا ئای ئەوە چۆ ناو ئەشکەوتەوە! هاها چۆ شەبنەبانێ!

گەورەکان: ئەی ماڵی وێرانم. خۆ شێخ هەڵات و خۆی شاردەوە، دەکوو خانەت خەرا بێ یا شێخ، ئەدی لە زەلزەلەی ڕۆژی قیامەت لە سایقەی ئینشیقاقی سەماوات، لە شەهیق و زەفیری جەهەننەم چۆن نەجاتمان دەدەی؟! داخەکەم پەککوو چۆن عەقڵی گۆڕین بە درۆو دەلەسە کوو ماڵی خواردین؟! لە دین و دنیای کردین، بە

---

[1] ـ قشڵە بینایەکە محەدمەد پاشای ڕەواندز کە ناوبانگی پاشای کۆرەیە لە سەر گردی کۆن بینای کردووە کە کەوتۆتە باکووری ڕۆژئاوایە (شمال غرب)ی کۆیە.

هیممەت هیممەت و بەرەکاتی وی تەنها بۆو ماڵی مفتی بوو. تەق... تەق... بۆمبابـــاری جێـــی قـــسە نەمـــا، هەڕا کەن، هەڕا کەن، چارەسەرە ڕۆژی نەفسییە، فڕی فڕی شێخ فڕی، مەلا فڕی، فڕی فڕی ئاغا فڕی، فڕی... فـڕی فـڕی، فـڕی فـڕی ئەفەنـدی فـڕی فڕی، فڕی... فـڕی فـڕی... حـاجی فـڕی...سۆفی فـڕی... دەروێـش فڕی...سە فڕی... مریشک فڕی، هەموو فڕین، چوونە بنەبانان....

منداڵەکە: ئەدی وا بفڕن دەنا تێدەکەون، قوڕ بە سـەرتان، ئەگەر بە شەو هات بە ئالیکتریک دونیای ڕووناک کرد لە سەربانان. لە ناو حەوشان، لە کۆڵانان، هەمووی دیتن ئەوجا چی دەکەن؟

گەورەکان: تو خـوا ئەمەش هەیە! ئەوجـار قوڕی کـوێ کەیـن بە سـەر خۆمـان، کێـوە بچـین، کێـوە بفـڕین، دەبـێ زەوی بکـۆڵین و بچیـنە بـن عـاردی، ئەوا فـڕۆکە گەڕاوە.... چـووە کەرکـوک... ئەلحەمدولیللا ... یارەببی... ئەوجارەش قوتار بووین.

داخەکەم ئەوانەی، کە زۆر کەرن دووبـــارە دەبـــنەوە کەرەکەی جاران و دەچنەوە خزمەت شێخ و دەست و پیی ماچ دەکەن و دەڵـێن قوربان لە سایەی هیممەتی تۆوە سلامەت بوون و زیانمان نەهێنا.

یەکێـک لە مریـدە هەرە کەر و گەوجەکـانی دەڵـێ بە خـودا بە غەوس چاوم لێ بوو، کە بۆمبا دەهاتە خوار حەزرەتی شێخ دەستی وەبەر دەگرتن لە ئێمەی لا دەدا، (صدق صدق آمنا آمنـا) هیممەتـی شێخ کافییە زاهیرەن خۆی شـاردەوە و بـاتینەن هیممەتـی فەرمـوو. شکوور دەرچووین، کوڕە هەر شێخ حیسابە!!

منداڵەکە وەختە لە قینان بدڕێ و تەق بکـا ئەوجـارەش فـڕۆکەی ئینگلیـزی فـڕی لە کەرکـوک، لە بەغـدا، لە موسـڵ وەک قـاز و قولینگ لە سەران دێنە خـوارێ و ئەوا لە هەمـوو لایەکەوە هـاتن و جـێبەجـێ کردیـانە ئـاگر بـاران، قیـامەتە عـالەم بە لەرزە لەرزە

دەستیان بە هەڵاتن کرد... یا غەوس! یا غەوس! شاهی نەقشبەند! ئومەرمەندان! خارخاران! پیرەمەگروون! پیرۆتە سووری مەرگێ! پیری دایان نەجات حیفز هاوار دەخیل. دیسان بەو چەشنە هەموویان خۆیان بزر کرد و خۆیان شاردەوە گەلی مزگەوت و تەکیە بە بەر بۆمبا کەوتن و رمان و خەراپ بوون.

دووبارە کە رۆیشتنەوە خەڵکی هاتنەوە دەرێ زۆر ترسان ئەسەری تەجرەبەیان دیت کەمێک هاتنەوە سەر هۆش تەمایان بوو نەختێ عاقڵ بن، بەڵام کە هێندێکیان چوون بۆ لای شێخ، شێخ نەمابوو، مەلا نەمابوو، هەموویان باڵیان گرتبوو و فڕیبوون. ئەوجا گوتیان بەڵێ بە خودا لێمان گۆڕاوە، هەر شتە قاعیدەی هەیە، ئێمە بە حیکایەتی قاڵیچەی سلێمانی پێغەمبەر و باس و خواسی عفریتان تێکەوتین، شێخان هەڵیانخەڵەتاندین، فلان سواری قاڵیچەی سلێمانی بوو، گوتی بە حەقی سلێمان بمبە فلانە جێ، دەستبەجێ بردی، عفریتەکان قەڵای کچی شایان هەڵگرت و بە بناغەوە بردیانە ناو حەوت دەریایان لە جزیرەدا دایاننا. بەعزێ لە ئەولیایان دیتوویانە کە کەعبە لە جێی خۆی نەماوە چووە بە پیر رابیعەی عەدەوییە. ئەی ئەمان رەببی دەخیل ئەوە چی بوو چۆن وای لێ هات و باسی کەرامەت و حیکایەت بە جارێ ئێمەی گۆڕی، ئەگەر لێگەڕابان هیچ نەبا لە جێی خۆمان دەماین ئەوەندە بە عاردیدا نەدەچووینە خوارەوە و وەک لە حیکایەتێدا دەڵێ:

ئەحمەد کەوتە ژێر زەمین پیان گوت دوو بەران دێن رۆژی جومعە، خۆت هەڵدە سەر بەرانە سپییەکەی، بە سەر ئەکەوی، ئەگەر بکەویە سەر بەرانە رەشەکەی لە حەوت تەبەقەی زەوی رۆدەچیت. قوڕ بە سەر خۆی هەڵدا کەوتەسەر بەرانە رەشەکەی و کەوتە بن حەوت تەبەقەی عاردی.

چـی بکەیـن تـاوانی ئـێمە نەبـوو. مەلای چـاک لە وەعزیـدا دەیفەرموو فلانە کەس هەر بە تاوێ دەچێتە مەککە دەفڕێ دەچێتە ئاسـمان سـدرة المنتهـی، بەهەشـت، کورسـی، عەرش، هەمـووی دەگەڕێ، نەمانـدەوێرا دەنـگ بکەیـن کەڕامەتـی ئەولیـا حەقـقە لە کتێبی عەقیدە نووسراوە وەک موعجیزەی پێغەمبەران دەبێ ئیمـانی پێ بێنن!!

منـداڵ بە منـداڵی بە فیتـری ئیلاهـی زۆر زیـرەکن دیـارە پرسـیار دەکاو دەڵێ: بابە ئەو بارانە کوو دەبارێ کەوا دەنک دەنک و تنۆکە تنۆکە دێتە خوارێ؟

باب: ڕ ۆڵە ئەوە مەلائیکەت دەچن لە بەحری (رزق مقسوم) ئاوێ دێنن بە بێژنگەیدا دەکەن وەک دەنـکە گەنـم و جـۆ لە بێژنگـێ دێـنە خوارێ ئەمن لە مەلام ئاوا بیستووە.

منداڵ: ئەدی بابە بۆچی هێندێ جاران بە ڕێژنە دەبـارێ و دەنکـی گەورەیە، جارجاریش نەرمە نەرمە دەبـارێ و دەنگـی ورد ورد دێـتە خوارێ وەک خونـاوەی ڕەشماڵان؟! بە پێی قسەی تۆ دەبێ بێژنـگ و سەرەد و هێڵەکیشیان هەبێ؟!

بــاب: سـەیرێ ئەم هەتیـوە بێـژۆیە، ئەوە دەرسـی شـەیتانە بە قسەی مەلایان بڕوا ناکات.

منداڵ: ئەدی بابە گیان ئەو بروسکە و گرمەی هەوری چییە؟

باب (ئەگەر سوننی بـێ دەڵـێ) ڕۆڵە ئەوە مەلائیکەتـێکە بە قەدەر ژەنـگە سـوورەیەکی قەمچیەکـی ئـاگرینی بە دەسـتەوەیە لە هەوری دەدا د و بە سەریدا دەهاڕێنێ. ئەوە برووسکەی ئاگری قەمچی و ئەو نەڕەیە و دەنگە گەورەش ئی وییە.

منداڵ: ئەدی بابە جارجارە برووسک لە عەردی دەدا ئینسان و حەیوانی دەسووتێنێ لەو جێیە بۆنی باڕووتی لێدێ و هەندێ جاران لەو جێگایە ئاسن دەدۆزێتەوە.

باب: ئەدی لەو ماڵ خراپە ئەتۆ چیت بە سەر شتی واوەیە وەڵڵا ئەوە شەیتانە سەرم بە فەتەڕات دەدا.

باب ئەگەر شیعە بێ دەڵێ: ئەوە نعلەی(علی الصحابة صلاة الله و سلامه علیک یا امیر المؤمنین)موجتەهیدی نەجەفی ئەشرەف و کەربەلای موعەللا وایان فەرمووە. ئەڵبەتتە ئەڵبەتتە وایە بابە تەمامە.

کوڕە شیعە بڕوا دەکا ئەمما منداڵە سوننی زرنگن بە قسە پڕوپووچ ناخەڵەتێن، ئیللا ئەوانە نەبێ کە وەکوو شیعان ئیمانیان بە ئیمامو هەیە بە شێخان هەبێ، ئەوانیش دەگۆڕێن. دەنا منداڵە سوننی بەتایبەتی منداڵی کوردان قەت لە زەکای فیتری خەڵقی ناکۆڕێن. لە سەر ئەو بێکەسییە ئیمڕۆ شکور منداڵی کوردان بە نەوعێ بۆ ئەوجی ئەعلا دەفڕن. هەرچی دۆستە حەق وایە کەیفی پێ بێ چونکوو زۆر باش دەخوێنن عاقیبەت بۆیان باش ئەبێ دەچن بۆ بڵندترین پایە.

هیوای من بە بێچووە کوردان ئەوەیە بە قسەی پڕپووچ نەگۆڕێن تەماشای خودای بکەن خەڵق و ئیجادی ئەو بێننە بەر چاوی قەواعیدی فیتری تەماشا کەن. خارقولعادەدە چ نییە گوێی نەدەنێ. چی خودا کرد بێتی بە عادەت ئەوە باشە ئەگەر بە عەقڵ تەماشای کەرامەتیان کردبا دەیانزانی فایدەی چییە بۆ هەموو شتێ تەشەبوسیان بە کەرامەت نەدەکرد. ئەوە ڕاستە شێخ دەفڕێ بە لۆقێ دەچێتە مەککە نوێژی سبەینێ لە مەککە دەکا و ئیشراق لە مەدینە، زوحا لە قودس، نیوەڕۆ لە بەغدا، بۆ هەموو مللەت چ

کەڵک دەگرێ؟ تا ئیمڕۆ حەججاجی قوڕ بەسەر پشتی دەشکا لە سەر حوشتر گەلێکیان بەردەبوونەوە ئەسکوردیان ورد دەبوو چل پەنجا ڕۆژ بە سواری حوشتر حیندرحۆیان دەکرد و کوڵووکیان دەچوو ئایا بۆ میللەت فایدەی چی هەیە کە شێخ بفڕێ یا نەفڕێ چووە مەککە یا نەچووە مەککە، بفڕێ و نەفڕێ تەماشای لەوحی مەحفووزی کرد ئەوەی تیا بوو بۆی کەشف بوو چ سوودی هەیە؟ بابەگوڕگوڕ ئاگری شاڵاوی هەڵسا، بەغدای ترساند کە ئاوی نەوتاوی بکا. بە عیلم وفەن و هەندەسە زەوتیان کرد و تەمایانە ئەو نەوتە بۆ ئاورووپا بەرن. ئێمە خۆمان لە ماڵی خۆمان بێبەش بووین کەشفی عیلمیمان نەبوو ئەو لە نێو عەردیدا بوو لێمان بزر بوو ئەجانب بەدەریا خست ئێمەش هەر خەریکی لەوح بووین قەی ناکات لەوە پێش سۆفی نەزەرە.

ئەم قورئانە لە لەوحی مەحفوو زرا بۆ پێغەمبەر هاتە خواری بۆ ئەم وەلی و شێخانە تەماشای ناکەن حەتتا کەمیان بە ڕەشخوێنیش دەیزانن بە مەعنا هیچ، ئەوی خەراپە نالێ، ئەوان کە ئیمانیان هەیە بە قورئان کەلامی خودایە بیزانن فکری موسڵمانان هەر بەو لاو بەولادا دەفڕێ بەڕاستی ڕوو لە ڕێگای ڕاست ناکەن.

فڕی فڕی بە فکرم هاتەوە کەری دەجالی فڕی کەری وا هوڕ و هوپ گوێ ئەوەندە درێژە حەفتا هەزار جوو لە بن سێبەری گوێیدا ڕادەوەستێ شەقامی لە مەددی نەزەری بە چل ڕۆژ هەموو دنیا دەگەڕێ خسووسەن نەڕە دێوێکی وەک دەجاڵی سوار بووە.

مندالەکە: ئەو کەرامەتی ئەولیایان سەلماند عەبدی خودا عیبادەتی دەکەن با کەرامەتیان بێ ئەی دەجال ئەوە چییە؟ ئەویش خۆشەویستی خودایە؟ خودا ئەو هەموو ئیشانەی بۆ دەکات؟ فڕی فڕی هەموو خەزێنەیی دنیا بە پەلە لە دوایی سەری وی وەک زەنگە

...سووره و زەردەواڵە و مێش هەنگوین بە هاژهاژ و گرمەگرم بە ئەمری وی دەفڕن ئەمە بۆ فڕی؟ فڕی فڕی ئەم چیایە فڕی، ئەم چیایە بە ئەمری ئەو لە ڕەگ و ڕیشە لە عاردی دێنە دەرێ و بە حەوای دەکەون دەفڕن وەک دوو بەران شەڕەقۆچێ دکەن لەم بەر و لەوبەر، ئەمە بۆ کەس نەبووە وەکوو ڕێک دەکەوێ.

گەورەکان: برای باوکم ئێمە موسڵمانین بە قەولی مەلایان مسڵمانین ئەوەی ئەوان فەرموویانە بڕوا دەکەین، حەتمەن دەفەرموون ڕووبار و نان و گۆشتی بە دوودا دەڕوا.

منداڵەکە: چی؟ ڕووبار؟ چی؟ نان؟ چی گۆشت؟ بە خوا ئەمە قسەیەکی سەیرە خۆزیا ئەمن لە ناو ئێوە گەورە نەبووبام ئەم تەرزە قسانەم نەبیستبا لە ئێوە هەرچی مەلا بیڵێ ئێوە دوای قسەی بکەون ئەوە قەت نابێ. ئەمە دیارە مەلا زۆر برسییەتی نانە ئاردی لە ماڵ نییە لە مێژە گۆشتی نەخواردیە تامەزرۆیە خەون بە نان و گۆشتەوە دەبینێ (الخیر لنا و الشر لاعدائنا) لام وایە تەفسیری ئەم خەونە ئەوەیە ئیمڕۆ سبەی کێخوا خێر بۆ خۆی دەکا و دوو سێ حەیوان سەر دەبڕێ دەیکا بە کەشکەک و مەلای دەعوەت دەکا. سەلەی پڕ لە نان و تەبەقی پڕ لە چێشتی لە بەر دەمی دادەنێن مەلا عافییەتی دەکا لاڕانێکیش دەنێرنە ماڵی مەلا، مەلاش نەختێ بە کوڵاوی و هێندێکیش بە برژاوی یەک دوو زگی تریشی لێ دەخوا یا کەسی بووە وەکوو بسحاق (بسحاق ناوی پیاوێکی بووە) ئەویش حەزی لە تەعام بووە ئەمما بوسحاق چاکە باسی تەعامی خۆش دەکا واقیعەن ئەویش حەزی لە قاورمە بووە لە گەڵ ساواری ڕزی ڕەواندزیان ئەمە ئەوەندە نان و گۆشتە بۆ ترێت خۆرەکانە.

ئەوە لە مەلای چاک دوورە گۆشت و نان و حەز بە درۆی هەڵبەستراوە خەیاڵ و خولیای برسییانە دوورە لە پێغەمبەر

چونکە پێغەمبەر وەحی لە خوا وەردەگرێ تەشریعی ئەحکان ئەکا دوورە لەم نەوعە قسە پڕوپووچانە خسووسەن تەعریف و تەوسیفی کەری دەجاڵ یا خوا لەعنەتی خوا لەو کەسەی بێ کە درۆی بە زاری پێغەمبەرێوە هەڵبەست و عالەمی ماڵوێران کرد، کردنی بە کەری نەفامی هیچ نەزان. برای باوکم وەرنەوە سەر حاڵی منداڵی، بە خوا زۆر باشترە.

فڕی فڕی قەل فڕی دەست هەڵبڕن، فڕی فڕی قول فڕی دەست هەڵمەبڕن، مەبەستی لە قولە ڕەشەیە و نافڕێ وە ئیللا سەرەو بن دەبن وەک هاڕووت و ماڕووت سەرەوژێر هەڵدەواسرێن. بەڵێ ئەویش حیکایەتی زەمانی پیرییە موسڵمانەکان، کە گەورە بوون گوێ و عەقڵیان تەواو دەبێ ئیمانیان بە قووەت دەبێ ئەمجا هەموو عەجایب و غەرایب بڕوا ئەکەن.

خۆشناوێک مەدحی کەری خۆشناوێکی تری دەکرد و دەیگوت بە خوا کەرا تۆ زۆر دەنگی خۆشە ئەویش تەشەکوری ئەکرد و دەیوت ماڵت سەد جار ئاوا بێ هیچ چاکەم بۆ تۆ نیشە ئەوا هەر لە پیاوەتی خۆتەوە مەدحی کەرێم ئەکەی. موسڵمانانیش سەد جاران ماڵیان ئاوا بێ، دەجاڵ هیچ پیاوەتیشی بۆ ئەوان نییە کەچی مەدحی کەرەکەی ئەکەن.

فێڵێک لە ناو کوردان هەیە کۆتر فڕێنکێی پێ دەڵێن وا دەبێ کچکی گچکە دەدەنە پیاوێکی زەبەلاح لێی مارە دەکەن و بۆی دەگوێزنەوە. کچەکە لێی دەترسێ هاوار دەکا و بۆی ڕاناوەستێ ئیشی خۆی لەگەڵ بکا. ئاخر کۆتر فڕێنکێی پێ دەکا شەوێ، یا ڕۆژێ گەمەی لەگەڵ ژنەکەی دەکا دەڵێ وەرە کۆتر فڕێنکێت پێ بکەم بۆ خۆت دەفڕی دەچیتە دەرەوە. ئەویش پێی خۆش دەبێ و دەڵێ باشە بە پەتێکی دەست و پێی دەبەستێتەوە و

تیشی خۆی لەگەڵ دەکا. دیارە ئەوەی لاقی ببەستریٚ چی بەسەر دیٚت ئیتر لازمە ئینسان ئاگای لە دەست و لاقی خۆی بیٚت وەئیللا تیٚدەکەویٚ.

بەلیٚ ئەگەر ئیمرۆ بلێین عەقڵ لە نیٚو موسڵمانانەدا فرِی راستە گورج دەست هەڵبرە و ئەگەر بلێین عیلم و زانین لە نیٚو کوردانـدا فرِی وایە و خیٚرا دەست هەڵێنە. هیچ رامەوەستە نە عیلم نە عەقڵ نە فکری تەنقید و موحاکەمە لە ناو موسڵمانان خسووسەن لە ناو کوردان ئەوانی کە تابعی شیٚخانن نەمایە فرِییە رۆیشتییە. لام وایە نایەتەوە مەگەر منداڵانیٚ کە تازە پیٚدەگەن فیٚڵەکی بکەن، فاقە و داویٚکی دابنیٚنەوە بەڵکوو تەیری عیلم و عەقڵی پیٚوە بیٚ دەیگرنەوە ئەویش لازمە باوکەکانیان لێیان گەریٚن لەسەر عەقڵی فیتری گەورە ببن لێیان نەگۆرِن.

خودا بە مەرحەمەتی خۆی عەقڵیٚکی چاکمان پیٚ کەرەم کا (ئامین)

# دەردی دڵی مەلای کۆیی

پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ لە فەرموودەیەکی خۆید دەفەرموێ: (کل مولود یولد علی الفطرة ثم ابواه یهودانه او یمجسانه او ینصرانه) هەموو رۆڵەیەک هەر لە سەر پاکی و چاکی لە دایک دەبێ، پاشان دایک و بابی دەیکەن بە جوولەکە یا ئاگرپەرەست یان فەلە.

بەڵێ بێگومان بە پێی ئەو فەرموودەی پێغەمبەر هەموو منداڵێک هەر لە سەر پاکی سروشتی خۆی لە دایک دەبێ و دێتە سەر دنیایەو ئەگەر لێشی گەڕێن هەروا بە پاکی گەورە دەبێ و بە پاکیش دەمێنێتەوە. جا تەماشای کەن ئەو هەموو خەڵکە هەمووی هەر بە پاکی ببێ و بە پاکیش بمێنێتەوە چۆن و چەندە خۆش دەبێ و کەشوهەوای ئەو جیهانە کەوا پڕاوپڕ و لێواولێوە لە پاکی و چاکی سروشتی و ئەوینی راستەقینە چەندە نەرم و نیانە؟ جیهانێکی بێخەوش و ژەنگی گوناح و تاوان، بێهەموو جۆرە فرت و فێڵ و درۆ و دەلەسە، بێ خەیانەت و خەراپکاری و پڕ پڕ لە راستی و دروستی و یەکیەتی و برایەتی.

راستی ئەگەر شوێنی ژین و دایک و باب و کەس و کار و دەوروبەرییەکانی لە مرۆڤ گەڕێن و هەر کام بۆلایەک و بۆ ئامانجێکی نەبەن و هەر کەش بە قازانجی خۆی جۆرێک ئاڵوگۆڕی تێدا وەدی نەهێنێ و هەر کەس بۆ لای خۆی رانەکێشێ، گومان لەوەدا نییە کە ئەو بێچارە نە هیچ فێڵ و فووتێک دەزانێ و نە خەیانەت و خەراپکاری و نە ئاگاشی لە درۆ و دەلەسە و خێچی و خواری هەیە و نە زێف و ستەم و دەزانێ و نە ناڕاستی و

دژمنایەتی. ئەوەی هەیەتی هەر راستی و چاکی و پاکی و ئەوینە. دڵـی وەک شووشـەی بـێگەرد وایە و لـە ئـاوێنەی بـێژەنـگ و ژار خاوێنترە، وەک قاقەزێکی سپی و تـازە و دەس لێنەدراوە کە هیچ شـتێکی لە سـەر نەنووسـرابێ. هەرکەس دەیـهەوێ بـۆ خـۆی و بە قازانجی خۆی لە سەری بنووسێ، لە ڕاستیـشدا هەر کەس تـوانی دەستی خۆی وە پێش بخا و بەر لە هەموان لە سـەری بنووسـێ ئەو مێشک و دڵە بۆ خۆی و بە قازانجی خۆی تاپۆ دەکا.

جـا بەڕاسـتی ئەوە دایـک و بـاب و کەس و کـاری منـداڵەکەن کە دەبێ زۆر بە چـاکی لێـی وریـا بـن و پـێش دەسـتی بـکەن و لەپـێش هەمـوو کەسدا بـۆ خـودای خۆیـانی تـاپۆ بـکەن تـا هەم بە کەڵکـی خۆیان بێ و هەم بۆ گەل و نیشتمانەکەشیان رۆڵەیەکـی لێهـاتوو و بەقـازانج بـێ و هەروەهـا لە رۆژی پەسڵانیـشدا بتـوانن وڵامـی بەرپرسییەکانی خۆیان بدەنەوە.

دایک و باب دەبێ منـداڵ هەر لە سـەر رەوشـی پـاک و سروشـتی خوایی خۆی پەروەردە بکەن و بە رەوگە و رێبازی ئایینی یەزدانیـدا بیخەنە سەر گەڕ و هەمیشە رێکەی راست و دروسـتی نیـشان بـدەن. دەنا بێگومان بەرپرس و بەرگرونی جیهان و پەسڵانن.

چونکە زۆر نێزیکە ئەو منداڵە بکەوێتە سـەر رێگەیەکـی خەراپ و هەم خۆی و هەم کۆمەڵێک لە خەڵک بەدبەخت و ماڵوێران بکـات و ئێتر وەک پشیلەی رەجەبە شێتی گەڕەکێکی بە خـۆیەوە بـسووتێنێ! منداڵ کاتێ کە لە دایکی دەبـێ جـگە لە فێـر کـردن و بارهێنانەکـانی سروشتی پـاک و خـاوێن (تعلیمـات و تمرینـات پـاک طبیعـی) هـیچ جۆرە فێر کران و بارهێنانێکی دیکەی نییە و نایزانێ.

بەڵام لە دواییـــدا وردە وردە لە چوارچێـــوەی ژیـــنگەکەی و دەوروبەرییەکانی خۆی فێری دەیان و سەدان و بەڵکە هەزاران شتی

جۆراوجۆری وا دەبێ کە سەرتاپا بۆ خۆی و گەل و نیشتمانەکەی زیانی رووت و بەدبەختییە و شۆڤار و نەیارو تەپرەشەکان لە سەر مینای بێگەردی مێشک و دڵی خاوێنی قەباڵەی خەیانەتکاری تۆمار دەکەن و ئەو چاکی و پاکییەی پێشووی دەشۆنەوە.

جا راستی ئایینی پیرۆزی ئیسلامیش هەروەک ئەو منداڵە پاکە لە دایک بوو ئێتر کاتێک کە خوای گەورە بۆ کۆمەڵی مروڤی نارد جگە لە یاسا و رێسای چاک و پاک و پێشکەوتنخوازانەی مرۆڤایەتی و خواپەرستی هیچ شتێکی دیکەی تێدا نەبوو.

راستی تا نێزیکەی دووسەد ساڵ دوای پێغەمبەرﷺ هەروا بە دەست لێنەدراوی مابۆوە، بە تایبەتی لە دەورانی پێغەمبەر و یارانی پێغەمبەرﷺ و پەیرەوانی وان و پەیرەوانی واندا نە هیچ شتێکی لێ زیاد و نە هیچ شتێکیشی لێ کەم کرابۆوە و دروست وەک منداڵێکی پاکی دوور لە هەموو پیسییەک بە پاکی و چاکی مابۆوە و دەتگوت شووشەی بێگەردە.

راستی کەسیش خیرەتی ئەوەی نەبوو، کە هەرگیز وەها خیانەتێک بکا و راستەوخۆ بە گژ خوا و پێغەمبەری خوادا بێت. چونکە پێغەمبەرﷺ لەو بارەوە هەڕەشەی گەورەی کردووە و فەرموویەتی (من احدث فی امرنا هذا لیس منه فهو رد فهو و ما احدثه فی النار) هەر کەس شتێک لەو ئایینەی ئێمە زیاد بکا، ئەو شتە فڕێ دراوە و قبووڵ نەکراوە و ئەو کەسە خۆی و شتە زیاد کراوەکەی لە دۆزەخدا دەبن.

دیارە ئیسلام ئایینێکی پاک و چاک و بێخەوش و گەردە و هیچ جۆرە خەرافات و پڕوپووچییەکی لەگەڵ نییە و نابێ ببێ و هەر کاتێک گەند و گەلاش و خەرافاتی رەگەڵ کەوت لە راستەقینەی خۆی دەردەچێ و خواش قبووڵی ناکات. (و من یبتغ غیر الاسلام

دینا فلن یقبل منه و هو فی الآخرة من الخاسرین) بەڵێ هەرکەس بێجگە لە ئایینی پاکی ئیسلامی دەس لێنەدراو دینێکی دیکە بۆخۆی هەڵبژێرێ هەرگیز لێی قەبووڵ ناکرێ و ئەو کەسە لە پەسڵانیشا لە ڕیزی ڕەنج بەخەساران و دەسبەتاڵانە. جا هەر بۆیە موسڵمانانی هەوەڵی زۆر زۆر لە مجێز بوون بۆ ئەوەی کە ئەو دینە وەک خۆی بهێڵنەوە و دەسکاری نەکە ن. نە هیچی لێ زیاد کەن و نە هیچیشی لێ کەم کەنەوە.

خوا هەڵناگرێ خۆ هە تا لە دە س وانیشدا بوو هەروا بە دە س لێ نە دراوی و بە پاکی مایەوە تەواوی ئەو کەسانەش کە وزەوزی ئاڵوگۆڕ کردنی دین یا لێ زیاد و کەم کردنیان دەهات خێرا سەرکوتیان دەکردن و نەیاندەهێشت ئامانجی گڵاوی خۆیان لە نێو خاکی پاکی ئیسلامدا وەدی بێنن و زۆر هۆشیارانە و وریایانە هەر ئاژاوەیەکیان هەر لە تۆودا خەفە دەکرد و نەیاندەهێشت بگوورێ.

داری ناکۆکی و دووبەرەکایەتییان خێرا لە ریشە دەردەهێنا و هەرگیزاو هەرگیز رێگەی بڕ بڕ بوون و قۆڵ قۆڵ کرانی موسڵمانانیان بە هیچ جۆرێک نەددا. بەڵام بە داخەوە دوای یارانی وەفاداری پێغەمبەر و پەیڕەوان و پەیڕەوانی وان ژیوار بە جارێکی گۆڕا و هەم موسڵمانان شل بوون و لە بڕشت کەوتن و هەم دژمنانی ئیسلامیش چاکتر کەوتنە سەر فێڵ و لە بڕشتتر و ئازاتر بوون، توانییان وەک دۆست و دڵسۆز خۆیان بنوێنن و فرمێسکی تیمساح بۆ موسڵمانان بڕێژن!

ئەوان زۆریان خۆ بە تاقی کردبۆوە و لە رێگای جەنگ و سوپاییەوە هەرگیز سەرکەوتنێکیان وەدەس نەهێنابوو و دەیانزانی کە لەو رێیەوە هیچیان پێ لەگەڵ ناکرێن. جا هەر بۆیە هاتن و لە رێگەی فێڵ و تەڵەکە و درۆ و دەلەسە و دووڕووییەوە وەخۆ کەوتن!

بەرگی دۆستییان دە بەر کرد و خۆیان بە برا نیشان دا و لەو ڕێیەدا هەرچی لە دەستیان هات کردیان و بە هەزاران داخی گرانەوە لەو ڕێیەدا سەرکەوتنی زۆریان وەدەس هێنا!! توانییان جگە لە خودی قورئانی پیرۆز دەس دە هەموو شتێکی ئیسلام وەردەن و بە فەرموودەی مامۆستای مەزن تەنانەت بیر و باوەڕی خەڵکیشیان هەر گۆڕی و بگرە لە کتێبەکانی بیر و باوەڕیشا شتی دڵخوازی خۆیان بو ئێمەی نەزان گونجاند. و لە پەڕتووکە مەزنەکان و کتێبە دێژەیی (شرعی)یەکانیشدا شتی وایان بۆ تۆمار کردین کە ئێستاش پاش پتر لە ١٤٠٠ ساڵە هەروا پێیەوە دەناڵێین! جا سەیر ئەوەیە کە تەنانەت مەلا گەورەکانیشمان بە شێوەی ڕەسمی بە فەقێکانیان دەگوتەوە و دەیڵێنەوە! ئیتر بەڕێژە پەکی وەها ئاوێتەی ئایینیان کردبوو کە بەڕاستی جیا کردنەوەیان کارێکی زۆر دژوار ور حەستەمە، هەر جوولەکەکان لە دوای پێغەمبەر پتر لە چەندین هەزار وتەیان بە زمانی پیرۆزی پێغەمبەروە هەڵبەست و مامۆستاش گوتەنی (لەعنەتی خودا لەو کەسانەی درۆ بە زمان پێغەمبەرەوە هەڵدەبەستن) شتی وەها خوڕافی و پڕوپووچ و خەراپیان بە نێوی دین دە مێشکی منداڵانی موسڵمان هاویشت کە نە خوا فەرمووبووی و نە پێغەمبەر و نە هیچ کەسێکی ژیرۆمەند و دینزانیش بۆی قەبووڵ دەکرێ.

ئەو ئیسلامە کە خوا بۆ محەممەدی نارد تەنیا یەک ڕەوگە و ڕێباز بوو بەڵام ئەوان کردیانە دەیان و سەدان ڕێچکە و ڕێبازی جیا جیاو تەنانەت دژ بە یەکتریش. تەریقەت و مەریقەت و شێخایەتی و مێخایەتییان پێوە لکاند بە شێوەیەکی زۆر فێڵبازانە تەریقەتیان ڕەگەڵ شەریعەت خست و تەریقەتیان دانا بە کاکڵ و شەریعەتیشیان کردە توێڵک. خۆ دیارە کە هەموو میوەیەکیش

کاکڵەکەی گرینگە و تویکڵەکەی ئەگەر نەشبێ زۆر گرینگ نییە و تەنانەت هی زۆرێک لە میوەکان هەر فڕێ دەدرێ.

جا ئەوجار هێنایان تەریقەتیشیان کردە بە دەیان و بەڵگە سەدان تەریقەت و بەو جۆرە موسڵمانانییان کردنە تۆوی پڕپڕە و ئاردی نێو دڕوان و ئیتر یەکیەتییە پۆڵایینەکەی موسڵمانانیان وەها تواندەوە کە چەندین سەدەیە هێشتا نەمەیوەتەوە!

ئەو هەموو ڕێچکە و ڕێباز (مذاهب)انە ئەو هەموو تەریقەت ومە ریقە تانە یان بەو هەموو پەیڕەو و پرۆگرامانەوە لە بەر دەمی منداڵی کاڵی زۆرخاوی موسڵمان دانا و ئیتر بەو جۆرە سەریان لێ شێواند و ڕێگەیان لێ گۆڕی و بە فەرموودەی مامۆستای گەورەمان ڕەببی –

ئەوی ڕێـــــگەی لە کوردەکـــــان گـــــۆڕی
لەعنەتـــــی خـــــودا لە ئەلـــــحەد و گـــــۆڕی
ڕە ببـی هـە رکـە س کـە دژ منـی کـورد بـی
چـــاوی بـــا دە ر پەڕی و ملـــی وردبـــی

سەرەنجام وای لێ هات کە موسڵمانانیان تێک بەردا و بە گژ یەکتریاندا کردن و خۆ دزیش بازاڕی هاڵۆزی دەوێ، زۆر چاکیان بۆ هاتبوو موسڵمانان دەستیان دە بەرۆکی یەک نابوو و خەنجەریان بەخوێنی یەک سووبوو ئەوانیش هەستیان کرد بەگوێستنەوەی سامان و دەرهێنانی کانگاو چاوەکانی وڵاتی ئیسلامی و ئیتر گورژی گوتەنی:

بەگژ یەکدا دەچین و خەنجەرن بە خوێنی یەک سوورە
لەدژمن نیز یـکە دڵمان و هـەر تەنیا لەیەک دوورە
تەواو داهـات و سـامانی وڵاتـیش گـاوران ئەیـبەن
مـوسڵمانیش سواڵ و ڕاوو ڕووتـە بـۆ ژیـان ئە یکەن

بیر و باوەڕی ئەو کەسانەی کە لە سەر هەر کام لەو ڕێچکە و ڕێباز و تەریقەتە جۆراوجۆر و جیا جیایانەن جۆرێکە کە لە بەر گروپگەراییەکەیان ڕاستەقینەی ئاییني ئیسلامیان یا هەر لە بیر چۆتەوە و یا زۆری گرینگی پێ نادەن، چونکە بە لای وانەوە شەریعەت توێڵک و تەریقەت کاکڵە و دیارە هەمیشەش کاکڵ لە توێکڵ گرینگترە. دەک نۆشی گیان نەبێ ئەو کاکڵە پیسەی دەرخواردیان دان.

جا هەر ئەوەندە خۆی بەڵگەیە بۆ ئەم داوایە کە ئەگەر لە لای وان بێڕێزی خوا نەخواستە بە خوا یا پێغەمبەریش بکرێ زۆری گرینگی پێ نادەن و ڕەنگە هەر قەڵسیش نەبن، بەڵام ئەگەر پێیان بگوترێ شێخەکانتان شێخ نییە یان پیاوی چاک نییە یان تەریقەت لە بنیڕا شتێکی خەراپە و.. یا بگوترێ بابا ئەو بەرنامانە هەر دە ئیسلامێدا نین، ئەگەر هەبان پێغەمبەر دەستووری لە سەر دەدان یان یار و یاوەرانی پێغەمبەر دەیانکردن بە یەکجاری لە کوورە دەردەچن و هەر خوا خۆی دەزانێ چۆن دەهاوژوێن؟

مامۆستایەکی خۆشەویست و بەڕێزم جەنابی مامۆستا مەلا حوسێنی فیردەوسی کە هەر خەڵکی گوندی خۆمان سارتکی‌یە بۆی گێڕامەوە و فەرمووی فەقێ بووم چوومە لای مەلایەکی مریدە شێخ بەو مەرجە جێگەی کردم کە لەگەڵیان خەتمەی شێخی بکەم، هەموو ڕۆژێ لێی دەپرسیم ئەرێ حوسێن گیان! خۆشەویستی شێخت زیاد نەبووە؟ منیش دەمکوت نەوەڵڵاهی هیچم لێ حاڵی نییە! سەرەنجام ڕۆژێکی منیش بەویم گوت ئەرێ قوربان بۆچی جارێکی ناڵێی خۆشەویستی پێغەمبەرت زیاد نەبووە؟ گوتی ئەوە هیچ هیچ لە وی گەڕێ گەڕێ!

جا مامۆستای گەورەمان خوا بە میهر و بەزەی خۆی شادی بفەرموێ، دێنێ دەردی دڵ دەکا و لە کتێبی فڕی فڕی قەل فڕیدا ئەو کوڵ و بڕک و ژانە دڵانە هەڵدەڕێژێ و بە شێوەی چیرۆکێکی زۆر سادە و باوێکی منداڵانە نیشانی دەدا.

ئەو بەڕێزە منداڵێکی دڵپاکی زۆر خاوێنی ڕەوش سروشتی نەگۆڕدراو لەگەڵ چەند کەسی پیاوی فریو دراوی مریدە شێخ کەر کراو دادەنێو یاری فڕی فڕی قەل فڕییان پێ دەکات. گەورەکان لە نۆرەی خۆیاندا دەیانهەوێ منداڵەکە بیرو بیر و باوەڕی چەوت و چەوێڵ و تەریقەتبازی و شێخ بازاڕی و مریدایەتی بەرن وباوەڕی پێ بە شێخ و گەورەیی وی پەیدا بکەن و پێی دەڵێن شێخ دەفڕێ بە هیممەتی شێخ کەر دەفڕێ شێخ بۆمبای لە ئاسمانێ دەگێڕێتەوە و ناهێڵێ بتەقێتەوە و زیان بە خەڵک بگەیەنێ، بەڵام منداڵەکەش کە خاوەنی بیر و باوەڕێکی پاکی سروشتی و دڵ و دەروونێکی بێخەوشی وەک مینای بێگەردە و هەرچەندی دەکا و دەکرێنێ بۆی قەبووڵ ناکرێ و ناتوانێ بیسەلمێنێ و ناچار هاواری لێ بەرز دەبێتەوە و دەڵێ هەی هاوار بۆ خاتری خوا ئەو شێخە زگ زلە و ئەو کەرە گوێدرێژە چۆن دەفڕن؟ ئاخر بابە هەموو شتێک بۆ خۆی یاسا و ڕێسایەک و بەرنامەیەکی تایبەتی هەیە، فڕینیش بۆ خۆی هەل و مەرجێکی تایبەتی هەیە و کابرا ناتوانێ وا بە ئاسانی بفڕێ.

جا مامۆستای گەورە خوا لێی خۆش بێ لەو چیرۆکە بەنرخەیدا قارەمانی چیرۆکەکە منداڵێکی کاڵی سادە و ساکاری دەروون پاکی ڕاستی خواز و ڕاستگەرا دادەنێ و لایەنەکانی دیکەی چیرۆکەکە چەند کەسی گەورە و فێڵ لێکراو و مێشک تالان کراو وفریو خواردوون بە پرووپووچ گەرا و خەرافاتی لە پێنووس دەدا و پێکەوە ئەو چیرۆکەیان پێ دەگێڕێ بە جۆرێک، کە گەورەکان دەیانهەوێ بە

منداڵەکە بسەلمێنن شێخ، چونکە خۆشەویستی خوایە(ئەگەر ببێ) دەتوانێ بە حەوادا بفڕێ و بە سەر ئاوێدا بڕوا، بەڵام فڕۆکە، چونکە گاور دروستیان کردووە یا گاوری تێدان ناتوانێ وە حەوا بکەوێ و بفڕێ. کە دیارە زۆر زۆر لە ژیری و ئاوەز دوورە و مامۆستا گوتەنی برا ئەو عەسرە نەما کاکە ئەو دەورە رۆیی شێخ بە حەوادا بفڕێ یا لە سەر ئاوێ رۆیی.

بەڵێ منداڵەکە راستی خواز و راستی ویستە و دەیهەوێ پێیان بقەبووڵێنێ کە بابە ئاخر راستەقینە شتێکە و فریو و فێڵبازیش شتێکی دیکەیە. پێویست ناکا هەر کەس خۆشەویستی خوا بوو هەر بفڕێ تەماشا کەن پێغەمبەر و یارانی خۆشەویستی خوا بوون هیچ نەشدەفڕین و بە سەر ئاوێشدا نەدەڕۆیشتن. چونکە خاوەنی هەلومەرجی فڕین نەبوون. نە باڵیان هەبووە نە ئەو کاتیش ئامرازی وەکوو فڕۆکە و کۆپتێر هەبووە کەوایە هەر چەندە خۆشەویستی خواش بوون نەیانتوانیوە بفڕن.

بەڵام چۆیلەکە و نموونەکانی وی لە مەل و باڵندە ئەگەرچی نە پێغەمبەر و نە خۆشەویستی خواشن چونکە باڵیان هەیە و خاوەنی هەلومەرجی فڕینن دەتوانن بفڕن. ئاخر هەر شتێک بۆ خۆی خاوەنی یاسا و رێسا و بەرنامەیەکی تایبەت بە خۆیەتی. و بە زاراوەی زانیاری تا سوغرا و کوبرای قەزیە راست و دروست نەبن ئاکامی دروست نادا.

جا بەهەشتی مامۆستای گەورە لەو چیرۆکەدا ئەوەمان پێ دەڵێ کە موسڵمانان و بەتایبەتی موسڵمانانی کورد هەر وە دوای شتی خەرافاتی و پڕوپووچ و ئەفسانەیی کەوتن و لەو رێیەشدا راستەقینەیان ون کرد و بوونە هۆی گومڕایی تۆرەمەی داهاتوو و بەرەی دواڕۆژیش (اضلوا کثیرا و ضلوا عن سواء السبیل) زۆریان

گومڕا کردن و خۆشیان هەر ڕێگەی ڕاستیان لێ ون بوو. دەیان و سەدان شتی بێبناوان وبێڕاستەقینەی وەک قالیچەی سولەیمان، دەریای ڕۆزی دابەش کراو (بحر رزق مقسوم)، داستانی ئەحمەد و شەوی بەرات، لە بەر دەستا بوونی دێو و درنج و جنۆکە، عەبدی سۆفیان و کەری جرجاڵ یان بۆ ئێمە ساز کردووە و هەر لە منداڵیڕا دە مێشکیان هاویشتووین و جا بە گەورەییش تەنانەت بگرە بە زانیاری باشقە مەلا و زانا و پسپۆڕەکانی ئیسلامیش لە مێشکمان ناهێنرێتەوە دەر و وە ژەنگی ئاواڵ بۆ خوا دانان و هاوبەش بۆ پەیدا کردن و ئەو جۆرە گوناحانە و کرێژی نەزانی وەها ئاوێنەی دڵمانی ڕەش کردووە کە بە ئاسانی و هەر وا بە سووک و سادەگی بۆمان مشتوماڵ ناکرێ و خاوێن نابێتەوە.

بەڵێ جا ئەوەیە کە مامۆستای گەورەمان دەفەرموێ: دەبێ خەڵک ڕاستیخوازو ڕاستیویست بن، (خوارق العادە)و کەشف و کەرامات و درۆ و دەلەسەی شێخ و مێخان چ کەڵکێکی هەیە و بۆچی دەبێ و چ بارێک لە سەر شانی خەڵکی موسڵمانی هەژاری زۆر لێکراوی چاو بەستراو لادەبا و چ دەردێکیان لێ کەم دەکاتەوە؟!

جەنابی شێخ بفڕێ، یا نەفڕێ، بچێتە مەککە یا نەچێ، بە لۆقێک ئەو سەرەو سەری دنیا بکا یا نەیکا، بە ئێسرێک هەموو جیهان بگەڕێ یا نەگەڕێ چ دەبێ و ئەم گەل و ئایین و نیشتمانە چ قازانجێکی لێ دەکا؟ شێخ هەر خەیانەتمان پێ نەکا و دەرخواردی بێگانانمان نەدا بەسە. حاشا هیچی ویمان لەوە پتر ناوێ. ئاخر زۆر سەیر و سەرسووڕهێنەرە بۆ چی تا ئەوڕۆ حاجییە هەژارەکانمان بەو هەموو زەحمەت و نارەحەتییەوە دەرد و ئازار و نیزیکەی دوو مانگ بە سواری حوشتر حیندرحۆیان دەکرد تا دەگەیشتنە مەککە و ئی واشیان هەبوو کە لە حوشترەکەی بەر

دەبــۆوە و ملــی دەشــکا، بەڵام چــۆنە جەنــابی شــێخ هەر بە ئیـسرێک(لحـظە) یـا بە چـاو لە سـەر یەک نانێـک دەچێـتە وێ و دەگەڕێــتەوە؟ ئەدی ئەگەر وایە و خــاوەنی ئەو هەمــوو کەشــف و کەرامات و زانیاری نهێنی و دۆستی وا نیزیکی خـودان، بـۆچی ئەو هەمـوو چـاوە و کانگـا گرینگـانەی کوردسـتان و تەنـانەت نەوتــی کەرکــوک و کرماشــان دەرنــاهێنن؟ خــۆ ئەوان ئامــانجی هەرە گەورەیان پوول پەیدا کردنە و پوولیش لەو ڕێیەوە زۆر چاک پەیـدا دەبێ، بۆچی نۆکەری و بەندەگی بۆ دەکەن؟ بۆ چی لە ڕێیەکی ئـاوا ئابڕوومەندانە وەدەستی ناهێنن؟ بۆچی پەتی نۆکەری و قەڵاتەی راو پێکەری لە ملی خۆتان دەرناهێنن و خۆتان ناکەنە پیاو؟!

مەگەر نابینن، کە بێگانەکان بەهۆی زانیاری زۆر و پیشەسازی و ژمێـرە و پێـوانە چـۆن کانەکـانی کوردسـتان وبگـرە هەمـوو خـاکی ئیــسلامییان دەرهێنــاوە و زەوتیــان کــرد؟ بەڵام شــێخە بێگــانە پەرستەکان هەر ئاگاشیان لێ نەبوو ئێستاش هەر پێمـان دەڵـێن بە کەرامەت چەسپاندوویانە کە کەوا نوورە لەباباگوڕگوڕ هەڵدەستێ و هیممەتی فلانە شێخە ئـاگری بەرزی بابـاگوڕگوڕ بەغدای روونـاک کردبــوو شــەوقی لە دونــدی بــرایم جەلالــی کــورتەکڕا دەبینــرا و ئەوانــــیش لە بەر نەزانــــی و دەستەوســـتانی خۆیـــان و لەبەر خەیانەتکاری و بێگانە پەرستی خۆیـان خەڵکیـان وا حـاڵی کردبـوو کە ئەوە نــوورە لە گــۆڕی پیــرۆزی بابــاگوڕگوڕی پیــر و پێــشەوا هەڵدەستێ. دەک بە درۆیان دڕێن.

بەڕێــز هــۆنەری ژیــری کــورد عە بــدوڵڵا پەشــێو گەمە بەو بیروباوەڕە پووچە دەکا وبە پەژارەوە دەڵێ:

مناڵەکـان مناڵەکـان! ئەی برسـییە ژیـن تالەکـان! دەزگیـرانم کوترێکی دیار بەکرە.....

بۆ گواستنەوەی رۆژ ئەژمێرم پەر پەر دری قەدی چیام قەف قەف بری کە لەدەرگای سنورم دا ؛ تفی دەمی پوستال رەشیک ها سوغی دا نیو چاوانم!! وە هەروها ئەو هەڵبەستەی پیشوی ئەو بەرێزە بیر دێنمەوە کە دەڵی:

منداڵەکان! مناڵەکان

ئەی برسییە ژین تاڵەکان!

لە سەر سینگە نەوتاوییەکەی بابە گوڕگوڕ

نیزیک تاڤگەی سەرەوژووری زێڕینی گڕ

گڵکۆیەکی بچکۆلەم دی

لێی نووسرابوو

ئا لێرەدا

مناڵێکی چاوبزی کورد

لە برسان مرد!!

یان دەیانگوت کابە لە جێی خۆی نەماوە و گۆیا بە پیر خاتوو رابیعەی عەدەوییەوە چووە! کەرێ جرجاڵێ گوێی ئەوەندە پانن، کە لە ژێر سێبەری گوێیەکیدا جێگەی حەفتا هەزار جوولەکە دەبێتەوە.

جا بۆیە مامۆستای بەڕێزمان دەفەرموێ: کابرایەکی خۆشناوەتی بە کەری کابرایەکی دیکەی خۆشناوەتی هەڵدەگوت و دەیگوت کەرەکەی تۆ زۆر کەرێکی چاکە و دەنگی زۆر خۆشە... ئەویش لە وەڵاما دەیگوت ماڵت سەد جار ئاوەدان بێ، هیچ چاکەیەکیشم بۆت نییە و هەر لە پیاوەتی خۆتەوەیە کە ئاوا بە کەرەکەمدا هەڵدەڵێی.

راستی جرجاڵیش هیچ چاکەیەکی بۆ موسڵمانان نییە بەڵام هەر لە چاکەی خۆیانەوە ئاوا بە کەرەکەی هەڵدەڵێن و بۆی بوونەتە چاوەش! ماڵیان ئاوا لە ئاقڵی خۆیانەوە!

دیسان ئەو بەڕێزە لەو چیرۆکە چووکەدا پێمان دەڵێ کە خەڵک ئەوەنـدە برسـی و هەژار و نەدارە کە تەنـانەت مەلای بەدبەخـت و ماڵوێران ئەوەندە تامەزرۆیە لەسوێیان و لەززەتان خەون بەنان و گۆشتەوە دەبینێ ئەوەندە برسی و ئاتاجە خەونەکەی بە دڵخـوازی خۆی مانا دەکا وخەیاڵ پلاوێکی باشی بۆ دەکا.

سەرەنجام دەڵێ وا هەڵدەکەوێ کە لە نێو کورداندا بـاوە کچێکـی منداڵی گچکەی هەژار دەدەن بە کابرایەکی تەمەنداری زەبەلاح و لێی مارە دەکەن و بۆی دەگوێزنەوە. کچە بێچارەکە لە کابرا دەترسـێ و خۆی نادا بە دەستەوە، هاوار هاواری لێ پەیدا دەبێ. ئەمجـا کـابرا لێی دەگەڕێ تـا ئـارام دەبێـتەوە پاشـان لە ڕێگەی فێـڵ و فـووتەوە بۆی دەچێ، شەو یا ڕۆژ گاڵتە و دەسبازی لەگەڵ دەکا و پێی دەڵـێ وەرە با کـۆتر فـڕێنکەت پـێ بکەم. ئەویـش نـازانێ و دەڵـێ باشـە. کابراش دێنێ دەست و لاقی پێکەوە دەبەستێت و وای تێدەگەیەنێ کە بەو جۆرە دەتوانی بۆ خۆت بفڕی و بە کولانە و پەنـجەرەدا بچێـتە دەرێ و وەک کۆتران باڵ بگری.

جـا کـابرا بەو جـۆرە کـاری خـۆی لەگەڵ دەکـا و ئەویـش دژکردەوەیەکی پێ ناکرێ چونکە دەست و لاقی بەستراون و کەسێک کە دەست و لاقی ببەسترێن دەبێ حاڵی کوو بێ؟

ئەمجا دەفەرموێ ئێمەی کوردی هەژاری ماڵوێران وەک ئەو کـچە بەدبەختە لێقەوماوە دەست و قاچمان بەستراوە و دەرەتانمان نییەو داکۆکیمان پێ لە خۆمان ناکرێ. دژمنان وەها ڕێگەیان لێ بڕیوین و دەست و پێیان بەستووین و وڵاتیان لێ تەنیوین کە هەرچی خۆمـان بێژ و بەوێدا دەین لەبەر بێیەکیەتی هیچمان لە دەس نایە و ئەوان دەتوانن بە کەیفی خۆیانمان لەگەڵ بکەن. ئێستا هەر خۆت پێم بێژە چماوە لە گەڵمان بکەن؟ مەگەر ماڵیان نەخواردین؟ نیـشتمانیان لـێ

دڵبەش و داگیر نەکردین؟ دینەخەمانیان لێ دەس تێوەرنەداین؟ئاقڵ و هۆشیان لێ نەستاندین؟لە ماڵی خۆمان وەدەریان نەناین؟لە ژیان و لە هەموو شتێکیان نەکردین؟ دەست و لاق و چاویان نەبەستین؟

جـا پاشـانیش بە داخ و کەسـەرێکی زۆرەوە دەفەرمـوێ: ئەگەر بڵێین ئیمڕۆ عەقڵ لە نێو موسڵمانان فڕیوە راستە و درۆی تێدا نییە و باوەڕ بکە و خێرا دەست هەڵبـڕە. هەروەهـا ئەگەر بڵێـین عـیلم و زانیـاری لە نێـو کـوردان فڕیـوە و نەمـاوە، دیـسان بـاوەڕ بـکە و گورجێ دەستت هەڵێـنە، دەنـا تێـدەکەوی و دەیـدۆڕێنی. چـونکە بە داخەوە ئەوڕۆکە نە ئاقڵ و ئـاوەز لە نێـو موسـڵمانانـدا مـاوە و نە عـیلم و زانیـاریش لە نێـو کوردانـدا. جـا بەتـایبەتی لە نێـو ئەو کوردانەی کەوا کەوتـوونەتە دوای شـێخ و مێخـان و بـوونەتە مریـد هەر بە جارێک بـاری کـردووە، نە دیـن مـاوە، نە ئاقـل، نە بیـر و هەستی ئازادی، نە مرۆڤایەتی و کوردایەتی، نە زانست و زانیاری، نە هۆش و هەستی تەکپەرەستی و نە...

## مەلای گەورە، دلێر مەردی جۆگەتشکێن

جستانان لە کوێستانان بە گشتی ولە کوێستانە سەر دە ئاسمان هەڵکشاوەکانی کوردستانی سەر بەرز بەتایبەتی، جاری وا دەبێ کە ئەوەنـدە بەفـر دەبـارێ تەواوی رێوبـان دەگیـرێن و هـاتوچۆ بە تەواوی دەبـڕێ و پێوەنـدی لە نێـوان خەڵکـدا نـامێنێ. جـا بـۆ کردنەوەی رێوبان و پەیدا کردنەوەی پێوەندی نێوان خەڵک لاوەکان دەستە دەستە خۆیـان هەڵـدەکەن و دێـنە مەیـدانێ و جـۆگەتێ بـۆ هەمووان دەشکێنن.

بەڵام لەو بەینەدا کێهە لە هەمووان ئازاتر و دلێرتر، قۆچاختر و لە هەمووان پتر دە خۆی راببینێ، ئەو وەپێش گشتیان دەکەوێ و رێیە بۆ هەمووان دەشکێنێ و کەلێنێ دەو بەفرە حەستەم و فرزە برەی دەخات. جا لە پاشان ئەوانی دیش پێدا دەڕۆن و تا سەرەنجام وەهای لێ دێ کە رێیەکە بۆ هەموو کەس پانتاو و تەخت دەبێ و ئەوجار ئیتر هەر کەسێکی بێهێز و لاوازیش هەر دەتوانێ پێیدا بڕوا.

دیارە کە ئەو کارەش لە دەس هەموو کەس نایەت و هەر کەس ناتوانێ و دە خۆشی رانابینێ وە پێش گشتیان بکەوێ و جۆگەتێ بۆ خەڵکی بشکێنێ. چونکە ئەو کارە کوڕی ئازا و دلێر و بەهێز و دەخۆڕادیتووی دەوێ و مەردی قارەمان.

جا راستی مەلای گەورەش خوا لێی خۆش بێ، لە دەورانێکدا ژیاوە کە دەسەڵاتی تەریقەت و شێخ و مێخان تەواوی وڵاتی کوردستانی تەنیبۆوە و بە تایبەتی دوو تەریقەتی قادری و نەقشبەندی خەڵکی کوردستانی گەورەیان بە شێوەیەکی سەیری ناجۆگرافیایی لە نێو خۆیاندا بەش کردبوو. کاڕانی مرید و دەروێشان بە دوای شێخ و خەلیفاندا دێ بە دێ، شار بە شار، کۆ بە کۆ، ناوچە بە ناوچە و هەرێم بە هەرێم دەڕۆیشتن و دەگەڕان و مانۆڕیان دەدا.

ئیتر بەو جۆرە لەبەر چاوی دۆست و دژمن خۆیان نیشان دەدا. هوولە هوول و نەڕە نەڕی دەروێشان گوێچکەی پیاوی کەڕ دەکرد، تەکیە و خانەگاکان کە لە ماکا وەک مزگەوتی زیانن لە بەرابەر مزگەوتانی خودادا راست کرابوونەوە و ژمارەیان لە ژمارەی مزگەوتەکان لەوانەبوو زۆرتر و پتریان بە قەرای وان بێ و لە پەنای گەلێک لە مزگەوتە خوداییەکاندا خانەگایەکیش ساز کرابوو کە ئێستاش لە گەلێک جێیان نموونەیان بە داخەوە هەر ماوە!!

لەباتی حوجرەی فەقێیان و فێرگەی زانیاری، تەکیە و دەروێشدان ئاوەدان دەکرانەوە و ژمارەی مرید و دەروێش و شێخ و خەلیفان زۆر لە مەلا و فەقێ و لایەنگرانی ئایینی راستەقینە و تەکیەرستانی راستی پتر بوو.

دەروێشگەل ئاور و ئاسنیان دەخوارد و دار و بەردیان قووت دەدا! خەڵکیان سەر دەبڕی و مار و دووپشکیان دەگرتن، مەلا زاناکان سەریان لێ شێوابوو لە داخان وەخت بوو دیق بکەن! مەلای گەورە گوتەنی:

ئەوەی زانــــایە نـــــاو جەرگـــــی پەڵاســـــە
ئەوەی نـــــــادانە نـــــــازانێ چ باســـــــە

مەلای نەزان و نەخوێندەوار بێسیوادەکانیش دەیانگوت ئەوە کەرامەتی ئەولیایانەو کەرامەتی ئەولیایانیش هەقە! ئەو مەلایانەی لێیان بەدەنگ هاتبان و کەمێک بەرهەڵستی کردبان زوڕنایان بۆ لێدەدان و دەیانگوت کافر بوون، یان بوونەتە کەڵبەش و وەهابی و لە لایەن دەزگا و دەسەڵاتدارەکانی ناوچەیی سەروەزل و هێزی چەپەڵی ئینگلیزیشەوە دەخرانە ژێر زەخت و گوشار و پرسیارەوە و زیندانی و ئازار و ئەشکەنجە دەکران و لە لایەن خەڵکی بە نێو موسڵمانیشەوە لە دێیان و لە جێیان دەردەکران و رانەدەگیران و مووچە و بەراتی کەم و کوڕ و هەر نەبووشیان هەر لێ دەگێڕانەوەو بەو جۆرە دەبوونە هۆی ئاوارەیی و دەربەدەری و سەرگەردانی خۆیان و ماڵ و منالیان.

دام و دەزگــای تەریـــقەت و شـــێخایەتی چ لە بـــارودۆخی نێونەتەوایەتی گشتییەوە و چ لە باری ناوچەیی و تایبەتییەوە گەلێـــک پـــتەو و بەهێـــز بـــوو، هەروا بە ئاســـانی نەک هەر

نەدەڕووخێنرا، بەڵکە هەر نەشدەڕووشێنرا!! چونکە لە لایەکەوە فەرمانڕەوا نارەواکان و هێزە دەسەڵاتدارەکانی سەر وە زلهێزی کۆنەپەرستی ئینگلیز پشتیوانیان بوون و کۆمەک و یارمەتی تەواویان پێ دەکردن و لە پارە و پووڵ پەکیان نەدەخستن و لە لایەکی دیکەشەوە ئاغاوات و کوێخا و گزیر، کە هەر کامێکیان گۆپاڵێکی سەرکوتکەری گەلی کورد بوون چونکە قازانجی خۆیان دەوەیدا دەدیت بە درۆ یان بەڕاست مریدی بێ دەسەڵات و نۆکەری ئالقە لەگوێی وان بوون. کە بێگومان ئاوا چاکتر دەیانتوانی خەڵکی هەژاری نەخوێندەواری کورد کەر بکەن و بچەوسێننەوە.

چا هەر بۆیە بە هەموو هێز و توانایی خۆیان داکۆکی کار و پشتیوانی داموودەزگای شێخ و شێخایەتی بوون. هەر مەلایەک بۆنی نەیاری یا دژایەتی شێخانی لێ هاتبایە دەهۆڵی گاوریەتی و بێدینی یان بۆ هەڵدەگرت و بە خوانەناس و لە دین وەرگەڕاو و فاسق و..یان بە خەڵک دەناساند و وەهایان لە بەرچاوی خەڵک سووک دەکرد کە هەمووان هەر بە چاوی دژمن و نەیار چاویان لێ دەکرد و تەنانەت هەروەک باس کرا لە جێیانیش هەر رایان نەدەگرت و وا هەڵدەکەت کە لە ساڵێدا ناچار بوو دوو سێ جێیان بکا و لە هیچیشیان نەحەسێتەوە.

مەلای بێچارە یا دەبوو مل راکێشێ و تەسلیمی خەڵکی نەخوێندەواری دین‌نەزان بێ، یا دەبوو بە یەکاری دەس لە مەلایەتی هەڵبگرێ، کە بێگومان ئێستاش ئەو حاڵەت و ژیوارە نالەبارە بۆ گەلێک لە مەلا هۆشیار و رووناکان روو دەدا و خۆشم هەر لێی بێبەش نەبووم.

بەسەرهاتی دڵتەزێنی هۆنەری هێژای گەلی کورد مەلا رەسووڵی ئەدیب نموونەیەکی چووکەیە لەو هەموو کارەساتە سەخت و

درۆزانەی کە لەو ڕێیەدا بە سەر مەلای هەژار و هۆشیاری کورد هاتوون.

خوا لێخۆشبێ مەلا رەسووڵی ئەدیب بە هۆی ئەوەی کە هەر لە بنی‌ڕا لە ژیواری زۆر دژواری مەلایەتی لە کوردستاندا زۆر جاڕس و بێزار دەبێ، دەس دەکا بە پیشە و پژگاڵەکانی وەک ئاش‌وەستایی، پزیشکی، دارتاشی و مامۆستایەتی وانە گوتنەوە بە کوڕە ئاغا و خاوەن دەسەڵاتەکانی ناوچەکە.

بەڵێ ئەو تەکپەرەستە راستەقینەیە لە دوامین ساڵەکانی ژیانیدالە گوندی سەرگیزی ناوچەی شنۆیە دەبێتە مامۆستای کوڕەکانی ئاوڕەحمان ئاغای شێخ پەرستی مێشک بەتاڵ، مەلایەکی نامەلاش بە نێوی مەلا مەحموود کە بڵێندگۆی راگەیاندنی کەشف و کەراماتی درۆزنانەی شێخی بورهان دەبێ و لەگەڵ ئەدیبا لە باری بیر و باوەڕەوە دژایەتی و ناکۆکییان دەبێ.

جا ئەو مەلا ئالقە لەگوێیە دەچێتە لای ئاوڕەحمان ئاغا و گەلێک شەیتانی و شۆڤاری لە ئەدیب دەکا ئەویش تەواوی مووچەو بەراتەکەی لێ دەبڕێ و سەرەڕای ئەوەش لێی دەکەوێتە بڕوبیانوو و دەیهەوێ کارێکی وای بە سەر بێنێ کە نەک هەر بە جارێک تەمبێی بکا و بەس، بەڵکە سەرەڕای تەمبێ کردنی یەکجارەکی وی لەمەولا هیچ کەس نەتوانێ لە رابەر شێخا بکۆخێ.

بەڵێ مەلا رەسووڵی تەکپەرست لە سەر تەکپەرستی خۆی بەو جۆرە لەگەڵ ئەو موسڵمانە ئیسلام نەناسە شێخ پەرستانە پێوە دەبێ. چەند مانگێکیش دەبێ کە مانگانەی وەرنەگرتووە و هیچیشی نابێ و ناچار دەس دەکا بە قەرز و قۆڵە و وام وەرگرتن، جا بەو جۆرە لە ماوەی سێ مانگدا سێ هۆقە گۆشت بە قاسابی دێی قەرزدار دەبێ و ناشیبێ بیداتێ. رۆژێک قەساب ئاوڕیشی دەبێ و

داوای وامەکەی لێ دەکات و سەرەڕای زۆر قسەی ناحەز دەچێ لە لای ئاغاش زۆر بەدگۆیی لەو هەژارە دەکا، جەنابی ئاغاش دەستوور دەفەرموێ سەد شەقی تەواوی بە بێ کەم و زیاد تێهەڵدەن!!

جا مامۆستای بەڕێز و پایە بەرزی گەلی کورد، هەم بە زەبری ئەو شەقانە و هەمیش لە شەرمی ئابڕوو چوون وەها نەخۆش دەکەوێ،کە دەگاتە خاڵی گیانەڵڵا و بە یەکجاری لە پێ دەپەڕێ، لەو کاتەدا ئاغاش ویژدانی نوستووی وەخەبەردێ و خۆی دە ماڵی ئەدیبی بە شەقان کوژراو دەهاوێ،ئەسپێک و دەمانچێک و تفەنگ و فیشەکدانێک و کاتژمێرێکی زێڕی بۆ دەبا و دەڵێ بمبوورە، من پەشیمانم!! ئەویش بە هیچ جۆرێک لێی وەرناگرێ و دەڵێ جا من تازە ئەوانە چ لێ بکەم لە سەردەمی هەڵکەدانا؟! پێشی دەڵێ بگرە وا لێرە منیش بەخشیمی لە دادگای ڕۆژی پەسڵاندا چ وەڵامێک دەدەیتەوە؟ من چ گوناحێکم هەبوو ئاوات لێ کردم؟ هەر ئەوەندە نەبێ کە دەمگوت شێخەکەی تۆ خوا نییە و نابێ بیپەرستی و خوای تاک و تەنیا بپەرستە و بەس؟!

بەڵێ ئەو شتانەی پێدا دەنێرێتەوە و پاشان گیانی پاکی تەکپەرستانەی خۆی بە خودای تاک و تەنیا دەسپێرێتەوە و ئیتر ماڵاوایی لە کورد و کورستان و لە هەموو تەکپەرستانی هاوبیر و باوەڕی دەکا. خوا بە بەهەشتی بەرینی شاد بکا.

جا ڕاستی ئا لەوەها کات و ساتێکدا و لە وەها هەل و مەرجێکد اکێ دە یتوانی هەر تەنیا بە حاڵودوو بەلاش دژ و نەیاری شێخگەل وگارانی دەرویشان بێ؟! کێ دەیتوانی بە درۆ، یا بە ڕاست خۆی بەمریدو نۆکەری یەکێک لە شێخەکان نیشان نەدا؟جا مەلای نەزان و خەڵکی موسڵمانی بێڕامیاری وچاو بە ستراویش ئەوەندەیان

شێخەکان گەورە کردنەوە کە تەنانەت سوێندیان پێ دەخواردن ولە هەرحاڵەتێکدا هاواریان لێ دەکردن و هانایان دەبردنە بەر تەنانەت جاری وا دەبوو کە کابرا سوێندەکەی بە خواش دەخوارد بەڵام لە دواییدا هەر دە تگوت لەو تەکپەرستییەی پەشیمانە و بە دوای ویدا سوێندی بە شێخیش هەر دەخوارد. بۆ نموونە دەیگوت وەڵلا بە غەوس یا بە خوا بە فلان شێخی، کە رەنگە ئێستاش ئەوە کەم نەبێ و گەلێکی واشمان هەن کە لە بنیڕا خوایان لە بیر خۆیان بردۆتەوە و شێخیان لە جێی خوا داناوە.!!ئێستاش زۆر کەسی واهەیە، کە بۆ ڕوالەتسازی و کارسازی خۆی هات و چۆی شێخیک دەکا ئەگەرچی باوەڕیشی پیی نییە. تەنا زۆر جاری واش هەبووە، کە مەلا وبیجگە لە مەلاش بە خودی خومیان گوتووە: تو بو نازانی نانی خوت بخوی کورە چت لە شیخان داوە ؟! ئەگەر هاوکاریشیان ناکەی نەیاریشیان مەبە. وات بە قازانجە کورە هەرخویان دەگەڵ ڕیک رەخە.

بێگومان لە وەها حاڵەتێکدا مەردێکی دلێر و ئازا و قارەمانی لە خۆ بوردووی دەوێ کە بتوانێ دەست لە سنگی خۆی بدا و بێتە مەیدانی خەبات و تێکۆشانەوەو خۆی بکاتە پێشمەرگەی هەمووان و بەهێزی بیرو باوەڕو زانیاری زۆری خۆی لەو شەوەزەنگی نەزانی و ناتێگەیشتووییدا جۆگەتێ بۆ خەڵک بشکێنێ و ڕێگەیان بۆ پانتاو بکات تا هەموو بتوانن پێیدا بڕۆن و لەو زەڵکاوی سەرشێواوی ڕزگارییان بێ و بێنەوە دەرێ.

بەڵێ ئا لەو ژیوارە تووش و دژوار و سەختە ولەم حاڵە تاڵ و ناهەموارەدا کە هیچ کەس هەر نەیدەوێرا تەنانەت بەرەو ڕووی ئەم داموودەزگایە بشکوخێ تاقە مەلایەکی کوردی خوا پەرست و زۆر بەهەست هاتە مەیدانی خەباتی خواییەوە و بە هێزی بیر وباوەڕی

پەتەوی پۆڵایینی خۆی و زانیاری زۆری دەستی کرد بە خەبات و تێکۆشان و جۆگەتێ بۆ گش لایەک شکاند و ڕێگەی بۆ هەمووان پانتاو کرد خیرەتی بۆ هەموان شکاند و پێی گوتن وەرن بە دوامدا مەترسن من وام لێرە وەرن با وڵاتمان خاوێن کەینەوە وەرن وەرن... وەرن بۆ خاوێنکاری وڵات لە خەیانەتکاران. وەرن خوامان لەگەڵە با دڕک و داڵی شێخ و خەلیفە و دەروێش ریشەکێش کەین.جا ئەو کەسە جگە لە مەلای گەورەی کۆیی کەسێکی دیکە نەبوو. بەڵێ مەلای گەورە بوو کە هاتە مەیدانی خەباتی خوایی و قۆڵی خیرەت و پیاوەتی هەڵماڵی و شێرانە گوڕاند و بانگی ئیسلامی بەرز کردەوە و هاواری گەلی کوردی لە نهێنی هێنایە دەرو هەموو خەولێکەوتووەکانی لە خەوی بێئاگایی ڕاپەڕاند و تێیگەیاندن کە ئەو ڕێیەی گرتوویانە ڕێگەی وان نییە و لێیان گۆڕیون و ئێستا ئەوان بە ڕێی گۆڕاودا دەڕۆن و دەڵێ با بدەنەوە سەر ڕێبازی ڕاستیی ئیسلام کە ڕێگەی قورئانی پیرۆزە.

جا ئەو جار هێنای بە بۆمبا بەتەوژمەکانی هۆنراوە پڕ واتاکانی خۆی ئەوەندەی ئەو تەریقەت و مەریقەت و داموو دەسگای شێخایەتی و بازاڕی پیر و مریدییەی بۆمباران کردن و دانیە بەر دەستڕێژی چەکی هۆنراوە ئاگرینەکانی خۆی کە لانی کەم هێنانیە حاڵەتی نیوە گیانی. مەلای گەورە وەک باوکێکی گەورە کە دەبینێ منداڵەکەی گەورەترین ستەمی لێ دەکرێ هەڵدەکوتێتە سەر کابرای ستەمکەر هیچ جۆرە بەزەییەکی پێیدا نایەت و هەرچی بۆی بکرێ لەگەڵی دەکاو هەڵمەتی پاڵەوانانەی خۆی بردە سەر ستەمگەران لە ئیسلام و لە گەلی کورد و بەزەیی پێیاندا نەهات و ڕوحمی پێ نەکردن و لێی دان و لێی دان تا بە جارێک لاوازی کردن.

جا ئەمجا لەوێڕاو بەدوای ویدا دەیان و سەدن و هەزاران مەلا و زاناو هۆنەری دیکەش خیرەتیان شکاو ترسیان نەما وەخۆ کەوتن و

بە دژی و بە ئاشکرایی ئەو بنکەی بێگانە پەرستییانەیان بە سەختی دایە بەر دەستڕێژی ئاوری چەکی هۆنراوە و نووسراوە و بە قسە و بە هۆنراوە و بەسراە لە دژی ئەو دامودەزگایە دەستیان کرد بە راگەیاندن.

راستی مامۆستای گەورە شۆڕشێکی وەهای کرد کە تا ئێستاش لە جیهاندا نەکراوە و لە توانای هەموو کەسێکیشدا هەر نەبووە. بەڵام لەمەولا زۆربەی هەرە زۆری نووسەران و هۆنەران وەخۆ کەوتن و هاتنە مەیدانی خەبات و تێکۆشان و رەگەڵ شۆڕشی مەلای گەورە کەوتن و دەستیان کرد بە بەربەرەکانی ئەو دامودەزگایە و رامالینی خورافات و پڕوپووچ پەرستی و ئاوری شۆڕشیان خۆشتر و خۆشتر کرد و ئیتر ئێستاش کاروانی شۆڕش نەپساوەتەوە و هەر لە ئاژوێن‌دایە.

زۆر کەسی ترسەنۆکی واش رەنگە هەبووبن کە زۆریان ئارەزوو لەو خەبات و تێکۆشانە هەبووبێ بەڵام خیرەتی ئەوەیان نەبووە کە راستەوخۆ بێنە مەیدان و وەک مەلای گەورە دەنگی دلێرانەی خۆیان دەرببڕن. جا هاتن وەک چاو لێکەرانی خوا لێخۆشبوو عومەری خەییام هۆنراوە و نووسراوەکانی خۆیان بە نێوی مامۆستاوە بڵاو کردبێتەوە! کە بە ڕای من ئەوانەش هەر هی مامۆستای گەورەن.

هەر لەو کاتەدا گەلێکی رووناکبیر و ئازا و دلێری واش هەبوون کە بە پەیڕەوی و چاو لێکردنی مامۆستا و نەریت دەرهێنان لەو نەترسە راستەوخۆ هەڵمەتیان بردۆتە سەر ئەو خورافات و پڕوپوچ پەرستییانە کەوا زۆر لە دوایە لە ئیسلام زیاد کراون. چونکە تازە ترسیان نەمابوو خیرەتیان بە یەکجاری شکابوو. ئاخر ئەگەر جۆگەت شکێنرا منداڵیش هەر دەتوانن پێیدا بڕۆن.

ئەوەتا دەبینین کە لەم دواییانەدا هۆنەری چاو نەترساوی کورد مامۆستا مەلا مارفی کۆکەیی لە ناوەندی هێز و مەڵبەندی

تـاپۆکراوی دوو شـێخی زۆر بەهێـز و مریـد زۆری ناوچەکـانی مەهابادو بۆکان کاتێک کە لێی دەپرسن:ئەرێ مامۆستا لە بورهان و زەمبیل کامیان چاکترە و مریدی کێههیـان بین و هـاتوچۆی کامیـان بکەین؟ بێترس و پەروا وڵامیان دەداتەوە و دەفەرموێ:

برهـان برهـان، بـر سـر زمبیـل بـزن بیـل
هـر دو انبـان دروغنـد چه برهـان و چه زمبیـل

بەڵێ مامۆستا کۆیی بێترسو خـۆف هەڵـدەکوتێتە سـەر هەر دوو بنکەی بەهێزی هەردووک تەریقەتی قـادری ونەقشی و هەردووکیـان بە ئاشکرا بە هەمبانەی درۆ لە پێنـووس دەدات و دەڵـێ بـابە تـۆ چ دەڵێی؟ نە بورهان چاکە و نە زەمبیل، واتا نە نەقشی و نە قادری و هەر لە ماکا تەریـقەت چـاک نییە و بنـاغەی لەسـەر درۆ دانـراوە کەوایە دەبێ دووری لێ بکەی.

جـا ئەوەش بـێگومـان هەر لە ژێـر رۆشـنایی ئەو چـرایەدایە کە مامۆستای گەورە هەڵیئاساندووە و شۆقی وە هەر چواری لای خۆی داوە و ئیتـر بەڕاسـتی ئـاوری شۆڕشـێکی کە مامۆسـتای گەورە هەڵیکـردووە هەر وا بە ئاسـانی نـاکوژێتەوە و تـا سـەرکەوتنی یەکجاری ئەو شۆڕشە و تا رووناک کردنی هەمـوو دنیـا بەتـایبەتی جیهـانی ئیـسلام بە شـۆقی ئەو روونـاک نەبێـتەوە ئەو مەشـخەڵە بڵێسەی بەرز و بەرزتر دەبێ و هەرکەس لەبەر خۆی سووتەمەنی و دەستەچیلەی بۆ دێنـێ و تـازەش ئیتـر هەرکەس خیرەتـی شکاوە و هیچ رووناکبیرێک دووری لـێ ناکا و هەر نەبێ فوویەکی لـێ دەکـا و کەمێکی خۆشتر دەکا. سەرەنجام مەشخەڵی ئاوری شۆڕشـی مەزنـی مەلای گەورە لە ناوەندی کوردستانەوە بە هەموو جیهانی ئیـسلامدا بڵاو ئەبێتەوە.

ئەوەتا دەبینین کە لە ساڵەکانی ١٣١٤–١٣١٥ مەشخەڵی بەرز و بڵیندی بڵێسەی لە هەرێمی موکریان کە مەڵبەندی هێزی دوو نوێنەری زۆر بەهێزی دوو تەریقەتی قادری و نەقشبەندی بوو بەڕێز مامۆستا مەلا مارفی کۆکەیی مەلای نەترس و بەخیرەتی کورد بە پەیڕەوی لە مامۆستای گەورە، شێخ و خەلیفە و تەواوی دام و دەزگاکانی شێخایەتی دەداتە بەر توانج و پلار و هەروەها ڕێکوڕاست بە خەڵک دەڵێ هەموو شتێکی شێخ درۆ و دەلەسە و فێڵ و فووتە و جگە لە نەزان و نەخوێندەوار و بێئاگایان هیچ کەس فریوی ئەوانە ناخوات و دەڵێ ریش و پرچ و سەرومێزەری شێخ لانەی شەیتانە و مرگی نەفرینی لەو حەشارگەیەدا خۆی حەشار داوە هەروەها کە دەڵێ:

تەماعم بوو بکەم مەتحی خەڵیفەی شاهی زەنبیلی
کە تێفکریم لە قووەت خاریجە تەشریح و تەفسیلی
سوئالم کرد لە ئوستادی تەبیعەت، بۆچی بێدەنگی؟
گوتی چ بکەم؛ تەخەییول ناکرێ تەسویر و تەشکیلی
فەقەت بیستوومە زۆر ئەهلی گوزەشتو عەفو و ئیغمازە
بە شەرتێ لێم نەڕەنجێ حازرم بۆ خەتم و تەکمیلی
لە باب و فەسلی تەزویر و ریا هێند چوست و چالاکە
هەموو کەس خۆ دەپارێزێ لە مەکر و کەید و تەزلیلی
وەکوو جەردەی موسەللەح دەچتە سەر ڕێگەی موسڵمانان
بە ئیمان ئیکتیفا ناکا و دەکا نەزعی سەراویلی
هەموو ڕۆژێ لە مەکتەبخانەیی تەدریس و تەدلیسی
دەنووسن سەد جەوازی نومرە یەک، ڕوتبەی عەزازیلی
بە ریش و سووڕەت و عەممامە و شکڵ و هەیولائی
بە لەحنی نازک و قەولی ئەکازیب و ئەباتیلی

فریـــوی جـــاهیلی وەحـــشی دەدا، بێچـــارە نـــازانێ
مەقـام و مەنزڵـی ئیبلیـسە، ریـش و پـێچ و مەنـدیلی
أيـــا مـــن قُلـــتَ أنَّ الـــشِّعرَ عـــصيانٌ و نُقـــصانُ
لَكُـــم إِحـــسانُكُم يـــا لائِمـــي، نَقْـــصي و ذَنْـــبي لِـــي

مانـای هـۆنراوە عەرەبییـەکە ئەوەیە کە دەڵـێ: ئەرێ هـۆی ئەو کەسـەی کە لـۆمەم دەکەی و پێـت وایە هـۆنراوە گونـاح و تـاوان و نـاتەواوییە، بـۆ خۆتـان چاکەی خۆتـان هـۆی لـۆمەکەرانی مـن و منـیش بـۆ خـۆم نـاتەواوی و گونـاحی خـۆم. چـونکە بەڕاستی ئەو هۆنراوانەی من نەک هەر ناتەواوی و گوناحیان تێدا نییە و بەس، بەڵکە وەک شمشێری یارانی پێغەمبەرﷺ کە لە پێناوی پەرە پێدانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام وەکار خـراون.هەروەهـا ئەمجـار راستەوخۆ هەڵـدەکوتێتە سـەر شـێخ و دوای هێنـدێک پێهەڵـدانی پـێچەوانە و توێدار پێی دەڵێ تـۆ پیـاوێکی زۆر بـێشـەرم و بـێئـابڕووی چـونکە لەگەڵ ئەوەشا کە ئەو هەموو هەڵمەت و گوشار و گورگەڕاوە کە بۆ تۆ کرا و چەپڵەیـان لـێ تەقانـدی مەیـدانت چـۆڵ نەکـردووە و وەک شێری لە مەیدانا چەقی و تۆ پیاوێکی وای هەموو شتێک بە مفتـی و بێحەق و کرێ دێتە بەر دەستت و مریـدە کەرەکانـت بـۆت دێـنن و تۆش هەرچی ئیشتیات لێ بـێ دەیخـۆی و هەرچـی پێـت خـۆش بـێ دەبەری دەکەی لە دوایەدا پێی دەڵێ ئەوا کـردم هەمـوو خووخـدەی تـۆ چـاک بـوو، بەڵام یـا شـێخ کە نەدەبـوو وا بـی کەچـی نەزان و ئەحمەقی . کە بەو شێوە دفەرمێ:

ئەی جەنـابی شـێخ! دەزانـم تـو خەڵـیفەی بەرحەقـی
وەک دەڵـێن شەخـسێکی سـاحیب ئیحتـرام و رەونەقـی
دەنگـی زیکـر و خەتـم و تەهلیلـت فەزای پـڕ کـردووە

زەلــزەلەی خــستۆتە خەیــمەی بێــستوونی ئەزرەقــی
ئـافەرین! سـەد ئـافەرین بـۆ غیـرەت و بـۆ هیممەتـت
تۆ کە مەحسووری لە چوار لاوە کە چەپڵەت لێتەقی
با وجـوودی ئەم هەمـوو حەمـلە و فـشار و گـورگەڕاو
مەرکەزت خاڵی نەکرد، وەک شێر لە مەیدانێ چەقی
با لە بەینی خـۆم و خۆتـدا پێت بڵـێم عـیللەت چ بوو
بەخـت و ئیقباڵـت سـەعیدە گەرچی بـۆ خۆشـت شـەقی
مەوقیعــی ســولح و ســەفایە بــا شــتێکت پــێ بڵــێم
نابێ عـاجز بی لە هەق، گەر تـۆ لەسـەر ڕێگەی هەقی
گەرچی دەوڵەتمەند و ساحیب پووڵ و پارە و سـەروەتی
مـالیکی گـامێش و مـێش و گـوێدرێـژ و گـوێلەقـی
هەر لە وشـتر تـا دەگـاتە کـاوڕ و گیـسک و فـرووج
دێـتە بەردەسـتت هەمـوو ڕۆژێ بە مفـتە و بـێهەقـی
تَأكُــــلُ مِمَّــــا تَــــشْتَهِي، تَلْــــبِسُ مِمَّــــا تَــــشَاء
مِــــن حَرِيــــرِ نــــاعِمٍ اَوْ سُــــنْدُسٍ وَ اسْــــتَبْرَقِ
گەرچی فەڕزەن جوملە ئەخلاقت هەموو چا بێ وەلی
دوور لە تۆ، یا شێخ! کەمێ نادان و نەختێ ئەحمەقی
تۆ وەکوو مێوی لەگەڵ ئەشخاسی بێشـەرم و ئەدەب
بـۆ ئەدیبێکـی وەکـوو مـن بـۆچی وا سـەخت و ڕەقـی
بـۆ دەبـێ تـۆ بـۆم بنێـری یەک عەبـای کـۆنی ڕزیـو
تـا منـیش مەجبـوور بـبم عەرزت بـکەم تـۆ لەقلەقـی
خزمەتــی ئەشخاســی شــاعیر لازمە، عەقڵــت ببــێ
اِنَّهُــــم كَالــــسُّمِّ قَتَّــــالٌ لِمَــــن لا يَتَّقِــــي

بەڵێ کاکی کۆیی لەو پارچە هەڵبەستەدا بە ئاشکرا هەڵدەکوتێتە سەر شێخ و خەلیفە و دەڵێ وەکوو جەردە و ڕێگری چەکدار ڕێ لە

موسڵمانان دەگرێ و بە تاڵان کردنی بیر و باوەڕ (ایمان) وازیان لێ ناهێنێ و تەنانەت تەما لە ناموسیشیان دەکا و دەرپێشیان لە پێ دادەکەنێ!

جا هەر بۆیە لە پارچە هەڵبەستێکی دیکەدا دەڵێ نابێ بە هیچ جۆرێک خەلیفەت پێ هەژار بێ و بەزەییت پێیدا بێ چونکە بەڕاستی ئەو هەموو شتێکی هەیە جگە لەراستی و دروستی و چاکی و پاکی و نوێژ و ڕۆژوو.

واتا ئەو هەر خوا پەرست نییە و ئەوەی کە موسڵمانێکی راستەقینە دەبێ هەیبێ نییەتی، دەنا ماشەڵڵا لە بێدینیدا زۆر دەوڵەمەندە و هەر لە خودا دوور و لە چاکە بەرییە جا هەر بۆیە نابێ بە هیچ جۆرێک بەزەت پێیدا بێ وەک دەفەرموێ:

مەڵێ خەلیفە فەقیرە دەڵێن بیحەمدیللا
هەموو شتێکی هەیە، غەیری سیدق و سەوم و سەلات

هەروەها بەڕێز و پایەبەرز مامۆستا رەمزی مەلاو هۆنەری دڵسووتاوی کورد هەر لەو هەرێمی مەهاباد و بۆکانە لە پارچە هەڵبەستێکی زۆر جوان و تەڕ و پاراودا وێڕای دادگایی کردنی خەڵکی فریو دراوی کورد دڵسۆزییان بۆ دەنوێنێ و ئامۆژگارییان دەکا و بە داخ و کەسەرەوە پێیان دەڵێ کە ئەمڕۆ ئایینی پیرۆزی ئیسلام زۆر بێهێز و چیلازە و یەکیەتی و برایەتی لە نێوان خەڵکی موسڵماندا هەر نەماوە و .... هۆی هەمووی ئەوانەش هەر تەنیا شێخ و خەلیفە و بازاڕی شێخ و تەریقەتە و بەس!!

لە حاڵ و ژیواری ئەم دامودەزگایە و فێر کردن و بارهێنانەکانی وان کە هەر کە مرید و نۆکەری وان یا یەکێک لە شێخەکانی دیکە نەبێ بە چاوێکی زۆر کەمی دەڕوانینێ و لایان وایە کە تەنانەت

لە... یش خەراپترە. مریدەکانیش ئەوی بە بێگانە دەزانن و هەرکەسێکیش کە بە بێگانەی بزانن ئەگەر بتوانن و بوێرن هەر خێرا دەشیکووژن. یا لانی کەم رێگەی هەموو جۆرە پێشکەوتن و سەرکەوتنێکی لێ دەگرن.

ئەمجا زۆر رێکوڕاست و بێتوێڵک بە مریدەکان دەفەرموێ ئاخر ئێوە ئەی ماڵوێرانینە جگە لە دژمنایەتی و دووبەرەکایەتی و رق و قینی موسڵمانان و خەرافات و پڕوپووچ پەرەستی چیدیکە لەو شێخانە فێر بوون؟ لەوەتا بوونەتە مریدی وان بە یەکجاری رێبازی دینتان لێ تێک چووە؟ ئەنکۆ بۆچی پێتان وایە کە شێخ وەکیل و نوێنەری خوایە و رۆزی و گیانی گیانلەبەرانیش هەر بە دەست وییە؟

پاشان بە بەڵگەی لۆجیک (منطق)ی پێیان دەڵێ ئەگەر راستە ئەو شێخانە زانیاری نهێنی (علم غیب)یان هەیە و خاوەنی کشف و کەراماتن بۆچی ناچن لەو هەموو خەزێنانە ژێر زەوی یەکێکی بۆ خۆیان دەرهێنن و بە یەکجاری پێی پێ بگەن و لەو چاو لەدەستی و سواڵکەری و تالانکەری و راو و رووت و چاو بەستنەی کە دەیکەن رزگارییان بێ؟ خۆ ئەگەر وا بکەن لەو هەموو حەرام خواردنەش رزگار دەبن.

ئەمجا ئەو بەرێزە دێتە سەر ئەوە کە دەفەرموێ: شێخە چاوبەستەکان بو فریو دانی خەڵک هەر خۆیان وتەیەکیان بە زمانی پێغەمبەرەوە هەڵبەستووە و بە درۆ دەڵێن ئەو خۆشەویستە فەرموویەتی (من لا شیخ لە فشیخە شیطان) پەنا بە خودا لەو بوختانە؟ چ بوختانێکی گەورەیە؟! کە دەڵێن هەر کەس شێخێکی نەبێ، شێخی وی مرگ (شیطان)ە. جا منیش ئەو درۆ زلەم بە زمانی خۆمەوە نەک بە زمانی پێغەمبەرەوە ئاوا راست کردۆتەوە

(من كان له شيخ فشيخه شيطان) (اى كالشيطان فى المكر و الحيل)

بەڵێ ڕەمزی دەڵێ بەڕاستی ئەو درۆ و بوختان و چاو و ڕاوە بۆ فریو دانی خەڵک دروست کراوە. دەنا ئاخر یارانی پێغەمبەر و پەیڕەوانی وان کوا مریدی کێ بوون؟ و شێخی وان کێیە؟

یان دەڵێن (من اعتقد حجرا فقد نفعه) هەرکەس باوەڕی بە بەردیکێش هەبێ قازانجی پێدەگەیەنێ.

جا ڕێزدار ڕەمزی ڕاز زان دەفەرموێ ئەگەر خوا نەخواستە ئەو قسە ڕاستە دەبێ بوتپەرەستەکان بیر و باوەڕیان لە هەموو کەس ڕاستتر بێ و لە دیندا دەبێ لە هەموو کەس لە پێشتر بن چونکە ئەوان خۆ یەکجار زۆریان باوەڕ بەو دار و بەرد هەیە!!

پاشان پەلامارێکی زۆر ژیرانە دەباتە سەر بیر و باوەڕی نەزانانەی موسڵمانە سادە و ساویلکە فریودراوەکان کە دەڵێن تۆبە هەر دەبێ لە سەر دەستی شێخ بێ و بە بێ شێخ تۆبە قەبووڵ نابێ!!

جا ئەویش لە وڵامیانا ئەفەرمێ: پێغەمبەری خوا ڕۆژێ حەفتا جار لە خزمەت خوادا تۆبەی دەکرد و دەپاڕایەوە. چونکە تۆبە هەر لە بەینی خوا و بەندەی خوادایە و بەس، بۆ تۆبە شێخیش هەر وەکوو بەندەکانی دیکە وایە و هیچ جیاوازییەکیان نییە و خۆ هەر لە بنیڕا پیر و مرید و شێخ بازاڕی بۆیە پەیدا کردنی ماڵ و پڕ کردنی تێر و جەواڵە! دەنا نە شێخ زانیاری ڕاستەقینەی هەیە و نە مریدەکانیش ڕێگا و تەریقەتیان دیوەتەوە. چونکە خۆ لە ئیسلاما شتێک بە نێوی تەریقەت هەر نییە.

ئەوجار بە ڕاشکاوی دەفەرموێ: بۆ بەدبەختی و لە بەر ناکۆکی و دژایەتی ئەوانە ئێمەش هەمووومان یەکترمان لەبەرچاوان کەوتووە، جا ئاخر هەتا کەنگێ ئاوا بین؟ برایانی خۆشەویست مەسڵەحەت

وایە با بدەینەوە سەر ڕێبازی شەریعەت و ڕوو لە خوا بکەین، تەریقەت و مەریقەت و شێخ و مێخ هەمووی هەر هەوایە و نرخێکی نییە. بەڵکە بە ڕوحم و بەزەی خوای گەورە ئەو هەموو ڕق و قین و ناخۆشەویستی و دژایەتییەمان لە دڵ بچێتە دەرێ و برایەتی و خۆشەویستی پێشوومان بۆ تازە ببێتەوەو تۆوی پیسی مریدایەتی و نۆکەریمان لەنێو نەمێنێ. ئیتر بەسە و شێخ مەکەنە لات و مەنات و بوت و سەنەم. جگە لە خوای گەورە سەری بەندەکی بۆ کەس نەوی مەکەن.

جا ئەوەش گوڵبژێرێک لە هۆنراوە درێژ و پڕ واتا و دەردە دڵەکەی "ڕەمزی" کە هەمووی هەر ڕاز و ڕیئۆنی و ڕەمزی سەرکەوتن و خۆشبەختی و کامەرانی و ئامۆژگاری دڵسۆزانەیە بۆ موسڵمانان:

## هاواری ئیسلام

برایانی دین میللەتی ئیسلام
تابیعی شەرعی شای خەیرول ئەنام
عەرزێکم هەیە ئەم بەندەی فەقیر
خاڵی لە غەرەز، بێ بوغز و تەفسیر
بە فەرموودەی حەق ئایەتی قورئان
موسڵمان هەموو پێکەوە بران
ئیمڕۆ ئەبینم برایانی من
فیرقە فیرقە بوون لێک بوون بە دژمن
بێ ئیتتیحادن، بێ ئیتتیفاقن
نیسبەت بە یەکتر ئەهلی نیفاقن

دینـــــــی ئیـــــــسلامێ ئەورۆ زەعـــــــیفە
باعیـــــــسی چیـــــیە؟ شـــــێخ و خەلـــــیفە
هەرکەس ئەیبیـــــــنن غەیـــــرە موریـــــدە
لەبەرچاوانیـــــــان هەر وەک یەزیـــــــدە
موریـــــدیش کەســـێک بە غە یـــر بـــزانن
فەوری ئەیکـــــــــووژن، ئەگەر بتـــــــوانن
پێــــی وایە بەهەشـــت بە دەس شـــێخانە
مـــایەی ویـــش کـــاورِ و گیـــسک و بەرانە
غەیـــــری عەداوەت بــــوغزی موســـــڵمان
ئێـــوە چ فێـــر بـــوون لە خـــزمەت شـــێخان
یـــا شـــێخ نایـــب و وەکیلـــی خـــوایە
رزق و رۆزی و رۆح، لە دەس وی دایە
چـــی موســـڵمان و ئەهلـــی تـــاعەتە
بە ئەمـــری خـــودا جـــێگەی جەنـــنەتە
مـــاڵوێـــرانیش بـــووین هێنـــدەی بـــرینج و رۆن
بـــۆ شـــێخان بەریـــن، بە مفتـــی بیخـــۆن
ئەگەر لە عیلمـــــی غەیبـــــین بـــــاخەبەر
خەزێـــــنەی قەدیـــــم بـــــۆ نـــاهێننە دەر؟
ئەوە بوختـــــانە و خەڵـــــک فریـــــو دانە
چـــی شـــێخی نەبـــێ شـــێخی شـــەیتانە
ئەســـحابی رەســـووڵ، یـــا خـــۆ تـــابیعین
مریـــدی کـــێ بـــوون برایـــانی دیـــن؟
دەڵـــێن ئاقیـــــدە بە بەرد کـــــافییە
قـــسێکی درۆیە و هەرگیـــز وا نیـــیە
گەر ئەوە راســـتە خـــودای نەخواســـتە

چــی بــوت پەرەســتە ئاقیــدەی راســتە
ئاقیـــــدەی عەوام ئەزانـــــن چیــــیە؟
پێـــــی وایە تـــــۆبە لە لای شــــێخییە
پێغەمـــبەر ئەیکـــرد رۆژی حەفتــا جــار
لە خـــزمەت خـــودا تـــۆبە و ئیـــستیغفار
تـــۆبە لە بەینـــی عەبـــد و خـــودایە
بـــۆ تـــۆبە شـــێخیش وەک عەبـــد وایە
هەم پیـــر هەم مریـــد مەقـــسوودیان مـــاڵە
مەقـــسوود پـــڕ بـــوونی تێـــرِ و جەواڵە
نە شـــێخ شـــک ئەبـــا عیلمـــی حەقـــیقەت
نە مریـــد دیـــویە رێگـــای تەریـــقەت
لەبەر نـــاکۆکی شـــێخان و مریـــد
لەبەر چـــاوی یەک گـــش بـــوونە یەزیـــد
مەســـــڵەحەت وایە بـــــرای تەریـــــقەت
بـــا بـــدەیتەوە بـــۆ لای شـــەریعەت
بەڵکـــوو بە روحمـــی خـــودا و پێغەمـــبەر
بـــوغز و غەرەزمـــان لە دڵ بچـــتە دەر
تـــازە بێـــتەوە حـــوببی قەدیممـــان
تـــۆوی مریـــدی نەیەتە نێومـــان
ئیتـــر شـــێخ مەکەن بە لات و مەنـــات
هەر بیپەرســـتن تـــا مـــاوە حەیـــات
هـــاواری ئیـــسلام بـــۆ ئەوەی مـــاوە
ئـــاڵقەی غـــوڵامی لە گـــوێ نەکـــراوە
کەســـێک کە دارای عیلمـــی غەیبییـــە
موحتـــاجی مـــاڵی فەقیـــران نیـــیە

بەســـە ئەی رەمـــزی جاهیـــل چـــا نـــابێ
مەلاش بەعزێکیـــــان ماڵیـــــان خەرا بـــــێ
ئەوان راوەســـــــــتان بە دەســـــــــتەو نەزەر
جـــاهیلیش کەوتـــنە ســـوجدە سەراســـەر

# سوپاس لەسەر تەواو کردن

سـوپاس بـۆ تـۆ ئەی خـودایە ؛ پڕاوپـڕی ئەو دنیـایە
ستاییـشیش لەگەڵـدایە؛ پەسـنی زۆریـش بە دوودایە
بـێپایـان و بـڕانەوە بـێ ؛ بـۆ دڵ هـۆی بـووژانەوە بـێ
هۆی هێز گرتن و ژیانەوە بێ ؛ مایەی سەرهەڵدانەوە بێ
لە نـاخی دڵـی پـڕ کـوڵەوە لە قـزگەی مێـشک و دڵەوە
بە بـۆوبەرامەی گـوڵەوە وەک چنـووریَ بە چـڵەوە
بۆ تۆ یەزدانی پاک و تاک خودای زارۆک و باب و داک
لە چاکیدا چاکتر لە چاک ؛ لە گش نەنگێکی دوور و پاک
تەنیـا و بـێهاوتـا و دڵـۆوان ؛یەزدانـی مەزن و میهرەبـان
خـودای ئـێمە و ئێـوە و ئەوان ؛ بـووێنەری بـوونەوەران
زانـا و دانـا و توانـا و بەهێـز ؛ زۆر گەورە و لێـزان و بەڕێـز
بۆ گش بۆنێک هەوێن و پێز ؛ بۆ هەموو کارێک ئەوە تێز
ڕۆزیـدەری زینـدەوەران ؛ سـازێنەری بـووێنەران
ژێنـەری گـش ژینـاوەران ؛ مـاکی خـونچە و گـوڵ و بەران
خـودای هۆشـیار و مەسـتانی ؛خۆشەویـستی بەهەسـتانی
ڕێکوپێک خەری خوستانی ؛خوای بە دەست و بێدەستانی
زیندووکەرەوەی مردووگەل ؛هێنەری گش دەرفەت و هەل
بەخێوکەری ئیفلیج و شەل ؛ بەخـشەری هێزی فڕینی مەل
ئەی بەخشەری تیرێژ بە خۆر ؛ پێلدەر بەدە ریای شین وبۆر

ئەی وەدیهێنــی کەم و زۆر ؛ بینـایی چـاوی سـاخ و کـۆر
هـۆی پارێزەری نووسـەران ؛ بەخـشەری هەسـتی هـۆنەران
تۆی بەخشەری بەبەخشەران ؛ سەرداری گەورەوسەروەران
پێکهێـنەری گەل و هـۆزان ؛ هـۆزان و لێـزان و چـازان
ئاگـادار لە هەمـوو نیـازان ؛تـۆی پێـزان و بە هەمـوو رازان
دانەری یاسـا و رێـسایان ؛ تـۆی زانـاکەری زانایـان
زانایـان هەر وایە لایـان ؛ پەسـن هەر بـۆ تـۆیە شـایان
هـۆ یەزدانە مەزنەکەم هـۆو ؛ بە تـۆ ئـاخر بـێچکە لە تـۆو
وزەت کەس نییە ئاخر خۆ و ؛ چەقر و زەدەر بە دەنکی تۆو
ئەی روێـنەری گـوڵی ئەویـن ؛ رەنگێـنەری رووی زەمـین
گش ئەوانەی بەرز و نەوین ؛ دەڵێن هەموو کار هەر بەوین
خودای بێوێنە و بێهاوتای ؛ خودای ئێرە و خودای ئەولای
وەدیهێنەری گش تەوای(شت) ؛ خـودایەکی تاق و تەنیای
خـاوەن هێـز و وزەی زۆری ؛ پرشـنگ‌هـاوێژتر لە خـۆری
هەر تـۆ گەنجـی سـەربەمۆری ؛ پـارێزەری شـەل و کـۆری
ئاگا و ئامادە و لە هەر جێ ؛چی ویستت دەیکەی جێبەجێ
بێ‌تێرامـان و هەر لەجێ ؛هەمـوو شتێک بە تـۆ دێتە جێ
بیـسەر و بیـنەر و وریـا ؛ لە دونـدی چیـا و بنـی دەریـا
لە ئاسمانانیش چـی کریـا ؛ گـشتی نەخـشی تـۆی لـێ دریـا
ئاگـاداری هەر کـۆمەڵێ ؛ چـی مانـگ و رۆژی لـێ هەڵـێ
بـۆ هەر فەرمانکێـت دەڵـێ ؛ یەزدانەکەم بەڵـێ بەڵـێ
هەرچی بووە و هەیە و دەبێ ؛ هەرچی جۆرێک بوونی هەبێ
مەگەر هیچ ئاوەز (عقل)ی نەبێ ؛ دەنا دەڵێ هەر وا دەبێ
*تەنیـا ئەوە پەروەردگـار؛ پەروەردگـاری جـانەوار*

ئەو جـانەوەری بـێژمـار ؛ لە نـاو دەریـا و لە لێـرەوار
گـش بـوونەوەری دوا بـراو ؛ یـا دوانەبـڕاو و هەروا مـاو
پیـر و منـاڵ، جحێـڵ و لاو ؛ پەروەردەی دەسـتی وین تەواو
بە گش گیانـدار و بێ‌گیان ؛ بە بوون بە نەبوون بە جیهان
بە گـش کـورات و کاکێـشان ؛ ئاگـادار هەر ئەتـۆی یەزدان
هەرچـی دەبـێ و رابـردووە ؛ هەرچـی زینـدووە و مـردووە
هەرچـی هەرچییەکـی کـردووە ؛ بە ئاوی تـو خـۆی شـردووە
ئەو دنیـایەی وا گەورەیە ؛ بەم خـول و سـورِ و دەورەیە
بەو هەمـوو نـازە گەورەیە ؛ ملیاردهـای وای لە دەورەیە
کە بـێ لە خـۆت کەس نـازانی ؛ لە کـوێڕا هـاتووە بنـاوانی
پەروەردەی خۆتە بە جوانی ؛ هەر خۆت خـودای میهرەبانی
کـێ پـسپۆڕ و زیـرە و زانـا ؛ دەڵـێ بە گـش هێـز و توانـا
بـێجگە لە تـۆ خـودای دانـا ؛ کـێ جیهـانی ئـاوا دانـا؟!
کـێ دەزانـێ کە بـوون چییـە ؛ ئاسـمانی سـەرەوخوون چییـە
زەمـین لە نـاو دەروون جییـە یـا مـاکی ئـاوی روون چییـە
کێ دەزانێ لە کوێوە هات ؛ یا مەرگ بەرەو کوێی دەبات
یـا تـاوێکی تـر چـی دەکـات ؛ تەمبـێ دەکـرێ یـانە خەڵات
کـێ دەزانـێ ئەو دنیـایە ؛چەنـدەی دیـکەی بە دوادایە
چەنـدی چووە و چەنـدی مایە ؛ بێجگە لە تۆ ئەی خودایە
کێ دەزانێ کە کێی ئەتـو ؛ چەنـدی و چـۆنی و لە چی ئەتۆ
چۆن بووی و چـۆن دەبی ئەتۆ ؛ دەبێ چ بی و نەبی بە تۆ
کـێ دەزانـێ کە تـۆ چـۆنی ؛ خـاوەن تـام یا رەنـگ و بـۆنی
بـێجگە لەوەی بڵێـی کـۆنی ؛ بە خـوا هەرچـی بڵـێن تـۆ نـی
جـا هەر بـۆیە لە نـاخی دڵ ؛ لە دەروونێکـی پـڕ لە کـوڵ

هەڵدەخوێنم وەکو بولبول بولبولی براو لە سوورە گوڵ
دەڵێم خودای خاون هەستانێ ؛ خودای خۆموخەڵکوخوستان(کائنات)
ئاودێری دێم و باغستان ؛ خودان کەری دەستەوستان
دەیدرکێنم بە دڵ و گیان ؛ پێی لێ دەنێم بە پێ لێنان
دەڵێم یەزدانی دڵۆوان ؛ بەخشەر و پوگ و میهرەبان
بە هیچ لەونێکی ناتوانم ؛ نە بە دست و نە بەزمانم
نە پێنووس و وەجەکانم ؛ نە بەو دڵەی پەرێشانم
بکەم پەسن و سوپاسی تۆ ؛ پێم تەواو نابێ باسی تۆ
دڵخۆشم کە دەمناسی تۆ ؛ کە خوا خوایەکی خاسی تۆ
بۆ ئەو ڕێزەی لە منت ناوە ؛ بۆو یارمەتییەی بەمنت داوە
هەتا بنێم ئەو هەنگاوە ؛ جا تا گیانم لەبەر ماوە
قەت پەسنی تو تەواو ناکەم ؛ ئاوڕ وە نارەوا نادەم
ئابڕووی خۆمت لە لا نابەم ؛ لە خۆمت تەوەللا ناکەم
ئاخر بێ‌یارمتی تۆیی ؛ کوڵی دڵی مەلای کۆیی
بۆ ماوەی چەن ساڵی رۆیی ؛ کە نووسیم بە لەسەرخۆیی
چلۆن دەکرا بە منی چیلاز ؛ منێکی بێ‌هێز و لاواز
منی ناتامادە و ناساز ؛ داماو و راماو و بێ‌واز
پەڕتووکێکی ئاوا مەزن ؛ کە ونیە و نموونەی نەبن
نەنگ و هەڵەشی کەم هەبن ؛ بێ تۆ چۆن دەنووسرا بە من؟
ئەویش لەمەڕ مەلای کۆیە ؛ کە بێ‌کومان دۆستی تۆیە
تەکپەرستی سەربەخۆیە ؛ کوڕی کوردی رەنجەڕۆیە
کەتۆ لەمنت خۆشتر دەوێ؛ چون تۆی پەرست ڕۆژوشەوێ
یاخوا بەر بەزەت کەوێ ؛ کێ وەک وی بێ لێرە و لەوێ

گەنـد و گەڵاشـت نـاهەوێ ؛ تـۆ تۆپەرسـتی وات دەێـو
هەرکەس کەوا تۆپەرسـتە؛ تەکپەرسـت و دڵ بەهەسـتە
هەر بە تۆپەرستیش مەستە ؛ لەبەنـدەگیت نـابێ خەستە
خـوایە لێـت دەپـاڕێمەوە ؛ تـا کـاتێ بـۆ لات دێـمەوە
لەو تەمەنەی بەڕێـمەوە ؛ هەرگیـز بێکـار نەخـولێمەوە
چی دەیکەم پەسندی تۆ بێ ؛ تاکوو هۆشم لەسەر خۆ بێ
نەگۆڕێ و هەروەکوو خۆ بێ ؛ دەبێ چاوم هەر لە تۆ بێ
زۆر زۆرم ماون کاری دیش؛لەو جیهانە پژگاڵ(شغل)و ئیش
گەلێکم ئیش بوون وە ریش ؛ لە کەس داوا ناکەم ئەمیش
کەوایە ئەی یەزدانەکەم ؛ ئەی خـودا مێهرەبـانەکەم
تـاکوو خـوا نەکـا وا نەکەم ؛ دەردم بە تـو دەوا نەکەم
بۆ ئەنجامی ئەو کارانە؛ لەبۆ پەرا (خزمـە ت)ی ئەو قورئانە
تـاکوو مـاوم لەو جیهـانە ؛ بـۆ خزمەتـی ئەو کـوردانە
خـودایە هەر خـۆت یارم بی ؛ دەسگیر و یاری کارم بی
دەرمـانی دڵەی بیمـارم بـی ؛ لەو خەبـاتەم هاوکـارم بـی
خوایە خۆت یارمەتیم بدەی ؛ ریسوای ئێرە ئەولام نەکەی
خۆت بمدەیەی چی پێم دەدەی ؛ ژێرباری بەندانم نەبەی
گومـانم لەوەیـدا نیـیە ؛هەرکەس خـودای لە لا نیـیە
هـیچ سـەرکەوتنێکی بـۆ نیـیە ؛ کە بـشبێ تـام و بـۆی نیـیە
بـێ هێـزی تـۆ نـاکرێ کـارێ ؛ بـێ ودمـت بـاران نابـارێ
بەفـریش لێـی نـایەتە خـوارێ ؛ گـوڵ ناکا هـیچ گیـا و دارێ
لە تـۆڕایە هەرچـی هێـزە ؛ کـێ تـو نەتـهەوێ بـێ ڕێـزە
بـێ تـۆ بـوون بـێتێـزە و پێـزە ؛ لە تـۆڕا چـی پێـزە و تێـزە
ئەی خـوایە تـۆ خـوای هەمـووانی ؛ بۆ هەمـو زامـێ هەتـوانی

هەرچی بتهەوێ دەتوانی ؛ بە گورزی بیکەی بە جوانی
ئەی خودا چاک و پاکەکەم ؛ یەزدانە تەنیا و تاکەکەم
من هەر لە تۆ داوا دەکەم ؛ کە ڕووناک کەی ڕەوانەکەم
ئای چەندەم پێ خوشە خوایە ؛ وای چەندەشی تام تێدایە
بێژی گورزی خوای لە لایە ؛ سەربەرزیش هەر دەوەیدایە

مەهاباد سالی ٢٦٩١ کوردی

دوامین جاری پێداچوونەوەی ئەو پەڕتووکە لە مانگی گەلاوێژی سالی٢٦٩١ی کوردی ڕێکەوتی مانگی موردادی ١٣٧٨ی هەتاوی دابوو و دوامین چاو ڕێخشاندنەوەی لەشەوی یەکشەممۆ ٢٢ی ڕەزبەری سالی ٢٧٠١ کوردی (١٣٨٠/٧/٢٢) هەتاویدا بوو.

و صلی الله علی سیدنا محمد و علی آله و اصحابه و اتباعه
اجمعین و آخر دعوانا ان الحمد لله رب العالمین

# ناوەڕۆک

هەتا دەمرم لە بۆ کوردان دەناڵم

عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بەحاڵم

دەبێ من کەیفی چیم بە دنیا بێ

قەومی من وا بە زیل و ڕیسوا بێ

بێکەس و بێدەرو فەقیر و هەژار

بێ سەروسەرفراز و بێ سەردار

ئەوی ڕێگەی لە کوردان گۆڕ بێ

لەعنەتی خودا لە لەحەد و گۆڕ بێ

مەلای گەورە